زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی ٢٢

# پیاوانی لەدەوری پێغەمبەردا

خالد محمد خالد

## مەبەست لە زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

- دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردییە بە گرنگترین و کاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەرڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین .
- ئاشناکردنی خوێنەری لاوی موسڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ ڕۆشنبیری ئیسلامی و سازێنەری ڕابوونی ئیسلامین .
- شارەزاکردنی ڕاستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە ، ئازادکردنیەتی لە گشت کۆت و بەندو بۆچوونی تەسکی حزبایەتی و تاکڕەوی و ڕەوتگەرایی .
- بناغەیەک بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتییەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەرتاکێکی موسڵمانی کورد ، تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکاریانەی هەبێ ، کە خوای پەروەردگار پێی سپاردوە .

دەگەڵ ڕێزو تەقدیرمان بۆ بیروڕای نوسەرانی ئەم زنجیرەیە ، مەرجیش نییە ئێمە پابەندی هەمو بیرو بۆچونەکانیان بین .

بادەستورێشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت ؛

ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٨﴾ سورة الزمر

# پیاوانی لەدەوری پێغەمبەر

نووسینی

## خالد محمد خالد

وەرگێڕانی

## سهام بەرزنجی

پێداچوونەوە و لێکۆڵینەوە و ڕاستکردنەوەی

## دەستەی نووسینگەی تەفسیر



ناوی کتێب بە عارەبی: رجال حول الرسول

ناوی نوسەر: خالد محمد خالد

ناوی کتێب بەکوردی: پیاوانێ لە دەوری پێغەمبەر ﷺ

ناوی وەرگێر: سهام بەرزنجی

چاپ و بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر

خەت: نەوزاد کۆیی

نەخشەسازی: جمعە صدیق کاکە

بەرگ: ئەمین مخلص

نۆرە و ساڵی چاپ: دوەم ١٤٢٩ک – ٢٠٠٨ز

تیراژ: ٣٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری و هونەر هەولێر ژمارەی سپاردنی ( ٢١٠ ) ی ساڵی ٢٠٠٢ دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر کوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٢٢ ٥١ ٤٦٠ ٠٧٥٠ - ٩١ ٧٢ ١٣٨ ٠٧٧٠
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# پێشەکی

ئەوکاتەی دەمانویست ئەم کتێبە پاچڤە(ترجمة) و چاپ بکەین، دەمانزانی لێرەو لەوێ پرسیار و مقۆمقۆ دەربارەی چاپ و بڵاوکردنەوەی دەورووژێنرێ، چونکە چەند چەمکێکی دوور لە راستیەکانی مێژوی لەخۆ گرتووە و دانەر خاوەنی بیرۆکەیەکە، کە پێچەوانەی تێگەیشتنی ئیسلامە بۆ مێژو. هەروەها دانەر کەوتۆتە ژێر کاریگەریی رۆژهەڵاتناسە بێئینسافەکان و هەندێ لە مێژونوسە قین لەدڵەکان.

دیارە ئێمە هەر لەسەرەتای شەستەکانەوە سات بەسات و تاو بەتاو لەگەڵ ئەم کتێبەدا ژیاوین، بە ئەندازەی تێگەیشتنیشمان بۆ ئیسلام و بە هاوکاری راگۆڕینەوەی نوسەر و دانەر و مێژونوسە ئیسلامیەکان، خاڵە لاواز و بەهێزەکانمان تێدا بەدیکردووە.

هۆی پاچڤە و بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبەش، بەم خاڵانەی خوارەوە کورت هەڵدێت:

١- دانەر وێڕای ئەوەی، دەربارەی گوتراوە و دەگوترێ، بەم کتێبەی شوێنەوارێکی گەورە و بەرزی هێناوەتە کایەوە، تا خەڵك ئارەزومەندی مێژوی ئیسلامی بن، هەروەها بەهۆی رانواندنی لایەنە سەرنج راکێشەرەکانی ژیانی ئەم کەڵە پیاوانە و شێوازی سانا و دڵ راکێش، خۆشویستنیانی لە دڵی خەڵکی جێ کردۆتەوە.

٢- خواست و داوای گشت ئاستەکان بۆ ئەم کتێبە، بەتایبەتی چینی گەنجان، هەروا کاریگەریی روونی ئەم کتێبە لە گەشانەوەی رابونی ئیسلامی پیرۆز، بوونە هاندەرمان بۆ پاچڤە و بڵاوکردنەوەی، بۆ ئەوەی نەوەی بەرێزی کورد، ئەوانەی زانست بە زمانی خۆیان تێدەگەن، لەم کتێبە گەورەدا بێ بەش نەبن..

٣- دانەری ئەم کتێبە، خالد محمد خالد، هەروەك نەریت و خوی هۆشمەندان و خوازیارانی راستیی، وێڕای ون بون و سەرلێشێواوی و ساتمەکردن و خلیسکانیان، لە رۆشتن و کاروانی

گورج و گۆڵ و خێرایان بەرەو شکۆیی و بەرزیونەوە، بەڵام لە کۆتادا شارەزای راستیی دەبن، بۆ رێگای بەرەو خوا چونیش، دەبنە چرا و مەشخەڵێکی رۆشن..

٤- هەندێ مامۆستا و شارەزامان بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم کتێبە راسپارد، تا لە پەراوێزی کتێبەکەدا، تێبینیەیە پێویستەکانمان بۆ تۆمار بکەن، شتەکانی تریشمان بۆ زیرەکی و هۆشمەندی خوێنەری بەرێز جێهێشتووە.

لەگەڵ ئەوپەڕی دڵخۆشیمان بە دەرچوونی ئەم کتێبە، لە خوای گەورە داواخوازین سەرکەوتومان بکات بکات و پیرۆزیی بخاتە ئەم کارەمان و میللەتەکەشمان پێی بەهرەمەند بێت.

فۆرسینگەی ئەفسیر

٢٠٠٣/١/١٣

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

# پێشەکی

قسەوباسێك نیە هەڵبەستریَ، یان فرۆفێڵێك نیە بگوترێتەوە، ئەو باس و بەسەرهاتەی کە مێژوو لەبارەی مەزنترین دەستەی خاوەن بیروباوەڕ و ئیمان کە لەسەر زەویدا دەرکەوتبێت هەواڵی پێداوین.. ! !

لەبەرئەوەی بەدرێژایی و دێرینی مێژووی مرۆڤایەتی، متمانە و راستگۆیی و راستبینی وەك ئەو ماوەیەی مێژووی ئیسلام و شوێنکەوتە پێشینەکانی بەخۆوە نەدیوە، بەجۆرێ کە بۆ لێتوێژینەوەو بەدواداچوونی هەواڵ و باسەکانی توانایەکی زۆری مرۆیی بێوێنە دەستەبەر کرا، کە چەندین نەوەی پێشبڕکێکار لە زانایانی لێهاتوو هەستاون پێی و هیچ هەڵوێستەیەکی چەرخی یەکەمی ئیسلام، یان چرپەیەکیان واز لێنەهێناو هەموویان خستنە بەر وردەکاری پشکنین و ڕۆشنایی لێکۆڵینەوەو رەخنە.

*    *    *

ئەو گەورەییە سەرسوڕهێنەرەشی لەسەر لاپەڕەکانی ئەم کتێبە لەبارەی ئەو پیاوە بەرزانەی هاوەڵانی پێغەمبەری خواﷺ بەدی دەکەین، ئەفسانەیەك نیە، با لە خستنەڕووی نمونە کەم وێنەکانیدا وەك ئەفسانە خۆی بنوێنێ! ! !

بەڵکو ئەوانە راستین و کەسێتی و ژیانی هاوەڵانی پێغەمبەر پێکدێنێت و.. بەرز دەبێتەوەو خۆی دەنوێنێ، بەو جۆرە نا کە نووسەران و پیاهەڵدەران دەیانەوێت، بەڵکو بەو رادەیەی کە هاوەڵ و کەسەکانی ویستوویانە و، بەپێی ئەو کۆشش و هەوڵە بێوێنەو وەرگێراوەی کە لەپێناوی سەرکەوتن و تەواوکاریدا داویانە.

ئەم کتێبەش ئەو توانایە لەخۆی رانابینێت کە تەواوی ئەو گەورەییە بێوێنەیە بۆ خوێنەران بخاتە روو، بەڵکو ئەوەندەی دەوێ کە ئاماژە بە ئاکارەکانیان بکا و لە ئاسمانەکەیان بڕوانێ..

لەراستیدا مێژوو پیاوانێکی دیکەی وەهای بەخۆیەوە نەبینیوە کە بەجۆرێ نیەت و عەزمیان خستبوە خزمەت ئامانجێکی بێوێنە لە دادوەری و بەرزیدا و، پاشان ژیانی خۆیان بەشێوەیەکی بێوێنە لە قوربانیدان و جەسووریدا لە پێناویدا بەخت کرد–وەك ئەوەی هاوەڵانی دەوری پێغەمبەر نواندیان.. ! !

*    *    *

لە کات و ساتی چاوەڕوانکراو و، وادەی دیاریکراوی خۆیدا هاتنە ژیان. لە ساتەوەختێکدا ژیان چاوەڕێی کەسانێك بوو بەها ڕۆحیەکانی سەر لەنوێ ببوژێنێتەوە، ئەوان لەگەڵ پێغەمبەرە بەڕێزەکەیاندا وەك مژدەبەخش و خواپەرست هاتن..

لە دەمێکدا کە چاوەڕوانی یەکێ بوو کۆت و زنجیری سەر مرۆڤایەتی لاببات و، بوون و ئایندەی دەرباز بکات، ئەوان لە شوێن پێغەمبەرە مەزنەکەیانەوە وەك سوارچاك و ڕزگارکار هاتن..

لەکاتێکدا کە چاوەڕێی کەسانێك بوو ئاسۆی نوێ و چاك بۆ شارستانێتی مرۆڤایەتی بهێنێت، ئەوان هاتن وەك سەرمەشق و ڕێز لێ گیراو..

* * *

باشە ئەو زاتە پاکانە چۆن توانیان هەموو ئەوەی بەدەستیان هێنا لە چەند ساڵێکدا ئەنجام بدەن..؟! چۆن جیهانی کۆنیان بەو هەموو ئیمپراتۆریەت و هێزەیەوە گۆڕی و کردیانە خۆڵەمێش..؟؟

چۆن چۆنی بە قورئانی پیرۆز و وشەکانی جیهانێکی نوێی ئاوەها جوانیان هێنایە کایەوە کە لە بەرزی و مەزنیدا بێوێنەیەو سەرنج دەهەژێنێ و.. لە تواناو دەستەڵاتدا زۆر بڵندە؟؟

بەر لە هەموو ئەوانە و، لەسەرووی هەموویەوە.. چۆن توانیان وەکو خێرایی تیشك ویژدانی مرۆڤایەتی بەحەقیقەتی یەکخواناسی ڕووناك بکەنەوەو بۆ هەمیشە بت پەرستی هەموو چەرخەکان رابماڵن..؟!

ئەوەیە موعجیزە راستەکەیان..

هەروەها، موعجیزە راستەقینەکەیان لەو توانا دەروونیە بەرزەدا خۆی دەبینێتەوە کە چاکەکانی خۆیان پێ دەڕازاندەوەو بە جۆرێکی کەم وێنە دەستیان بە ئیمانیانەوە گرتبوو..!؟

لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئەو موعجیزانەی کە بە دەستیان هێناو جێبەجێیان کرد، تەنها ڕەنگدانەوەیەکی خاکەڕایی(متواضع) ئەو موعجیزە گەورەیەیە کە بەسەر دونیادا هات ئەو ڕۆژەی خوای گەورە مۆڵەتی دا کە قورئانە پیرۆزەکەی بێتە خوارێ و، پێغەمبەرە ڕاستگۆ و دەست پاکەکەشی گەیاندنی لەسەر بێت و، کاروانی ئیسلامیش لەسەر ڕێگای ڕووناکی هەنگاوی خۆی دەست پێ بکات..!!

* * *

لەم کتێبەشدا، کە پێشتر لە پێنج بەرگی جودادا بڵاوکراوەتەوە، ئێستاش لەم بەرگە یەکگرتووە تەواوەدا دەیخەینە ڕوو، کەسێتی (شەست) هاوەڵی پێغەمبەری خوای لەخۆگرتووە–علیهم أفضل الصلاة وأبهى السلام–.

هەروەك لە کۆتایی کتێبەکەشدا باسمان کردووە، ئەو (شەست) هاوەڵە هەڵبژاردەو

نوێنەری چەندین هەزار برای بەڕێزی دیکەیانن کە هاوسەردەمی پێغەمبەر بوون و باوەڕیان پێی هێناوەو سەریانخستووەو پشتیوانی بوون.. لە وێنەو هەڵس و کەوتیاندا شێوەو ئاکاری هەموو هاوەڵان بەدی دەکەین.

ئیمانیان، دامەزراوی و، پاڵەوانێتی و، وەلائیان بۆ خودا و پێغەمبەرەکەی دەبینین، ئەو کۆششە بەدی دەکەین کە ئەنجامیان داوە.. لەگەڵ ئەو ناڕەحەتیانەی کە لەژێریاریدا خۆیان گرت.. لەتەك ئەو سەرکەوتنەی کە بەدەستیان هێنا..

هەروەها ئەو رۆڵە جێی شانازیەیان دەبینین کە پێی هەستان بۆ رزگارکردنی هەموو مرۆڤایەتی لە بتپەرستی ویژدان و، ونبوونی ئایندە..

خوێنەر لەنێو ئەو (شەست) هاوەڵەدا هەرچوار خەلیفەکەی پێغەمبەر: أبوبکر، عمر، عوسمان، علی، بەدی ناکات، خوای گەورە یارمەتی داین بۆ هەریەکەیان کتێبێکمان دانا بەناوی (وجاء أبوبكر.. بين يدي عمر.. في رحاب علي.. وداعاً عثمان..).[١]

*　　*　　*

ئێستاش با بە ملکەچی و شادیەوە لەو مەردە چاکەکارانە نزیك بینەوەو پێشوازی جوانترین و بەرزترین نمونەی چاکەی مرۆڤایەتی بکەین و.. با بەرزترین نمونەی مەزنی و تەواوی کە دنیا بە خۆیەوەی دیبێت بەدی بکەین و.. سەرنجی کەتیبەکانی حەق بدەین لە کاتێکدا کە جیهانی کۆن بە بیروباوەڕیان دەپێچنەوە و، کەشی ئاسمانیان جەنجاڵ کردوە بە ئاڵا نوێکانی حەقیقەت کە یەکخواناسی پەروەردگار و، ئازادکردنی دروستکراوانیان پێ ڕاگەیاندوون.

خالد محمد خالد

---

١ شایانی باسە ئەو چوارکتێبەی نووسەر لەیەك بەرگدا ئێستا هەیە بەناوی –خلفاو الرسول–. (وەرگێڕ)

ج مامۆستایەك بوو.. ج مرۆڤێك...؟؟

ئەو سەرچەشمەی مەزنی. و.. دەستپاكی. و.. پایەبڵندیە..؟

بێگومان ئەوانەی مەزنی ئەو سەرسامی كردن هەقیانە..

ئەوانەی گیانی خۆیان لەپێناودا بەخشی هەر ئەوان قازانجیان كرد..!

(محمد)ی كوڕی (عبدالله).. نێردراوی خوا بۆ لای خەڵك لە گەرمەی ناخۆشی ژیاندا...

ج نهێنییەك بۆی رەخسا وای لێكرد بیكاتە مرۆڤێك نەوەی مرۆڤایەتیش رێزدار بكات..؟

ج دەستێكی باڵا، لەلای ئاسمانەوە بۆی كرایەوە و، هەموو دەروازەكانی بەزەیی و، بەخشش و، رێنمایی بەفراوانی بۆ واڵاكرا..؟!! ج باوەڕێك و، ج جەسوورییەك و، ج رووناك كەرەوەیەك بوو..؟!

ج راستگۆییەك و، ج پاك و، بێگەردییەك..!!

ج خاكەڕایی(تواضع) و.. خۆشەویستی و.. ورەیەك بوو؟!

ج بە پیرۆزگرتنێكی حەق بوو..

ج رێزگرتنێكی ژیان و.. زیندوان بوو..؟!

خوای گەورە نازو نیعمەتی بەو ئەندازەیە پێبەخشی تا ببێتە شایستەی هەڵگری ئاڵاكەی و قسەكردن بەناوییەوە، بەڵكو بە جۆرێك كە بیكاتە دوا پێغەمبەر..

ئا لێرەوە، فەزڵی خوای باڵادەست زۆر گەورە بوو لەسەری ..

بۆیە هەرچەندە گەرو و ئیلهام و پێنوسەكان لەبارەیەوە بدوێن و، سرود بۆ مەزنی ئەو بڵێن، هەر هەموویان وەك ئەوە وان كە لە شوێنی خۆیاندا نەجوڵابن و، هێشتا زمانیان بە وتەیەك نەكردبێتەوە..

ئەگەر لاپەڕەكانی سەرەتای ئەم كتێبە مەبەستیان ئەوە بێت بە باسكردنی پێغەمبەرﷺ دەست پێبكات، ئەوا چاوی نەبڕیوەتە ئەوەی كە ئەو قسەكردنە مافی خۆی بدات و.. هەرگیز وا خۆی نانوێنێ كە پێغەمبەری مەزنی بە خوێنەرانی ئاشنا كردبێت.

بەڵكو ئەمە تەنها ئاماژەپێدانێكی شەرمنانەیە بۆ هەندێك خەسڵەتی سەركەوتن و مەزنی ئەو، كە وایكردبوو دڵی خەڵكی بەرەو رووی بێت و، ئەوانە بۆ لای خۆی كێش بكات و دۆستایەتیەكی بێوێنەیان بۆی هەبێت كە ئەم كتێبە لەبارەی هەندێكیانەوە دەدوێ لە موهاجیر و ئەنصارەكان، ئەوەبوو هەر لەگەڵ وەرگرتنی بۆنەكەی، هەموو شنەبا و شەماڵەكانی ژیان بوونە مزگێنیدەر و شادیهێنەر و، بوونە نێردراو بۆ هەموو پێگە و نشینگەیەكی مرۆڤ كە

هەڵگری بنەماکانی بانگەواز و، بۆن و بەرامەی بانگەوازکار و، راستێتی هەڵس و کەوت و بیروبۆچوون و.. مەزنی مامۆستا.. رووناکی پەیام و.. سۆز و بەزەیی پێغەمبەر بوو..

بەڵێ.. تەنها ئەو ئامانجە بوو، بەس.

کە لەبەر رۆشنایی تیرۆژی ئەو رووناکییە چرپرپەدا سەرنجی هەندێك لە خەسڵەتە مەزنە دەگمەنەکانی بدەین کە وەلامی بروادارانی بۆ لا بانگهێشت دەکرد و، وای لێدەکردن ئامانج و رێگا و.. مامۆستا و هاورێ.. تێیدا بەدی بکەن..

چی وایکردبوو سەرگەورەکانی هۆزەکەی بەخێرایی بەرەو رووی پەیام و ئاینەکەی بێن، (ابوبکر) و (طلحة) و، (زبیر) و (عثمان کوڕی عفان) و، (عبدالرحمن کوڕی عوف)، (سعد کوڕی ابی وقاص).. بەو خێراییە دەست لە هەموو ئەو سەروەری و پلەو پایەیە هەڵگرن کە لەناو هۆزەکەیاندا هەیانبوو و، بێنە ناو ژیانێك کە پڕیەتی لە کۆسپ و تەگەرەو ناڕەحەتی و ماندووبوون و، سەختی و، ململانێ.؟!

چی وای لە لاوازو کەم دەستەڵاتانی هۆزەکەی کردبوو کە خۆ بدەنە پەنای و، بەرەو لای ئاڵا و بانگەوازەکەی رابکەن، لەکاتێکدا کە دەیانبینی بێسەروەت و سامان و.. چەکە.. تووشی ناڕەحەتی دەکرێت و خراپەکاران بەشێوەیەکی زۆر سامناك بە شوێنیەوەن، بەبێ ئەوەی کە پێغەمبەری ئازیزﷺ توانای بەرگریکردنیانی هەبێت..؟!

چی وایکردبوو دڵڕەقترین کەسی سەردەمی نەفامی -عمری کوڕی خطاب- لەکاتێکدا کە دەچوو سەری مەزنی بەشمشێرەکەی لێبکاتەوە، بەدڵێکی پڕ باوەڕەوە بگەڕێتەوەو بەهەمان شمشێر کە نوری باوەڕ پرشنگدارتری کردبوو سەری دوژمنان و ئەو کەسانەی دەریەدەریان کردبوو بپەڕێنێ..؟!

چی وای کردبوو پیاوماقوڵانی شاری مەدینەو ریش سپیانی بەرەورووی بێن تا پەیمانی پێبدەن کە لەگەڵیدا ئامادەن بچنە دەریاو مەترسییەوە، لەکاتێکدا کە دەیانزانی جەنگی نێوان ئەوان و قوڕەیش گەورەترە لە کارەسات..؟!

چی وای لێکرد بوو کە ئەو کەسانەی باوەڕی پێدەهێنن لە زیادبووندا بن و کەمبوونەوەی بۆ نەبێت، لەکاتێکدا کە ئەو بەیانی و ئێوارە پێی دەفەرموون: (لە توانامدا نیە کە هیچ سوود یا زیانێکم هەبێت بۆتان و.. نازانم چی بەسەر من و ئێوەش دێت)؟؟

چی وای لێکردبوون کە بڕوای پێبکەن و بەڕاستی بزانن کە دنیا بەڕووی ئەماندا دەکرێتەوەو، قاچی ئەمان لەنێو زێڕ و مرواریدا نغرۆ ئەبێت و.. ئەو قورئانەی کە بە پەنهانی دەیخوێننەوە، بەوپەڕی دەنگ خۆشی و بەرزییەوە لە ئاسۆبڵندەکاندا دەنگ دەداتەوە، نەك لە نەوەی ئەماندا.. یان لە دورگەی ئەماندا و بەس.. بەڵکو لەهەموو کات و ساتەکان و، لە گشت جێگایەك..؟!

چی وایکردبوو بڕوا بەو پێشهاتە بکەن کە پێغەمبەرەکەیان بۆی باس دەکردن، لەکاتێکدا کە ئەوان هیچیان لە دەوروپشت و راست و چەپی خۆیاندا بەدی نەدەکرد، جگە لە نەهامەتی و

برسێتی و.. بەردی وەك پشكۆ گەرم كراو و.. چەندەها ئەشكەنجەی نەمەتی وشك، كە سەریان وەك سەری شەیتانەكان وابوو..؟!!

چی وایكرد دڵیان پڕ ببێت لە جەسوری و دڵنیایی..؟

(محمد)ی كوڕی (عبدالله)..

كێی دیكە هەیە بۆ ئەم كارە جگە لەو..؟!

بەچاوی خۆیان هەموو چاكەو باشەكانیان بینی.

پاكی و، خۆگری و، دەستپاكی و، دامەزراو و ئازایەتیەكەیان بەدی كرد.

بەسۆزی و سەربەرزییەكەیان بینی.

ژیری و داناییان چاو پێكەوت.

بینیان خۆر خۆی ئەنوێنێ خۆنواندنی راستی و مەزنی ئەو.

بیستیان كە گەشەی ژیان بەناخی ژیاندا رێی دەكرد، لەو كاتەی كە محمد دەستی كرد بە رژاندنی نیگاكانی ئەو رۆژەی و سەرنجدانەكانی نوێنێی بەسەریدا..؟!

هەموو ئەوانەیان بینی، زۆر لەوە زیاتریش، نەك لەپشت پەردەوە.. بەڵكو رووبەڕوو، بە هەڵس و كەوت و، بەبەرچاوڕوونی و ئاشكرایی..

كاتێك عەرەبێكی ئەو سەردەمە شتێك بەدی دەكات و دەیپشكنێ، ئەوا وەكو پسپۆڕێك هەواڵت دەداتێ..

ئەوان خەڵكێكی سەرناس و قیافەتناس(القیافة والمیافة) بوون، یەكێكیان شوێن پێیەكی لەسەر رێگایەك دەبینی، پێی دەوتی: كە ئەمە جێپێی فلانی كوڕی فلانە..!

یان كاتێك بۆنی هەناسەكانی قسەكەر دەكات، دەزانێت چی لەژێر سەردایە لە راستی و درۆ..!

ئەوانە، (محمد)یان بینی و لەگەڵیدا ژیان، هەر لەو كاتەوەی هاتەبوون.

هیچ شتێكی ژیانی ئەویان لا شاراوە نەبوو.

تەنانەت قۆناغی ساوایشی، ئەوەی كە تەنها خزم و كەسی منداڵ دەیبینێت.. بەڵام هی (محمد) لەلای هەموو خەڵكی مەككە ئاشكرا و بینراو بوو..

چونكە منداڵێتی ئەو وەك هی منداڵانی دیكە نەبوو.. هەر زوو سەرنجی خەڵكی بۆخۆی راكێشا بەپێی ئەو پیاوەتیە پێشوەختەی كە بە منداڵی تێیدا دەركەوت، بەو رادەیەی كە لەبری یاریكردنی منداڵانە كاری پیاوانەی دەكرد..!!

بۆ نمونە، قورەیشیەكان باسی كوڕەزاكەی (عبدالمطلب)یان دەكرد كە حەز بەیاری و گاڵتەجاڕی منداڵانە ناكات و، هەركاتێك بەرەو لای بانگ بكرایە دەیگوت: (من بۆ ئەوە دروست نەكراوم)..!!

یان ئەو هەواڵانەیان باس دەكرد كە لە (حەلیمە)ی دایەنیەوە بیستبوویان، كاتێك كە هێنایەوە بۆ لای خزمانی، باسی سەرنجی و ئەوەی كە لەو منداڵەدا بەدی كردبوو، ئەو

ئەزموونەی کە لەگەڵیدا هەیەتی هێناویەتیە ئەو باوەڕەی کە منداڵێکی ئاسایی نیە و، نهێنییەکی وای تیادایە کە تەنها خودا ئەیزانێ، دواتریش ڕۆژگار ئاشکرای دەکات.

لاوێتیشی –ئای چ گەنجییەکی پاك و بێگەرد بوو– زیاتر ڕوون و ئاشکرا بوو.. بەجۆرێك بوو کە جێی قسە و باسی خزم و کەسی و سەرقاڵ بوونیان بوو پێوەی، زیاتر قوڵ و گەورەتر بوو.

پیاوێتیشی پڕ بە هەموو چاو و، گوێ و، دڵێك بوو.

لەسەروی هەموو ئەمانەوە، ویژدانی کۆمەڵگەو هۆزەکەی، هەموو هەڵسوکەوتێکی ڕەوا و، جوان و چاکیان بەپێی خووڕەوشت و هەڵسوکەوتی ئەو دەپێوا..!!

* * *

کەوابوو ژیانێکی ڕوون و ئاشکرا و خوێندراوەیە..

لە بێشکەوە تا مردن..

هەموو بۆچوونەکانی.. گشت هەنگاوەکانی.. تێکرای وشەکانی.. هەموو جوڵەکانی تەنانەت گشت خەون و خۆزگە و خورپەکانی دڵیشی، هەر هەموویان لە یەکەم ڕۆژی شادبوونیەوە بەدونیا دیار بوو بۆ تێکرای خەڵك.

وەك ئەوەی خوای گەورە بەهۆی ئەوەوە بیەوێت بەخەڵکی بڵێت: ئەمە پێغەمبەر و نێردراوی منە بۆ لای ئێوە، مەنطیق و ژیری بەدەستەوەیە.. ئەوەش هەموو ژیانی لەو ساتەوەی کۆرپەیەك بوو لە سکی دایکیدا..

دەسا ئێوەش بەهەموو ئەو مەنطیق و عەقڵەی کە هەتانە، بیپشکنن و، حوکمی لەسەر بدەن..

هیچ گومانێکی تێدا دەبینن..؟ هیچ فێڵێکی تێدا بەدی دەکەن..؟

ئایا هیچ جارێ درۆی کردوە.. یان هیچ کاتێ ناپاکی نواندوە..؟ یان هیچ کەرەتێك سوکایەتی کردوە..؟ یان ستەمی لەهیچ مرۆڤێ کردوە..؟ ئایا نەنگی کەسێکی هەڵماڵیوە..؟ یان دەستی بەسەر هیچ سپاردەیەکدا گرتووە کە لای دانرابێت..؟

یاخود وازی لە خزمایەتی هێناوە..؟ یا شوێنکەوتووانی خۆی فەرامۆش کردووە؟ یا وازی لە پیاوەتی و ئازایەتی هێناوە..؟ یاخود قسەی بەهیچ کەس وتووە..؟ یان بەرامبەر هیچ بتێك وەستاوە..؟؟

چاك لێی بکۆڵنەوە و، بەتەواوی بیپشکنن، ئەوەتا هیچ قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیانی پەردەو داپۆشەری لەسەر نیە..

خۆ گەر ژیانیشی هەروەك دەیبینن و بەدی دەکەن بێ خەوشی و، ڕاستی و، مەزنیە.. ئایا مەنطیق و عەقڵ ڕێدەدا کە پیاوێك ئەوە ژیانی بێت پاشی چل ساڵ لە تەمەن درۆ بکات..!

لەسەر كێش درۆ بكات..؟ خودا و.. وای دەربخات كە نێردراوی ئەوە و، هەڵبژاردوەو پاكی كردۆتەوەو نیگای بۆ ناردووە..؟؟!!

نەخێر..

هەست و زرنگی.. وا دەڵێن..

مەنطیق و عەقڵ.. وا دەڵێن..

دەسا ئێوە بەچ شێوازێك بیردەكەنەوە..؟ و چ راستیەك بەدرۆ دەخەنەوە..؟

* * *

ئەمە-بەبۆچوونی ئێمە- تێڕوانینی ئیماندارانی سەرەتا بوو بەرانبەر پێغەمبەری خوا ﷺ بە موهاجیرین و.. ئەوانەی كە شوێنی كەوتن و سەریان خست..

لە راستیدا ئەوە تێڕوانینێكی یەكلاكەرەوەو خێرابوو، كە جێگەی دوودڵی و لێڵی تێدا نەبوو.

مرۆڤێك كە ئەو هەموو ژیانە رووناك و بێگەردەی هەبێت، ناكرێت بە ناوی خوای گەورەوە درۆ هەڵبەستێت.

ئا بەم بەرچاوڕوونیە بەجێهێنراوەوە، ئەو بڕوادارانە رووناكی خوای گەورەیان بەدی كردو و شوێنی كەوتن.

بەدڵنیاییەوە سوپاسگوزاری ئەو بەرچاوڕوونیەیان دەبن كاتێك پاشتر دەبینن پێغەمبەری خوا پەروەردگاری سەری دەخات و، هەموو دورگەی عەرەبی ملكەچی دەبن و، دەروازەكانی رۆژی و دەستكەوتیان لێدەكرێتەوە، كە ئەوان حسابیان بۆ نەكردبوو، بەڵام ئەو هەر ئەوە و، تەنها دونیانەویستی و خواپەرستی و، خۆگوشین و، خۆپاراستن(ورع)ی زیاد دەكات، تا دەگاتەوە لای پەروەردگاری ئەو ساتەی پێی شاد ئەبێت، لەكاتێكدا كە ئەو لەسەر حەسیرێك خەوتووە شوێنەواری پوشەكانی لەسەر لاشەی جێدەهێڵن..!!

یان لەكاتێكدا كە دەیبینن، ئەو پێغەمبەرەی سەربەرز و سەركەوتوانە ئاڵاكانی ئاسۆ پڕ دەكەن، كاتێك دەچێتە سەر دوانگە(منبر) بە گریانەوە روو لە خەڵكی دەكات و دەفەرموێت:

(هەركەسێك قامچی من لەپشتی درلوە، ئەوە پشتی منە با تۆڵەی خۆی بكاتەوە و.. هەر كەسێك پارەی كەوتۆتە لام، ئەوە سامانی منە بێت بیباتەوە).

یان كاتێك دەبینین، كە (عباس)ی مامی داوای لێدەكات كە كارێكی پێ بسپێرێت لەو كارانەی كە بە زۆریەی موسڵمانانی ئاسایی داوە، بە نەرمیەوە بەرێی دەكات و پێی دەفەرموێت:

(مامە، سوێند بەخوا ئێمە ئەو ئیش و كارە بە كەسێك نادەین كە خۆی داوای بكات، یان سوربێت لەسەری..!)

یان ئەو کاتەی کە ئەیبینین، تەنها بەشداری هاتنی خەم و ناسۆری بۆ سەر خەڵك ناکات و بەس، بەڵکو بنەمایەك بۆ خۆی و خاوخێزانی دادەنێت کە لێی لانادەن، بەوەی کە (یەکەمین کەس بن برسیان بێت کە برسێتی رووی لەخەڵك کرد و، دواکەسیش بن لە تێربوونندا گەر خەڵکی تێری رووی تێکردن.)

بەڵێ، موسڵمانانی پێشین زیاتر سوپاسگوزاری خوا دەبن لەسەر ئەو بەرچاوروونیەیان کە بەچاکی کاروباریان لەسەرەتاوە پێ بەدی کردووە، پاش ئەوەی کە زیاتر و زیاتر سوپاسگوزاری خوای گەورە دەبن لەسەر ئەوەی کە رێنوێنی کردوون بۆ باوەڕهێنان.

هەروەها دەبینین ئەو ژیانەی چاکترین بەڵگەبوو لەسەر راستێتی خاوەنەکەی کاتێك پێی فەرموون: ((من پێغەمبەری خودام بۆ ئێوە)) بەڕاستی زۆر مەزنە و، بەو گەورەیی و بێگەردییەوە چاکترین بەڵگەیە لەسەر راستگۆیی مامۆستای مەزن و پێغەمبەری بەڕێز، ئاست و پایەی ئەو لە بڵندی و سەربەرزیدا بۆ چرکەساتێکیش دانەبەزیوەو نەکەوتۆتە لەرزە، بەڵکو وەك خۆی بووە لە کات و ساتی سەر بێشکەوە تا مردن.

ئەم ژیانەی بڕی و پاش ئەوەی گەیشتە ترۆپکی، وەك رۆژی رووناك پرشنگی داوە کە خاوەنی ئەم ژیان و پەیامە، بۆ پلەوپایە و، سامان و، سەروەری، هەوڵی نەداوە، هەر بۆیە لەکاتێکدا کە هەموو ئەوانە بەو پەیمانەشەوە هاتنە بەردەستی کە خۆی کەسی یەکەم بێت تێیدا هەموویانی رەتکردەوە و.. ژیانێکی دونیانەویستانەی تادوا چرکەساتی ژینی بردەسەر.

هێندەی تاڵەموویەك لە مەبەستە مەزنەکانی ژیانی خۆی لای نەدا..

وادەی خۆی لە پەرستش و جیهاددا نەشکاند لەگەڵ پەروەردگاری..

ئەو هێشتا نیوەشەو دانەهاتبوو هەڵدەستا و، دەستنوێژی دەشوشت هەروەکو هەمیشە لەسەری راهاتبوو لە پەروەردگاری دەپاڕایەوەو فرمێسکی دەڕشت و.. نوێژی دەکرد و دەگریا..

وەك گرد سەروەت و سامانی دەهاتە بەردەست و، نەگۆڕا و، تەنها هێندەی موسڵمانێکی زۆر هەژار و کەم دەستی لێ هەڵدەگرت.. کاتێکیش مرد زرێپۆشەکەی لە بارمتەدا بوو..!!

هەموو وڵاتان هاتنە ژێر رکێفی بانگەوازەکەیەوە و، زۆرێك لە پادشایانی سەر زەوی بەترس ولەرزەوە بەرانبەر ئەو نامانەی راوەستان کە تێیدا داوای لێکردبوون موسڵمان بن.. هێندەی گەردیلەیەك لەخۆبایی بوون و خۆبەگەورەگرتن نەیتوانیوە بەلایدا بگوزەرێت با لە دووری چەند فەرسەخێکیشەوە بێت..!

کاتێك بینی هەندێك لەوانەی دەهاتنە خزمەتی دەشێوان و ترسیان پێوە دیار بوو، پێی دەفەرموون: (لەسەرخۆ بن، من دایکم قاورمە(گۆشتی وشك کراوە)ی دەخوارد لە مەککە)..!!

هەموو دوژمنانی ئاینەکەی چەکیان فڕێدلو، ملکەچی خۆیان راگەیاند کە چی پێ باشە ولیان لێبکات، لەکاتێکدا کە دەهەزار شمشێر لە رۆژی (فتح)دا بەسەر بەرزاییەکانی مەککەوە بەدەستی موسڵمانەکانەوە دەبریسکایەوە، تەنها هێندەی بە دوژمنەکانی ئاینەکەی فەرموو:

(برۆن، ئێوە ئازادن)..!!

تەنانەت خۆی بە دوور گرت لە بینینی ئەو سەرکەوتنانەی کە ژیانی خۆی لەپێناودا بەخت کرد، لەگەڵ کاروانی سەرکەوتواندا رۆژی رزگارکردنی مەککە دەڕۆیشت، سەری نەوی کردبوو بەجۆرێك خەڵکی نەیاندەتوانی سیمای ببینن و، لەدەروونی خۆیدا سوپاسگوزاری و شوکرانەبژێری بەدەم گریانەوە بەوپەڕی شەرمەوە.. بەرەو لای پەروەردگاری باڵادەستی دووپات دەکردەوە.... هەتا گەیشتە کەعبە و، رووبەڕووی قەرەباڵغی بتەکان بووەوە، دەستی دایە تەورێك و فەرمووی:

﴿جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا﴾الإسراء:١٨.

جا ئایا هیچ جێگەی گومان ماوەتەوە لە پەیامەکەیدا..؟

مرۆڤێك هەموو ژیانی بەخت بکات بۆ بانگەوازەکەی، کە هیچ دەستکەوتێکی تایبەتی خۆی بۆ دەوڵەمەندبوون تیادا نەبێت، یان پلەوپایە، یا سەرۆکایەتی.. تەنانەت نەمریی مێژوویی کەسێتی خۆی، هیچ لەمانە لە خەیاڵی ئەودا نەبوون، چونکە ئەو تەنها بڕوای بە ژیانی لای خوای گەورە هەیە..

مرۆڤێك ژیانی لە منداڵێتیەوە تا چل ساڵی بە بێگەردی و رامان بەرێتە سەر، پاشان لە چل ساڵییەوە تا کۆتایی بە پەرستش و رێنوێنی و جیهاد و تێکۆشان، هەموو دونیا بەڕوویدا بکرێتەوە، واز لە تێکڕایی سەروەرییە پڕوپوچەکانی بهێنێت و، دەستبگرێت بە رێچکەو پەرستشی پەیامی خۆیەوە، پاش ئەوە درۆزن دەبێت..؟؟

باشە ئیدی لەچیدا درۆ بکات..؟؟

بەراستی مرۆیی ئەو.. پێغەمبەرێتی ئەو بێگەردە..!!!

* * *

وەك پێشتریش وتمان مەنطیق و ژیری لە زوودا -و تا ئەمڕۆش- چاکترین بەڵگەن لەسەر راستگۆی محمد کاتێك فەرمووی: (من پێغەمبەری خودلم).

نایەت بەخەیاڵی هیچ خاوەن تێڕوانینێکی تەواو و عاقڵمەندێکی هۆشیاردا کە مرۆڤێك ئەوە ژیانی بێت لەسەرەتاوە تاکۆتایی و درۆ بە ناوی خوای گەورەوە هەڵبەستێت..

بڕوادارانی پێشین کە خێرا چوون بەدەم بانگەوازەکەیەوە، ئەوانەی کە لەسەر رووپەڕی ئەم کتێبە جێگای شانازیمانە کە ئاشنای بەشێك لە بەسەرهات و هەواڵیان بین، لەدوای هیدایەتی خوای گەورە، بەڵگەو نیشانەی منطق و عەقڵیان پێ بووە، بەڵام چۆن بەڵگەیەك..

ئا ئەوە (محمد)ە، پێش پەیامەکەی..

ئەوەتانێ، پاش پەیامەکەی..

هەر ئەوە، ئەوەتانێ نوێنگەی مردن دەپێچێتەوە.

جا ئایا چاو لەهەموو ژیانی ئەودا هیچ بەرز و نزمییەك بەدی ئەکات..؟

نەخێر... هەرگیز.

ئێستاش.. با هەڵوێستەیەك لەسەر ساڵانی سەرەتای هاتنی پەیامەكەی بكەین.. ئەو ساڵانەی لەخۆڕاگری و راستگۆیی و مەزنیدا نمونەیان زۆر كەمە لە مێژوودا.. ! !

هەر ئەو ساڵانەش لە ساڵانی دیكە زیاتر لایەنە باشەكانی مامۆستای مرۆڤایەتی و رێنوێنی كاریانی دەرخست.. ! !

هەر ئەو ساڵانە، كردنەوەو دەستپێكی پەرتووكێكی زیندوو بوو.. پەرتوكی ژیان و پاڵەوانێتیەكانی ئەو.. نەك هەر هێندە، بەڵكو زیاتر لە هەموو شتێكی دی بێشكەی موعجیزەكانی بوو.. ! !

ئا لەو ساڵانەدا كە پێغەمبەری خودا تەنیا و بێچەك بوو، هەموو جێگایەك بەجێ دەهێڵێت كە حەوانەوەو ئاسایش و جێگیربوونی تێدا بێت و.. دێتە دەرەوە بۆ لای خەڵكی بەو شتەی كە پێی ئاشنا نەبوون، بەڵكو بەوەی كە رقیان لێی دەبوویەوە.

چوو بۆ لایان و وشەكانی ئاراستەی عەقڵیان كرد، چی لەوە ناڕەحەت و قورس ترە كە پەیام و وتارەكەی ئاراستەی عەقڵی جەماوەر بكات لەبری سۆزیان.

(محمد)ی نێردراوی خودا، تەنها ئەوەی نەكرد و بەس،.. چونكە لەوانەیە ناڕەحەتی وتارێك كە ئاراستەی عەقڵ كراوە كەم بێتەوە گەر لە بازنەی داب و نەریتی هاوبەش و ئومێدی وەك یەكدا بێت.

بەڵام كاتێك لە ئایندەیەكی دوورەوە بانگیان دەكەیت،.. كە تۆ دەیبینیی و ئەوان بەدی ناكەن و.. تۆ لەناویدا ئەژی و ئەوان هەستی پێناكەن..

بەڵێ.. كاتێك عەقڵیان دەدوێنێت و هەڵدەستێتەوە بۆ ئەوەی بنەماكانی ژیانیان لە بنەڕەتەوە بە دەستپاكی و دڵسۆزییەوە بڕوخێنێ، بێ هیچ كینەیەك، یا سەرورەری و، ئارەزوویەك، ئا لێرەوە ئەم مەترسییە تەنها كەسانی خاوەن عەزم لە چاكەكاران و پێغەمبەران نەبێت كەسی دی لە توانایدا نیە.. !

لەراستیشدا پێغەمبەری خودا پاڵەوانی ئەم هەڵوێستە و.. مامۆستای مەزنی بوو.. لەو كاتەشدا پەرستنی بت.. پەرستش بوو، دروشمەكانیشی.. ئاینی خەڵكی بوو.. پێغەمبەری خودا پەنای بۆ فێڵ كردن نەبرد—هیچ فێڵ كردنێك—.

هەوراز و نشێوی رێگا و، سەختی ئەركەكەی، تكاخوازبوون بۆی گەر ئەو زیرەكییە دەگمەنەكەی بەكاربهێنێت بۆ سازكردنی دەروونەكان بەر لەوەی كە تووشی سەرسوڕمانیان بكات بە وشەی یەكخواناسی..

ئەو لە توانایدا بوو، مافی تەواوی خۆشی بوو، كە هەستێت بە دابڕینی كۆمەڵگا لەو خوایانەی كە سەدەها ساڵ بوو دەیانپەرستن، وە بزاڤی دەورەگرتن و لەوسەرەوە گەڕانەوە(التفاف) دەست پێبكات، بەپێی توانا دوور لە رووبەڕووبوونەوەی ناهەموار و ناكاو كە

دەزانێت لە یەکەم چرکەساتدا هەموو کینەو رقی هۆزەکەی لەدژی دەجوڵێنێت و، لە یەکەم چرکەساتیشەوە ئەوان هەموو ئەو چەکانەی کە پێیانە لە دژی بەکاری دەهێنن.

بەڵام ئەوەی نەکرد.. ئەمەش بەڵگەو نیشانەیە کە ئەو پێغەمبەرە، گوێبیستی دەنگی ئاسمان بووە، لە دڵی خۆیدا پێی فەرمووە هەستە... ئەویش هەستاوە.. بەخەڵکی رابگەیەنە.. رایگەیاند بەبێ شاردنەوە و هەڵهاتن..!!

لە یەکەم چرکەساتەوە بە ناوەرۆکی پەیامەکەی و کرۆکی کێشەکەوە رووبەڕوویان بوویەوە:

(ئەی خەڵکینە، من نێردراوی خوام بۆ ئێوە، بۆ ئەوەی بیپەرستن و، هیچ شتێك نەکەن بە هاوتای ئەو.. ئەم بتانە هیچ و پوچ و ناڕەوان و، لە توانایاندا نیە سود یا زیانیان هەبێت بۆتان.)

لە چرکەساتی یەکەمەوە، بەو وشە روون و پاراوانە رووبەڕوویان بووەوە، بێپەردە، هەر لە چرکەساتی یەکەمەوە، بەرەورووی ئەو جەنگە سەختە بووەوە کە لەسەری دەنوسرا بیکات هەتاماڵئاوایی لەژیان..!!

جا ئایا بڕواداڕانی سەرەتا پێویستیان بە هیچ هاندەرێك هەبووە کە ببێتە پاڵنەر بۆیان تا بڕۆن پەیمان بەم پێغەمبەرە بدەن..!!

چ ویژدانێکی زیندوو، ئەم دیمەنە جوان و سەنگین و بێوێنەیە نایفرۆشێنێ..؟

دیمەنی پیاوێك کە خەڵکی تەنها بە خاوەن عەقڵێکی تەواو و، خورەوشتێکی کامڵ ناسیبیان، بە تەنها بەرانبەر هۆزەکەی وەستاوە بە بانگەوازێك رووبەڕوویان بۆتەوە کە لە بەرانبەر گرانی و سەختیەکەیدا چیا دێتە لەرزە و.. بە ئاشکرا و جوانی وشەکان لە دڵ و دەمی دێنە دەرەوە.. وەك ئەوەی هەموو هێزی داهاتو و توانا و نەخشەکانی لە ناخدا بڵاوبووبێتەوە، هەر وەك ئەوەی قەدەرێك بێت و پەیامی خۆی بدا بە گوێیاندا..!!

بەڵام، پێدەچێت کە ئەمە هەڵوێستەیەکی گیانی چاکە بێت، پاشی ئەوە (محمد) بگەڕێتەوە سەر خۆی و، چۆنی ئارەزوو لێیە خودای بپەرستێت و، واز لە خواوەندەکانی هۆزەکەی بهێنێت بەرێی خۆیاندا بڕۆن و، دەست لە دینی هۆزەکەی هەڵگرێت بەرێی خۆیدا بچێت..

گەر ئەم خەیاڵە لەو کاتەدا هاتبێت بە دڵی هەندێك کەسدا، ئەوا (محمد)ﷺ زۆر زوو ئەوەی پوچەڵ کردەوە.. بە تەواوی بۆ خەڵکی روون کردەوە کە ئەو پێغەمبەرەو نێردراوەو لەسەریەتی بیگەیەنێت و.. ئەوەی لە دەستدا نیە کە بێدەنگ بێت یاخود ئەو حەق و روناکییەی کە رێنوێنی ئەوی بۆ کراوە تەنها هەر بۆ خۆی بێت.

بەڵکو تێکڕای هێزەکانی جیهان و سروشت، توانای بێدەنگکردن و بەربەستی نیە، چونکە خوای گەورە خستویەتە گڕ و، دەیجوڵێنێ و، هەنگاوەکانی بەڕێوە دەبات..

قورەیش زۆر خێرا بەرپەرچیان دایەوە، وەك بڵێسەی ئاگرێك رەشەبایەکی وێرانکەر هێنابێتی..!!

ئەمجا دەستکرا بە تەنگ پێهەڵچنینی دەروونی، کە بە درێژایی تەمەنی تەنها گەورەو ڕێزلێگیراو ڕاهاتبوو.. ڕێزێك کە لەو بڵندتر نەبێت..

پێغەمبەر وەك مامۆستایەکی بێوێنە و.. بە هونەرێکی سەرسوڕهێنەرەوە.. دەستی کرد بە وتنەوەی یەکەم وانەی..

لە ڕاستیدا وێنەی ئەم دیمەنە هەموو کات و جێگایەك.. بگرە مێژووشی پڕ دەکرد. خاوەن ویژدانە زیندووەکانی نێو مەککە خۆشحاڵ دەبوون و، سەرسامی دایدەگرتن و، نزیك دەبوونەوە..

پیاوێکی سەربڵند و پایەداریان بینی..

نازانن: ئایا سەری درێژبۆتەوە و گەیشتۆتە ئاسمان و خۆی لێ داوە.. یاخود ئاسمان لەسەری ئەو نزیك بۆتەوەو شکۆداری کردوە..؟!

لەخۆبران و، خۆگری و، مەزنییان بەدی کرد..

سەرنج ڕاکێشترین شت کە بینیان و، جوانترین شت کە کەوتە بەرچاویان، ئەو ڕۆژەبوو کە پیاوماقوڵانی قورەیشی چوونە لای (أبو طالب) و پێیان گوت:

(ئەی-أبوطالب- تۆ تەمەن و ڕێز و پایەیەکت لەنێوماندا هەیە، داوای وازهێنانی برازاکەتمان لێ کردیت، بەڵام وازی لێ نەهێنایین..

ئێمە-سوێند بەخوا- خۆ ناگرین لەسەر ئەو جنێوانەی بە باوباپیرانمانی دەدا و، خەوەکانمان بە کەم دەزانێت و، نەنگی و شورەیی دەداتە پاڵ خواوەندەکانمان، یا ئەوەتا وازی پێدەهێنی لێمان، یان لەوەدا ململانێ لەگەڵ ئەو و تۆشدا دەکەین، هەتا یەکێکمان لەناو دەچێت.)..

(أبو طالب)یش هەواڵ بۆ برازاکەی دەنێرێت و پێی دەڵێت:

(برازای ئازیزم..

هۆزەکەت هاتنە لام و، لەبارەی تۆوە قسەیان بۆ کردم، من و خۆیشت بهێڵە و تووشی کارێکم مەکە توانای بەرگەگرتنیم نەبێت.).

دەبێت ئەو ڕۆژە هەڵوێستی پێغەمبەر چی بێت..؟

تەنها پیاوێك کە پشتی دەگرت، ئەوەتا وەك ئەوەی بیەوێ دەستی لێ هەڵگرێت.. یان وا دیارە، کە ئامادە نیە و توانای ڕووبەڕووبوونەوەی قورەیشی نیە کە لە هەموو لاوە کەڵبەکانیان لێتیژ کردۆتەوە..

پێغەمبەرﷺ هیچ دوودڵ نەبوو لە وەڵامدانەوە و، دەروونی بەرزی نەلەرزی.. نەخێر.. بەدوای چەند وشەیەکا نەگەڕا تا دڵنیایی خۆی پێ جێگیر بکات..

ئا لەوێدا دڵنیایی ئەو لەسەر دوانگەی مامۆستایەتی هەستایەوە و، بەهێزترین وانەی بۆ هەموو مرۆڤایەتی دا و، گەورەترین بنەماکانی دا بە گوێیاندا.

ئا بەم جۆرە قسەی کرد.. جا نازانین.. ئەمە مرۆڤێکەو دەدوێ..؟ یاخود هەموو بوونەوەرە و سروشتێك دەچرپێت..؟!

(مامە..

سوێند بەخوا، گەر خۆر بخەنە دەستە راستم.. مانگیش لە دەستە چەپم، هەتاوەکو دەست لەم کارە هەلگرم، تا خوا خۆی سەری دەخات یان لەپێناویدا تیا دەچم، هەرگیز وازی لێ ناهێنم..)..!!

سڵاو و بەزەیی و بەرەکەتی خودات لەسەر بێت ئەی پێغەمبەر، ئەی سەروەری هەموو مەردان، بەڕاستی قسەکانت مەردانە بوو..!!!

* * *

(أبوطالب) دەست بەجێ پێشەنگایەتی و هێزی خۆی و باپیرانی هاتەوە بیر و، هەربۆیە دەستی خستە سەر شانی برازاکەی و پێی وت:

(چیت پێ خۆشە بیڵێ، سوێند بەخوا بەهیچ شێوەیەك بە دەستتەوە نادەم.)..

کەواتە (محمد) پشتیوانی و پاراستنی لە مامەیەوە وەرنەدەگرت گەرچی دەیتوانی، بەڵکو (محمد) خۆی پەنادان و پاراستن و دامەزراوی بۆ کەسانی دەوروپشتی لێدەباری..!

ج مرۆڤێك لە خەڵکانی شەرەفمەند، نیمەنێکی ئاوا بەدی بکات، دڵی، بەوپەڕی خۆشەویستی و ئیمان و رێزەوە، بۆ لای ئەو پێغەمبەرە لە شەقەی باڵ نادات..؟

* * *

دامەزراوی ئەو لەسەر حەق و خۆراگری پەیامەکەیدا و.. ئارامگری لەسەر ناڕەحەتی لە پێناوی خودادا، نەك لە پێناوی خۆی و سوودمەندبوونی.

هەموو ئەوانە وا دەکات کە خاوەن هۆشە زیرەکەکان سەرسام بن و.. عەقڵە زیندووەکان بە ئاگا بێنێت و، شوێن ئەو رووناکیە بکەون کە بانگیان دەکات بۆ لای و، خێرا بەرەو لای ئەو راستگۆی دەسپاکە بڕۆن کە هاتووە پاکیان بکاتەوە و، رێنوێنیان بکات..

خەڵکی دەیانبینی ئازار لەگشت لاوە دەورەی داوە، ئەو تەنها (ابو طالب)ی مامی و (خدیجە)ی خێزانی دڵخۆشکەری بوون، ئەوانیشی لەدەستی چوو، لە چەند رۆژێکی نزیك بەیەکدا هەردووکیان مردن..

ئەو کەسەی بیەوێت رادەی دەربەدەرکردن و چەوساندنەوە و رێژەی ئەو جەنگەی قورەیش بەرانبەر پێغەمبەر بهێنێتە پێش چاو، ئەوا هێندەی بەسە کە بزانێت (ابولهب) بەتەنها خۆی، کە پیسترین و دڵڕەقترین دوژمنی بوو، رۆژێکیان ویژدانی ناڕەحەت بوو بەوەی کە دیتی، بۆیە

رایگەیاند کە ئەو پێغەمبەرە دەپارێزێ و داڵدەی ئەدات و، بەرەنگاری هەموو دوژمنکارییەك ئەبێتەوە بکرێتە سەری..!![1]

بەڵام پێغەمبەر پەنادانەکەی رەت کردەوە و بە سەربڵندی و بێداری و، رێزەوە مایەوە..

هیچ کەس نیە ئازار و ناڕەحەتی لەسەر لابدات، چونکی هیچ کەس توانای لادانی ئازاری نیە لەسەری..!!

تەنانەت (ابوبکر)ی مەزنیش، جگە لە گریان توانای هیچی دیکەی نەبوو..

رۆژێکیان پێغەمبەر رۆشت بۆ کەعبە، لەکاتێکدا بە دەوریدا دەسوڕایەوە، گەورەپیاوانی قوڕەیشی هاتن دەورەیان گرت و، پێیان وت: تۆی بە خواکانمان ئاوا و ئاوا دەڵێیت..؟

بەهێمنی وەڵامی دانەوە: بەڵێ.. من وا دەڵێم..!!

پاش ئەوە بە کراسەکەی رایدەکێشن، (ابوبکر)یش بەدەم گریانەوە تکایان لێدەکات: (پیاوێك دەکوژن تەنها لەسەر ئەوەی کەدەڵێت پەروەردگارم خوایە)..؟؟

* * *

ئەو کەسەی لە رۆژی (طائف)دا پێغەمبەری بینی، بەڵگەو نیشانەی راستگۆیی و لەخۆبوردوویی ئەو بەو جۆرەی کە لێی دەوەشێتەوە و، شایەنیەتی بینیوە..

رووی وەردەگێڕێت بەرەو لای (ثقیف) و بانگهێشتیان دەکات بۆ لای خوای تاك و خاوەن دەستەڵات..

ئایا هێندەی بەدەستی هۆز و کەس و کارەکەی خۆی تووشی بوو بەسی نەبوو..؟

وە ئایا چەندبارەی ئەو ئێش و ناڕەحەتیە بەئاگای ناهێنێتەوە، کاتێك دەچێت بۆ ناو هۆزێك کە هیچ سیلەی رەحم و خزمایەتی لەنێوان ئەم و ئەواندا نیە..؟

نەخێر.. لەهیچ کاتێکدا سەرئەنجامەکان ناچنە نێو بیرکردنەوەو بڕیاری ئەوەوە.. پەروەردگاری باڵادەستی فەرمانی پێکردووە: ((علیك البلاغ: راگەیاندنت لەسەرە)).

یان رۆژێکی دێتەوە یاد کە قسەو گاڵتەجاری هۆزەکەی زۆری بۆ هێنا و، گەڕایەوەماڵەوە، غەمگین و دڵتەنگ لە جێگەکەیدا خۆی داپۆشی، کاتێکی زانی دەنگێك لە ئاسمانەوە لە دەرگای دڵی دا، دەست بەجێ نیگای بۆ هات، ئەو فەرمانەی بەسەردا دایەوە کە پێشتر لە رۆژی نێو ئەشکەوتەکەدا بەسەریدا درا..

---

١ لە هیچ یەکێك لە پەرتوکەکانی سیرەی پێغەمبەرﷺ ئەم هەڵوێستەی (أبو لهب)م بەدی نەکردوەو نەمزانیوە هەبێت، چونکە ئەو هەر لە سەرەتای بانگهێشتەی پێغەمبەر بۆ هۆزەکانی نێو مەککە بۆ یەکتاپەرستی بەرانگاری بویەوە و نەفرەتی لێکرد و بە شێت و گەمژەی لەقەڵەم دا، بۆیەش خوای گەورە تداخلی کرد و نیگای ناردە خوارەوە و لەعنەت و نەفرەتی هەتاهەتایی لێکرد و فەرموی: (تبت یدا أبي لهب وتب) -لێکۆڵەر-

﴿يا أيها المدثر، قم فأنذر﴾المدثر:١-٢.

کەواتە راگەیەنەر و ترسێنەرە.. و

پێغەمبەرێکە هیچ باکی لە ئازار و ئەشکەنجە نیە و، بەشوێن حەوانەوەدا ناگەڕێت، دەڕوات بۆ (طائف) تا پەیامی خوای گەورە بە خەڵکەکەی بگەیەنێت..

لەوێش گەورەپیاوانی شار دەورەیان دا و، لە نزستەکانی شاری مەککەیان خراپتر بوون، منداڵ و تێنەگەیشتوەکانیان لێ هاندا، خۆیان لە پیرۆزترین خەسڵەتی عەرەب داماڵی، کە ئەویش ڕێزگرتنی میوان و پەنادانی پەناهەندەیە..

تێنەگەیشتو و منداڵەکانیان خستە شوێن پێغەمبەر ﷺ تا بەردی تێبگرن..

ئەو پیاوەی کە قورەیش پێشنیاریان بۆ کرد کە هێندەی پارە بۆ کۆدەکەنەوە لە هەموویان دەوڵەمەندتر بێت..

لە پلەو ڕێزیش بەجۆرێك بیکاتە سەرۆك و پادشایان، ئەو پێی ڕازی نەبوو، فەرمووی (من تەنها بەندەو نێردراوی خوام)..

ئەوەتا هەر ئەو لە (طائف)، خۆی خستۆتە پەناپەرژینی باخێك تا لەو گەمژانەی شوێنی کەوتون پەنای بدات.. دەستی راستیشی بەرزکردۆتەوە بۆ ئاسمان و لە پەروەردگاری دەپاڕێتەوە.. بەدەستی چەپیشی ئەو بەردانە لە دەموچاوی دەگێڕێتەوە کە تێی دەگرن، لەو کاتەدا لە بەدیهێنەر و پەروەردگاری خۆی دەپاڕێتەوە و دەفەرموێت:

(گەر تۆ تووڕە نەبیت لێم من باکم نیە، بەڵام لەگەڵ ئەمەش لێخۆشبوونت بۆ من فراوانترە)..

بەڵێ، بێگومان ئەو پێغەمبەرە چاك دەزانێت کە چۆن بەویەپەڕی ئەدەب و ڕێزەوە لەگەڵ پەروەردگاری بدوێ..!

ئەو کاتێك رایدەگەیەنێت کە باکی لە ئازار چەشتن لەپێناوی خودا نیە، لەهەمان کاتدا رایدەگەیەنێت کە پێویستیەکی زۆری بە لێبوردنویی هەیە، کە خوای گەورە پێی ببەخشێت..

لە ئاوەها هەڵوێستێکدا، شانازی بە ئارامگری و ئازایەتی خۆیەوە ناکات و، خۆی بە بەرز نیشان نادات، ئەو جۆرە خۆ بەرز نیشان دانە لەم هەڵوێستەدا لەوانەیە واتای منەت کردن بەسەر خوادا هەڵبگرێت..

(محمد)یش لەو کەسانە نیە ئەمەی لێ شاراوە بێت..

هەر لەبەر ئەوە باشترین شت لەو هەڵوێستەدا کە گوزارشت لە ئازایەتی و خۆگریەکەی بکات، دەنگی نوزانەوە و پاڕانەوەیەتی..!

بەم جۆرە داوای لێخۆشبوونی لە پەروەردگاری دەکرد و دەپاڕایەوە:

(پەروەردگارا سکاڵای کەم هێزی و، کەم توانای و، کەمیم لای خەڵك بۆ تۆ دەکەم.. ئەی بەبەزەییترینی بەزەیکاران، تۆ پەروەردگاری بێدەستەڵاتانی و، پەروەردگاری منی، دەمدەیتە دەستی کێ؟.. بۆ بێگانەیەك ڕوویەکی گرژم بداتێ؟ یان بۆ لای دوژمنێك کارو فرمانی منت

داوەتە دەستی..؟ گەر تۆ تووڕە نەبیت لێم من باکم نیە، بەڵام لەگەڵ ئەمەش لێخۆشبوونت بۆ من فراوانترە.. بەڕۆشنایی و نووری وەجهت کە هەموو تاریکیەکانی ڕووناك کردەوە و، کاروباری دونیاو دوارۆژی بەهۆوە چاك بوو، پەنادەگرم لەوەی تووڕەبیت بەسەرما بباریێ، یان خەشم و قینت لەسەرم بێت.. پەشیمانی بۆ لای تۆیە تا ڕازی ئەبیت و.. هیچ تواناو هێزێکم نیە بەتۆ نەبێ)..

ئەمە چ خۆشەویستیەکە کە پێغەمبەر بەرانبەر بانگەوازەکەی هەیەتی..؟

کەسێکی بێچەك.. ڕوو لەهەر لایەك دەکات و بۆ هەر کوێیەك دەڕوات، ڕووبەڕووی فرت و فێڵ و تەڵەکەبازی دەبێتەوە..

هیچ هۆکارێکی ژیانی دونیای نیە پشتی پێ ببەستێت، ئنجاش ئەو هەموو سووربوون و، خۆگری و خۆشەویستیەی هەڵگرتووە..

خەڵکی بینیان لە(طائف)ەوە دەگەڕایەوە بۆ (مەککە)، نە بەنائومێدی ، نە بە تێکشکاوی، بەڵکو زیاد لە ڕادە ئومێد و مژدەو خۆشحاڵی پێوە دیار بوو.

سەردانی هۆزەکانی دەکرد و، خۆی دەچووە گەڕەك و شوێنی نیشتەجێبوونیان:

ڕۆژێك بۆ لای هۆزی (كندە)..

ڕۆژێکی دی بۆ لای (بنی حنیفە)..

ڕۆژێکی کە بۆ لای (بنی عامر)..

بەو جۆرە، هۆز لە دوای هۆز..

بە هەموو ئەوانە دەڵێت:

(من نێردراوی خودام بۆ لای ئێوە، فەرمانتان پێدەکات کە تەنها خوا بپەرستن و هیچ هاوەڵپەرستێکی بۆ دامەنێن و، واز لەو بتانە بهێنن کە دەیانپەرستن).

لەلای نشینگەی هۆزە نزیکەکان، (ابولهب) شوێنی دەکەوت و بە خەڵکی دەوت: باوەڕی پێمەکەن، بەڵکو بۆ گومڕایی و سەرلێشێوان بانگتان دەکات..!!!

خەڵکی پێغەمبەری خوداﷺیان تا لەو هەلومەرجە ناڕەحەتەدا بینی، بەدوای بڕواداران و پشتیوانانیدا دەگەڕا، بەڵام ڕووبەڕووی کەللەڕەقی و دژایەتی دەبوویەوە.

تا لەو ساتەدا دەیانبینی هەموو سازشێك (مساومة) ڕەت دەکاتەوە و، ڕازی نابێت کە ئیمان نرخێکی لە دونیا هەبێت، تەنانەت ئەگەر ئەو نرخە تەنها وادەو بەڵێنێك بێت لەوەوە بۆ پلەوپایە یان دەستەڵات.

تا لە ڕۆژگارە ناخۆش و گەرمانەدا، سەردانی هۆزی (بنی عامر بن صعصعە)ی کرد، لەلایان دانیشت و باسی خودای بۆ کردن و قورئانی بۆ خوێندنەوە، لێیان پرسی:

(ئایا گەر ئێمە پەیمانمان پێدلیت لەسەر ئەو کارەی تۆ، پاشان خودا تۆی بەسەر نەیارانتدا سەرخست، ئایا لەپاش تۆ کارو فرمان بۆ ئێمە دەبێت.)؟؟

پێغەمبەرﷺ وەڵامی دانەوەو فەرمووی:

(کارو فرمان بەدەست خودایە، لە کوێی بوێت لەوێی دادەنێت)..!!
کە ئەوەیان بیست، بڵاوەیان لێکرد و گوتیان: هیچ پێویستمان بەکاری تۆ نیە..
پێغەمبەرﷺ بەجێی هێشتن و بەدوای ئەو بڕوادارانەدا دەگەڕا کە ئیمانەکەی خۆیان بەنرخێکی کەم نافرۆشن..!!

* * *

لەراستیدا خەڵك بینیان، کەسانێکی کەم بڕوایان پێهێنابوو.. لەگەڵ ئەوەشدا و، وێڕای کەمی ژمارەشیان ئەو هاودەمی و هاوەڵیی تێدا بەدی دەکردن..
لەولاشەوە قورەیش بڕیاری داوە کە دەبێت هەر هێزێك تەمبێکردنی بڕوادارانی خۆی لەئەستۆ بگرێ..
لە پڕێکدا ئازار و ئەشکەنجە وەك گەردەلولێکی شێت دابارییە سەر تێکڕای موسڵمانان و، بێباوەڕان هەموو جۆرە تاوانێکیان بەرامبەر کردن..
ئا لێرەدا ئەو شتە چاوەڕوان نەکراوە ڕوودەدا کە لە خەیاڵدا نەبوو.
(محمد) فەرمان بە موسڵمانەکان دەکات کە بۆ (حەبەشە) کۆچ بکەن و، خۆی بە تەنها دەمێنێتەوەو بەرەنگاری دوژمنکاری دەبێتەوە..
باشە بۆ خۆیشی کۆچ ناکات و، پەیامی خوای گەورە لە شوێنێکی دیکە ڕابگەیەنێت، خۆ خودا پەروەردگاری جیهانیانە و، تەنها پەروەردگاری قورەیش نیە..؟؟
یان، بۆ لەدەوری خۆی نایانهێڵێتەوە، خۆ هێشتنەوەیان سوودی مسۆگەری تێدایە.
مانەوەیان لە مەککە سەرەڕای کەمی ژمارەیان کەسانی دیکە وا لێدەکات کە بڕوا بهێنن و بێنە ناو دینی خوا.
پاشان ئەو کەسانەی کە لە خێزانە بەرز و بەهێز و خاوەن دەسەڵاتەکانی قورەیشن لەناویاندا ژمارەیان کەم نیە..
ئەوەتا بۆ نمونە لە (بنی امیە) —عثمان کوڕی عفان— و، عەمری کوڕی سعید کوڕی عاص و، خالدی کوڕی سعید کوڕی عاص.
لە (بنی اسد)یش، زبێری کوڕی عوام و، اسودی کوڕی نوفل و، یزیدی کوڕی زەمعە و، عەمر کوڕی أمیە.
لە (بنی زهرە)ش، عبدالرحمن کوڕی عوف و، عامری کوڕی ابی وقاص و، مالك کوڕی أهیب و، مطلب کوڕی أزهر..
ئەوەتا ئەوانە و کەسانی دیکەشیان لەنێودایە کە بنەماڵەکانیان ماوەیەکی زۆر لەسەر چەوساندنەوە و ئازاردانیان ئارام ناگرن.
باشە بۆ پێغەمبەرﷺ لە دەوری خۆی نایانهێڵێتەوە، تاوەکو پشتی بگرن و سەرچاوەی هێزێك بن لەبەردەستیدا..؟؟

ئا لێرەدا مەزنی (محمد)ی پێغەمبەری خوا دەدرەوشێتەوە.. ئەو ئاشووبی ناوێت و، شەڕێکی ناوخۆییشی مەبەست نیە، با ئەگەری سەرکەوتنی خۆیشی تێدا بێت، بەڵکو با تەواو لە سەرکەوتنی خۆی دڵنیاش بێت..!!

ئا لێرەدا بەزەیی و مرۆڤایەتی ئەو دەردەکەوێت، چونکە بەرگەی ئەوە ناگرێت کە ببینێت خەڵکی بەهۆی ئەوەوە ئازار دەدرێن، لەگەڵ ئەوەشدا چاك دەزانێت بڕوای وایە کە قوربانیدان باجی هەموو جیهادێکی پیرۆز و بانگەوازێکی گەورەیە، بەڵام با کاتێك قوربانی بدرێت کە هیچ دەرفەت و بواری دیکە نەمابێت.

وەلێ ئێستا، کە ڕێگایەك هەیە بۆ خۆپاراستن لە ئەشکەنجە، با مسوڵمانەکان بەو ڕێگایەدا بڕۆن.

ئەی بۆچی خۆیشی لەگەڵیان ناڕوات..؟؟

چونکە ئەو هێشتا فەرمانی کۆچ کردنی پێنەکراوە، ئێرە جێگای ئەوە.. لەسەر زەوی بتەکان..

بەردەوامیش دەبێت لەسەر هاوارکردن بەناوی خودای تاك و تەنها. و.. بەردەوامیش بەبێ بێزاری ترس و ئازار و ئەشکەنجە دەچێژێ.. چونکە ئەم ئازار ئەدرێ نەك ئەو لاواز و کەم دەستەڵاتانەی کە بڕوایان پێی هێناوە و شوێنی کەوتوون..

بەڵکو ئەو کەسە ڕێزدارانەش کە بڕوایان پێ هێناوەو شوێنی کەوتوون..!!

هەرکێ وێنەو نمونەی دامەزراوی و جوانی خۆبەخت کردنی ئاوەها دەزانێت، با بۆمانی بهێنێ..

بەراستی ئەوە بڵندییەکە تەنها کەسانی خاوەن عەزم لە پێغەمبەران و هەڵبژێردراوەکان لە توانایاندایە..!!

* * *

مرۆڤایەتی و پێغەمبەرایەتی، بەشێوەیەکی پتەو و زۆر جوان لە (محمد)دا بەیەك گەیشتوون، ئەو کەسانەیشی گومانیان لە پەیامەکەی هەبوو، گومانیان لە مەزنی و بێخەوشی ناوکرۆك و بێگەردی مرۆڤایەتیەکەی نەبوو..

ئەو خودایەشی کە دەزان+ێ پەیامەکەی لەکوێ دادەنێت، مرۆڤێکی وەهای بۆ هەڵبژارد، کە ئەوپەڕی ڕێز و بڵندی و سەربەرزی و دەستپاکی کە هەستی مرۆڤایەتی ئارەزووی دەکات، پاکانەی بۆ دەکەن..

خەڵکی گوێبیستی بوون و دەیانبینی چۆن سەرزەنشتی ئەوانەی دەکرد کە زیادەڕەوییان لە گەورەکردنی ئەودا دەکرد، بەڵکو لەوانەش کە زۆر زۆر لەزیادەڕەوی نزمتر بوون..

سەرزەنشتی دەکردن لەسەر ئەوەی کاتێك کە دەهاتە لایان و ئەوان دانیشتبوون، لەبەری هەڵدەستانەوە، پێیانی دەفەرموو:

(وەك فارسەكان هەڵئەستنەوە، كە هەندێكیان هەندێكی دیكە بە گەورە دەگرن)..

دیاردەی خۆرگیرانەكەی ڕۆژی مردنی كوڕە ئازیزەكەی كە ناوی (ئیبراهیم) بوو، موسڵمانان وایان باسدەكرد كە خۆریش بۆ مەرگی (ئیبراهیم) دڵتەنگ و غەمگین بووە، بۆیە ڕوناكی لێبڕاوە، ئا لەو ساتەدا پێغەمبەری دەستپاك و مەزن بە پەلەو خێرا دەڕوات بۆ پوچەڵكردنەوەی ئەو پڕوپاگەندەیە، بەر لەوەی كە ببێت بە ئەفسانەیەك و.. وەك وتاربێژێك لەنێو موسڵماناندا دەوەستێت و دەفەرموێت:

(خۆر و مانگ دوو نیشانە(ئایەت)ن لە نیشانەكانی خوای گەورە، لەبەر مردنی یان ژیانی كەسێك ناگیرێن.)..!!!

ئەو پارێزەرێكی پاكی عەقڵ و بیركردنەوەی خەڵكییە و، هەستانیشی لە مافدانی ئەو سپاردەیە، چاكترە لەلای و لەپێشترە بۆی لە پڕ بە هەموو زەوی سەروەری و بەرزڕاگرتن..

پێغەمبەرﷺ بە دڵنیاییەوە دەیزانی كە ئەو نێردراوە بۆ ئەوەی ژیانی مرۆڤایەتی بگۆڕێت و، تەنها پێغەمبەری قوڕەیش نیەو بەس، یان تەنها بۆ عەرەب نێردرابێت، بەڵكو پێغەمبەر و نێردراوی خوایە بۆ هەموو خەڵك..

خوای گەورەش-سبحانە- ئەو زەمینە بەرفراوانەی خستە بەرچاوی كە بانگەوازەكەی پێی دەگات و، بەیداخی ئەوی بەسەرەوە دەشەكێتەوە..

بەدڵنیاییەكی تەواویشەوە ئایندەی ئەو ئاینەی بینی كە مژدەی دابوو بە خەڵك و، لەگەڵ ئەو جاویدانیەی(خلود) كە بۆی دەبێت، تا ئەو كاتەی زەوی و ئەوەی لەسەریەتی بۆ خودا دەمێنێتەوە.. سەرەڕای هەموو ئەوانە نە خۆی و، نە ئاینەكەی و، نە ئەو سەركەوتنەی كە سەرزەوی نمونەی وەك ئەوەی بەخۆوە نەدیوە، لە خشتێكی نێو دیوارێك زیاتر نەهاتە پێش چاو..!!

ئەو مرۆڤە مەزنە ئەوەی زۆر بە ڕوون و ئاشكرایی خستەڕوو، فەرمووی:

(نمونەی من و پێغەمبەرانی پێش من، وەك نمونەی مرۆڤێكە خانوویەكی بە جوان و ڕازاوەو چاكی دروست كردبێت تەنها جێگەی یەك خشتی سووچێك لە سوچەكانی نەبێت، خەڵكی بەسەرسامیەوە بە دەوریدا بسوڕێنەوە و، بڵێن: خۆزیا ئەو خشتە دادەنرا..؟؟ من ئەو خشتەم و، دوایین پێغەمبەریشم)..!!

هەموو ئەو ژیانەی گوزەراندی..

تێكڕای جیهاد و قارەمانێتیەكانی..

سەرجەم مەزنی و بێگەردیەكەی..

هەموو ئەو سەركەوتنەی ئاینەكەی لە ژیانیدا بەدەستی هێنا و، ئەو سەركەوتنانەی كە دەیزانی پاش مردنی پێی دەگەن..

هەموو ئەوانە، تەنها خشتێكە...!

تاكە خشتێك لە دروستكردنی خانوویەكی بەرز و دێرین..!!

ئەوە خۆیەتی رایدەگەیەنێت و، دەیڵێتەوە و، سوورە لەسەر دووپاتکردنەوەی..!!

پاشان ئەو قسەیەی وەك خاکەرایی(تواضع) نەدەدایە پاڵ خۆی، تا مەزنی خۆ بەگەورەگرتنی نێو دەروونی پێ تێر بکات.

بەڵکو ئەو هەڵوێستەی وەك حەقیقەتێك دووپات دەکردەوە، کە بەرپرسیارێتی گەیاندن و راگەیاندنی بەشێك لە کرۆکی پەیامەکەی پێکدێنێت..

چونکە خاکەرایی، سەرەڕای ئەوەی کە رەوشتێك بوو لە خووڕەوشتە رەسەنەکانی (محمد)، بەڵگە و ئاماژەیەك نەبووە بۆ گەورەیی ئەو.. چونکە لە راستیدا مەزنی پێغەمبەر لە بەرزبوونەوەو رەسەنایەتیدا گەیشتبووە ئاستێك کە خۆی بەڵگەو نیشانە بێت و سەلمێنەری خۆی بێت..

* * *

ئا ئەوەتا مامۆستای مرۆڤ، دوایین پێغەمبەر.

ئا ئەوەتانێ ئەو رووناکییەی کە خەڵك بینیان وەك مرۆڤێك لەنێو خۆیاندا دەژیا و.. پاش مردنیشی هەموو جیهان بینیان، وەك راستی و باسکردنێك..

ئێستاش، ئێمە، لەسەر لاپەڕەکانی داهاتووی ئەم کتێبە، دەچینە دیداری چەند کەسێك لە هاوەڵە بەڕێزەکانی، سەرسام دەبین بە ئیمان و قوربانیدانیان و، مەزنی ئەو مەبەستەی بۆی ژیان، بەجۆرێك کە هاوشێوەی بەدی نەکەین.. هەموو هۆکارەکانی ئەو کارە ناوازانەش بۆمان روون و ئاشکرا دەبێت..

ئەو هۆکارانەی کە تەنها رووناکییەك بوو شوێنی کەوتن و بەس..

تەنها (محمد)ی نێردراوی خوا بوو، کە خوای گەورە حەق بینی و دەروون بەرزی بۆ کۆکردبووەوە و، ژیانی پێ رێزدارکرد و، ئەندازەکانی مرۆڤایەتی پێ رۆشن کرد...!!

دووەم: ئەوانەی شوێنی کەوتن.

1

# موصعەبی کوڕی عومەیر

# یەکەمین فێرکاری ئیسلام

چەند جوانە بەباسکردنی ئەم هاوەڵەی پێغەمبەر دەست پێ بکەین.
خۆشەویسترین گەنجی قورەیش و، لە هەموویان جوانتر و، بەرێزتر بوو.. مێژوونووس و سەریردەگێڕەوان لەباسی گەنجێتیدا دەڵێن: (بۆنخۆشترین کەسی نێو مەککە بوو)..
لە نازو نیعمەتدا لەدایك بوو، گۆشکراو، لەسێبەریدا پێگەیشت..
لەوانەیە لەنێوان گەنجانی مەککەدا کەسی دیکە نەبووبێت وەك (موصعەبی کوڕی عومەیر) لەلایەن دایك و باوکیەوە نازی کێشکرابێ.
ئەو گەنجە ناسك و، نازدار و خۆشگوزەرانە، قسەوباسی سەرزاری ئافرەتانی مەککە و، گەوهەری کۆڕ و دانیشتنەکانیان بوو، ئایا دەکرێت بگۆڕێ و ببێت بە یەکێك لە ئەفسانەکانی ئیمان و قوربانیدان....؟؟
سوێند بەخوا لە هەواڵێو.. دەنگ و باسی (موصعەبی کوڕی عومەیر) یان (موصعەبی بەخێر) هەروەك لەنێو هاوەڵاندا ناسرابوو جوانتر نیە ..!!
ئەمیش یەکێکە لەو کەسانەی ئیسلام گۆشی کردن و (محمد)ﷺ پەروەردەی کردن..
بەڵام چ کەسێك بوو...؟
چیرۆك و بەسەرهاتی ژیانی رێز و شانازییە بۆ هەموو نەوەی مرۆڤایەتی ...
ئەم گەنجە رۆژێکیان گوێی لەو قسەو باسانە بوو کە خەڵکی مەککە لە (محمد)ی دەست پاکەوە گوێبیستی دەبوون...
ئەو (محمد)ەی کە دەڵێت خوای گەورە وەك مژدەدەر و ترسێنەر و، بانگەوازکار بۆ پەرستنی خودای تاك و تەنیا ناردویەتی..
لەکات و ساتێکدا خەڵکی مەککە شەو و رۆژیان دەگوزەراند و تەنها خەم و قسەو باسێك سەرقاڵی کردبن پێغەمبەرﷺ و ئاینەکەی بوو، ئەم گەنجە نازدارەی قورەیشیش لەهەموو کەس زیاتر گوێی لەو قسەوباسانە دەگرت.
چونکە ئەو سەرەڕای کەمی تەمەنی و تازەپێگەیشتویی، رازێنەر و جوانیبەخشی کۆڕ و دانیشتنەکان بوو، هەموو دانیشتنێك سوور بوون لەسەر ئەوەی (موصعەب) یەکێك بێت لە ئامادەبوانی، چونکە جوانی روخسار و عاقڵمەندی و زیرەکی لە خەسڵەتەکانی (ئیبن عومەیر) بوون کە دڵ و دەروون دەروازەیان بۆ واڵا دەکرد..
لەنێو ئەوەی بەرگوێی کەوتبوو بیستبووی کە پێغەمبەر و ئەوانەی لەگەڵیدان و بروایان هێناوە پێی، دوور لە ئازار و ئەشکەنجەو ئاگاداری قورەیش.. لە (صفا) لە ماڵی (ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەم) دانیشتن و کۆبوونەوەی خۆیان ساز دەکەن، دوودڵی و، مانەوە و،

چاوەڕوانیکردنی زۆری نەخایاند و، ئێوارەیەکیان بەرەو ماڵی ئەرقەم بە کەیف و خۆشیەوە کەوتە رێ..

لەوێندەر، پێغەمبەر بە هاوەڵانی شاد دەبوو و، قورئانی بۆ دەخوێندن و، نوێژی بۆ خودای گەورەو باڵادەست لەگەڵ دەکردن..

هێشتا موصعەب، شوێن و جێی خۆی نەگرتبوو، ئایەتەکانی دڵی پێغەمبەر کە لەسەر لێوی دەدرەوشانەوە و، پاشان بەرەو گوێچکە و دڵەکان رێگایان دەگرت، لەو ئێوارەیەدا دڵی (ئیبن عومەیر) دڵێکی وادەپێدراو بێت..!!

هێندەی نەمابوو لە خۆشیان باڵ بگرێت و، لە کەیف و خۆشیدا جێگای بەخۆی نەدەگرت..

ئا لەو ساتەدا پێغەمبەری ئازیز دەستی راستی پیرۆزی بەوپەڕی سۆزەوە بۆ درێژ کرد هەتا بەر سنگە خرۆشاوەکەی و، دڵە ئارام و جێگرەکەی کەوت، قوڵی ئارامبەخشیەکەی هێندەی قوڵی زەریاکان بوو.

لە چاوتروکانێکدا بڕوای هێناو موسڵمان بوو، بە جۆرێ دیاربوو کە داناییەکەی چەندقاتی تەمەنی ببێت و، نەخشەسازییەکی وای لابێت کە رێڕەوی ژیان بگۆڕێت..!!

دایکی موصعەب کە ناوی (خوناسی کچی مالك) بوو، خاوەن کەسێتییەکی بەهێز و دیار بوو، شەرم لێکردنیشی گەیشتبووە ئاستی ترس و سام..

لەو کات و ساتەدا کە (موصعەب) موسڵمان بوو جگە لە دایکی هیچ هێزێکی دیکە نەبوو لەسەر زەویدا کە سڵی لێبکات یا لێی بترسێ.

گەر هەموو مەککە بە گشت بت و پیاوماقوڵان و بیابانیەوە، ببوونایەتە ناڕەحەتکاری رکابەر بەرانبەری، (موصعەب) هیچ باکی لێیان نەبوو..

بەڵام دژایەتی دایکی، ئەمەیان ئەو ناڕەحەتیەیە کە بەرگەی ناگیرێ..!

خێرا بیری کردەوە و، بڕیاری دا موسڵمان بوونەکەی ئاشکرا نەکات تا خوای گەورە دەروی لێدەکاتەوە..

پاش ئەوە بەردەوام هاتوچۆی ماڵی ئەرقەمی دەکرد و، لای پێغەمبەری خوداﷺ دادەنیشت، سۆمای چاوی بە ئیمانەکەی و دووربوونی لە توڕەبوونی دایکی کە هەواڵی موسڵمان بوونی نازانێت رۆشنتر دەبوو..

بەڵام شاری مەککە، بەتایبەت لەو رۆژگارەدا، نهێنی تێدا ون نەدەبوو، قورەیش چاوو گوێیان بڕیبووە هەموو رێگایەك و، شوێن هەموو جێگەپێیەکی سەر لمە گەرم و نەخشاوەکە دەکەوتن..

جارێکیان (عثمانی کوڕی طلحە) ئەوی بینی کە بە نهێنی بۆ ماڵی (ئەرقەم) دەچوو.. جارێکی دیکەش چاوی پێی کەوتبوو کە وەك (محمد) نوێژی دەکرد، بە پەلەو زۆر خێرا وەك

رەشەبای تیژڕەوی بیابان، بەرەولای دایکی موصعەب رۆیشت و، ئەو هەواڵەی پێدا کە ئارامی لەبەر بڕی..

موصعەب لەبەردەم دایکی و، هۆزەکەی و، پیاوماقوڵانی مەککە کە لە دەوری کۆبووبوونەوە راوەستا، بەوپەڕی دڵنیایی حەق و خۆڕاگرییەوە، ئەو قورئانەی بۆ خوێندنەوە کە پێغەمبەر بەهۆیەوە دڵەکانیان دەشوات و، پڕ دانایی و ڕێز و، داد و تەقوای دەکات.

دایکی ویستی بە زللەیەکی توند بێدەنگی بکات، بەڵام ئەو دەستەی کە وەك تیر ئاراستەی کرد، زۆری پێنەچوو لە ئاست ئەو رووناکیەدا کە روخساری جوانتر و بەهاو رێزێکی وەهای پێدابوو رێزلێگرتنی دەسەپاند بەسەردا و، هێمنی و لەسەرخۆییەکی قەناعەت پێکەری پێبەخشیبوو، خاوبوویەوە..

بەڵام، ئاخۆ دایکی لەژێر پاڵەپەستۆی سۆزی دایکایەتیدا واز لە لێدان و ئازاردانی دێنێت، ئەو لە توانایدایە بە شێوازێکی دیکە تۆڵەی وازهێنانی لە خواوەندەکان لێبکاتەوە..

بەمجۆرە دایکی بردیە سوچێك لە سوچەکانی ماڵەکەی و، لەوێ بەندی کرد و، بەچاکی لەسەری دایخست، بەو شێوەیە بە بەندکراوی مایەوە، هەتا هەندێك لە بڕواداران کۆچیان کرد بۆ خاکی حەبەشە، کە ئەو هەواڵەی بیست بیری لەخۆی کردەوە و، دایکی و پاسەوانەکانی خافڵاند و، ئەویش بەرەو حەبەشە کۆچی کرد..

ماوەیەك لەگەڵ هاوەڵەکانیدا لە حەبەشە مایەوە، پاشان گەڕایەوە بۆ مەککە و، بۆ جاری دووەم لەگەڵ چەند هاوەڵێکیدا بە فەرمانی پێغەمبەر بەرەو حەبەشەو بەوپەڕی گوێڕایەڵییەوە کۆچی کرد.

بەڵام (موصعەب) لە حەبەشە بێت یا لە مەککە، ئەزموونی ئیمانداریەکەی لەکاردا بەرزو سەرکەوتووە لە هەموو شوێن و جێیەك و، لە پوختەکردنی ژیانی بووبوویەوە لەسەر ئەو رەوتە نوێیەی کە محمد نمونە هەڵبژاردەکەی پێدابوون و، موصعەب دڵنیابوو لەوەی کە ژیانی وای لێهاتووە کە شایانی ئەوەبێت گیانی خۆی لەپێناوی پەروەردگاری باڵادەست و دروستکاری مەزنیدا بکاتە قوربان..

رۆژێکیان بەرەو لای هەندێك موسڵمان چوو کە لە دەوری پێغەمبەرﷺ دانیشتبوون، کاتێك کە چاویان پێی کەوت سەریان نەویکرد و چاویان داخست و فرمێسکیان لەچاو هاتە خوارێ، لەبەر ئەوەی بینیان.. کراسێکی شڕی کۆنی لەبەردابوو، دیمەن و روخساری بەر لە موسڵمان بوونیان هاتەوە یاد، ئەو دەمەی کاڵای وەك گوڵی ناو باخچە درەوشاوە و، شەنگ و، بۆنخۆش بوو..

پێغەمبەری خوداش دانایانە و، سوپاسگوزارو خۆشەویستانە سەرنجی دا و، زەردەخەنەیەکی رێز و خۆشەویستی لەسەر لێوەکانی درەوشایەوە و، فەرمووی:

(پێشتر ئەم موصعەبەم بینی، لەنێو شاری مەککەدا هیچ گەنجێکی دیکە نەبوو وەك ئەم نازدار بێت لای دایك و باوکی، لەبەر خۆشەویستی خوداو پێغەمبەرەکەی وازی لەوانە هەمووی هێنا)..!!

دایکی پاش ئەوەی کە بێئومێد بوو لە گەڕانەوەی، لە هەموو ناز و نیعمەت و خۆشییەك بێبەشی کرد و، نەیدەهێلا کە ئەوانەی پشتیان لە خواوەندەکان کردوەو بەر نەفرینیان کەوتوون، نانی ئەو بخۆن، هەتا گەر ئەو مرۆڤە کوڕی خۆیشی بێت..!!

دواقۆناغی هەوڵیشی لەگەڵیدا ئەو کاتەبوو کە موصعەب لە حەبەشە گەڕابوویەوە، هەوڵیدا جارێکی کە بەندی بکاتەوە، لای خۆیەوە سوێندی خوارد گەر ئەو هەوڵی بەندکردنی بدات ئەوا ئەم هەموو ئەو کەسانە دەکوژێت کە بۆ بەندکردنی پەنایان بۆ دەبات..

دایکی بەچاکی ئاشنای دەروون بەرزییەکەی بوو، زانی هەرچی بڵێت دەییاتە سەر، بۆیە بە گریانەوەماڵئاواییان لەیەکدی کرد..

ساتی ماڵئاوایی و لەیەکدابڕان سووربوونی سەرسوڕهێنەری دایکی لەسەر کوفر لەلایەك و سووربوونی گەورەتری کوڕەکەی لەسەر باوەڕ لەلایەکی دیکەوە ئاشکرا کرد.. لەکاتێکدا کە لە ماڵ دەری دەکرد پێی گوت: بڕۆ بە ڕێی خۆتدا.. ئیدی من دایکی تۆ نیم..

ئەو لە دایکی نزیك بوویەوەو گوتی:

(دایەگیان، ئامۆژگاریت دەکەم و، بەزەییم بەتۆدا دێتەوە، دەی بڕوا بێنەو بڵێ: أشهد أن لا اله الا الله، وأن محمد رسول الله)..

دایکی بە توڕەیی و رقەوە وەلامی دایەوەو گوتی: سوێند بە ئەستێرەکان، هەرگیز نایەمە ناو ئاینی تۆ، چونکە بیروبۆچوونم لەق دەبێ و، عەقڵیشم لاواز..!!

بەو جۆرە (موصعەب) لەو خۆشگوزەرانیەی کە تێیدا دەژیا هاتە دەرو ژیانێکی پڕ لە تەنگی و بێنانی و هەژاری بەسەردا هەڵبژارد... ئەو گەنجە بۆنخۆشە وای لێهاتبوو بە زبرترین جل و بەرگەوە دەبینرا، رۆژێك تێر و، چەند رۆژێ برسی، بەلام گیانی درەوشاوەی بە بەرزی عەقیدە و، وابەستە بە روناکی خوای گەورەوە، کردبوویە مرۆڤێکی دیکە کە چاوەکان پڕ لە گەورەیی و دەروونەکان پڕ لە جوانی دەکات..

* * *

ئا لەو کاتەدا، پێغەمبەری ئازیز بۆ مەزنترین کاری ئەو ساتەی هەڵبژارد، کە ببێتە نێردراو (سفیر)ی بۆ شاری مەدینە و، ئەو ئەنصارییانە لە ئاینی تێبگەیەنێت کە ئیمانیان بە پێغەمبەر هێناو لە عەقەبە بەیعەتیان پێدا و، خەڵکانی دیکەشیان بۆ لای ئاینی خودا بانگ بکات و، شاری مەدینە بۆ رۆژی هیجرەتی گەورە ساز و ئامادە بکات..

لەنێو هاوەڵانی پێغەمبەردا ئەو کاتە کەسانی لەو بەتەمەنتر و پایەدارتر و، خزمی نزیکی پێغەمبەر هەبوو.. بەلام پێغەمبەر (موصعەبی خێر)ی هەڵبژارد و، چاك دەیزانی کە

مەترسیدارترین کێشەی ئەو ساتەی پێ سپاردبووە و، ئایندەی ئیسلامی لەنێو شاری مەدینەدا داوەتە دەست کە پاش کات و ساتێکی کەم دەبێتە خانەو مالّی کۆچکردن و، پێگەو شوێنی بانگەواز و بانگخوازان و، مژدەدەران و موجاهیدان..

(موصعەب)یش پشت ئەستوور بەو بیر و تێگەیشتنە بلیمەت و ئاکارە جوانەی خوای گەورە پێی بەخشیبوو ئەو سپاردەیەی گرتە ئەستۆ و.. بە دونیانەویستی و بەرزی و دڵسۆزییەکەی دڵی خەڵکی مەدینەی بۆ لای خۆ راکێشا و، پۆل پۆل و دەستەدەستە هاتنە نێو ئیسلامەوە..

ئەو رۆژەی کە پێغەمبەر ئەوی بۆ مەدینە نارد تەنها دوازدە موسڵمانی لێبوو کە پێشتر لە پەیمانی عەقەبەدا بەیعەتیان بە پێغەمبەر دابوو، بەڵام هێشتا چەند مانگێك نەبوو هاتبووە ناویان، ئەو خەڵکە هاتن بە دەم بانگەوازی خوداو پێغەمبەرەکەیەوە..!!

لە وەرزی داهاتووی حەجدا بۆ پەیمانی عەقەبە، موسڵمانانی مەدینە شاندێکیان بە نوێنەرایەتی موسڵمانانی شارەکەیان نارد بۆ شاری مەککە بۆ دیداری پێغەمبەر کە ژمارەی ئەندامەکانی حەفتا بڕواداری پیاو و ئافرەت بوو و.. لەژێر سەرکردایەتی مامۆستا و نێردراوی پێغەمبەر بۆ لایان (موصعەبی کوڕی عومەیر)..

بەڕاستی (موصعەب) بە لێهاتوویی و ئاکارجوانی خۆی سەلماندی کە پێغەمبەری خوا ﷺ زانیوویەتی چۆن پیاوێکی هەڵبژاردووە..

(موصعەب)بەچاکی لە پەیامەکەی گەیشتبوو و لە سنوورەکانی شارەزابوو.. زانیبووی کە ئەو بانگەوازکارە بۆ لای خودا و، مژدەبەخشە بەو ئاینەی کە خەڵکی بەرەو رووناکی رزگاربوون و، رێگای تەواو و راست و دروست بانگ دەکات و، ئەمیش وەك پێغەمبەرەکەی کە بڕوای پێی هێناوە، تەنها گەیاندنی لەسەرە..

لەوێ میوانی (ئەسعەدی کوڕی زرارە) بوو، پێکەوە دەچوونە سەردانی هۆزەکان و ماڵ و کۆڕ و دانیشتنەکان و، ئەوەی لە قورئانی پیرۆز ئاشنای بوون بۆ خەڵکیان دەخوێندەوەو، بەوپەڕی نەرم و نیانیەوە بەو خەڵکەیان رادەگەیاند کە خودای تاك و تەنها (الله)یەو بەس.

لەم پێناوەدا تووشی هەڵوێستی ناڕەحەتی وەها بوو، گەر زیرەکی و زرنگی عەقڵی و، بەرزی رۆحی نەبوایە، لەوانەبوو کە ببێتە هۆی تیاچوونی خۆی و ئەوانەشی کە لەگەڵیدابوون.

رۆژێکیان لە کاتێکدا کە ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد، لەپڕێکا (ئوسەیدی کوڕی حوضەیر) سەرۆکی (بنی عبدالاشهل)ی شاری مەدینە، حەربەکەی بە دەستەوە گرتبوو، بە رق و قینێکی زۆرەوە بەرەورووی ئەو کەسە دێت کە هۆزەکەی لە ئاینەکەیان هەڵدەگەڕێنێتەوە.. داوایان لێدەکات کە واز لە خواوەندەکانیان بهێنن و، دەربارەی تاك و تەنهایی خوا قسەیان بۆ دەکات کە پێشتر هیچیان لەبارەوە نەزانیوە و، لەسەری رانەهاتوون..!

خواوەندەکانی ئەوان شوێن و جێیان جێگیرە، گەر یەکێکیان پێویستی پێی هەبوایە شوێنەکەی دەزانی و رووی تێدەکرد و بەرەولای دەچوو و، ئەو زیانەی رووی تێکردبوو بۆی

لادەبرد و ئەویش بەدەم پاڕانەوەکەیەوە ئەهات.. پێشتر ئاوا بیریان دەکردەوە و بە خەیاڵیاندا ئەهات.

بەڵام خودای محمد کە ئەم نێردراوی ئەوە بۆ لایان بانگیان دەکات بۆ لای ئەو خودایە، هیچ کەس نازانێ شوێنی لە کوێیە و، کەس ناتوانێ کە ببینێت..!

کاتێك ئەو موسڵمانانەی کە لە دەوری (موصعەب) دانیشتبوون بینیان (ئوسەیدی کوڕی حوضەیر) بە خەشم و قینێکی دڕندانەوە بەرەو لایان دێت، ترسیان لێنیشت، بەڵام (موصعەبی خێر) لە شوێنی خۆی خۆڕاگر و، هێمن و، لەسەرخۆ مایەوە..

(ئوسەید) بە توڕەییەوە بەرانبەری وەستا و، رووی دەمی کردە ئەو و (ئەسعەدی کوڕی زرارە) و وتی:

(چی ئێوەی گەیاندۆتە ئێرە، لاوازەکانمان گێل و نەفام دەکەن..؟ ئەگەر دەتانەوێ لە ژیاندا بمێنن، بڕۆن لای ئێمە مەمێننەوە)..!!!

ئا لێرەدا وەك هێوری و بەهێزی دەریا..

وەك هەڵهاتنی گزنگی بەیان و ئاوابوونی.. رووی گەشی (موصعەبی خێر) درەوشایەوەو بە زمانێکی شیرین پێی وت:

(یەکەم جار لامان دانیشە و گوێڕاگرە..؟! گەر قسەکانمانت بە دڵ بوو قبوڵی دەکەیت،، خۆ ئەگەر رقیشت لێی بوو ئەوا واز دەهێنین لەوەی حەزی پێناکەیت).

الله اکبر.. چەند سەرەتایەکی جوانە کۆتایی پێشاد ئەبێت...!

(ئوسەید) پیاوێکی داناو ژیر بوو.. ئەوەتا سەیر دەکات (موصعەب) ویژدانی خۆی دەکاتە دادوەر و.. داوای لێدەکات تەنها گوێڕادێرێت.. گەر بڕوای پێی هەبوو، ئەوا لەسەر بۆچوونی خۆی وازی لێدێنێت، گەر رازیش نەبوو بە قسەکانی ئەوا (موصعەب) بێ زەرەرو زیان ئاوایی و هۆزەکەیان بەجێدەهێڵێت و بەرەو لای ئاوایی و هۆزێکی دیکە دەچێت.

(ئوسەید) کە گوێی لەوە بوو گوتی: راست دەکەیت.. حەربەکەی فڕێدایە سەر زەویەکەو دانیشت گوێبگرێت..

هێندە نەبوو (موصعەب) دەستی کردبوو بە قورئان خوێندن و، راڤەی ئەو بانگەوازەی کە (محمد کوڕی عبدالله)ﷺ هێناویەتی، رووی (ئوسەید) لەگەڵ واتای وشەکاندا گەشایەوە، زیاتر جوانتر دەبوو.

هێشتا (موصعەب) قسەکانی تەواو نەکردبوو، (ئوسەیدی کوڕی حوضەیر) هاواری لەو خەڵکەکەی دەرویەری کرد و وتی:

(قسەی لەمە جوان و راستتر نیە.. باشە ئەوەی بیەوێت بێتە ناو ئەم ئاینەوە ئەبێت چی بکات..؟؟)

خەڵکەکە بە (لا الە الا الله)یەك وەڵامیان دایەوە زەوی لەرزاندەوە، پاشان (موصعەب) پێی وت:

(لاشەو جل و بەرگەکانی بشوات و، شاهێدی بدات کە هیچ خوایەك نیە جگە لە -الله-).
(ئوسەید) بۆ ماوەیەکی کەم لای ئەوانی بەجێهێشت و گەڕایەوە، سەری ئاوی لێدەچۆڕا، راوەستاو رایگەیاند کە (أشهد أن لا اله الا الله، وأن محمداً رسول الله)..
هەواڵەکە وەك رووناکی بڵاوبوویەوە.. دواتر (سەعدی کوڕی مەعاذ)یش هات و گوێی لە (موصعەب) گرت و بڕوای هێنا و، موسڵمان بوو، دوای ئەویش (سەعدی کوڕی عوبادە)..
موسڵمان بوونی ئەوانەش بوویە خێر و بەرەکەت و، خەڵکی شاری مەدینە بە یەکدیان دەوت: باشە کە (ئوسەیدی کوڕی حوضەیر) و (سەعدی کوڕی مەعاذ) و (سەعدی کوڕی عوبادە) موسڵمان بووبن، ئێمە بۆ دوابکەوین..؟ دەبا خێرا بەرەو لای (موصعەب) بڕۆین و، ئێمەش لەگەڵیدا ئیمان بهێنین، ئەوەتا ئەو خەڵکە وا باس دەکەن کە حەق و راستی دەڵێت..!!

* * *

یەکەم نێردراوی پێغەمبەرﷺ سەرکەوتنێکی بێوێنەی بەدەست هێنا، سەرکەوتنێك کە شایستەی بێت..
رۆژان و ساڵ تێپەڕین و، پێغەمبەر و هاوەڵانی کۆچیان کرد بۆ مەدینە، قورەیش بەردەوام رق و کینە لە دڵیاندا پەنگی دەخواردەوە و، کەلوپەلی ناهەقیەکەی خۆیان ئامادە دەکرد، بۆ ئەوەی بەردەوام بن لەسەر راوەدونانی بەندەچاکەکانی خوا و.. ئەوەبوو غەزای بەدر روویدا و، تێیدا بەجۆرێك تەمبێ کران کە ئارامیان نەمێنێ و، هەوڵی تۆڵە سەندنەوە بدەن و، غەزای (ئوحود) بەرپابوو.. موسڵمانان خۆیان ساز و ئامادەکرد و، پێغەمبەرﷺ لەنێوەندی ریزەکانیدا راوەستا و سەرنجی سیمای بڕوادارەکانی دەدا، تا یەکێکیان لەنێودا هەڵبژێرێت بۆ هەڵگرتنی ئاڵاکە.. (موصعەبی خێر)ی بانگ کرد.. هاتە پێشەوەو ئاڵاکەی هەڵگرت..
ئەو جەنگە ترسناکە دەستی پێکرد و، کوشتار گەرم بوو، تیرهاوێژەکان سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەریان کردﷺ، کاتێك بینیان وا بێباوەڕان بە دۆڕاوی بەرەو دواوە دەکشێنەوە، شوێنەکانی خۆیان لەسەر بەرزایی کێوەکە بەجێهێشت، بەڵام زۆری نەبرد ئەو کارەی ئەوان سەرکەوتنی موسڵمانانی گۆڕی بۆ شکست.. موسڵمانان سەرسام بوون کە بینیان سوارەکانی قورەیش لەسەر کێوەکەوە بۆیان دێنەوە و، بە شمشێرە تینوە شێتەکانیان هێرشیان بۆ دێنن..
کاتێك بینیان پشێوی و بیم ریزی موسڵمانانی پارچەپارچە کرد، خێرا بەرەو لای پێغەمبەری خواﷺ چوون تا بیکوژن..
(موصعەبی کوڕی عومەیر) هەستی بەو مەترسیە زۆرە کرد و، ئاڵاکەی بەرزکردەوە و، وەك نەڕەی شێر الله اکبری کرد و، بەردەوام دەهات و دەچوو و پەلاماری دەدا.. هەموو هەوڵێکیشی بۆ ئەوە بوو کە سەرنجی دوژمنان رابکێشێت و لە پێغەمبەریانﷺ دوور بخاتەوەو بەخۆیەوە

سەرقاڵیان بکات و، سوپایەکی تەواوی لەخۆی پێکهێنا.. بەڵێ، (موصعەب) بە تەنها جەنگا وەك ئەوەی کە سوپایەکی بێشومار بێت..

دەستێکی ئاڵاکەی بە پیرۆزی گرتبوو..

دەستەکەی دیکەشی بەوپەڕی هێزەوە شمشێری پێدەوەشاند.

بەڵام دوژمنان لەسەری زۆر بوون و، دەیانویست بەسەر لاشەکەیدا بڕۆن تا دەگەنە پێغەمبەر..

با گوێ بۆ شاهێدێکی ئامادەبوو راگرین تا ئەو دوا دیمەنی ژیانی (موصعەب)ی مەزنمان بۆ باس بکات..!!

(ئیبن سەعد) دەڵێت: (ئیبراهیمی کوڕی محمدی کوڕی شرحبیل العبدری) هەواڵی داینێ کە لە باوکی بیستووە:

(موصعەبی کوڕی عومەیر لە رۆژی ئوحوددا ئاڵاکەی هەڵگرتبوو، کاتێك موسڵمانان هەڵهاتن، ئەو هەر لە شوێنی خۆی بوو، (ابن قمیئە) کە سوارچاکێك بوو بەرەورووی هات و لەدەستی راستی دا و پەڕاندی و، (موصعەب) دەیگوت: (وما محمد الا رسول قد خلت من قبله الرسل)، بە دەستی چەپەی ئاڵاکەی گرتەوەو نوشتایەوە بەسەریدا، ئەمجارەیان دای لە دەستی چەپی و ئەویشی پەڕاند، ئەمجا بە هەردوو شانی ئاڵاکەی گرت بە سنگیەوەو دەیگوت: (وما محمد الا رسول قد خلت من قبله الرسل).

سێیەم جار رمێکی تێگرت و پێکای و لەجەستەی چەقی، (موصعەب) کەوت و ئاڵاکەش کەوت).

(موصعەب) کەوت و.. ئاڵاکەش کەوت..!!

خشڵی شەهادەت و، ئەستێرەی شەهیدان کەوت..!!

کەوت، پاش ئەوەی لە جەنگی قوربانیدان و ئیماندا پاڵەوانێتیەکی مەزنی نواند..

ئەو وای گومان دەبرد گەر بکەوێت، رێگای بکوژان بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ لە بەرگریکار و پارێزەران چۆڵ دەبێت..

بەڵام ئەو لە مەزنی خۆشەویستی پێغەمبەر و مەترسی لەناوچوونی، گیانی خۆی بەخشی، کاتێك رۆشت و لەگەڵ هەموو لێدانێکی شمشێردا کە باڵێکی دەپەڕاند دەیووت:

﴿وما محمد الا رسول قد خلت من قبله الرسل﴾ال عمران:١٤٤.

ئەو ئایەتەکە لەپاش ئەو بە وەحی هاتەخوارەوەو دووبارەی کردەوە و، تەواوی کرد و، کردیە قورئانێك بخوێنرێتەوە..

* * *

پاش کۆتایی هاتنی ئەو جەنگە تاڵە، لاشەی ئەم شەهیدە تێکەیشتووەیان بە راکشاوی دۆزییەوە، دەم و چاوی کەوتبووە سەر ئەو خاکەی کە تێکەڵ بە خوێنەپاکەکەی بووبوو..

وەك ئەوەی بترسێ كه جەستەی بێگیانیشی پێغەمبەر ببینێت خراپەیەكی تووش ببێت، دەم و چاوی خۆی شاردبۆوه هەتا ئەوەی لێی دەترسا و خۆی لێدەپاراست نەیبینێت..!!

یان وەك ئەوەی شەرم بكات كه شەهید بووە بەر لەوەی دڵنیابێت له دەربازبوونی پێغەمبەری خوا و، پێش ئەوەی كاری پارێزگاریكردن و بەرگری لێكردنی تا كۆتایی ئەنجام بدات..!!

بۆ تۆیه پاداشتی لای خودا ئەی (موصعەب).. ئەی ئەو كەسەی باسكردنت ژیان بۆنخۆشتر دەكات...!!!

* * *

پێغەمبەر و هاوەڵانی هاتن و بەسەر جێگای شەڕەكەدا دەگەڕان و ماڵئاواییان له شەهیدەكان دەكرد، لەلای جەستەی (موصعەب)دا، بەخوڕ فرمێسك هاتنه خوارێ.

(خەبابی كوڕی ئەرەت) دەڵێت:

((لەگەڵ پێغەمبەری خوداﷺ لەپێناوی خوادا كۆچمان كرد، مەبەستمان ڕەزامەندی خوابوو، پاداشتمان كەوته لای خودا، تیاماندا بوو كه ڕۆیشت و، هیچی له پاداشتەكەی له دونیا دەست نەكەوت، (موصعەبی كوڕی عومەیر) یەكێك بوو لەوانه، لەڕۆژی ئوحوددا كوژرا، هیچی نەبوو بیكەین به كفنی تەنها جاجمێك نەبێت.. كاتێك سەریمان پێ دادەپۆشت، قاچەكانی دەردەكەوتن، كه قاچەكانمان پێ دادەپۆشی سەری دەردەكەوت، پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی پێمان: وای لێبكەن سەری دابپۆشێت و قاچەكانیشی به سوڕناتكه دابپۆشن..))

وێڕای ئەو ئازاره غەمگینه قوڵەی كه شەهید بوونی (حەمزە)ی مامی پێغەمبەر و شێواندنی جەستەی لەلایەن بێباوەڕانەوه، بەسەر پێغەمبەریدا هێنا و، بوویه هۆی ئەوەی چاوانی پێغەمبەرﷺ پڕ فرمێسك و دڵی پڕ له ئێش و ئازار بێت..

سەرەڕای پڕبوونی گۆڕەپانی جەنگ له جەستەی هەموو ئەو هاوەڵ و هاوڕێیانەی كه هەریەكەیان لای ئەو دونیایەك بوو له ڕاستگۆیی و پاكی و ڕووناكی..

وێڕای هەموو ئەوانه، پێغەمبەرﷺ لەسەر جەستەی یەكەمین نێردراوی ڕاوەستا، ماڵئاوایی لێ دەكرد و دەیلاواندەوه..

بەڵێ... پێغەمبەری خوداﷺ لای (موصعەبی كوڕی عومەیر) ڕاوەستا و چاوەكانی دەورەدرابوون به ڕووناكی و سۆز و ئەمەكی ئەو و فەرمووی:

(من المؤمنين رجال صدقوا ما عاهدوا الله عليه)الاحزاب/۲۳.

پاشان به غەمبارییەوه سەرنجێكی ئەو جاجمەی دا كه كرابوو به كفنی و فەرمووی:

(تۆم بینی له مەككە، كەس نەبوو جلی لەتۆ جوانتری لەبەردابێ، كەس نەبوو له تۆ چاكتری پۆشیبێت.. ئێستاش ئەوەتانێ تۆ به قژ ئاڵۆسكاوی لەناو ئەم جاجمەدایت))...؟!

پێغەمبەرﷺ سەرنجێکی بەسۆزانەی گۆڕەپانی شەڕەکە و هەموو هاوەڵانی (موصعەب) ی داو دەنگی بەرزکردەوە و فەرمووی:

(پێغەمبەری خودا لە ڕۆژی قیامەتدا شاهێدی دەدات کە ئێوە لای خوا شەهیدن)..

پاشان ئاوڕی لە هاوەڵە زیندووەکانی دەورەبەری دایەوە و فەرمووی:

(ئەی خەڵکینە سەردانیان بکەن و، وەرنە لایان و، سەلامیان لێبکەن، سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، هەتا ڕۆژی قیامەت هەر موسڵمانێك سڵاویان لێبکات، وەڵامی سڵاوەکەی دەدەنەوە)..

* * *

سڵاوت لێ بێت ئەی موصعەب...

سڵاوتان لێبێت ئەی کۆمەڵی شەهیدان..

سڵاو و سۆز و بەزەیی و بەرەکەی خوا لەسەر هەمووتان بێت..

پاڵەوانی ئەمجارەمان، لە وڵاتی فارسەوە دێت ..

لە وڵاتی فارس کە پاشتر چەندین بڕواداری دیکەی تێدا موسڵمان بوون و، بوونە پاڵەوانانێك لە ئیمان . و.. زانین . و.. ئاین . و.. دنیادا کەسیان پێ نەگات.

ئەوەش یەکێکە لە جوانی و مەزنیەکانی ئیسلام، نەچۆتە هیچ وڵاتێك لە وڵاتان تا بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر، هەمو تواناو وزەکانی نەبزوێنێ و، کرۆکی زیرەکێتی و بلیمەتی نێو ناخی خەڵك و دانیشتوانەکەی دەرنەهێنێت.. ئەوەتا فەیلەسوفەکان، موسڵمان بوون... دکتۆرەکان موسڵمان بوون... شارەزایان موسڵمان بوون... فەلەکیەکان موسڵمان بوون... داهێنەران موسڵمان بوون... زانایانی بیرکاری موسڵمان بوون..

بەهۆی ئەوانەوە لە هەمو ئاسۆیەکەوە دەردەکەون و، لە گشت وڵاتێکەوە دێن، هەتا چاخەکانی سەرەتای ئیسلام پڕ کەسانی بلیمەت دەبێت لە هەمو بوارەکانی عەقڵ و، ویست و، ویژدان .. کەسانێك نیشتمانیان جودایە و.. ئاینیان یەك ..!! پێغەمبەر ﷺ پێشبینی ئەو بڵاوبوونەوە پیرۆزەی ئاینەکەی کرد، نەك هەر ئەوە، بەڵکو لەلایەن پەروەردگاری باڵادەستیەوە وادەی ڕاستگۆیانەی پێدرابوو... ڕۆژێکیان کات و جێی نیشاندرا و، بەچاوی خۆی بینی ئاڵای ئیسلام بەسەر شارەکانی سەر زەوی، کۆشك و تەلاری گەورەکانیانەوە دەشەکێتەوە..

لەمەدا سەلمانی فارسی شاهێد بوو، پەیوەندیەکی بە تینی هەبوو بەوەی کە ڕویدا.

ئەمەش لە ڕۆژی (خەندەق)دا بوو.. ساڵی پێنجەمی کۆچی، کاتێك یەکێك لە گەورە پیاوانی جولەکە بەرەو مەککە کەوتە ڕێ، بەمەبەستی کۆمەکی کردنی بێباوەڕان و کۆکردنەوەی هۆزەکان و هێنانیان بۆ سەر پێغەمبەری خوا و موسڵمانان، پەیمانیان لەگەڵدا بەستوون کە هاریکاریان بکەن لەو جەنگە یەکلاکەرەوەیەدا بۆ دەرهێنانی ڕەگ و ریشەی ئەم ئاینە نوێیە.

نەخشەی ئەو جەنگە ستەمکارانەیە دانرا، بەوەی کە سوپای (قورەیش) و (غەطەفان) لەدەرەوەی شاری مەدینەوە هێرش بهێنن و، (بنوقریظة)ش لەناوەوەی مەدینە و لە پشت ڕیزی موسڵمانانەوە هێرش بکەن، ئەوانەی لەو کاتەدا دەکەونە نێوان هەردوو دەستهاڕەکەوە دەیانهاڕن، لەناویان دەبەن و، دەبنە یادەوەری..!!

ڕۆژێکیان پێغەمبەر و یاوەرانی سەرسام بوون بە هاتنی سوپایەکی بێشومار و پڕ چەك و تفاق کە لە مەدینە نزیك دەبوویەوە .

موسڵمانان دەستەوسان بوون، خەریك بوو لە ناو ئەو نەهامەتیە گەورەیە لە هۆشی خۆیان بچن..

قورئانی پیرۆزیش بەم شێوەیە ئەو هەڵوێستەی خستۆتە ڕوو، دەفەرموێت:-

﴿إِذْ جَاءُوكُمْ مِنْ فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنْكُمْ وَإِذْ زَاغَتْ الأَبْصَارُ وَبَلَغَتْ الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِاللَّهِ الظُّنُونَ: لەو دەمەدا کە لە ژوور و ژێرەوە بۆتان هاتن، چاوتان ڕەشکەوپێشکەی دەکرد، دڵتان بە تەپەتەپ کەوت و گەیشتە قورقوڕاگەتان، زۆر خەیاڵی جۆراوجۆرتان بەدڵدا دەهات.﴾الاحزاب/١٠.

بیست وچوار هەزار جەنگاوەر بەسەرۆکایەتی (ئەبوسوفیان) و (عینیەی کوڕی حصن) دەهاتن لە مەدینە نزیك دەبوونەوە تا گەمارۆی بدەن و دەستی گڵاویان لێ بوەشێنن و کۆتایی بە (محمد) و ئاینەکەی و، هاوەڵەکانی بهێنن..

ئەو سوپایەش تەنها لە قورەیش پێك نەهاتبوو... بەڵکو هەموو ئەو هۆز و خاوەن بەرژەوەندیانەی لەگەڵدابوو کە ئیسلام بەمەترسی دەزانن لەسەر خۆیان.

ئەم کۆتا هەوڵی یەکلاکردنەوەیە کە دوژمنانی پێغەمبەر: تاك و، کۆمەڵەکان و، هۆزەکان و، خاوەن بەرژەوەندیەکان، پێی هەڵدەستن..

موسڵمانان خۆیان لە هەڵوێستێکی ناهەمواردا بینییەوە.

پێغەمبەری ئازیزیش هاوەڵانی بەڕێزی کۆکردەوە تا لەو بارەیەوە ڕاوێژیان پێ بکات..

ئاشکرایە لەسەر بەرگری و کوشتار یەکدەنگ بوون.. بەڵام چۆن بەرگری بکەن؟؟

ئالێرەدا پیاوێکی لاق درێژی قژ پڕ هاتە پێشەوە، کە لای پێغەمبەر خۆشەویستیەکی مەزن و ڕێزێکی گەورەی هەبوو.

(سەلمانی فارسی) هاتە پێشەوە و چووە سەر گردێکی بەرز و، سەرنجی وردی پشکنێرانەی مەدینەی دا و، سەیری کرد-هەروەك ڕاهاتبوو- بەشاخ و بەردەڵان دەورەی دراوە، بەڵام بۆشاییەکی فراوان هەیە و، گونجاو و لەبارە و، سوپا دەتوانێت لێوەی بەئاسانی بپەڕێتەوە.

(سەلمان) لە وڵاتی فارس شارەزایی چاکی دەربارەی هۆکارەکانی جەنگ و فێڵ و تەڵەکەکانی کوشتار فێر بوو بوو، چووە پێشەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەو پێشنیارەی خۆی خستە ڕوو کە عەرەب پێشتر لە جەنگەکانیدا بەکاریان نەهێنابوو.. ئەوەش بریتی بوو لە هەڵکەندنی خەندەقێك کە هەموو ناوچە کراوەکانی دەوری مەدینە بگرێتەوە.

خواش چاکتر دەزانێت، گەر لەو غەزایەدا ئەو خەندەقەیان هەڵنەکەندایە چ سەرئەنجامێك چاوەڕوانی موسڵمانانی دەکرد، قورەیش هەرکە بینیان سەرسام بوون و، سوپاکەیان بۆماوەی مانگێك دەستەوسان لە ڕەشماڵەکانیاندا مایەوە و نەیدەتوانی بپەڕێتەوە بۆ مەدینە، هەتا

شەوێکیان خودای گەورە ڕەشەبایەکی توندی زیخاوی بۆ هەڵکردن ڕەشماڵەکانیانی لەبنەوە هەڵکەند و، بەهیلاکی بردن. ! !

(ئەبوسوفیان) هاواری لە سوپاکەی کرد و فەرمانی پێکردن کە بەو پەڕی نا ئومێدی و سەرکزییەوە بگەڕێنەوە بەرەو ئەو جێگای لێوەی هاتبوون.. ! !

* * *

لە میانەی هەڵکەندنی (خەندەق)ەکەدا سەلمانیش شوێنی خۆی لە نێو موسڵمانانەدا گرتبوو کە چاڵیان هەڵدەکەند و لە هەوڵداندا بوون و ماندوو دەبوون، پێغەمبەری خوداش ﷺ پاچێکی بەدەستەوە بوو لەگەڵیاندا کاری دەکرد..

لەو بەشەی کە سەلمان لەگەڵ دەستە و هاوەڵەکانیدا کاری لێدەکرد، بەردێکی زۆر ڕەق هاتە بەر پاچەکانیان.

(سەلمان) لاشەیەکی پتەو و، خاوەن دەست و مەچەکێکی بەهێز بوو، تەنها لێدانێکی دەستی ئەو بەس بوو بۆ شکاندنی بەرد و پرژ و بڵاوکردنی، بەڵام لە ئاست ئەو بەردەدا دەستەوستان وەستا .. ئەوانەی دیکەی دەوروبەریشی هاتن، بەڵام تەنها خۆ هیلاك کردنی زیاتریان بۆ مایەوە.. ! !

(سەلمان) ڕۆشت بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ تا مۆڵەتی لێ بخوازێت لەبەر ئەو بەردە سەختە ڕێڕەوی چاڵەکە بگۆڕن..

پێغەمبەری ئازیز ﷺ لەگەڵ سەلماندا هات تا شوێن و بەردەکە ببینێت..

کاتێك بینی، داوای پاچێکی کرد و، داوای لە هاوەڵانی کرد کەمێك دوور بکەونەوە تا پارچە بەردیان بەر نەکەوێت..

پاشان ناوی خوای لێ هێناو، بەوپەڕی جەسوری و هێزەوە هەردوو دەستی پیرۆزی بەپاچەکەوە بەرزکردەوە و، دای لەبەردەکە، بەردەکە شەقی برد، لە نێو کەلێنە گەورەکەیەوە بریسکەیەکی ڕووناك بەرزبوویەوە.

(سەلمان) دەڵێت ئەو بریسکەیەم بینی کە ئەو ناوەی ڕووناك کردەوە، واتە دەوروبەری شاری مەدینەی ڕووناك کردەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەنگی بەرز-الله اکبر-ی کرد و فەرمووی:

(الله اکبر.. کلیلەکانی فارسم پێدرا، لەنێویدا کۆشك و تەلارەکانی (حیرە)و (مەدائن)ی کیسرا ڕووناکی دا و، ئوممەتەکەی من دەستی بەسەردا دەگرن)..

پاشان پاچەکەی بەرزکردەوە و لێدانی دووەمی وەشاند، هەمان شت دووبارە بوویەوە و، بەردەکە بریسکەیەکی ڕووناکی لێ بەرز بوویەوە، پێغەمبەر ﷺ هاواری کرد:

(الله اکبر.. کلیلەکانی ڕۆمم پێ بەخشرا و، کۆشکە سوورەکانیان ڕووناکیدا بۆم و، ئوممەتەکەم دەستی بەسەردا دەگرن)..

پاشان بۆ جاری سێیەم پاچەکەی لێدا، بەردەکە بەتەواوی ورد بوو، بریسکەیەکی ڕووناکی بێ وێنەی لێ بەرزبوویەوە، پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان پێکەوە -الله اکبر- یان کرد.. پێغەمبەر هەواڵی ئەوەی پێدان کە ئەو ئێستاکە کۆشکەکانی شام و صنعاء و شارەکانی دیکەی سەر زەوی دەبینێت کە ڕۆژێك دادێت ئاڵای خودایان بەسەرەوە بشەکێتەوە، موسڵمانانیش بە ئیمانێکی مەزنەوە بەدەنگی بەرز وتیان: ﴿ هَذَا مَا وَعَدَنَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَصَدَقَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ: ئەمە ئەو بەڵێنەیە کە خودا و پێغەمبەرەکەی بە ئێمەیان دابوو، بەڵێنی خوا و پێغەمبەرەکەی ڕاستن. ﴾الاحزاب-٢٢-

(سەلمان) خاوەن بیرۆکەی هەڵکەندنی خەندەق بوو.. خاوەنی ئەو بەردەش بوو کە هەندێك لە نهێنیەکانی غەیب و ئایندەی لێوە دەرکەوت، کاتێك پێغەمبەر ﷺ پشتی بەم بەست، (سەلمان) لە تەنیشتیەوە ڕاوەستابوو ڕووناکیەکەی بینی و، گوێبیستی مزدەکان بوو.. تەمەنیشی هێندەی خایاند تا هاتنە دی ئەو مزدانەی لە ژیانیدا بەدی کرد و، شارەکانی ( قودس) و (ڕۆم)ی بینی..

کۆشکەکانی (صنعاء) و ( شام) و ( میسر) و (عێراق)ی بینی..

هەموو لاکانی سەر زەوی بەدی کرد بەو دەنگە پیرۆزە دەهەژا کە لە هەموو جێگایەك لە منارەی مزگەوتەکانەوە بەرز دەبووە و ڕووناکی ڕێنوێنی و ڕزگاربوون و چاکەی پێ بوو..!!

ئەوەتانێ ئێستا، لە ژێر سێبەری دارێکی چڕوپڕی بەردەم ماڵەکەی خۆیدا لە (مدائن) دانیشتوە و بەسەرهاتی قارەمانێتیە مەزنەکەی بەمەبەستی گەڕان بەدوای ڕاستیدا بۆ ئەو خەڵکە دەگێڕێتەوە کە لە دەوری دانیشتون و، بۆیان باس دەکات کە چۆن لە ئاینی هۆزەکەی خۆی (فارس)ەوە چوە سەر ئاینی مەسیحی، پاشان ئیسلام..

چۆن دەوڵەمەندی باوکە سەربڵندەکەی بەجێهێشت و، خۆی هاوێشتە کۆشی هەژاری، بەمەبەستی ڕزگارکردنی عەقڵ و ڕۆحی..!!

هەروەها چۆن لە بازاڕی کۆیلە فرۆشیدا فرۆشرا، لە کاتێکدا ئەو لەسەر ڕێگای گەڕان بەدوای حەقیقەتدا بوو..؟؟

وە چۆن گەیشت بە پێغەمبەر ﷺ و چۆن باوەڕی پێی هێنا..؟

وەرن با لەو دانیشتنە بەڕێزەی نزیك ببینەوە و، گوێبیستی ئەو هەواڵە سەرسوڕهێنەرە بین کە سەرگوزشتەی خۆی دەگێڕێتەوە..

* * *

(من پیاوێکی خەڵکی (اصبهان) بووم، لە گوندێك کە پێیان دەگوت (جی).. باوکم سەرکاری ناوچەکەی بوو.

منیش لە خۆشەویسترین بەندەکانی خوا بووم لای...

لە ئاگر پەرستیدا ڕۆچوو بووم، تا ئەو ڕادەی من هەڵگیرسێنەری ئاگرەکەیان بووم و، نەمدەهێشت خامۆش ببێت..

باوکم قەرزێکی هەبوو، ڕۆژێکیان ناردمی بۆی بهێنمەوە، چوومە دەرێ، لەڕێگا بەتەنیشت کەنیسەیەکی گاورەکاندا تێپەڕ بووم، گوێم لێ بوو نوێژیان دەکرد، چوومە ژوورێ بۆ لایان تا بزانم چ دەکەن، نوێژەکەیان سەرنجی ڕاکێشام، بەخۆم گوت ئەمە لەو ئاینەی کە ئێمە لەسەرین چاکترە، لایان مامەوە تا خۆر ئاوا بوو، نەچووم بۆ قەرزەکەی باوکم، نەشگەڕامەوە بۆ لای هەتا خەڵکی نارد بۆ سۆراغ کردنم..

کاتێك کار و بار و نوێژی گاورەکان سەرنجی ڕاکێشام لە بارەی بنەڕەتی ئاینەکەیانەوە پرسیارم لێ کردن، وتیان: لە شامە..

کە گەڕامەوە بە باوکم وت: بەلای خەڵکانێکدا تێپەڕ بووم لە کڵێسایەکدا نوێژیان دەکرد و نوێژەکەیان سەرنجی ڕاکێشام و، بینیم ئاینەکەی ئەوان لەوەی ئێمە چاکترە... دەستمان کرد بە گفتوگۆ و قسە لەو بارەیەوە... پاشان کۆت و زنجیری کردە قاچم و بەندی کردم..

هەواڵم نارد بۆ گاورەکان کە من هاتومەتە سەر دینی ئەوان و، پرسیاری ئەوەشم لێ کردن گەر کاروان لە شامەوە هات بەر لە گەڕانەوەیان هەواڵم بدەنێ تاوەکو لەگەڵیاندا بڕۆم بۆ شام، ئەوانیش وایان کرد، زنجیر و کۆتە ئاسنینەکەم پساند و هاتمە دەرێ و لە گەڵیاندا بەرەو شام کەوتمە ڕێ ...

لەوێ دەربارەی زانای دیاریان پرسیارم کرد، پێیان وتم: ئەو ئەسقەفەی خاوەنی کەنیسەیە، چوم بۆ لای و سەربردەی خۆم بۆ باسکرد، لەلای مامەوە و خزمەتم دەکرد و نوێژم دەکرد و فێری زانیاری دەبووم..

ئەم ئەسقەفەش لە ئاینەکەیدا پیاوێکی خراپ بوو، هەڵدەستا بە کۆکردنەوەی خێر لە خەڵکی بۆ ئەوەی دابەشی بکات، بەڵام بۆ خۆی هەڵی دەگرت و کۆی دەکردەوە..

مرد..

یەکێکی دیکەیان هێنا و خستیانە جێگاکەی، هیچ کەسم نەدیتبوو لە ئاینەکەیاندا لەو چاکتر بێت، زیاتر لەو ئارەزومەندی دواڕۆژ بێت، هێندەی ئەو دونیا نەویست و لەسەر پەرستش بەردەوام بێت..

بەجۆرێك خۆشم ویست کە پێشتر هیچ کەسم بەو جۆرە خۆش نەویستووە..

کاتێك ئەجەلی نزیك بۆوە، پێم وت: ئەوا دەبینی ئەمری خوات بەسەردادێ، جا چ ئامۆژگاریەکم دەکەی و بۆ لای کێ دەمنێریت؟

ئەویش پێی وتم: ئەی کوڕم، کەسێك ناناسم لەسەر ئەوە بێت کە ئێمەی لەسەر بوو، تەنها پیاوێك نەبێت لە موصڵ.

کاتێك کە وەفاتی کرد، چوومە لای مامۆستایەکەی موصڵ. سەربردەی خۆمم بۆ گێڕایەوە و ئەو ماوەیەی کە خوا ویستی لەسەر بوو لای مامەوە و ئەویش وەفاتی کرد و خواپەرستێکی بۆ دەستنیشان کردبووم لە (نصیبین).

چوومە لای و سەربردەی خۆمم بۆ گێڕایەوە و ئەو ماوەیەی کە خودا ویستی لەسەر بوو لەلای بووم و ئەویش وەفاتی کرد و فەرمانی پێکردبووم بچم بۆ لای پیاوێك لە (عەموریە)ی شاری رۆم و منیش چوومە لای و لەلای مامەوە.

بۆ بژێوی ژیانم مانگا و مەڕم بەخێو دەکرد.. لەپاشان ئەویش وەفاتی کرد.

کاتێك ئەجەلی هات، پێم وت: دەمنێریت بۆ لای کێ؟ پێی وتم: کەس ناناسم لەسەر ئەوە بێت کە ئێمەی لەسەر بوو، تا فەرمانت پێ بکەم بچیت بۆ لای، بەڵام سەردەمی پێغەمبەرێك لێت نزیکە کە ئاینی ئیبراهیمی حەنیف دێنێت و.. کۆچ دەکات بۆ جێگایەکی پڕ دارخورمای نێوان دووکێو، گەر توانیت دڵسۆز بە بۆی..

ئەو پێغەمبەرە هەندێك بەڵگە و نیشانەی هەیە ناشاردرێتەوە، ئەو(صەدەقە) ناخوات، دیاری وەردەگرێت و، مۆری پێغەمبەرایەتیشی بەناوشانیەوەیەتی، کە بینیت خێرا دەیناسیتەوە.

ڕۆژێکیان کاروانێك بەلامدا تێپەڕی، دەربارەی وڵاتەکەیان پرسیارم لێ کردن، تێگەیشتم کە خەڵکی دوورگەی عەرەبن، پێم وتن: ئەم مانگا و مەڕانەی خۆمتان پێ دەدەم بمگەیەننە ئەو شوێنەی خۆتان، ڕازی بوون و وتیان: باشە..

لەگەڵ خۆیاندا بردمیان هەتا گەیاندمیانە –وادی القری– لەوێدا ستەمیان لێکردم و، فرۆشتمیان بە پیاوێکی جوولەکە... لەوێ کۆمەڵە دارخورمایەکی زۆرم بینی، حەزم دەکرد کە ئەمە ئەو جێگایە بێت بۆ من باسکرا، کە دەبێتە شوێنی کۆچ کردنی پێغەمبەری چاوەڕوانکراو، بەڵام ئەوێ نەبوو..

لای ئەو پیاوەی کڕیبوومی مامەوە، هەتا ڕۆژێکیان جوولەکەیەکی (بني قريظة) هاتە سەردانی، خاوەنەکەم فرۆشتمی بەو پیاوە، ئەویش لەگەڵ خۆی بردمی هەتا گەیاندمیە مەدینە!!

سوێند بەخوا هەرکە بینیم تێگەیشتم ئەمە ئەو شوێنەیە کە بۆم باسکرا..

لای ئەو پیاوە مامەوە و لەسەر دارخورمای (بني قريظة) کارم بۆ دەکرد، هەتا خوای گەورە پێغەمبەری نارد و پاشان بەرەو مەدینە هات و لە (قباء) لای (بنی عمروی کوڕی عوف) لایدا.

ڕۆژێکیان بەسەر دارخورمایەکەوە بووم، خاوەنەکەم لە بنیدا دانیشتبوو، پیاوێکی جوولەکەی ئامۆزای هاتە لای و، لەمیانەی قسەکانیدا وتی: خوا (بنی قیلة) لە ناو بەرێت،

ئەوانە لە دەوری پیاوێك كۆبوونەتەوە لە (قباء)، كە لە مەككەوە هاتوە و وا باس دەكەن كە پێغەمبەر بێت..

سوێند بەخوا لەگەڵ ئەو قسەیەی ئەودا موچڕكە بەلەشمدا هات، دلرخورماكە لەرییەوە و خەریك بوو بكەوم بەسەر خاوەنەكەمدا!! بەخێرایی هاتمە خوارەوە، وتم: چی دەڵێیت؟ دەنگ و باس چییە..؟؟

خاوەنەكەم دەستی بەرز كردەوە و زللەیەكی توندی لێدام، پاشان وتی: چ پەیوەندیت بەوەوە هەیە؟ دەی بڕۆوە سەر كارەكەی خۆت.. چومەوە سەر كاری خۆم.. كە شەو داهات ئەوەی كە لام بوو كۆم كردەوە، پاشان چومە دەرەوە تا گەیشتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ .. لە (قباء)..

چومە ژوورەوە بۆ لای، چەند هاوەڵێكی لەلا بوو، پێم وت: ئێوە كەسانێكی نامۆ و نەدارن و پێویستیتان بەشت هەیە، منیش خۆراكم لەلابوو كە كردبوومە خێر (صدقە)، كاتێك باسی شوێنی ئێوەم بۆ كرا زانیم كە ڕەواترین كەسن بەو خێرە بۆیە هێنام بۆتان، خواردنەكەم دانا، پێغەمبەر بە هاوەڵانی فەرموو: بەناوی خودلوە بخۆن، داینا بۆیان و خۆی دەستی بۆ نەبرد، لەدڵی خۆمدا وتم: سوێند بەخوا ئەمە نیشانەیەكیان ...شتی (صدقە) ناخوات..!!

دوای ئەوە گەڕامەوە، بۆ بەیانی داهاتوو و چوومە خزمەت پێغەمبەرﷺ ، هەندێك خواردنم پێ بوو، پێم وت: تۆم بینی (صدقەت) نەخوارد.. شتێكم لابوو پێم خۆش بوو ڕێزت لێ بنێم وەك دیاری پێت ببەخشم، ئەوەم وت و لەبەر دەمیدا دانا، ئەویش بە هاوەڵانی فەرموو: بەناوی خولوە بخۆن.. خۆیشی لەگەڵیاندا خواردی..

لە دڵی خۆمدا وتم: سوێند بەخوا ئەمە بەڵگە و نیشانەی دووەمە..شتی دیاری دەخوات..!!

پاش ئەوە گەڕامەوە و هێندەی خوا بیەوێت مامەوە، دوای ئەوە گەڕامەوە بۆ لای، بینیم لە (بقیع) بە شوێن جەنازەیەكەوە دەڕوات و، هاوەڵانی بەدەوریەوەن، دوو پشتەماڵی بەسەرەوەیە و بەیەكێكیان سەری پێچاوە، ئەوی دیكەشی پۆشیبوو، سڵاوم لێ كرد، پاشان چوومە پشتیەوە تا سەیری نێو شانی بكەم، زانی كە من ئەوەم دەوێت، عەباكەی لەسەر شانی لادا، نیشانەكە لەنێو شانی دابوو، مۆری دوا پێغەمبەر، هەروەك مامۆستاكەم بۆی باس كردبووم..

منیش خۆمدا بەسەریدا و ماچم كرد و گریام، پاش ئەوە پێغەمبەر ﷺ بانگی كردم و لەبەردەمیدا دانیشتم، سەربردە و باسەكەی خۆم بۆ گێڕلیەوە، وەك ئەوەی ئائێستا بۆتانم باس كرد..

پاشان موسڵمان بووم و.. كۆیلایەتی بویە لەمپەر لەنێوان من و هەردوو غەزای بەدر و ئوحود..

ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (خۆت لە خاوەنەکەت بکڕەوە تا ئازادت بکات)، منیش لەگەڵی پێك هاتم، پێغەمبەر فەرمانی بەهاوەڵانی کرد تا کۆمەکم بکەن، خوای گەورە لە کۆیلایەتی ڕزگاری کردم و، موسڵمانانە بەئازادی ژیام و، لەگەڵ پێغەمبەری خودا بەشداری غەزای (خەندەق) و هەموو جەنگەکانی دیکەم کرد.[1]

* * *

بەم وشە پڕشنگدار و سازگارانە.. سەلمانی فارسی باسی پاڵەوانێتیە بێگەردە پیرۆز و مەزنەکەی خۆی لە پێناوی گەڕان بەدوای ئەو حەقیقەتی ئاینەیدا کرد کە دەیگەیەنێت بەخوا و، ڕۆڵی خۆی لە ژیانیدا بۆ دیاری دەکات..

جا دەبێت ئەو مرۆڤە چ کەسێکی سەر بڵند بووبێت...؟

چ باڵادەستیەکی مەزن بوو گیانە پێشەنگەکەی بەدەستی هێنا بوو و، ویستە زاڵەکەشی بەسەر کۆسپ و ئاستەنگەکانیدا پێویستی کردبوو و، توانی تێیپەڕێنێ و، بەسەر هەڵە موتدا بگوزەرێ و سەر کزی بکا بۆی.. خواست و ویستی خۆی لە ئامێزی دەوڵەمەندی و ناز و نیعمەتی باوکی بێتە دەرێ و بەرەو نادیارێ بەڕێ بکەوێت، بە هەموو کەم و کورتی و، سەختی و ئاستەنگەکانیەوە و، لە خاکێکەوە بگوێزێتەوە بۆ خاکێکی دیکە و.. لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکیکە.. بە ماندوویەتی.. زەحمەت و خواپەرستیەوە و.. بە بەرچاوڕوونیە ڕەخنەگرەکەی خەڵك و، مەزهەب و، ژیانی، دەپشکنی.. بەو پەڕی سووربوونی مەزنیەوە بە دوای ڕاستیدا دەچوو، لەگەڵ ئەو خۆبەختکارییە بێگەردەی لە پێناوی بەدەستهێنانی ڕێنوێنیەدا، تا وای لێهات وەك کۆیلە بفرۆشرێت... پاشان خوای گەورە پاداشتی گەورەی دەداتەوە و، لەگەڵ حەقدا کۆی دەکاتەوە و، بە پێغەمبەرەکەی دەگەیەنێت و، پاشان تەمەنێکی درێژی دەداتێ تا بەچاوی خۆی ببینێت ئاڵای خودا بەسەر هەموو وڵاتانەوە دەشەکێتەوە و، بەندە موسڵمانەکانیشی هەموو گۆشە و جێگایەکی زەوی پڕ دەکەن لە ڕۆشنایی و، ئاوەدانی و، دادپەروەری..؟!!

باشە چی چاوەڕوان بکەیت لە ئیسلامێتی پیاوێك ئەوە هیمەت و ڕاستگۆیی بێت؟

بەڕاستی وەك موسڵمان بوونی بڕواداره زۆر چاکە تەقوادارەکان بوو... لە دونیا نەویستی و، زیرەکی، خۆپارێزیدا (ورع) زۆر لە (عومەری کوڕی خطاب) دەچوو.

---

[1] ئەم قسانە کە لە —سلمانی فارسی— یەوە وەرگیراوە بۆ (ابن عباسی گێڕاوەتەوە (رضی الله عنهما) و، (ابن سعد) لەکتێبی (الطبقات الکبری)ج٤ چاپی (بیروت) گواستویەتیەوە (بەدەسکاریەکی کەمەوە) وەرمانگرتووە.

چەند ڕۆژێك سەلمان لەگەڵ (ابو درداء)دا لەیەك خانودا پێکەوە بوون، (ابو درداء)τ بەشەو هەڵدەستا و شەونوێژی دەکرد، ڕۆژیش بە ڕۆژو بوو.. سەلمانیش ئەو زۆر زیادەڕەوییەی لەپەرستشدا بەو جۆرە بەچاك نەدەزانی.

ڕۆژێکیان سەلمان ویستی ڕۆژووی سونەتی پێ بشکێنێت، (ابو درداء) سەرکۆنەی کرد وتی: ڕێگریم لێ دەکەیت کە بۆ پەروەردگارم بەڕۆژو بم و، نوێژی بۆ بکەم...؟!

سەلمانیش لە وەڵامدا پێی وت:

(چاوەکانت مافیان هەیە لەسەرت، خاو و خێزانت مافیان هەیە لەسەرت، ڕۆژو بگرەو بشکێنە(ڕۆژ نا ڕۆژ)، و.. نوێژ بکە و بشخەوە)..

ئەم قسەیە گەیشتەوە پێغەمبەر ﷺ و فەرمووی:

(بەڕاستی سەلمان لەزانیندا تێر بووە...)

پێغەمبەر ﷺ سەرنجی زیرەکی و زانیاریە زۆرەکەی دابوو..

لە ڕۆژی (خەندەق)یشدا، (ئەنصاریەکان) ڕاوەستابوون و دەیان وت: سەلمان لە ئێمەیە، لە ولاوە (موهاجیرەکان) دەیان وت: نەخێر سەلمان لە ئێمەیە..

پێغەمبەر ﷺ بانگی کردن و فەرمووی:

(سەلمان لە ئێمەیەی ئال و بەیتە)..!!

لە ڕاستیدا شایستەی ئەو ڕێزە بوو..

(عەلی کوڕی ابوطالب)یش τ بە (لوقمانی حەکیم) ناوی دەبرد، پاش مردنی پرسیاریان لێ کرد لە بارەیەوە، وتی:

(ئەو پیاوێکە لە ئێمە و بۆ ئێمەی (ئال و بەیتە)... کێتان هەیە وەك لوقمانی حەکیم بێت..؟

زانستی سەرەتا و، کۆتایی پێدراوە و، کتێبی یەکەمین و، دوایەمینی خوێندۆتەوە و، دەریایەك بوو بێ بڕانەوە).

سەلمان لە نێو دڵی هاوەڵانی پێغەمبەریشدا ﷺ ڕێزێکی باڵا و جێگایەکی بەرزی هەبوو.

لەسەردەمی خیلافەتی (عومەری کوڕی خطاب)دا، بەسەردان هات بۆ مەدینە، (عومەر) کارێکی بۆ کرد کە شك نابەین هەرگیز بۆ کەسی دیکەی کردبێت، ئەوە بوو هاوەڵانی کۆکردەوە و پێی وتن:

(وەرن با بچینە دەرەوە بۆ پێشوازی سەلمان..)!!

بەو جۆرە هەموویانی بردە دەرەوەی شار بەمەبەستی پێشوازی کردنی.

سەلمان لەگەڵ پێغەمبەردا ژیا لەو ساڵەوەی پێی گەیشت و بڕوای پێ هێنا و بوو بەموسڵمانێکی ئازاد و، موجاهید و خواناسێك لەگەڵیدا..

دوای ئەوەش لەگەڵ خەلیفە (ئەبو بەکری صدیق)دا ژیا و، پاشان لەگەڵ ئەمیری بڕواداران (عومەری کوڕی خطاب)، لە دوای ئەویش تا سەردەمی (عثمان) ژیا و لەکاتی خیلافەتی ئەودا بەرەو لای پەروەردگاری گەڕایەوە.

لە زۆربەی ئەو ساڵانەدا، ئاڵای ئیسلام ئاسۆکانی پڕ کردبوو و، گەنجینە و سامانەکان وەك باج و دەستکەوت دەهێنرانە شاری مەدینە و، بەشێوەی بەخشینی ڕێککراو، پلە و پایەی جێگر بەسەر خەڵکیدا دابەش دەکرا و.. لەسەر هەموو ئاستەکان بەرپرسیارێتی فەرمانڕەوایی زۆر بووبوو، کاروبار و پلە و پایەش بەهۆیانەوە زیادی کردبوو..

دەبێت سەلمان لەو خۆشگوزەرانییەدا لەکوێ بوو بێت..؟ لەو ڕۆژگارەی خۆشی و دەوڵەمەندی و ناز و نیعمەتەدا لە کوێدا بەدی بکەین..؟

چاوەکانتان بەچاکی بکەنەوە...

ئا ئەو پیرە بەهەیبەتە دەبینن لەو سێبەرەدا دانیشتوە و، قاپ و زەمبیلە لە پەلکی دارخورما دروست دەکات..؟

ئەوە سەلمانە...!!

جوان جوان سەیری بکەن..

چاك بڕواننە کراسە کورتەکەی، ئەها لە کورتیدا تا سەر ئەژنۆی هاتوە، ئەوە سەلمانە، لە شکۆمەندی پیرییەکەی و، ساناییی گەڕانەوەیدا..

لە ڕاستیدا ئەو بەخششی زۆری پێ دەدرا... پشکی ئەو ساڵانە چوار تا شەش هەزار دەبوو، بەڵام ئەو هەمووی دەبەخشیەوە و، ڕازی نەبوو تەنها یەك درهەمیشی لێی بۆ بێت، ئەوەتانێ خۆی دەڵێت:

(پەلکە خورمایەکم دەکڕی بە درهەمێك، چاکم دەکرد و، پاشان دەمفرۆشتەوە بەسێ درهەم، لەوە درهەمێکم دەهێشتەوە و، درهەمێکیشم بۆ ماڵ و منداڵم خەرج دەکرد و، درهەمەکەی تریشم دەکردە خێر...

خۆ گەر (عومەری کوڕی خطاب)یش ڕێگری ئەوەی لێ بکردمایە وازم نەدەهێنا و دەستم لێ هەڵنەدەگرت)!

پاشان چی تر، ئەی شوێنکەوتوانی محمدﷺ ..؟؟

چی دیکە پاشی ئەوە ئەی ڕێز و سەربڵندی مرۆڤایەتی لە هەموو سەردەم و جێگایەکدا..؟؟ هەندێکمان لە کاتێکدا گوێبیستی لە خۆگرتنەوە و خۆ گوشین و پارێزکاری (ورع) هەندێك لە هاوەڵانی وەك (ابوبکر) و (عمر) و (ابوذر) و براکانیان دەبووین، وامان گومان دەبرد کە سروشتی ژیان لە نیوە دوورگەی عەرەبیدا بەو جۆرەیە و، عەرەبی ئەو جێگایە پێداویستیەکانی خۆی لە سادە و ساکاری دا دەبینییەوە..

بەڵام ئەوەتا ئێستاکە ئێمە لە بەرامبەر پیاوێکی فارس داین... لە وڵاتی سەربڵندی و خۆشگوزەرانی و شارستانیەتەوە هاتوە و، لە خەڵکە نەدارەکەشی نەبووە.. دەبێت بۆچی ئێستاکە سەروەت و سامان و ناز و نیعمەت رەت بکاتەوە و، سور بێت لەسەر ئەوەی کە لە رۆژێکدا بە درهەمێك رازی بێت کە بەکاری دەستی خۆی پەیدای دەکات..؟

چییەتی بۆ لەسەرکاری را دەکات و پێی رازی نابێت و دەڵێت:

(گەر توانیت خۆڵ بخۆیت بەڵام نەبیتە ئەمیری دووکەس، ئەوا وا بکە..)

هۆی چییە لە پلە و پایە و سەرکاری رادەکات، مەگەر بە ئەمیری هێزێك رازی بێت کە بەرەو جیهاد بچێت.. یان مەگەر لە کات و ساتێکدا بێت کە جگە لەو کەسی دیکە بۆ ئەو پلەیە نەگونجێ، ئا لەو کاتەشدا بەزۆر دەدرێت بە سەریدا و، بە گریان و ترسەوە بەرەو رووی دەچێت..؟

پاشان بۆ لە کاتێکدا کە بە زۆر ئەو سەرکارییە دەدرێت بەسەریدا رازی نابێت کە لەبەخششە حەڵاڵەکەی بەشی خۆی ببات..؟؟

(هیشامی کوڕی حسان) لە (حسن)ەوە گێڕاویەتیەوە:

(ئەو بەخششەی بۆ سەلمان براببووەوە پێنج هەزار بوو، سەرکاری سی هەزار کەس دەکات و وتاریان بۆ دەخوێنێتەوە، عەبایەکی لەبەردایە نیوەی راخستوە تا لەسەری دانیشێت و نیوەکەی تریشی پۆشیوە، کاتێ بەخششەکەی بۆ دەهات هەمووی دەبەخشییەوە و، بەری پەنجی شانی خۆی دەخوارد...)

دەبێت بۆ وابکات و، بەو جۆرە دونیا نەویست بێت، کە ئەو فارسە و، رۆڵەی نێو ناز و نیعمەت و، گۆشکراوی نێو شارستانیەتە..؟

با گوێبیستی وەڵام بین لێی، لە کاتێکدا لەسەر نوێنگەی مردن راکشاوە و، گیانە مەزنەکەی خۆی ساز دەکات بۆ دیداری پەروەردگاری بەرز و خاوەن میهری.

(سەعدی کوڕی وەقاص) چوو بۆ سەردانی، سەلمان دەستی کرد بە گریان..

(سەعد) پێی وت: ئەی باوکی (عبدالله) چی وات لێدەکات بگریت..؟ خۆ کە پێغەمبەری خوا وەفاتی کرد لەتۆ رازی بوو).

سەلمان وەڵامی دایەوە:

سوێند بەخوا نە لەترسی مردن دەگریم، نە لەبەر سوربوونم لەسەر دونیا، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانێکی لەگەڵ بەستبوین و، فەرمووی: بابەشی هەر کەس لە ئێوە لە دونیادا هێندەی تێشوی رێبوارێك بێت، ئەوەتا من ئەم هەموو پێویستیەم لە دەورە)!!

(سەعد) دەڵێت: منیش سەرنجم دا، لەدەوری تەنها قاپێکی گەورە و کوزەیەکم بینی، بۆیە پێم وت:

ئەی باوکی (عبدالله) ئامۆژگارییەکمان بکە تا لێت وەرگرین، وتی:

(ئەی (سەعد)، یادی خوا بکە لە کاتی غەمبارییتدا، گەر غەمت هەبوو..
وە لەکاتی فەرمان دەرکردنندا گەر دادوەریت کرد..
و لە کاتێکدا کە بە دەستت شت دابەش دەکەیت..)

کەواتە هەر ئەوە بوو دەروونی بەڕادەیەك پڕ دەوڵەمەندی و، وازهێنان لە دونیا بەو هەموو سامان و، پلەوپایە و، دەسەڵاتەیەوە کردبوو... پەیمان وئامۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەو و هەموو هاوەڵانی، کە ڕێگە نەدەن دونیا بەسەرياندا زاڵ بێت و، هیچ کەستان لە هێندەی تێشووی ڕێبوارێك زیاتری لێ هەڵنەگرێت..

بەڕاستی (سەلمان) ئەو پەیمان و ئامۆژگارییەی پاراستبوو، لەگەڵ ئەوەشدا بەخوڕ فرمێسکی دەڕشت لە کاتێکدا دەیبینی گیانی بۆ دەرچوون خۆی ساز دەکات، لە ترسی ئەوەی نەبادا سنووری بەزاندبێت.

تەنها قاپێکی لەدەور هەبوو نانی تێدا دەخوارد و، گۆزەیەك ئاوی تێدا دەخواردەوە و دەست نوێژی پێ دەشوت.. لەگەڵ ئەوەشدا وایدادەنا خۆشگوزەرانە..

من پێم نەوتن لە هەموو کەس زیاتر ئەم لە عومەر دەچوو..؟

لەو ڕۆژانەشدا کەئەمیری (مدائن) بوو، بار و دۆخی هیچ نەگۆڕابوو، هەروەك بینیمان ڕەتی دەکردەوە کە تەنها درهەمێك لە دەستخۆشانەی ئەمیرێتی وەرگرێت و.. بەردەوام لەبەری ڕەنجی شانی خۆی دەخوارد و، بەکاری پەلکی خورما چنینەکەی دەژیا.. پۆشاکەکەشی بەس عەبایەك بوو هاوشێوەی عەبا کۆنەکەی لە خاکەڕاییدا..

ڕۆژێکیان بەڕێگادا دەڕۆیشت، پیاوێکی خەڵکی شامی پێ گەیشت کە بارێك هەنجیر و خورمای پێ بوو..

بارەکە کابرای خەڵکی شامی هیلاك و کەنەفت کردبوو، هێشتا کەسێکی بەدی نەکردبوو کە وا دیاربێت لە خەڵکە نەدار و هەژارەکان بێت، تا بارەکەی خۆی بدات بە شانیدا، کە گەیاندیە جێگای خۆی لە بری ئەوە شتێك پارەی بداتێ ..

ئاماژەی بۆ پیاوێك کرد، ئەویش هات بۆ لای، پیاوەکەی خەڵکی شام پێی وت: ئەمەم لەگەڵ هەڵبگرە.. ئەویش هەڵی گرت و پێکەوە ڕۆشتن.

لە ڕێگادا کە گەیشتن بە کۆمەڵێك کەس، سڵاوی لێکردن، بە ڕاوەستانەوە وەڵامیان دەدایەوە: سەلام لەسەر ئەمیریشمان..

سەلام لەسەر ئەمیریشمان..؟؟

مەبەستیان چ ئەمیرێك بێت..؟!! پیاوەکەی خەڵکی شام بەو جۆرە لە دڵی خۆیدا پرسی..

زیاتریش سەرسام بوو کاتێك بینی هەندێك لەو خەڵکە خێرا بەرەو لای (سەلمان) دێن تا بارەکەی لێ وەریگرن و دەڵێن:

بیدە ئێمە.. ئەی ئەمیر...!!

خاوەن بار تێگەیشت کە ئەوە (سەلمانی فارسی) ئەمیری (مدائن)ە، تازە لەدەستی دەرچوو، وشەی داوای لێبوردن و عوزر خوازی لە زاری دەردەپەڕین و، نزیك بوویەوە تا بارەکە وەرگرێت، بەڵام سەلمان داواکەی ڕەت کردەوە و وتی:

(نەخێر، ڕازی نابم تا نەتگەیەنمە شوێنی خۆت)..!!

ڕۆژێکیان پرسیاری لێکرا: چی وات لێدەکات ڕقت لە سەرکاری و ئەمیری بێت..؟

وتی: (شیرینی سەرەتاکەی و، تاڵی کۆتاییەکەی)...

ڕۆژێکیان هاوڕێیەکی دێتە ماڵەکەی، دەبینێت هەویر دەشێلێت، لێی دەپرسێت: ئەی کوا خزمەت کارەکەت؟

پێی دەڵێت: (بۆ پێویستیەك ناردومە و، حەزیشمان نەکرد دوو کاری لەیەك کاتدا لەسەر کۆبکەینەوە..).

کاتێك دەڵێین ماڵەکەی، با بەجوانی بزانین چۆن ماڵێك بوو..؟ کاتێك سەلمان دروست کردنی ئەمەی هات بەخەیاڵدا کە ئێستا لەگەڵ چاوپۆشینیدا پێی دەوترێت ماڵ، پرسیاری لە وەستا کرد: چۆنی دروست دەکەیت..؟؟

وەستاکەش شارەزا و زیرەك بوو، ئاشنای دونیا نەویستی و پارێزکاری سەلمان بوو..

بۆیە وتی: ((مەترسە.. خانویەك دەبێت لە گەرمادا سێبەرت بۆ بکات و، لە سەرما بت پارێزێت، گەر تێیدا بە پێوە بوەستیت سەرت لێ بدات، کە ڕاکشایت لە ناویدا قاچت بەر دیوارەکەی بکەوێت)..!!

(سەلمان) پێی وت:

(بەڵێ، ئاوای دروست بکە)!!!

هیچ شتێك لە خۆشیەکانی دونیا نەبوو بۆ تەنها چرکە ساتێ سەلمان ڕووی تێکردبێت، یان دەرونی وابەستە کردبێت پێوەی، تەنها یەك شت نەبێت کە زۆر سوور بوو لەسەری و، بە ئەمانەت دابوویە دەست ژنەکەی و، داوای لێکردبوو کە لە شوێنێکی دوورە دەست و پارێزراودا بۆی بشارێتەوە.

لە کاتی نەخۆشی سەرەمەرگیدا، سەر لە بەیانی ئەو ڕۆژەی تێیدا گیانی سپارد، بانگی کرد:

(ئەو شتەی پێم سپاردبوویت بیشاریتەوە بۆم بهێنە)..!!

هێنای بۆی، قووتوویەك بوو میسکی تێدا بوو، لە ڕۆژی ڕزگار کردنی (جەلەولا)دا بەری کەوتبوو، پاراستبووی تا ببێتە عەتری ڕۆژی مردنی.

دوای ئەوە داوای ئاوی کرد و میسکەکەی تێ کرد، پاشان بەدەستی تێکی وەردا و، بەژنەکەی وت:

(بیپرژێنە بە دەورمدا.. ئائێستا دروست کراوانێك لە دروستکراوەکانی خوا دێنە سەردانم، کە خواردن ناخۆن و، حەزیان لە بۆنی خۆشە)...

کاتێك بۆنەکەی پرژاند، پێی وت: دەرگاکەم لەسەر پێوە بدە و برۆ خوارێ.. ژنەکەش چۆنی فەرمان پێ کردبوو بەجێی هێنا...

پاشی کەمێك هاتەوە سەرێ بۆ لای، سەیری کرد گیانە پیرۆزەکەی لە جەستەی جیا بۆتەوە و ماڵئاوایی لە دونیا کردوە و.. بە دیداری مەلائیکەتە پایەبەرزەکان (ملأ الاعلى) گەیشتوە، بەسەر باڵەکانی رۆشناییدا بەرز بۆتەوە بۆ لای، چونکە لەوێدا ژوانی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و، (ابوبكر) و (عمر)ی هاورێی و.. دەستەیەکی پایە بڵندی شەهیدان و چاکەکاراندا هەبوو.

لەوەتەی رووناکی لەسەلمان دەدات تامەزرۆیەتی..

ئەوا ئێستا دەتوانێ کە ئارام بگرێت و، تامەزرۆییەکەی بشکێنێ..

# ٣

## ئەبوذەری غیفاری

### سەرهەستەی ئەبالڵحاو دوژمنی سەروەت و سامان

بە مەستی و خۆشیەوە بەرەو مەککە کەوتە ڕێ...

راستە سەختی و ناڕەحەتیەکانی سەفەر و گەرمای بیابان تووشی ئازار و ماندویەتی زۆریان کرد، بەڵام ئەو ئامانجەی هەوڵی بۆ دەدا، برینەکانی لەبیر بردبوەوە و، سەبوری و مژدەی دەپرژاند بەسەر گیانیدا..

بە پەنهانی هاتە ناوی، وەك ئەوەی یەکێك بێت لەو کەسانەی کە بۆ تەواف بەدەوری خواوەندە مەزنەکانی کەعبە هاتبێت، یان وەك ئەوەی ڕێبوارێك بێت و ڕێی لێ تێکچووبێت، یا وەك ئەوەی سەفەر و گەشتەکەی درێژەی کێشابێت و بۆ حەوانەوە و بەدەستهێنانی تێشوو پەنای بۆ هێنابێت.

خۆ گەر خەڵکی مەککە بیانزانیایە هاتووە بەدوای (محمد)داﷺ دەگەڕێت و گوێی لێ رادەگرێت، ئەوا لەناویان دەبرد.

ئەو هیچ باکی نەبوو لەوەی کە لێی بدرێت، بەڵام پاش ئەوەی بە دیداری ئەو پیاوە شاد ببێت کە چەندەها ڕێگای بڕیوە تا ببینێ، دوای ئەوەی کە باوەڕی پێدەهێنێت، گەر بڕوای هێنا بەراستگۆیی و دڵنیا بوو لە بانگەوازەکەی..

دەمێك بوو لە دوورەوە گوێبیستی دەنگ و باسی بوو، هەروەختێك کەسانێکی ببینیایە لەبارەی (محمد)ەوە چپەیەکیان بکردایە بە وریاییەوە لێیان نزیك دەبوەوە، هەتاوەکو لەتوێی قسەکانی ئێرەو ئەوێ هێندەی لا گەڵاڵە بوو (محمد)ی نیشان بدات و، ئەو جێگایەشی ئاشنا بکات کە دەتوانێت ئەوی تێدا ببینێت.

ڕۆژێکیان دەمەویەیانی بەرەو ئەو جێیە ڕۆشت، بینی پێغەمبەرﷺ بەتەنها دانیشتووە، لێی نزیك بوویەوەو وتی: بەیانیت باش برای عەرەب..

پێغەمبەر لەوەلامیدا فەرمووی: سەلام لەسەر تۆش ئەی برا..

(ئەبوذەر) وتی: لەوەی دەیڵێیت بۆم بهۆنەرەوە..

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوەی دەیڵێم شیعر نیە تا بۆتی بهۆنمەوە، بەڵکو قورئانی پیرۆزە..

(ئەبوذەر) وتی: باشە بیخوێنەرەوە بۆم..

پێغەمبەر دەستی کرد بە خوێندنەوە و، (ئەبوذەر)یش گوێی لێ راگرتبوو، ماوەیەکی زۆر کەم تێپەڕ ببوو، (ئەبوذەر) هاواری کرد: (أشهد ان لا اله الا الله... وأشهد أن محمداً عبده ورسوله)..!

ئەمجا پێغەمبەر لێی پرسی: خەڵکی کوێیت براکەم..

(ئەبوذەر) وتی: غیفار.

زەردەخەنەیەکی فراوان لەسەر لێوەکانی پێغەمبەرﷺ درەوشایەوە و، روخساری سەرسامی دایگرت..

(ئەبوذەر)یش بەهەمان شێوە پێکەنی، ئەو نهێنی ئەو سەرسوڕمانەی لەسەر روخساری پێغەمبەر دەرکەوت دەزانێت، کاتێك زانی ئەو کەسەی لەبەردەمیدا موسڵمان بوونی خۆی ئاشکرا دەکات پیاوێکی هۆزی (غیفار)ە.

چونکە (غیفار) هۆزێکە هاوشانیان نیە لە دزی و جەردەیی و رێبەکاروان گرتندا..!!

خەڵکەکەشی بوونەتە نمونەی پەندی تاڵانکاری.. ئەوانە هاوپەیمانی شەرو تاریکین، تیاچوون بۆ ئەو کەسەیە لە شەودا بکەوێتە چنگی کەسێکی هۆزی (غیفار).

دەبێت ئەمڕۆ-کە هێشتا ئیسلام ئاینێکی پەنهان و ژێردەستەیە- یەکێکیان لێ بێت تا موسڵمان بێت..؟!

(ئەبوذەر) سەربردەکە دەگێڕێتەوە و دەڵێت:

(... پێغەمبەرﷺ لە سەرسوڕمانیدا چاوەکانی دەکردەوەو سەیری دەکرد، کاتێك لە غیفارەوە بێت، پاشان فەرمووی: (إن الله يهدي من يشاء) خوای گەورە رێنوێنی هەر کەس دەکات بیەوێت..! بەڵێ، لە راستیدا خوای گەورە هەرکەسێکی بوێت رێنوێنی دەکات.

(ئەبوذەر)یشرضي الله عنه یەکێك بوو لەوانەی خودا ویستی رێنوێنی بکات و، مەبەستی چاکەی پێی هەبوو..

کەسێکی حەق بین و بەرچاو روون بوو، دەگێڕنەوە کە ئەو لە سەردەمی نەفامیدا یەکێك بوو لەو کەسانەی لە دژی بتەکان هەڵگەڕابوونەوە و، بەرەو بڕواهێنان بەخودای بەدیهێنەری مەزن دەچوون.

بەم شێوەیە هەر کە بیستی پێغەمبەرێك هاتووەو بت و بتپەرستی لادەبات و، خەڵکی بۆ پەرستنی خودای تاك و تەنهای خاوەن دەسەڵات بانگهێشت دەکات، ئەو بەرەو رووی هەنگاوی هەڵگرت و، پشتێنی سەفەری بۆ بەست.

* * *

(ئەبوذەر) دەست بەجێ موسڵمان بوو...

رێزبەندیشی لەنێو ئەوانەدا کە باوەڕیان هێناوە، پێنجەم یا شەشەم کەس بوو.

کەواتە، موسڵمان بوونی لە رۆژانی یەکەم، بەڵکو لەساتەکانی سەرەتای هاتنی ئیسلامدا بوو و، موسڵمان بوونەکەشی زۆر زوو بوو...

ئەو کاتەی ئەو موسڵمان بوو پێغەمبەر بە پەنهانی و چرپە بانگەوازی دەکرد.. بە چرپە لەگەڵ خۆی و، ئەو پێنج کەسەی بڕوایان هێنابوو دەدوا؛ (ئەبوزەر)یش دەبوو ئیمان هێنانەکەی لەنێو سنگیدا بپارێزێت و، بە نهێنی لە مەککە بچێتە دەرەوە، بەرەو لای هۆزەکەی خۆی بگەڕێتەوە..

بەڵام (ئەبوزەر) -جوندبی کوڕی جونادە- سروشتێکی بەجۆش و خرۆشی هەبوو.

ئەو بۆ ئەوە دروست کرابوو لەدژی ناڕەوا هەڵگەڕێتەوە لەمەرکوێ بێت.. ئەوەتا ئێستا بەچاوی خۆی ناڕەوا دەبینێت.. بەردێکی داتاشراوە، ئەوانەی دەیپەرستن مێژووی لەدایکبوونیان گەورەترە لەمێژووی داتاشینی بەردەکان، لەبەردەمیدا هۆش و سەریان دەچەمێننەوە، خەڵکی بانگی لێدەکەن: لبیك.. لبيك..!!

ڕاستە ئەو لەو ڕۆژانەدا بینی پێغەمبەر نهێنی و چرپەی پێ باشتر بوو.. بەڵام هەردەبوو ئەم شۆڕشگێڕە پایەدارە هاوارێکی بڵند بکات بەر لەوەی بڕوات..

پاش ئەوەی موسڵمان بوو ئەم پرسیارەی ئاراستەی پێغەمبەرﷺ کرد:

بەچی فەرمانم پێ دەکەیت، ئەی پێغەمبەری خوا..؟

پێغەمبەر وەڵامی دایەوە: بگەڕێوە بۆ لای هۆزەکەت تا فەرمانی منت پێ دەگات..

(ئەبوزەر) وتی: بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە ناگەڕێمەوە، تا بە ئاشکرا بۆ ئیسلام لە مزگەوتدا هاوار نەکەم ناڕۆمەوە..!!

ئەی پێم نەوتن..؟؟

ئەو سروشتێکی یاخیانەی بەجۆشی هەیە، جا ئایا لە ساتێکدا (ئەبوزەر) جیهانێکی نوێی بەهەموو نهێنیەکانیەوە بۆ ئاشکرا بێت، کە خۆی لە پێغەمبەردا دەبینێتەوە، کە ئیمانی پێ‌ی هێناوە و، لەو بانگەوازەدا کە مژدەکانی لەسەر زاری ئەو گوێ لێ بوو.. ئایا ئا لەو چرکەساتەدا دەیانەوێت بە بێدەنگی بۆ لای هۆزەکەی بگەڕێتەوە..؟

لە ڕاستیدا ئەوە کارێکە لەسەرو توانای ئەوەوە...

لێرەدا چووە کەعبە و بەهەموو دەنگی خۆی هاواری کرد:

(أشهد أن لا اله الاّ الله.. وأشهد أن محمداً رسول الله)..

ئەو هاوار کردنە -وەك ئێمە بزانین- یەکەم هاوارکردنی ئیسلام بوو کە بەرەنگاری لوتبەرزی قورەیش بوویەوە و گوێی زرینگاندنەوە... خاوەنەکەشی کەسێکی نامۆیەو لە شاری مەککەدا هیچ پلەوپایەو خزم و کەس و پەنادەرێکی نیە..

ئەوەی بە زرنگی خۆی بەتەمابوو تووشی بێت، تووشی بوو.. بێباوەڕان لێی کۆبوونەوەو کەوتنە لێدانی تا خستیانە سەر زەوی..

ئەو هەواڵە گەیشت بە (عەباس)ی مامی پێغەمبەر، بە پەلە هات، بە هۆی فێڵێکی زیرەکانەوە توانی لە بن کەڵبەکانیان دەریبهێنێت، ئەوەبوو پێی وتن:

(ئەی خەڵکی قورەیش، ئێوە بازرگانن، ڕێگاشتان بەلای غیفاردا دەڕوات، ئەمەش پیاوێکە لەوان، ئەگەر هۆزەکەیتان لێ هان بدات، ئەوا ڕێگا لە کاروانەکانتان دەگرن).. گەڕانەوە سەر هۆشی خۆیان و وازیان لێی هێنا.

بەڵام (ئەبوذەر)، تامی شیرینی ئازار چەشتنی لەپێناوی خودا چەشت و، نایەوێت لە مەککە بڕوات هەتا چاکەی زیاتر بەدەست بهێنێت..!!

بەو جۆرە، بۆ ڕۆژی دووەم –لەوانەیە هەرهەمان ڕۆژیش بووبێت– دەگات بە دوو ئافرەت کە بەدەوری هەردوو بتی (ئوساف) و (نائیلە)دا دەسوڕێنەوەو هاواریان بۆ دەکەن، (ئەبوذەر) لەسەریان دەوەستێت و جنێو بە بتەکانیان دەدات.. دوو ئافرەتەکە دەقیژێنن، پیاوان وەك گوللە دەبارن بەسەریدا و، دەست بە لێدانی دەکەن تا لەهۆش خۆی دەچێت..

کاتێك بەئاگا دێتەوە، جارێکی دیکە هاوار دەکات کە (أشهد أن لا اله الا الله– وأن محمداً رسول الله)..

پێغەمبەرﷺ سروشتی ئەو قوتابییە هاتووە نوێیە و توانای بێوێنەی لە بەرەنگاربوونەوەی ناڕەوادا تێدەگات.. بەڵام هێشتا کاتی ئەوە نەهاتووە، بۆیە فەرمانەکەی دووبارە دەکاتەوە بۆی کە بگەڕێتەوە بۆ لای هۆزەکەی، هەتا کاتی ئاشکرابوونی ئاینەکەی بێت بگەڕێتەوە و بەشداری لە ڕووداوەکانیدا بکات.

* * *

(ئەبوذەر) دەگەڕێتەوە بۆ لای کەس و کار و هۆزەکەی، دەربارەی ئەو پێغەمبەرە بۆیان دەدوێت کە خەڵکی بۆ پەرستشی خوای بێهاوەڵ بانگهێشت دەکات و بۆ لای ئاکاری پەسەند ڕێنماییان دەکات، بەوجۆرە یەك بەیەکی هۆزەکەی موسڵمان دەبن و، تەنها بەوە واز ناهێنێت کە هۆزی غیفار موسڵمان بن، بەڵکو دەگوێزێتەوە بۆ لای هۆزی (ئەسلەم) و چراکانی خوای تێدا دادەگیرسێنێ..!!

ڕۆژگار دەگوزەرێ و، پێغەمبەر بەرەو مەدینە کۆچ دەکات و، موسڵمانان لەگەڵیدا لەوێ جێگیر دەبن، ڕۆژێکیان کۆمەڵە سوارەو پیادەیەکی زۆر، بە کاروانێکی گەورە بەرەو شاری مەدینە دێن، زرمەی پێی ئەسپەکانیان گوێی دەزرینگاندنەوە.. خۆ گەر (الله أکبر)ی بڵندیان نەبوایە، ئەوا هەرکەس بەدی بکردنایە وایدەزانی سوپایەکی گەورەی هێزی بێباوەڕانە.

کەژاوە بێشومارەکە نزیك بووەوە و.. چووە نێو مەدینەوە.. بەرەو ڕووی مزگەوتی پێغەمبەر و شوێنی نیشتەجێبوونی بوونەوە..

ئەو کەژاوەیە هەردوو هۆزی (غیفار و ئەسلەم) بوو، (ئەبوذەر) هەموویان بە موسڵمانی لەگەڵ خۆی هێنابوو.. پیاو و، ژن و، پیر و، لاو و، منداڵ..!!

بۆیە پێغەمبەرﷺ حەقی بوو زیاتر سەرسام بێت..

لە دوێنێیەکی دووردا زۆر سەری سوڕما کاتێك پیاوێکی لە هۆزی غیفار بینی لەبەردەمیدا ڕاوەستاوەو موسڵمان بوونی خۆی ڕادەگەیەنێت، ئەوە بوو بەسەرسامییەوە فەرمووی: (إن الله يهدي من يشاء)..!!

بەلام ئەمڕۆ، ئەوەتانێ سەرجەم هۆزی غیفار بە موسڵمانێتی هاتوونەتە خزمەتی و.. چەند ساڵێکیان لە ئیسلامێتیدا گوزەراندوە، پاش ئەوەی خوای گەورە لەسەردەستی (ئەبوذەر) هیدایەتی دان.. نەك هەر هێندە، بەڵکو هۆزی (ئەسلەم)یشیان لەگەڵ خۆیان هێناوە..

زلهێزانی جەردەیی و هاوپەیمانانی شەیتان، ئەمڕۆ بوونەتە پاڵەوان و زلهێزی چاکە و، هاوپەیمانی حەق..

جا ئایا بەڕاستی خوای گەورە هەرکەسێ بیەوێت هیدایەتی نادات..؟؟

پێغەمبەرﷺ سەرنجێکی پڕشادی و، سۆز و، خۆشەویستی سیمای چاکیانی دا و.. سەیرێکی هۆزی غیفاری کرد و فەرمووی:

((غفار غفر الله لها)).. غیفار خوا لێی خۆش بووە.

پاشان تەماشای هۆزی (ئەسلەم)ی کرد و فەرمووی:

((وأسلم سالمهم الله)).. (ئەسلەم)یش خودا بێزیان(سالم)ی کردن..

(ئەبوذەر)یش.. ئەو بانگخوازە چاکە.. بەهێز و خاوەن پەیمانە.. بەدەستهێنەری ئەو دەستکەوتە پڕ بەهایە.. ئایا پێغەمبەرﷺ ڕێزی لێ نەنێت بە سڵاوێکی تایبەت..؟؟

بەڵێ.. بەڕاستی پاداشتی ئەو زۆر زۆر دەبێت و، بەخێرهاتنەکەشی پیرۆزە، سنگی ئەو و، مێژووی ئەو، بەرزترین نیشانە و، باڵامەندترین ڕێز و جەسووری لەخۆ دەگرێت..

سەردەم و نەوەکان تەواو دەبن و، خەڵکی هەمان بیروبۆچوونی پێغەمبەرﷺ لەبارەی (ئەبوذەر)ەوە دووبارە دەکەنەوە:

(زەوی کەسی لەسەرخۆی هەڵنەگرتووە و، ئاسمانیش سێبەری بۆ هیچ کەس نەکردووە کە لە (ئەبوذەر) ڕاستگۆتر بێت)..!!

شێوازی قسەکردنی چاکتر بێت لە (ئەبوذەر)..؟؟

* * *

لەراستیدا پێغەمبەرﷺ داهاتووی هاوەڵەکەی خوێندەوەو، هەموو ژیانی لەو چەند وشەیەدا کورت کردەوە..

چونکە ڕاستگۆیی بوێرانە، کرۆکی هەموو ژیانی (ئەبوذەر) بوو..

ڕاستگۆی ناخی و، ڕاستگۆی ڕواڵەتی..

ڕاستگۆی بیروباوەڕی و، ڕاستگۆی شێوازی دواندنی.

جا بەراستی هەموو ژیانیشی راستگۆیانە دەگوزەرێنێ و.. خۆی بە هەڵەدا نابات و، خەڵکی دیکەش تووشی هەڵە ناکات و، رێگە بەهیچ کەسیش نادات کە بەهەڵەیدا ببات..

راستگۆیەکەشی چاکەیەکی بێزمانی لاڵ نابێت.. چونکە راستگۆی بێدەنگ لای (ئەبوذەر) راستگۆیی نیە..

بەڵکو راستگۆیی ئاشکراو دەریڕاوە.. ئاشکراکردنی رەوا و بەرەنگاربوونەوەی ناڕەوایە.. پشتگیری راست و پوچەڵکردنەوەی هەڵەیە..

راستگۆیی پشتیوانیکردنێکی جوامێرانەی حەقە و، گوزارشت کردنێکی بوێرانەیە لێی و، رۆیشتنێکی چاپوکانەیە لەگەڵی..

پێغەمبەرﷺ بە چاوڕوونیە دروستەکەی لەنادیاری دوور و نەزانراوی دوورەوە هەموو ئەو ئاستەنگ و ناڕەحەتیانەی بینیبوو کە (ئەبوذەر) بەهۆی راستگۆیی توندیەوە تووشی دەبێت، بۆیە هەموو کات فەرمانی پێدەکرد کە لەسەرخۆیی و ئارامگری بکاتە بەرنامەو رێبازی خۆی.

رۆژێکیان پێغەمبەرﷺ ئەم پرسیارەی ئاراستە کرد:

((ئەبوذەر، چی دەکەیت گەر مایت و بینیت کۆمەڵە سەرکارێك ماڵی دەستکەوت و سەرانە تایبەت دەکەن بەخۆیان و بەس))..؟؟

وەلامی دایەوە کە:

(سوێند بەو کەسەی تۆی بەحەق رەوانە کردووە، بەم شمشێرەم لێیان دەدەم)..!!

پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو:

((ئایا شتێکی لەوە چاکترت نیشان نەدەم..؟ ئارام بگرە تا بە دیداری من دەگەیتەوە))..

دەبێت بۆ پێغەمبەر ئەم پرسیارەی بەتایبەت لەو کردبێت..؟؟

سەرکاران. و.. سامان..؟؟

لەراستیدا ئەوە کێشەیەکە، (ئەبوذەر) هەموو ژیانی خۆی بۆ تەرخان دەکات و، ئەوە گرفتی ئەمە لەگەڵ کۆمەڵگاو لەگەڵ داهاتوودا..

پێغەمبەریش بەچاکی ئاشنای ببو بۆیە ئەو پرسیارەی ئاراستە کرد، تاوەکو ئەو ئامۆژگارییە بەنرخەی بۆ بکاتە تێشوو: ((ئارام بگرە تا بە دیداری من دەگەیتەوە))..

(ئەبوذەر)یش راسپاردەی مامۆستاو پێغەمبەرەکەی دەپارێزێت.. ئەو شمشێرە هەڵناگرێت کە پەیمانی دابوو لە دژی ئەو سەرکارانەی سامانی میللەت بۆ خۆیان خڕ دەکەنەوە بەرز بکاتەوە.. بەڵام بۆ تەنها چرکەساتێکی رۆژیش لێیان بێدەنگ نابێت..

بەڵێ.. کە پێغەمبەرﷺ رێگری ئەوەی لێدەکات شمشێر لە رووباندا هەلگرێت، ئەوا رێگری ئەوەی لێنەکردووە کە حەق لەسەر زمانە راست و دروستەکەی هەلگرێت.. بە دڵنیاییەوە ئەوەش دەکات...

* * *

سەردەمی پێغەمبەر تێپەڕی و پاش ئەویش سەردەمی (ئەبوبەکر) و، سەردەمی (عومەر)یش لە بالادەستیەکی تەواوەتیدا بوو بەسەر گومڕاکارانی ژیان و پالنەرەکانی ئاشوویدا..

تەنانەت ئەو دەروونانەشی مەیل و ئارەزوویان لێبوو، هیچ کەلێن و ڕێگەیەکیان لەبەردەم ئارەزووەکانیاندا بەدی نەدەکرد..

ئەو ڕۆژانە، خواروخێچی و لاڕێبوون نەبوو تا (ئەبوذەر) دەنگی خۆی لە دژیان بەرز بکاتەوەو بە وشە گەرم و بلێسەدارەکانی دایانشۆرێت..

سەردەمی ئەمیری بڕواداران (عومەر) درێژەی کێشا، بەجۆرێك دونیا نەویستی و، سککوشین و، دادگەری بەسەر والی و ئەمیرەکان و دەولەمەندەکاندا دانابوو، کە لەوانەبوو لەسەرووی توانای مرۆڤەوە بێت..

جا والیەك لە والییەکانی لە عێراق، یا لەشام، یاخود لە صەنعا، یا لە هەر ولاتێکی دیکەی دوور بوویێت، نەیدەتوانی جۆرێك لە شیرینی بخوات، کە زۆربەی زۆری خەلکی توانای کڕینیان نەبێت، چونکە پاشی چەند ڕۆژێك هەوالەکە دەگەیشتەوە بە (عومەر) و.. فەرمانە راستەوخۆکانی دەهات بۆ ئەو والییە کە بێت بۆ مەدینە تاوەکو حسابی گرانی خۆی وەرگرێت..!!

جا کەوابوو (ئەبوذەر) دەبێت پیرۆزبایی لێبکات و.. زۆر دلخۆش بێت کە فاروقی مەزنی ئەمیری بڕوادارانە، لەکاتێکدا (ئەبوذەر) هیچ شتێك لە ژیانیدا وەك قۆستنەوەی دەستەلات و قۆرخکردنی سەروەت و سامان بێزاری نەدەکرد، ئەوا (عومەری کوڕی خطاب) بەچاودێریکردنی توندی دەستەلات و، دادوەری لە دابەشکردنی ساماندا ئاسودەیی و دلنیایی بۆ ئەو دەستەبەر دەکرد..

هەر بۆیە خۆی تەرخان کردبوو بۆ پەرستشی پەروەردگار و.. جیهاد لە پێناویدا.. هەر کاتێکیش سەرپێچییەکی لێرە یا لەوێ بەدی بکردایە لێی بێدەنگ نەدەبوو.. شتی واش زۆر کەم دەبینرا..

بەلام کاتێ کە مەزنترین و، دادگەرترین و، چاکترین فەرمانڕەوای شێر ئاسای مرۆڤایەتی، لەو ڕۆژەدا مالئاوایی لە دونیا دەکات و، لەدوای خۆی بۆشاییەکی ئێجگار گەورە بەجێ دەهێلێت و، کۆچکردنەکەی کاردانەوەی وەهای دەبێت کە بواری لێ هەلهاتنی نیەو خەلکی توانایان نیە بەرامبەری، ڕزگارکردنی خاکی ولاتانیش بەردەوامە، لەگەل ئەوەیشدا رادەی ئارەزوو و گەیشتنی بە خۆشییەکانی ژیان لەوپەڕیدایە..

(ئەبوذەر) ئەو مەترسییە بەدی دەکات..

خستنەپێشی بەرژەوەندی خۆیی لەوانەیە ئەو کەسانە توشی ئاشووب بکات کە ڕۆلیان لە ژیاندا ئەوەبوو بەیداخی خودا بەرز بکەنەوە..

دونیا بەرازاندنەوە پوچەڵەکەی و گومڕاییە زیانبەخشەکەیەوە، لەوانەیە ئەو کەسانە تووشی ئاشووب بکات کە هەموو پەیامەکەیان ئەوەیە ژیان بکەنە کێڵگەیەك بۆ کردەوەچاکەکان.. سامانیش کە خوای گەورە کردویەتیە خزمەتکارێکی گوێڕایەڵ بۆ مرۆڤ، لەوانەیە بگۆڕێت و ببێتە گەورەیەکی ستەمکار..

لەگەڵ کێ..؟؟

لەگەڵ هاوەڵانی (محمد)، ئەو (محمد)ەی کاتێ وەفاتی کرد زرێپۆشەکەی لە بارمتەدا بوو، لەسەردەمێکدا دەستکەوت و سامانەکان لەبەرپێیدا کەڵەکە کرابوو..!!

ئەو فەڕو بەرەکەتانەی زەوی کە خوای گەورە بەسەر هەموو خەڵکیدا ڕژاندووە و.. مافی هەموویانی تێدا داناوە و پێی دەبڕێت، گومان دەبرێت کە داگیربکرێت و ببێتە هۆی خۆ بەگەورەزانین..

دەستەڵاتدارێتی ئەو بەرپرسیارێتیەیە کە بەهۆی سەختی لێپرسینەوەی خوای گەورە لەسەری دڵی چاکەکاران لەبەری دەلەرزێ، وا دەگۆڕێت بۆ هۆکاری باڵادەست بوون و، دەوڵەمەندی و، رابواردنی تێکدەری توند..

(ئەبوذەر) هەموو ئەوانەی بەدی کرد، کەچی لەدوای ئەرك و بەرپرسیارێتی بۆ خۆی نەگەڕا.. بەڵکو هات و دەستی راستی دایە شمشێرەکەی و، لە هەوای داو لەتی کرد و، هەستایەوە بەو شمشێرەی کە ئاشنای سەرشۆڕی نەبووە ڕوویەڕووی کۆمەڵگا ببێتەوە.. بەڵام زۆر خێرا ئامۆژگارییەکەی پێغەمبەری هاتەوە یاد و، شمشێرەکەی خستەوە ناو کالانەکەی، چونکە بۆی نیە لەرووی موسڵماندا بەرزی بکاتەوە..

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَنْ يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلاَّ خَطَأً: بۆ هیچ بڕوادارێك نیە کە بڕوادارێکی دیکە بکوژێت مەگەر بە هەڵە.﴾النساء:٩٢.

ئەمڕۆ رۆڵی ئەو کوشتن نیە.. بەڵکو بەرهەڵستی کردنە..

شمشێریش ئامێری گۆڕین و راستکردنەوە نیە، بەڵکو وشەی راستگۆی دەستپاکی مەردانە ئامرازی گۆڕان و راستکردنەوەیە..

ئەو وشە دادگەرانەی کە ڕێگەی خۆی ون ناکات و، سەرئەنجامی مەترسیدار نابێت.

رۆژێکیان پێغەمبەر هەواڵی بە کۆمەڵێك لە یاوەرانی دا، کە زەوی هیچ کەسێکی هەڵنەگرتووە و، ئاسمانیش سێبەری بۆ کەس نەکردووە لە (ئەبوذەر) راستگۆتر بێت لە قسەکردندا..

جا کەسێك ئەو هەموو توانایەی هەبێت لەراستی وتن و، دروستی بڕوا پێهێناندا، چ پێویستییەکی بە شمشێر هەیە..

تەنها وتنی وشەیەك، کاریگەرترە لە پڕ بە زەوی لە شمشێر.

دەبا بەو راستگۆییەوە بڕوات بەرەو لای سەرکاران و، دەوڵەمەندان و، هەموو ئەوانەی کە بەهۆی چۆك دادانیان لەبەردەم دونیادا دەبنە هۆی مەترسی بۆ سەر ئەو ئاینەی کە بۆ رێنوێنی هاتووە، نەك دەست پانکردنەوە و، پێغەمبەرایەتییە، نەك پادشایی.. بەزەییە.. نەك سزا و.. خاکەرایییە.. نەك لوت بەرزی.. هاوشانییە.. نەك جوداخوازی، قەناعەت هێنانە.. نەك تەماح کاری و، تێربوونە.. نەك رابواردن و.. لەسەرخۆییە لە وەرگرتنی ژیان، نەك تووشی فیتنە بوون بە دونیا و تیاچوون لەپێناویدا..

با (ئەبوذەر) بۆ لای هەموو ئەوانە بکەوێتە رێ، هەتا خوای گەورە لەنێوان ئەم و ئەواندا بە حەق دادوەری بکات، کە لەراستیدا خوای گەورە چاکترینی دادوەرانە..

* * *

(ئەبوذەر) بەرەو لای بنکەی دەستەڵاتدارێتی و سامان کەوتە رێ و، یەك بەیەك دای بەسەریاندا و، لە چەند رۆژێکی کەمدا بووە خاوەنی ئەو ئاڵایەی کە جەماوەر و زەحمەتکێشان لەدەوری کۆببوونەوە..

تەنانەت لەو وڵاتە هەژارانەش کە خەڵکەکەی تا ئەو ساتە ئەویان نەدیبوو.. باسی ئەویان پێگەیشتبوو.. وای لێهاتبوو کە ناوی لای هەر هۆزێك بهێنرایە دەبووە هۆی وروژاندنی چەندین پرسیاری گرنگ کە هەڕەشەیان لە بەرژەوەندی دەستەڵاتدار و دەوڵەمەندان دەکرد.

خۆ گەر ئەم شۆڕشگێڕە پایەبڵندە بیویستایە خۆی و برادەکەی ئاڵایەکی تایبەتیان هەبێت، ئەوا دروشمی هەڵکۆڵراوی سەر ئەو ئاڵایە تەنها لغاوێك دەبوو کە ئاگرێکی سوور و بڵێسەداری لێدەهاتە دەرەوە، ئەو سرودەشی کە لەهەموو کات و جێگایەك دووبارەی دەکردەوە و.. خەڵکیش لەوەوە وەك سرود دەیانووتەوە ئەم وشانە بوو:

(مژدە بدە بەو کەسانەی ئاڵتون و زیو کۆدەکەنەوە بە کۆمەڵە ئوتویەکی ئاگرین ناوچەوان و لاشەیانی پێ داخدەکرێ لە رۆژی دواییدا)..!!

بەهیچ شاخێکدا هەڵنەدەزنا و، بەهیچ دەشتێکدا نەدەهاتە خوار و، نەدەچووە هیچ شارێك و، رووبەڕوی هیچ سەرکارێك نەدەبوویە ئەو وشانەی لەسەر زار نەبوایە..

تا وای لێهاتبوو کە خەڵکی دەیانبینی بۆ لایان دێت بەم وشانە پێشوازییان لێی دەکرد:

(مژدە بدە بەوانەی سامان و ماڵ کۆدەکەنەوە بە ئاگر داخدەکرێن).

ئەو دروشمەی بووبووە ئاڵایەکی سەر ئەو پەیامە، کە ژیانی خۆی بۆ تەرخان کردبوو، کاتێك کە بینی سامانەکان کەڵەکە دەبن و قۆرخ دەکرێن و.. کاتێك سەیری کرد دەستەڵاتدارێتی لوت بەرزی و قۆستنەوەیە.. کاتێك دەبینێ خۆشەویستی دونیا خەڵکی سەرکەش دەکات و گومان دەبرێت هەموو ئەو جوانی و پارێزکاری(ورع) و، دڵسۆزی و، لێبڕانەی لەماوەی چەند ساڵێکدا پەیامە مەزنەکە دروستی کرد زیندەبەچاڵ بکرێت..

لەم ڕووەوە بە بنکەیەك دەستی پێکرد کە لە هەموویان زیاتر دەسەڵاتدار و مەترسیدارتر بوو.. کە ئەویش شام بوو، لەوێ (معاویەی کوڕی ئەبو سفیان) فەرمانڕەوای خاکێك بوو کە لەهەموو وڵاتانی دیکەی ئیسلامی زیاتر پڕ خێر و بێر و دەسکەوت بوو.. (معاویە) بەبێ‌شومار سامانی دابەش دەکرد و، کەسانی پلەوپایەدار و ناسراوی پێ لەخۆی نزیك دەکردەوە، ئایندەی خۆی پێ مسۆگەر دەکرد کە ئارەزووی دووری پێ هەبوو.

لەوێ زەوی‌وزار و کۆشك و تەلار و سەروەت و سامان هەڵگرانی بانگەوازی تووشی ئاشووب دەکرد، دەبا (ئەبوذەر) درك بەو مەترسیە بکات بەر لەوەی گەمارۆی بدات و بیڕوخێنێ..

سەردەستەی بەرهەڵستکاران کراسە خاکەراییەکەی هەڵکرد و، زۆر خێرا بەرەو شام کەوتە ڕێ..

خەڵکە ئاساییەکە هەرکە بەهاتنی ئەویان زانی، بەوپەڕی جۆش و خرۆشەوە چوونە پێشوازی و، بەرەو هەر لایەك بڕۆیشتایە لە دەوری بوون..

قسەمان بۆ بکە ئەی (ئەبوذەر).. !

دەی ئەی هاوەڵی پێغەمبەری خوا بۆمان بدوێ.. !

(ئەبوذەر)یش سەرنجێکی وردی دەوروبەری خۆی دەدات و، دەبینێت زۆربەیان هەژار و نەدارن.. پاشان سەرنجی لایە نزیکەکانی شار دەکات و کۆشك و تەلار و زەوی‌وزار بەدی دەکات..

پاشان هاوار لە خەڵکەکەی دەوروبەری دەکات و دەڵێت:

(سەرم سوڕماوە لەو کەسەی ژەمێ لەماڵەکەیدا شك نابات، چۆن شمشێرەکەی هەڵناکێشێت و بچێتە سەر ئەو کەسانە)..؟؟!!

دەست بەجێ ئامۆژگارییەکەی پێغەمبەرەکەی پێغەمبەری خوای دێتەوە یاد کە لەسەرخۆیی بخاتە جێگای هەڵگەڕانەوە، وشەی بوێرانە لەجێگای شمشێر دابنێ، واز لەو زمانەی شەڕ دەهێنێت و دەگەڕێتەوە سەر زمانی مەنتیق و بڕواپێ‌هێنان، خەڵکی فێردەکات کە هەموویان وەك ددانەکانی شانە یەکسانن.. هەموویان هاوبەشن لە ڕزق و ڕۆزیدا.. کەس ڕێز و چاکەی(فەزڵی) بەسەر ئەوی تردا نیە بە تەقوا نەبێت.. دەبێت سەرکار و ئەمیر و والی خەڵکی، یەکەمین کەس بێت برسی بێت، گەر برسێتی ڕووی لە خەڵکی کرد و، دوایەمین کەسیش بێت بۆ تێربوون گەر خەڵکی تێر بوون.

ئەو بڕیاری دا کە بە وشە و بوێریەکەی ڕایەکی گشتی وا لەهەموو وڵاتانی ئیسلامدا دروست بکات کە زرنگی و، بەرگری و، هێزێکی وەهایان پێ ببەخشێت کە ببێتە لغاوی ئەمیر و دەوڵەمەندەکان و، نەهێڵێت کە چینێك پەیدابێت دەسەڵات بۆ خۆیان بقۆزنەوە، یان سەروەت و سامان قۆرخ بکەن..

لە ڕۆژانێکی کەمدا، شام هەمووی بۆ گوێڕایەڵی وەك شانەی هەنگ وابوو کە شاهەنگەکەی خۆی دۆزیبێتەوە، خۆ گەر (ئەبوذەر) تەنها ئاماژەیەکی سەرپێیی بدایە بۆ شۆڕش ئەوا ئاگر هەڵدەگیرسا.. بەڵام -وەك وتمان- گرنگیدانی خۆی لەوەدا خەست کردبووەوە کە رایەکی گشتی وا دروست بکات کە ڕێزی خۆی بسەپێنێت، وتەکانیشی بوویوونە قسەوباسی نێو کۆڕ و دانیشتنیمزگەوت و ڕێگاویان..

ئەو ڕۆژە مەترسیەکەی لەسەر خاوەن بەرژەوەندییەکان زیاتر پەرەی سەند، کە بە ئامادەبوونی کۆمەڵێك خەڵك وتوێژی لەگەڵ معاویەدا کرد و، ئامادەبووی نێو کۆڕەکە بۆ کەسانی ئامادەنەبوویان گێڕایەوە، بای شەماڵیش هەواڵەکەی بڵاوکردەوە..

(ئەبوذەر)ی لەهەموو کەس ڕاستگۆتر، هەروەك پێغەمبەر و مامۆستاکەی وەسفی کرد، ڕادەوەستا و بەبێ ترس و پێچ و پەنا پرسیاری لە معاویە کرد دەربارەی ئەو سەروەت و سامانەی هەیبوو بەرلەوەی ببێتە دەستەڵاتدار و، ئەوەی ئەمڕۆ هەیەتی..!!

لەبارەی ئەو خانووەی لە مەککە تێیدا دەژیا و، ئەو کۆشك و تەلارانەی ئەمڕۆ لە شام هەیەتی..!!

پاشان پرسیارەکەی ئاراستەی ئەو هاوەڵانە کرد کە لەگەڵ معاویەدا هاتبوون بۆ شام و لەو دانیشتنەدا ئامادەبوون و هەندێکیشیان ئێستا خاوەن زەوی و زار و کۆشك و تەلارن.

پاشان هاوار لە هەموویان دەکات: ئێوەن لەگەڵ پێغەمبەردا دەژیان و قورئانی بۆ دەهاتە خوارەوە..؟؟

لەبری ئەوان خۆی وەڵامی دەدایەوە: بەڵێ خوای گەورە قورئانی لەناوتان ناردە خوار و، لەگەڵ پێغەمبەردا چەندین غەزاتان بینیوە..

پاشان دەهات و دەیپرسی: ئایا ئێوە لەقورئانی پیرۆزدا ئەم ئایەتە بەدی ناکەن:

﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ، يَوْمَ يُحْمَى عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَى بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَذَا مَا كَنَزْتُمْ لأَنفُسِكُمْ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ: ئەو کەسانەی زێڕ و زیو کۆدەکەنەوە و لەڕای خودا بەختی ناکەن، تۆ مژدەیان بدەرێ سەبارەت بەو ئازارە بەژانەی توشی دێن، ڕۆژێ کە ئەم زێڕ و زیوە لە ئاگری دۆزەخ سۆر دەکرێنەوە و تەوێڵ و کەلەکە و پشتیانی پێ داغ دەکرێ، دەردی ئەو شتە بچێژن کە بۆ خۆتان لەسەر یەکتان دانابوو.﴾التوبة:٣٤-٣٥...؟؟

معاویە ڕەوتی قسەوباسەکەی دەگۆڕێ و دەڵێت: ئەو ئایەتە لەسەر ئەهلی کیتاب هاتۆتە خوارێ..

(ئەبوذەر) هاوار دەکات: نەخێر.. بەڵکو بۆ ئێمە و ئەوانیش دابەزیوە..

(ئەبوذەر) بەردەوام دەبێت لەسەر ئامۆژگاریکردنی معاویەو ئەوکەسانەی لەگەڵیدان و داوایان لێدەکات کە واز لەو هەموو زەوی و زار و کۆشك و تەلار و سامانە بهێنن کە لە بەردەستیاندایە و، هەرکەسە تەنها پێویستی ڕۆژێك زیاتر لای خۆی گل نەداتەوە..

هەواڵی ئەم دیمانەو دەنگ و باسەی (ئەبوذەر) بۆ نێو کۆڕ و دانیشتن و کۆبوونەوەکان دەگوێزرێتەوە.....

سرودەکەی (ئەبوذەر)یش لەنێو ماڵ و سەر ڕێگاکاندا بەرزتر دەبێتەوە:

(مژدە بدە بەوانەی سامان و ماڵ کۆدەکەنەوە لە قیامەتدا بە ئاگر داخدەکرێن).

معاویە هەست بە مەترسی دەکات و، وشەکانی ئەو شۆڕشگێڕە پایەبڵندە بێزاری دەکات، بەڵام ئەوەش دەزانێت کە خاوەن ڕێزی تایبەتە، بۆیە دەستی خراپەی بۆ درێژ ناکات، دەست بەجێ نامەیەك بۆ خەلیفە (عوسمانؓ) دەنووسێ و پێی دەڵێت: (ئەبوذەر) خەڵکی شامی تێکداوە.

(عوسمان)یش نامە بۆ (ئەبوذەر) دەنووسێ و بانگی دەکاتەوە بۆ مەدینە.

لە ڕۆژێکدا کە هەرگیز شاری دیمەشق ڕۆژی ئاوا گەرم و گوڕی شادی و خواحافیزی لێکردنی بەخۆوە نەدیبوو، جارێکی تر (ئەبوذەر) کراسەکەی هەڵدەماڵێ و لەشامەوە بەرەو مەدینە دەگەڕێتەوە.

* * *

(هیچ پێویستیەکم بە دونیای ئێوە نیە)...!!

(ئەبوذەر) پاش ئەوەی کە گەیشتە مەدینە ئەوەی بە خەلیفە (عوسمان) وت، گفتوگۆیەکی دوورو درێژ لەنێوانیاندا دروست بوو.

خەلیفە (عوسمان) پاش کۆتایی هاتنی گفتوگۆکەی لەگەڵ هاوڕێکەیدا و، لەو هەواڵانەشەوە کە لەهەموو جێگاکانەوە پێی دەگەشت دەربارەی برەودانی خەڵکی بە بۆچوونەکانی (ئەبوذەر)، بەراستی لە مەترسی و هێزی بانگەوازەکەی (ئەبوذەر) تێگەیشت، بڕیاری دا کە لای خۆی لەشاری مەدینە بیهێڵێتەوە و، شوێنی نیشتەجێبوونی بۆ دیاری بکات.

ئەوەبوو (عوسمان) بڕیارەکەی بەشێوازێکی جوان و نەرم و نیان بە (ئەبوذەر) ڕاگەیاند و، پێی وت:

(لێرە لای من بمێنەرەوە، تۆز و خۆڵی گومان لە سەرت نامێنێت و دەڕوات)..

(ئەبوذەر) وەڵامی دایەوە: (هیچ پێویستیەکم بە دونیای ئێوە نیە)..!

بەڵێ، ئەو هیچ پێویستی بە دونیای خەڵکی نیە. و.. لەو کەسە دونیا نەویستانەیە کە بەدوای دەوڵەمەندی ڕۆحدا وێڵن، بۆ بەخشین لەژیاندان، نەك وەرگرتن..!!

داوای لە خەلیفە (عوسمانؓ) کرد کە مۆڵەتی بدات بەرەو (ڕەبەذە) بچێت، ئەویش

مۆڵەتی دا..

لەبەرھەڵستی کردنیشدا ئەو ھەر بە دەستپاکی بۆ خودلو پێغەمبەرەکەی مابوویەوە، لە قولایی دەروونیدا ئامۆژگاریەکەی پێغەمبەریﷺ دەپاراست کە شمشێر بەرز نەکاتەوە، لەراستیدا وەك ئەوەی پێغەمبەر ھەموو غەیبی بینیبێت وابوو.. غەیب و ئایندەی (ئەبوذەر)، بۆیە ئەو ئامۆژگارییە بەنرخەی پێبەخشی.

لەگەڵ ئەوەشدا (ئەبوذەر) بێزاری و ناڕەحەتی خۆی نەدەشاردەوە، کاتێك دەیبینی ھەندێك لەوانەی تامەزرۆی ھەڵگیرسێنەری ئاشووبن وتەکانی ئەو و بانگەوازەکەی دەکەنە ھۆکاری تێرکردنی تامەزرۆیی و فێڵەکانیان.

ئەو کاتەی کە لە (رەبەذە) بوو، رۆژێکیان شاندێك لە کوفەوە ھات داوایان لێکرد ئاڵای شۆڕش لە دژی خەلیفە بەرز بکاتەوە، ئەویش بە وشەی توند سەرزەنشتی کردن و وتی:

(سوێند بەخوا گەر (عوسمان) لەسەر درێژترین تەختە، یان شاخ، لەخاچم بدات، ھەر گوێبیست و گوێڕایەڵی دەبم و، ئارامی لەسەر دەگرم و، خۆڕاگر دەبم، ئەوە بەچاك دەزانم بۆ خۆم..

یا گەر لە ئاسۆوە بەرەو ئاسۆ رێگام پێبکات، ھەر گوێبیست و گوێڕایەڵی دەبم و، ئارام دەگرم لەسەری و، خۆگر دەبم و، ئەوە بەچاك دەزانم بۆ خۆم..

گەر بشم گەڕێنێتەوە بۆ ماڵی خۆم، ھەر گوێبیست و گوێڕایەڵی دەبم و، ئارام دەگرم لەسەری و، خۆگر دەبم و، ئەوە بەچاك دەزانم بۆ خۆم)...

ئەو پیاوە ھیچ کام لە مەبەستە دونیاییەکانی ناوێت، پاشان خوای گەورە رووناکی بەرچاورونی پێبەخشیوە، جارێکی دیکە ھەستی بە بەڵا و مەترسی ئاشووبی چەکداری کردبوو بۆیە خۆی لێ دوورخستەوە، ھەروەك چۆن دەرکی بە بەڵا و مەترسی بێدەنگ بوون کردبوو، خۆی لەویش دەپاراست و، دەنگی بەرز دەکردەوە -نەك شمشێرەکەی- بەوشەی حەق و وتنی راستی.

نە چاوچنۆکی گومڕای دەکات و نەئەنجامەکان ملکەچی دەکات..!

لە راستیدا (ئەبوذەر) خۆی بۆ بەرھەڵستی کردنێکی پاك و دونیانەویستانە یەکلا کردبۆوە.

ھەموو تەمەنیشی بۆ سەرنجدان لە ھەڵەکانی فەرمانڕەوایی و سامان تەرخان کردبوو، چونکە فەرانڕەوایی و سامان ئەوەندە گومڕاکاری و ئاشووبیان لەخۆگرتووە کە (ئەبوذەر) ترسی ھەیە تووشی ئەو برایانەی بێت کە لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ ئاڵای ئیسلامیان ھەڵگرتبوو، ئەو کەسانەی دەبێ بەردەوام ھەڵگری بن.

ھەروەھا فەرمانڕەوایی و سامان، ھەردووکیان رەگی ژیانی نەتەوەو کۆمەڵەکانن، گەر تووشی گومڕایی بوون، ئەوا ئایندەی خەڵکی رووبەڕووی مەترسییەکی تەواو دەبێت..

(ئەبوذەر) ئاواتی ئەوەی دەخواست کە ھیچ کام لە ھاوەڵانی پێغەمبەر ئەمیرایەتی لە

ئەستۆ نەگرێت، یان سامان کۆنەکاتەوە، وەکو جاران سەربازی ڕێنوێنی و، خواپەرست بن..
ئەو بەچاکی ئاشنای درندەیی دونیا و درندەیی سامان بوو و، دەیزانی کە (ئەبوبەکر) و (عومەر) دووبارە نابنەوە.. زۆر جاریش لە پێغەمبەریﷺ دەبیست کە هاوەڵانی لە گومڕابوون بەهۆی ئەمیرێتییەوە ئاگادار دەکردەوەو دەیفەرموو:
((... ئەوە سپاردەیە و، لە ڕۆژی قیامەتدا سەرشۆڕی و پەشیمانییە.. مەگەر کەسێك وەکو پێویست بەڕێوەی بردبێت و، ئەوەی لەسەر شانیەتی بەجێی هێنابێت))رواه مسلم.
کار بەوە گەیشتبوو کە (ئەبوذەر) لە هاوەڵەکانی دوورەپەرێز بێت، چونکە ئەوان فەرمانڕەوایەتیان گرتە دەست، بەهۆی سروشتی کارەکەشیانەوە دەوڵەمەندی ڕووی تێکردن..
ڕۆژێکیان (ئەبوموسای ئەشعەری) پێی گەیشت، هەرکە بینی هەردوو دەستی بۆ کردەوەو لەخۆشی بینیندا هاواری کرد: (سڵاوت لێ بێت (ئەبوذەر).. سڵاوت لێبێ براکەم).
بەڵام (ئەبوذەر) لەخۆی دورخستەوەو وتی:
(من برات نیم، ئەو کاتە برات بووم کە هێشتا نەبووبوویتە والی و ئەمیر),,!
هەروەها ڕۆژێکیش بە (ئەبوهورەیرە) گەیشت و لە ئامێزی گرت، بەڵام (ئەبوذەر) پاڵی پێوە ناو پێی وت:
(دووریکەوەرەوە لێم.. ئەوە تۆ نیت کە ئەمیریت وەرگرتووە و، کۆشك و تەلارت بەرز کردۆتەوەو، مەڕ و ماڵات و کشتوکاڵت هەیە)..؟؟
(ئەبوهورەیرە)ش بەردەوام بووو لە بەرگریکردن لەخۆی و پوچەڵکردنەوەی ئەو پروپاگەندانە..
وا دیارە کە (ئەبوذەر) زۆر ڕۆچوویێت لەو هەڵوێستەیدا بەرامبەر دەستەڵات و سامان..
بەڵام (ئەبوذەر) خاوەنی بۆچونێك بوو راستگۆیی لەگەڵ خۆی و ئیمانەکەیدا بۆی دروست کردبوو، (ئەبوذەر) بە هیواو ئاوات و کردەوەکانی.. ئاکار و خەونەکانی، لەو ئاستەدا وەستابوو کە پێغەمبەری خوا و (ئەبوبەکر) و (عومەر)ی هاوەڵی بەجێیان هێشتبوو..
خۆ ئەگەر هەندێك کەس ئەوە بە نمونەیی تێدەگەن و وادادەنێن کە کەس پێی ناگات، ئەوا (ئەبوذەر) وەك پێشەنگێك سەیری دەکات کە نەخشەی ڕێگای ژیان و کار دەکێشێت، بەتایبەت بۆ ئەو پیاوانەی هاوژیانی پێغەمبەرﷺ بوون و، لە پشتیەوە نوێژیان کردوەو، لەگەڵیدا جیهادیان کردووە و، پەیمانیان پێداوە لەسەر گوێڕایەڵی..
هەروەها ئەو-وەك پێشتریش باسمان کرد- بە تێگەیشتنە پرشنگدارەکەی دەیزانی کە دەستەڵات و سامان چەند کاریگەرییەکی یەکلاکەرەوەیان هەیە لەسەر ئایندەی خەڵکی، پاشان هەر ناتەواوییەك تووشی سپاردەی دەستەڵات یان دادگەری سامان بێت، ئەوا دەبێتە مەترسییەکی خراپ و پێویستە لابرێت و بەرهەڵستی بکرێت..

* * *

(ئەبوذەر) ئەوەندەی پێی کرا لە ژیاندا هەڵگری ئاڵای پێشەنگی مەزنی پێغەمبەرﷺ و هەردوو هاوەڵەکەی بوو، ئەمەکدار بوو بۆیان و، پاسەوانی بوو.. مامۆستا بوو لە هونەری زاڵبوون بەسەر گومڕاییەکانی دەستەڵات و، ساماندا.

داوایان لێکرد لە عێراق ببێتە ئەمیر، وتی:

(نا بەخوا... هەرگیز ناتوانن سەرنجم بۆ لای دونیاکەی خۆتان ڕاکێشن)..

ڕۆژێکیان هاوڕێیەکی بینی پۆشاکێکی کۆنی لەبەردایە، لێی پرسی:

- جگە لەمە هیچ کراسێکی دیکەت نیە..؟! خۆ هەر لەم چەند ڕۆژەدا بوو دوو کراسی نوێم لەلات بینی..؟

(ئەبوذەر) وەڵامی دایەوە:

(برازای ئازیزم... بەخشینم بە کەسانێك کە لەمن زیاتر پێویستیان پێی بوو)..

وتی: سوێند بەخوا... تۆش پێویستت پێیانە!!

(ئەبوذەر) وەڵامی دایەوە:

(خودایە لێمان خۆش ببێت.. بەڕاستی تۆ دونیا زۆر بە گەورە دەگریت، ئەم عابایەی بەسەر شانمەوەیە نایبینیت..؟! دانەیەکی دیکەشم هەیە بۆ نوێژی جومعە، بزنێکیشم هەیە دەیدۆشم، گوێدرێژێکیشم هەیە پێی دەڕۆم، دەباشە چ نیعمەتێك لەوە مەزنترە کە ئێمەی تێداین)..؟؟

* * *

ڕۆژێکیان دانیشتبوو قسەی دەکرد و دەیوت:

(ئازیزەکەم بە حەوت شت ڕایسپاردم..

فەرمانی پێکردم بە خۆشویستنی نەداران و، نزیکبوونەوە لێیان..

فەرمانی پێکردم کە سەیری ئەو کەسە بکەم لەخۆم خوارترە و، سەیری ئەو کەسە نەکەم کە لەسەرووی خۆمەوەیە.

فەرمانی پێکردم کە داوای شت لە هیچ کەس نەکەم.

فەرمانی پێکردم کە سیلەی ڕەحم بەجێ بهێنم.

فەرمانی پێکردم کە ڕاستی بڵێم با تاڵیش بێت.

فەرمانی پێکردم لەپێناوی خوادا لە لۆمەی لۆمەکاران نەترسم.

فەرمانی پێکردم کە زۆر (لا حول ولا قوة الا بالله) بڵێم.

لەڕاستیدا لەسەر ئەم ڕاسپاردەیە مایەوە و، هەموو ژیانی خۆی پێ ڕاخاو دابوو، هەتا بوویووە (ویژدانێك) لەنێوان گەل و ئوممەتەکەیدا..

ئیمامی عەلی دەڵێت:

(ئەمڕۆ هیچ کەس نەماوە لەپێناوی خوادا لە لۆمەی لۆمەکاران سڵ نەکات جگە لە (ئەبوذەر).)..!!

ژیا بۆ دژایەتی کردنی قۆستنەوەی دەستەڵات و، قۆرخکردنی سامان..

ژیا بۆ لەناوبردنی هەڵە و، بونیاتنانی راستی..

دونیانەویستانە بۆ بەرپرسیارێتی ئامۆژگاریکردن و ئاگادارکردنەوە ژیا..

رێگرییان لێدەکرد فەتوا بدات، ئەو زیاتر دەنگی خۆی بەرز دەکردەوە و، بە رێگرەکانی دەوت:

(سوێند بەخوا، گەر شمشێر بخەنە سەر ملم و، دوای ئەوە وا گومان ببەم کە من بەجێهێنەری وشەیەکم کە لە پێغەمبەرمﷺ بیستووە بەر لەوەی لێی دەن، ئەوا هەر جێبەجێی دەکەم.. !!

بریا ئەو کات و ساتە موسڵمانان گوێبیستی قسەو ئامۆژگارییەکانی بوونایە..

ئەوا ئاشووبەکان هەر لە لانکدا دەمردن، ئەو ئاشووبانەی کە دواتر گەورە بوون و مەترسیان زیادی کرد و، دەوڵەت و کۆمەڵگا و ئیسلامی تووشی مەترسی وەها کرد، کە لەوە مەترسیدارتر نەبێت..

ئێستاش (ئەبوذەر) لە (رەبذە) چارەسازی ئێش و ژانی سەرەمەرگی دەکات.. ئەو جێگایەی کە هەڵیبژارد بۆ نیشتەجێبوونی پاش ناکۆکیەکەی لەگەڵ عوسماندا، دەسا وەرن با پێکەوە سڵاوی ماڵئاوایی لەم رێبوارە مەزنە بکەین و، دوا دیمەنی ژیانی سەرسوڕهێنەری سەیر بکەین.

ئەو ئافرەتە گەنم رەنگە لاوازەی لە تەنیشتیەوە دانیشتووەو دەگری، خێزانەکەیەتی..

ئەویش لێی دەپرسێت: بۆچی دەگریت کە دەزانیت مردن حەقە..؟

وەڵامی دەداتەوە کە بۆ ئەوە دەگری: (تۆ دەمریت و، هیچ پۆشاکێکم لا نیە بیکەم بە کفن بۆت)..!!

زەردەخەنەیەکی ماڵئاوایی ئاسای بۆ دەکات و، پێی دەڵێت: دڵنیابە.

(... مەگری، رۆژێکیان من لەگەڵ چەند هاوەڵێکدا لای پێغەمبەرﷺ دانیشتبووم، گوێم لێبوو فەرمووی: یەکێك لەنێوە لە دەشتاییەکی وشکی سەرزەویدا دەمرێت، کۆمەڵێك لە بڕواداران دەیبینن و دەینێژن..

هەموو ئەو هاوەڵانەی لەو دانیشتنەدا لەگەڵمدا بوون لەنێو کۆمەڵ و ئاوەدانیدا مردن و جگە لە من کەسیان نەماوە.. ئەوەتا منیش لەم دەشتە وشکەدا دەمرم، چاودێری رێگا بکە.. کۆمەڵێك بڕوادار دەردەکەون، سوێند بەخوا من نەدرۆم کردووەو نە درۆشم لەگەڵ کراوە)..

رۆحی بەرەو لای پەروەردگاری گەڕایەوە..

راستیشی وت..

ئەو کاروانەی کە لە بیاباندا ڕێگا دەبڕێت، لە کۆمەڵێك موسڵمان پێکهاتووە، لە سەرووی هەموویانەوە هاوەڵی پێغەمبەری خودا -عبداللهی کوڕی مەسعود-ی تێدایە.

(ئیبن مەسعود) دیمەنەکە بەدی دەکات بەر لەوەی پێی بگات.. دیمەنی لاشەیەکی ڕاکێشراو وەك ئەوەی مردبێت، لە تەنیشتیەوە ئافرەتێك و منداڵێك دەگرین..

جڵەوی وڵاخەکەی دەسوڕێنێت و کاروانەشی لەگەڵیدا بەرەو لای ئەو دیمەنەیان دەبات، هەر کە تەماشای لاشەکە دەکات، ڕوخساری (ئەبوذەر)ی هاوەڵ و برای لە ئیسلامەتی بەدی دەکات، چاوەکانی پڕ لە ئەشك دەبن، لەسەر لاشەکەی دەوەستێت و دەڵێت:

(پێغەمبەری خوا ڕاستی فەرموو... بە تەنیا دەڕۆیت و.. بە تەنیا دەمریت.. بە تەنیا زیندوو دەکرێیتەوە)..

* * *

(ئیبن مەسعود) دادەنیشێت و ئەو ڕستەیە بۆ هاوەڵەکانی لێك دەداتەوە.

(بە تەنیا دەڕۆیت و.. بە تەنیا دەمریت.. بە تەنیا زیندوو دەکرێیتەوە)..

ئەوەش لە غەزای تەبوکدا بوو... ساڵی نۆی کۆچی، پێغەمبەرﷺ فەرمانی کرد کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ ڕوویەڕووبوونەوەی ڕۆم، ئەوانەی خەریکی فرت و فێڵ و پلان دانان بوون لە دژی ئیسلام.

ئەو ڕۆژگارەش خەڵکی تێدا بانگکرا بۆ جیهاد ڕۆژانێکی سەخت و گەرم بوو..

ڕێگاکە دوور و ناڕەحەت و.. دوژمنیش سامناك...

هەندێك لە موسڵمانان لە چوونەدەرەوەدا تەمبەڵیان کرد، جۆرەها بەهانەیان بۆ خۆیان دەهێنایەوە.

پێغەمبەر و هاوەڵانی چوونە دەرەوە.. هەرچەند درێژەیان بە ڕۆیشتن دەدا هیلاك و ماندووتر دەبوون، هەرکە پیاوێك دوابکەوتایە، بە پێغەمبەریان دەوت: ئەی پێغەمبەری خوا، فڵان کەس دواکەوت، دەیفەرموو:

(وازی لێبێنن..

گەر خەیری تێدابێت ئەوا خوای گەورە دەیگەیەنێتەوە پێتان.. خۆ گەر واش نەبێت ئەوا خوای گەورە دەربازی کردن لێی)..!!

جارێکیان ئاوڕیان دایەوە، (ئەبوذەر)یان نەبینی، بە پێغەمبەریانﷺ وت:

(ئەبوذەر دواکەوتووە و، حوشترەکەی خاو دەڕوات..

حوشترەکەی (ئەبوذەر) لەژێر باری برسێتی و تینویەتی و گەرمادا لاواز ببوبوو، لە ناڕەحەتیدا هەنگاوەکانی سست ببوبوو..

(ئەبوذەر) هەموو هەوڵ و کۆششێکی لەگەڵدا کرد بە هەر فێڵێ بووە بەڵکو بەردەوام بێت لەسەر ڕۆشتن، بەڵام ماندوویەتیەکەی قورسایی خستبووە سەر حوشترەکە..

(ئەبوزەر) سەیری کرد گەر وا بڕوا ئەوا ئەم لە موسڵمانان دادەبڕێت و لێی دیارنامێنن، بۆیە لە حوشترەکەی دابەزی و، شت و مەك و بارەکەی هەڵگرت و دای بەسەر شانی خۆیدا و بەپێ بە نیوەڕاکردن، لەنێو ئەو بیابانە زۆر گەرمەدا کەوتە ڕێ ، تا بگاتەوە بە پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانی..

سەرلەبەیانی، لەکاتێکدا کە موسڵمانان بارەکانیان کردبووەوە تا بحەسێنەوە، یەکێکیان تەماشای کرد، گەردەلولێکی بینی تارمایی پیاوێکی لە پشتەوە دیارە کە دەڕوات.

ئەو پیاوەی ئەوەی بینی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە پیاوێکە بە تەنیا ڕێگا دەبڕێت..

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (دەی ئەبوزەر بێت)..

گەڕانەوە سەر قسەو باسی خۆیان، هەتا ئەوکەسەی ڕێگا دەبڕێت زیاتر لێیان نزیك دەبێتەوە، ئەوکاتە دەزانن کێیە..

ڕێبوارە پایەبەرزەکە وردەوردە لێیان نزیك دەبوویەوە و.. هەنگاوەکانی لەسەر ئەو لمە داخ بووە هەڵدەگرت و، بارەکەشی بەسەر پشتیەوە بوو ئازاری دەدا.. بەڵام خۆشحاڵ و بەختەوەرە چونکە گەیشتۆتەوە کاروانە پیرۆزەکە و، لە پێغەمبەری خواﷺ و برا موجاهیدەکانی دوانەکەوتووە..

کاتێك گەیشتە سەرەتای کاروانەکە، یەکێکیان هاواری کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، سوێند بەخوا خۆیەتی، (ئەبوزەر)ە..

(ئەبوزەر) بەرەو ڕووی پێغەمبەر چوو..

هەر کە پێغەمبەرﷺ بەدی کرد زەردەخەنەیەکی پڕ لە سۆز لەسەر لێوەکانی درەوشایەوەو فەرمووی:

(خوا ڕەحم بە (ئەبوزەر) بکات..

بە تەنیا دەڕوات..

بەتەنیاش دەمرێت..

بە تەنیاش زیندوو دەکرێتەوە..)

پاش تێپەڕبوونی بیست ساڵ یان زیاتر بەسەر ئەو ڕۆژەدا، (ئەبوزەر) بە تەنیایی وەفاتی کرد، لە دەشتی وشکی (ڕەبذە)دا.. پاش ئەوەی کە هەموو ژیانی بە تەنها لەسەر ڕێگایەك ڕۆشت کە جگە لەو کەسی دیکەی بەسەردا نەڕۆیشتبوو.. لە مەزنی دونیانەویستیەکەی و، قارەمانێتی خۆڕاگریەکەیدا، مێژووش بەتەنیا یادی دەکاتەوە.

هەروەها لای خوای گەورەش هەر بە تەنیا زیندوو دەکرێتەوە، چونکە بەڕاستی چاکە زۆر و هەمەجۆرەکانی، جێگا بۆ هیچ کەسێکی دیکە لە تەنیشتیەوە ناهێڵێت...!!!

# ٤

## بیلالی کوڕی ڕەباح

## بێ باک لە سەختی و نەهامەتی

(عومەری کوڕی خطاب)، کاتێ باسی (ئەبوبەکر) لەلای بکرایە دەیگوت:

(ئەبوبەکر سەروەرمانە و، سەروەریشمانی ئازاد کرد).

مەبەستی لەوە -بیلال- بوو...

جا پیاوێك کە (عومەر) ناز ناوی (سەروەرمان)ی لێ بنێت، بەڕاستی پیاوێکی مەزن و خۆشبەختە...

بەڵام ئەم پیاوە ڕەشتاڵە، لەڕ و لاوازە، بالابەرزە، قژ لول و چڕە، برۆ تەنکە، (هەروەك سەربردە گێڕەوان باسیان کردوە) کە گوێی لە وشەی پیا هەڵدان و باسکردنی دەبوو کە ئاراستەی دەکرا و، بەسەریدا دەووترا، سەری دادەخست و چاوەکانی دەنوقاند، لە کاتێکدا ئارەق بە نێوچاوانیدا دەهاتە خوارێ دەیگوت:

(بەڵکو من حەبەشیم. و.. تا دوێنێش کۆیلە بووم)...!!

جا دەبێت ئەو حەبەشیە کێ بێت، کە تا دوێنێ کۆیلە بووە.....؟؟

ئەوە (بیلالی کوڕی ڕەباح)ی بانگدەری ئیسلام و، نابوتکەری بتەکانە...

یەکێکە لە موعجیزەکانی ئیمان و راستگۆیی..

یەکێکە لە موعجیزەکانی ئیسلامی مەزن...

لەوەتەی ئیسلام هاتوە و تا ئەمڕۆ و، هەتا ئەو کاتەی خوا ویستی لەسەریەتی، لە نێو هەر دە کەسی موسڵماندا -لای کەم- حەوتیان بیلال دەناسێت..

واتە لە سەدە و سەردەمەکانی پێشوەوە تا ئەمڕۆ بە سەدەها ملیۆن مرۆڤ (بیلال)یان ناسیوە و، ناویان لەبەر کردوە و، ئاشنای ڕۆڵی ئەو بوون، هەروەك چۆن شارەزای ژیانی هەردوو مەزنترین خەلیفەی ئیسلام (ئەبوبەکر و عومەر) بوون..!!

گەر بێت و لە هەر منداڵێك بپرسیت کە هێشتا لە سەرەتای ساڵەکانی خوێندنیدا بێت لە میسر یا لە پاکستان ، لە مەلایو، یا لە چین...

لە هەردوو ئەمریکاکە و، لە ئەوروپا و، لە روسیا..

لە عێراق و، سوریا و، تورکیا و، ئێران و، سودان..

لە تونس و، جەزائیر و، مەغریب..

لە قوولایی ئەفریقیا، لەسەر دەشتاییەکانی ئاسیا و.. لە هەر جێگایەك کە موسڵمانی تێدا نیشتەجێ بێت، دەتوانیت لێی بپرسیت، بچکۆل بیلال کێبوو؟

وەڵامت دەداتەوە کە بانگدەری پێغەمبەر ﷺ بوو.. ئەو کۆیلەیە بوو کە سەرگەورەکەی

بە بەردی گەرم و قورس سزای دەدا هەتا لە ئاینەکەی پاشگەزی بکاتەوە، ئەویش دەیگوت:

(أَحَدٌ ، احَد.. خوا تاك و تەنهایە..)

کاتێکیش ئەم جاویدانیە دەبینیت کە ئیسلام بەخشیویەتی بە بیلال.. ئەوا چاك بزانە کە بیلال بەر لە موسڵمان بوونی تەنها کۆیلەیەکی دەست بەسەر بوو و حوشتری خاوەنەکەی بە چەند چنگە خورمایەك دەلەوەڕاند، لەچارەی نووسرابوو-گەر ئیسلام نەبوایە- کۆیلەیەکی سەر لێشێواو بێ و لەو قەرەباڵغیەدا بێت، تا مردن دەیپێچێتەوە و بەرەو قوڵایی لەبیر چونەوەی دەبات...

بەڵام ڕاستی ئیمانەکەی و، مەزنی ئەو ئاینەی بڕوای پێ هێنا لە ژیانیدا و، لە مێژووشدا جێگایەکی بەرزیان لەنێو گەورە پیاوانی ئیسلام و پیاوساڵحانیدا پێ بەخشی..!!

زۆرێك لە کەسانی خاوەن پلە و پایە و، دەستەڵات و سامان و جێ، دەیەکی ئەو جاویدانیەی (بیلال)ی کۆیلەی حەبەشیان دەست نەکەوت...!!

بەڵکو زۆرێك لە پاڵەوانانی مێژوو هێندەی بیلال لە مێژوودا نەناسران..

لە ڕاستیدا، ڕەشی پێستەکەی و، کەمی ڕەگ و ڕەچەڵەکی و، بەکەم زانینی لای خەڵك وەکو کۆیلەیەکی بەندە، کاتێك کە ئیسلامی هەڵبژارد، بێبەشی نەکرد لەوەی کە جێگایەکی بڵند بەدەست بهێنێت کە شایستەی ڕاستگۆیی و، دڵنیایی و، بێگەردی و، لێبڕانەکەی بێت..

هەموو ئەوانە، لە پێودانگی هەڵسەنگاندن و ڕێز لێناندا لای هیچ سەنگێکی نەبوو، تەنها ئەوکاتە مایەی سەرسوڕمان بوو کە مەزنییەتی لەکەسێکدا دەبینرێ کەس گومانی مەزنیی پێنەبردبێ..

خەڵکی پێشتر وایان دەزانی، کە کۆیلەیەکی وەکو بیلال، خاوەن بنەچەیەکی عەرەبی و، بێکەس و، بێدەسەڵات... لە ژیانیدا خاوەنی هیچ نیە و، موڵکی گەورەکەیەتی کە بە پارەی خۆی کڕیویەتی و.. لە نێو تەویلەی وڵاخ و حوشترەکانی گەورەکەیدا دێت و دەچێت..

وایان دەزانی کە ئەو جۆرە کەسانە، توانایان بەسەر هیچ کارێکدا ناشکێت و ناتوانن ببنە هیچ..

دوای ئەوە ئەو هەموو گومانەکانی ڕەواندەوە و، توانای بەسەر ئیمان هێناندا شکا، ئای لەو کەسەی وەك ئەوی پێ بکرێت... پاشان دەبێتە یەکەمین بانگدەری پێغەمبەر ﷺ و ئیسلام، ئەو کارەی هەموو سەردار و گەورەکانی قوڕەیش کە موسڵمان بووبوون و شوێنی پێغەمبەر کەوتبوون بە ئاواتیەوە بوون..!!

بەڵێ...(بیلالی کوڕی ڕەباح)!

چ پاڵەوانێتیەکە.. چ مەزنییەکی گەورەیە، ئەم سێ وشە گوزارشتی لێ دەکەن (بیلالی کوڕی ڕەباح)..؟!!

بەڵێ ئەو حەبەشی بوو لە نەتەوەیەکی ڕەش، ڕۆژگار کردبوویە کۆیلەی کابرایەکی نەوەی

(بني جومەح) لە مەکە، دایکیشی یەکێك بوو لە کەنیزەك و خزمەتکارەکانیان..

ژیانێکی کۆیلانەی دەگوزەراند، ڕۆژەکانی سەخت و هاوشێوەی یەکدی بەسەر دەچوون، بەبێ ئەوەی لەمڕۆیدا هیچ مافێکی هەبێ و، هیچ ئومێدێکی بە سبەینێ هەبێت..!!

وردە وردە گوێبیستی دەنگوباسەکانی (محمد) دەبوو، لە کاتێکدا خەڵکی مەککە قسەکانیان دەگوێزایەوە و ئەو کاتانەی کە گوێی لە قسە و باسی گەورەکەی و میوانەکانی دەگرت، بەتایبەت (ئومەیەی کوڕی خەلەف)، یەکێك لە گەورە پیاوانی (بەنی جومەح)، ئەو هۆزەی کە بیلال یەکێك بوو لە کۆیلەکانی..

گوێی لێ دەبوو (ئومەیە) هەندێ جار لەگەڵ هاوڕێکانیدا لە بارەی پێغەمبەرەوە ﷺ قسەی دەکرد، زۆرجاریش لەگەڵ ئەندامانی هۆزەکەیدا، قسەکانی بە شێوەیەکی پڕ لە بوغز و کینە و غەم و خراپەکاری بوو..

گوێیەکانی بیلال لە نێو ئەو وشە ڕقاویە شێتانەدا ئەو بنەمایانەی دەبیست کە ئەم ئاینە نوێیە هێناویەتی و.. هەستی دەکرد کە ئەوانە بنەما گەلێکی نوێن بۆ ئەم ژینگەیەی کە ئەمی تیادا دەژی... هەروەها لە قسە و باسە توند و تیژەکانیاندا دانپیانانی بەڕێزی و ڕاستگۆیی و دەست پاکی (محمد)ی گوێی لێدەبوو..!!

بەڵێ.. ئەو لێیانی دەبیست سەریان لێی سوڕدەما و، سەرسام دەبوون، بەوەی کە (محمد) هێناویەتی...!!!

هەندێك بە هەندێکی دیکەی دەووت: (محمد) ڕۆژێك لە ڕۆژان درۆزن نەبووە، جادوگەر نەبوە و، شێت نەبووە.. هەتا ئەمڕۆ بێین بەوانە عەیبداری بکەین و، ڕێگری لەوانە بکەین کە خێرا بەرەو ئاینەکەی دەڕۆن..!!

گوێی لێ بوو دەربارەی دەستپاکیەکەی دەدوان..

باسی ئەمەك..و

مەردایەتی و.. خوڕەوشت..و

پاك و بێگەردی و عاقڵمەندیان دەکرد..

هەروەها دەیبیست ئەو هۆکارانەیان بە گوێی یەکتردا دەچرپاند کە وایان لێدەکات ڕوویەڕووی ببنەوە و دوژمنایەتی بکەن، ئەوەش: یەکەم پشتیوانی و خۆشویستنی ئاینی باو باپیرانە.. دووەم مەترسیان لە شکۆمەندی قورەیش –ئەو شکۆیەی کە مەڵبەندە ئاینیەکەی، وەك پایتەختێکی پەرستش و قوربانی کردن لە هەموو دوورگەی عەرەبیدا، پێی بەخشیبوو– ، پاشان ڕق و کینەیان بەرانبەر (بەنی هاشم)، کە لەنێو ئەواندا پێغەمبەر و نێردراوێك دەرکەوێت و لەمان نەبێت..!

ڕۆژێکیان (بیلالی کوڕی ڕەباح) ڕوناکی خوای بەدی کرد و، لە قوڵایی دەروونە چاکەکەیدا گوێبیستی لەرینەوەی دەبێت و، بەرەو لای پێغەمبەری خوا ﷺ دەچێت و موسڵمان دەبێت...

نۆری پێ ناچێت هەواڵی موسڵمان بوونەکەی بڵاو دەبێتەوە... زەوی لەبەر چاوی سەرگەورەکانی لە (بەنی جەموح) سوور دەخوات.. ئەو سەرانەی کە لوت بەرزی فووی تێکردبوون و لەخۆباییی بوون قورسی کردبوون...!! شەیتانەکانی سەر زەوی لەسەر سینگی (ئومەیەی کوڕی خەلەف) کۆبوونەوە، کە موسڵمان بوونی کۆیلەیەك لە کۆیلەکانیان بە زللەیەك دەزانێت کە مایەی سەرشۆڕی و شورەییە بۆ هەموویان..

کۆیلە حەبەشیەکەیان موسڵمان بێت و، بکەوێتە شوێن (محمد)..؟!!

(ئومەیە) بەخۆی دەڵێت، لەگەڵ ئەوەشدا قەیناکە... خۆری ئەمڕۆ بەمانەوەی ئەم کۆیلە بێ گوێیە لەسەر ئیسلام ئاوا نابێت..!!

بەڵام خۆر هەر گیز بە موسڵمان بوونی بیلال ئاوا نەبوو، بەڵکو بە لەناوچوونی هەموو بتەکانی قورەیش و، پارێزەرانی بتپەرستی ئاوابوو..!

* * *

لەو لاشەوە (بیلال) هەڵوێستێکی وەهای هەبوو نەك هەر جێی شانازی و رێزە بۆ ئیسلام و بەس –ئەگەریش ئیسلام لە هەموان شایستەتر بێت– بەڵکو ریز و شانازیە بۆ هەموو مرۆڤایەتی..

ئەو لەبەردەم سەخترین جۆرەکانی سزادا خۆڕاگر بوو وەك خۆ ڕاگرتنی کەسانی مەزن و چاکەکار.

وەك ئەوەی کە خوای گەورە کردبێتیە نموونە بۆ خەڵکی تابزانن کە رەش پێستێتی و کۆیلەیەتی کار لە مەزنی رۆح ناکەن گەر ئیمانی تێدا بێت و، دەستی بەخودای خۆیەوە گرتبێت و پەیوەستی مافەکانی بێت..

بەڕاستی (بیلال) وانەیەکی رەوانی بەخەڵکی سەردەمەکەی و، هەمو سەردەمەکانی دیکە پێشکەش کرد، بۆ ئەوانەی کە لەسەر ئاینەکەی ئەون و، لەسەر هەر ئاینێکی دیکەن، وانەیەك کرۆکەکەی ئەوە بوو کەئازادی ویژدان و سەروەریەکەی نافرۆشرێن بە پڕی زەوی زێڕ، یان بە پڕی زەوی لە سزادان..

ئەو بە رووت و بێ پۆشاکی خرابووە سەر پشکۆ، تا لە ئاینەکەی پاشگەز بێتەوە، یان بیرو بۆچوونەکەی بگۆڕێت، بەڵام رازی نەبوو..

لە راستیدا پێغەمبەر ﷺ و، ئیسلام، ئەم کۆیلە حەبەشیە بێ دەسەڵاتەیان کردبووە مامۆستای هەموو مرۆڤایەتی لە هونەری رێزگرتنی ویژدان و، بەرگریکردن لە ئازادی و سەروەریەکەی..

ئەوان لە قرچەی گەرمای نیوەڕواندا، کاتێ بیابان دەبوویە دۆزەخێکی بکوژ.. دەیانبردە دەرەوە و بە رووتی فڕێیان دەدایە سەر چەوە بلێسەدارەکانی، دوای ئەوە بەچەند پیاوێك بەردێکی زۆر گەرمیان دەهێنا و دەیانخستە سەر جەستە و سنگی...

ئەو سزا دڕندانەیە هەموو رۆژێك دووبارە دەبووەوە، هەتاوەکو لەبەر سەختی سزاکەی دڵی هەندێك لە جەلادەکانی بۆی نەرم بوو، دواجار رازی بوون کە وازی لێ بهێنن، بەو مەرجەی بەچاکە ناوی خواوەندەکانیان بهێنێت، با بەتەنها وشەیەکیش بێت -بەس و زیاتر نەبێت- تا لوت بەرزی ئەوان بپارێزێ، قورەیش باسی ئەوە نەکەن کە ئەوان رووخاون و لە بەرامبەر خۆڕاگری و سووربوونی کۆیلەکەیاندا چۆکیان داداوە...

بەڵام ئەو تەنانەت ئەو تاکە وشەی کە دەیتوانی بە نابەدڵی بیڵێت و، ژیانی خۆی پێ بکڕێتەوە، بەبێ ئەوەی ئیمانەکەی لەدەست بدات و، واز لە بیروبۆچونی بهێنێت..

تەنانەت ئەو تاکە وشە سەر زارەکیەش (بیلال) رازی نەبوو بیڵێت..!

بەڵێ.. رەتی کردەوە کە بیڵێت.. لە جێگای ئەوە سرودە نەمرەکەی دووبارە دەکردەوە:

(أحدٌ.. أحدٌ.. خودا تاك و تەنهایە..)

کە جەلادەکانی هاواریان لێ دەکرد، بەڵکو لێی دەپاڕانەوە و دەیان وت:

(ناوی لات و عوزا بهێنە).

ئەویش وەڵامی دەدانەوە: (أَحَدٌ.. أَحَد..)

پێیان دەوت: ئێمە چی دەڵێین ئەوە بڵێ..

بە گاڵتەجاڕییەکی سەر سوڕهێنەر و، گاڵتەپێکردنێکی جنێو ئامێزەوە وەڵامی دەدانەوە:

(زمانم ئەوەی پێ ناوترێت)...!!

(بیلال) لە بەر گەرما و لەژێر بەردەکە دەمایەوە، هەتا کاتی ئێوارە هەڵیاندەستاندەوە و، گوریسێکیان دەکردە ملی، پاشان فەرمانیان بە منداڵەکانیان دەدا کە بە دەوری شاخەکانی مەککە و شەقامەکانیدا بیگێڕن.. (بیلال)یش تەنها زاری بە سرودە پیرۆزەکەی هەڵدەهێنا و بەس، ((احدٌ.. احد..))

وەك ئەوەی لەگەڵیاندابم دەزانم کە شەو دادەهات سازشیان لەگەڵدا دەکرد:

سبەینێ چەند وشەیەکی چاك لە بارەی خواوەندەکانمان بڵێ، بڵێ: پەروەردگارم لات و عوزایە، تا وازت لێ بێنین بڕۆیت بەرێی خۆتەوە، بەراستی لە سزادانت ماندوو بووین، وای لێهاتوە دەڵێی ئێمە سزا دەدرێین!

(بیلال)یش سەری دەجوڵاند و دەیوت: (أحدٌ.. أحد)

ئەمجا (ئومەیەی کوڕی خەلەف) بوغز و توڕەییەکەی دەتەقێتەوە و زللەیەکی لێ دەدات و، هاوار دەکات:

ئەی کۆیلەی ڕەش، چ شومی و بەڵایەك بووی تووشمان بوویت..؟ سوێند بە لات و عوزا دەتکەمە پەند بۆ هەموو کۆیلە و گەورە پیاوان..

(بیلال)یش بەو پەڕی دڵنیایی بڕواداڕانە و مەزنی خواناسانەوە دێتە وەڵام و دەڵێت: (احدٌ.. احدٌ..خودا تاك تەنهایە..)

هەروەها ئەو کەسەی ڕۆڵی کەسێکی خاوەن بەزەیی پێدراوە، دەست دەکاتەوە بە گفتوگۆو سازش و دەڵێت:

–وازی لێ بێنە ئومەیە.. سوێند بەلات لە ئەمڕۆوە ئیدی سزا نادرێت.. (بیلال) لە ئێمەیە... دایکیشی کەنیزەکمانە، بەڕاستی ئەویش ڕازی نابێت کە بەهۆی ئیسلام بوونی ئەمەوە ببینە قسە و باسی سەرزاری و گاڵتەجاری قوڕەیش...

(بیلال) چاوی کردەوە و سەرنجێکی ڕوخساری تەڵەکەباز و درۆزنیانی داو، بەزەردەخەنەیەکی وەك گزنگی بەیان دەمی کردەوە و بە ئارامییەکی وەك بومەلەرزەی هەژێنەر وتی:

(احدٌ.. احدٌ..)

سبەینێ هات و کاتی نیوەڕۆ نزیك بوویەوە، (بیلال) بەرەو ئەو گەرمایە برا، بەردەوام بوو لەسەر ئارامگری و خۆڕاگرییەکەی.

لە کاتێکدا کە سزایان دەدا، (ئەبوبەکری صدیق) دەچێت بۆ لایان و، هاواریان لێ دەکات: (ئایا پیاوێك دەکوژن تەنها لەبەر ئەوەی کە دەڵێت (الله) پەروەردگارمە)...؟؟

پاشان هاواری لە (ئومەی کوڕی خەلەف) کرد: ها لە نرخەکەی خۆی زیاتر وەربگرە و ئازادی بکە...

(ئومەیە)ش وەك ئەوەی لە نقرۆبووندا بێت و کەشتی دەربازبوونی پێ گەیشتبێت وا بوو... دەروونی ئاسوودە و بەختەوەر بوو کاتێ گوێی (لە ئەبوبەکر) بوو ئامادەیە نرخی ئازادکردنی بدات، چونکە بێ ئومێد بوونی لە ملکەچکردنی بیلال گەیشتبووە ئەوپەڕی.

هەروەها لەبەر ئەوەی کە ئەوان بازرگان بوون و، چاك دەیانزانی کە فرۆشتنی قازانجترە بۆیان لە مردنی..

فرۆشتیان بە (ئەبوبەکر) و ئەویش دەست بەجێ ئازادی کرد و، ئیدی (بیلال) لە نێو پیاوانی ئازاد دا شوێنی خۆی گرت...

لەو دەمەشدا کە (ئەبوبەکر) باڵە بەستراوەکانی (بیلالی) دەکردەوە و بەرەو ئازادکردنی دەبرد، (ئومەیە) پێی وت:

–بیبە، سوێند بە لات و عوزا، گەر بە ئوقیەیەکیش ڕازی بوویتایە بیکڕیت هەر پێم دەفرۆشتیت..

(ئەبوبەكر)ى زرنگ تێگەیشت كە ئەو وشانە چ بێ ئومێدى و بێزارییەكیان لەخۆ گرتووە و، شایستەى وەڵام دانەوە نەبوو...

بەڵام لەبەر ئەوەى كە هێرشى بۆسەر ئابڕو و ڕێزى ئەو كەسە تێدایە كە بوو بەبراى و، هاوڕێشتى، لە وەڵامى (ئومەیە)دا وتى:

-سوێند بەخوا گەر ئێوە بەسەد ئۆقیەش ڕازى بوونایە بیفرۆشن هەر دەمكڕى..!!

لەگەڵ هاوڕێكەیدا بەرەو لاى پێغەمبەر خوا ﷺ كەوتە ڕێ تا مژدەى ئازادكردنى بداتێ.. لە ڕاستیدا ئەوەش خۆشى و جەژنێكى مەزن بوو!

پاش كۆچكردنى پێغەمبەر و موسڵمانان بۆ مەدینە و، نیشتەجێ بوونیان لەوێ؛ پێغەمبەرﷺ ڕێساى بانگدان بۆ نوێژ دادەنێت...

باشە دەبێ كێ ڕۆژانە پێنج جار ببێتە بانگدەر بۆ نوێژ...؟ دەنگى (الله اكبر) و (لا الـه الا الله)ى بەرزى تێكەڵ بە ئاسۆیەكان بكات...

ئەو كەسە (بیلال) بوو.. كە پێش سیازدە ساڵ ئازار هەڕەشەى لێ دەكرد و، دەیبرژاند و، ئەویش هاوارى دەكرد:(الله احدٌ.. احدٌ.. خودا تاك و تەنهایە).

پێغەمبەر ﷺ ئەوى هەڵبژارد تا ببێتە یەكەم بانگدەر لە ئیسلامدا.

بە دەنگە خۆش و پاراو و، غەمگینەكەى، بەردەوام دڵەكانى پڕ لە ئیمان و، گوێیەكانى پڕ لە شادى دەكرد، لە كاتێكدا كە بانگى دەدا:

(الله اكبر.. الله اكبر.. الله اكبر.. الله اكبر..

اشهد الا اله الا الله.. اشهد الا اله الا الله..

اشهد ان محمدا رسول الله.. اشهد ان محمدا رسول الله..

حي على الصلاة.. حي على الصلاة..

حي على الفلاح.. حي على الفلاح..

الله اكبر.. الله اكبر.. لا اله الا الله).

جەنگ و كوشتار لە نێوان موسڵمانان و، سوپاى قورەیشدا بەرپا بوو، كە مەبەستیان بوو مەدینە داگیر بكەن..

شەڕێكى سەخت و ناڕەحەتى پڕ زیان... لە یەكەم غەزادا كە ئیسلام دەیكات (بیلال) دەهات و دەچوو، غەزاى بەدر... ئەو غەزایەى كە پێغەمبەر ﷺ فەرمانى دەركرد دروشمەكەى (احدٌ... احدٌ) بێت.

* * *

لەم جەنگەدا قوڕەیش پێى نا بەجەرگى خۆیدا و، هەموو گەورە پیاوانى بەرەو مەرگى خۆیان دەرچوون..!!

(ئومەیەی کوڕی خەلەف) ویستی نەیەتە دەرێ و بەشداری نەکات.. ئەو (ئومەیە)یەی کە گەورەی (بیلال) بوو و، بەدڕندانەترین شێوە سزای دەدا...

بیری لە نەهاتنە دەرەوە کردبوەوە، گەر (عوقبەی کوڕی أبی معیط)ی هاوڕێی نەهاتایە لای، کە زانیبووی نیازی دانیشتن و دەرنەچوونی هەیە، بوخوردانێکی بەدەستەوە بوو، بەرەو لای رۆشت و، بینی لە ناو هۆزەکیدا دانیشتوە، بوخوردانەکەی خستە بەردەمی و پێی وت: ئەی باوکی عەلی، خۆتی پێ بۆن خۆش بکە، چونکە تۆ لە پێڕی ئافرەتانی..!!!!

ئومەیە هاواری لێ کرد وتی: خوا رووڕەشت کات و ئەوەیش ناشیرین کات کە هێناوتە..

دوای ئەو هیچ رێگایەکی دەرنەچوونی بەدی نەکرد و لەگەڵ جەنگاوەراندا چووە دەرەوە..

ج نهێنیەکی قەدەرە، دەیپێچێتەوە و دەیکاتەوە..؟

پێشتر (عوقبەی کوڕی ئەبی موعیط) گەورەترین هاندەری ئومەیە بوو بۆ سزادانی بیلال و، موسڵمانە بێدەستەڵاتەکانی دیکە...

ئەمڕۆش، هەر ئەو هانی دەدات کە بەرەو جەنگی بەدر بکەوێتە رێ، کە تیاچوونی ئەوی تێدا دەبێت..!! هەروەك تیاچونی (عوقبە)شی تێدا دەبێت!

لە راستیدا (ئومەیە) لەو کەسانە بوو کە دانیشتبوو.. گەر سەرزەنشتی (عوقبە) نەبوایە بەو جۆرەی کە بینیمان دەرنەدەچوو بۆ شەڕ..!!

بەڵام خوای گەورە فەرمانی خۆی بەجێ دەگەیەنێت، دەبێت (ئومەیە) دەربچێت، چونکە حسابێکی کۆن لە نێوان ئەو و یەکێك لەبەندەکانی خوادا هەیە و، کاتی پاکتاوکردنی هاتووە و، قەرز کۆن دەبێت بەڵام نافەوتێت، وەك چۆن قەرز دەکەن، دەبێت ئاوەهاش بیدەنەوە...!!!

قەدەر بۆی دەرەخسێ کە گاڵتە بە ستەمکاران بکات.. ئەوەتانێ ئەو (عوقبە)یەی کە (ئومەیە) گوێی لە هاندانی دەگرت و، ئارەزووەکانی لەسزادانی بڕوادارانی بێ گوناهدا بەجێ دەهێنا، هەر ئەو (ئومەیە) بەرەو تیاچوون دەبات..

بەدەستی کێ...؟

بەدەستی خودی (بیلال).. تەنیا (بیلال)و بەس!!

هەمان ئەو دەستەی کە (ئومەیە) بەزنجیر دەیبەستەوە و، خاوەنەکەی ئەشکەنجە و ئازار دەدا..

هەر ئەو دەستە ئەمڕۆ و، لە غەزای بەدردا، وادە و ژوانی هەیە کە قەدەر چاکترین کاتی بۆ دیاری کردوە، لەگەڵ ئەو جەلادەی قوڕەیشدا کە بەستەم و دوژمنایەتی موسڵمانانی سەر کز کردبوو...

ئەوە بە تەواوی ڕوویدا...

کاتێك شەڕ لە نێوان هەردوو لادا بەرپا بوو و، لای موسڵمانەکان بە دروشمەکەیان (أحدٌ..أحدٌ) لەرییەوە، (ئومەیە) دڵی داخورپا و، ترسی لێ نیشت...

ئەو وشەیەی کە دوێنێ کۆیلەکەی لەژێر سزا و ئەشکەنجەدا دەیوتەوە، ئەمڕۆ بۆتە دروشمی ئاینێك بەتێکڕا و بۆتە دروشمی هەموو ئوممەتی نوێ...!!

(أحدٌ..أحد.)

ئا بەمجۆرە ..؟ بەو خێراییە و.. ئەو گەشەکردنە مەزنە..؟؟

* * *

شمشێرەکان بەیەکدا چوون و، شەڕ گەرم بوو...

لەکاتێکدا کە جەنگ لە کۆتایی نزیك دەبووەوە، (ئومەیەی کوڕی خەلەف) (عبدولڕەحمانی کوڕی عەوف)ی هاوەڵی پێغەمبەری ﷺ بەدی کرد، هانای بۆ برد و، داوای لێکرد کە لای ئەو دیل بێت بەڵکو ژیانی رزگار بکات..

(عبدالرحمن)یش بە داواکەی رازی بوو و، پەنای دا، پاشان بە نێوەندی گۆڕەپانی جەنگدا بەرەو جێگای دیلەکانی برد.

لەرێگادا (بیلال) چاوی پێکەوت و، هاواری لێ کرد:

(سەری کوفر..(ئومەیەی کوڕی خەلەف)... رزگارم نەبێت گەر ئەو رزگار بێت)..

شمشێرەکەی بەرزکردەوە تا ئەو سەرەی پێ بقرتێنێ کە لە خۆبایی بوون و لوت بەرزی قورسی کردبوو، (عبدالرحمنی کوڕی عەوف) هاواری لێ کرد:

(نا... بیلال.. ئەوە دیلی منە)

دیلی چی.. کە هێشتا جەنگەکە گەرم و بەردەوامە..؟؟

دیلی چی هێشتا شمشێرەکەی خوێنی جەستەی ئەو موسڵمانانەی لێدەچۆڕێت کە پێش کەمێك لەگەڵیان دەجەنگا..؟

نەخێر.. ئەوە لای (بیلال) پێکەنین و گاڵتەجاڕی بوو بەعەقڵەکان.. (ئومەیە)ش بەپێی پێویست پێکەنیوە و گاڵتەی کردوە..

هێندەی گاڵتە کردوە کە هیچی نەهێشتۆتەوە بۆ رۆژێکی وەك ئەمڕۆ و، بۆ ئەم تەنگانەیە و، ئەم سەر ئەنجامە...!!

(بیلال) کە بینی خۆی بە تەنها توانای بەزاندنی پەنادانی (عبدالرحمنی کوڕی عەوف)ی برای ئایینی نیە، بەوپەڕی دەنگ بەرزییەوە هاواری لە موسڵمانان کرد:

(ئەی پشتیوانانی خوا.. سەری کوفر (ئومەیەی کوڕی خەلەف) ئەوەتا، رزگارم نەبێت ئەگەر ئەو رزگاری بێت)...!

دەستەیەك لە موسڵمانان کە شمشێرەکانیان مەرگی لێدەچۆڕا، بەرەو لای هاتن و، دەوری (ئومەیە) و کوڕەکەیان دا -کە لەگەڵ قورەیشدا بەشداری شەڕی کردبوو-، (عبدالرحمن)

نەیتوانی هیچ بکات.. نەك هەر ئەوە بەڵکو لەبەر جەنجاڵی توانای پاراستنی زرێپۆشەکەی خۆیشی نەبوو..

(بیلال) بە قوڵی لە لاشەی (ئومەیە) راما کە لە ژێر شاڵاوی شمشێرەکاندا کەوتبوو، پاشان بەخێرایی لێی دوورکەوتەوە و بەدەنگە خۆشە بەرزەکەی هاواری دەکرد: (أحدٌ..احد).

* * *

بە مافی خۆمانی نازانم کە ئا لەو شوێن و جێیەدا بۆ چاکی لێبووردەیی لای (بیلال) بگەڕێین...

خۆ ئەگەر بەیەکگەیشتنی (بیلال) و (ئومەیە) لە رەوشێکی دیکەدا بوایە، ئەوا بۆمان هەبوو کە پرسیاری مافی لێبووردەیی لە (بیلال) بکەین و، بۆ کەسێکی وەك ئەو ئیماندار و خاوەن تەقوا نەبوو کە رژدی تێدا بکات.

بەڵام ئەو دیدارەی کە بوو، لەشەڕدا بوو، هەر لایەو بۆ ئەوە هاتبوو کە دوژمنەکەی لەناو بەرێت...

شمشێرەکان گڕیان دەسەند و.. کوژراوان دەکەوتنە سەر زەوی. و.. مەرگ بەدوای یەکدا دەهات، پاش ئەوە بیلال چاوی بە (ئومەیە)بکەوێت، ئەو (ئومەییە)یەی کە شوێن سەرەپەنجەیەك لە جەستەی نەهێشتوە شوێنەواری ئەشکەنجەی ئەوی پێوە نەبێت.

لە کوێ دەیبینێت و چۆن..؟

لە گۆڕەپانی جەنگ و کوشتاردا دەیبینێ، کە بە شمشێرەکەی سەری هەر موسڵمانێکی بکەوێتە بەردەست درووێنەی دەکات، خۆ گەر بە سەری (بیلال)یش بگەیشتایە ئەوا دەیپەڕاند..

ئا لەو رەوشەدا ئەو دوو پیاوە بەیەك دەگەن، هیچ دادگەرییەکی تێدا نیە لە (بیلال) بپرسین: بۆچی بە جوانی لێی نەبورا؟؟

* * *

رۆژان دەگوزەرێ، مەککە رزگار دەکرێت...

پێغەمبەر ﷺ بەسوپاسگوزاری و بەدەم –الله اکبر–ەوە، لە پێش دەهەزار موسڵمانەوە دەچێتە ناوی... خێرا بەرەو (کەعبە) دەچێت.. ئەو جێگا پیرۆزەی کە قورەیش بەقەد ژمارەی رۆژەکانی ساڵ بتیان تێدا دانابوو، جەنجاڵیان کردبوو..!!

بەراستی (حەق) هات و، (ناحەق) لە ناو چوو..

لەمڕۆ بەدواش نە عوزا و.. نە لات و.. نە هوبەل دەمێنێت.. لە ئێستە بەدواوە هیچ مرۆڤێ لەبەردەم بەردێکدا یان بۆ بتێك خۆی ناچەمێنێتەوە و.. خەڵکی پڕ بە ویژدانیان جگە لەو

خودایەی کە هاوشێوەی نیە و، تاك و تەنیا و بێهاوەڵە و، گەورە و پایە بەرزە، هیچی دی ناپەرستن..

پێغەمبەر ﷺ دەچێتە (کەعبە)وە و، (بیلال)یش لەگەڵ خۆی دەبات....!

هەر کە دەچێتە ژووری رووبەڕووی پەیکەرێکی داتاشراو دەبێتەوە، کە وێنەی (ئیبراهیم)ە دەخاتە روو کە بەخت دەگرێتەوە[1]، پێغەمبەر ﷺ توڕە بوو فەرمووی:

(خوا بیانکوژێت.. سەروەرمان ئیبراهیم بەخت گرەوە نەبوو... ﴿مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيًّا وَلاَ نَصْرَانِيًّا وَلَكِنْ كَانَ حَنِيفًا مُسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنْ الْمُشْرِكِينَ: ئیبراهیم نە جولەکە بوو نە گاور، بەڵام یەکتاپەرستێك بوو خۆی بە خوا سپاردبوو، هیچ هاوەڵی بۆ خودا پەیدا نەدەکرد.﴾ال عمران/٦٧.

دوای ئەوە فەرمانی بە (بیلال) کرد کە بچێتە سەر مزگەوتەکە و، بانگ بدات.

بیلال بانگ دەدات.. ئای لە جوانی و شادی و خۆشی ئەو سات و، شوێن و، بۆنەیە..!!

ژیان لە مەککەدا لە جوڵە وەستا و، هەزارەها موسڵمانیش وەك شنەبایەکی وەستاو راوەستان و، بە ملکەچی و لەبەر خۆوە بەنزمی لە دوای (بیلال)ەوە وشەکانی بانگیان دەوتەوە.

هاوەڵپەرستان لە نێوماڵەکانی خۆیاندا بوون، خەریك بوو باوەڕ نەکەن:

ئەوە (محمد) و ئەو هەزارانەیە کە دوێنێ لێرە دەر کران..؟؟

ئەرێ بەڕاست ئەوە دە هەزار موسڵمانی لەگەڵدایە..؟؟

بە راستی ئەمە ئەو کەسەیە کە دەرمان کرد و، لە دژی جەنگاین، خۆشەویسترین خزم و نزیکترین کەسیمان کوشت..؟؟

ئەرێ بەڕاست ئەوە، کە پێش چەند ساتێ بۆمان دوا و، ملمان لەبەر دەستیدا بوو، پێمانی وت:

(بڕۆن.. ئێوە ئازادن)..!!

بەڵام ئەو ساتە سیان لە گەورەپیاوانی قورەیش، لە سێبەری (کەعبە)دا دانیشتبوون، وەك ئەوەی دیمەنی (بیلال) بێزاری کردبن، کە بتەکانیان دەخاتە ژێر پێی و، بەسەر خۆڵە کەڵەکەبووەکەیەوە دەنگی بانگەکەی وەك بۆن و بەرامەی بەهار لە ئاسۆی مەککە بڵاو دەکاتەوە..

---

١ ئەو جۆرە بەخت گرتنەوەیە بریتی بوو لەوەی کەسێك بیویستایە کارێك ئەنجام بدات یا سەفەرێك بکات یان نەیکا (واتە دوو دڵبێت)، دەیانوسی و دەیانخستە ناو پەرداخێکەوە بە (بیکە) و (نەیکە) پاشان تیروپشکیان بۆ دەکرد -وەرگێڕ-

ئەو سێ کەسەش (ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب–کە پێش چەند ساتێ موسڵمان بوو–) و (عەتابی کوڕی ئوسەید) و، (حارسی کوڕی هیشام) بوون– کە ئەو دوانەیان هێشتا موسڵمان نەبوو بوون..

(عەتاب) سەیری (بیلال)ی دەکرد کە بانگی دەدا، وتی:

–خوا ڕێزی لە (ئوسەید) گرت کە گوێی لەمە نەبوو، کە پێی ناڕەحەت دەبوو.

(حارس)یش وتی:

–سوێند بەخوا.. گەر بمزانیایە (محمد) حەقە شوێنی دەکەوتم...!!

(ئەبو سوفیان)ی زۆرزانیش لە بارەی قسەکانیانەوە وتی:

–من هیچ ناڵێم، چونکە گەر قسە بکەم ئەوا ئەم بەردانە خەبەرم لێ دەدەن!!

کاتێ پێغەمبەر ﷺ (کەعبە)ی بەجێ هێشت چاوی پێیان کەوت، لە چرکە ساتێکدا نێو چاوانی خوێندنەوە، لە کاتێکدا کە چاوەکانی بە ڕووناکی خودا و، شادی سەرکەوتن دەدرەوشانەوە فەرمووی:

–زانیم کە چیتان دەوت...!!!!

ئەوەی کە وتبوویان بۆی باس کردن..

(حارس) و (عەتاب) هاواریان لێ هەستا:

شاهیدی دەدەین کە تۆ پێغەمبەری خودایت، سوێند بەخوا کەس گوێی لێمان نەبوو تا بڵێین ئەو هەواڵی پێداویت..!!

ئەمجا بە دڵێکی نوێوە پێشوازیان لە (بیلال) کرد.. کە لە دڵیاندا ئەو وشانە دەنگی دەدایەوە کە لە پێغەمبەریان ﷺ بیست لە وتاری سەرەتای هاتنە نێو مەککەدا:

(ئەی خەڵکی قوڕەیش!!! خوای گەورە خۆ هەڵکێشانی نەفامی و خۆ هەڵنان بە باو و باپیرنی لە نێودا نەهێشتن، خەڵکی لە ئادەمن و.. ئادەمیش لە خۆڵە)..

* * *

بەو جۆرە (بیلال) لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ژیا و هەموو دیمەنەکانی لەگەڵدا بینی و، بۆ نوێژ بانگی دەدا و، دروشمەکانی ئەم ئاینە مەزنەی دەبوژاندەوە و دەپاراست، کەلە تاریکی دەربازی کردبوو بەرەو ڕووناکی، لە کۆیلەیەتیەوە دەربازی کرد بەرەو ئازاد بوون...

ڕێزی ئیسلام بەرزبووەوە، لەگەڵیشیدا موسڵمانان ڕێزدارتر بوون، (بیلال)یش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەدڵی پێغەمبەری خوا نزیکتر دەبووەوە، پێغەمبەر لەبارەیەوە دەیفەرموو: (پیاوێکی ئەهلی بەهەشت)..

لەگەڵ ئەوەشدا بیلال هەر بەچاکی و خاکەڕایی مایەوە، تەنها خۆی وا دەهاتە پێش چاو کە (حەبەشییەکە تا دوێنێ کۆیلە بوو)..!!

ڕۆژێکیان ڕۆشت دوو ئافرەت بۆ خۆی و براکەی بخوازێت، بە باوکیانی وت:

(من بیلالم.. ئەمەش برامە، دوو کۆیلەی حەبەشین.. گومڕا بووین خوا ڕێنوێنی کردین.. دوو کۆیلە بووین خوا ئازادی کردین.. گەر ئەو دوو ئافرەتەتان پێداین، ئەوا سوپاس بۆ خوا و... ئەگەر ڕازیش نەبوون، ئەوا خوا گەورەترە)..!!

* * *

پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد و بە ڕەزامەندی و ڕازیکراوی گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری باڵادەست و، لەدوای ئەو (ئەبوبەکر) خەلیفەی کاروباری موسڵمانانی گرتە دەست..

بیلال چوویە خزمەت خەلیفەی پێغەمبەری خواو پێی وت:

(ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا...

گوێم لە پێغەمبەری خواﷺ بوو دەیفەرموو: باشترین کردەوەی بڕوادار، جیهادکردنە لەپێناوی خوا)..

(ئەبوبەکر) پێی وت: باشە چیت دەوێ ئەی بیلال..؟

وتی: دەمەوێت کە خۆم ببەستم لە پێناوی خوادا هەتا دەمرم..؟

(ئەبوبەکر) پێی وت: ئەی کێ بانگمان بۆ بدات..؟؟

(بیلال) چاوەکانی پڕ لە فرمێسك بوون و، وتی: لەدوای پێغەمبەری خوا بۆ هیچ کەس بانگ نادەم.

(ئەبوبەکر) پێی وت: نا بیلال... بمێنەرەوەو بانگمان بۆ بدە..

(بیلال) وتی: گەر ئازادت کردووم بۆ ئەوەی کە بۆ تۆ بم، ئەوا با چۆنت دەوێ وابکەم، گەر لەپێناوی خواشدا ئازادت کردوم ئەوا وازم لێبێنە بۆ ئەوەی کە ئازادت کردم لەبەر ئەو..

(ئەبوبەکر) وتی: لەبەر خوا ئازادم کردیت ئەی (بیلال)..

سەریردەگێڕەوان جیاوازییان هەیە، هی وایان هەیە دەگێڕێتەوە کە بۆ شام چووە، لەوێ بە موجاهیدی و، ئامادەیی ماوەتەوە.

هەندێکی دیکەیان دەگێڕنەوە کە داخوازییەکەی (ئەبوبەکر)ی قبوڵ کردووە کە لە (مەدینە) بمێنێتەوە، کاتێك کە مرد و، (عومەر) بویە جێنشینی، مۆڵەتی لێ خواست و بەرەو شام ڕۆشت.

بەهەر حاڵ، (بیلال) ئەوەی مابووی لە ژیان و تەمەنی کردیە نەزری خۆبەستن و ئامادەبوون بۆ جیهاد لەو شوێنانەی کە مەترسی هەبوو لەسەر ئیسلام، سوور بوو لەسەر ئەوەی کە لەسەر چاکترین کارێك بێت کە خوا و پێغەمبەر لایان خۆشەویستە تا شاد دەبێتەوە بە دیداریان.

ئیدی لەوە بەدواوە بە دەنگەخۆشە غەمگینە سامدارەکەی بانگی نەدا، چونکە نەیدەتوانی

کە بەزمان بڵێت: (أشهد أن محمداً رسول الله) لەبەر ئەوەی یادەوەرییەکانی هێرشیان بۆ دەهێنا و دەنگی لەژێر خەمەکانیاندا ون دەبوو و، بە فرمێسك وشەو پەندەکانی دەردەبڕی.

دوا بانگیشی ئەوجارەبوو کە ئەمیری بڕواداران (عومەر) سەردانی شامی کرد و، موسڵمانان لێی پاڕانەوە کە داوا لە (بیلال) بکات کە تەنها جارێك بانگیان بۆ بدات.

ئەمیری بڕواداران (بیلال)ی بانگ کرد، لەکاتی بانگدا داوای لێکرد کە بانگی بۆ بدات.. (بیلال) چووە سەر و بانگی دا.. هەموو ئەو هاوەڵانەی کە پێغەمبەریان بینیبوو بیلال بانگی بۆ دەدا دەستیان کرد بە گریان.. بەجۆرێك گریان کە پێشتر هەرگیز وا نەگریاون.. (عومەر) لەهەموویان زیاتر دەگریا..!!

* * *

بیلال هەروەك دەیویست بە جەنگاوەری لەشام کۆچی دوایی کرد..

ئەمڕۆش لەژێر خاکی دیمەشقدا ئێسکی پیاوێك شاردراوەتەوە کە لە مەزنترین پیاوانی مرۆڤایەتییە لە خۆڕاگری و دامەزراویی لەسەر عەقیدە و باوەڕ..





# عبدالەی کوڕی عومەر

# کۆڵەوەری نوێکار

لە ترۆپکی تەمەنی درێژیدا هاتە گۆ و وتی:

(بەیعەتم دا بە پێغەمبەری خواﷺ.. تا ئەمڕۆش نە شکاندوومە و نە گۆڕیومە.. هەرگیزیش بەیعەتم بە ئاشووبکار نەداوە و.. هیچ بڕوادارێکیشم لە گۆڕەکەیدا رانەچڵەکاندووە)..

ئەم وشانە پوختەی باوەڕپێکراوی ژیانی پیاوچاکێکە کە زیاد لە هەشتا ساڵ ژیاوە و، سەرەتای پەیوەندی کردنیشی بە ئیسلام و پێغەمبەرەوە لە تەمەنی سیازدە ساڵیدا بوو، کاتێك لەگەڵ باوکیدا هات بۆ غەزای بەدر، بەو ئومێدەی کە لەنێو موجاهیداندا جێگایەکی هەبێت، گەر پێغەمبەرﷺ لەبەر کەمی تەمەنی نەیگێڕایەتەوە..

لەو ڕۆژەوە.. بەڵکو بەر لەو ڕۆژەش کاتێك لەگەڵ باوکیدا کۆچی کرد بۆ مەدینە.. پەیوەندی ئەم منداڵە، کە زۆر زوو پیاوەتی تێدا بەدەرکەوت، بە پێغەمبەر و ئیسلامەوەﷺ دەستی پێکرد..

ئا لەو ساتەوەو تا ئەو ڕۆژەی دەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگاری، لەتەمەنی هەشتا و پێنج ساڵیدا، لە هەر کوێدا پێی بگەین کۆڵنەدەری و تۆبەکاریی تێدا بەدی دەکەین، کە هێندەی تالەموویەك لە ڕێبازەکەی لانادات و، لەو پەیمانەی کە داویەتی پاشگەز نابێتەوەو، هەر بەڵێنێکیشی دابێت بەکەم سەیری ناکات.

لایەنە سەرنج ڕاکێشەرەکانی (عبداللهی کوڕی عومەر) زۆرن.

زانینەکەی و، خاکەڕایی و، سەقامگیری ویژدان و ڕێبازی و، سەخاوەتی و، پارێزکاری(ورع)ی و، بەردەوامی لەسەر پەرستش و ڕاستگۆیی دەستگرتنی بە پێشەنگەوە..

بە هەموو ئەو چاکە و خەسڵەتانە، (ئیبن عومەر) کەسایەتیە بەهێزەکەی و، ژیانە بێگەردە ڕاستگۆیانەکەی زاخاو دابوو..

لە (عومەری کوڕی خەطاب)ی باوکیەوە چاکەی زۆر فێر بووبوو، لەگەڵ باوکیشیدا لەپێغەمبەرەوە تێکڕای چاکە و مەزنیەکان فێر بوو..

وەکو باوکی ئیمان هێنانەکەی بەخوا و، پێغەمبەر، چاك بوو، پاش ئەوەش چاودێریکردنی ئەو بۆ هەنگاوەکانی پێغەمبەر مایەی سەرسوڕمانی عاقڵمەندان بوو..

ئەو سەیری دەکرد، بزانێ پێغەمبەر لە هەموو کارێکدا چی دەکرد، ئەمیش بە وردی و ملکەچییەوە لاسایی دەکردەوە.

بۆ نمونە لێرەدا پێغەمبەرﷺ نوێژی دەکرد.. ئیبن عومەریش لە هەمان جێگەدا نوێژی دەکرد..

لەوێشدا، پێغەمبەر ﷺ بەپێوە دەپاڕایەوە، ئیبن عومەریش بەپێوە دەپاڕایەوە.

یان لەوێدا پێغەمبەر ﷺ بە دانیشتنەوە دەپاڕایەوە، (عبداللە)ش بە دانیشتنەوە دەپاڕایەوە..

ئا لێرەشدا و، لەسەر ئەم رێگایە رۆژێکیان پێغەمبەر لەسەر وشترەکەی دابەزی و، دوو رکات نوێژی کرد، (ئیبن عومەر)یش گەر رێی بکەوتایەتە سەر هەمان شوێن و جێ هەمان کاری ئەنجام دەدا..

نەك هەر هێندە، بەڵکو دەگێڕنەوە کە وشترەکەی پێغەمبەر لەو جێگایەی نێو مەککەدا دووجار سوڕایەوە، بەر لەوەی کە پێغەمبەر ﷺ دابەزێت و دوو رکات نوێژ بکات، لەوانەیە وشترەکە لەخۆڕا وای کردبێت تا شوێنێك بۆ خۆی بسازێنێت.

بەڵام (عبداللە ی کوڕی عومەر) هەر کە بگەیشتایەتە ئەو شوێنە دوو جار وشترەکەی دەسوڕاندەوە، پاشان دایدەنا و.. دواتر دوو رکات نوێژی بۆ خودا دەکرد.. تەواو بەو شێوەیەی کە لە پێغەمبەری بینیبوو..!!

ئەم زۆر لاسایی کردنەوەی پێغەمبەر لەلایەن (ئیبن عومەر)ەوە، وای لە عائیشەی دایکی بڕواداران کردبوو کە لەبارەیەوە بڵێت:

(هیچ کەس شوێن پێی پێغەمبەری لەجێگای خۆیدا وەك ئیبن عومەر هەڵنەگرتووە).

تەمەنە درێژە پیرۆزەکەیشی بەو خۆشەویستیە بەتینەوە بەسەر برد، هەتاوەکو سەردەمێك هات بەسەر موسڵماناندا چاکەکاریان دەپاڕایەوە:

(خوایە چەندە منت هێشتەوە (عبداللەی کوڕی عومەر)یش بمێنێتەوە، تا شوێن پێی هەڵگرم، چونکە بێجگە لەو کەس لەسەر فەرمانەکانی سەرەتا نابینم)..

* * *

بەهۆی بەهێزیی پشکنینی توند و بەتینی هەنگاو و وابەستەیی بە سوننەتەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ، (ئیبن عومەر) هێشتا لە گێڕانەوەی فەرموودە لە پێغەمبەری خواوە دەترسا، فەرمودەی نەدەگێڕایەوە تا بەتەواوەتی یەك بەیەکی پیتەکانی لەیاد نەبوایە.

خەڵکانی هاوسەردەمی دەڵێن:

(لە نێو هاوەڵانی پێغەمبەری خوادا کەس نەبوو هێندەی (عبداللەی کوڕی عومەر) خۆپارێز بێت لە زیاد کردن بۆ فەرموودە یان کەمکردنەوەی)...!!

بەهەمان شێوە زۆر خۆی دەپاراست لە فەتوا دان...

رۆژێکیان پیاوێك هاتە لای بۆ پرسیار کردن، کاتێك پرسیارەکەی ئاراستەی (ئیبن عومەر) کرد، لە وەڵامدا پێی وت:

(هیچ زانیاریم نیە لە بارەی ئەوەی کە تۆ پرسیاری لەبارەوە دەکەیت)...

پیاوەکە رۆشت بە رێگای خۆیەوە.. هەرکە چەند هەنگاوێك دوور کەوتەوە (ئیبن عومەر) دەستەکانی بە خۆشی و شادیەوە دەخشاند بەیەکدا و بەخۆی دەوت:

(ئیبن عومەر لەبارەی شتێکەوە پرسیاری لێکرا کە نەیدەزانی، وتی نازانم).!

زۆریش دەترسا لەوەی لە فەتواداندا ئیجتهاد بکات و، هەڵە بێت ئیجتهادەکەی، سەرەڕای ئەوەی کە ئەو بنەماکانی ئاینێکی مەزنی پەیڕەو دەکرد، کە بۆ ئیجتهادی هەڵە پاداشتێك دادەنێت، دوو پاداشتیش بۆ هی تەواو، بەڵام وەرعەکەی زاتکردنی لەسەر فەتوادان نەهێشتبوو.

هەروەها دووری دەخستەوە لە پلە و پایەی دادوەری.

لەو کاتەشدا دادوەرێتی بەرزترین پلە و پایەی دەوڵەت و کۆمەڵگا بوو و، دەوڵەمەندی و رێز و شکۆی بۆ خاوەنەکەی دەستەبەر دەکرد..

بەڵام (ئیبن عومەر)ی پارێزکار چ پێوەستیەکی بە دەوڵەمەندی و پلە و رێز و شکۆ هەیە..؟!

رۆژێکیان خەلیفە (عوسمان)τ بانگی کرد و داوای لێکرد کە پلەی دادوەر وەربگرێت، لێبووردنی خواست، (عوسمان) زۆری لەگەڵ وت، بەڵام ئەو هەر سوور بوو لەسەر لێبووردنەکەی..

(عوسمان) لێی پرسی: سەرپێچی فەرمانم دەکەیت؟؟

(ئیبن عومەر) لە وەڵامدا وتی:

(نەخێر... بەڵام پێم گەیشتووە کە دادوەری سێ جۆرە...

دادوەرێك کە بەنەزانی دادوەری دەکات، ئەوە لە ئاگر دایە..

دادوەرێك بەپێی ویست و ئارەزووی خۆی دادوەری دەکات، ئەوەش هەر لەئاگر دایە..

دادوەرێکیش ئیجتهاد دەکات و دەیپێکێت، ئەوەشیان هەر ئەوەی بۆ هەیە، نە گوناهی لەسەرە، نە پاداشتی هەیە...

منیش لەبەر خاتری خوا داوات لێ دەکەم بمبوریت لە وەرگرتنی ئەو کارە)...

(عوسمان) لێی بورا، بەڵام پاش ئەوەی کە پەیمانی لێ وەرگرت کە ئەوە بۆ کەس نەگێڕێتەوە.

چونکە (عوسمان) پلە و رێزی (ئیبن عومەر)ی لە دڵی خەڵکیدا دەزانی و، ترسی ئەوەی هەبوو گەر پیاوچاکانی تەقوادار بە وەرنەگرتنی قازێتیەکەی بزانن، شوێن و رێی ئەو بگرن و، ئەو کاتەش خەلیفە کەسانی تەقواداری بۆ قازێتی دەست نەکەوێت..

رەنگە ئەم هەڵوێستەی (عبداللەی کوڕی عومەر) وەك نیشانەیەکی ناجۆر(سلبی) دیاربێت.

بەڵام لە راستیدا وانیە، ئەو کە دادوەرێتی نەدەکرد لەکاتێکدا نەبوو کە کەسی دیکە شایانی ئەو شوێنە نەبێت، بەڵکو زۆرێك لە هاوەڵە چاك و پارێزکارەکانی پێغەمبەری خوا لە

ژیاندا بوون و، هەندێکیان سەر قاڵی کاروباری دادوەری و فەتوا دان بوون..
هەروەها دوور کەوتنەوەی (ئیبن عومەر)یش نەبووە هۆی لەکارکەوتنی کاروباری دادوەریتی، یان بکەوێتە دەست ئەو کەسانەی شیاوی نین...
بەڵکو ئەو وەهای پێ باشتر بوو لەگەڵ دەروونی خۆیدا بمێنێتەوە و، بە گوێڕایەڵی زیاتر و، پەرستشی زۆرتر گەشەی پێ بدات و پاکی بکاتەوە..
هەروەها لەو سەردەمەی ژیانی ئیسلامدا، دونیا بە رووی موسڵماناندا واڵا بوو، سەروەت و سامان بەسەریاندا رژابوو، پلە و پایە و ئەمیرایەتی زۆر بوو بوو.
گومڕایی سەروەت و سامان و پلە و پایە لەدڵی هەندێ بڕوادار نزیك بووەوە، ئەمە وایکرد کە چەندین هاوەڵی پێغەمبەر، لەنێویاندا (ئیبن عومەر)، ئاڵای بەرهەڵستی کردنی ئەو گومڕاکردنە بەرز بکەنەوە و خۆیان بکەنە نمونەی دونیا نەویستی و پارێزکاری و دوور کەوتنەوە لە پلە و پایەی بەرز و، شکاندنی ئاشووب و گومڕاکردنەکەی...

* * *

لە راستیدا (ئیبن عومەر) هاوەڵی شەو بوو، تێیدا هەڵدەستایەوە و شەونوێژی دەکرد و.. هاوڕێی بەرەبەیان(سحر) بوو، بە گریان و پاڕانەوەی لێخۆشبوون بەسەری دەبرد...
لە لاویدا خەونێکی بینی، راڤە و لێکدانەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو خەونەی وابوو کە شەو نوێژی کردە ئەوپەڕی ئومێدەکانی عبدالله و، مایەی خۆشی و شادیەکانی..
دەبا گوێڕادێرین بۆی، خۆی خەونەکەیمان بۆ دەگێڕێتەوە:
(لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ لە خەوندا بینیم پارچەیەك ئاوریشمم بەدەستەوە بوو، بۆ هەر جێگەیەکی بەهەشت بمویستایە دەیبردم...
بینیم دوو کەس هاتن بۆ لام، ویستیان بمبەن بۆ ناو ئاگر، مەلائیکەیەکیان پێ گەیشت وتی: مەترسە، مەشڵەژێ، ئەوانیش وازیان لێ هێنام..
(حەفصە)ی خوشکم خەونەکەی بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: (عبدالله) چاکترین پیاوە، خۆزگە شەونوێژی دەکرد و زۆریشی دەکرد)...
جا لەو رۆژەوە تا گەیشتەوە خزمەتی خوا، لە ماڵ، یان لەسەفەر، وازی لە شەونوێژ نەهێنا..
ئەوەبوو نوێژی دەکرد و قورئانی دەخوێند و، زۆر یادی پەروەردگاری دەکرد... هەرکە گوێی لە ئایەتە ترسێنەرەکانی قورئان دەبوو، وەکو باوکی فرمێسك لە چاوانی دەباری..
(عوبەیدی کوڕی عومەیر) دەڵێت: رۆژێکیان ئەم ئایەتەم بۆ (عبداللهی کوڕی عومەر) خوێندەوە:
﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِنْ كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا، يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا

وَعَصَوْا الرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّى بِهِمْ الأَرْضُ وَلاَ يَكْتُمُونَ اللَّهَ حَدِيثًا: دەبێ چۆن بێ ئەگەر ئێمە لە هەر کۆمەڵێ هاوتاییین یەکێکمان لێ هەڵبژاردن کە ببنە شایەت لەسەریان، تۆشمان کردە شایەتێك لەسەر ئەمانە.. ئەوێ رۆژێ ئەو کەسانەی کافر بوون و بەقسەی پێغەمبەریان نەکرد، حەز دەکەن لەگەڵ زەوی تەخت بکرێن و، ناشتوانن هیچ قسەیەك لە خوا بشێرنەوە.﴾النساء/٤١-٤٢.

ئەمە وای لە (ئیبن عومەر) کرد دەست بکات بە گریان هەتا ریشی بە فرمێسکەکانی تەڕ بوو..

رۆژێکیان لە نێو براکانیدا دانیشت، ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ، الَّذِينَ إِذَا اكْتَالُوا عَلَى النَّاسِ يَسْتَوْفُونَ، وَإِذَا كَالُوهُمْ أَوْ وَزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ، أَلاَ يَظُنُّ أُولَئِكَ أَنَّهُمْ مَبْعُوثُونَ، لِيَوْمٍ عَظِيمٍ، يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ: هاوارە لە کەم فرۆشان، ئەوکەسانەی بەپێوانە شتێ لە مەردم دەسێنن، دەشێ هەموویان پێ بدەن.. ئەگەر خۆشیان بۆیان پێوان، یان بەکێشانەیان پێدان، لێی کەم دەکەن.. ئاخۆ ئەوانە نازانن کە هەر زیندوو دەکرێنەوە، بۆ رۆژێکی گەورە و گران، ئەو رۆژەی کە هەموو مەردوم بۆ دیداری پەروەردگاری هەموو دنیا رادەوەستن.﴾المطففین١-٦.

پاشان بەردەوام ئەم ئایەتەی دووبارە دەکردەوە:

﴿يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ﴾...

لە گەڵیدا فرمێسك باران ئاسا دەهاتە خوارێ.. هەتا لەبەر زۆر تامەزرۆیی و گریانی بورایەوە و کەوت.!!

* * *

سەخاوەت و دونیانەویستی و پارێزکاریەکەی ئەو پێکەوە لە هونەرێکی مەزندا کاریان دەکرد، بۆ پێکهێنانی باشترین چاکەکانی ئەم مرۆڤە مەزنە.. کە زۆری دەبەخشی، چونکە بەخشندە بوو..

حەڵاڵی پاکی دەبەخشی، لەبەر ئەوەی خۆپارێز بوو..

باکی نەبوو لەوەی بەخشندەییەکەی هەژاری بکات، چونکە دونیا نەویست بوو..!!

(ئیبن عومەر)τ لەو کاسانە بوو کە داهاتێکی فراوان و چاکیان هەبوو، زۆریەی تەمەنی بازرگانێکی دەست پاك و سەرکەوتوو بوو.. مووچەیەکی زۆریشی لە -بیت المال- بۆ برِا بوویەوە..

بەڵام هەرگیز ئەو دەستهاتەی بۆ خۆی کۆنەدەکردەوە، بەڵکو بە لێشاو دەینارد بۆ هەژار و نەدار و کەم دەستان..

ئەوەتا (ئەیوبی کوڕی وائلی راسبی) باسی یەکێك لەو بەخشندەییانەیمان بۆ دەکات و،

هەواڵمان دەداتێ کە رۆژێکیان (ئیبن عومەر) چوار هەزار درهەم و قەدیفەیەکی بۆ هات..

بۆ رۆژی دواتر، (ئەیوبی کوڕی وائل) لە بازاڕ بینی ئالیك بە قەرز بۆ وڵاخەکەی دەکڕێ..

(ئەیوبی کوڕی وائل) چوو بۆ لای کەس و کارەکەی و لێی پرسین: باشە دوێنێ چوار هەزار درهەم و قەدیفەیەك بۆ باوکی عبدالرحمن (واتە ئیبن عومەر) نەهات..؟

وتیان: با...

وتی: دەی ئەمڕۆ لە بازاڕ بینیم ئالیکی بۆ وڵاخەکەی دەکڕی و پارەکەی پێ نەبوو.

وتیان: ئەو دوێنێ نەخەوت هەتا هەموو پارەکەی بەخشییەوە، قەدیفەکەی دا بەشانیا و چوویە دەرەوە.. کە گەڕایەوە ئەویشی پێ نەبوو، کە لە بارەیەوە پرسیارمان لێ کرد، پێی وتین: بەخشیویەتی بە هەژارێك...!!

(ئەیوب) چوویەوە دەرەوە و هەردوو دەستی دەدا بەیەکدا، هەتا گەیشتە بازاڕ و چوویە شوێنێکی بەرز و هاواری لە خەڵکی کرد:

(ئەی دەستەی بازرگانان...

چی لە دونیا دەکەن، ئەوە (ئیبن عومەر)ە و هەزارەها درهەمی بۆ دێت و دەیبەخشێتەوە، بۆ بەیانیەکەی ئالیك بۆ وڵاخەکەی بە قەرز دەکڕێت)..؟؟!!

بەڵێ بەراستی هەر کەسێك (محمد) مامۆستای بێت و.. (عومەر)یش باوکی، کەسێکی مەزنە، شایانی هەموو مەزنییەکیشە...!!

بەخشندەیی (عبداللەی کوڕی عومەر)و دونیا نەویستی و خۆپارێزیەکەی، ئەم سێ خاسیەتە لای (عبدالله) راستێتی پێشەنگی و، راستێتی کوڕایەتی دەخستە روو.

کەسێك بەو رادەیە شوێن پێی پێغەمبەری خوا هەڵگرێت، تەنانەت بە وشترەکەیەوە لە شوێنێك رادەوەستێت کە رۆژێکیان پێغەمبەری بینیوە بەوشترەکەیەوە لەوێ راوەستاوە و، بڵێ: (بەڵکو شوێن پێیەکانی بکەونە سەر شوێن پێی)..!

ئەو کەسەی لە چاکە و رێزگرتن و سەرسوڕمان بە باوکیدا بگاتە ئەو ئاستەی کە کەسێتی (عومەر) بەسەر دوژمنانیدا سەپاندبوو، چ جای خزم و کەس و کار و مناڵەکانی..

دەڵێم: ناکرێت کەسێك وابەستەی ئەو پێغەمبەرە و، ئەو باوکە بێت ببێتە بەندەی سەروەت و سامان..

سامانی زۆر و بەلێشاو دەهاتە لای.. بەڵام تەنها بەلایدا تێدەپەڕی و، بەماڵەکەیدا دەپەڕیەوە..

بەخشندەییەکەی، یان بە چاکە باسکردنی، مایەی لەخۆباییبوون نەبوو.

پاشان، ئەو تایبەتی دەکرد بە هەژار و نەداران.. زۆر کەمیش روویدەدا کە بەتەنها نان بخوات.. هەر دەبوو هەتیوێك.. یان هەژارێکی لەگەڵدا بێت.. زۆر جار سەرکۆنەی هەندێك لە کوڕەکانی دەکرد، کاتێك دەیبینی دەوڵەمەندانیان داوەت دەکرد و، هەژارانیان لەگەڵ خۆیاندا

نەدەهێنایەوە و، پێی دەوتن:
(بانگهێشتی تێرەکان دەکەن و، برسییەکانیش بەجێ دەهێڵن)...!!
هەژاران ئاشنای سۆزەکەی بوون و، چێژی چاکە و خۆشەویستیەکەیان کردبوو و لەسەر ڕێگاکەی دادەنیشتن، تا بیانبینێ و لەگەڵ خۆی بیانباتەوە بۆ ماڵ و.. وەك چۆن کۆمەڵەی هەنگ دەورەی گوڵ دەدەن بۆ مژینی شیلەکەی، ئەوانیش ئاوا دەورەیان دەدا!

* * *

لە ڕاستیدا سامان لە دەستی ئەودا خزمەتکار بوو.. نەك فەرمان بەدەست..
هۆکارێکی پێداویستیەکانی گوزەران بوو، نەك بۆ خۆشگوزەرانیو ڕابواردن.
سامانەکەشی تەنها هی خۆی نەبوو، بەڵکو هەژارانیش بەشێکی دیاری کراویان تێیدا هەبوو، بەڵکو مافێکی وەك یەك کە هیچی لەوان جیاواز نەبوو..
دونیا نەویستیەکەی لە بەخشندەییە فراوانەکەیدا هاوکاری بوو... هەرگیز خۆی بۆ دونیا ماندوو نەدەکرد و، هەوڵی بۆ نەدەدا، بەڵکو تەنها ئەوەندە پۆشاکەی دەویست کە جەستە داپۆشێت و، ئەوەندە خۆراکەش کە برسیەتی نەهێڵێت..
یەکێك لەو برایانەی کە لە خوراسانەوە هاتبوو کراسێکی نەرمی جوانی بەدیاری بۆ هێنا و، پێی وت:
-ئەم پۆشاکەم لە خوراسانەوە بۆ هێناویت و، چاوەکانم ڕووناك دەبن، گەر ببینم ئەو جلە زبرانەت لا ببەیت و، ئەم جلە جوانە بپۆشیت..
(ئیبن عومەر) پێی وت: ئادەی پیشانمی بدە..
دەستی لێدا و وتی: ئەرێ ئەمە ئاوریشم نیە..؟؟
هاوڕێکەی وتی: نەخێر.. لۆکەیە.
(عبدالله) کەمێك لێی ڕاما، پاشان بە دەستی لایبرد و وتی:
(نا.. لە خۆم دەترسم.. دەترسم بمکاتە کەسێکی لوت بەرز و لەخۆبایی.. خوداش کەسی لوت بەرز و لەخۆبایی خۆش ناوێت)..!!!
ڕۆژێکیان هاوڕێیەکی کیسەیەکی پڕی بە دیاری بۆ هێنا..
(ئیبن عومەر) لێی پرسی: ئەمە چیە؟
وتی: ئەمە دەرمانێکی زۆر گەورەیە لە عێراقەوە بۆم هێناوی..
(ئیبن عومەر) وتی: باشە ئەم دەرمانە بۆچی چاکە..؟؟
وتی: بۆ هەرسکردنی خۆراك..
(ئیبن عومەر) زەردەخەنە گرتی و بە هاوەڵەکەی وت:
(خواردن هەرس دەکات..؟؟ من ماوەی چل ساڵە هەرگیز تێر خواردنم نەخواردووە)...!!

ئەم پیاوەی کە ماوەی چل ساڵ لەخواردن تێری نەخواردووە، تێر نەخواردنەکەی بەهۆی نەبوونیەوە نەبووە، بەڵکو بەهۆی دونیا نەویستی و پارێزکاری و، هەوڵدانیەوە بوو بۆ شوێن پێ هەلگرتنی پێغەمبەرەکەی و باوکی..

ئەو دەترسا لەوەی ڕۆژی قیامەت پێی بگوترێت:

﴿أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا وَاسْتَمْتَعْتُمْ بِهَا: لە ژیانی دونیاتاندا هەموو خۆشی و لەزەتەکانی خۆتانتان دوایی هێنا و تەواوتان کردن، بە ئارەزووی خۆتان بەو هەموو نیعمەتە پاك و بەلەزەتەی هەتانبوو ڕاتان بوارد.﴾الاحقاف/٢٠

هەروەها بە چاکی تێگەیشتبوو کە لە دونیادا میوان و، ڕێبوارە..

لەبارەی خۆیەوە دەیگوت: (لەوەتەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کردووە، نەخشتم لەسەر خشت داناوە، نە دارخورمایەکم چاندووە)...

(مەیمونی کوڕی مەهران)یش دەڵێت:

(چووم بۆ لای (ئیبن عومەر)، هەرچی شتی نێو ماڵەکەی هەیە خەمڵاندم، لە نوێن و لێفە و ڕایەخ و.. هەموو ئەو شتانەی کە تێیدا بوو، نرخی هەمووی نەیدەکردە سەد درهەم)!!!

ئەمەش بەهۆی نەدارییەوە نەبوو.. چونکە (ئیبن عومەر) دەوڵەمەند بوو..

بەهۆی ڕەزیلیشەوە نەبوو.. چونکە بەخشندەیەکی دەستکراوە بوو..

بەڵکو ئەوەی لەبەر دونیانەویستی و، خۆ دوور گرتن لە رابواردن و، پابەندبوون بە ڕێبازەکەیەوە لە ڕاستگۆیی و پارێزکاریدا بوو..

بەڕاستی (ئیبن عومەر) تەمەنێکی زۆری بەسەر برد و، لەسەردەمی ئەمەویدا ژیا کە پڕ بوو لە ماڵ و سامان و زەوی و زار زۆر بوو، خۆشگوزەرانی زۆربەی ماڵەکانی گرتبوەوە، بەڵکو بڵێ زۆربەی کۆشك و تەلارەکانی گرتبوەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم کێوە پایە بڵندە بەسەر بەرزی و خۆڕاگری مایەوە، ڕەوتی خۆی نەگۆڕی و وازی لە دونیا نەویستی و پارێزکارییەکەی نەهێنا.

کە باسی بەشی دونیا و پێویستیەکانی بکرایە، کە ئەو لێی هەڵدەهات، دەیگوت:

(من و هاوەڵانم لەسەر فەرمانێك کۆ بوویووینەوە، دەترسم گەر سەر پێچیان بکەم نەگەم پێیان)...

پاشان خەڵکەکەی تێدەگەیاند کە ئەو لەبەر بێدەستەڵاتی وازی لە دونیا نەهێناوە و، هەردوو دەستی بەرەو ئاسمان بەرز دەکردەوە و دەیگوت:

(پەروەردگارا.. خۆت دەزانی گەر لەبەر ترسی تۆ نەبوایە پێشبڕکێی قوڕەیشمان دەکرد لە دونیادا)...

* * *

بەڵێ... گەر لەبەر ترسی پەروەردگاری نەبوایە لەم دونیایەدا پێشبڕکێی دەکرد و، لە سەرکەوتوەکانیش دەبوو.

بەڵکو پێویستیشی بە پێشبڕکێ نەبوو، چونکە دونیا بەرەو لای ئەو دەهات و، بەشتە چاك و فریودەرەکانیەوە بەشوێنیەوە بوو..

باشە دەبێت چی هەبێت لە پلە و پایەی خەلیفایەتی زیاتر فریودەر بێت..؟؟

چەندین جار پێشنیار کرا بۆ (ئیبن عومەر) بەڵام ئەو خۆی لادەدا.. هەڕەشەی کوشتنی لێکرا گەر پێی رازی نەبێت، ئەو زیاتر رەتی کردەوە و، خۆی لێ لادا..!!

(حسن)ؓ دەڵێت:

(کاتێك (عوسمانی کوڕی عەففان) کوژرا، بە (عبداللەی کوڕی عومەر)یان وت: تۆ سەروەری خەڵکیت و، کوڕی سەروەری خەڵکیت، وەرە پێشەوە تا وا بکەین خەڵك بەیعەتت بدەنێ..

وتی: سوێند بەخوا من چەند لە توانامدا بێت ناهێڵم بەهۆی منەوە دڵۆپە خوێنێك بڕژێ..

وتیان: دێیتە پێشەوە، یا لەماڵەکەی خۆتدا بتکوژین..

ئەویش قسەکەی پێشتری بۆ دووبارە کردنەوە..

تەماحیان خستە بەری.. ترساندییان.. بەڵام هیچیان لێ هەڵنەکڕاند)..!!

دواتریش.. کە رۆژگار دەگوزەرا و، ئاشووب زیادی دەکرد، هەمیشە (ئیبن عومەر) جێی ئومێد بوو، خەڵکی داکۆکیان دەکرد تا پلەی خەلیفایەتی وەر بگرێت و ئەوانیش پەیمانی پێ دەدەن، بەڵام هەمیشە رەتی دەکردەوە و رازی نەدەبوو..

ئەم رەتکردنەوەیە رەخنەیەکە بەرەو رووی (ئیبن عومەر) دەکرێتەوە..

بەڵام ئەو بەڵگە و پاساوی خۆی بەدەستەوە بوو..

پاش کوژرانی (عوسمان)ؓ، بارودۆخ تێك دەچوو، بەجۆرێك کە مەترسی و خراپی لێ چاوەڕوان دەکرا.

(ئیبن عومەر) گەرچی پلەی خەلیفایەتی وەرنەدەگرت، بەڵام رازی دەبێت بەرپرسیاریەتیەکەی و مەترسیەکانی لە ئەستۆ بگرێت، بەو مەرجەی هەموو موسڵمانان بە گوێڕایەڵی و ویستی خۆیان هەڵیبژێرن، بەڵام تەنها کەسێك بەزەبری شمشێر بهێنرێت بۆ پەیمان پێدانی، ئەمە بوو ئەو رەتی دەکردەوە و لەگەڵیشیدا بەخەلیفایەتی رازی نەدەبوو..

لەو کاتەشدا، ئەم کارە لەتوانا بەدەربوو... سەرەڕای فەزڵەکەی و، کۆدەنگی موسڵمانان لەسەر خۆشویستن و رێزگرتنی ئەو، بەهۆی فراوان بوونی ناوچەکانی ژێر دەستەڵاتیان و، دووریيان لەیەك و، ئەو جیاوازیانەی کەوتبووە نێوان موسڵمانان و، کردبوونیە دەستە و کۆمەڵی جیاجیا و، مەترسی جەنگ و، شمشێر وەشاندنی لێدەکرا، هەموو ئەوانە وایان کردبوو کەش ساز و گونجاو نەبێت بۆ ئەو کۆ دەنگییەی کە (عبداللەی کوڕی عومەر) کردبوویە مەرج..

- ڕۆژێکیان پیاوێکی پێگەیشت و پێی وت: هیچ کەس وەك تۆ بۆ ئوممەتی موحەممەد خراپ نەبووە.!

(ئیبن عومەر) وتی: بۆچی..؟ سوێند بەخوا نەخوێنی کەسیانم ڕشتووە و، نە ڕیزی کۆمەڵیانم شکاندووە و، نە هێزیانم پارچە پارچە کردووە..

پیاوەکە وتی: گەر تۆ ئارەزووت هەبوایە هەموان بەتۆ ڕازی بوون.

(ئیبن عومەر) وتی: حەزناکەم کە بۆم ببوایە و، پیاوێك بیگوتایە: نەخێر و، یەکێکی دیکە بیگوتایە: بەڵێ.

تەنانەت پاش ئەوەی کە ڕووداوەکان قۆناغێکی درێژیان بڕی و، کاروبار بۆ معاویە یەکلا بوویەوە.. لە دوای خۆیشی درا بە (یەزید).. پاشان (معاویە)ی دووەمی کوڕی یەزید لەبەر دونیانەویستی پاش چەند ڕۆژێك لە وەرگرتنی خەلافەت وازی لێهێنا..

هەتا لەو ڕۆژەدا، (ئیبن عومەر) هەر چەندە بەتەمەن بوو، بەڵام هێشتا جێگای ئومێدی خەڵکی و، ئومێدی خیلافەت بوو.. ئەوە بوو (مەروان) چوو بۆ لای و پێی وت:

-دەستت بێنە پەیمان بەتۆ بدەین، چونکە تۆ سەروەری عەرەب و کوڕی سەروەریانی..

(ئیبن عومەر) پێی وت: ئەی چی بکەین بە خەڵکی ڕۆژ هەڵات..؟

(مەروان) وتی: لێیان دەدەین هەتا پەیمانت پێ دەدەن..

(ئیبن عومەر) وتی: (سوێند بەخوا پێم خۆش نیە کە حەفتا ساڵ تەمەنم بێت و، بەهۆی منەوە تەنها یەك پیاو بکوژرێت)...!!

مەروان لای ئەوی بەجێ هێشت و، لەبەر خۆیەوە ئەم هۆنراوەی دەوت:

إني أرى فتنة تغلي مراجلها والملك بعد أبي ليلى لمن غلبا

واتە: من ئاشووب دەبینم جێی خۆدەکاتەوە و دەستەڵات پاش (باوکی لەیلا) بۆ ئەو کەسەیە بەسەریدا زاڵ بێت.

مەبەستی لە باوکی لەیلا (معاویەی کوڕی یەزید) بوو..

* * *

ئەم ڕەتکردنەوەی لەبەر بەکارهێنانی شمشێر و هێز بوو، وایکردبوو لە (ئیبن عومەر) کە هەڵوێستی گۆشە گیری و بێلایەنی لە ئاشووبی چەکداری نێوان لایەنگرانی (عەلی) و، لایەنگرانی (معاویە)دا وەرگرێت و، ئەم وشانە بکاتە دروشم و ڕێبازی خۆی:

(هەر کەسێ وتبێتی: (حي على الصلاة) بەدەمیەوە چووم..

هەرکەسێ وتبێتی: (حي على الفلاح) وەڵامم داوەتەوە.

هەرکەسێ وتبێتی: وەرە بۆ کوشتنی برای موسڵمان و، بردنی ماڵەکەی، وتومە: نەخێر)..!!

بەڵام لەو گۆشەگیری و بێلایەنیەیدا، خوار نابێتەوە بەلای ناڕەوادا..

لە کاتێکدا (معاویە) ئەوپەڕی دەستەڵاتی هەبوو، (ئیبن عومەر) بەجۆرێك بەرەنگاری کرد، ئێشی پێگەیاند و شێواندی.. کە (معاویە) پەیمانی کوشتنی بدات و، هەر معاویەش بوو وتی: (گەر لە نێوان من و خەڵکیدا تاڵە موویەك مابێت نامێڵم بپچڕێت)..!!

ڕۆژێکیان (حەجاج) وەستا بوو وتاری دەدا، وتی: (ئیبن زوبەیر) دەستکاری قورئانی کردووە!

(ئیبن عومەر) بەرپەرچی دایەوە و هاواری لێکرد: (درۆت کرد.. درۆت کرد.. درۆت کرد..)

(حەجاج) لەدەستی دەرچوو و، ئەو کارە لە ناکاوە رایچڵەکاند، لە کاتێکدا ئەو هەموو شتێ لێی دەترسێ، پەیمانی خراپترین سزای بە (ئیبن عومەر) دا..

(ئیبن عومەر) دەستی لە ڕووی (حەجاج) راوەشاند و، وەڵامی دایەوە و، خەڵکەکەش سەرسام بووبوون، وتی:

(گەر ئەوەی پەیمانت دا بەجێی بهێنیت هیچ سەیر نیە، چونکە تۆ نەفامێکی سەپێنراوی)..!!

بەڵام ئەو -سەرەڕای بەهێزی و بوێرییەکەی- تا دوا ڕۆژی تەمەنی سوور بوو لەسەر ئەوەی کە لە ئاشووبی چەکداریدا بەشی نەبێت، رازی نەدەبوو لای هیچ دەستەیەك بگرێت..

(ئەبو عالیەی بەراو) دەڵێت:

(ڕۆژێکیان لە دوای (ئیبن عومەر)ەوە دەڕۆیشتم، ئەو هەستی پێ نەدەکردم، گوێم لێبوو بەخۆی دەوت:

(شمشێرەکانیان خستۆتە سەر ملی یەکدی، هەر یەکەو ئەوەی تر دەکوژێ، دەڵێن: ئەی عبداللهی کوڕی عومەر، دەستت بێنە)...؟!

کاتێك دەیبینی خوێنی موسڵمانان بەدەستی خۆیان دەڕژێ، لە داخ و پەژارەدا وەخت بوو بتەقێ..!!

ئەو -هەروەك لە سەرەتای قسەکانماندا لە بارەیەوە خوێندمانەوە-، (هیچ بڕوادارێکی لە کۆڕەکەیدا رانەچڵەکاندوە)..

خۆ گەر لە توانایدا بوایە شەڕ راگرێت و، خوێن رشتن بوەستێنێت، ئەوا دەیکرد، بەڵام ڕووداوەکان لەو بەهێزتر بوون، بۆیە خۆی گۆشە گیر کرد.

بەڵام دڵی هەر لەگەڵ (عەلی)دا بووە. بەڵکو وەك دەردەکەوێت دڵنیاییەکەشی لەگەڵ ئەودا بوو، تەنانەت لێی دەگێڕنەوە کە لەدوا ڕۆژەکانی تەمەنیدا وتویەتی:

(داخ و کەسەر بۆ هیچ شتێك ناخۆم کە لەدونیادا لەدەستم چووبێت، تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە لەگەڵ (عەلی)دا لە دژی دەستە هەڵگەڕاوەکان نەجەنگام)..!!

ئەو کاتەش کە ئامادە نەبوو لەگەڵ ئیمامی عەلیدا بێت کە لەسەر حەق بوو و، حەقیش لەگەڵ ئەودا بوو، ئەو کارەی بۆ هەڵاتن یان دەرباز بوون نەبوو.. بەڵکو رەتکردنەوەی هەموو جیاوازیی و ئاشووبەکە بوو، بۆ خۆ دوور خستنەوە لە کوشتارێك کە لە نێوان موسڵمان و هاوەڵپەرستدا نیە، بەڵکو لە نێوان موسڵمانان دایە، هەندێکیان هەندێکی دیکەیان دەخۆن..

ئەوەشی بەتەواوی روون کردۆتەوە، کاتێك کە (نافع) لێی دەپرسێت:

ئەی باوکی عبدالرحمن، تۆ کوڕی عومەریت و، هاوەڵی پێغەمبەری خوایتﷺ و، تۆ واو.. تۆ وا.. باشە چی دەستت دەگرێ لەم کارەدا–واتە لە پشتیوانی کردنی عەلی دا–؟؟

پێی وت: (ئەوەی رێگریم لێ دەکات ئەوەیە خوای گەورە خوێنی موسڵمانی لەسەر حەرام کردووم، خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿ وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ..: لەگەڵیان بجەنگن تا ئاژاوە بنەبڕ بێت و ئایین هەر بۆ خوا بێت.﴾البقرە/١٩٣.

ئێمەش بەجێمان هێنا و، شەڕی هاوەڵ پەرستانمان کرد هەتا ئاینی خوا سەرکەوت، بەڵام ئەمڕۆ، لەبەر چی بجەنگین..؟؟

ئەوکاتە من جەنگام، کەعبە لە گۆشەیەوە تا دەرگاکەی پڕبوو لە بت، هەتا خوای گەورە خاکی عەرەبی لێ پاك کردەوە...

جا باشە ئەمڕۆ کەسێك بکوژم کە دەڵێت:( لا اله الا الله).؟!

ئەمە بۆچوون و، پاساو و، بیروڕای ئەو بوو..

کەواتە خۆ دوور گرتنی ئەو لە کوشتار و بەشداری نەکردنی تێیدا، هەڵهاتن یان ناچۆری(سلبی) نەبوو، بەڵکو رەتکردنەوەی جەنگێکی ناوخۆیی نێوان بڕواداران و، بەرزکردنەوەی شمشێری موسڵمان بەرووی موسڵماندا بوو..

(عبداللهی کوڕی عومەر) زۆر ژیا.. ئەو رۆژانەی بینی کە دەروازەکانی دونیا بەرووی موسڵماناندا کرایەوە و، سەروەت و سامان زیادی کرد و، پلە و پایە زۆر بوو و، چاوچنۆکی و ئارەزووەکان گەورەدەبوون..

بەڵام توانا دەروونییە گەورەکەی، پێکهاتەی سەردەمی گۆڕی...!! سەردەمی چاوچنۆکی و سامان و ئاشووبی، لای ئەو کردە سەردەمی دونیا نەویستی و، پارێزکاری و، ئاشتی و، ئەو کۆڵنەدەرە تۆبەکارە بە هەموو دڵنیایی و خوا پەرستی و بەرزییەکیەوە بەسەری برد و، هەرگیز بەسەر سروشتە دەروونیە باشەکەیدا زاڵ نەبوو کە ئیسلام لەرۆژانی مەزن و بەرزی یەکەمیدا دایڕشتبوو و پاکی کردبووەوە..

لەگەڵ سەرەتای دەستەڵاتی ئەمەویدا سروشتی ژیان گۆڕا، هیچ دەروازەیەك نەبوو بۆ دەرباز بوون لەو گۆڕانە و.. ئەو سەردەمە بوو بووە سەردەمی فراوان بوون لە هەموو شتێکدا..

فراوان بوونێك کە تەنها چاوچنۆکی دەوڵەتی نەگرتبووە و بەس، بەڵکو چاوچنۆکی کۆمەڵ و تاکەکانیشی گرتبۆوە.

لە نێوەندی دەریای سەرنج ڕاکێشان و، جۆش و خرۆشی سەردەمی شەیدابوون بە ڕووکاری فراوانخوازی و، دەستکەوت و، خۆشییەکانی، (ئیبن عومەر) لەگەڵ چاکیەکانی خۆیدا دەژیا و، بەردەوامی لەسەر برەو دان بە پێشکەوتنی ڕۆحی مەزنی لە هەموو ئەوانە سەرقاڵی کردبوو..

لە ڕاستیشدا ئەو لە پێویستیەکانی ژیانە پایەبەرزەکەی ئەوەندەی بەدەست هێنا بوو کە بە ئاواتیەوە بوو، هەتا هەندێك لە هاوسەردەمەکانی لە بارەیەوە دەڵێن:

(ئیبن عومەر کە مرد، وەك (عومەر) وابوو لەچاکەدا.)

بەڵکو لەبەر سەرسامیان بە تیشکی چاکەکانی، دەیانویست کە چاکەکانی ئەم لەگەڵ (عومەر)ی مەزنی باوکیدا بەراورد بکەن، دەیانوت:

(عومەر لەسەردەمێکدا بوو هاو شێوەی هەبوو، بەڵام ئیبن عومەر لە سەردەمێکدا ژیا هاوشێوەی نەبوو)..!!

ئەمەش زیادەڕۆییەکە شایستەیی (ئیبن عومەر) لێخۆشبوونی بۆ دەخوازێت.. بەڵام (عومەر) لەگەڵ هیچ کەسدا بەراورد ناکرێت و.. زۆر دوورە لەوەی کە لە هەموو سەردەمەکاندا نمونەی هەبێت..

لە ساڵی هەفتاوسێی کۆچیدا... خۆر بەرەو ئاوا بوون دەچوو، یەکێك لە کەشتیە هەمیشەییەکان خۆی پێچایەوە و، بەرەو جیهانەکەی دیکە و لای پەروەرندگاری ڕۆیشت، کە جەستەی دوایەمین نوێنەری ڕۆژانی وەحی-لە مەککە و مەدینە-ی لەگەڵ خۆیدا هەلگرتبوو، کە ئەویش -عبداللە‌ی کوڕی عومەر- بوو[1].

---

١ دوایەمین هاوەڵ کۆچی دوای کردبێت -ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ - بوو، کە لەبەسرە وەفاتی کرد، لەساڵی نەوەد و یەکی کۆچیدا، یان دەڵێن لە ساڵی نەوەد و سێی کۆچیدا وەفاتی کردووە.

ئەو هەواڵانەی سەبارەت بە هێرش و دەست درێژییەکانی هێزە چەکدارەکانی فارس بۆ سەر موسڵمانان و.. جەنگی (جسر) کە لە تەنها ڕۆژێکدا چوار هەزار شەهید بوونە قوربانی و.. شکاندنی خەڵکی عێراق بۆ ئەو بەڵێن و پەیمانانەی لەسەریان بوو، گەیشتە ئەمیری بڕواداران (عومەری کوڕی خطاب) نیگەرانی کردبوو..

بۆیە بڕیاریدا کە خۆی بەرەو ئەوێ بڕوات و لە جەنگێکی یەکلاکەرەوەدا دژ بە فارسەکان سەرپەرشتی سوپای موسڵمانان بکات...

ئەوەبوو لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوەڵانیدا بەڕێ کەوت و (عەلی کوڕی ئەبو طالب)ی کردە جێنشینی خۆی لەسەر مەدینە..

بەڵام هێشتا لە مەدینە دوور نەکەوتبووەوە، هەندێك لە هاوەڵان وایان پێ چاك بوو کە بگەڕێتەوە و، بۆ ئەم کارە گرنگە هاوەڵێکی دیکە راسپێرێت لە بری خۆی..

ئەم بۆچوونەش (عبدالرحمنی کوڕی عەوف) هێنایە ئاراوە و، رایگەیاند کە ژیانی ئەمیری بڕواداران بەو جۆرە بخرێتە مەترسییەوە لە کاتێکدا کە ئیسلام لە رۆژگاری یەکلابوونەوەیدایە، کارێکی دروست نیە..

(عومەر) فەرمانی دا کە موسڵمانان کۆ ببنەوە بۆ راوێژ و بانگی نوێژی بە کۆمەڵ(الصلاة الجامعة) کرا و (عەلی کوڕی ئەبو طالب)یش بانگکرا، ئەویش لەگەڵ هەندێك لە خەڵکی مەدینەدا بەرەو ئەو جێگایە رۆشت کە ئەمیری بڕواداران و هاوەڵانی لێ بوو.. بیروڕا بەوە گەیشت کە (عبدالرحمنی کوڕی عەوف) بانگەشەی بۆ دەکرد و، ئامادەبوان بڕیاریاندا کە (عومەر) بگەڕێتەوە بۆ مەدینە و، سەرکردەیەکی دیکە لە نێو موسڵماناندا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی فارسەکان هەڵبژێرێت..

ئەمیری بڕوادارانیش هاتە سەر ئەو رایە و، لە هاوەڵانی پرسی:

-باشە کێتان پێ چاکە بینێرین بۆ عێراق..؟؟

بۆ کەمێك بێدەنگ بوون و بیریان کردەوە...

پاشان (عبدالرحمنی کوڕی عەوف) هاواری کرد: دۆزیمەوە..!!

(عومەر) وتی: کێیە..؟

(عبدالرحمن) وتی:

(شێر لە هەڵمەت بردندا.. سەعدی کوڕی مالیکی زوهەری..)

موسـڵمانانیش پێـشنیارەکەیان بـەلاوە پەسـەند بـوو، ئـەمیری بـڕواداران نـاردی بـەدوای (سەعدی کوڕی مالیکی زوهەری)دا -کـە (سـەعدی کـوڕی ئـەبو وەقـاص)ە- و کردیـە ئـەمیری عێراق و، فەرماندەی سوپا..

دەبێ ئەو کەسە کێ بێ کە (شێرە لە هەڵمەت بردندا)..؟

دەبێ ئەو کەسە کێ بێت گەر بهاتبایە بـۆ لای پێغەمبـەر ﷺ و، ئـەویش لـەنێو یاوەرانیـدا بوایە، سڵاوی لێدەکرد و قسەی خۆشی لەگەڵ دەکرد و دەیفەرموو:

(ئەمە خاڵی منە.. دەی بایەکێك لە ئێوەش خاڵی خۆیم نیشان بدات)..!!

ئەو پیاوە (سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص)ە... باپیرەی (ئوهـەیبی کـوڕی مـەناف)ە.. مـامی خاتوو (ئامینە)ی دایکی پێغەمبەری خواﷺ..

لەتەمەنی حەڤـدە سـاڵیدا موسـڵمان بـوو، موسـڵمان بوونەکەشـی زۆر زوو بـوو، لـە بـارەی خۆیەوە دەدوێت و دەڵێ:

(...ڕۆژگارێك بوو من سێیەکی ئیسلام بووم)..!!

واتە ئەو سێیەمین کەسی سەرەتا بوو کە بەرەو ئیسلام هاتن.

لە ڕۆژانی سەرەتادا کە پێغەمبەر ﷺ لـە بـارەی خـودای تـاك و تـەنهاوە دەدوا و، مژدەی ئاینی نوێی بڵاو دەکردوە، بەر لەوەی کە پێغەمبەر ﷺ ماڵی (ئەرقەم) بکاتە پەناگە بۆ خۆی و ئەو هاوەڵانەی کە باوەڕیان پێی هێنابوو، (سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص) دەستی پەیماندانی بـۆ پێغەمبەر ﷺ درێژ کرد..

لەو بارەیـەوە کتێبـەکانی سـەریردەو مێـژوو بۆمـانی دەگێڕنـەوە کـە ئـەو یـەکێك بـوو لـەو کەسانەی بەهۆی موسڵمان بوونی (ئەبو بەکر) و لەسەر دەستی ئەو موسڵمان بوون..

بـۆی هەیـە لـەو ڕۆژەدا لەگـەڵ ئـەوانی تـر کـە ئەبوبـەکر قەناعـەتی پێهێنـان موسـڵمان بوونەکەی ڕاگەیاندبێ، کە ئـەوانیش (عوسمـانی کـوڕی عـەفان) و، (زوبـەیری کـوڕی عـەوام) و، (عبدالرحمنی کوڕی عەوف) و، (طەڵحەی کوڕی عبیداللە) بوون..

ئەمەش ڕێ لەوە ناگرێت کە پێشتر بەنهێنی موسڵمان بووبێت..

لە ڕاستیشدا (سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص) سەروەریی زۆری هەیە کـە دەتوانێـت پێیانـەوە بنازێت و شانازییان پێوە بکات..

بەڵام ئەو تەنها بە دوو چاکەی گەورە لە چاکەکانی شانازی دەکرد..

یەکەمیان: یەکەمین کەسە لەپێناوی خوادا تیر و ڕمی هاویشتبێ.

دووەمیش: ئەو تاکە کەسێکیشە کە پێغەمبەر ﷺ دایك و باوکی خـۆی بـەقوربان کردبێـت، ئەوە بوو لە ڕۆژی (ئوحود)دا پێی فەرموو:

(تیر بهاوێژە ئەی سەعد.. دایك و باوکم بەقوربانت بێ)..

بەڵێ.. ئەو هەمیشە شانازی بەو دوو بەخششە مەزنە دەکرد و، سوپاسگوزاری خوا بوو لەسەریان و دەیوت:

(سوێند بەخوا.. یەکەمین پیاوم لە نێو عەرەبدا کە لە پێناوی خوادا تیری هاوێشتبێ)..

(عەلی کوڕی ئەبو طالب)یش دەڵێت:

(هەرگیز گوێم لێ نەبووە پێغەمبەر ﷺ دایك و باوکی بکات بە قوربانی هیچ کەس جگە لە (سەعد)، گوێم لێ بوو لە ڕۆژی (ئوحود)دا دەیفەرموو:

(سەعد تیر بهاوێژە.. دایك و باوکم بە قوربانت بێ)..

بەراستی (سەعد)یش یەکێك بوو لە ئازاترین سوارچاکانی عەرەب و موسڵمانان و دوو چەکی هەبوو.. ڕمەکەی و.. نزاکانی..

لە جەنگدا تیری بۆ هەر دوژمنێك بهاوێشتایە دەیپێکا.. هەر پاڕانەوە و نزایەکیشی بکردایە خوا گیرای دەکرد..!!

خۆی و، هاوەڵانیش، هۆکاری ئەوەیان بۆ پاڕانەوەیەکی پێغەمبەر ﷺ بۆی دەگەڕاندەوە.. ئەوەبوو ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ شتێکی لێ بینی دڵخۆش و بەختەوەری کرد، ئەم پاڕانەوە وەرگێڕاوەی بۆ کرد:

(پەروەردگارا هاویشتنەکەی ڕاست ڕەو بکە و.. نزاکانی گیرا بکە)..

بەو جۆرە لە نێو برا و هاوەڵەکانیدا ناسرابوو کە پاڕانەوەکانی وەك شمشێری بڕەر وان، خۆیشی لە کارو کردەوەی خۆیدا هەستی بەوە بوو؛ بۆیە دوعای لەکەس نەدەکرد تەنها دەیدایە دەست خوا.

لەو بارەیەوە (عامری کوڕی سەعد) دەگێڕێتەوە:

(سەعد) پیاوێکی بینی جنێوی بە (عەلی) و (طەڵحە) و، (زوبێر) دەدا، ڕێگری لێ کرد، بەڵام پیاوەکە وازی نەهێنا.

سەعد پێی وت: کەواتە دوعات لێ دەکەم.

پیاوەکە وتی: دەبینم وەك ئەوەی پێغەمبەر بیت هەڕەشەم لێ دەکەیت..!!

سەعد ڕۆشت و دەست نوێژی گرت و دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان دەستەکانی بەرزکردەوە و وتی: خودایە گەر دەزانی ئەم پیاوە جنێو بە کەسانێك دەدات کە پێشتر چاکەیان لای تۆ هەبووە و جنێو پێدانیشیان ڕقت هەڵدەستێنێ، ئەوا بیکەرە پەند و عیبرەت...

تەنها ماوەیەکی کورتی بەسەردا تێپەڕی.. هەتا ڕۆژێکیان حوشترێك لەماڵێکەوە هاتە دەرێ و بەهیچ نەگیرایەوە و کەوتە نێو قەرەباڵغی خەڵکەوە –وەك ئەوەی بۆ شتێك بگەڕێت–، پاشان پەلاماری پیاوە جنێودەرەکەی دا و خستیە ژێر قاچەکانی و، کەوتە سەری هەتا مرد..!!

لەراستیدا ئەم دیاردەیە، گیان ناسکی و بێگەردی و، راستێتی دڵنیایی و، قوڵی دڵسۆزی ئەو دەخاتە روو.

بەراستیش.. سەعد.. گیانەکەی ئازاد و.. دڵنیاییەکەشی پتەو و.. دڵسۆزیەکەشی قوڵ بوو..

هەموو کاتێکیش بە پارووی حەڵاڵ پشتگیری تەقوای خۆی دەکرد، هەردەم سوور بوو لەسەر رەتکردنەوەی هەر درهەمێك کە جێگەی گومان بووبێت..

(سەعد) ئەوەندەش ژیا.. هەتا گەیشتە ئەوەی لە دەوڵەمەندترین کەسانی نێو موسڵمانان بێت، ئەو رۆژەیش کە مرد سەروەت و سامانێکی چاکی لە پاش بەجێما.. لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆری سامان و حەڵاڵێتی، زۆر کەم پێکەوە رێکدەکەون، ئەوا لای (سەعد) کۆ بوو بوونەوە و.. خوا زۆری حەڵاڵ و.. چاکی پێدا بوو..

بەڕاستیش (سەعد) ﷺ لە هونەری ماڵ بەخشیندا مامۆستا بوو، هەروەك چۆن لە هونەری دەستکەوتندا مامۆستا بوو..

توانای ئەو لە کۆکردنەوەی ماڵی حەڵاڵی پوخت و بێ خەوشدا، هاوتا –بگرە بەرزتریش– بوو لە توانای بەخشینی لە پێناوی خوادا..

لە حەجی ماڵئاواییدا، ئەو لەگەڵ پێغەمبەرخوا دابوو لەوێ نەخۆش کەوت، پێغەمبەر ﷺ چووە سەردانی، (سەعد) لێی پرسی:

(ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.. من خاوەن سامانم و.. تەنها کچێکم هەیە میراتگرم بێ.. دەکرێ دوو لە سێ بەشی سامانەکەم بکەمە خێر..؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر..

وتم: ئەی نیوەی..؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر..

وتم: ئەی سێیەکی..؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ.. سێیەکیش زۆرە.. تۆ گەر میراتگرەکانت بە دەوڵەمەندی بەجێ بهێڵیت.. چاکترە لەوەی بە هەژاری بەجێیان بهێڵی و چاویان لە دەستی خەڵکی بێت، تۆ هەر شتێك لە پێناوی خوادا ببەخشیت پاداشتی خۆیت لێ دەست دەکەوێت، تەنانەت پارووەکیش کە دەرخواردی خێزانەکەتی دەدەیت)..

دواتر (سەعد) هەر تەنها باوکی کچێك نەمایەوە و.. خوای گەورە پاش ئەو نەوەی دیکەی پێ بەخشی.

* * *

(سەعد) لە ترسی خوا زۆر دەگریا..

ئەو هەر کاتێك گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بوایە ئامۆژگاریان دەکا و، بۆیان دەدوێ، چاوەکانی پڕ لە فرمێسك دەبوون، تا دەگەشتە ئەوەی فرمێسکەکانی کۆشی تەڕ بکات..

لە راستیشدا پیاوێك بوو کە نیعمەتی سەرکەوتن و رازی بوونی پێ بەخشرا بوو..

ڕۆژێکیان، لە کاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵەکانیدا دانیشتبوو، چاوی بڕیبوە ئاسۆ وەك کەسێ گوێ لە چرپە و پەنهانێك بگرێ، پاشان سەرنجی روخساری هاوەڵەکانی داو فەرمووی:

(ئێستا پیاوێکی ئەهلی بەهەشت دێت بۆ لاتان)..

هاوەڵانیش سەرنجی هەموو کوچە و لایەکیان دەدا تا بەبینینی ئەو کەسە بەختەوەرە سەرفرازە خۆشبەخت و شاد ببن..

پاش ماوەیەکی کەم، (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) هات بۆ لایان.

لەدوای ئەوە (عبداللەی کوڕی عەمری کوڕی عاص) خۆی گەیاندە لای و زۆر بەتکاوە لێی پرسی کە ئەو کار و پەرستشانەی پێ بڵێت کە لە خوای گەورەی نزیك دەکاتەوە و، ئەوی وا لێ کردوە شایانی ئەو پاداشت و، مژدەیە بێت.

(سەعد) پێی وت:

(هیچی زیاتر نیە لەوەی کە هەموومان پێی هەڵدەستین و دەیپەرستین..

بێجگە لەوەی کە من هیچ رق و کینەیەك بەرامبەر بە موسڵمانان هەڵناگرم).

ئا ئەوەیە (شێری هەڵمەتبەر) هەروەك (عبدالرحمنی کوڕی عەوف) پێناسەی کرد..

ئا ئەمە ئەو پیاوەیە کە (عومەر) هەڵیبژارد بۆ ڕۆژی مەزنی (قادسیە)..

لە راستیشدا هەموو چاکەکانی ئەو لەبەردەم بەرچاو روونی ئەمیری باوەڕداراندا دەدرەوشایەوە لە کاتێکدا کە بۆ ناڕەحەتترین چالاکی کە ڕووبەڕووی ئیسلام و موسڵمانان دەبووەوە هەڵیبژارد.

ئەو دوعای گیرا بوو.. گەر داوای سەرکەوتن لە خوا بکات پێی دەبەخشێت.

ئەو خواردن پاك و.. زمان پاك و.. ویژدان پاك بوو..

ئەو یەکێك بوو لە ئەهلی بەهەشت.. هەروەك پێغەمبەر ﷺ پێشبینی کرد.

ئەو سوار چاکی ڕۆژی بەدر و.. سوار چاکی ڕۆژی ئوحود و.. سوار چاکی هەموو دیمەنێك بووە کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بینیبێتی..

چاکەیەکی دیکەی، کە هەرگیز (عومەر) لەیادی ناچێت و بوێناگا نیە لە گرنگی بەها و جێگای لە نێو ئەو تایبەتمەندیانەدا کە پێویستە هەبێت لە هەموو ئەو کەسانەدا کە ڕووبەڕووی کاری مەزن دەبنەوە، ئەویش باوەڕپتەوییەتی..

هەروەها (عومەر) هەرگیز هەواڵی (سەعد) لەگەڵ دایکی لەیاد ناچێت، لەو ڕۆژەدا کە موسڵمان بوو و شوێنی پێغەمبەر ﷺکەوت..

ئەو کاتەی کە هەموو هەوڵەکانی ڕێگری کردن و پاشگەزکردنەوەی لەسەر ڕێگەی خوا بێئاکام بوو.. دایکی پەنای بردە بەر هۆکارێك کە بێگومان بوو لەوەی گیانی (سەعد) شکست دەهێنێت و دەیگێڕێتەوە بۆ سەر بت پەرستیی خزم و کەسەکانی..

دایکی دەست هەڵگرتنی لە خواردن و خواردنەوە ڕاگەیاند، هەتا (سەعد) دەگەڕێتەوە سەر ئاینی باوباپیر و نەتەوەکەی و، بەوپەڕی سەختی لەسەر مانگرتنەکەی بەردەوام بوو تا تەواو شەکەت بوو..

ئەو هەمووە و سەعدیش هەر گوێی پێ نەدەدا و، ئیمانەکەی خۆی بەهیچ شتێك نەدەگۆڕییەوە، ئەگەریش ئەو شتە ژیانی دایکی بێت..

لە کاتێکدا لە مردن نزیك بوو بوویەوە، هەندێك لە خزم و کەسەکانی بردیان بۆ لای دایکی تا سەرنجی ماڵئاوایی لێ بدات، بەو ئومێدەی بە بینینی دایکی لە سەرە مەرگدا دڵی نەرم ببێت..

(سەعد) ڕۆشت و.. دیمەنێکی بینی کە بەردی دەتاواندەوە..

بەڵام ئیمانی ئەو بە خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ لە بەرد و پۆڵا پتەوتر بوو، دەم و چاوی بردە پێشەوە لە روخساری دایکی و هاواری لێکرد تا ببیستێ:

(دایە بزانە، سوێند بەخوا.. گەر سەد گیانت هەبێت و، یەك بەیەك دەربچێت، واز لەم ئاینەم ناهێنم بۆ هیچ شتێك..

دە تۆش کەیفی خۆتە، دەخۆی یان ناخۆی)..!!

دایکی وازی لە مانگرتنەکەی هێنا و.. نیگا هاتە خوارەوە و دەستخۆشی هەڵوێستەکەی (سەعد)ی کرد و، پشتگیری کرد، دەفەرموێت:

﴿وَإِنْ جَاهَدَاكَ عَلَى أَنْ تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلاَ تُطِعْهُمَا: ئەگەر هانیان دای هاوەڵپەرستێك بۆ من بڕیار بدەی کە زانیاریت پێی نیە، لەوەدا گوێڕایەڵیان مەکە.﴾العنکبوت/٨.

ئەرێ بەڕاستی ئەمە (شێری هەڵمەت بەر)نیە..؟؟

کەواتە با ئەمیری بڕواداران ئاڵای (قادسیە) بداتە دەستی و، با تیربارانی زیاد لە سەد هەزار جەنگاوەری مەشق پێکراوی کۆبووەوەی فارسی پێ بکات، کە بە ترسناکترین تفاقی جەنگی ئەو سەردەمەوە چەکدار کرابوون.. زیرەکترین عەقڵی جەنگی ئەو سەردەمە و، فێڵبازترین کەسیان سەرکردایەتیی دەکرد.

بەڵێ.. بۆ لای ئەوان بە لەشکرە سامناکەکانیانەوە، (سەعد) تەنها بە سی هەزار جەنگاوەری.. رم بەدەستەوە.. تەنها رم و بەس.. بەرە و ڕوویان دەبێتەوە.. بەڵام لەدڵیاندا

ویستی ئەم ئاینە نوێیە بەوپەڕی ئیمان و، پەرۆشی و، ئارەزوومەندی و دڵخۆشی بەرەو مردن و، شەهید بوون هەیە..!!!

هەردوو لا بەیەك گەیشتن...

بەڵام.. نا .. هێشتا بەیەك نەگەیشتوون..

(سەعد) لەوێ چاوەڕوانی ڕێنوێنی و ئامۆژگاری ئەمیری بڕواداران (عومەر) دەكات.. ئەوەش نامەی (عومەر)ە بۆ ئەو و فەرمانی پێدەكات كە بگەنە (قادسیە) كە دەروازەی فارسە و، پەیامی ڕووناكی و ڕێنوێنی دەدات بە گوێدا:

{ئەی (سەعدی كوڕی وەهیب).!!

لەخۆبایی نەبیت گەر وترا: خاڵی پێغەمبەری خوا و هاوەڵیەتی، چونكە ڕەچەڵەك لە نێوان خوای گەورە و بەندەدا نیە تەنها بە ملكەچی و گوێڕایەڵی ئەو نەبێت.. خەڵكیش پایە بڵند و بێپایە لای خودا وەك یەكە... پەروەردگاریان خوایە و، ئەوانیش بەندەی ئەون و.. بەهۆی لەش ساغی و بەهێزییان ڕێزدار دەبن و، بەهۆی گوێڕایەڵییەوە پاداشتی لای خودایان دەست دەكەوێت...

سەرنج بدە ئەو ڕێ و شوێنەی كە پێغەمبەری خواﷺ لەسەری بەدی كرد، لەو ڕۆژەوەی نێردرا و تا ئەو ساتەی لێمان جیا بوویەوە و، پابەند بە پێوەی، چونكە بەڕاستی ئەوە ڕێ و شوێنی تەواوە...}

پاشان پێی دەڵێت:

{لەبارەی هەموو كاروبارێكتانەوە نامەم بۆ بنووسە.. چۆن دادەبەزن...؟ دوژمنتان دەكەوێتە كوێتانەوە... بەهۆی نامەكانتەوە وام لێ بكە، وەك ئەوەی تەماشاتان بكەم وابێ}...!!

بەمجۆرە (سەعد) نامە بۆ ئەمیری بڕواداران دەنوسێت و باسی هەموو شتێكی بۆ دەكات، هەتا وەختە بگاتە ئەو ڕادەی كە شوێن و هەڵوێستی هەموو سەربازێكی بۆ دیاری بكات..

(سەعد) لە (قادسیە) دادەبەزێت، فارسەكانیش بە گەل و سوپاوە كۆدەبنەوە، بەجۆرێ كە پێشتر وا كۆنەبونەتەوە، ڕۆستەمیش كە ناودارترین و مەترسیدارترین سەركردەیانە سەرپەرشتی سوپا دەگرێتە ئەستۆ..

(سەعد) نامە بۆ (عومەر) دەنوسێت و، ئەمیش وەڵامی دەداتەوە:

{خەمبار مەبە بەوەی لەوانەوە دەیبیستی، یا ئەوەی بۆتی دەهێنن، پشت بەخوا ببەستە و، پەنای پێ بگرە و، چەند پیاوێكی هۆشمەند و خاوەن بیروڕا و بەغیرەت بنێرە بۆ لایان، بانگیان بكەن بۆ لای خوا... و هەموو ڕۆژێكیش نامە بۆ من بنووسە...}

(سەعد) دەگەڕێتەوە و نامە بۆ ئەمیری بڕواداران دەنووسێت و دەڵێت: {(ڕۆستەم) سەربازگەی لە (ساباط) داناوە و ئەسپ و فیلیان هێناوە و، ئێستا لە ئامادە باشیدان بەرانبەرمان...}.

(عومەر)یش وەڵامی دەداتەوە و دڵنیای دەکاتەوە و ڕێی نیشان دەدات...

(سەعد)ی سوار چاکی زیرەکی گیان لەسەر دەست، خاڵۆی پێغەمبەری خوا ﷺ و، دەستپێشخەر لە موسڵمان بوون و، پاڵەوانی جەنگ و غەزاکانە، ئەو کەسەیە شمشێرەکەی هەڵە ناکات و، رمیشی لار ناڕوات، لە یەکێك لە جەنگە مێژووییەکاندا لە پێشەوەی سووپاکەیدا وەستاوە.

وەستاوە وەك ئەوەی سەربازێکی ئاسایی بێت.. نە لەخۆبایی بوون بە هێز و، نە پلە و پایەی سەرکردایەتی، وایان لێ کردووە کە تەنها متمانەی تەواوی بەخۆی بێت.. بەڵکو پەنا بۆ ئەمیری بڕواداران دەبات لە مەدینە، کە ماوەیەکی زۆر نێوانیانە، هەموو ڕۆژێك نامەی پرس و راوێژی لەگەڵدا ئاڵوگۆڕ دەکات و جەنگە گەورەکەش لە بەرپابووندایە..

(سەعد) بۆیە ئەوەی دەکرد چونکە دەیزانی کە (عومەر) بە تەنها خۆی لە مەدینە فەتوا نادات و، بە تەنها بڕیار دەرناکات.. بەڵکو پرس و ڕا بەو موسڵمانانەی کە لە دەوریین و بە هاوەڵانی دیاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات...

(سەعد)یش وێڕای هەموو رەوشێکی جەنگ نایەوێ کە خۆی یان سوپاکەی لە پیت و فەڕی راوێژ و لێکۆڵینەوەکانیان بێبەش بکات، بەتایبەت لە کات و ساتێکدا کە (عومەر)ی تێگەیشتووی مەزن لەنێو گەورە پیاوانیدا بێت.

* * *

(سەعد) راسپاردەکەی (عومەر) بەجێ دەهێنێت، و چەند هاوەڵێکی دەنێرێت بۆ لای (ڕۆستەم)ی سەرکردەی فارس تا بۆ لای ئیسلام بانگی بکەن..

گفتوگۆ لە نێوان ئەوان و سەرکردەی فارسدا درێژە دەکێشێ، لە دواییدا کۆتایی بەقسەکانیان دەهێنن بەوەی قسەکەرەکەیان دەڵێت:

{خوای گەورە ئێمەی هەڵبژاردووە تا بەهۆی ئێمەوە ئەوەی ویستی لەسەرە لە دروستکراوەکانی لە بتپەرستییەوە بۆ یەکخواناسی دەرباز بکات و... لە تەنگی دونیاوە بۆ فراوانیەکەی و، لە ستەم و زۆری فەرمانڕەواکانەوە بۆ دادگەری ئیسلامیان ببات...

ئەوەی ئەمەی لێ قەبوڵ کردین، ئێمەش لێی قەبوڵ دەکەین و، وازی لێ دێنین، ئەو کەسەش بەرانبەرمان بجەنگێ، لە دژی دەجەنگین تا بەڵێنی خوا بەجێ دەگەیەنین...}

ڕۆستەم پرسی: باشە خوا وادە و بەڵێنی چی داوە پێتان...؟؟

هاوەڵەکە وەڵامی دایەوە:

{بەهەشت بۆ شەهیدەکانمان و، سەرکەوتن بۆ زیندوانمان...}

شاندەکە گەڕایەوە بۆ لای (سەعد)ی سەرکردەی موسڵمانان، تا هەواڵی پێ بدەن کە جەنگ ڕوو دەدات..

چاوەکانی (سەعد) پڕ لە ئەشك دەبن..

پێی خۆش بوو ئەو جەنگە یا کەمێك دوا بکەوتایە، یا کەمێك پێشبکەوتایە.. ئەو ڕۆژە نەخۆشییەکەی توند بوو بوو لەسەری و ناڕەحەت و بێ هێزی کرد بوو.. هەموو لاشەی دوو مەڵی دەرکردبوو بە جۆرێك کە نەیدەتوانی دابنیشێت؛ چ جای بتوانێ سەر بکەوێتە سەر ئەسپەکەی و بەشداری شەڕێکی وا گەورە و پڕ لە پەلاماردان و دڵڕەقانە بکات..!!

خۆ گەر جەنگەکە بەر لە نەخۆش کەوتنی دەستی پێ بکردایە، یان دوا بکەوتایە تا چاك دەبووەوە خۆی دەگرت، ئەوا تاقیکردنەوەیەکی مەزنی ئەنجام دەدا.. بەڵام ئێستا.. بەڵام نا، پێغەمبەری خوا ﷺ فێری کردوون کە هیچ کامیان نەڵێت: ((ئەگەر))..

چونکە (ئەگەر) مانای دەستەوەستانی دەدات و، بڕواداری بەهێزیش بێ فرت و فێڵ نیە و، هەرگیز دەستەوەستان نابێت..

ئا لەو کاتەدا (شێری هەڵمەت بەر) لە نێو سوپاکەیدا بۆ وتاردان ڕاوەستا، بەم ئایەتە پیرۆزە دەستی پێکرد:

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِنْ بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ﴾الانبياء/١٠٥.

پاش تەواوکردنی وتارەکەی، نوێژی نیوەڕۆی بە سوپاکەی کرد و، پاشان بە دەنگی بەرز چوار جار (الله اکبر-الله اکبر-الله اکبر-الله اکبر)ی کرد و پێشوازی لەسەربازەکانی کرد..

گەردوون دەنگی دەدایەوە و لەگەڵ دەنگی بڵندی (الله اکبر)ی ئەوان دەیوتەوە، دوای ئەوە دەستی وەکو تیری پێکەر ڕوو کردە دوژمن، هاواری لە سەربازەکانی کرد:

لەسەر بەرەکەتی خوای گەورە با بڕۆین..

خۆیشی بەو هەموو ژان و ئازارەیەوە بەرەو لای ئەو کەپرە بووەوە کە تێیدا دادەنیشت و کردبوویە بارەگای سەرکردایەتیەکەی.. لە گۆشەیەکی کەپرەکەیدا بەسنگدا ڕاکشا و سەرینێکی خستە ژێر سنگیەوە، دەرگای کەپرەکەشی کراوە بوو.. بە جۆرێك کە کەمترین هێرشی فارسەکان بەس بوو بۆ ئەوەی کە بەزیندوویی یا مردوویی دەستگیری بکەن.. بەڵام ئەو سڵی نەدەکرد و نەدەترسا..

دومەڵەکانی گەورە دەبوون و کێمیان لێ دەهات، بەڵام ئەم بە شتێکی کەوە سەر قاڵ بوو، لە گۆشەیەکی کەپرەکەدا بوو (الله اکبر)ی دەکرد و هاواری دەکرد.. فەرمانی دەردەکرد بۆ ئەوانە: بەرەو لای ڕاست بڕۆنە پێشەوە.. بۆ ئەوانەی دیکەش: کەلێنەکانی لای چەپ پڕ بکەنەوە..

(موغیرە) ئاگات لەبەردەمت بێ.. ئەی (جریر) شوێنیان کەوە.. ئەی (نوعمان) لێیان دە.. دەی (ئەشعەس) هێرش بەرە.. تۆش ئەی (قەعقاع)... دەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بەرەو پێشەوە بڕۆن...!!

دەنگەکەی عیزەت و ئومێدی لە خۆ گرتبوو، هەر تاکە سەربازێکی دەکردە سوپایەك..

جەنگاوەرانی فارس وەك مێشی گێژ دەکەوتن.. لەگەڵ ئەوانیشدا بت پەرستی و ئاگر پەرستی هەڵدەوەری..!!

کاتێك بینیشیان سەرکردەکەیان و باشترین جەنگاوەرانیان کوژرا ئیدی وەرەیان بەتەواوی نەما، سوپای موسڵمانان تا (نەهاوەند) شوێنیان کەوت.. پاشان (مەدائن) و چوونە ناویەوە تا تەخت و تاجی کیسرا وەك دەستکەوت و غەنیمە هەڵبگرن!!

* * *

لەشەڕی (مەدائن)دا (سەعد) تووشی نارەحەتیەکی گەورە بوو..

جەنگی (مەدائن) نزیکەی دوو ساڵ پاش جەنگی (قادسیە) بوو- کە تێیدا پێکدادان لە نێوان سوپای فارس و موسڵمانەکاندا بەردەوام بوو، هەتا هەموو پاشماوەی سوپا ڕووخاوەکەی فارس لە (مەدائن) کۆبووەوە و.. بۆ دوا هەڵوێست و یەکلابوونەوە خۆی ساز کرد..

(سەعد) تێگەیشت کە کات لە بەرژەوەندی دوژمنەکانیدایە، بۆیە بڕیاری دا کە ئەو هەلەیان لەدەست بدات.. بەڵام ئەوەی چۆن بۆ بکرێت لە کاتێکدا ڕووباری دیجلە لە وەرزێکی پڕ لافاو و شەپۆلداردا دەکەوێتە نێوان ئەو و مەدائن..

ئا لێرە هەڵوێستێك هەیە کە دەیسەلمێنێ بەڕاستی (سەعد) هەروەك (عبدالرحمنی کوڕی عەوف) وتی، (شێرە لە هەڵمەت بردندا)..!!

ئیمان و سوور بوونی (سەعد) و چوست و چالاك بوون لە ڕووبەڕوو بوونەوەی مەترسیدا و، بە شێوەیەکی نەبەردانە بەسەر (مەحاڵ)دا زاڵ بوو..!!

بەمجۆرە، (سەعد) فەرمانی بۆ سوپاکەی دەرکرد کە لە (دیجلە) بپەڕنەوە و.. فەرمانی دەرکرد کە بگەڕێن بۆ بوارێك لە ڕووبارەکەدا تا بتوانن بپەڕنەوە لێی.. لە دواییدا تەنکاوێکیان دۆزییەوە کە پەڕینەوە لێوەی کەم مەترسیدار نەبوو..

بەر لەوەی کە سوپا کاری پەڕینەوەی دەست پێ بکات (سەعد) دەرکی بەوە کرد کە پێویستە جێگایەك بۆ گەیشتن لەوبەر دابین بکرێت کە دوژمن دەورەی گرتووە.. لەو کاتەدا دوو دەستەی ئامادە کرد..

یەکەمیان: کە ناویان نا دەستەی نارەحەتیەکان(کتیبة الاهوال)، (عاصمی کوڕی عەمری)ی کردە فەرماندەیان..

دووەمیشیان: کە ناوی دەستەی بێدەنگەکان(کتیبة الخرساء) بوو، (قەعقاعی کوڕی عەمر)ی کردە فەرماندەیان..

ئەرکی سەر شانی ئەو دوو دەستەیە بوو کە بەرەنگاری ناخۆشیەکان ببنەوە تا جێیەکی بێترس بۆ سوپا لەویەرەوە دابین بکەن کە بە شوێنیاندا بێت.. بەشێوەیەکی لێزانانەی سەر سوڕهێنەر ئەو چالاکیەیان ئەنجام دا..

نەخشەکەی (سەعد) ئەو ڕۆژە سەرکەوتنێکی وەهای بەدەست هێنا کە مێژوونووسانی سەرسام کردووە..

سەرکەوتنێك کە (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص)یشی سەرسام کرد..

هەروەها (سەلمانی فارسی) هاوڕێ و هاوەڵی شەڕەکەشی سەرسام کردبوو.. لەسەرسامی و خۆشیدا دەستەکانی دەدا بەیەکدا و دەیوت:

{بەڕاستی ئیسلام نوێیە..

سوێند بەخوا دەریاکانیشیان بۆ ملکەچ کرا، هەروەك چۆن وشکاییان بۆ ملکەچ کرا..

سوێند بەو زاتەی گیانی (سەلمانی)ی بەدەستە، بەکۆمەڵ لێی دەردەچن هەروەك چۆن بە کۆمەڵ چوونە ناویەوە..}

هەرواش بوو.. چۆن بە کۆمەڵ چوونە ناو ڕووباری دیجلەوە، بە هەمان شێوە و بەکۆمەڵ لێی هاتنە دەرەوە... تەنها یەك سەربازیان لەدەست نەدا.. بەڵکو لغاوی ئەسپێکیشیان تێدا نەچوو..

یەکێك لە سەربازەکان پەرداخەکەی لێ کەوت، پێی ناخۆش بوو کە لە نێو هاوەڵەکانیدا تەنها ئەو شتی لێ ون بێت، بۆیە هاواری لە هاوەڵەکانی کرد تا هاوکاری بکەن بۆ گرتنەوەی، شەپۆلێکی بەرز بەرەو لایەکی برد تا هەندێك لەوانەی کە دەپەڕینەوە توانیان بیگرنەوە..!!

یەکێك لە سەربردە مێژووییەکان جوانی دیمەنی ئەو پەڕینەوەیەی دیجلەمان بۆ باس دەکات و، دەڵێت:

{(سەعد) فەرمانی کرد کە بڵێین: حسبنا الله ونعم الوکیل..

پاشان بەسواری ئەسپەکەیەوە خۆی کوتایە ناو دیجلەوە.. خەڵکەکەش لەدوای ئەو خۆیان تێکوتا، کەس دوا نەکەوت، پێیدا دەڕۆشتن هەروەك بەسەر زەویدا بڕۆن، لەمبەر تا ئەو بەریان پڕ کردبوو، وای لێهاتبوو لەبەر دەستەی ئەسپ سوار و پیادە ڕووی ئاوەکە دیار نەما بوو، خەڵکەکە لەکاتی پەڕینەوەدا پێکەوە دەدوان وەك ئەوەی لەسەر زەوی بەیەکەوە قسە بکەن، ئەمەش بەهۆی ئەو دڵنیایی و ئاسایش و بڕوابوون بە فەرمانی خوا و سەرکەوتنی و، وادە و بەڵێنی پیشتگیرییەی هەستیان پێدە کرد..!!}

* * *

ئەو ڕۆژەی (عومەر) والیێتی عێراقی بە (سەعد) سپارد، دەستی دایە ئاوەدانکردنەوە و دروست کردنی خانوو بۆ خەڵك و، کوفەی بنیات نا و، ڕێساکانی ئیسلامی لەو وڵاتە پان و بەرینەدا دامەزراند..

ڕۆژێکیان خەڵکی کوفە لای ئەمیری بڕواداران شکاتیان لێ کرد.. سروشتە هەڵگەڕاوە ڕاڕاییەکان بەسەریاندا زاڵ بوو، شتێکی پێکەنیناویان بۆ هەڵبەست، وتیان: (سەعد) نازانێ جوان نوێژمان پێ بکات..!!

(سەعد)یش پڕ بەدەمی پێکەنی، وتی:

{سوێند بەخوا من بە شێوەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژیان پێدەکەم.. لە دوو ڕکاتی یەکەمدا درێژی دەکەمەوە و، لە دوو ڕکاتی دووەمدا کورتی دەکەمەوە}..

(عومەر) بانگی دەکات بۆ مەدینە، هیچ توڕە نابێت، بەڵکو دەست بەجێ داواکەی جێبەجێ دەکات..

پاش ماوەیەك (عومەر) سوور دەبێت لەسەر ئەوەی کە بیگێڕێتەوە بۆ کوفە، سەعد بە پێکەنینەوە وەڵامی دەداتەوە:

{ئایا فەرمانم پێدەکەیت کە بگەڕێمەوە بۆ ناو هۆزێك کەوا هەست دەکەن من بەجوانی نوێژ ناکەم}...؟؟!!

وای بەباش زانی هەر لە مەدینە بمێنێتەوە..

کاتێك ئەمیری بڕواداران (عومەر) ت بریندار کرا، لە نێو هاوەڵانی پێغەمبەردا شەش پیاوی هەڵبژارد، تا کاروباری هەڵبژاردنی خەلیفەی نوێیان بەدەست بێت، لەبارەی هەڵبژاردنی ئەوانەوە وتی کە ئەو شەش کەسی هەڵبژاردوە کاتێ پێغەمبەری خواﷺ وەفاتی کرد لێیان ڕازی بوو.. (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) یەکێك بوو لەو شەش کەسە.

بەڵکو لە دوا وتەکانی (عومەر)دا دەردەکەوێت گەر ئەو یەکێکی لەو هاوەڵانە هەڵبژاردایە بۆ خەلیفایەتی ئەوا (سەعد)ی هەڵدەبژارد..

ئەوە بوو لە کاتێکدا کە هاوەڵەکانی ڕادەسپارد وماڵئاوایی لێدەکردن پێی وتن:

{گەر (سەعد) گرتیە دەست ئەوا چاکە..

خۆ ئەگەر بە کەسێکی دیکەیان سپارد ئەوا با پشت بە (سەعد) ببەستێت}.

* * *

تەمەنی (سەعد) درێژ دەبێت و.. ئاشووبی گەورە دێت بەسەردا و.. ئەو گۆشە گیر دەبێت لێی.. بگرە فەرمان بە خاو و خێزان و کەس و کاری دەکات کە هیچ هەواڵێکی ئەو ئاشووبەی بۆ نەهێنن..

ڕۆژێکیـان ڕووی خـەڵك بـەرەو لای ئـەو وەرگـەڕا، (هـاشمی کـوڕی عوتبـەی کـوڕی ئـەبی وەقاص)ی برازای دەڕوات بۆ لای و پێی دەڵێت:

–مامە ، ئا لێرەدا سەد هەزار شمشێر تۆ بە ڕەواترین کەس دەزانن بۆ ئەم کارە.

(سەعد) وەڵامی دەداتەوە:

{لەو سەد هەزار شمشێرە.. تەنها شمشێرێکم دەوێت.. کە گەر پێی لە بڕوادار درا هیچی لێ نەکات و.. گەر پێی لە بێباوەڕ درا بیبڕێت} ...!!

برازاکەی لە مەبەستەکەی تێگەیشت و، لە گۆشە گیری و ئاشتیەکەیدا وازی لێهێنا..

کاتێکیش کاروبار بۆ (معاویە) یەکلا بووەوە و، کورسی فەرمانڕەوایەتی لە دەستی ئەودا جێگیر بوو، لە (سەعد)ی پرسی:

–ئەوە بۆچی لەگەڵ ئێمەدا نەجەنگایت..؟؟

وەڵامی دایەوە:

{من بە ڕەشەبایەکی توندا تێپەڕیم، وتم: ئخ..ئخ.. حوشترەکەم پاڵی دایەوە تا منیش خۆم دایە پاڵی..}.

(معاویە) وتی: لە قورئاندا (ئخ..ئخ) نیە، بەڵکو خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَىٰ فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّىٰ تَفِيءَ إِلَىٰ أَمْرِ اللَّهِ: ئەگەر دوو دەستە لە بڕواداران لەگەڵ یەك جەنگان، ئێوە ئاشتیان بکەنەوە، ئەگەر یەکیان ویستی ناهەقی لەویتر بکا، ئێوە لەگەڵ ئەوە بجەنگن کە ناهەقی دەکا، هەتا بۆ فەرمانی خوا ملکەچ دەکا.﴾حجرات/٩

تۆش لەگەڵ هەڵگەڕاوەکاندا نەبوویت لە دژی دادگەرەکە.. یان لەگەڵ دادگەرەکەدا نەبووی دژی هەڵگەڕاوەکە.

(سەعد) وەڵامی دایەوە و وتی:

{نەمدەتوانی شەڕ لەگەڵ پیاوێکدا بکەم– مەبەستی (عەلی کوڕی ئەبی طالب) بوو– کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموویێت: تۆ بۆ من لە پایەی (هارون)دایت بۆ (موسا)، بەڵام لە دوای من هیچ پێغەمبەرێك نایەت}..

* * *

لە یەکێك لە ڕۆژەکانی ساڵی پەنجا و چواری کۆچیدا، تەمەنی (سەعد) لە هەشتا تێپەڕیبوو، لە ماڵەکەی خۆیدا لە (عەقیق) خۆی بۆ دیداری خوا ساز دەکرد..

کوڕەکەی دوا ساتەکانی ژیانیمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت:

{سەری باوکم لەکاتی گیاندانا لەسەر کۆشم بوو، گریام، وتی:

کوڕم چی وات لێ دەکات بگریت...؟؟

خوای گەورە هەرگیز ئازاری من نادات و.. من لەئەهلی بەهەشتم}...!!

پتەوی ئیمانەکەی هیچ شتێك لاوازی ناکات، تەنانەت ترس و لەرزی مردنیش..

ئەو پێشتر پێغەمبەر ﷺ مژدەی پێدابوو، ئەویش پتەودارترین ئیمانی بە راستگۆیی پێغەمبەر ﷺ هەیە.. ئیدی لەچی بترسێت..؟

{خوای گەورە هەرگیز ئازاری من نادات و.. من لە ئەهلی بەهەشتم}..!!

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دەیویست کە دەگاتەوە بە خوای گەورە هەلگری جوانترین و رازاوەترین یادگاری بێت کە لەگەڵ ئاینەکەی کۆی کردوەتەوە و بە پێغەمبەری خوای ﷺ گەیاندوە.. پاشان ئاماژەی بۆ سندوقەکەی کرد و کردیانەوە، کراسێکی کۆنی دڕا و شڕیان لێ دەرهێنا، فەرمانی دا بە خاو و خێزان و کەسەکانی کە لەوەدا کفنی بکەن و وتی:

{ لە رۆژی بەدردا لە نێو ئەو کاڵایەدا بەرەو رووی هاوەڵپەرستان بوومەوە و، بۆ ئەم رۆژە هەڵمگرتبوو}...!!

بەڵێ.. ئا ئەو بەرگە کۆنە، تەنها کاڵایەك نیە و بەس.. بەڵکو ئاڵایەکە بەسەر ژیانێکی دوور و درێژی سەربڵندەوە دەشەکێتەوە کە خاوەنەکەی بە بڕواداری و، راستگۆیی و، ئازایەتی گوزەراندویەتی!!

لەسەر شانی پیاوان لاشەی دواین موجاهیدی کۆچکردوو بەرەو مەدینە هەلگیرا، تا جێگای خۆی بە هێمنیەوە لە تەنیشت دەستەیەك لە هاوەڵانی پاکی مەزنیەوە بگرێت کە بەر لەو بەرەو لای خوا بوو بوونەوە و، لاشە تێکۆشەرەکانیان ئارامگەیەکیان لە گڵکۆی (بەقیع) دۆزیەوە.

ماڵئاوا.. ئەی (سەعد)..!!

ماڵئاوا، پاڵەوانی (قادسیە) و، رزگارکاری (مەدائن) و، خامۆشکاری ئاگری پەرستراوی فارس بۆ هەتا هەتایی..!!

# صوهەیبی کوڕی سینان

## باوکی یەحیا لە مامەڵەکەیدا قازانجی کرد

لە نێو ناز و نیعمەتدا لە دایك بوو...

باوکی فەرمانڕەوای (ئوبلە) و والی (کیسرا) بوو لەسەری... لەو عەرەبانە بوو کە سەردەمانی زۆر بەر لە ئیسلام ڕێ ڕەویان کردبوو بۆ عێراق، لە نێو کۆشکەکەیدا کە بەسەر کەناری ڕووباری فوراتدا دەیڕوانی، لەولای (جەزیرە) و (موصل)، ئا لەوێدا منداڵەکە بەخۆشی و بەختەوەری ژیا..

ڕۆژێکیان وڵات تووشی هێرشی ڕۆمەکان بوو.. ئەو ڕق لەدڵانە ژمارەیەکی زۆریان بە دیل گرت و ئەو منداڵەش کە (صوهەیبی کوڕی سینان) بوو کردیانە کۆیلە...

بازرگانانی کۆیلە دەستا و دەستیان پێدەکرد، تا ئەو سوڕانەوە دوور و درێژەی لە مەککە کۆتایی هات و، فرۆشرا بە (عبداللەی کوڕی جەدعان)، دوای ئەوەی قۆناغی منداڵێتی و سەرەتای لاوی لە وڵاتی ڕۆم بەسەر بردبوو، هەتا زمان و شێوازی قسەکردنی ئەوانی وەرگرتبوو.

خاوەنەکەی بە زیرەکی و چوست و چالاکی و دڵسۆزییەکەی سەرسام دەبێت، بۆیە ئازادی دەکات و، بواری بۆ دەڕەخسێنێت لەگەڵ خۆیدا بازرگانی بکات.

ڕۆژێکیان... با لێگەڕێین (عەماری کوڕی یاسر)ی هاوڕێی لە بارەی ئەو ڕۆژەوە بۆمان بدوێت:

{لە دەرگای ماڵی (ئەرقەم) گەیشتم بە (صوهەیبی کوڕی سینان)، کە پێغەمبەری خوایﷺ تێدا بوو...

پێم وت: چیت دەوێ...؟

وەڵامی دامەوە: ئەی تۆ چیت دەوێ..؟

پێم وت: دەمەوێت بچم بۆ لای (محمد) و، گوێبیستی ئەوە بم کە دەیڵێت.

وتی: منیش هەمان شتم دەوێت..

چووینە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەرﷺ و، ئەویش باسی ئیسلامی بۆ کردین و، موسڵمان بووین...

دوای ئەوە بەو شێوەیەماینەوە تا ئێوارە داهات...

پاشان بە پەنهانی و شاراوەی چووینە دەرەوە}..!!

کەواتە (صوهەیب) بە ڕێگای خۆی بەرەو ماڵی (ئەرقەم) ئاشنا بوو...

ڕێگای خۆی بەرەو ڕێنوێنی و ڕووناکی و، قوربانیدانی قورس و خۆبەخشینی مەزن

دۆزییەوە...

تێپەڕ بوون بەو دەروازە دارینەدا کە نێو ماڵی ئەرقەمی لە دەرەوەی جیا دەکردەوە، تەنها تێپەڕبوون بە دەروازەیەکدا نەبوو... بەڵکو مانای تێپەڕبوون لە سنووری هەموو جیهانی دەگەیاند...!

جیهانی کۆن، بە هەموو ئەو شتانەی لە ئاین و خووڕەوشت و، ڕژێم و، ژیان کە لەخۆی گرتبوو.. دەپەڕێتەوە بۆ جیهانێکی نوێ بە هەموو ئەوەی لە خۆی گرتووە لە ئاین و خووڕەوشت و، ڕژێم و، ژیان...

تێپەڕبوون بەدەروازەی ماڵەکەی (ئەرقەم)یشدا، کە پانایییەکەی لەیەك پێ زیاتر نەبوو، لە ڕاستی و واقیعدا واتای بڕینی دەریایەکی بەرین و فراوانی پڕ لە نەهامەتی دەدا..

چوونە ژوورەوە بەو کۆسپەدا، مەبەستم ئەو دەروازەیەیە، جاڕدانی سەردەمێکی پڕ لە لێپرسراوێتی گەورە بوو...!

بەلای هەژاران و، غەریبان و، کۆیلەکانیشەوە، چوونە ژوورەوە بە دەروازەکەی ماڵی ئەرقەمدا مانای قوربانی دانێکی دەبەخشی کە لە سەرووی هەموو وزە و توانایەکی ئاسایی مرۆڤەوە بوو.

(صوهەیب)ی هاوڕێشمان پیاوێکی غەریب بوو... ئەو هاوڕێیەشی کە لە دەروازەی ماڵەکەدا پێی گەیشت، (عەماری کوڕی یاسر) پیاوێکی هەژار بوو... دەبێ چی وایان لێ بکات کە بەدەم نەهامەتیەوە بچن و ئامێزیان بۆ پێشوازیی کردبوەوە...؟؟

ئەوە بانگی ئیمانە کە بەری ناگیرێت..

ئەمە سروشتی (محمد)ە ﷺ، کە بۆن و بەرامەکەی دڵی چاکەکاران پڕ لە ڕێنوێنی و خۆشەویستی دەکات...

ئەمە شەنگیەکی نوێی پرشنگدارە، ئەو عەقڵانە ڕووناك دەکاتەوە کە لەکۆنی بۆگەن کردوو و، گومڕایی و دەست بەتاڵیەکەی بێزار بوون...

بەر لە هەموو ئەوانە، بەزەیی خوایە بۆ هەر کەسێ بیەوێت... ڕێنوێنی خودا هەر کەس ڕووی لێ بکات بەهرەوەری دەکات..

* * *

(صوهەیب) لە کاروانی بڕواداراندا شوێنی خۆی گرت...

لە ڕیزی پەڕاگەندە و سزادراوانیشدا جێگایەکی فراوان و بڵندی گرت..!!

لە ڕیزی کۆششکار و خۆبەختکارانیشدا هەروەها جێگایەکی بەرزی گرت..

ئەوەتا بەڕاستگۆییەوە دەربارەی خۆشەویستی مەزنی خۆی بۆ ئەو بەرپرسیارێتیانەی کە وەك موسڵمانێك پەیمانی بە پێغەمبەر ﷺ داوە و، هاتۆتە ژێر ئاڵای ئیسلام دەدوێ و، دەڵێت:

{پێغەمبەر ﷺ هیچ دیمەنێکی بەدی نەکردووە، منی لەگەڵدا نەبووبێت...
هیچ بەیعەتێکیشی پێ نەدراوە.. من ئامادەی نەبووبم..
لەگەڵ هەر دەستەیەکیش دەرچووبێت.. من ئامادەی بووم...
هیچ غەزایەکی نەکردووە، لە سەرەتا و کۆتاییدا، لای راست یا چەپیەوە نەبووبم...
هەر کاتێك موسڵمانان ترسیان لە پێشەوەی خۆیان بووبێت، ئەوا من لە پێشەوەیان بووم...
یا لە پشتەوەی خۆیان مەترسیان هەبووبێت، ئەوا من لە پشتیانەوە بووم...
نەمهێشتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەوێتە نێوان من و دوژمنەوە، هەتا ئەو رۆژەی گەیشتەوە بە پەروەردگاری}...!!

ئەمە نموونەیەکی سەرسورهێنەری ئیمانێکی بەرز و خۆشەویستی و پشتیوانیەکی مەزنە...

(صوهەیب)یش –خوای گەورە لەو و لە هەموو برایانی رازی بێت–، لەیەکەم رۆژەوە کە پێشوازی لە رووناکی خوا کرد و، دەستی خستە نێو دەستی پێغەمبەرەوە ﷺ، شایانی ئەو ئیمانە بەرزە بوو..

لەو رۆژەوە، پەیوەندییەکانی بە خەڵك و، بە دونیا و، بگرە بەخۆیشیەوە شێوەیەکی نوێی لە خۆ گرت.

ئەو رۆژە، دەروونێکی پتەوی، دونیانەویستی لێبڕاوی بەدەست هێنا و، بەهۆیەوە پێشوازی لە رووداوەکان دەکرد و ملکەچی دەکرد و، نەهامەتیەکانیشی سووك دەکرد..

–هەروەك پێشتر باسمان کرد– بە نەبەردی و چەسورانە رووبەڕووی ئەنجامەکانی دەبووەوە.. لە هیچ دیمەن و مەترسییەك دوا نەدەکەوت... سەرقاڵی و خۆشەویستی خۆی لەبری دەستکەوت بەبژاردنیەوە خەریك دەکرد... لەبری ئارەزووی ژیان، شەیدای مەترسی و خۆشەویستی مردن بوو..

سەرەتای خەباتی پیرۆز و پشتیوانی پایەبڵندی بەرۆژی هیجرەت دەست پێکرد، ئا لەو رۆژەدا دەستی لە هەموو ئەو سامان و زێڕە هەڵگرت کە لەبازرگانیە قازانجمەندەکەی ئەو هەموو ساڵانەی لە مەککە بەسەری بردبوو بەدەستی هێنابوو.. دەست بەرداری هەموو ئەو سەروەت و سامانە بوو کە هەموو دەستمایەکەی بوو، لە ساتێکدا وازی لێ هێنا کە شکۆمەندییەکەی رێگە بە دوودڵی و پەشیمان بوونەوە نەدەدا.

ئەوە بوو کاتێك پێغەمبەر ﷺ ویستی کۆچ بکات، (صوهەیب) بەوەی زانی، لە راستیدا دەبوو ئەو یەکێك بێت لەم سیانە: پێغەمبەر ﷺ و.. ئەبوبەکر و...صوهەیب.

بەڵام قورەیشیەکان پیلانی خۆیان دانابوو بۆ رێگرتن لە کۆچی پێغەمبەرﷺ.

(صوهەیب) کەوتە تەڵەکانیانەوە و، ماوەیەك لە کۆچکردن دوا کەوت، لە کاتێکدا

پێغەمبەرﷺ و هاوڵەکەی لەسەر بەرەکەتی خوا ڕێی خۆیان گرتبووە بەر..

(صوهەیب) گفتوگۆ و بگرەوبەردەی زۆری کرد، تا توانی لە دەستی ناحەزانی دەرباز بێت، چووە سەر حوشترەکەی و، بەغاردان کەوتە بڕینی بیابان..

قورەیشیەکان سێرەگرانی خۆیان بە شوێنیا نارد و پێی گەیشتن، هەر کە (صوهەیب) چاوی پێیان کەوت بەر لەوەی لە نزیکەوە ڕووبەڕوویان بێتەوە، هاواری لێکردن:

{ئەی خەڵکی قورەیش...!! خۆتان دەزانن کە من دەستڕاسترین کەستانم لە تیر هاوێژیدا.. سوێند بەخوا نامێڵم پێم بگەن تا هەرچی تیرم پێیە نەیهاوێژم، پاشانیش بە شمشێرەکەم لێتان دەدەم هەتا هیچ شتێکم لە دەستدا نامێنێ، دەی گەر دەتانەوێ وەرنە پێش...

گەر دەشتانەوێ ئەوا سەروەت و سامانەکەمتان نیشان دەدەم و، وازم لێ بێنن}...

بەزەییان بەخۆیاندا هاتەوە و، ڕازی بوون کە سامانەکەی ببەن و پێیان وت:

-بە هەژاری و نەداری هاتیتە ناومان و، لای ئێمە ماڵت زیادی کرد و، لەنێوماندا گەیشتیتە ئەو پلەیەی پێی گەیشتی، ئێستاش دەتەوێت بە خۆت و ماڵەکەتەوە دەربچیت..؟؟

ئەو جێگایەیان نیشان دەدات کە سەروەت و سامانەکەی تیادا حەشاردابوو، ئەوانیش وازیان لێ هێنا بە ڕێی خۆیدا بچێت و، بەرەو مەککە گەڕانەوە..

سەیر لەوەدایە ئەوان بێ هیچ گومانێك باوەڕیان بە قسەکەی کرد، بەبێ سوودڵی و، داوای هیچ بەڵگەیەکیان لێ نەکرد.. بگرە سوێندیشیان نەدا کە قسەکانی ڕاست بێت..!!

ئەمەش هەڵوێستێکە بۆ (صوهەیب) مەزنی زۆری تێدایە کە وەك پیاوێکی دەستپاك و ڕاستگۆ شایانیەتی...!!

(صوهەیب) تەنها و دڵخۆش لەسەر کۆچ کردنەکەی بەردەوام بوو، تا لە (قەباء) گەیشتەوە پێغەمبەر ﷺ.

پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوو، هەندێك لە هاوەڵانی لە دەوردابوو، (صوهەیب)یان لێ دەرکەوت، هەر کە پێغەمبەر ﷺ بینی بە ڕوویەکی گەشەوە بانگی لێکرد: {باوکی یەحیا لە مامەڵەکەیدا قازانجی کرد..!!

باوکی یەحیا لە مامەڵەکەیدا قازانجی کرد}...!!

ئا لەو ساتەدا، ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتە خوارەوە:

﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَشْرِي نَفْسَهُ ابْتِغَاءَ مَرْضَاةِ اللَّهِ وَاللَّهُ رَءُوفٌ بِالْعِبَادِ: کەسانی وا هەن بۆ ڕەزامەندی خوا گیانیان دەبەخشن، خودا لەگەڵ بەندەکانی خۆی زۆر بە سۆز و بەزەییە.﴾البقرة/٢٠٧.

بەڵێ، (صوهەیب) گیانە بڕوادارەکەی خۆی بە هەموو ئەو سەروەت و سامانەی کڕی کە لاوێتی خۆی لە پێناودا بەسەر بردبوو.. هەموو لاوێتیەکەی و.. هەرگیز هەستی نەدەکرد کە

ئەو خەڵەتاوە.

ماڵ چییە، ئاڵتون چییە، هەموو دونیا چییە، کە ئەو ئیمانەکەی، سەروەریی ویژدانی، ویستی ئایندەی بۆ بمێنێتەوە..؟؟

پێغەمبەر ﷺ زۆری خۆش دەویست.. (صوهەیب)یش لە پاڵ پارێزکاری و تەقوایدا، رۆح سوك و، قسە خۆش بوو..

رۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ چاوی پێی کەوت خورمای دەخوارد و، چاوێکیشی کول ببوو..!

پێغەمبەر ﷺ بە پێکەنینەوە پێی فەرموو: خورما دەخۆیت و چاوێکیشت کول بووە...؟

وەڵامی دایەوە: جا چی تێدایە...؟ بە چاوەکەی دیکەم دەیخۆم..!!

ئەو لە بەخشینیشدا زۆر دەستکراوە بوو... هەموو ئەو پارەی لە (بیت المال) پێی دەدرا لە پێناوی خوادا دەیبەخشی، هاوکاری دەست کورتی دەکرد و... بەهانای لێقەوماوانەوە دەچوو... بە ویستی خۆی نانی دەرخواردی نەدار و هەتیو و نیل دەدا.

تەنانەت دەستکراوەییە زیادەکەی سەرنجی (عومەر)ی راکێشا بوو، ئەوە بوو پێی وت: دەبینم زۆر خواردن دەبەخشیت تا گەیشتۆتە ئەوەی زیادەڕۆیی تێیدا بکەی..؟

(صوهەیب) وەڵامی دایەوە: لە پێغەمبەری خوام بیستوە دەیفەرموو:

{چاکترین کەستان ئەو کەسەیە کە خواردن ببەخشێت}...

گەر ژیانی (صوهەیب) پڕی بێت لە چاکە و مەزنی، ئەوا هەڵبژاردنی لەلایەن (عومەری کوڕی خطاب)ەوە تا پێشنوێژی بۆ موسڵمانان بکات هەموو ژیانی پڕ لە درەوشانەوە و مەزنی دەکات..

ئەوە بوو کاتێك ئەمیری بڕواداران لە نوێژی بەیانیدا بریندار کرا..

کە هەستی بە کۆتایی ئاکامی کرد، راسپاردە و دواین وشەکانی دا بە گوێی هاوەڵانیدا و، وتی:

{با (صوهەیب) نوێژ بە خەڵکی بکات}...

لەو رۆژە (عومەر) شەش لە هاوەڵانی هەڵبژارد و، کاری هەڵبژاردنی خەلیفەی نوێی خستنە ئەستۆ..

خەلیفەی موسڵمانان خۆی پێشنوێژی بۆ دەکردن.. بەڵام لەو رۆژانەدا کە کەوتە نێوان برینداربوونی (عومەر) و، هەڵبژاردنی خەلیفەی نوێ، کێ پێشنوێژی بۆ خەڵك بکات..؟

(عومەر)، بەتایبەتی لەو ساتانەدا کە گیانە بێ گەردەکەی بەرەو لای خوای گەورە دەگەڕایەوە، هەزار جار بیری دەکردەوە بەر لەوەی هەڵبژێرێت.. گەر هەڵیشی بژاردایە، ئەوا کەس بەختەوەرتر نیە لەو کەسەی کە هەڵبژێردراوە..

عومەر (صوهەیب)ی هەڵبژارد..

هەڵیبژارد بۆ ئەوەی ببێتە پێشەوای موسڵمانان لە نوێژدا تا خەلیفەی نوێ دەست بەکار

دەبێ.. هەڵیبژارد و دەیزانی کە زمانی (عەجەمی)١یە، ئەم هەڵبژاردنەش لە تەواوی نیعمەتەکانی خوای گەورە بوو بەسەر (صوهەیبی کوڕی سینان)ی بەندەی چاکیدا..

---

١عەجەمی: بە هەر زمانێك دەوترێت کە عەرەبی نەبێت.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ پەیمانی عەقبەی دووەمی لەگەڵ ئەنصارییەکاندا دەبەست، لە نێو ئەو حەفتا کەسەی شاندەکەی لێ پێکهاتبوو، لاوێکی رووخسار گەشی، سەرنج راکێشی، ددان بریسکەدار دانیشتبوو.. بەهێمنی و سەنگینیەکەی بینەری سەرسام دەکرد، کە قسەشی دەکرد بینەر زیاتر دەحەپەسا..!!

ئەو لاوە (مەعازی کوڕی جەبەل) بوو ؓ..

کەوا بوو ئەو پیاوێکی ئەنصارییە و، لە رۆژی عەقەبەی دووەمدا پەیمانیدا و، بووە موسڵمانێکی پێشین..

پیاوێکیش ئاوەها زوو موسڵمان بووبێت و، وەك ئەو ئیمان و دڵنیایی هەبێت، لە هیچ دیمەن و جەنگێکدا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دوا ناکەوێت، مەعاز هەروای کرد..

لەگەڵ ئەوەشدا گەشدارترین چاکە و، مەزنترین خاسیەتەکانی تێگەیشتن(فقه)ـەکەی بوو.

لە فیقە و زانیندا گەیشتبووە ئەو ئاستەی شایستەی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ بێت کە لەبارەوەیە فەرمووی:

{زاناترین کەسی ئوممەتم لە بارەی حەڵاڵ و حەرامەوە، مەعازی کوڕی جەبەلە}.

مەعاز لە عاقڵمەندی و بەهێزی زیرەکیدا هاوشێوەی (عومەری کوڕی خطاب) بوو، پێغەمبەر ﷺ کە ناردی بۆ یەمەن لێی پرسی:

- ئەی مەعاز بەچی حوکمیان دەکەیت؟

لە وەڵامیدا وتی: بە کتێبی خودا..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئەگەر لە کتێبی خودادا نەتدۆزیەوە...؟؟

مەعاز وتی: بەپێی سوننەتی پێغەمبەرکەی ﷺ بەجێی دەگەیەنم...

فەرمووی: ئەی ئەگەر لە سوننەتی پێغەمبەرەکەیدا ﷺ نەتبینییەوە....؟؟

مەعاز وتی: بەبۆچونی خۆم ئیجتهاد دەکەم و، کەمتەرخەمی ناکەم...

روخساری پێغەمبەر ﷺ گەشایەوە و فەرمووی:

{سوپاس بۆ خوا کە نێردراوی پێغەمبەری خوای سەرکەوتوو کردووە بۆ ئەو کارەی کە پێغەمبەری خوا پێی رازییە}..

جا پشتگیری و خۆشەویستی (مەعاز) بۆ قورئان و، سوننەتی پێغەمبەرەکەی پەردەپۆشی عەقڵی نەدەکرد لە چاودێری کردنی بیروبۆچونەکانیدا، هەروەها ئەو راستیە زۆرە پەنهانانەی لە عەقڵی ناشارێتەوە.. کە چاوەڕوانی یەکێکە بیدۆزێتەوە و ئاراستەی بکات.

لەوانەیە ئەم توانایە لەسەر ئیجتهاد و، ئەو ئازایەتیەی لە بەکارهێنانی زیرەکی و عەقڵدا، وایانکردبوو لە (مەعان) کە لە نێو برا و هاوەڵانیدا لە هەموان زیاتر لە فیقە شارەزابێت، هەروەك پێغەمبەریش ﷺ باسی کرد، بوویە (زاناترین کەس لەبارەی حەڵاڵ و حەرامەوە).

سەربردە مێژووییەکان وای دەخەنە روو –لە هەر جێیەکدا بوایە– عەقڵێکی رووناکی بەخش و بەتینی هەبوو کە دەیزانی بەچاکی کاروبار یەکلابکاتەوە..

ئەوەتانێ (عائذاللەی کوڕی عبدالله) بۆمان دەگێڕێتەوە، کە رۆژێکیان لە سەرەتای سەردەمی خەلیفایەتی عومەردا لەگەڵ هاوەڵانی پێغەمبەردا ﷺ چوویە مزگەوت، دەڵێت:

{لەنێو کۆڕێکدا دانیشتم کەلە سی کەس زیاتر بوون، هەموویان فەرموودەیان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕایەوە، لە نێو دانیشتنەکەدا لاوێکی خوێن گەرمی، بیروڕا جوانی، درەوشاوە هەبوو، کە لە هەموویان گەنجتر بوو، گەر گومانیان لە فەرموودەیەك هەبوایە دەیانگێڕایەوە بۆی و ئەویش فەتوای بۆ دەدان، هەتا پرسیاریشیان لێ نەکردایە قسەی بۆ نەدەکردن، کاتێك کۆڕەکەیان تەواو بوو چوومە نزیکیەوە و لێم پرسی:

ئەی بەندەی خوا تۆ کێیت؟؟

وتی: من (مەعازی کوڕی جەبەل)م}.

ئەوەتا (ئەبو موسلیمی خەولانی)ش دەڵێت:

{چوومە نێو مزگەوتی (حومص)، کۆمەڵێك پیاوی پیرم بەدی کرد گەنجێکی جوانی بەتوانای بێدەنگ لە ناوەڕاستیاندا دانیشتبوو.. گەر خەڵکەکە گومانیان لەشتێك بۆ دروست ببوایە روویان دەکردە ئەو و پرسیاریان لێ دەکرد.. بە کەسێکی تەنیشت خۆمم وت: ئەوە کێیە..؟

وتی: مەعازی کوڕی جەبەلە..

ئیدی خۆشەویستی ئەو کەوتە نێو دڵمەوە}..

(شەهری کوڕی حەوشەب)یش لە بارەیەوە دەڵێت:

{هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ گەر مەعازیان لە نێو دابوایە کاتێك قسەیان دەکرد، سەرنجیان دەدا وەك سامێك بۆی}...

ئەمیری بڕواداران (عومەر) T زۆر جار پرس و رای پێ دەکرد..

لە هەندێ جێگاشدا کە پشتی بە بیروبۆچوون و تێگەیشتنی (مەعان) دەبەست، دەیوت:

{گەر مەعازی کوڕی جەبەل نەبوایە (عومەر) بەهیلاکدا دەچوو}..

وا دیارە مەعاز خاوەنی عەقڵێکی چاك مەشق پێکراو و، پێگەیەکی کاریگەری قەناعەت هێنەر بووە، کە لە هێمنی و شارەزاییە هەمەلایەنەکەیەوە سەرچاوەی دەگرت..

لەمیانی ئەو سەربوردە مێژووییانەشدا کە پێی دەگەین، دەبینین –وەك پێشتر باسمان کرد– لابەری گرێیەکانە..

کەوابوو ئەو هەر دانیشتووە و خەڵکی لەدەورە..

بێدەنگیشە، قسە ناکات هەتا دانیشتوانی کۆڕەکە پەرۆشی قسەی ئەبن..
کاتێکیش دانیشتوان لە کارێکدا جیاڕا بوون، دەیانگێڕایەوە بۆ مەعاز تا یەکلای بکاتەوە..
کە قسەی دەکرد، وەك یەکێك لە هاوسەردەمەکانی باسی دەکات:
{وەك ئەوەی لەزارییەوە رووناکی و گەوهەر بێتە دەر وابوو}...
ئەو لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و پاش وەفاتکردنیشی کە هێشتا هەر گەنج بوو، گەیشتبووە ئەو هەموو پلەوپایە لە زانین و، ئەو رێزگرتنەی موسڵمانان بۆی.. تا لەسەردەمی (عومەر)دا τ (مەعان) وەفاتی کرد کە هێشتا تەمەنی سی و سێ ساڵی تێنەپەڕاندبوو..!!

* * *

(مەعان) لە دەست و، دەروون و، ئاکاردا لێبوردە بوو..
داوای هەر شتێکی لێبکرایە بە خۆشییەوە دەیبەخشی... بەهۆی ئەوماڵبەخشین و سەخاوەتیەوە هەموو سامانەکەی لەدەست دابوو
کاتێك پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد، (مەعان) لە یەمەن بوو لەو ساتەوەی کە پێغەمبەر ناردی بۆ ئەوێ تا موسڵمانان فێر بکات و لە ئاین شارەزایان بکات..
لەسەردەمی جێنشینی (ئەبو بەکر)دا (مەعان) لەیەمەن دەگەڕایەوە، (عومەر) دەیزانی کە مەعاز دەوڵەمەند بووە.. پێشنیاری کرد بۆ ئەبوبەکر کە ماڵ و سامانەکەی لەگەڵ بەش بکات..!! عومەر هیچ چاوەڕوانی نەکرد، بەڵکو بەپەلە هەستایەوە و بەرەو ماڵی مەعاز کەوتە رێ و قسەکانی پێگەیاند..
لەراستیشدا (مەعان) دەستپاك و، باخەڵ پاك بوو، با دەوڵەمەندیش بوبێت، ئەو خراپەیەکی نەکردووە، هیچ شتێکی گومانلێکراوی ئەنجام نەداوە، لە پاڵ ئەوەشدا داواکەی (عومەر)ی رەتکردەوە و، لەو بارەیەوە گفتوگۆی لەگەڵدا کرد.
(عومەر) لەلای هەستا و رۆشت..
بۆ بەیانی، (مەعان) بەپەلە بەرەو لای ماڵی (عومەر) دەڕۆیشت..
کە دەگات پێی خێرا دەست دەکاتە ملی و بەر لەوەی قسە بکات، فرمێسك بەچاوانیدا دێتە خوارێ و دەڵێت:
{ئەمشەو لەو خەودا بینیم لەناو ئاوێکدا پەلەقاژەمە، دەترسام کە نغرۆ ببم، هەتا تۆ هاتی ئەی (عومەر) و دەربازت کردم}..
جا هەردووکیان پێکەوە بەرەو لای ئەبوبەکر چوون و.. (مەعان) داوای لێکرد کە ماڵەکەی لەگەڵ بەش بکات.
(ئەبو بەکر) پێی فەرموو: ((هیچ شتێکت لێ وەرناگرم)).
(عومەر) سەیری (مەعان)ی کرد و وتی: ((ئێستا پاك و حەڵاڵە))..

ئەبوبەکری لەخواترسی پارێزکار تاکە درهەمێکی بۆ مەعاز بەجێ نەدەهێشت، گەر بیزانیایە بەناڕەوا پەیدای کردووە.

(عومەر)یش هیچ تۆمەت یا گومانێکی بەرانبەر (مەعاز) نەبوو..

بەڵکو ئەوە سەردەمی نمونەییەکان بوو، کەسانێکی زۆری وای تێدا بوو کە بەرەو ترۆپکی تەولومەندی خۆشبەخت پێشبڕکێیان بوو، تێیاندا بوو وەك باڵندە دەفڕی، تێیاندا بوو خێرا دەڕۆشت، تێیاندا بوو لەخۆی دەگرتەوە.. بەڵام هەموویان لە نێو کاروانی چاکەدا دەڕۆیشتن و ڕێگایان دەبڕی.

(مەعاز) کۆچ دەکات بۆ شام و، لەنێو خزم و کەسەکانی و ئەو خەڵکەی روویان تێدەکرد وەك مامۆستا و تێگەیشتوویەك دەژیا، کاتێك ئەمیری شام (ئەبو عوبەیدە) کە هاوڕێی لەدڵا شیرینی گیانی بە گیانی مەعاز بوو مرد، ئەمیری بڕواداران (عومەر) ئەوی لەجێگادا کردە والی شام و، تەنها چەند مانگێك بەسەر ئەمیرێتیەکەیدا تێپەڕی تا بە هێمنی و تۆبەکارییەوە بۆ لای پەروەردگاری گەڕایەوە..

(عومەر)τ دەیووت:

{گەر مەعازم بکردایە بەجێنشین و، پەروەردگارم پرسیاری لێ بکردمایە: بۆ کردتە جێنشین؟ ئەوا دەموت: گوێم لە پێغەمبەرەکەت بوو ﷺ دەیفەرموو: زانایان کاتێك دەچنە خزمەتی پەروەردگاری باڵادەستیان، مەعاز لە پێشیانەوەیە} ...

ئەو جێنشینیەی (عومەر) لێرەدا مەبەستیەتی، دانانیەتی لەسەر هەموو موسڵمانان، نەك تەنها لە وڵاتێك یا ویلایەتێك..

(عومەر) بەر لەوەی کە بمرێت پرسیاریان لێکرد: گەر یەکێکت بۆ دابنایانیە..؟ واتە خۆت جێنشینێکت بۆ دابنایانیە و ئێمەش پەیمانمان پێ بدایتایە لەسەری..

لە وەڵامدا وتی:

{گەر مەعازی کوڕی جەبەل زیندوو بوایە و، ئەوم دانابایە، پاشان کە دەگەیشتمەوە خزمەت پەروەردگارم و دەیپرسی لێم: کێت لەسەر ئوممەتی موحەممەد دانا، منیش دەمووت: (مەعازی کوڕی جەبەل)م دانا، پاش ئەوەی گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: مەعازی کوڕی جەبەل پێشەوای زانایانە لەڕۆژی دواییدا} ...

* * *

ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

{ئەی مەعاز... سوێند بەخوا خۆشم دەوێیت، تۆش با لەبیرت نەچێ دوای هەموو نوێژێك بڵێیت:

(اللهم أعني على ذكرك و شكرك و حسن عبادتك: خودایا کۆمەکم بکە لەسەر یادکردن و سوپاسگوزاری و چاك پەرستنت)} ...

بەڵێ.. خوایە کۆمەکم بکە.. پێغەمبەرى خوا ﷺ هەمیشە جەختى لەسەر ئەو مانا مەزنە دەکردەوە کە خەڵکى بەهۆیەوە تێدەگەن کە هیچ توانا و دەسەلات و، پەنا و پشتیوانێکیان نیە جگە لە خوا، بەس خواى بەرز و بێ هاوتایان هەیە..

(مەعاز)یش بە چاکى لەو وانەیە گەیشت و بەجوانى بەجێى هێنا..

بەیانیەکیان پێغەمبەر ﷺ پێى گەیشت و لێى پرسى:

{ئەى مەعاز چۆن رۆژت کردەوە..؟؟

وتى: وەک بڕوادارێکى راست رۆژم کردەوە ئەى پێغەمبەرى خوا..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: هەموو ڕەوایەک حەقیقەتى خۆى هەیە، جا حەقیقەتى ئیمانەکەى تۆ چیە؟

(مەعاز) وتى: هیچ بەیانیەک هەڵنەستاوم هەردەم وام گومان بردووە کە شەوم بەسەردا نایەت.. هیچ شەوێکیشم بەسەردا نەهاتووە دەنا وام گومان بردووە کە ناگەمە بەیانى.. هیچ هەنگاوێکم نەناوە، مەگەر وا گومانم بردووە کە هەنگاوى دیکەى بەشوێندا نانێم... وەک ئەوەى سەیرى هەموو ئوممەتە پێشینەکان بکەم کە بانگدەکرێن بۆ لاى نامەکەیان.. وەک ئەوەى کە بەهەشت نشینان بەدى بکەم لە ناز و نیعمەتى بەهەشتدان و.. ئاگرنشینان ببینم لە نێو ئاگردا سزا دەدرێن...

پێغەمبەر ﷺ پێى فەرموو: چاکى بۆ چوویت، پابەندبە پێوەى} ...

بەڵێ.. مەعاز هەموو شتێکى خۆى و ئایندەى بەخشیبووە خوا و، جگە لەو هیچ شتێکى دیکەى بەدى نەدەکرد..

(ئیبن مەسعود) لە پیاهەڵدانیا چاکى بۆ چووە کاتێ دەڵێت:

{لە راستیدا (مەعاز) ئوممەتێک بوو، ملکەچ بۆ خوا و بێگەرد بوو، ئێمە مەعازمان بە (ئیبراهیم)(١) دەچوواند} ...

* * *

(مەعاز) هەمیشە خەڵکى بۆ لاى زانست و، یادى خوا بانگ دەکرد..

بانگەشەى خەڵکى دەکرد بۆ دەستگرتن بە زانستى راستى سوودمەندەوە و دەیوت:

(بەئاگا بن لە خواربوونەوەى دانایان.. ڕەوا بەهۆى ڕەواوە بناسن، بزانن کە ڕەوا رۆشنایى هەیە)...!!

ئەو پەرستنى وەک مەبەست و، دادگەرى سەیر دەکرد..

رۆژێکیان موسڵمانێک پێى وت: فێرم بکە.

(مەعاز) لێى پرسى: ئایا گەر فێرت بکەم گوێڕایەڵم دەبیت..؟؟

پیاوەکە وتى: من زۆریش لەسەر گوێڕایەڵیت سوورم..

مەعاز پێى وت: (رۆژ نا رۆژ بەڕۆژوو بە..

شەونوێژ بکە و، بشخەوە.. ڕۆژی پەیدا بکە و، خراپە مەکە.. هەر بە موسڵمانی بمرە و.. بە ئاگا بە و خۆ دوور بگرە لە پاڕانەوەی ستەم لێکراو)..

زانستی وەك ناسین و، کردار، سەیر دەکرد و.. دەیووت:

(هەرچی دەتانەوێت فێری بن، بزانن کە زانست لای خوای گەورە هیچ سودێکتان پێی ناگەیەنێت هەتا کاری پێ نەکەن)..

باوەڕهێنان بە خوا و یادکردنی وەك ئامادەکردنی هەمیشەیی مەزنی خوا و، پێداچوونەوەی هەمیشەیی ئاکاری دەروون سەیر دەکرد.

(ئەسوەدی کوڕی هیلال) دەڵێت: {لەگەڵ مەعازدا بەڕێگادا دەڕۆیشتین، پێی وتین: دانیشن با سەعاتێك ئیمان تازە بکەینەوە}..

لەوانەیە هۆی زۆر بێدەنگ بوونەکەی ئەو کرداری رامان و بیرکردنەوەیە بوو بێت کە لە ناخیدا نەدەسرەوت و رانەدەوەستا.. ئەمە بوو کە هەروەك بە پێغەمبەریﷺ وت: هیچ هەنگاوێك نانێت، وا گومان ببات هەنگاوێکی دیکەی بەدوادا دەنێت.. ئەمەش بەهۆی زیادە ڕۆچوونیەوە لەیادی پەروەردگاری و، ڕۆچوونی لە لێپێچینەوەی دەروونیدا..

* * *

ئاکامی (مەعاز) هات و، بانگکرا بۆ دیداری خوا..

لە کاتی ژانەکانی گیانکێشاندا لە نەستەوە راستی هەموو زیندوویەك دەردەکەوێت و، ئەو وشانە بەسەر زمانیدا دێت- گەر توانای قسەکردنی هەبێت- کە کاروبار و ژیانی تێدا کورت بۆتەوە..

ئا لەو چرکە ساتانەدا، مەعاز چەند وشەیەکی مەزنی درکاند کە بڕوادارێکی مەزن ئاشکرا دەکات.

ئەوە بوو سەرنجی ئاسمانی دەدا و لە پەروەردگاری خاوەن میهری دەپاڕایەوە و دەیوت:

(پەروەردگارا.. من پێشتر لە تۆ دەترسام، بەڵام ئەمڕۆ تکات لێدەکەم، پەروەردگارا.. تۆ دەزانیت کە من دونیام بەهۆی ڕۆشتنی رووبارەکان، یا رواندنی دارەکانەوە خۆش نەویستووە.. بەڵکو بەهۆی تینویەتی کاتی گەرمای زۆر توند و ناخۆشیەکانی هەندێ کات و، بەدەستهێنانی زانست و ئیمان و گوێڕایەڵی زیاترەوە خۆشم ویستووە)..

دەستی راستی درێژ کرد وەك ئەوەی تەوقە لەگەڵ مردندا بکات و، لەبێ هۆشیەکەیدا دەیووت:

(بەخێر بێت مردن.. خۆشەویستێکە لە کاتی نەداریدا هاتووە)...

* * *

ئەمجا (مەعاز) گەڕایەوە بۆ لای خوا...

۹

# میقدادی کوڕی عەمر

## یەکەمین سوارچاک لە ئیسلامدا

هاوەڵ و دۆستانی لە بارەیەوە دەدوێن و، دەڵێن:

(یەکەم کەس کە ئەسپی تاودا لە پێناوی خودا، میقدادی کوڕی ئەسوەد بوو)...

(میقدادی کوڕی ئەسوەد) پاڵەوانی ئەمجارەمانە و بە (میقدادی کوڕی عەمر) ناو دەبرێت، لەسەردەمی نەفامیدا پەیمانی لەگەڵ (ئەسوەدی کوڕی عبد یغوث)دا بەست و ئەویش کردی بە کوڕی خۆی، بەو جۆرە بە ناوی (میقدادی کوڕی ئەسوەد)ەوە بانگ دەکرا، تا ئەو ئایەتە پیرۆزەی قورئان هاتە خوارەوە و منداڵی خەڵك بەهی خۆ کردنی هەڵوەشاندەوە، پاش ئەوە رەچەڵەکی ئەمیش درایەوە پاڵ (عەمری کوڕی سەعد)ی باوکی راستەقینەی..

میقداد لەو کەسانە بوو کە زۆر زوو موسڵمان بوون و، هەوتەمین کەسیشە کە موسڵمان بوونی خۆی راگەیاند و ئاشکرای کرد، بەوپەڕی ئازایەتی مەردانە و خۆزگەی دۆستانەوە، پشکی خۆی لە سزا و ئەشکەنجەی قورەیشیەکان چەشت..

هەڵوێستی رۆژی (بەدر)یشی بۆ هەمیشە وەك تابلۆیەکی قەشەنگ دەمێنێتەوە و هیچ بەهاو نرخی کەم ناکات...

هەڵوێستێکی بڵند، هەموو ئەوانەی بینیان ئاواتەخواز بوون کە هەر کەسە و خۆی خاوەنی ئەو هەڵوێستە مەزنە بوایە..

(عبداللە‌ی کوڕی مەسعود)ی هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ ، دەڵێت:

(دیمەنێکم لە میقداد بینی، من خاوەنی بوومایە، لام خۆشەویستر بوو لە هەموو ئەو شتانەی کە لەسەر زەویدا هەیە)..

ئا لەو رۆژەدا کە بە ناخۆشی و دەستی پێکرد.. قورەیشیەکان بە هێزێکی بەتین و سووربوونێکی زۆر و، لوتبەرزی و خۆهەڵکێشانەوە هاتبوون..

ئا لەو رۆژەدا، کە موسڵمانان کەم بوون، پێشتریش لە شەڕکردن لە پێناوی ئیسلامدا تاقی نەکرابوونەوە و، ئەوە یەکەمین جەنگ بوو کە بیکەن..

پێغەمبەر ﷺ راوەستا و ئیمان و ئامادەباشی ئەو کەسانەی لەگەڵیدا بوون تاقی دەکردەوە لە رووبەڕوو بوونەوەی ئەو سوپا زۆرە پڕ پیادە و سوارەی بەرەو روویان دێت.

هات و داوای راوێژی لەو بارەیەوە کرد، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەیانزانی کاتێك داوای پرس و راوێژ بکات، ئەوا بە راستی کارەکە ئەنجام دەدات و، راستی تێڕوانین و بۆچوونی تەواوی هەریەك لە هاوڕێکانی دەوێت، خۆ گەر یەکێکیان بۆچوونێکی هەبوایە جیاواز یان بە پێچەوانەی بیروڕای هەموویان، ئەوا هیچ شەرم و ئەنگی تێدا نیە..

(میقداد) ترسی ئەوەی هەبوو کە لەبارەی ئەو جەنگەوە لەنێو موسڵمانەکاندا هەڵوێستی خۆپارێزی هەبێت.. بەر لەوەی کەسی دیکە بدوێت ئەو پێش کەوت تا بە وشە تیژەکانی دروشمی شەڕەکە بخاتە روو و، بەشداری لە پێکهاتەی ویژدانییدا بکات..

بەڵام بەر لەوەی لێوی بجوڵێنێ، (ئەبو بەکری صدیق) دەەستی بە قسە کرد، (میقداد) زۆر دڵئارام بوو.. (ئەبو بەکر) قسەی جوانی کرد.. پاش ئەویش (عومەری کوڕی خطاب) دوا و قسەی چاکی کرد..

پاشان (میقداد) هاتە پێشەوە و وتی:

(ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ..!! بەرەو ئەوەی خوا خستویەتیە بەردەستت بەڕێ بکەوە، ئێمە هەموومان لەگەڵتداین.. سوێند بەخوا هەرگیز وەك ئەوەی بەنی ئیسرائیل بە (موسا)یان گوت پێت ناڵێین: برۆ تۆ و پەروەردگارت بجەنگن، ئێمە لێرەدا دادەنیشین... بەڵکو پێت دەڵێین: برۆ تۆ و پەروەردگارت بجەنگن و، ئێمەش لەگەڵتاندا دەجەنگین...!!

سوێند بەو زاتەی تۆی بەهەق رەوانە کردووە، گەر بەرەو چەقی دەریامان ببەیت بەبێ ئاوڕدانەوە لەگەڵتدا دێین تا دەگەیتە شوێنی خۆت و، لەلای راست و چەپ و لە دواوە و پێشەوەت دەجەنگین، تا خوای گەورە سەرکەوتووت دەکات)...

وشەکانی وەك دەستڕێژی گوللە دەرپەڕین و.. دەموچاو و روخساری پێغەمبەر ﷺ گەشایەوە و لێوەکانی بە پاڕانەوەی خێر کە بۆ میقدادی کرد بریسکانەوە... ئەو وشانەی کە (میقداد) درکاندی جۆش و خرۆشی خستە نێو کۆمەڵی بڕوادارانەوە، کە بەو پەڕی هێز و بڕوای خۆیەوە جۆری قسە کردنی بۆ هەرکەسێ بیەوێت بدوێت و... بە شێوازێك بۆ هەر کەسی کە بیەوێت قسە بکات دیاری کرد...!!

بەڵێ.. وتەکانی (میقداد) مەبەستی خۆی لە دڵی بڕواداراندا پێکا و، (سەعدی کوڕی مەعاز)ی سەرکردەی ئەنصاریەکان هەستایەوە و وتی:

((ئیمانمان پێ هێنایت و بەراستمان زانیت و، شایەتیمان دا کە ئەوەی تۆ هێناوتە حەقە، لەسەر ئەوە وادە و بەڵێن و پەیمانمان پێدایت، دە ئەی پێغەمبەری خوا بەرێ بکەوە بەرەو ئەوەی کە دەتەوێت، دڵنیابە ئێمە لەگەڵتداین... سوێند بەو زاتەی تۆی بەحەق رەوانە کردووە گەر بچیتە نێو دەریایەوە لەگەڵت دێین، تەنها کەسێکمان دوا ناکەوێت، هیچ پێمان ناخۆش نیە کە سبەینێ رووبەڕووی دوژمنێکمان بکەیتەوە..

ئێمە لە جەنگدا ئارامگرین و، لە روو بە رووبوونەوەدا راستگۆین. بەڵکو خوا ئەوەی چاوتی پێ رۆشن دەبێت لە ئێمەدا بەدی بێنێت.. دەی لەسەر بەرەکەتی خوا بمان بە..))

دڵی پێغەمبەر ﷺ پڕبوو لە شادی... و بە هاوەڵەکانی فەرموو:

(دەی بەڕێ بکەون و، مژدەتان لێ بێت)...

هەردوو کۆمەڵ بەیەك گەیشتن...

موسڵمانان لەو ڕۆژەدا تەنها سێ ئەسپ سواریان هەبوو بەس، ئەوانیش: (میقدادی کوڕی عەمر) و (مەرسەدی کوڕی ئەبی مەرسەد) و، (زوبێری کوڕی عەوام) بوون، تێکڕای موجاهیدانی دیکە بە پیادە، یان بەسواری وشترەوە بوون..

* * *

ئەو وشانەی (میقداد) کە پێشتر باسمان کرد، تەنها ئازایەتیەکەی ناخاتە ڕوو و بەس، بەڵکو دانایی دروست و، بیرکردنەوەی قوڵیمان نیشان دەدات..

(میقداد) ئا بەو جۆرە بوو..

دانا و، زرنگ بوو، داناییەکەشی تەنها بەوشەی ڕووت گوزارشتی لە خۆی نەدەکرد، بەڵکو بەبنەمای بێ وێنە و، ئاکاری پڕ بەهاو ڕاست گوزارشتی لە خۆی دەکرد و، ئەزموونەکانیشی مایەی بەهێز بوونی دانایی و نیشانەی ژیرییەکەی بوو..

جارێکیان پێغەمبەر ﷺ ئەمیرایەتی جێگایەکی پێ سپارد، کە گەڕایەوە پێغەمبەر ﷺ لێی پرسی: (ئەمیرایەتیت بەلاوە چۆن بوو)...؟؟

بەڕاستگۆییەکی مەزنەوە وەڵامی دایەوە:

(وات لێ کردم وەها سەیری خۆم بکەم کە لەسەرو خەڵکەوەم و، ئەوان هەموو لەخوار منەوەن.. سوێند بەو زاتەی تۆی بە حەق ڕەوانە کردووە لە ئەمڕۆ بەدوا تا هەتایە ئەمیرایەتی سەر دوو کەسیش ناکەم)...

جا گەر ئەمە دانایی نەبێت.. ئەی دەبێت چی بێت..؟؟

گەر ئەویش دانا نەبێت.. دەبێت کێی دیکە بێت..؟؟

پیاوێکە بەهۆی دەروونی، یا لاوازییەوە هەڵناخەڵەتێ..

فەرمانداری پێدەدرێت، لە لەخۆباییبوون و سەرکەشی دەروونی دەترسێت و، ئەو لاوازییەی دەروونی بۆ دەردەکەوێت و، سوێند دەخوا کە خۆی لێ دوور بگرێت و، پاشی ئەو ئەزموونە ڕەتی فەرمانداریێتی دەکاتەوە و خۆی لێ دەپارێزێت و... پاشان سوێندەکەی دەباتە سەر و لەدوای ئەوە هەرگیز نابێتە ئەمیر..!!

ئەو هەمیشە ئەو فەرموودەیەی لەسەر زار بوو کە لە پێغەمبەریﷺ بیستبوو، کە ئەویش: ((بەختەوەر ئەو کەسەیە کە لە ئاشووب دوور بکەوێتەوە))...

ئەویش کاتێ لە فەرمانداریدا لوت بەرزییەکی بەدی کرد تووشی ئاشووبی دەکرد، یان لەوەدا بوو تووشی بکات، ئەوا بەختەوەری ئەو لە خۆ دوور گرتندایە لێی..

زۆر لەسەر خۆیی و هێدی بوونی لە هەڵسەنگاندنی پیاواندا.. یەکێکی دیکە بوو لە نیشانەکانی داناییەکەی.

ئەمەش لە پێغەمبەرى خواوە ﷺ فێر ببوو.. پێغەمبەر ﷺ فێرى كردبوون كە دڵى ئادەمیزاد لە وەرگەڕاندا خێرا ترە لە هەڵگەڕانەوەى مەنجەڵ لەكاتى كوڵاندا..

(میقداد) مەزندە و هەڵسەنگاندنى خۆى لەبارەى خەڵكەوە دوا دەخست تا كاتى مردنى ئەو كەسە دەهات، بۆ ئەوەى دڵنیا بێت كە ئەو كەسەى ئەم دەیەوێت هەڵسەنگاندنى خۆى لەبارەوە بخاتە روو ناگۆڕێت و گۆڕانى تازە بەسەر ژیانیدا نایەت.. یان هیچ شتێكى نوێ لە پاش مردنى روونادات..؟؟

دانایییەكەشى لەم گفتوگۆیەدا كە یەكێك لە هاوەڵ و كۆڕنشینانى بۆمانى باس دەكات، لە زۆرى شارەزاییەكەیدا دەدرەوشێتەوە، ئەو هاوەڵەى دەڵێت:

{رۆژێكیان لاى (میقداد) دانیشتبووین، پیاوێك بەلایدا تێپەڕى.. روویكردە (میقداد) وتى: خۆش بەختى بۆ ئەو دوو چاوەى كە پێغەمبەریان ﷺ بینیوە.. سوێند بەخوا حەزمان دەكرد ئەوەى تۆ بینیت ئێمەش بمانبینیایە و، ئەوەى تۆ تێیدا ئامادە بوویت ئێمەش تێیدا ئامادە بووینایە..

(میقداد) رووى تێكرد و پێى وت:

((چى واتان لێدەكات كە خۆزگە بە دیمەنێك بخوازن كە خوا لێتانى پەنهان كردووە، كە نازانن گەر تێیدا ئامادە بوونایە چۆن دەبوون؟؟ كۆمەڵانێك هاوسەردەمى پێغەمبەرى خوا ﷺ بوون خواى گەورە بەسەر دەم و چاویان كردنیە دۆزەخەوە.. ئەوە بۆ سوپاسى خوا ناكەن ئێوەى لەو تاقیكردنەوەیەى ئەوان پاراست و، كردنیە بڕوادار بە پەروەردگار و پێغەمبەرتان))...

دانایییە.. بەڵام چۆن داناییەك...!!

ناگەیت بە هیچ بڕوادارێك كە خوا و پێغەمبەرى ﷺ خۆش بوێت، دەبیینى ئاواتەخوازى ئەوەیە كە لە رۆژگارى پێغەمبەرﷺدا بژیایە و بیبینیایە...!

بەڵام بەرچاو رۆشنى (میقداد)ى داناى زیرەك رەهەندى شاراوەى ئەو خۆزگەیە ئاشكرا دەكات..

ئایا رێى تێ ناچێت ئەو كەسەى ئاواتەخوازە لەو رۆژگارەدا بژیایە.. لە پێڕى دۆزەخیان بوایە..؟

ئایا لەوانە نەبوو كە لەگەڵ بێباوەڕاندا ئەمیش بێباوەڕ بوایە...؟؟

كەوابوو چاك وایە ئەو كەسە سوپاسگوزارى خوا بێت كە لەسەردەمێكدا ژیانوىەتى ئیسلام لەسەقامگیریدایە و، ئەویش بەبێ گرێ و بەسەلامەتى وەریگرتووە..؟؟

ئەم دید و بۆچوونەى (میقداد) ، كە لە دانایى و زرنگیدا دەدرەوشێتەوە.. لە هەموو هەڵوێستە و، ئەزموونێك و، وشەیەكیدا، زیرێكى دانا بوو.

* * *

میقداد خۆشەویستیەکی مەزنی بۆ ئیسلام هەبوو..

لەپاڵ ئەوەشدا، تێگەیشتو و دانا بوو...

خۆشەویستیش ئەوکات مەزنی و داناییە کە خاوەنەکەی بکاتە مرۆڤێکی پایەبەرز، چێژی ئەو خۆشەویستیە لە خودی خۆیدا هەست پێ نەکات.. بەڵکو لە بەرپرسیارێتیەکانیدا بیدۆزێتەوە..

(میقدادی کوڕی عەمر)یش لەو پێڕە بوو..

خۆشەویستیەکەی بۆ پێغەمبەر ﷺ، دڵی پڕ کردبوو لە بەرپرسیارێتی بەرانبەر سەلامەت بوونی پێغەمبەر ﷺ .

لە شاری مەدینەدا هەر دەنگێکی ناساز ببیسترایە، (میقداد) لە چاوتروکانێکدا خۆی دەگەیاندە دەرگای پێغەمبەری خوا ﷺ و بەسواری ئەسپەکەیەوە رادەوەستا و، زۆر بەتوندی شمشێری بەدەستەوە دەگرت و لە خزمەتیدا بوو..!!

خۆشەویستیەکەشی بۆ ئیسلام، دڵی پڕکردبوو لە بەرپرسیارێتی ئەو بەرانبەر پارێزگاریکردنی ئیسلام.. نەك هەر لە فێڵ و تەڵەکەی دوژمنانی،.. بەڵکو لەهەڵەی دۆستەکانیشی..

رۆژێکیان لەگەڵ سریەیەکدا چووە دەر و، دوژمن توانی گەمارۆیان بدات، ئەمیری سریەکە فەرمانی دا کە هیچ کەس وڵاخەکەی نەلەوەڕێنێت.. بەڵام یەکێك لە موسڵمانەکان ئاگاداری فەرمانەکەی نەبوو و، سەرپێچی کرد، ئەمیرەکەیان سزایەکی وای دا زیاد لەوەی کە شایستەی بێت، یان هەر شایەنی نەبووە..

(میقداد) بەلای ئەو پیاوەدا تێپەڕی، دەگریا و هاواری دەکرد، کاتێ لەو بارەیەوە لێی پرسی و، ئەویش بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە..

(میقداد) دەستی گرت و، پێکەوە بەرەو لای ئەو ئەمیرە رۆشتن و، (میقداد) ئەوەندەی گفتوگۆ لەگەڵدا کرد تا هەڵەکەی بۆ دەرخست و پێی وت:

(دەی ئێستا، خۆت بخە بەردەستی و... رێگەی بدە تۆڵەت لێ بکاتەوە)..!!

ئەمیرەکە بەگوێی کرد.. بەڵام سەربازەکە لێی خۆشبوو و هیچی لەدڵدا نەما، (میقداد)یش بە مەزنی هەڵوێستەکە و، مەزنی ئەو ئاینەی کە ئەم سەروەرییەی پێداوە، زۆر شادومان بوو، وەك ئەوەی کە گۆرانی بڵێت لەبەر خۆیەوە دەیوت:

(من دەمرم و... ئیسلام دەسەڵاتدارە)...!!

بەڵێ.. ئەوە خۆزگەی ئەو بوو.. کە کاتێك بمرێت ئیسلام دەسەڵاتدار بێت... و بەڕاستیش بۆ بەدیهێنانی ئەو ئاواتە لەگەڵ تێکۆشەراندا هەوڵ و کۆششێکی بێ وێنەی وەهای دا کە شایستەی ئەوە بێت پێغەمبەر ﷺ پێی بفەرموێت:

((خوای گەورە فەرمانی پێکردم خۆشم بووێیت و.. هەواڵی پێداوم کە تۆی خۆش دەوێت))...

# ۱۰

## سه عیدي کوړي عامر

## منځي لهٔ ډېر ټوټ کړ کوندا

کێ لە ئێمە ئاشنای ئەم ناوەیە و، پێشتر بیستوویەتی..؟؟

-وا گومان دەبەم- گەر هەر هەمووشمان نەبێت، ئەوا زۆربەمان، هەرگیز نەمانبیستووە.. وەك ئەوەی لەگەڵتاندا بم ئێستا کە دەیخوێننەوە، پرسیار دەکەن: دەبێت ئەم (سەعیدی کوڕی عامر)ە کێ بێت..؟؟

بەڵێ.. ئێستا دەزانین ئەم (سەعید)ە کێیە..!!

* * *

یەکێکە لە گەورە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، با ناوەکەشی وەك ناوی گەورە هاوەڵانی دیکە بڵاو و ئاشنا نەبێت.

یەکێکە لە گەورە خۆپارێزە پەنهانەکان..!!

پێدەچێت ئاسایی و دووبارەکردنەوە بێت، کە بڵێین لە هەموو دیمەن و غەزلیەکدا لەگەڵ پێغەمبەرﷺدا بووە.. چونکە ئەوە ڕێڕەوی هەموو موسڵمانەکان بوو، بۆ هیچ بڕوادارێك نەبوو کە لە ئاشتی یان جیهاندا لە پێغەمبەری خوا دوا بکەوێت.

(سەعید) بەر لە رزگارکردنی (خەیبەر) موسڵمان بوو، لەو ساتەوەش کە ئیسلامی لە ئامێز گرت و وادە و بەڵێنی دا بە پێغەمبەرﷺ، هەموو ژیان و، بوون و، ئایندەی خۆیشی پێ بەخشین.

گوێڕایەڵی و، دونیانەویستی و، بەرزی... خۆ خەفەکردن و، وەرع و، خۆ بەرز گرتن، هەموو خەسڵەتە چاکەکان لەم مرۆڤە پاك و بێگەرد و برا و هاوڕێ گەورەیەدا هەبوو..

کاتێکیش هەوڵدەدەین بە مەزنیەکەی بگەین و ببینین، پێویستە کە زرنگ بین تا بێئاگا نەبین لەو مەزنیە و لێگەڕێن لە دەستمان دەربچێت و خۆی ون بکات..

کاتێك لە نێو قەرەباڵغیدا چاومان بە (سەعید) دەکەوێت، هیچ شتێکی تێدا بەدی ناکەین جێگای رامان و سەرنجدان بێت..

چاو یەکێك لە ئەندامانی دەستەی هەژاران دەبینێت.. قژ ئاڵۆزکاو و تەپ و تۆزاوی... لە پۆشاك و، شێوەی دەرەوەیدا، هیچ شتێکی تێدا نیە لە موسڵمانە هەژارەکانی جودا بکاتەوە..!!!

خۆ گەر پۆشاك و شێوەی دەرەوەیمان کردە بەڵگە و نیشانە بۆ ئاشنا بوونی حەقیقەتی ئەو، ئەوا هیچ بەدی ناکەین، چونکە مەزنی ئەم پیاوە زۆر لەوە ڕەسەنترە کە بە ڕووکەشێکی دەوڵەمەندانە و ئاڵ و واڵا خۆی بنوێنێت.

ئەوەتانێ ئا لەوێدا لە پشتی سادەیی و پۆشاکە کۆنەکانیەوە خۆی حەشارداوە..

ئایا مرواری شاراوەی نێو گوێچکەی ماسیتان بینیوە..؟ ئەمیش شتێکی لەو بابەتەیە..

* * *

کاتێك ئەمیری بڕواداران (عومەری کوڕی خطاب) معاویەی لە والیێتی شام لادا، بە دەوروبەری خۆیدا چاوی گێڕا، بۆ کەسێك دەگەڕا لە جێگای ئەو دایبنێت.

شێوازی (عومەر)یش لە هەڵبژاردنی والی و یاریدەدەرەکانیدا ئەوپەڕی بەئاگا بوون و، وردی و، لەسەر خۆیی تێدا بوو.. چونکە لەو بڕوایەدا بوو کە هەر والییەکی لە دوورترین جێگای سەر زەوی هەڵەیەك بکات، خوای گەورە لەسەر ئەوە پرسیار لە دوو کەس دەکات: یەکەمیان عومەر.. دووەمیان خاوەنی هەڵەکە..

پێودانگیشی لە هەڵسەنگاندنی خەڵك و هەڵبژاردنی والیدا زۆر بە وردبینی و توندی و، گشتگیری و، بەر چاو ڕوونیەوە بوو، تا ئەوپەڕی وردبینی..

شامیش، لەو ڕۆژگارەدا جێگایەکی گەورە بوو، ژیانیش تێیدا بەر لە گەیشتنی ئیسلام بۆ ناویان بە چەندین سەدە، لەنێو شارستانێتیە ڕکابەرەکاندا گۆڕانی بەسەردا دەهات و، ناوەندێکی بازرگانی گرنگ و، چاوگەیەکی فراوانی نیعمەت بوو، بۆیە بەوانەوە و، لەبەر ئەوانە.. خانەی هەڵخەڵەتاندن بوو، هەر بۆیە بە بۆچوونی (عومەر) کەسێکی دونیا نەویستی، خواپەرستی، ڕازی بووی، تەوبەکاری، پشت لە دونیا کردووی وەهای دەویست کە هەموو شەیتانەکانی گومڕا کردن لەبەردەم نەویستنی ئەودا هەڵبێن..

(عومەر) بانگی کرد: دۆزیمەوە.. (سەعیدی کوڕی عامر)م بۆ بانگ بکەن..!!

دواتر، (سەعید) دێتە لای ئەمیری بڕواداران و ئەویش داوای لێ دەکات ببێتە والی (حومص)..

بەڵام (سەعید) داوای لێبووردنی کرد و.. وتی:(تووشی ئاشوویم مەکە، ئەی ئەمیری بڕواداران)..

(عومەر) بەدەنگی بەرز وتی:

(سوێند بەخوا وازت لێ ناهێنم.. ئێوە سپاردەکان و جێنشینیتان خستۆتە گەردنی من و.. پاشان بەجێم دێڵن)...؟؟!!

لە ماوەیەکی کەمدا (سەعید)ی ڕازی کرد، چونکە بەڕاستی وشەکانی عومەر شایانی ئەوە بوون کە بڕوای پێ بێنێت.

بەڵێ هیچ دادگەری تێدا نیە کە سپاردە و جێ نشینیان بدەن بەسەر ئەودا و، پاشان بەتەنها جێی بهێڵن.. جا گەر کەسانی وەك ((سەعیدی کوڕی عامر)) لەبەر پرسیارێتی هەڵبێن، ئیدی عومەر کێ لەسەر فەرمانڕەواییە گرانەکانی دابنێت..؟؟

(سەعید) لەگەڵ ژنەکەیدا، کە تازە بووك و زاوا بوون، بەرەو (حومص) کەوتنە ڕێ، هاوسەرەکەشی هەر لە منداڵیەوە زۆر جوان و نازدار بوو.. (عومەر)یش بڕی پێویست لە سامانی پێدان.

کاتێك لە (حومص) جێگیر بوو.. ژنەکەی ویستی مافی خۆی وەك هاوسەرێك لەو سامانە بخاتە کار کە عومەر پێی بەخشین و، داوای لێکردن کە جل و بەرگێکی شایان و، پێویستی و کەلوپەل پێ بکڕن و.. ئەوی دیکەی هەڵبگرن..

(سەعید) پێی وت: دەتەوێ لەوە چاکترت نیشان بدەم..؟؟ ئێمە لە وڵاتێکداین بازرگانیەکەی قازانجمەندە، بازاڕەکەیشی گەرم و گوڕە، دەبا ئەم پارەیە بدەین بە کەسێك بازرگانی پێوە بکات بۆمان و بیبوژێنێتەوە..

ژنەکەی وتی: ئەی گەر لە بازرگانیەکەیدا زەرەری کرد..؟؟

(سەعید) وتی: پاراستنەکەی لەسەر ئەو دادەنێم..!!

ژنەکەی وتی: کەوابێت.. زۆر چاکە..

(سەعید) چووە دەرەوە، هەندێك پێداویستی ژیانێکی کولەمەرگی پێ کڕی، پاشان هەموو سامانەکەی بەسەر هەژار و نەداراندا بەخشیەوە..

ڕۆژان تێپەڕی و.. لە نێوان هەر ماوە و کات و ماوەیەکی کەدا ژنەکەی لەبارەی بازرگانێتیەکەیانەوە پرسیاری لێدەکرد، کە قازانجیان بەکوێ گەیشتووە..

(سەعید)یش وەڵامی دەدایەوە: بازرگانێتیەکی سەرکەوتووە و.. قازانج لە گەشە و زیادبووندایە.

ڕۆژێکیان لەبەردەم کەسێکی نزیکیدا کە بە ڕاستی کارەکە ئاشنا بوو هەمان پرسیاری لێکرد، زەردەخەنە گرتی، پاشان پێکەنی بە جۆرێك کە ژنەکەی گومان و دوودڵی بۆ دروست بوو، زۆر داوای لێکرد کە بەراستی و ڕونی بۆی بدوێت، پێی وت: مێردەکەت هەر لەو ڕۆژەدا هەموو سامانەکەی بەخشیووە.

ژنەکەی (سەعید) گریا و، غەمبار بوو کە لەو پارە سوودمەند نەبوە، نە ئەوەی خۆی دەیویست لێی کڕی، نەپارەکەش ما..

(سەعید) سەرنجی دا، فرمێسکە ڕژاوەکانی زیاتر جوان و قەشەنگیان کردبوو.

بەر لەوەی ئەو دیمەنە سەرنج ڕاکێشە دەروونی لاواز بکات، بە چاوی عەقڵ سەرنجی بەهەشتی دا، هاوەڵە دێرین و کۆچکردوەکانی خۆی تێدا بەدی کرد، وتی:

((هاوەڵانێکم هەبوو بەر لەمن بەرەو لای خوا ڕۆیشتن.. منیش پێم خۆش نیە گەر هەموو ئەوەی لە دونیادا هەیە بۆم بێت لەڕێگەی ئەوان لا بدەم))..!!!

گەر بشترسایە کە بەجوانیەکەی هەڵیبگێڕێتەوە، وەك ئەوەی لەگەڵ دەروونی خۆیدا بدوێت، وتی:

((دەزانیت کە لەبەهەشتدا پەری چاو ڕەش و چاك و باشی وا هەیە، کە گەر یەك دانەیان بهێنرێتە سەر زەوی هەر هەمووی ڕووناك دەکاتەوە و، ڕۆشنایەکەی ڕووناکی خۆر و مانگی پێکەوە نەدەهێشت... دەی ئێستا قوربانی بە تۆ بدەم لە پێناوی ئەواندا، چاکترە لەوەی ئەوان بکەمە قوربانی لە پێناوی تۆدا))...!!!

قسەکانی، هەروەك چۆن بە هێمنی و، رووگەشی و، رەزامەندی، دەست پێکردبوو بە هەمان شێوەش کۆتایی پێ هێنا..

ژنەکەیشی دڵئارام بوو، تێگەیشت هیچ شتێك نیە چاکتر بۆ ئەو لە رۆیشتن لەسەر ڕێگەی سەعید و، هاندانی دەروونی خۆی بۆ لاسایی کردنەوەی ئەو لە دونیا نەویستی و تەقوادا..!!

* * *

(حومص) لەو ڕۆژگارەدا، بە (کوفەی دووەم) ناو دەبرا، ئەم ناو لێنانەشی بەهۆی زۆر هەڵگەڕانەوەی خەڵکەکەی و راجیاییان بەرانبەر بە والیەکانیان بوو..

گەرچی (کوفە) کە لە عێراقە لە یاخی بووندا لە پێشتر بوو، (حومص)یش ناوی ئەوی بەهۆی هاوشێوەییەوە وەرگرت..

سەرەڕای سەرقاڵ بوونی (حومص)یەکان بە یاخیبوونەوە، هەروەك باسمان کرد، ئەوا خوای گەورە دڵەکانیانی بەرانبەر ئەو بەندە چاکە کە (سەعید) بوو رێنوێنی کردبوو، خۆشیان دەویست و گوێڕایەڵی بوون.

(عومەر) رۆژێکیان پرسیاری لێکرد: ((خەڵکی شام تۆیان خۆش دەوێت))..؟

(سەعید) لە وەڵامیدا وتی: ((لەبەر ئەوەیە کە هاوکاریان دەکەم و دڵنەواییان دەکەم))..

خۆشەویستی خەڵکی (حومص) بۆ سەعید هەر چەند بێت، ئەوا بێزاری و سکاڵایان هەر دەبێت و دەربازبوونی لێ نیە... گەر هەر بۆ ئەوەش بێت بیسەلمێنێت کە هێشتا (حومص) رکابەری (کوفە)ی عێراقە..!!

رۆژێکیان، ئەمیری بڕواداران (عومەر) سەردانی (حومص)ی کرد و لە نێو هەشاماتێکی زۆری خەڵکەکەیدا پرسی: لەبارەی (سەعید)ەوە چی دەڵێن..؟؟

هەندێك کەس سکاڵایان لێی هەبوو... بەڵام سکاڵایەکی پیرۆز، چونکە بەهۆی ئەو سکاڵایەوە لایەنێکی زۆر سەرسوڕهێنەری مەزنی ئەو پیاوە دەرکەوت.. کە زۆر جێگای سەرسوڕمان بوو..!!

(عومەر) داوای لە پێڕی سکاڵاکاران کرد، کە یەك بەیەکی خاڵەکانی سکاڵاکەیان بخەنە ڕوو..

قسەکەرێك بەناوی ئەو پێڕەوە هەستایەوە و وتی: ((چوار سکاڵامان لەسەر هەیە..

تا ڕۆژ نەبێتەوە نایەتە دەرەوە بۆلامان...

بەشەودا وەڵامی هیچ کەس ناداتەوە...

لە مانگێکدا دوو ڕۆژی هەیە کە تێیدا نایەتە دەرەوە بۆ لامان و نایبینین...

چوارەمیش، کە ئەو هیچ دەستەڵاتێکی تێیدا نیە، بەڵام ئێمەی بێزار کردووە، ئەویش ئەوەیە کە ناویەناو بێهۆش دەبێت– واتە دەبورێتەوە–))..

پیاوەکە ئەوەی وت و دانیشت..

(عومەر) بۆ ماوەیەك مات و بێدەنگ بوو، ڕووی لە خوا کرد و، بە چرپەوە دەیوت:

((خودایە من وەك چاکترینی بەندەی تۆ ناسیوومە..

خودایە پێشبینی و شێوەناسیەکەم بۆی بەخەسار نەبێت))...

جا بانگی کرد بەرگری لە خۆی بکات، (سەعید) وتی:

((ئەوەی کە دەڵێن: تا ڕۆژ نەبێتەوە ناچمە دەرەوە بۆ لایان..

سوێند بەخوا پێم خۆش نەبوو باسی هۆیەکەی بکەم... لە ڕاستیدا خێزانەکەم خزمەتکاری نیە، خۆم هەویر دەشێلم و، وازی لێدێنم تا هەڵدێت، ئینجا نان دەکەم، دوای ئەوە دەستنوێژ دەگرم بۆ نوێژی چێشتەنگاو، پاشان دێمەوە دەرەوە بۆ لایان))...

ڕوخساری (عومەر) گەشایەوە و، وتی: سوپاس بۆ خوا.. ئەی دووەم...؟!

(سەعید) درێژەی بە قسەکانیدا:

((ئەوەشی کە دەڵێت: بەشەودا وەڵامی کەس نادەمەوە..

سوێند بەخوا پێم خۆش نەبوو باسی هۆیەکەی بکەم.. من ڕۆژم داناوە بۆ ئەوان و، شەویش بۆ پەروەردگارم))..

((ئەوەیش کە دەڵێن: لە مانگێکدا دوو ڕۆژم هەیە ناچمە دەرەوە بۆ لایان تێیدا..

خزمەتکارم نیە جل و بەرگەکەم بۆ بشوات و، جل و بەرگی دیکەشم نیە بیگۆڕم، هەر بۆیە خۆم جل و بەرگەکانم دەشۆم و چاوەڕوان دەکەم تا لەدوای ماوەیەك وشك دەبێتەوە.. لە کۆتایی ڕۆژیشدا دەچمە دەرەوە بۆ لایان))..

((ئەوەیشی کە دەڵێن: کە ناو بە ناو بێهۆش دەبم..

ئامادەی کوژرانی (خوبەیبی ئەنصاری) بووم لە مەککە، کە قوڕەیش گۆشتەکەیان لێ دەکردەوە، خستبوویانە سەر حوشترێك و، پێیان دەوت: پێت خۆشە ئێستا (محمد) لە جێگای تۆدا بوایە و، تۆش ساغ و سەلامەت بوویتایە..؟؟ وەڵامی دەدانەوە و دەیوت: سوێند بەخوا

پێم خۆش نیە من لە نێو کەس وکار و منداڵەکانمدا بم، لە نێو ساغ و سەلامەتی و خۆشی دونیادا و، پێغەمبەری خواش دڕکێك بچێت بە پێیدا..

هەر کاتێك ئەو دیمەنەم بێتەوە یاد کە بینیم و، کە من ئەو ڕۆژە لە هاوەڵ پەرستان بووم، پاشان بیرم دەکەوێتەوە کە ئەو ڕۆژە سەرخستنی خوبەیبم واز لێ هێنا، لە ترسی سزا و ئەشکەنجەی خوا دەلەرزم و لە هۆشی خۆم دەچم))..

وشەکانی (سەعید) کۆتایی هات، کە بە تەڕی فرمێسکی خۆپارێزی بێگەردییەوە لێوەکانی بەجێدەهێشت..

(عومەر) خۆی پێ ڕانەگیرا و لە خۆشیاندا، بەدەنگی بەرز وتی:

((سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە پێشبینی و ناسینەکەمی بەهەڵە نەبرد))..!!

دەستی کردە ملی (سەعید)، نێو چاوانە ڕۆشنە پایە بەرزەکەی ماچکرد..

* * *

ج بەختێکە لە ڕێنوێنی ئەو پێڕە دروستکراوە بەدەستیان هێناوە..؟؟

ج مامۆستایەك بوو پێغەمبەری خوا ﷺ..؟؟

ج ڕووناکیەکی پرشنگدار بوو کتێبی خوای گەورە..؟؟

ئیسلام ج قوتابخانەیەکی ئیلهام بەخش و ج فێرکارێك بوو..؟؟

بەڵام، ئایا زەوی دەتوانێت ژمارەیەکی زۆری لەم پێڕە لەسەر پشتی خۆی هەڵگرێت..؟؟

گەر ئەوە ڕوویبدایە، ئەوا بە زەوییەتی نەدەمایەوە و.. دەبووە فیردەوس..

بەڵێ.. دەبووە فیردەوسی وادە دراو..

لە کاتێکدا کە فیردەوس هێشتا کات و ساتی نەهاتبێت، ئەوا ئەو کەسانەی لەم پێڕە پایەدار و سەربڵندانە کە بەژیاندا دەگوزەرێن و بەسەر زەویدا تێدەپەڕن.. هەمیشە کەم و دەگمەنن..

(سەعیدی کوڕی عامر) یەکێکە لەوانە..

بەخشش و موچەکەی بەپێی ئەرك و کارەکەی زۆر بوو، بەڵام ئەو هێندەی لێ هەڵدەگرت کە بەشی خۆی و خێزانەکەی بکات و.. ئەوی دیکەی بەسەر ماڵە هەژارەکاندا دەبەخشیەوە..

ڕۆژێکیان پێی وترا: بەو زیادەیە خاو و خێزان و خزمانت ببوژێنەرەوە..

لە وەڵامدا دەیوت: ((باشە بۆ خاو و خێزان و خزمانم..؟؟

سوێند بەخوا من ڕەزامەندی لای خوا نافرۆشم بە خزمایەتی))...

چەندە جاریش پێی دەوترا: (خەرجیی خۆت و خاو و خێزانت زیاد بکە و لە شتە باشەکانی ژیان بەهرەوەر بە):

بەڵام ئەو هەمیشە لە وەڵامدا، ئەم وشە مەزنانەی دووپات دەکردەوە:

((نەخێر هەرگیز لە دەستەی یەکەم دوا ناکەوم، پاش ئەوەی گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوای گەورە خەڵکی بۆ لێپرسینەوە کۆ دەکاتەوە، بروادارە هەژارەکان وەك پۆلە کۆتر بە خۆشیەوە دێن، پێیان دەوترێت: راوەستن بۆ لێپرسینەوە، دەڵێن: هیچ شتێکمان نەبووە تا لەسەری لێمان بپرسنەوە... خوای گەورە دەفەرموێت: بەندەکانم راستیان وت و.. بەر لەخەڵکی دەچنە بەهەشتەوە))...

* * *

لەساڵی بیستەمی کۆچیدا، (سەعید) گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری، پاکتر لە پەڕەی سپی، بەتەقوا ترین دڵ و، جوانترین ژیاننامەی هەبوو..

مەیل و تامەزرۆیی بۆ گەیشتنەوە بەدەستەی یەکەم درێژەی کێشا، کە ژیانی خۆی لە پێناوی پاراستنی بەڵێنەکەی و شوێن پێ هەڵگرتنیاندا نەزر کردبوو..

بەڵێ.. خۆزگەی گەیشتن بە پێغەمبەر و مامۆستاکەی و.. بە هەموو هاوەڵە پێشینە بێگەردەکانی درێژەی کێشا..

ئەوا ئەمڕۆ، ئاسودەیی و، دڵنیایی دەروون و، بار سووکیەوە پێیان دەگات..

لە باری دونیا و خۆشیەکانی نە هیچی پێیە و نەهیچی جێهێشتوە تا پشت وشانی قورس بکات..

تەنها خۆپارێزییەکەی، دونیانەویستیەکەی، تەقواکەی، مەزنی دەروون وئاکاری پێیە.

ئەو چاکانەی تەرازوو قورس دەکەن، بەڵام لەسەر پشت سوکن ...!!

لەگەڵ ئاکاری وا کە خاوەنەکەی دونیای پێ هەژاند و.. لەخۆ بایبوون ئەوی نەهەژاند...!!

* * *

سڵاو لە (سەعیدی کوڕی عامر)..

سڵاوی لێبێ لە ژیان و، مردنیدا..

سڵاو و، پاشان سڵاو، لە ژیان و یادی..

سڵاویش لە کەسە بەڕێز و بێگەردەکان.. هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ ...

# ١١

# حەمزەی کوڕی عبدالمطلب

## شێری خوداو ڕەهاری ئیلاها

مەککە لە خەوێکی قوڵدا بوو، پاشی ڕۆژێکی پڕ کۆشش و، ماندووبوون و، پەرستش و، ئارەزووبازی..

قورەیشیەکانیش لە نێو نوێنەکانیاندا ئەمدیو و ئەو دیویان دەکرد.. تەنها یەکێکیان نەبێت کە لەناو نوێنەکەیدا ئارامی نەدەگرت، زوو دەخزێتە ناوی و، چەند ساتێکی کەم تیایدا حەسایەوە، پاشان بە خۆشی و شادییەکی مەزنەوە هەڵدەستایەوە، چونکە وادەی لەگەڵ پەروەردگاریدا هەبوو، رووی دەکردە شوێنی نوێژکردنەکەی لە ژوورەکەیدا و، بەردەوام لەگەڵ پەروەردگاری دەدوا و لێی دەپاڕایەوە.. هەر کاتێك ژنەکەشی بە هۆی پرخەی سنگی تکاکاری و پاڕانەوە گەرم و گوڕە دووبارەبووەکانی بەخەبەر بهاتبایە، بەزەیی پێیدا دەهاتەوە و، داوای لێدەکرد بەزەیی بەخۆیدا بێتەوە، بەشی خۆی بخەوێت، وەڵامی دەدایەوە و ئەسرینەکانی پێش وشەکانی دەکەوتن:

((سەردەمی خەوتن بەسەر چوو ئەی خەدیجە))..!!!

هێشتا کارەکەی خەوی قورەیشی نەزڕاندبوو، گەرچی لەوەدا بوو بێتە مایەی سەرنج ڕاکێشانیان، ئەو ساتە هێشتا لە سەرەتای بانگەوازیدا بوو و، بەچرپە و نهێنی وشەکانی دەدرکاند.

ئەو کەسانەی ئەو ڕۆژانە باوەڕیان پێی هێنا بوو زۆر کەم بوون..

جگە لە ئیمانداران کەسی دیکەش هەبوو ڕێز و خۆشەویستیەکی زۆریان هەبێت بۆی و، بە جۆش و خرۆشێکی مەزنەوە باڵەکانیان لێك بدەن بەرەو ئیمان هێنان پێی و ڕۆشتن لە نێو کاروانە پیرۆزەکەی. تەنها کاریگەری عادەت و ژینگە و، پاڵەپەستۆی داب و نەریت و بۆماوە و، دوودڵی لە نێوان بانگی ڕۆژئاوابوون و، بانگی ڕۆژهەڵاتندا، ڕێگربوو..

(حەمزەی کوڕی عبدالمطلب) مامی پێغەمبەرﷺ و، برای شیری.. یەکێك بوو لەوانە..

* * *

(حەمزە) بەچاکی ئاشنای مەزنی و کامڵی برازاکەی بوو... بە روون و ئاشکرایی ڕاست و دروستی کارەکەی و، کرۆکی خەسڵەتەکانی دەزانی..

ئەو تەنها وەك مامێك ئاشنای برازاکەی نەبوو بەس.. بەڵکو وەك برا و، هاوڕێ، دەیناسی.. چونکە (حەمزە) و پێغەمبەر ﷺ لە یەك نەوە بوون و، تەمەنیان نزیك بوو.. پێکەوە گەورە

بوون و، بەیەکەوە یاریان کرد و، بوون بە برا و، لە سەرەتای ڕێگاوە هەنگاو لەگەڵ یەکدا پێکەوە ڕۆشتن..

خۆ گەر گەنجێتی هەر یەکەیان بە ڕێگایەکدا ڕۆشتبێت، ئەوە حەمزە پێشی هاوتەمەنەکانی خۆی دەکەوت لە بەدەستهێنانی خۆشیەکانی ژیان و، کردنەوەی جێگا بۆخۆی لە نێو پیاوماقوڵانی مەککە و گەورەپیاوانی قورەیشدا... لە کاتێکدا (موحەمەد) لە خەڵوەتدا بوو لەگەڵ ڕۆشناییەکانی ڕۆحی کە دەستی بە ڕووناککردنی ڕێگای بەرەو خوا چوون کردبوو و، قسەی دڵی کە لە ژاوەژاوی ژیان دووری خستبوەوە بەرەو بیرکردنەوە و رامانی قوڵ و، ڕووەو خۆ سازدان بۆ دەست خستنە نێو دەستی حەق و وەرگرتنی..

دەڵێین: گەرچی لاوێتی هەر یەکەیان ئاراستەیەکی جیای گرت، ئەوا حەمزە بۆ چرکە ساتێکیش لە چاکەکانی هاوتەمەن و برازاکەی دانەبڕا.. ئەو چاکە و ڕێزداریانەی کە خاوەنەکەیان خستبوە جێگایەکی بڵند لە دڵی هەموو خەڵکیدا و، وێنەیەکی ئاشکرای بۆ ئایندە مەزنەکەی دەکێشا.

لە سپێدەی ئەو ڕۆژەدا، حەمزە وەك کردبوویە خوو، هاتە دەرێ.

لەلای کەعبە کۆمەڵێك لە گەورە پیاوانی قورەیش و پیاوماقوڵانیانی بەدی کرد و لەگەڵیان دانیشت، گوێی لە قسەکانیان گرت..

دەربارەی (موحەمەد) دەدوان...

حەمزە یەکەمجار بوو ببینێ بانگەوازی برازاکەی خستونیەتە دڵەڕاوکێ.. قسەکانیان بۆنی بۆغز و کینە و، داخ لە دڵی و، تاڵی لێدێت.

ئەوان پێشتر باکیان نەبوو، یان وایان دەخستە ڕوو کە گوێی پێ نادەن و بەلایانەوە هیچ نیە.

بەڵام ئەمڕۆ، دڵەڕاوکێ و، خەم و، ئارەزوومەندی هەڵمەتبردن بۆی، لە ڕوخساریاندا شەپۆلی دەدات..

حەمزە بە قسە و باسەکانیان زۆر پێکەنی و.. زیادەڕەوی و، خراپ لێکدانەوەی دایە پاڵیان..

بەدوایدا (ئەبو جەهل) بۆ ئامادەبوانی دووپاتکردەوە کە حەمزە لە هەموو خەڵکی زیاتر لە مەترسی ئەوەی (موحەمەد) بانگەوازی بۆدەکات ئاگادارە، بەڵام دەیەوێت کارەکە لای قورەیش ئاسان بکات تا بخافڵێن و، کاتێك بەئاگا بێنەوە، خراپترین ڕۆژی بێت و، کاری برازاکەی بەسەریاندا زاڵ بوو بێت..

بەردەوام لە قسەکانیاندا دەیاننەڕاند و هەڕەشەیان دەکرد و.. (حەمزە)یش هەندێ جار پێدەکەنی و، جاری واش هەبوو قینی هەڵدەستا، کاتێکیش جیابوونەوە و هەرکەسەو بەڕێی

خۆیدا ڕۆشت، (حەمزە) سەری بە بیرۆکەی نوێ و، خورپە تازەکە قورس بوو بوو، کاری برازاکەی دەهێنایە بەرچاو و، سەر لە نوێ لەگەڵ خۆیدا تاوتوێی دەکرد...!!!

* * *

ڕۆژان تێپەڕی، هەر ڕۆژە و بانگی لەوی دیکە دەکرد و، لەگەڵ هەر ڕۆژێکدا قسە و باسی قورەیش لەسەر بانگەوازەکەی پێغەمبەر ﷺ زیاتر دەبوو..

پاشان قسە و باسەکان دەگۆڕا بۆ شەڕ فرۆشتن.. (حەمزە)ش لە دوورەوە چاودێری هەڵوێستەکەی دەکرد..

خۆڕاگری برازاکەی سەرسامی کردبوو... لێبڕانەکەی لە پێناوی ئیمان و بانگەوازەکەیدا لای هەموو قورەیش شتێکی نوێ بوو، سەرەڕای ئەو لێبڕان و خۆگرییەی کە پێی ناسرابوو..!!

خۆ گەر لەو ڕۆژەدا گومان بیتوانیایە هەر کەس بەرانبەر ڕاستگۆیی پێغەمبەر و مەزنی خووڕەوشتەکانی هەڵبخەڵەتێنێ، ئەوا توانای نەبوو کەلێن و جێگایەك بۆچوونە نێو تێگەیشتنی حەمزە بدۆزێتەوە..

حەمزە لە هەموان چاکتر ئاشنای (موحەممەد) بوو... لە کاتی زۆر منداڵیەوە.. تا لاوێتی بێگەردی... و تا کاتی پیاوێتی دەست پاکی بەرزی..

ئەو وەك خۆی دەیناسی، بەڵکو زیاتر لەوەی کە خۆی دەناسێت ئاشنای بوو، لەو کاتەوەی کە پێکەوە هاتبوونە ژیان.. بەیەکەوە گەورە بوون... پێکەوە پێگەیشتن... ژیانی (موحەممەد)یش هەر هەمووی وەك تیشکی ڕۆژ بێگەردە..!! حەمزە هیچ گومانێکی بەدی نەکردووە سەبارەت بەو ژیانە.. نایەتە یادی ڕۆژێك بینیبێتی تووڕە بێت، یان نا ئومێد، یا چاوچنۆك، یان ئارەزووباز، یان بێھۆرە و داڕووخاو بێت..

(حەمزە)ش تەنها خاوەنی هێزی جەستە نەبوو بەس، بەڵکو خاوەنی هۆشمەندی عەقڵ و، بەهێزی ویستیش بوو..

ئا لێرەوە شتێکی سروشتی نەبوو کە لە شوێن کەوتنی کەسێك دوا بکەوێت کە ئەو هەموو ڕاستگۆیی و دەستپاکیيەی تێدا دەرك پێ کرد بوو.. بەو جۆرە لە دڵیدا پێچایەوە تا ئەو کاتەی بەهۆی کارێکەوە لە ڕۆژێکی نزیکدا ئاشکرا دەبێت..

* * *

ڕۆژی دیاریکراو هات...

(حەمزە) لە ماڵ هاتەدەر و، تیر و کەوانەکەی لەشان کرد بوو و، بەرەو ڕووی بیابان دەچوو تا ئارەزووە خۆشەویستەکەی و، وەرزشە پەسەندەکەی، کە ڕاوە، ئەنجام بدات... کە ڕاوچیيەکی لێهاتووی کەم وێنە بوو..

بەشێکی رۆژ لەوێ مایەوە... کاتێك لە راو گەڕایەوە، وەك کردبوویە پیشە، بەرەو کەعبە چوو، تا تەوافی بکات، بەر لەوەی بەرەو ماڵەوە بگەڕێتەوە.

لە نزیك کەعبە خزمەتکارێکی (عبداللّٰی کوڕی جەدعان)ی پێگەیشت...

هەرکە چاوی پێی کەوت، وتی:

((ئەی باوکی (عومارە)... گەر دەتبینی (محمد)ی برازات چی بەسەرهات بەدەستی (ئەبو حەکەمی کوڕی هیشام).. ئا لەوێ چاوی پێی کەوت دانیشتبوو، ئازاری دا و، جنێوی پێدا و، ئەوەی پێی ناخۆش بوو پێی کرد))..

ئینجا ئەوەی ئەبو جەهل بەسەر پێغەمبەری ﷺ هێنا بوو بۆی شیکردەوە..

حەمزە بەچاکی گوێی لە قسەکانی گرت، پاشان بۆ کەمێك بیری کردەوە، دوای ئەوە دەستی برد کەوانەکەی لەسەر شانی دانا و... بە خێرایی و جەسورانە بەرە و لای کەعبە رۆشت، بەو ئومێدەی لەوێ بە ئەبو جەهل بگات.. خۆ گەر لەوێ نەیدۆزییەوە، ئەوا لە شوێن و جێگای دیکە بەدوایدا دەگەڕێ تا پێی دەگات..

بەڵام بەر لەوەی بگاتە کەعبە، سەیری کرد ئەبو جەهل لە حەوشەکەیدا لە نێو کۆمەڵێك لە گەورەپیاوانی قورەیش دانیشتووە..

بە هێمنیەکی ترسناکەوە، حەمزە لە ئەبو جەهل نزیك بووەوە، پاشان کەوانەکەی بەرزکردەوە و دای بەسەری ئەبو جەهلدا، شکاندی و خوێنی لێهات، بەر لەوەی کە ئامادەبوان لە سەرسامیەکەیان بەئاگابێنەوە، حەمزە هاواری بەسەر ئەبو جەهلدا کرد:

((جنێو بە موحەممەد دەدەیت، لە کاتێکدا کە من لەسەر ئاینەکەی ئەوم و ئەوە دەڵێم کە ئەو دەیڵێت...؟! دەی گەر دەتوانیت وەڵامم بدەرەوە))...

لە چرکە ساتێکدا، هەموو ئامادەبوان ئەو سووکایەتیەی بە (ئەبو جەهل)ی سەرکردەیان کرا و ئەو خوێنەی لەسەری دەچۆڕا، لە بیریان چوو، ئەو وشەیەی وەك هەورە بروسکە دای بەسەریاندا سەر قاڵی کردن.. ئەو وتەیەی کە (حەمزە) تێیدا رایگەیاند لەسەر ئاینی (محمد)ە و، هەمان تێڕوانینی هەیە و، ئەوە دەڵێت کە ئەو دەیڵێت..

ئایا حەمزە موسڵمان دەبێت..؟؟

بەڕێزترین و بەهێزترین گەنجی قورەیش..؟؟

بەڕاستی ئەمە نەهامەتیەکە قورەیش توانای بەرگەگرتنی نیە، چونکە موسڵمان بوونی حەمزە رێگە بۆ زۆر کەسی هەڵبژاردە و دیاری دیکە خۆش دەکات تا موسڵمان بن و، (موحەممەد)یش کەسانێکی خاوەن توانا و هێزی لەدەور کۆ دەبێتەوە کە ببنە مایەی بەهێزبوونی بانگەوازەکەی و خۆ کۆکردنەوەی و، رۆژێکیش قورەیش بە دەنگی ئەو پاچانە بێدار دەبێتەوە کە خواوەند و بتەکانیان دەشکێنێت..!!

بەڵێ.. حەمزە موسڵمان بوو، ئەوەی لەدڵیدا پێچابوویەوە بۆ خەڵکی ئاشکرا کرد و، هەموو ئەو خەڵکە حەپەساوەی بە نائومێدی بەجێهێشت و، ئەبوجەهلیش ئەو خوێنەی دەسڕی لەسەرە شکاوەکەی دەهاتە خوارێ.. حەمزە جارێکی دیکە دەستی دایە کەوانەکەی و لەسەر شانی راگرت و، بە هەنگاوی چەسپاو و، ئازایەتی بەهێزیەوە بەرەو ماڵ کەوتە رێ..!

* * *

حەمزە خاوەنی عەقڵێکی بەجێهێنەر و، ویژدانێکی راست و دروست بوو..

کە گەڕایەوە ماڵەوە و، ماندوێتی ئەو رۆژەی دەرچوو، دانیشت بیری کردەوە و، ئەو رووداوانەی پێش ماوەیەکی کەم روویدابوو دەهێنایە خەیاڵی..

چۆن موسڵمان بوونی خۆی راگەیاند و.. کەی..؟؟

لەچرکە ساتێك لەچرکە ساتەکانی حەماسەت و تووڕەیی و هەڵچووندا رایگەیاند..

پێی ناخۆش بوو خراپە بەرانبەر برازاکەی بکرێت و، ستەمی لێ بکرێت و ئەویش هیچ پشت و پەنا و سەرخەرێکی نەبێت، بۆیە تووڕە بوو، لەسەر رێز و پایەی بەنی هاشم غیرەت گرتی و، سەری ئەبو جەهلی شکاند و، موسڵمان بوونی خۆیشی دا بەڕوویدا..

بەڵام، ئایا ئەوە رێگایەکی پەسەندە تا مرۆڤ واز لە ئاینی باوباپیر و هۆزەکەی بهێنێت.. ئاینی چەرخ و سەردەمەکان.. پێشوازی لە ئاینێکی نوێ بکات کە هێشتا بنەماکانی تاقی نەکردووەتەوە و، لەبارەی راستێتیەوە تەنها شتێکی کەم ئاشنا بێت..

راستە ئەو بۆ چرکە ساتێکیش گومانی لە راستگۆیی (موحەممەد) و بێگەردی مەبەستەکەی نیە.. بەڵام ئایا دەکرێت مرۆڤ لە چرکەساتێکی تووڕەبووندا پێشوازی لە ئاینێکی نوێ بکات و، هەموو ئەو بەرپرسیارێتی و ماندوویەتیەی لە ئەستۆ بگرێت، ، هەر وەکو ئێستا حەمزە کردی..؟؟

لە راستیدا ئەو لە دڵ و دەروونیدا رێزی هەبوو بۆ ئەو بانگەوازە نوێیەی کە برازاکەی ئاڵا هەڵگریەتی..

بەڵام، گەر لەسەری نووسرابێت کە یەکێك بێت لە شوێنکەوتوانی ئەو بانگەوازە و، بڕوادار بێت پێی و، پارێزەری بێت.. دەبێ کاتی گونجاو بۆ چوونە نێو ئەو ئاینە کەی بێت..؟

لە چرکەساتێکی غیرەت و تووڕەیی..؟ یان کاتەکانی بیرکردنەوە و لەسەرخۆیی..؟؟

بەو جۆرە راست رەوی ویژدانی و، بێگەردی بیرکردنەوەی، بەسەریاندا سەپاند کە ئەو بابەتە هەمووی سەرلەنوێ بە چاکی و وردبینی بیر لێ بکاتەوە..

دەستی کرد بە بیرکردنەوە و، چەند رۆژێکی بەسەر برد، لە بیرکردنەوە نەدەسرەوت و، شەوانەش چاوەکانی نەدەچوونە خەو..

کاتێکیش بمانەوێت بەهۆی عەقڵەوە راستی بدۆزینەوە، گومان وەك هۆکارێکی گەیشتن بە ناسینی خۆی دەسەپێنێت..

بەو جۆرە، حەمزە هەر کە عەقڵی خستەکار لە تۆژینەوەی رەوشی ئیسلام و، ئاینی کۆن و ئاینی نوێی لەگەڵ یەك بەراورد کرد، بەهۆی سۆزی خۆرسکی بۆماوەی بەرانبەر ئاینی باووباپیری و، ترسی خۆرسکی بۆماوەی بەرانبەر هەموو شتێکی نوێ، گومانیان لە دەروونیدا وروژاند..

هەموو یادەوەریەکانی لە بارەی کەعبە و، خواوەندەکانی و، بتەکانی..، دەربارەی ئەو سەروەریە ئاینیانەی هاتەوە پێش چاو کە ئەو خواوەندە داتاشراوانە بۆ هەموو قورەیش و، تێکرای مەککە بەگشتیی دەستەبەر کردوە....

دابڕان لە هەموو ئەو مێژووەو .. ئاینە دێرینە زۆر سەختە.. ئەوەش رستن و شیکردنەوەی مەزنی پێویستە..

حەمزە سەری سوڕدەما لەوەی کە چۆن ئادەمیزاد دەتوانێت ئاوا بە ئاسانی و خێرا ئاینی بلو و باپیرانی بەجێ بهێڵێت و پەشیمان بووەوە لەوەی کردویەتی.. بەڵام گەشتی بیرکردنەوەی ژیرانەی درێژەپێدا.. کاتێکیش بینی کە تەنها عەقڵ بەس نیە بە هەموو دڵسۆزی و راستگۆییەکییەوە پەنای بردە بەر نادیار (غەیب).

لەلای کەعبە، بە ملکەچیەوە روویکردە ئاسمان و، پەنای بردە بەر هەموو شتێکی نێو ئەو گەردونە لە توانا و رۆشنایی، تا بەرە و لای حەق و رێگەی راست رێنوێنی بکەن، دەبا گوێ لە خۆی بگرین، پاشماوەی بەسەر هاتەکەمان بۆ باس بکات:

{...پاشان هەستم بە پەشیمانی کرد بەدابڕان لە ئاینی باوباپیر و هۆزەکەم و... لەم کارە مەزنە بە گومان بووم، بە جۆرێك کە چاوم نەدەچووە خەو..

پاشان هاتم بۆ لای کەعبە، لە خوا پاڕامەوە کە سنگم بۆ حەق بکاتەوەو، گومان و دوو دڵیم لا نەهێڵێت. خوای گەورە پاڕانەوەکەی گیرا کردم و دڵی پڕ کردم لە دڵنیایی.

بەرە و لای پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتمە رێ و، هەواڵی سەر گوزەشتەی خۆم پێدا و، ئەویش پاڕایەوە بۆم کە دڵم لەسەر ئاینەکەی جێگیر بێت...}

بەمجۆرە (حەمزە) موسڵمان بوو.. موسڵمان بوونێکی تەواو بە دڵنیاییەوە..

خوای گەورە بەهۆی حەمزەوە ئیسلامی شکۆدار کرد و... سەربڵند و بوێرانە راوەستا و بەرگری لە پێغەمبەری خوا و، هاوەڵە بێدەسەڵاتەکانی دەکرد..

ئەبو جەهل کە بینی لە ریزی موسڵماناندا دەوەستێت، تێگەیشت کە جەنگ بەرپا دەبێت، هەر بۆیە هات و هانی قورەیشیەکانی دەدا کەئازار و ئەشکەنجەی پێغەمبەر و هاوەڵەکانی بدەن و، بەردەوام رێگای بۆ شەڕێکی نێوخۆیی ساز دەکرد کە بەهۆیەوە سارێژی رق و کینە و بوغزەکانی دڵی خۆی پێ بکات..

دیارە (حەمزە)ش نەیدەتوانی رێگری لە هەموو ئازاردانێك بکات.. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا موسڵمان بوونی قەڵغان و پارێزکارێك بوو.. هەروەها سەرنج راکێشانێکی سەر کەوتوویش بوو بۆ زۆرێك لە هۆزەکان کە بەهۆی موسڵمان بوونی حەمزە و، پاشان (عومەری کوڕی خطاب)ەوە ئەوانیش دەستە دەستە بێنە ناو ئیسلامەوە..!!

لەو ساتەوەی کە حەمزە موسڵمان بوو هەموو خۆشی و، توانا و هێز و، ژیانی بۆ خودا و ئاینەکەی نەزر کرد بوو، هەتا وای لێکرد پێغەمبەر ﷺ ئەم نازناوە مەزنەی پێ ببەخشێت:

{شێری خودا و، شێری پێغەمبەرەکەی ﷺ }..

یەکەمین دەستەی موسڵمانانیش کە بۆ روو بەڕوو بوونەوەی دوژمن کەوتە ڕێ، حەمزە بەرپرسی بوو..

یەکەمین ئاڵاش کە پێغەمبەر ﷺ دابێتە دەست یەکێك لە موسڵمانان، ئەوا بە حەمزە درا..

ئەو رۆژەشی لە غەزای بەدردا هەر دوو کۆمەڵ بەیەك گەیشتن، شێری خودا و شێری پێغەمبەرکەی ﷺ ، لەو غەزایەدا مایەی سەرسوڕمان بوو..!!

پاشماوەی لەشکری تێکشکاوی قوڕەیش لە بەدرەوە بەرە و مەککە بەسەر شۆڕی و نائومێدی گەڕانەوە، ئەبو سوفیانیش دڵشکاو و، سەرشۆڕانە گەڕایەوە..

چونکە لە نێو گۆڕەپانی جەنگدا لاشەی گەورە پیاوانی قوڕەیش وەك.. ئەبو جەهل و.. عوتبەی کوڕی رەبیعە و.. شەیبەی کوڕی رەبیعە و.. ئومەیەی کوڕی خەلەف و.. عوقبەی کوڕی ئەبی موعەیت و، ئەسوەدی کوڕی عەبدول ئەسەدی مەخزومی و.. وەلیدی کوڕی عوتبە و.. (نظر کوڕی حارس) و.. (عاص کوڕی سەعید) و.. (گمم کوڕی عەدی) و.. دەیەها پیاوی دیکەی قوڕەیش وەك ئەوان گەورەی بەجێ هێشتبوو..

جا لەبەر ئەوەی کە قوڕەیش بە ئاشتی و هێمنایەتی ئەو شکستە خراپەیان لەیاد نەدەچوو.. هەر بۆیە دەستیان کردە خۆ سازدان و، کۆکردنەوەی هێز و بێ هودەییان، تا تۆڵەی خۆیان و رێز و کوژراوەکانیان بکاتەوە..

قوڕەیش سوور بوو لەسەر شەڕ..

غەزای ئوحود هاتە پێشەوە و قوڕەیشیەکان زۆر زوو بەسەرۆکایەتی (ئەبو سوفیان) بۆ جارێکی کە هاتنە دەرەوە و، هەموو هۆزە عەرەبە هاوپەیمانەکانی خۆیان لەگەڵدا بوو..

گەورە پیاوانی قوڕەیش لەم جەنگە نوێیەیاندا ئامانجیان دوو پیاو بوو: یەکەمیان پێغەمبەرﷺ .. دووەمیشیان حەمزە لەدوای پێغەمبەر.. بەڵێ.. ئەو کەسەی گوێبیستی قسە و باسی پلانەکانیان بوایە بەر لە دەرچوونیان بۆ جەنگ، دەیبینی کە چۆن حەمزە لە دوای پێغەمبەر ﷺ مەبەست و ئامانجی جەنگەکە بوو..

بەر لە دەرچوونیش پیاوێکیان هەڵبژارد و کاری حەمزەیان پێسپارد، کە ئەویش کۆیلەیەکی حەبەشی خاوەن شارەزاییەکی کەم وێنە بوو لە ڕم هاوێژیدا... هەموو ڕۆڵی ئەویان

لە جەنگەکەدا چڕ کرد بووەوە لەوەی کە لێدانێکی کوشندە ئاراستەی حەمزە بکات بە ڕمەکەی و، ئاگاداریان کردەوە کە جگە لەوە بەهیچ شتێکی دیکەوە سەر قاڵ نەبێت، ئاکامی جەنگەکە و ئاراستەی کوشتارەکە هەر چۆن بێت..

تەنها ئەوەکاری ئەوە..

وادە و بەڵێنی بە هایەکی زۆر مەزنیان پێدا بوو کە ئەویش ئازاد کردنیەتی.. ئەو پیاوە کەناوی وەحشی بوو، کۆیلەی (جوبەیری کوڕی موتعەم) بوو.. لە ڕۆژی بەدریشدا مامی جوبەیر تیا چووبوو،

جوبەیر پێی وت: {لەگەڵ خەڵکیدا بڕۆرە دەرەوە، خۆ گەر توانیت حەمزە بکوژیت ئەوا تۆ ئازادیت}..!!

پاشان ناردی بۆ لای (هیندی کچی عوتبە)ی خێزانی ئەبو سوفیان تا زیاتر هانی بدات و، پاڵی پێوە بنێت بەرەو ئەو ئامانجەی کەدەیانەوێت..

هیند پێشتر لە جەنگی بەدردا باوکی و، مامی و، برایەکی و، کوڕێکی تیا چوو بوو..

پێشی وترا بوو حەمزە هەندێك لەوانەی کوشتووە و، دەستیشی هەبووە لە کوژرانی ئەوانی دیکەدا..

لەبەر ئەوە زۆربەی پیاو و ژنانی قورەیش سوور بوون لەسەر چوونە دەرەوە بۆ جەنگ، تەنها بۆ هێنانەوی سەری حەمزە و بەس بەهەر نرخێك بووە و چەندێ ناڕەحەتی بوێت..!!

هیند چەند ڕۆژێك بەر لە چوونە دەرەوە بۆ جەنگ، تەنها کاری ئەوە بوو هەموو ڕق و کینەی بکاتە نێو دڵی وەحشیەوە و ڕۆڵی خۆی بۆ دیاریکرد، خۆ گەر سەرکەوتوو بوو لە کوشتنی حەمزەدا ئەوا بەنرخترین خشڵی خۆڕازاندنەوە کە ئافرەت هەیبێت پێی ببەخشێت و، بەپەنجە کێن لە دڵەکانی گوارە و مرواریە بەنرخەکانی و گەردانە زێڕەکەی کە گەردنیان قەرەباڵغ کردبوو گرت و، لە کاتێکدا کە چاوە زەقەکانی بڕیبوە وەحشی وتی:

{هەموو ئەمانە بۆ تۆیە، گەر حەمزە بکوژیت}...!!!

وەحشی لیکی لە دەم دەهاتە خوارێ و... خەیاڵی بە جۆش و خرۆشەوە بەرەو لای ئەو جەنگە لەشەقەی باڵی دەدا کە ئازادبوونی خۆی تێدا بەدەست دەهێنێت و، ئیدی بە کۆیلە و دەست بەسەری نامێنێتەوە و، هەموو ئەو خشڵانەیشی کە شان و ملی سەرکردەی ئافرەتانی قورەیش و، ژنی سەرکردەکەیان و، کچی سەرکردەکەیانی ڕازاندۆتەوە دێتە دەستی..!!

کەواتە پیلان بوو.. هەموو ئەو جەنگەش حەمزەی ﷺ بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا دەوێت..

جەنگی ئوحود دەستی پێکرد..

هەر دوو کۆمەڵ بەیەك گەیشتن و.. حەمزە بەکاڵای شەڕەوە کەوتە نێوان زەوی مردن و کوشتار و، پەڕێکی نەعامەی لەسەر سنگ بوو کە پێشتریش سنگی لەجەنگدا پێ ڕازاندبۆوە..

دەستی کرد بە هاتن و چوون، هەر سەرێکی بیویستایە بە شمشێرەکەی دەیپەڕاند، بەردەوام لەبێباوەڕانی دەدا، وەك ئەوەی مەرگ هاتبێتە ژێر فەرمانیەوە، هەرکەسێ بیویستایە تێی دەگرت و یەکسەر دەیپێکا..!!

هەموو موسڵمانان هەڵمەتیان برد تا لەوەدا بوو سەرکەوتنی تەواو بەدەست بهێنن.. تەنانەت هێزە شکاوەکەی قورەیش دەستی بە کشانەوە کرد، هەڵدەهات.. گەر تیرهاوێژان شوێنی خۆیان لەسەر کێوەکە جێ نەهێشتایە و، نەهاتنایەتە خوارەوە بۆ گۆڕەپانی شەڕ بە مەبەستی کۆکردنەوەی دەستکەوتەکانی دوژمنی تێکشکاو.. خۆ گەر ئەوان شوێنی خۆیان چۆڵ نەکردایە و ئەو کەلێنە گەورەیان لەبەردەم سوارەکانی قورەیشدا والاّ نەکردایە ئەوا جەنگی ئوحود گۆڕستانێك بوو بۆهەموو قورەیش" بە پیاو و.. ژنیەوە.. بەڵکو بە ئەسپ و هوشتریشیەوە..!!

سوارەکانیان لە پشتەوەو لەکاتی بێئاگایدا لە موسڵمانانیان دا و، شمشێرە تینووە شێتەکانیان خستە کار بۆیان و.. موسڵمانان سەر لەنوێ دەستیان دایەوە خۆ کۆکردنەوە و، شمشێرەکانیان هەڵگرتەوە کە هەندێکیان کاتێك سوپای قورەیشی بەدی کردبوو دەکشێتەوەو هەڵدێت دایان نابوو.. بەڵام بەراستی ئەو کارە چاوەڕوان نەکراوە سەخت و دژوار بوو..

حەمزە کە ئەوەی بینی هێز و چوست و چالاکی و هەوڵی چەند قات زیاتری کرد..

لەراست و چەپ و بەردەم و دواوەی خۆیەوە لێی دەدان و.. (وەحشی)یش لەوێدا چاودێری دەکرد و، چاوەڕوانی دەرفەتی دەستدرێژیکردن بوو تا لێدانی خۆی ئاراستە بکات..

با لێگەڕێین (وەحشی) خۆی باسی ئەو دیمەنەمان بۆ بکات، بە دەمی خۆی:

{.. پیاوێکی حەبەشی بووم، رمم بەشێوەی حەبەشیەکان دەوەشاند، زۆر کەم هەڵەم دەکرد لە گرتنە نیشانەدا.. کاتێك خەڵکەکە بەیەك گەیشتن، چووم و سەیری حەمزەم دەکرد، تا لە نێو خەڵکەکەدا وەك هوشتری کەڵەگەت بەدیم کرد.. بە شمشێرەکەی خەڵکی لەت لەت دەکرد و، هیچ شتێك لەبەردەمیدا خۆی نەدەگرت..

سوێند بەخوا خۆمم بۆ ئامادە دەکرد و دەمویست، لەپشت درەختێکەوە خۆم شاردەوە تا بیپێکم یا لێم نزیك بێتەوە، (سیباعی کوڕی عەبدول عوزا) بردمیە پێشەوە بەرەو لای، کاتێك حەمزە چاوی پێی کەوت هاواری لێی کرد: وەرە بەرەو ڕووم ئەی کوڕی خەتەنەکەری کچان، پاشان لێدانێکی وای لێدا سەری لەلاشەکەی کردەوە..

ئا لەو کاتەدا رمەکەم جووڵان، هەتا بە دڵی خۆم هاویشتم و دای لە سنگی و لەنێوان قاچەکانیەوە هاتە دەر، هەستایەوە بەرەو لام، بەڵام توانای بەسەریدا نەشکا و مرد..

چوومە سەری و رمەکەی خۆم هەڵگرت، پاشان گەڕامەوە بۆ سەربازگە و تێیدا دانیشتم، چونکە من هیچ پێویستیەکی دیکەم نەبوو تێیدا و، ئەوم کوشت تا ئازاد بم...}

هیچی تێدا نیە گەر واز لە وەحشی بهێنین قسەکانی خۆی تەواو بکات:

{کاتێك گەڕامەوە بۆ مەککە ئازاد کرام و، لەوێ مامەوە تا پێغەمبەری خواﷺ لەڕۆژی ڕزگارکردنی مەککەدا هاتەوە ناوی، منیش هەڵهاتم بۆ تائیف.

کاتێکیش شاندی تائیف بەرەو لای پێغەمبەری خواﷺ چوون تا موسڵمان ببن دوودڵ بووم کە ڕوو لە کوێ بکەم، وتم: بگەمە شام، یا یەمەن، یا هەر جێگایەکی دیکە..

سوێند بەخوا من ئا لەو خەفەتەدا بووم پیاوێك پێی وتم: تیاچوون بۆتۆ..!! سوێند بەخوا پێغەمبەری خوا هەرکەس بێتە ناو ئاینەکەیەوە نایکوژێت..

منیش هاتم تا گەیشتمە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ لە مەدینە و نەیبینیم تا لەبەردەمیدا ڕاوەستام و شایەتومانی حەقم هێنا، کاتێك بینیمی فەرمووی: تۆ (وەحشی)یت..؟ وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.. فەرمووی: بۆم باس بکە کە چۆن حەمزەت کوشت، منیش بۆم گێڕایەوە.. کاتێك لە قسەکانم بوومەوە فەرمووی: تیاچوون بۆ تۆ، لەبەر چاوم ون بە.. منیش خۆم لە ڕێگەی پێغەمبەری خواﷺ لادەدا، تا نەم بینێت هەتا ئەو کاتەی وەفاتی کرد و گەڕایەوە بۆ لای خوای گەورە.

کاتێك موسڵمانان چوونە دەرەوە بۆ (موسەیلەمەی کەزاب)ی خاوەنی یەمامە، منیش لەگەڵیاندا ڕۆشتم و، هەمان ئەو ڕمەی کە حەمزەم پێکوشت لەگەڵ خۆم برد..

کاتێك خەڵکەکە دای بە یەکدا (موسەیلەمەی کەزاب)م بینی وەستابوو، شمشێرێکی بەدەستەوە بوو، خۆم بۆ ساز کرد و، ڕمەکەم جووڵاند، تا بەدڵی خۆم تێم گرت و بەری کەوت..

جا گەر بەم ڕمەم باشترین کەس کە حەمزەیە کوشتبێتم، ئەوا خوازیارم خوای گەورە بمبەخشێت و لێم ببورێت چونکە خراپترین کەسیش کە (موسەیلەمەی کەزاب)ە پێم کوشت}.

* * *

بەم شێوەیە شێری خودا و شێری پێغەمبەرەکەی، سەرفرازانە شەهید بوو...!!

هەروەك چۆن ژیانی دەنگدەرەوەو سەرفرازانە بوو، مردنیشی بە هەمان شێوە دەنگدەرەوەو سەرفرازانە بوو.. دوژمنەکانی تەنها بەکوشتنی وازیان لێنەهێنا.. باشە چۆن وازی لێبهێنن و ڕازی بن.. لەکاتێکدا کە ئەوان هەموو بەندەکانی قوڕەیش و تێکڕای پیاوەکانیان هاتنە ئەو جەنگەوە کەتەنها پێغەمبەرو حەمزەی مامیان مەبەست بوو.

(هیندی کچی عوتبە) کە خێزانی ئەبوسوفیان بوو فەرمانی کرد بە (وەحشی) کە جەرگی حەمزەی بۆ بهێنێت.. وەحشی بەدەم ئەو خواستە ناجۆرەوە ڕۆشت و.. کاتێك هێنای بۆ هیند، بەدەستی ڕاستی پێی دا و بەدەستی چەپیشی گوارەو گەردانەکەی وەك بەخشش لەسەر ئەو کارەی ئەنجامی دا وەرگرت لێی..

هیندی کچی ئەو عوتبەیەی کە موسڵمانان لە جەنگی بەدردا کوشتیان و ژنی ئەبوسوفیانی سەرکردەی سوپای بێباوەڕی بت پەرستی.. جەرگی حەمزەی خستە ناو دەمی و دەیجووی بەو ئومێدەی کە ئەو کارە سەرشێتانە سارێژی بوغز و کینەی بکات، بەڵام جەرگەکە لەنێوان کەڵبەکانی نەوەستا، نەیتوانی کە ئیدی بیمژێت، هەر بۆیە لە دەمی دەریهێنا و، چوویە سەر بەردێکی بەرز و هاواری دەکرد:

| | |
|---|---|
| نحن جزينـــاكم بيـــوم بــدر | والحرب بعد الحرب ذات سُعر |
| ما كــان عن عتبة لي من صبر | ولا أخـــي، وعمّة، وبكـــري |
| شــفيت نفســي وقضيت نذري | أزاح وحشــيٌ غليـل صـدري |

واتە: ئێمە سزای رۆژی بەدرمان دانەوە، شەڕی دوای شەڕیش ناڕەحەتە، لە دوای عوتبە و براکەم و مامی و کوڕەکەم ئارامم نەما، سارێژی دەروونی خۆم کرد و نەزرەکەم بەجێ هێنا، وەحشی داخ و کینەی دەروونمی نەهێشت..)

جەنگ کۆتایی هات و، بێباوەڕان سواری حوشترەکانیان بوون و، جڵەوی ئەسپەکانیان گرت و بەکاروان بەرەو مەککە کەوتنەوە رێ..

پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانی بەرەو گۆڕەپانی جەنگەکە هاتن تا سەیری شەهیدەکانیان بکەن..

لەوێدا لەنێو جەرگەی دۆڵەکەدا، لەکاتێکدا لە دەم و چاوی ئەو هاوەڵانەی دەڕوانی کە گیانی خۆیان لە پێناوی خوادا بەخشی و، کردیانە قوربانیەکی بێگەرد بۆ پەروەردگاری باڵادەستیان. لەناکاو راوەستا و ... سەرنجی دا، نێوچەوانی گرژ بوو... بە ددانەکانی لێوی خۆی کرۆشت و... پێڵوی چاوەکانی دا بە یەکدا..

هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبوو کە ئاکاری عەرەب هێندە بێتە خوار و ئەو درندەیەتیەی لێ بوەشێتەوە و، جەستەی مردوویەك بشێوێنێت بەو جۆرەی کە بینی جەستەی مامی شەهیدی پایەبەرز (حەمزەی کوڕی عبدالمطلب)ی شێری خودا و سەرداری شەهیدان شێوێنرابوو..

پێغەمبەر چاوی کە وەك مانگی تابان دەگەشایەوە، لەکاتێکدا کە سەرنجی جەستەی مامەی دا فەرمووی:

(هیچ کۆستێ وەك ئەمەی تۆ ناڕەحەت نابێت لام.. رانەوەستاویشم هەرگیز لەم راوەستانە ناڕەحەت تر..)

پاشان ئاوڕی دایەوە لە هاوەڵانی و فەرمووی:

(لەبەر ئەوە نەبوایە (سەفییە)ی-خوشکی حەمزە- دڵتەنگ ئەبێت و ئەکرێتە خوویەك لەدوای من، لێی دەگەڕام درندەو باڵندەکان بیانخواردایە..

لە هەر شوێنێکدا خوا باڵادەستم بکات بەسەر قوڕەیشیەکاندا، جەستەی سی کەسیان دەشێوێنم..)

هاوەڵانی پێغەمبەر هاواریان کرد:

(سوێند بەخوا، هەر ڕۆژێك خواى گەورە سەرمانخات بكات بەسەریاندا، ئەتكیان دەكەین، بەجۆرێك كە هیچ عەرەبێك واى نەكردبێت..!!)

بەڵام ئەو خودایەى كە حەمزەى بە شەهیدبوون ڕێزدار كرد، جارێكى دیكەش ڕێزى لێدەنێت بەوە كە كوژرانى ئەو دەكاتە دەرفەت بۆ وانەیەكى زۆر مەزن كە تا هەتایە دادگەرى بپارێزێت، بەزەیى پێداهاتنەوە تەنانەت لە سزادان و تۆڵەسەندنەوەدا دەكاتە فەرز و پێویست..

فەرز بەمجۆرە كە هێشتا پێغەمبەرﷺ لە وتنى پەیمانە پێشینەكەى نەبووبوویەوە نیگاى بۆ هاتە خوارێ لە جێگاى خۆیدا.

﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ، وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِلصَّابِرِينَ، وَاصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلاَّ بِاللَّهِ وَلاَ تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلاَ تَكُ فِي ضَيْقٍ مِمَّا يَمْكُرُونَ، إِنَّ اللَّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَوْا وَالَّذِينَ هُمْ مُحْسِنُونَ﴾النحل١٢٥-١٢٨.

واتە: بە كارزانى و ئامۆژگارى پەسەند، مەردوم بەرەو ڕێگەى پەروەردگارت بانگ بكە و بە چاكترین شێوە لەگەڵیان بدوێ، پەروەردگارت لەو كەسانەى لە ڕێگەى ئەو لایانداوە-لەگشت كەس- ئاگادارترە و هەر خۆشى باشتر دەزانێ كێیە لەسەر ڕاستەڕێیە.. ئەگەر تۆڵە دەستێننەوە، دار بەدار بێ و پتر نەبێ، خۆ ئەگەر خۆڕاگریش بن، دیارە بۆ خۆڕاگرەكان زۆر باشترە.. خۆڕاگر بە! دیارە خۆڕاگرتنیشت هەر بۆ خوایە و خەمیان مەخۆ و لەو گزى و فێڵانەش دەیكەن، دڵتەنگ مەبە، بێگومان خودا لەگەڵ خۆپارێزان و چاكەكارانە.

هاتنەخوارەوەى ئەم ئایەتانەش لەو جێگایەدا، چاكترین پاداشت بوو بۆ حەمزە كە پاداشتى كەوتە لاى خواى گەورە..

* * *

پێغەمبەرى خوا بە مەزنترین شێوە خۆشى دەویست، ئەو-هەروەكو پێشتر باسمان كرد - تەنها مامەى خۆشەویستى نەبوو بەس..

بەڵكو براى بوو لە شیرەوە..

هاوڕێنى بوو لە منداڵێتیدا..

و هاوڕێى هەموو تەمەنى بوو..

لەم چركەسانانەى ماڵئاوایشدا، پێغەمبەرﷺ هیچ سڵاوێكى بۆ ماڵئاوایى لێكردنى بەدى نەكرد چاكتر بێت بۆى كە بەقەد ژمارەى هەموو شەهیدانى جەنگەكە نوێژى لەسەر كرد..

بەمجۆرە لاشەى حەمزە بەرەو شوێنى نوێژكردنەكە برا لە گۆڕەپانى جەنگ كە ئەمى لەنێودا تیاچوو، خوێنى ڕژا... جا پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانى نوێژیان لەسەر كرد، پاشان

شەهیدێکی دیکەیان هێنا و، پێغەمبەر نوێژی لەسەر کرد.. دوای ئەوە شەهیدەکە دەبرا و حەمزە لەجێی خۆی دەمایەوەو شەهیدی سێیەم دەهێنرا لە تەنیشت حەمزەوە دانرا و پێغەمبەر نوێژی لەسەریان کرد..

بەو جۆرە.. شەهیدان هەموویان.. یەك یەك هێنران و.. پێغەمبەری خواﷺ نوێژی لەسەر هەریەکەیان و حەمزەش لەگەڵیدا بێت دەکرد، ئەو ڕۆژە حەفتاجار نوێژی لەسەر مامەی کرد..

* * *

پێغەمبەرﷺ لە جەنگەکەوە بەرەو ماڵ گەڕایەوە، لە ڕێگادا گوێی لە دەنگی ئافرەتانی هۆزی (عەبدولئەشهەل) بوو بۆ شەهیدەکان دەگریان، پێغەمبەرﷺ لە زۆر بە سۆزی و خۆشەویستیدا دەیفەرموو:

{بەڵام حەمزە کەس ناگری بۆی} ...!!

(سەعدی کوڕی مەعان) گوێی لەو قسەیە دەبێت و، وا گومان دەبات کە پێغەمبەرﷺ دەروونی ئاسوودە ئەبێت گەر ئافرەتان بۆ مامەی بگرین، بۆیە خێرا بەرەو لای ئافرەتانی هۆزی (عەبدولئەشهەل) دەڕوات و فەرمانیان پێدەکات کە بۆ حەمزە بگرین، هەر کە پێغەمبەر گوێبیستی گریانەکەیان دەبێت بەرەو لایان دەچێت و، دەفەرموێت:

{مەبەستم ئەوەنەبوو، بگەڕێنەوە خوا بەزەیی‌بێتەوە پێتاندا، لەمڕۆ بەدواوە گریان نیە}.

ئیدی هاوەڵانی پێغەمبەر دەستپێشخەریان دەکرد لە لاواندنەوەی (حەمزە) و بەرز ڕاگرتنی ڕەوشتە زۆر مەزنەکانیدا..

لەو بارەیەوە (حەسانی کوڕی سابت) لە چامەیەکی درێژیدا دەڵێت:

دع عنك داراً قد عفا رسمها      وابكي على حمزة ذي النائل
اللابس الخيل إذا أحجمت      كالليث في غابتـه، الباسـل
أبيض في ذروة من هاشـم      لم يمر دون الحـق بالبـاطـل
مـال شهيدا بين أسـيافكم      شلت يدا وحشـي من قاتـل

واتە: واز لەو خانوە بهێنە کە دروستکردنی تەواو بووەو بۆ حەمزەی پایەبەرز بگری، ئەو پیاوەی کە خۆی کۆدەکردەوەو سواری ئەسپەکەی دەبوو، وەك شێری بەجەرگ وابوو لە بێشەکەیدا.. سپی بوو لە بنەچەدا و نەوەی هاشم بوو، بەسەر حەقدا نەدەڕۆشت بە ناڕەوا لەنێو شمشێرەکانتاندا شەهید بوو، هەردوودەستی وەحشی بکوژەکەی بشکێت.

* * *

عبداللەی کوڕی رەواحەش دەڵێت:

| | |
|---|---|
| بکت عینیی وحقّ لها بکائها | وما یغني البکاء ولا العویل |
| علی أسد الإله غداة قالوا : | أحمزة ذاکم الرجل القتیل |
| أُصیب المسلمون به جمیعاً | هناك وقد أُصیب به الرسول |
| أبا یعلی، لك الأرکان هـدّت | وأنت الماجـد البرّ الوصـول |

واتە: چاوەکانم ئەشکیان رشت و حەقیشیان بوو کە گریان، گریان و رۆڕۆ چ سودێکی هەیە جا.. بەسەر شێری خودادا، کاتێك بەیانی وترا: ئەرێ ئەو پیاوە کوژراوە حەمزەیە، کۆستی هەموو موسڵمانان کەوت لەوێدا و پێغەمبەریش غەمبار بوو بۆی. ئەبا یەعلی، دەست و پێی بێهێز کردین، تۆ سەرفراز و چاك و پەرۆش بوویت.

* * *

(صەفیەی کچی عبدالمطلب)ی پوری پێغەمبەرﷺ و خوشکی حەمزەش وتی:

| | |
|---|---|
| دعاه إله الحقّ ذو العرش دعوة | الی جنـــة یحیـا بهـا، وســرور |
| فذلـك ما کنا نُرجّـي ونـرتـجي | لحمزة یـومِ الحشـر خیر مصیر |
| فوالله لا أنسـاك ما هبت الصّبا | بکاءً وحزناً، محضري ومسیري |
| عَلی أسـد الله الذي کانَ مِدْرَها | یَـذُودُ عَن الاسـلامِ کـلَ کَفُـورِ |
| أقول وقد أعلی النّعيُ عشـیرتي | جـزی الله خیـراً من أخ ونصیـر |

واتە: خودای حەقی خاوەن تەخت بانگهێشتی کرد بۆ ئەو بەهەشتەی تێدا بە ئاسودە ئـەژی.. ئـەوەش خواسـت و ئومێـدی ئێمـە بـوو بـۆ حـەمزە کـە لـە رۆژی حەشـردا باشـترین سەرئەنجامی هەبێت.. سوێند بەخوا تا شنەبای بەیانی هەڵکات لە بیرت ناکەم، گریان و خـەم و پەژارە، خۆشی و خامۆشیمە،، بۆ شێری خودا کـە ویـستی پاراسـتنی ئیـسلام بـوو لـە هـەموو بێباوەڕێـك، دەڵـێم و شـیوەنی هۆزەکـەم بـەرز دەکەمــەوە، خـوا پاداشـتی بـرا چـاك و سەرخەرەکەمان بە چاکترین شێوە بداتەوە..

لەگەڵ ئەوەشدا باشترین لاواندنەوەی بۆن و بەرامەدار لە یاددا وتەکانی پێغەمبەر بوو کاتێ لەسەر لاشەی راوەستا، ئەو ساتەی لەنێو شەهیدەکانی جەنگدا بەدی کرد و فەرمووی:

{بەزەیی خوات لەسەر، بەراستی تۆ-ئەوەندەی من بزانم- پەیوەنـدی خزمایـەتیت بـەجێ دەگەیاند و، زۆر کاری چاکەت ئەنجام دەدا}...

* * *

بەراستی پەژارەی پێغەمبەر ﷺ بۆ حەمزەی مامی مـەزنی زۆر قـورس بـوو.. سەرەخۆشـی لێکردنیش تێـدا کـارێکی سـەخت بـوو.. لەگـەڵ ئەوەشـدا قـەدەر جـوانترین سەرەخۆشـی بـۆ پێغەمبەر لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبوو.

لە ڕێگای گەڕانەوەیدا لە ئوحودەوە بۆ ماڵ، پێغەمبەرﷺ بەلای ئافرەتێکی هۆزی (بەنی دینار)دا تێپەڕی کرد کە باوکی و، مێردەکەی و، برایەکی شەهید بووبوون..

کاتێك چاوی بە موسڵمانان کەوت لە جەنگ دەگەڕانەوە، بە پەلە بەرەو لایان ڕۆشت و دەنگ و باسی شەڕەکەی لێدەپرسین..

هەواڵی مەرگی مێرد و... باوك و... براکەیان پێدا...

ئەمجا بە پەرۆشیەوە لێی پرسین:

{ئەی پێغەمبەری خوا چی لێ هاتووە}...؟؟

وتیان: {زۆر باشە... سوپاس بۆ خوا چاکە هەروەك تۆ پێت خۆشە}...!!

وتی: {نیشانم بدەن، هەتا سەیری بکەم}..!!

لەگەڵی ڕۆیشتن تا لە پێغەمبەرﷺ نزیك بوویەوە، کاتێك چاوی پێی کەوت بەرەو ڕووی ڕۆشت و وتی:

{هەموو کۆستێك لەدوای تۆ، کارێکە و ئاسان دەبێت}...!!

*　　*　　*

بەڵێ... ئەمە جوانترین و زیندووترین سەرەخۆشی بوو..

پێدەچێت کە پێغەمبەرﷺ بۆ ئەو دیمەنە گەورەو بێوێنەیە زەردەخەنە گرتبێتی، چونکە لە دونیادا هەوڵ و، خۆشەویستی و، خۆبەختکردنی هاوشێوەی ئەوە نیە..

ئافرەتێکی... لاوازی، بێدەستەڵات، لە یەك ساتدا باوکی و، مێردەکەی و، براکەی لە دەست بدات.. کاردانەوەی بەرانبەر ئەو کۆستە لە ساتی بیستنی ئەو هەواڵەدا کە کێو لەبن دێنێ ئەوەبوو:

{ئەی پێغەمبەری خوا چی لێهاتووە}...؟؟!!

بەراستی ئەوە دیمەنێك بوو کە قەدەر بەچاکی وێنای کێشا و ساتەکەی دیاریکرد تا بیکاتە سەرەخۆشی بۆ پێغەمبەر... بەڵام چ سەرەخۆشییەك.. سەرەخۆشی بێت بۆ شێری خودا و، سەرداری شەهیدان..!!

١٢

# عبداللەی کوڕی مەسعود

## یەکەمین کەس بە ئاشکرا قورئانی خوێند

بەر لەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بچێتە ماڵی ئەرقەمەوە، (عبداللەی کوڕی مەسعود) باوەڕی پێ هێنابوو، بووبووە شەشەمین کەسی موسڵمان بووی شوێنکەوتەی پێغەمبەرﷺ
کەواتە لەو کەسانەیە زۆر زوو باوەڕیان هێنا...
لەبارەی یەکەمین دیداری لەگەڵ پێغەمبەری خوادا دەڵێت:
{گەنجێکی تازی پێگەیشتوو بووم، مەڕەکانی (عوقبەی کوڕی ئەبی موغیث)م دەلەوەڕاند، پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکر هاتن، وتیان: ئەی گەنج، شیرت لایە بەشمان بدەیت..؟؟
وتم: ناتوانم بتان دەمێ، لەبەر ئەوەی هی خۆم نیە و من لایان دانراوم..
ئەمجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی مەڕێکت لایە هێشتا قسر بێت و، کەلی نەگرتبێت..؟؟
وتم: بەڵێ...
هێنام بۆ لایان، پێغەمبەر گرتی و دەستی بە گوانیدا هێنا و لە پەروەردگاری پاڕایەوە گوانەکانی پڕشیر بوو.. پاشان ئەبوبەکر بەردێکی ناو چاڵی هێنا و، دۆشیە ناوی و، ئەبوبەکر لێی خواردەوە، دوای ئەوە منیش خواردمەوە.. ئینجا بە گوانەکەی فەرموو: بچۆرەوە جێی خۆت، ئەویش چووەوە جێی خۆی..
پاش ئەوە چوومە خزمەت پێغەمبەر و، وتم: لەو قسانەم فێر بکە.
فەرمووی: تۆ گەنجێکی فێرکراوییت}...

* * *

(عبداللەی کوڕی مەسعود) سەرسام بوو کاتێکی بەندەیەکی چاکی خودا و پێغەمبەرە دەست پاکەکەی بینی لە پەروەردگاری دەپاڕێتەوە و دەست دەهێنێت بە گوانێکدا کەوادەی شیردانی هێشتا نەهاتووە، ئەویش لە خێر و رزق و رۆزی پەروەردگار شیرێکی پوختی پالێوراوی دا بۆ خواردنەوە..!!
ئەو رۆژە نەیدەزانی، کە ئەوەی بینیویەتی ساناترین و بچوکترین موعجیزەیە و، لەکاتێکی نزیکدا لەو پێغەمبەرە موعجیزەی وەها بەدی دەکات کە دونیا دەهەژێنێت و، پڕ لە رووناکی و رێنوێنی دەکات...
بگرە ئەو رۆژە نەیدەزانی، ئەو کە منداڵێکی هەژاری لاوازی کرێگرتەیەو شوانی مەڕەکانی (عوقبەی کوڕی ئەبی موغیت)ە دەبێتە یەکێك لە موعجیزەکان، رۆژگارێك کە ئیسلام دەیکاتە

بڕوادارێکی وەها بە ئیمانەکەی لوتبەرزی قورەیشیەکان هەرەس پێدێنێ و ستەمکاری گەورەکانی دەبەزێنێت..

دەڕوات لە کاتێکدا کە ئەو نەیدەوێرا بەلای مەجلیسێکدا تێپەڕێت کە یەکێك لە سەرکردەکانی مەککەی تێدا بێت، مەگەر سەری نەوی بکردایە و هەنگاوەکانی هێواش بنایە.. دەڵێن: پاش موسڵمان بوونی بەرەو لای دەستەیەك لە گەورەپیاوانی قورەیش دەچێت لای کەعبە، لەکاتێکدا کە هەموو پیاوماقوڵانی قورەیش و سەرکردەکانی لەوێ دانیشتبوون و، بەسەر سەریانەوە رادەوەستێت، قورئانی خودا بە دەنگە کاریگەرە بەرزەکەی دەخوێنێت:

بسم الله الرحمن الرحيم ﴿الرَّحْمن، علَّم القرآن، خَلَقَ الإِنسَانَ، عَلَّمَهُ الْبَيَانَ، الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ، وَالنَّجْمُ وَالشَّجَرُ يَسْجُدَانِ﴾ الرحمن ١-٦.

پاشان بەردەوام دەبێت لەسەر خوێندنەوەکەی و، سەرکردەکانی قورەیش حەپەساون، باوەڕیان نەدەکرد بەوەی کە چاوەکانیان دەیبینی و... بەوەی کە گوێیەکانیان دەیبیست.. هەرگیز لەو باوەڕدا نەبووە کە ئەو کەسەی لە دژی دەسەلات و لوت بەرزی ئەوان وەستاوە.. کرێ گرتەی یەکێکە لەوان و، شوانی مەڕەکانی پیاوماقوڵێکیانە.. (عبداللەی کوڕی مەسعود)ی هەژاری نادیار و نەناسراوە..!!

با لێگەڕێین کەسێك کە بەچاوی خۆی ئەو دیمەنە کاریگەرەی بەدی کردووە بۆمانی بگێڕێتەوە.. کە ئەویش (زوبەیر)ە رضي الله عنه، دەڵێت:

{یەکەمین کەس کە لەدوای پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئاشکرا لە مەککەدا قورئانی خوێند (عبداللەی کوڕی مەسعود) بوو رضي الله عنه، رۆژێکیان هاوەڵانی پێغەمبەر کۆبوونەوەو وتیان:

سوێند بەخوا قورەیشیەکان هەرگیز گوێیان لەم قورئانە نەبوو بە ئاشکرا بخوێندرێت، ج پیاوێك ئەیدات بە گوێیاندا...؟؟

(عبداللەی کوڕی مەسعود) وتی: من..

وتیان: دەترسین خراپەت بەسەر بێنن، ئێمە پیاوێکمان دەوێت خاوەن هۆز بێت، ئەگەر ویستیان لێی بدەن بیپارێزن...

وتی: وازم لێ بێنن، خوای گەورە دەمپارێزێت..

(ئیبن مەسعود) هات تا لە چێشتەنگاودا گەیشتە سەر کەعبە، پاشان بە دەنگی بەرز ئەمەی خوێند: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ.. الرَّحْمنُ.. عَلَّمَ الْقُرْآنَ﴾، دواتر بەرەو روویان وەستا و خوێندی..

لێی رامان و وتیان: کوڕەکەی (ئوم عەبد) چی دەڵێت..؟؟ لەوە دەخوێنێت کە موحەممەد هێناویەتی، هەستانەوە بۆی و کەوتنە لێدانی دەم و چاوی، ئەویش بەردەوام بوو لەسەر خوێندنەوەکەی هەتا گەیشتە ئەو جێگایەی کە خوای گەورە ویستی لەسەر بوو پێی بگات...

پاشان بە روخسار و جەستەی بریندارەوە گەڕایەوە بۆ لای هاوەڵەکانی، پێیان وت:

ئێمە ئا لەوە ئەترساین بە سەرت بێت..

وتی: دوژمنانی خوا هەرگیز ئاوا بێ نرخ نەبوون لام وەك ئێستا، گەر دەشتانەوێت سبەینێش دووبارەی دەكەمەوە بۆیان..

پێیان وت: بەستە، ئەوەی ئەوان رقیان لێیەتی دات بە گوێیاندا..!!

بەڵێ.. (ئیبن مەسعود) ئەو رۆژەی كە حەپەسا بە پڕبوونی گوانی مەڕە قسرەكە لە شیر كە لە پڕێكدا و بەر لەوەی كە كاتی شیردانی بێت.. ئەو رۆژە نەیدەزانی كە ئەو و هەژاران و كەسانی سادەی وەك ئەو، دەبنە یەكێك لە موعجیزە گەورەكانی پێغەمبەر، ئەو رۆژەی كە بەیداخی ئیسلام هەڵدەگرن و، تیشكی خۆر و رووناكی نیوەڕۆی پێ جێلێژ دەكەن..!!

نەیدەزانی كە ئەو رۆژە نزیكە...

بەڵام زۆر خێرا ئەو رۆژە هات و، زەنگی وادەهاتنی لێیداو، ئەو گەنجە كرێگرتە هەژارە، ونبووە... بووە موعجیزەیەك لە موعجیزەكان..!!

* * *

لەبەر جەنجاڵی ژیان نەدەبینرا...

بگرە دوور لە قەرەباڵغیشی...!!

هیچ جێگایەكی نەبوو لەنێو ئەو كەسانەدا كە خاوەنی سامانێكی زۆر بوون، یا لەنێوان ئەوانەدا كە خاوەنی جەستەیەكی بەهێز بوون، یا لەنێوئەوانەدا كە شتێك پلەو پایەیان پێدرابوو..

ئەو ماڵ و سامانی نەبوو.. جەستەیشی لەڕ و لاواز.. لە پلە وپایەشدا نەناسراو.. بەڵام ئیسلام لەبری هەژارییەكەی باشتری پێ بەخشی و بەختێكی زۆری لە گەنجینەكانی كیسرا و گەوهەرەكانی قەیسەری پێدەدا..!!

لەبری ئەو جەستە لاواز و بێهێزەی، ویستێكی پێ دەبەخشێت كە ستەمكاران لەناو دەبات و، بەشداری دەكات لە گۆڕینی داهاتووی مێژوودا..!!

لەجێی ونبوونەكەیدا نەمریی و زانست و پایەیەكی پێدەبەخشێت كە لە پێشەوەی زانایانی مێژوودا بێت..!

راستێتی پێغەمبەری ﷺ تێیدا بەدی هات، ئەو رۆژەی پێی فەرموو:

((تۆ گەنجێكی فێركراویت))، پەروەردگار فێری كرد، تا بوویە شارەزای نێوئوممەت و، راگری ئەو كەسانەی هەموو قورئانیان لەبەر بوو..

لەبارەی خۆیەوە دەڵێت:

{لە دەمی پێغەمبەرەوە ﷺ حەفتا سورەتم وەرگرتووە، كەس لێم ناباتەوە تێیاندا}..

وەك ئەوەی خوا ویستبێتی پاداشتی بداتەوە، ئەو كاتەی ژیانی خۆی خستە مەترسییەوە لە

پێناوی ئەوەی قورئان بە دەنگی بەرز بخوێنێت و لە هەموو جێگایەکی مەککەدا بڵاوی بکاتەوە لە سالانی دەربەدەری و ئەشکەنجەدان و خوای گەورەش بەهرەی جوان خوێندنەوە و راست تێگەیشتنی واتاکانی پێبەخشیبوو..

پێغەمبەریش هاوەڵەکانی رادەسپارد کە شوێن پێی (ئیبن مەسعود) هەڵبگرن و دەیفەرموو:

((دەست بگرن بە رێگەی کوڕی (ئوم عەبد)ەوە))...

رایدەسپاردن کە لاسایی خوێندنەوەکەی ئەو بکەن و، لێیەوە فێر بن کە چۆن قورئان بخوێننەوە.

پێغەمبەرﷺ دەیفەرموو:

((ئەو کەسەی کە حەز دەکات قورئان وەك خۆی کە هاتۆتە خوارەوە ببیستێت، ئەوا با گوێ لە کوڕەکەی (ئوم عەبد) بگرێت))...

زۆر جاریش پێغەمبەر ﷺ حەزی دەکرد کە گوێبیستی قورئان بێت لە زاری (ئیبن مەسعود)ەوە...

رۆژێکیان پێغەمبەر بانگی کرد و، پێی فەرموو:

((قورئانم بۆ بخوێنەرەوە ئەی عبدالله))...

عبدالله وتی:

(من بۆتی بخوێنمەوە، لەکاتێکدا کە بۆ تۆ هاتۆتە خوارەوە، ئەی پێغەمبەری خوا)؟!

پێغەمبەر پێی فەرموو:

((پێم خۆشە کە لە کەسانی دیکەوە گوێبیستی بم))..

(ئیبن مەسعود) دەستی کرد بە خوێندنەوە لە سورەتی (النساء) هەتا گەیشتە ئەو ئایەتەی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلاَءِ شَهِيدًا، يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُواْ وَعَصَوُاْ الرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّى بِهِمُ الأَرْضُ وَلاَ يَكْتُمُونَ اللّهَ حَدِيثًا﴾ النساء٤١-٤٢.

پێغەمبەری خوا خۆی بۆ نەگیرا و گریا و، چاوەکانی پڕ لە ئەسرین بوون، بە دەستی ئاماژەی بۆ (ئیبن مەسعود) کرد: کە... (ئەوەندە بەسە... ئەی ئیبن مەسعود هێندە بەسە)...

ئیبن مەسعود لەبارەی ئەو بەخششەی خوای گەورە پێی داوە دەدوێت و دەڵێ:

(سوێند بەخوا هیچ ئایەتێکی قورئان نیە کە نەزانم لەبارەی چییەوە هاتۆتە خوارەوە و، هیچ کەس نیە لەمن شارەزاتر بێت لە قورئان، خۆ گەر بزانم کەسێکی دیکە هەیە لە من شارەزاتر بێت دەتوانم بەسواری وشتر پێی بگەم، ئەوا خۆمی دەگەیەنمێ و، منیش لەئێوە چاکتر نیم)!!!

هاوەڵانی پێغەمبەری خواشﷺ لەبارەی ئەو پێشەنگیەوە شایەتیان بۆ داوە.

ئەمیری باوەڕداران (عومەر)ﷺ لەبارەیەوە دەڵێت:

((لێوان لێوە لە شارەزایی))..

ئەبوموسای ئەشعەریش دەڵێت:

((لەبارەی هیچ شتێکەوە پرسیارمان لێ مەکەن تا ئەو دەریای زانیاریەتان لەناودایە)).

تەنها پێشنگێتی لە قورئان و (فقهدا جێی ستایش نەبوو و بەس.. بەڵکو لە پارێزکاری و تەقواشدا هەر لە پێشەوە بوو.

(حذیفە) لەبارەیەوە دەڵێت:

((هیچ کەسێکم نەبینیوە وەك (ئیبن مەسعود) لە پێغەمبەری خوا بکات لە هەڵس و کەوت و خوو ڕەوشت و ئاکاریدا..

هاوەڵانی پارێزکاری پێغەمبەر ﷺ دەیانزانی کە (ئیبن ئوم عەبد) لە نزیکترین کەسیانە لە خواوە))..!!

ڕۆژێکیان چەند هاوەڵێك لای (عەلی کوڕی ابوطالب) ﷺ دانیشتبوون و پێیان وت:

(ئەی ئەمیری باوەڕداران، هیچ کەسمان نەبینیوە لە ڕەوشت جوانی و نەرم و نیانی و زانین و، خۆشی هاونشینی لەگەڵی و، پارێزکاریدا چاکتربێت لە (عبداللەی کوڕی مەسعود)...

ئیمامی عەلی وتی:

سوێندتان دەدەم بەخوا، لەناخی دڵتانەوە بوو...؟؟

وتیان: بەڵێ...

وتی: (خودایە تۆ شاهید بە... خودایە منیش هەمان ئەوەی ئەوان وتیان دەیڵێمەوە، یان چاکتر لەوە..

ئەو قورئانی خوێند و حەڵاڵەکەی حەڵاڵ کرد و، حەرامەکەیشی حەرام کرد.. شارەزا بوو لە ئایندا، لە سوننەتیشدا زانا بوو)..!!

* * *

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کە باسی (عبداللەی کوڕی مەسعود)یان دەکرد، دەیانوت:

کاتێ ڕێ لە ئێمە دەگیرا، ڕوخست بەو دەدرا، هەرچیەك ئێمە ئامادەی نەبوین، ئەو ئامادەی بوو).

مەبەست لەمە ئەوەبوو کە (عبدالله) ﷺ زۆر دەرفەتی لەلایەن پێغەمبەرەوەﷺ بۆ دەرەخسا کە بۆ کەسی دیکە نەڕەخسابوو، لەهەموو کەس زیاتر دەچووە ماڵەکەی، زیاد لە کەسانی دیکەش لە خزمەتیدا دادەنیشت... جیا لە هەموو هاوەڵانی دیکە جێگەی نهێنی و پەنهانی بوو، تەنانەت بە (صاحب السواد) ناویان دەبرد، واتە خاوەنی نهێنی..

ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەڵێت:

(پێغەمبەرمﷺ بینی، وام دەبینی کە ئیبن مەسعود لە کەس وکاری بێت)..

ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ خۆشەویستیەکی زۆر مەزنی بەرانبەری هەبوو، پارێزکاری و زرنگی و، دەروون بەرزییەکەی خۆش دەویست... هەتا پێغەمبەرﷺ لەبارەیەوە فەرمووی:

((گەر بەبێ راوێژی موسڵمانان کەسێکم بۆ ئەمیری دیاری بکردایە، ئەوا فەرمانم دەکرد کە کوڕی (ئوم عەبد) دابنێن).))...

پێشتریش راسپاردەی پێغەمبەرمان بۆ هاوەڵانی خستە روو:

((دەست بگرن بە رێگەی کوڕی (ئەم عەبد)ەوە))...

ئەم خۆشەویستی و، متمانە پێکردنە کردبوویانە شایستەی ئەوەی کە زۆر نزیك بێت لە پێغەمبەری خواﷺ و، ئەوەی بەو بەخشرا بەکەسی دیکە نەدرا کاتێك پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: ((مۆڵەت خواستنت بۆ لای من ئەوەیە پەردە بەرز بکەیتەوە))..

ئەمەش مافی مۆڵەت پێدانی بوو کە لە هەر کاتێکدا بیەوێت، شەو بێت یا رۆژ، لە دەرگای ماڵی پێغەمبەرﷺ بدات.

بەمجۆرە هاوەڵانی لەبارەیەوە دەیانوت:

(ئەگەر رێگری لە ئێمە بکرایە مۆڵەت بەو دەدرا، لەهەر جێیەك نەبوینایە ئەو ئامادە دەبوو)..

لەراستیشدا (ئیبن مەسعود) شایانی ئەو رێزلێنانە بوو.. سەرەڕای ئەوەی کە تێکەڵاوییەکەی بەو جۆرە نزیك بوو، دەیتوانی زۆر خانەخوێی بێت، لەگەڵ ئەوەشدا (ئیبن مەسعود) تەنها ملکەچی و رێز و ئەدەبی پێی زیادی دەکرد..

لەوانەیە چاکترین شتیش بۆ دەرخستنی ئەو ئاکار شیرینە تێیدا، روخساری بێت کاتێك لەبارەی پێغەمبەری خواوە ﷺ دەدوا لەپاش وەفاتی..سەرەڕای زۆر کەم قسەکردنی لەبارەی پێغەمبەرەوە ﷺ، دەبینین کاتێك لێوی بجوڵاندایە تا بڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا دەدوا و دەیفەرموو... موچرکەی توند دەیگرت و شپرزی و دڵەڕاوکێی پێوە دیار بوو، لەترسی ئەوەی نەبادا لەبیری بکات و پیتێك لە جێگای پیتێکی دیکە دابنێت..!!

با گوێبیستی براکانی بین کە لەبارەی ئەو دیاردەیە دەدوێن:

(عەمری کوڕی مەیمون) دەڵێت:

{ساڵێکیان چوومە خزمەت (عبداللەی کوڕی مەسعود)، گوێم لێنەبوو لەبارەی پێغەمبەری خواوەﷺ بدوێت، کەچی رۆژێکیان باسی فەرموودەیەکی کرد بەسەر زاریدا هات: پێغەمبەری خوا فەرمووی، ناڕەحەت بوو تا بینیم ئارەقە بە نێوچەوانیدا هاتە خوارێ، پاشان -وەك ئەوەی بەبیری هاتبێتەوە- وتی: ئەوەی پێغەمبەر فەرمووی نزیك بوو لەمە}...!!

(عەلقەمەی کوڕی قەیس)یش دەڵێت:

{عبداللهی کوڕی مەسعود ئێوارانی هەموو پێنج شەممەیەك وتاری دەدا، لە هیچ ئێوارەیەکیان گوێم لێنەبوو بڵێت: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی.. تەنها جارێك نەبێت.. سەیرم کرد خۆی دابوو بەسەر گۆچانەکەیدا، گۆچانەکەی دەلەرزی و، دەجوڵایەوەو خۆی نەدەگرت}..!!

(مەسروق)یش لە (عبدالله)وە بۆمان باس دەکات:

{رۆژێکیان (ئیبن مەسعود) وتاری دەدا وتی: گوێم لێ بوو لە پێغەمبەری خواوەﷺ... دوای ئەوە لەرزی و جلەکانیشی لەرانەوە.. پاشان وتی: وەك ئەوەی فەرموو... یان نزیك لەوە.}..!!

رێز و بەرز ڕاگرتنی پێغەمبەری خواﷺ لای ئەو گەیشتبووە ئەو ئاستە زۆر مەزنە، ئەمەش لە زیرەکیەکەیەوە سەرچاوەی گرتبوو، بەر لەوەی کە لە تەقواکەیەوە بێت..!!

چونکە ئەو پیاوەی زیاد لە کەسانی دیکە هاودەمێتی پێغەمبەریﷺ کردبێت، بەڕاستی لە پلەو رێزی ئەو پێغەمبەرە تێگەیشتبوو.. پاشان هەڵس و کەوتیشی لەگەڵ پێغەمبەرﷺدا کاتێك کە لە ژیاندا بوو، لە باسکردنیشیدا پاش مردنی، خووڕەوشتێکی نایاب بوو..!!

* * *

لەهیچ گەشت و ئاوەدانیەکدا لە پێغەمبەری خواﷺ دانەدەبڕا...

هەموو دیمەنەکان و، تێکڕای جەنگەکانی بینی... لە رۆژی بەدریشدا لە بەرامبەر ئەبو جەهلدا رۆڵێکی هەبوو شایانی باسکردن بوو، کە لەو رۆژە پایە بڵندەدا شمشێری موسڵمانان لەناویان برد...

جێنشینەکانی پێغەمبەر و هاوەڵانی رێز و قەدری ئاشنا بوون و... ئەمیری باوەڕداران (عومەر) کردیە سەرپەرشتی (بیت المال) لە کوفە، کاتێکیش ناردی بە خەڵکەکەی وت:

{سوێند بەو خوایەی کە هیچ خوایەکی دیکە نیە جگە لەو، ئێوەم لەخۆم لەپێشتر داناوە، دەی ئێوەش لێی وەرگرن و لێی فێر بن}..

خەڵکی کوفەش بەجۆرێ خۆشیان ویستبوو کە کەسی دیکەیان پێشتر لەو زیاتر خۆش نەدەویست.. و کەسیشیان دوای ئەو خۆش نەویستووە..

یەکدەنگی خەڵکی کوفەش لەسەر خۆش ویستنی مرۆڤێك، کارێکە لە موعجیزە دەکات..

چونکە ئەوان یاخیبوو و گێرە شێوێن بوون و، لەسەر یەك خواردن ئارامیان نەدەگرت..!! توانای هێمنی و ئاشتیان نەبوو..

خۆشەویستیان بەرانبەری گەیشتبووە ئەو ئاستەی، کاتێك خەلیفەی موسڵمانان (عوسمان)ﷺ ویستی لەسەر کوفە لای ببات، لە دەوری کۆبوونەوە و، پێیان وت: (لەلامان بمێنەرەوەو مەڕۆ، ئێمەش ناهێڵین تووشی هیچ خراپەیەك بیت لەێی)..

بەڵام (ئیبن مەسعود) بە چەند وشەیەك وەڵامی دانەوە كە دەروون بەرزی و تەقوای دەخاتە روو، پێی وتن:

{گوێڕایەڵی ئەوم لەسەرە و، ئەوە دەبێتە هۆی ئاژاوە و ئاشووب و، منیش پێم خۆش نیە كە یەكەمین كەس بم دەرگاكانی واڵا بكەم}..!!

ئەم هەڵوێستە پایەبڵندە پارێزكارە دەمانگەیەنێتە هەڵوێستی (ئیبن مەسعود) لە ئاست خەلیفەی موسڵمانان (عوسمان)... كە گفتوگۆ وجیاوازیی لەنێوانیاندا دروست بوو تا گەیشتە ئەوەی موچە و یارمەتی (عبدالله) لە (بیت المال) برا.. لەگەڵ ئەوەشدا تەنها وشەیەكی خراپی بەرانبەر (عوسمان) نەدركاند... بەڵكو هەڵوێستی پارێزگاری لێكردن و بەئاگاهێنانەوەی هەبوو، كاتێك بینی پیلان گێران لە سەردەمی عوسماندا دەگۆڕێت بۆ ئاژاوەگێڕی.. و كاتێك هەواڵەكانی لەناوبردنی عوسمانی بیست، وتە بەنرخەكەی وت:

{گەر بیكوژن، كەسی وەك ئەویان پێ ناكرێتە جێنشین}..

هەندێك لە هاوەڵانی (ئیبن مەسعود) دەڵێن:

{هەرگیز نەمان بیستووە (ئیبن مەسعود) قسەیەكی خراپ بە عوسمان بڵێت}..

* * *

خوای گەورە هەروەك چۆن تەقوای پێ بەخشیبوو، بەهەمان شێوە داناییشی پێدابوو.

توانایەكی زۆریشی هەبوو لە بەدی كردنی قوڵایی ناخەكان و، گوزارشت كردن لێی بە جوانی و راست و دروستی.. بۆ نمونە با گوێبگرین لە كاتێكدا كە ژیانی مەزنی (عومەر) كورت دەكاتەوە و لە چڕكردنەوەیەكی سەرسوڕهێنەردا دەڵێت:

{موسڵمان بوونی رزگاركردن(فتح) بوو.. كۆچكردنیشی سەركەوتن بوو.. جێنشینیەكەشی رەحمەت بوو..}.

لەبارەی ئەوەی ئەمڕۆ بە رێژەیەتی كات (نسبية الزمان) ناوی دەبەین، دەدوا و دەیوت:

{پەروەردگارتان شەوو رۆژی لا نیە.. رۆشنایی ئاسمانەكان و زەویشی لە رووناكی روخساریەوەیە}..!!

دەربارەی كار و گرنگێتی لە بەرزكردنەوەی ئاستی ئاكاری خاوەنەكەیدا دەدوا و دەیوت:

{من سەرزەنشتی پیاوێك دەكەم، كە ببینم دەست بەتاڵ بێت و.. هیچ ئیشێكی دونیا و.. هیچ كارێكی دواڕۆژی نەبێت}..

لە وتە كۆكراوەكانیشی:

{باشترین دەوڵەمەندی، دەوڵەمەندی دەروونە و، چاكترین تێشووش تەقوایە و، خراپترین كوێریش كوێری دڵە و، مەزنترین هەڵەش درۆكردنە، خراپترین كاسبێتی سوخواردنە و،

خراپترین خواردنیش خواردنی ماڵی هەتیوە، ئەو کەسەیشی کە خۆ بگرێت خوای گەورە لێی خۆش دەبێت، هەرکەسیش لێبوردەبێت، خوداش لێی دەبوورێت}..

* * *

ئا ئەمەیە (عبداللەی کوڕی مەسعود)ی هاوەڵی پێغەمبەری خواﷺ.

ئەمەیش گۆشەیەکی ژیانە مەزنە شکۆدارەکەیەتی، کە خاوەنەکەی لە پێناوی خودا و پێغەمبەرەکەی و ئاینەکەیدا گوزەراندی..

ئەوەتا ئەو پیاوەی کە لاشەی وەك قەبارەی چۆلەکە وابوو..!!

لاواز، کورت، لەوەدا بوو کە خەڵکی دانیشتوو لە باڵادا لە ئاستی ئەمدا بێت، لەکاتێکدا ئەم بەپێوە وەستابێت...

دوو لاقی لاواز وباریکی هەبوو.. ڕۆژێکیان پێیان سەرکەوتە سەر دارێك تا خورما بۆ پێغەمبەری خواﷺ لێبکاتەوە.. هاوەڵانی پێغەمبەر باریکییەکەیان بەدی کرد پێکەنین، پێغەمبەرﷺ فەرمووی:

{بە قاچەکانی ئیبن مەسعود پێدەکەنن، کە لە کێشانەدا لای خوای گەورە قورسترن لە کێوی ئوحود}..!!

بەڵێ.. ئا ئەمە ئەو هەژار و کرێگرتە لاوازە بێهێزەیە.. کە ئیمان و دڵنیاییەکەی کردیە پێشەوای پێشەنگانی چاکە و ڕێنوێنی و ڕووناکی..

پشکی خۆی لەسەر سەرخستنی خوا و بەخششی پێبڕا، بەوەی کە کردیە یەکێك لە دە هاوەڵە یەکەمینەکەی نێو هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ ئەوانەی لەکاتێکدا لەسەر زەوی بوون مژدەی ڕەزامەندی خوا و بەهەشتیان پێدرا..

لە هەموو جەنگە براوەکانیشدا بەشداری کرد لەگەڵ پێغەمبەرﷺ و.. جێنشینەکانیدا پاشی ئەو.. لەسەردەمی ئەودا بینی مەزنترین دوو ئیمپراتۆریەتی جیهان ڕزگاردەبن و دەروازەکانیان بە ملکەچی و گوێڕایەڵی لەبەردەم بەیداخەکانی ئیسلام و ویستەکەیدا واڵا بن..

پلەوپایەکانی دی کە بە شوێن موسڵمانێکدا دەگەڕا پڕی بکاتەوە و، سەروەت و سامانی زۆریان کەوتبووە دەست، بەڵام هیچ کام لەوانە لەو وادەو بەڵێنەی دوور نەخستەوە کە دابووی بە خودا و پێغەمبەری خوا و.. هیچ ڕێگرێك لە دڵنیایی بۆ لای خوا و ملکەچی و خاکەڕایی و پەیرەوی ژیانی لانەدا..

لەخۆزگە و ئاواتەکانی ژیانیش تەنها خۆزگەیەکی هەبوو، هەموو جارێك خۆزگەی بۆ دەخواست و دووبارەی دەکردەوەو گۆرانی بە باڵادا دەوت و، ئومێدی دەخواست کە پێی بگات..

دەبا گوێ لە خۆی بگرین بۆمانی باس بکات:

{لە جەنگی تەببوکدا لەگەڵ پێغەمبەری خواﷺ بووم نیوە شەو هەستام.. بڵێسەی ئاگرێکم بینی لەلایەکی سەربازگەکەوە بە شوێنیدا تەماشام کرد، سەیرم کرد ئەوە پێغەمبەری خوا و، ئەبوبەکر و عومەرەو، عبداللەی قاچ باریك مردووە و ئەوان چاڵی بۆ هەڵدەکەنن، پێغەمبەری خواش لە چاڵەکەیدایە، ئەبوبەکر وعومەریش دەیدەنە دەستی، پێغەمبەریش دەفەرموێ: براکەتانم بدەنە دەست.. دایانە دەستی، کاتێك ئەلحەدەکەی ئامادە کرد فەرمووی، خودایا من ئێوارەم کردەوەو لێی رازی بووم تۆش لێی رازی بە.. خۆزیا من خاوەنی ئەو چاڵە بوومایە}..

ئەوە تاکە ئاواتی بوو لە دنیادا دەیخواست..

ئەویش-وەك دەبینین- ئەو شتە ناخوازێت کە خەڵك بە ئاواتیەوەن لەسەربەرزی و دەوڵەمەندی و پلەو پایە و ناوبانگ...

چونکە ئەوە ئاواتی پیاوێکی دڵفراوانی دەروون بەرز و یەقین پتەو بوو.. پیاوێك خوای گەورە هیدایەتی دابێت و پێغەمبەر پەروەردەی کردبێت و قورئان پێشرەوی بکات..!!

## ١٣

# حوزه‌یفه‌ی کوڕی یه‌مان

## دوژمنی دووڕوویی و دۆستی قسه‌له‌ڕوو

خەڵکی(مەدائن) پۆل پۆل و دەستەدەستە هاتنە دەرەوە بۆ پێشوازی ئەو والییە نوێیەیان کە ئەمیری باوەڕداران (عومەر) ﷺ بۆی هەڵبژاردبوون...
بەوپەڕی شادی و خۆشییەوە هاتنە دەرەوە بۆ بینینی ئەو هاوەڵە پایە بڵندەی کە زۆریان لەبارەی پارێزکاری و تەقواکەیەوە بیستبوو... زیاتریشیان دەربارەی ناڕەحەتیە سەختەکانی لە رزگارکردنی عێراقدا بەرگوێ کەوتبوو...
لەکاتێکدا ئەوان چاوەڕوانی کەژاوەی هاتوویان دەکرد، پیاوێکی نورانیان لە بەردەم خۆیاندا بینی، بەسواری گوێدرێژێکەوەیە کە کورتانێکی کۆنی لەسەر پشتە و، پیاوەکەش قاچەکانی بەملاو لایدا شۆڕ کردۆتەوە و، کولێرەیەك و کەمەك خوێی بەدەستەوە گرتبو دەیخواردن..!!
کە گەیشتە نێوەندی کۆمەڵەکەیان، ئەوجا زانیان کە ئەوە (حوذەیفەی کوڕی یەمان)ە، ئەو والییەیە کە چاوەڕوانیان دەکرد، وەخت بوو لە خۆشیا باڵ بگرن..!!
بەڵام، سەریان لەچی سوڕدەمێنێ...!!
چاوەڕوانیان دەکرد هەڵبژاردنی عومەر چی بێت...؟!
لە راستیدا ئەوان بەهانەیان هەبوو، چونکە وڵاتی ئەوان چ لە سەردەمی فارسەکان و، چ لە پێشی فارسەکان، والی وەها پایەبڵندی لەم جۆرەی بەخۆوە نەدیوە..!!

*    *    *

حوذەیفە دەرۆشت و، خەڵکەکەیش هەر دەورەیان دابوو، لە دەوری خڕبوویبوونەوە...
کاتێك بینی روویان تێکردووە وەك ئەوەی چاوەڕێبن قسەیان بۆبکات، سەرنجێکی وردی روخسارییانی داو، پاشان وتی:
{ئاگاداربن لە هەڵوێستەکانی ئاشووب}...!!
وتیان: ئەی باوکی عبدالله هەڵوێستەکانی ئاشووب کامەیە...؟
وتی: {بەردەرگای دەستەڵاتدارانە..
یەکێکتان دەچێت بۆ لای ئەمیر یا والییەك، بەدرۆی باوەڕ دەکات و، شتانێکی تێدا وەسف دەکات کە تێیدا نیە}..!!
بەڕاستی چەندە جێی سەرسوڕمانە، ئەوەندەش دەستپێکردنێکی جوان بوو..!!
خەڵکەکە کە ئەوەیان لە والی نوێیان بیست دەست بەجێ بەخۆیاندا هاتنەوە، کە ئەو لە دونیادا هێندەی رقی لە دووڕوویی و بێزارە لێی، رقی لەهیچ شتێکی دیکە نیە.

ئەم دەستپێکەش راسترین گوزارشت بوو لە کەسێتی فەرمانڕەوای نوێ و، لە ڕێبازی فەرمانڕەوایی و والیەتیەکەی...

* * *

(حوذەیفەی کوڕی یەمان) بە سروشتێکی نایابەوە هاتۆتە ژیان و رقی لە دووڕوویيە و، خاوەنی توانایەکی زۆر گەورەیە لە بەدیکردنی ژێربەژێرییە دوورەکانیدا...

لەو رۆژەوەی ئەو و (سەفوان)ی برای لەگەڵ باوکیدا هاتنە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و هەرسێکیان موسڵمان بوون، ئیسلام ئەو بەهرەیەی زیاتر گەشەدار و سەنگینتر دەکرد.. چونکە ئەو هاتە نێو ئاینێکی بەهێزی، پاکی، ئازای، خاوەن بەهاوە.. کە رقی لە ترسنۆکی و، دووڕوویی و، درۆکردنە...

لەسەر دەستی پێغەمبەر بە روون و ئاشکرایی وەك سپێدەی بەیان گۆش کراو، هیچ شتێکی ژیانی نیە لای ئەوان نادیار بێت.. یا لە قوڵایی دەروونیدا پەنهان بێت.. راستگۆ و دەست پاکە.. بەهێزەکانی لەسەر حەق خۆش دەوێت و، رقی لە ماستاوکاران و، ریابازان و، فێڵباز و هەڵخەڵەتێنەرانە...!!

هیچ بوارێکی دیکەی وەها نەبوو کە بەهرەکەی (حوذەیفە) تێیدا گەشە بکات، وەك ئەو بوارە، لە ئامێزی ئەم ئاینەو، لەبەردەستی پێغەمبەردا و، لەنێوەندی ئەو نەوە مەزنەی هاوەڵاندا...!!

بەراستیش بەهرەکەی چاك گەشەی سەند و... لە خوێندنەوەی روخسارەکان و نهێنییەکاندا تایبەتمەندی خۆی وەرگرت... بە یەك تەماشاکردن روخساری دەخوێندەوەو، دەچوویە گۆشە و قوژبنی قوڵاییە شاراوەکان و، نییەتە پەنهانەکانی بەبێ هیلاك بوون ئاشکرا دەکرد...!!

لەمەشدا ئەوەی دەیویست پێی گەیشت... تەنانەت ئەمیری باوەڕداران (عومەر)ﷺ کە کەسێکی زۆر زیرەك و زرنگ و ژیر بوو، بیروبۆچوون و بەرچاوڕوونی حوذەیفەی وەردەگرت، لە هەڵبژاردن و ناسینی پیاواندا.

حوذەیفە لە چاکی و تۆکمەیی بیروبۆچووندا هێندەی پێ بەخشرابوو کە بزانێت چاکە لەم ژیانەدا روون و ئاشکرایە بۆ هەر کەس بیەوێت... خراپەش خۆی لێ هەڵدەکرێت و دەشاردرێتەوە، هەر بۆیە پێویستە لەسەر کەسی هۆشمەند کە توێژینەوە لەسەر خراپە بکات لەوانەی دەیهێنن و، لە شاراوەکانی.

بەمجۆرە (حوذەیفە)ﷺ خۆی یەکلاکردەوە بۆ توێژینەوەی خراپەو خراپەکاران و، دووڕوویی و دووڕووەکان..

دەڵێت:

{خەڵکی لەبارەی چاکەوە پرسیاریان لە پێغەمبەری خواﷺ دەکرد،

بەڵام من لەبارەی خراپەوە پرسیارم لێدەکرد لەترسی ئەوەی نەبادا بمگاتێ...

وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە لە نەفامی و خراپەدا بووین، خوای گەورە ئەم چاکەیەی بۆ ناردین.. ئایا لەدوای ئەم چاکەیە خراپە هەیە..؟

فەرمووی: بەڵێ...

وتم: جا ئایا لەدوای ئەو خراپەیەش چاکە روودەدات..؟

فەرمووی: بەڵێ... خراپیشی تێدا دەبێت..

وتم: خراپیەکەی چیە..؟؟

فەرمووی: کەسانێك دێن سوننەتی من جێبەجێ ناکەن و... رێنمایی دیکە دەگرنە بەر لەبری ئەوەی من هەندێکیان لێ دەناسیت و هەندێکیشیان ناناسیتەوە..

وتم: ئایا لەپاش ئەو چاکییە خراپە روودەدات..؟

فەرمووی: بەڵێ! بانگخوازانێك دێن لە بەر دەروازەکانی دۆزەخن، هەرکەس بە دەمیانەوە بچێت فرێی دەدەنە ناوی...

وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، جا فەرمانت چیە بۆم گەر بەوە گەیشتم..؟

فەرمووی: پابەند دەبیت بە کۆمەڵی موسڵمانان و پێشەواکەیانەوە..

وتم: ئەی گەر کۆمەڵ و پێشەوایان نەبوو..؟؟

فەرمووی: لەو دەستە و رێچکانە گۆشەگیر دەبیت، گەر باوەشت کردبێت بە بنی دارێکدا هەتا دەمریت و تۆ لەسەر ئەوەبە}..!!

چاوتان لە قسەکەی بوو: ((خەڵکی لەبارەی چاکەوە پرسیاریان لە پێغەمبەری خواﷺ دەکرد، بەڵام من لەبارەی خراپەوە پرسیارم لێدەکرد لەترسی ئەوەی نەبادا بمگاتێ))...؟؟

بەراستی (حوذەیفەی کوڕی یەمان) چاوکراوەو بەرچاوڕوون ژیا بەرانبەر چاوگەی ئاشوبەکان و، رێڕەوەکانی خراپە تا خۆیان لێ بپارێزێت و، خەڵکیشیان لێ ئاگادار بکات، ئەمەش چاوەکراوەی کردبوو بەرانبەر دونیا و، شارەزایی لەبارەی خەڵکی و، ناسینی کات و ساتەوەو... لە هۆش و عەقڵیدا بابەتەکانی بە شێوازی فەیلەسوف و، لێزانی دانایەکان تاووتوێی دەکرد..

(حوذەیفە)ﷺ دەڵێت:

{خوای گەورە موحەممەدیﷺ نارد، ئەویش بانگی خەڵکی کرد لە تاریکیەوە بەرەو رووناکی و، لەبێباوەڕییەوە بەرەو باوەڕ، لەنێو خەڵکیشدا ئەوەی ویستی هات بە دەمیەوەو، ئەوەی مردبوو بەهۆی حەقەوە ژیانی هاتەوە بەبەردا...

ئەو کەسەشی کە دەژیا بەهۆی ناڕەواوە ژیانی لەبەر برا...

پاش ئەوە پێغەمبەرایەتی رۆشت و، جێنشینایەتی لەسەر رێبازی ئەو هات...

پاشان دەبێتە پادشاییەکی داگیرکراو..!!

خەڵك هەیە بە دڵ و دەست و زمان بەرهەڵستی دەکات.. ئەو کەسانە بەدەم حەقەوە چوون.. تێشیاندا هەیە کە بە دڵ و زمانی بەرهەڵستی دەکات، بەبێ دەست، ئەمەش لقێکی حەقی واز لێهێناوە...

لەنێویشیاندا هەیە بە دڵ بەرهەڵستی دەکات، بەبێ دەست و زمان، ئەمەش وازی لە دوو لقی حەق هێناوە...

هەیشە لەنێویاندا کە نە بە دڵی، نە بە دەستی، نە بە زمانی بەرهەڵستیان ناکات، ئەمانەش مردوی ناو زیندوەکانن}...!!!

لەبارەی دڵەکان و دەربارەی ژیانی رووناکی و تاریکی تێیدا دەدوا و دەیوت:

{دڵەکان چوار جۆرن:

– دڵێك داپۆشراوە، ئەمەش دڵی بێباوەڕە...

– دڵێك دوودیوە، ئەمەشیان دڵی دووڕووە...

– دڵێکیش رووتە، چرایەکی تێدایە ئەگەشێتەوە، ئەمەش دڵی بڕوادارە..

دڵێکیش هەیە کە دووڕوویی و ئیمانی تێدایە، نمونەی ئیمانیش وەك درەختێك وایە بە ئاوی پاك ئاو بدرێت.. نمونەی دووڕوویش وەك جۆگەیەکە کێم و خوێنی پێدا بڕوات! جا کامیان باڵادەست بوو، ئەوا سەردەکەوێت}..!!

جا شارەزایی حوذەیفە لە خراپەو، سووربوونی لەسەر روبەڕووبوونەوەو بەرپەرچدانەوەی، شتێك لە تیژیان بەخشیبووە زمان و وشەکانی و، خۆی بە ئازایەتیە چاکەکەوە لەوبارەیەوە هەواڵمان دەداتێ، دەڵێت:

{هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەرﷺ و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، زمانێکی تیژم هەیە بەرامبەر خاووخێزانم، دەترسم بەهۆیەوە بخرێمە نێو ئاگر...

پێغەمبەرﷺ پێی فەرمووم، ئەی تۆ بۆ زۆر داوای لێخۆش بوون ناکەیت ..؟؟ من لە رۆژێکدا سەد جار داوای لێخۆشبوون لەخوا دەکەم}...

* * *

ئا ئەوەیە حوذەیفەی دوژمنی دووڕوویی و، دۆستی قسە لەڕوویی..

پیاوێکی لەم جۆرەش، ئیمانەکەی پتەو و تۆکمە دەبێت... و خۆشەویستی و پشتیوانیشی قوڵ دەبێت.. حوذەیفەش لە ئیمان و خۆشەویستی و پشتیوانیدا بەو جۆرە بوو..

باوکی موسڵمانی بەدی کرد لە رۆژی ئوحوددا بە دەستی موسڵمانان کوژرا، کوژرانێکی بە هەڵە و بە کەسێکی بێباوەڕی تێگەیشتبوون...!!

حوزەیفە ئاوڕێکی دایەوە، بینی شمشێرەکان هاتوون بە یەکدا، هاواری لە لێدەرەکەی کرد: باوکمە.. باوکمە.. ئەوە باوکمە..!!

بەڵام ئاکامی هاتبوو..

کە موسڵمانان بەوەیان زانی، ماتەمینی و غەم دایگرتن.. بەڵام ئەو بە سۆز و لێبوردنەوە تەماشای کردن و وتی:

{خوا لێتان خۆش بێت، کە لە هەموو بە بەزەییەکان بەبەزەییترە}...

پاشان بە شمشێرەکەیەوە بەرەو جەنگە هەڵگیرساوەکە ڕۆیشت تا خۆی تێدا تاقیبکاتەوەو ئەرکی سەرشانی بەجێ بێنێ...

شەڕ کۆتایی دێت، هەواڵ دەگاتەوە بە پێغەمبەری خواﷺ، ئەویش فەرمان دەکات کە خوێنی بدرێت لەباتی باوکی حوزەیفە (حوسەیلی کوڕی جابر)ﷺ، بەڵام حوزەیفەی کوڕی بەهانە دەهێنێتەوە و ڕازی نابێت پێی و، هەمووی دابەش دەکات بەسەر موسڵماناندا، بەوەش خۆشەویستی و ڕێزی پێغەمبەر بەرانبەری زیاتر دەبێت..!!

* * *

ئیمان و وەلائی حوزەیفە، ڕازی نابێت بە دەستەوسانی و، لاوازی... بەڵکو بەمەحاڵیش ڕازی نیە..

لە جەنگی (خەندەق)دا، پاش ئەوەی کە دۆڕان بوویە بەشی بێباوەڕانی قورەیش و جولەکە هاوپەیمانەکانیان، پێغەمبەرﷺ ویستی کە ئاگاداری کۆتا گۆڕانکاری هەڵوێستی سەربازگەی دوژمنەکانی بێت..

شەوێکی تاریك و سامناك بوو.. ڕەشەباش گفە گفی دەدایەوەو هاژەهاژی بوو، وەك ئەوەی کە بیەوێت چیا ڕەگو ڕیشەدارەکانی بیابان لەبن دەربێنێ... هەڵوێستەکەش بەو هەموو ئابڵۆقە و سەرسەختی و سووربوونەی لەخۆی هەیبوو و بوو بووە هۆی ترس و تۆقین، برسێتی زۆریش گەیشتبووە ئاستێکی زۆر ناڕەحەت لەنێو هاوەڵانی پێغەمبەرداﷺ

ئا لەو کاتەدا کێ توانا و، هێزی ئەوەی هەیە کە بچێتە نێو مەترسییەکی تاریکەوەو بەرەو سەربازگەکانی دوژمن بچێت و بیبەزێنێت، یان دزە بکات بۆ ناوی، پاشان سەیری حاڵیان بکات و ئاگاداری هەواڵەکانیان بێت...؟؟

پێغەمبەر خۆی لەنێو هاوەڵانیدا کەسێك دیاری دەکات کە بەم چالاکیە گرنگە زۆر ناڕەحەتە هەستێت...

بڵێی ئەو پاڵەوانی کێ بێت..؟؟

هەر ئەوە... (حوزەیفەی کوڕی یەمان)...!

پێغەمبەری خوا بانگی کرد و ئەویش بەجێی هێنا، خۆی بەو راستگۆییە زۆر مەزنەی کە هەیەتی بۆمان باس دەکات و هەواڵەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە، تەنها ئەوەی لە توانادا بوو کە دەبێت داواکەی پێغەمبەر بەجێ بهێنێت.. بەهۆی مەترسی ئەو چالاکیەی کە خرابووە ئەستۆیەوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات و، لەسەرئەنجامەکانی سڵ دەکات و، هەستانیش بە ئەنجامدانی لەژێر باری برسێتی و، سەرما و سۆڵە و ماندوویەتی زۆردا کە بەهۆی ئابڵۆقەی مانگێك یا زیاتری دوژمنانەوە گیرۆدەی بووبوون...!

کاری حوذەیفە ئا لەو شەوەدا سەرسوڕهێنەر بوو..

ماوەی نێوان هەردوو سەربازگەکەی بڕی و، ئابڵۆقەکەی بەزاند و.. دزەی کرد بۆ ناو سەربازگەی قورەیش و، ڕەشەبای توونديش ئاگری سەربازگەکەی خامۆش کردبوو و، تاریکی باڵی بەسەردا کێشابوو، حوذەیفەﷺ لەنێو ریزی جەنگاوەرانیاندا شوێنی خۆی کردەوە..

ئەبوسوفیانی سەرکردەی قورەیش ترسی ئەوەی هەبوو، کە تاریکی ببێتە هۆی دزەکردنی موسڵمانان بۆ ناویان سەرسامیان بکات، هەر بۆیە هات و سوپاکەی ئاگادار کرد... حوذەیفەش گوێی لێبوو بە دەنگی بەرز دەیوت:

(ئەی خەڵکی قورەیش، با هەریەك لەئێوە سەیری هاونشینەکەی بکات و، دەستی بگرێت و بزانێت ناوی چییە)...

حوذەیفە دەڵێت: (منیش خێرا دەستم برد بۆ دەستی ئەوەی تەنیشتم و وتم پێی: ناوت چییە...؟ وتی: فلانی کوڕی فیسار..!!

بەمجۆرە ئامادەبوونی خۆی لەنێو سوپاکەدا بەسەلامەتی دەستەبەر کرد..!

ئەبوسوفیان درێژەی بە بانگەوازەکەی بۆ قورەیش دا و وتی: (ئەی خەڵکی قورەیش... سوێند بەخوا ئێوە ناتوانن لێرەدا ڕۆژ بکەنەوە.. بەراستی وڵاخەکان-واتە حوشتر و ئەسپەکان هیلاك بوون... (بەنوقورەیزە)ش ناپاکیان لێکردین و هەواڵی ناخۆشمان لێیانەوە پێ گەیشتووە، بە هۆی ڕەشەبای توونديشەوە دەبینن چیمان بەسەر هاتووە.. مەنجەڵەکانمان ڕاناوەستێت و، ئاگرمان بۆ ناکرێتەوەو.. چادرەکانمان بۆ ڕاناگیرێت.. بار بکەن، ئەوا منیش بار دەکەم)..

پاشان چووە سەر وشترەکەی و، دەستی بە ڕۆشتن کرد و، جەنگاوەرانیش بە شوێنیدا کەوتنە ڕێ..

حوذەیفە دەڵێت: (ئەگەر لەبەر فەرمانی پێغەمبەری خواﷺ نەبوایە کە هیچ شتێك ئەنجام نەدەم، بە تیرێك (ئەبو سوفیان)م دەکوشت)..

حوذەیفە گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ و هەواڵەکەی پێگەیاند و ئەو مژدەیەی پێدا..

* * *

ئەو کەسەی سەرنجی حوزەیفە بدات لە بیرکردنەوەو، شێوازی کارکردنی و...لە سەرقاڵبوونی بە زانست و زانیارییەوە رابمێنێت، هیچ پاڵەوانێتیەکی لە مەیدانی شەڕ و کوشتاردا لێ چاوەڕوان ناکات..

لەگەڵ ئەمەشدا.. حوزەیفە لەم بوارەدا هەموو گومانەکانی دەسڕیەوە ...و

ئەو پیاوە خواپەرستە، سەرنجدەرە، هەر کە شمشێرەکەی هەڵدەگرت و رووبەڕووی سوپای بت پەرستی و تاریکی دەبوویەوە تواناى لەرادەبەدەر و سەرسوڕهێنەری خۆی دەخستە روو کە جێگەی سەرسام بوون بوو.

بەسە بۆمان کە بزانین، ئەو سێیەمین کەس، یان پێنجەمین کەس بووە، لەنێو ئەو هاوەڵانەی دەستپێشخەری مەزن بوون لە رزگاکردنی هەموو عێراقدا..!

هەمەدان و، رەی و، دەینەوەر، لە سەردەستی ئەو رزگار کران..

لە جەنگی (نەهاوەند)ی مەزنیشدا، کە فارسەکان لە سەد و پەنجا هەزار جەنگاوەردا خۆیان دەنواند.. ئەمیری باوەڕداران (عومەر)، (نوعمانی کوڕی موقرەن)ی هەڵبژارد بۆ سەرکردایەتی سوپای موسڵمانان و، نامەیشی نووسی بۆ (حوزەیفە) کە سەرکردایەتی سوپایەك بکات و لە کوفەوە بەرەو لای بچێت..

(عومەر) نامەی خۆی بۆ جەنگاوەران نارد و، نووسی:

{کە موسڵمانان کۆبوونەوە، با هەر ئەمیرەو بەسەر لەشکری خۆیەوە بێت... و با (نوعمانی کوڕی موقرەن) سەرکردەی هەموو لەشکرەکان بێت..

گەر (نوعمان) شەهید کرا، ئەوا با (حوزەیفە) ئاڵاکە هەڵبگرێت.. گەر ئەویش شەهید بوو، با جەریری کوڕی عبداللە) بیگرێتەدەست}..

بەمجۆرە، ئەمیری باوەڕداران سەرکردەکانی جەنگی هەڵدەبژارد، هەتا ناوی حەوتیانی هێنا..

هەردوو سوپا بە یەك گەیشتن..

فارسەکان بە سەد و پەنجا هەزار کەسەوەو..

موسڵمانەکانیش بە تەنها سی هەزارەوە.. زیاتر نا..

جەنگ بەشێوەیەکی کەم وێنە بەرپابوو.. بەجۆرێك کە لە هەموو جەنگەکانی مێژوو زیاتر گیانفیدایی و توندوتیژی تێدابوو..

(نوعمانی کوڕی موقرەن) شەهید بوو... بەر لەوەی کە ئاڵای موسڵمانەکان بەربێتەوە سەر زەوی، سەرکردەی نوێ بە دەستی راستی لێی وەرگرت و، شنەبای سەرکەوتن لەنێو دەنگ و هەرا و تێکۆشانێکی زۆر مەزندا شەکاندیەوەو.. ئەو سەرکردەیەش تەنها (حوزەیفەی کوڕی یەمان) بوو..

دەست بەجێ ئالآکەی گرتە دەست و، فەرمانیدا کە هەواڵی مردنی نوعمان بڵاونەبێتەوە هەتا جەنگەکە کۆتایی دێت و، (نەعیمی کوڕی موقرەن)یشی بانگ کرد و وەك رێزلێنانی خستیە شوێنەکەی (نوعمان)ی برای..

هەموو ئەوانەی بە تێگەیشتنە پرشنگدارەکەی لە چەند چرکەساتێکدا ئەنجام دا–جەنگیش هەر درێژەی هەبوو–..

پاشان وەك ڕەشەبای لەبن هێنەر کەوتە وێزەی سوپای فارسەکان و هاواری کرد:

{الله أکبر، بەڵێنەکەی راست بوو!!

الله أکبر، سەربازەکانی خۆی سەرخست!!}

دواتر جڵەوی ئەسپەکەی سوڕاندەوەو بەرەو لای جەنگاوەرانی سوپاکەی و هاواری لێکردن:

ئەی شوێنکەوتووانی موحەممەد... ئەوەتا بەهەشتەکانی خوا سازدەدەن بۆ پێشوازیتان، دەی ئێوەش درێژە بە چاوەڕوانی مەدەن...

دەی ئەی پیاوانی بەدر..

بۆ پێشەوە، ئەی پاڵەوانانی خەندەق و، ئوحود و، تەبوك..

حوذەیفە توانی هەموو جۆش و خرۆشی جەنگەکە بپارێزێت، گەر زیادی نەکردبێت بۆی..

جەنگەکەش بە دۆڕانی فارسەکان کۆتایی پێهات.. دۆڕانێکی زۆر خراپ.. دۆڕانێك کە خەریکە هاوشێوەی نەبێ..!!

*　　*　　*

ئەم بلیمەتە لە داناییەکەیدا، کاتێك خواپەرستیەکەی لە تەکدابێت..

بلیمەت لە خۆیەختکردنیدا، کاتێك لەسەر گۆڕەپانی جەنگ رادەوەستێت..

ئەو بەو جۆرە بوو، بلیمەت بوو لە هەموو چالاکیەکدا کە پێی دەسپێردرا و، لە هەموو راوێژێکدا کە داوای لێبکرایە..

کاتێك (سەعدی کوڕی ئەبو وەقاس) و ئەو موسڵمانانەی کە لەگەڵیا بوون لە (مەدائن)ەوە گواستیانەوە بۆ (کوفە) و تیایدا نیشتەجێ بوون..

ئەمەش پاش ئەوەی کە کەش و هەوای (مەدائن) زیانێکی زۆری لە عەرەبە موسڵمانەکان دا، کە ئەوەش وای لە (عومەر) کرد نامە بنوسێت بۆ (سەعد) پاش ئەوەی گەڕا بەدوای جێگایەکی زیاتر گونجاودا دەست بەجێ ئەوێ بەجێ بهێڵێت و، موسڵمانەکانی بۆ بگوێزێتەوە..

ئا لەو رۆژەدا کێ کاری هەڵبژاردنی ئەو شوێن و جێگایەی پێ سپێردرا..؟

بە (حوذەیفەی کوڕی یەمان) سپێردرا.. لەگەڵ (سەلمانی کوڕی زیاد)دا رۆشت تا شوێنێکی گونجاو بۆ موسڵمانان بدۆزنەوە.

کاتێك گەیشتنە خاکی کوفە، کە لەو کاتەدا زەویەکەی لماوی رووت بوو، حوذەیفە بە هەواوە بۆنی کرد و، بە هاوڕێکەی وت: ئەمە دەبێتە شوێنمان بە ویستی خوا..

بەم شێوەیە نەخشەی کوفە کێشرا و دەستی ئاوەدانکردنەوەی پێگەیشت و کردیە شارێکی ئاوەدان..

هەر کە موسڵمانەکان گواستیانەوە بۆ ئەوێ، نەخۆشەکانیان چاك بوونەوەو، لاوازەکانیان هێزیان هاتەوە بەبەردا و، دەمارەکانی خوێنیان بوژایەوە..!!

بەراستی حوذەیفە خاوەنی زیرەکییەکی بەرفراوان و، ئەزموونێکی هەمەچەشن بوو، هەمیشە بە موسڵمانانی دەوت:

{چاکترین کەستان ئەوانەتان نین کە واز لە دونیایان دەهێنن بۆ دواڕۆژ.. و ئەوانەشتان نین کە واز لە دواڕۆژ دەهێنن بۆ دونیا.. بەڵکو ئەوانەیەکە لەمیش و لەویش وەردەگرن}.

* * *

لە یەکێك لە ڕۆژەکانی ساڵی سی وشەشی کۆچیدا.. بۆ دیداری پەروەردگاری بانگکرا.. لەکاتێکدا کە ئەو خۆی بۆ دوایەمین گەشتی سازدەکرد هەندێك لە هاوەڵانی هاتنە لای، لێی پرسین:

ئایا کفنتان لەگەڵ خۆ بۆ هێناوم..؟؟

وتیان: بەڵێ..

وتی: نیشانم بدەن..

کاتێك بینی، سەیری کرد تازە و جوانە..

دوا زەردەخەمەی گاڵتەئامێز کەوتە سەر لێوەکانی و، پێی وتن:

{ئەم کفنە بۆ من نابێت.. بەڵکو من دوو لەفافی سپیم بەسە کە کراسی لەگەڵدا نەبێت..

چونکە من بۆ کەمێك لە گۆڕدا دەمێنمەوە، دواتر دەگۆڕدرێت بۆ چاکتر لەو.. یان خراپتر لەو}..!!

چەند وشەیەکیشی لەبەر خۆیەوە درکاند، ئەوانەی لەوێ دانیشتبوون گوێیان بۆ رادێرا...

{سڵاو لە مردن...

خۆشەویستێك بەخۆشی هات..

ئەوەی پەشیمان بێت سەرکەوتوو نیە}..

ئەوەی وت و گیانێك لە مەزنترین گیانەکانی مرۆڤ و، لە زۆریەیان بەتەقوا درەوشاوە و ملکەچتر بەرەو لای خوای گەورە بەرز بوویەوە..

گەر خەڵکانێك هەبووایە لە بەهەشتدا لەدایك بوونایە و، لە سایەیدا پێبگەیشتنایەو گەورەببونایە، دواتر بهێنرایەتە سەر زەوی تا ببێتە رازێنەرەوەی و، رووناکی بۆی، ئەوا (عەممار) و (سومەییە)ی دایکی و (یاسر)ی باوکی لەو کەسانە دەبوون..!!

بەڵام ئێمە بۆ دەڵێین: ئەگەر.. بۆچی ئەم گریمانەیە دەکەین، لەکاتێکدا کە خاووخێزانی یاسر بەراستی لە پێڕی بەهەشتیان بوون..؟؟

پێغەمبەریشﷺ تەنها دڵنەوایی نەدەکردن بەس، کاتێك فەرمووی:

{خاووخێزانی یاسر ئارام بگرن، وادەی ئێوەی لەناو بەهەشتە}...

بەڵکو بڕیاری حەقیقەتێکی دەدا کە ئاشنای بوو و، واقیعێکی دووپات دەکردەوە بەچاوی خۆی دەیبینی و بەدی ئەکرد..

* * *

(یاسری کوڕی عامر)ی باوکی (عەممار) شارەکەی خۆی لە وڵاتی (یەمەن) بەجێ هێشت و بەدوای برایەکیدا دەگەڕا و، پرسیاری دەکرد..

شوێن و رێی مەککەی بە دڵ بوو، تێیدا گیرسایەوەو بووە هاوپەیمانی (ئەبوحوذەیفەی کوڕی موغیرە)...

(ئەبوحوذەیفە)ش یەکێك لە خزمەتکارەکانی کە ناوی (سومەیەی کچی خەیات) بوو لێ مارەکرد..

لەم ژن هێنانە پیرۆزەشدا خوای گەورە (عەممار)ی پێبەخشین..

زۆر زووش موسڵمان بوون.. وەك ئەو چاکەمەندانەی خوای گەورە هیدایەتیدان..

هەروەها هاوشانی ئەو چاکەمەندانەی پێشین کە پشکی خۆیان لە سزاو ئەشکەنجەو ناڕەحەتی قورەیشیەکان چەشت..!!

لەو کاتەدا قورەیش زۆر چاوی لەسەر ئەوەبوو بڕواداران بەلایەکدا بکەون..

خۆ گەر لەو کەسانە بوونایە کە خاوەن هۆز و رێز و پاڵپشتن، ئەوا بە هەڕەشە و گوڕەشە رووبەڕووی دەبوونەوە، (ئەبوجەهل) بە هەر باوەڕدارێکیان بگەیشتایە پێی دەوت: وازت لە ئایینی باووباپیرانت هێناوە کە ئەوان چاکتر بوون لەتۆ.. خەونت بە با دەدەین و.. رێزت ناهێڵین و... بازرگانیەکەت تێك دەشکێنین و.. سەروەت و سامانەکەت تیادەبەین.. پاشان شەڕی دەروونی توندیان لەدژی بەرپا دەکرد.

خۆ گەر بڕوادارەکەیش لە بێدەستەڵات و هەژارانی مەککە بوایە، یا لە کۆیلەکانی، ناڕەحەتیان دەکرد و ئەشکەنجەی زۆریان دەدا..

خانەوادەی (یاسر) لە دەستەی هەژار و بێدەستەڵاتان بوو..

کاری ئەشکەنجەدانیشیان بە (بەنی مەخزوم) سپێردرا، هەموویان دەهێنانە دەرەوە.. یاسر و، سومەیە و، عەممار، دەیانبردنە بەر گەرمای بەتینی مەککە و، بە هەموو جۆر و شێوەیەك بەر دەبوونە گیانیان و ئەشکەنجەیان دەدان!!

بەشی (سومەیە)ش لەم ئەشکەنجەدانەدا سامناك و ترسناك بوو، کە لێرەدا خۆمان لە قەرەی باسکردنی نادەین.. بە پشتیوانی خوا دیدارمان دەبێت لەگەڵ بەڕێزی قوربانیدان و، خۆڕاگرییە مەزنەکەیدا و لەبارەیەوە ئەدوێین لەگەڵ باسی خوشك و هاوشێوە نەمرەکانی ئەو رۆژگارەدا..

لێرەشدا تەنها هێندەمان بەسە بەبێ زیادەڕەوی بڵێین کە (سومەیە)ی شەهید لەو رۆژەدا هەڵوێستێکی وەهای نواند رێزێکی نەبڕاوەی بەخشیە هەموو مرۆڤایەتی، لەسەرەتایەوە تا کۆتایی و، حورمەتێکی پێدا کە بەهاکەی تەواو نابێت..!

هەڵوێستێك، کردیە دایکێکی مەزن بۆ هەموو بڕوادارەکانی تێکڕای سەردەمەکان و، رێزدارانی گشت کات و ساتەکان..!!

* * *

پێغەمبەرﷺ دەهاتە دەرەوە تا بەرەو ئەو جێگایە بڕوات کە دەیزانی خانەوادەی یاسری تێدا ئەشکەنجە دەدرێت..

لەو رۆژانەشدا هۆکاری بەرەنگاربوونەوەو لابردنی سزای هیچ لەدەستدا نەبوو.. ئەوەش ویستی خوا بوو..

چونکە ئاینی نوێ -بەرنامەی بێگەردی ئیبراهیم-.. ئەو ئاینەی (موحەممەد) بەیداخەکەی بەرز دەکاتەوە، بزاڤێکی چاکسازی سەرزاری و رووکەش نیە.. بەڵکو بەرنامەی ژیانە بۆ هەموو مرۆڤایەتی بڕوادار و... دەبێت ئەم مرۆڤایەتی‌یە خاوەن باوەڕەیش کە ئەم ئاینە لەگەڵ مێژوو بە هەموو پاڵەوانێتی و، قوربانیدان و، مەترسیەکانیەوە بۆ بمێنێتەوە..

ئەم هەموو گیانفیدایە چاکانە، ئەو (بنچینە)یەیە کە خۆڕاگرییەکی بێپسانەوەو، جاویدانیەکی لەناونەچووی بە ئاین و بیروباوەڕ دەبەخشی..!!!

ئەمەش (بۆنێکی خۆشی)یە و دڵی بڕواداران پڕدەکات لە دۆستایەتی و خۆزگە و، ئەو (بڵندگۆ)یەیە کە رێنمایی نەوەکان بەرەو لای حەقیقەتی ئاین و راستگۆیی و مەزنیەکەی دەکات..

بەمجۆرە هەر دەبوو ئیسلام ئەو گیانفیدایی و قوربانیانەی هەبێت و چارەیەکی دیکە نەبوو، قورئانی پیرۆزیش لەم چەند ئایەتدا ئەمەی بۆ موسڵمانان روون کردۆتەوە..

ئەوەتانێ دەفەرموێت:

﴿أَحَسِبَ النَّاسُ أَنْ يُتْرَكُوا أَنْ يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لاَ يُفْتَنُونَ: ئاخۆ مەردم لایان وایە هەر کە بڵێن ئێمە باوەڕمان هێناوە، ئیتر وازیان لێدەهێنرێت و تووشی هیچ تاقیکردنەوەیەك نابن؟﴾العنكبوت/٢.

﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَنْ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمْ اللَّهُ الَّذِينَ جَاهَدُوا مِنْكُمْ وَيَعْلَمَ الصَّابِرِينَ: ئاخۆ ئێوە لاتان وایە سەربەخۆ دەچنە بەهەشت؟ کەچی هێشتا خودا خەباتکاران و خۆڕاگرانی ئێوەی دیاری نەکردووە.﴾ال عمران/١٤٢.

﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ: ئێمە ئەوانەی بەر لەمانیشمان تاقیکردەوە، بێگومان خوا ئەوانەی کە راسیان گوت، ئەوانەش کە درۆزنن، دیاری دەکا.﴾العنكبوت/٣.

﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَنْ تُتْرَكُوا وَلَمَّا يَعْلَمْ اللَّهُ الَّذِينَ جَاهَدُوا مِنْكُمْ... : پێتان وایە کەس خۆتان تێناگەیەنێ و خواش لەوانەی لەئێوە چوونە جیهاد بێئاگایە!﴾التوبة/١٦.

﴿مَا كَانَ اللَّهُ لِيَذَرَ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ حَتَّى يَمِيزَ الْخَبِيثَ مِنْ الطَّيِّبِ: خوا هیچ کاتێ باوەڕداران لە بارودۆخێکدا-وا ئێوە هەن- نەهێشتۆتەوە، مەگەر لەبەر ئەوەی ناپاکان لە پاکان هەڵاوێرێ.﴾ ال عمران/١٧٩.

﴿وَمَا أَصَابَكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيَعْلَمَ الْمُؤْمِنِينَ: هەرچی ئەو رۆژە تووشتان هات وا دوو کۆمەڵ بە یەك گەیشتن، گشتی بە ئیزنی خودا بوو، هەتا خاوەن باوەڕەکان نیشان بدا.﴾ ال عمران/١٦٦.

* * *

بەڵێ.. بەم شێوە قورئان وەچەو هەڵگرانی فێرکرد، کە قوربانیدان کرۆکی ئیمانەو، بەرەنگاربوونەوەی دەستدرێژییە ستەمکارەکان بە خۆڕاگری و ئارامگرتن و بەردەوامی.. چاکترین و جوانترین باشیەکانی ئیمان پێکدەهێنێن...

ئا لێرەوە ئەم ئیمانەی خوای گەورە یاساکانی دادەڕێژێت و، رەگ و ریشەی دادەکوتێت و، نمونەکانی دەخاتە روو، پێویست دەکات کە پشتیوانی بوونی بە قوربانیدان بکرێت و بە خوێنەکەی دەروونی خۆی پاکژ بکات و، بۆ ئەم چالاکییە زۆر بەرزە کۆمەڵێك لە نەوەو لایەنگران و پیاوچاکانی هەڵبژێرێت ببنە پێشەنگێکی گەشاوە، نمونەیەکی بەرز بۆ ئەو بڕوادارانەی بەرەو لای دێن.

(سومەییە) و.. (یاسر) و... (عەممار)یش لەو کۆمەڵە پیرۆزە مەزنە بوون کە قەدەرەکانی ئیسلام هەڵیبژاردن تا قوربانیدان و خۆڕاگری و سووربوونیان ببێتە بڕوانامەی مەزنێتی و جاویدانیان..

* * *

وتمان: هەموو ڕۆژێك لەماڵ دەهاتە دەرێ تا بەرەو لای خانەوادەی (یاسر) بڕوات، تا دەستخۆشی لە خۆڕاگری و پاڵەوانێتیەکەیان بکات و.. دڵە گەورەکەشی لە سۆز و بەزەییدا دەتوایەوە کە دیمەنی ئەو سزاو ئەشکەنجەیانی بەدی دەکرد کە لە توانایاندا نەبوو..

ڕۆژێکیان، لە کاتێکدا کە سەردانی دەکرد (عەممار) بانگی کرد:

(ئەی پێغەمبەری خواً سزا و ئەشکەنجەدانمان گەیشتە ئەوپەڕی).

پێغەمبەریش بانگی لێکرد:

{ئارام بگرە (باوکی یەقظان)..

ئارام بگرن خانەوادەی (یاسر)..

جێ ژووانی ئێوە بەهەشتە}..

هاوەڵانی (عەممار) لە زۆر جێگادا دەربارەی سزادانیان دواون.

عەمری کوڕی حەکیم دەڵێت:

{(عەممار) سزا دەدرا، تا هۆشی لەلای خۆی نەدەما و نەیدەزانی چی دەڵێ}.

عەمری کوڕی مەیمونیش دەڵێت:

{بێباوەڕەکان (عەممار)یان بە ئاگر سوتاند، پێغەمبەری خواش لەوکاتەدا بەلایدا تێدەپەڕی، دەستی هێنا بەسەری (عەممار)دا و فەرمووی: ئەی ئاگر سارد و بێ زیان بە بۆ (عەممار)، هەروەك چۆن سارد و بێزیان بوویت بۆ (ئیبراهیم)}..

ئەو هەموو سزایە نەیدەتوانی گیانی (عەممار) ببەزێنێ، ئەگەرچی پشتی ناڕەحەت کردبێت و هێز و توانای کەم کردبێت..

(عەممار) لە ڕاستیدا هەستی بە ماندوویەتی نەکرد، لەو ڕۆژەدا نەبێت کە جەلادەکانی هەموو بلیمەتی خۆیان لە تاوان و دەستدرێژیدا خستە گەڕ و.. لە داخ کردنیەوە بە ئاگر، بۆ ڕاکێشانی لەسەر ئەو زەویە گەرمە بڵێسەدارە لەژێر بەردی گەرمدا و... بۆ نغرۆکردنی لەنێو ئاودا هەتا هەناسەی پێ نەمێنێت و، برین و زامەکانی تەڕ ببێت و بێتە ژان.

ئا لەو ڕۆژەدا، کاتێك لە باری سەختی ئەشکەنجەداندا هۆشی لای خۆی نەمابوو، پێیان وت: ناوی خواوەندەکانمان بەچاك بهێنە، دووبارەیان دەکردەوە لێی و، ئەویش بەبێ هەستکردن بەدوایاندا دەیوتەوە.

هەر لەو ڕۆژەدا، پاش ئەوەی کەمێك هۆشی هاتەوە، ئەوەی کە وتبووی هاتەوە یادی و، ئارامی نەما و، ئەم کارەی لەپێش چاو گەورە بوو تا وەهای سەیر کرد کە هەڵەیەکە و لێبووردن و قەرەبووکردنەوەی نیەو.. لە چەند چرکەساتێکی کەمدا، هەستکرن بە گوناهباری ئەوەندە سزای پێگەیاند کە سزای بێباوەڕانی لە ئاستیدا کەم و خۆش بوو..!!

خۆ گەر (عەممار) بۆ چەند کاتژمێرێك بەو هەستەیەوە وازی لێبهێنرایە دەبوویە هۆی تیاچوونی..

ئەو بەرگەی ناڕەحەتی جەستەی دەگرت، چونکە گیانی لەوێدا بەرز بوو..
بەڵام ئێستا وا تێدەگا کە گیانی شکستی هێنا و، خەم و خەفەت و ترس بەرەو تیاچوون و مەرگی دەبات..
خودای مەزن و باڵادەستیش ویستی وابوو ئەو دیمەنە ورووژێنەرە بکاتە ترۆپکی کۆتاییەکەی..
دەستی پیرۆزی نیگا هات تا تەوقە لەگەڵ (عەممار)دا بکات و، هاواری لێبکات: هەستە ئەی پاڵەوان... هیچ سەرزەنشت و نەنگیەکت لەسەر نیە..
پێغەمبەری خوداشﷺ گەیشت بە هاوەڵەکەی و بینی دەگری، فرمێسکەکانی بەدەستی سڕی و، پێی فەرموو:
{بێباوەڕەکان ئەشکەنجەیان دایت و، لەنێو ئاودا نغرۆیان کردیت، وتت ئاواو... ئاوات...وت؟}
عەممار سەری نەوی کرد و وەڵامی دایەوە:
بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا..
پێغەمبەری خواﷺ بە زەردەخەنەوە فەرمووی: ((گەر هاتنەوە، وەك ئەم قسەیەی ئێستایان پێ بڵێ))...!!
پاشان ئەم ئایەتە پیرۆزەی قورئانی بۆ خوێندەوە:
﴿إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ: مەگەر ئەوکەسەی بەزۆر کوفری پێ بکرێت و دڵیشی لەسەر باوەڕ دڵنیابێت.﴾النحل/١٠٦.
دەروونی (عەممار) سوکنایی بۆ هات، ئیدی هەستی بە ئازاری سزا و ئەشکەنجەی جەستەی نەدەکرد و، هیچ باکی لێی نەبوو..
بەڕاستی گیانی ئەو قازانجمەند بوو، ئیمانەکەشی بەهەمان شێوە قازانجی کرد و... قورئانیش باسی ئەو بازرگانیەی لە خۆ گرت، ئیدی پاشی ئەوە چی دەبێت با ببێ..!!
(عەممار) هێندە خۆڕاگر بوو جەلادەکانی لێی بێزار و ماندوو بوون و، لەبەردەم سووربوونی ئەودا بەچۆکدا هاتن..!!

*    *    *

پاش کۆچکردنی پێغەمبەر و موسڵمانان لە شاری مەدینە جێگیر بوون و، کۆمەڵگای ئیسلامی لەوێ زۆر خێرا پێك دەهات و، خۆی دەگرت و تەواو دەبوو..
لە نێوەندی ئەو کۆمەڵە موسڵمانە باوەڕدارەشدا، (عەممار)یش جێگایەکی بڵندی گرت..!!
پێغەمبەری خواﷺ زۆری خۆشدەویست و، سەرنجی هاوەڵانی بۆ لای ئیمان و ئاکارەکانی رادەکێشا..
پێغەمبەرﷺ لەبارەیەوە دەفەرموێت:

{(عەممار) تا سەر ئێسکەکانی لێوان لێوە لە ئیمان}.

کاتێك لێك تێ نەگەیشتنێکی سەرزاری کەوتە نێوان (خالیدی کوڕی وەلید) و (عەممار)ەوە، پێغەمبەر فەرمووی:

{هەرکەس دژایەتی عەممار بکات، خواش دژایەتی ئەو دەکات، هەرکەسیش دڵی عەممار بڕەنجێنێت، خوای گەورە دڵی دەڕەنجێنێت...}

هەر بۆیە هیچ ڕێگایەکی دیکە لەبەردەم (خالیدی کوڕی وەلید)–پاڵەوانی ئیسلام–دا نەبوو، ئەوە نەبێت کە خێرا خۆی بگەیەنێتە (عەممار) و داوای لێبووردنی لێبکات و، بەو ئومێدەی بەجوانی لێی ببورێت..!!

کاتێکیش پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانی مزگەوتیان لەشاری مەدینە دروست دەکرد، پاش مانەوەیان لەوێ، ئیمامی عەلی ﷺ هۆنراوەیەکی هۆنیبوەوە ودووبارەی دەکردەوەو، موسڵمانانیش لەگەڵیا دەیانووتەوەو، دەیانووت:

لا يستوي من يعمر المساجدا يدأب فيها قائما، وقاعدا

ومن يرى عن الغبار حائدا

واتە: وەك یەك نیە، ئەوەی مزگەوت ئاوەدان دەکات و، پەرستشی تێدا دەکات بە هەستانەوەو دانیشتنەوە، لەگەڵ ئەوەی کە لە تەپ و تۆزاوی‌بوون خۆی لادەدا.

(عەمار)یش لەلایەکی مزگەوتەکەدا کاری دەکرد و، سرودەکەی دەوتەوە و دەنگی بەرز دەکردەوە.. یەکێك لە هاوەڵانی وای گومان برد کە (عەممار) خۆی بەسەردا دەنوێنێ، بۆیە بە هەندێك وشە دڵێ ڕەنجاند، پێغەمبەرﷺ تووڕە بوو، فەرمووی:

{هەقیان چییە بەسەر (عەممار)ەوە..؟؟

بانگیان دەکات بۆ بەهەشت، ئەوانیش بۆ ئاگر بانگی دەکەن..

(عەممار) نووری چاومە}..

جا پێغەمبەری خواﷺ موسڵمانێکی تا ئەو رادەیە خۆش ویستبێت، دەبێت ئیمان و، تاقیکردنەوە و ، دەروون بەرزی و، سەقامگیری دەروون و ڕێڕەوی.. گەیشتبێتە ئەو پەڕی و، لە ترۆپکی تەواومەندیدا بێت..!!

خودای گەورەش لە نیعمەتەکانی خۆی پێ‌بەخشیبوو بە ڕێڕەوی ڕاست ڕێنوێنی کردبوو، لە پلەی باوەڕ و دڵنیاییشدا گەیشتبووە ئەو ئاستەی پێغەمبەری خواﷺ پاکانە بۆ ئیمانی بکات و، لەنێو هاوەڵانیدا بەرزی بکاتەوەو وەك پێشەنگ و نمونە نیشانی بدات و، لەبارەیەوە دەفەرموێت:

{شوێن پێی ئەوانەی دوای من هەڵبگرن.. ئەبوبەکر و عومەر.. و بە ڕێ و شوێنی عەمماردا بڕۆن}..

سەریردەگێڕەوان لەبارەیەوە وتویانە:

(بالابەرز و، چاوشین و، چوارشانە بوو.. لە هەموو کەس زیاتر بێدەنگ دەبوو.. لە هەموانیش کەمتر قسەی دەکرد)..

جا دەبێت ژیانی ئەم کەڵەپیاوە، بێدەنگە، چاوشینە، سنگ پانە، چۆن گوزەرابێت کە جەستەی شوێنەواری ئەشکەنجەی جۆراوجۆری پێوەبوو، هەروەها-لەهەمان کاتدا-بروانامەی خۆڕاگرییە سەرسوڕهێنەر و مەزنیە لەڕادەبەدەرکەی پێبوو..؟!

ژیانی ئەم دۆستە دڵسۆزە و، ئەم بڕوادارە راستگۆیە و، ئەم خۆبەختکارە بەهرەمەندە چۆن گوزەرابێت...؟؟

ئەو لەگەڵ پێغەمبەر و مامۆستاکەیدا هەموو دیمەنەکانی بەدی کرد.. هەر لە بەدر و ئوحود و خەندەق و تەبوکەوە بیگرە.. تا هەموو غەزاکانی دیکە..

کاتێکیش پێغەمبەری خواﷺ وەفاتی کردوبەرەو لای پەروەردگاری بالادەست گەڕایەوە، ئەم کەڵەپیاوە بەردەوام بوو لەسەر ڕۆیشتن..

لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەی موسڵمانەکان لەگەڵ فارس و، لەگەڵ ڕۆمەکاندا و، لە ڕووبەڕووبوونەوەیاندا لەگەڵ سوپای بەلێشاوی هەڵگەڕاوەکاندا، (عەممار) هەمیشە لە ریزی پێشەوەدا بوو..سەربازێکی ئازا و دەست پاك بوو، شمشێرەکەی لە ئاست هیچ لێدانێکدا نەوی نەدەکرد و، بڕوادارێکی پارێزکاری پایەبڵند بوو، هیچ ویستێك لە خوا بێئاگای نەدەکرد..

کاتێك ئەمیری باوەڕداران (عومەری کوڕی خطاب) بەوپەڕی وردبینی و خۆپارێزییەوە والی موسڵمانەکانی هەڵدەبژارد و کێ هەڵبژێرێ، هەمیشە چاوی بەوپەڕی متمانەوە دەکەوتە سەر (عەمماری کوڕی یاسر)..

بەمجۆرە خێرا کردیە والی کوفە و، (ئیبن مەسعود)یشی لەلای کردە سەرپەرشتی (بیت المال)ەکەی.. و نامەی نووسی بۆ خەڵکی ئەوێ و مژدەی هاتنی والی نوێیانی پێدان و وتی:

{من عەمماری کوڕی یاسرم ناردوە بۆ لاتان وەك ئەمیر و.. ئیبن مەسعودیش وەك مامۆستا و وەزیر..

ئەم دوانەش لە خانەدانەکانی هاوەڵانی (موحەممەد)ن، لە بەشداربووانی بەدرن}..

(عەممار)یش بەجۆرێ فەرمانڕەوای دەکردن زۆر گران بوو بەلای ئەو کەسانەوە کە چاوچنۆك بوون لە دونیادا و بەرگەگرتنی سەخت بوو لایان تا گەیشتە ئەوەی گەلەکۆمەکی لێبکەن یا لەوەدابوو ئەنجامی بدەن..

لە راستیدا والێتیەکەی خاکەڕایی و، پارێزکاری و، دونیانەویستی زیادکرد..

(ئیبن ئەبی هوزەیل)، کە لە هاوسەردەمانی کوفەی ئەوە، دەڵێت:

{(عەمماری کوڕی یاسر)م بینی ئەو کاتەی والی کوفە بوو تروزی دەکڕی، پاشان بە پەتێك دەیبەستەوەو ئەیدا بە کۆڵیا و، بەرەو ماڵەوە دەڕۆیشت}..!!!

لەوکاتەدا کەسێکی رەشۆکی بە ئەمیری کوفە دەڵێت: (ئەی گوێبڕاو)، تانەو تەشەری دا لەگوێی کە لە جەنگی یەمامەدا بە شمشێری هەڵگەڕاوەکان قرتابوو.. ئەمیریش کە دەستەڵاتدارە تەنها هێندەی بەو تانە لێدەرە وت:

{جنێوت بە چاکترین گوێم دا... کە لە پێناوی خوادا وای لێهاتووە}..!!

بەڵێ.. لەپێناوی خودا رۆژی یەمامە وای لێهات، ئەو رۆژەش یەکێك بوو لە رۆژە پڕ سەروەرییەکانی عەممار.. کە تێیدا ئەم کەڵەپیاوە گەردەلول ئاسا سوپای (موسەیلەمە)ی درۆزنی دروێنە دەکرد و، بەرەو شکست و تیاچوونی دەبردن..

لەنێو موسڵمانەکانیشدا ساردبونەوەی هەست پێبکردایە بە دەنگە هەژێنەرەکەی هاواری لێدەکردن، ئەوانیش وەك تیری هاوێژراو شاڵاویان دەبرد.

(عبداللەی کوڕی عومەر)ﷺ دەڵێت:

{لەرۆژی یەمامەدا عەماری کوڕی یاسرم بینی لەسەر بەردێکی گەورە بوو، چووبووە سەری و هاواری دەکرد: ئەی کۆمەڵی موسڵمانان.. ئایا لە بەهەشت رادەکەن..؟ من عەمماری کوڕی یاسرم، وەرن بۆ لام.. سەیرم کرد، بینیم گوێی قرتاوەو دەلەرێتەوە، لەکاتێکدا کە زۆر بە گەرمی دەجەنگا}..!!!

هەرکەس گومانی لە مەزنی موحەممەدی پێغەمبەری راستگۆ و، مامۆستای تەواومەند هەیە، با لە ئاست ئەم نمونانەی شوێنکەوتەو هاوەڵەکانیدا هەڵوێستەیەك بکات و، لەخۆی بپرسێت: ئایا کەسی دیکە توانای وەبەرهێنانی دەستەیەکی ئاوا مەزنی هەیە جگە لە پێغەمبەرێکی بەخشندە و، مامۆستایەکی مەزن..؟؟

کە لە پێناوی خوادا دەجەنگان و بەجۆرێ هەڵمەتیان دەبرد وەك چوونە پێشی کەسێك کە بەدوای مردندا بێت، نەك سەرکەوتن..!!

کاتێکیش جێنشین و فەرمانڕەوان، خەلیفە دەچوو مەڕی بێوەژنەکانی دەدۆشی و، هەویری نانی بۆ ماڵەهەتیوو دەشێلا.. هەروەك ئەبوبەکر و، عومەر ئەنجامیان دا..!!

ئەو دەمەی والیش بوون، خواردنەکەی خۆی بە پەت دەبەست و دەیدا بە کۆڵیدا.. وەکو عەممار ئەنجامی دا.. یا دەستیان لە مووچەکەیان هەڵدەگرت و دەهاتن لە پەلکی دارخورما قاپ و زەمیلەیان دروست دەکرد.. وەك سەلمان..!!

دەبا سەری رێز و نەوازش لەئاست ئەو ئاینەدا دانەوێنین کە ئەوانەی وەبەر هێناو، بۆ ئەو پێغەمبەرەی کە پەروەردەی کردن، با لەپێش ئاین و پێغەمبەریشەوە، بۆ خودای باڵادەستی دانەوێنین کە بۆ هەموو ئەوەی هەڵبژاردن و... رێنوێنی کردن بۆی و... کردنیە سەرمەشق بۆ چاکترین ئوممەت کە بۆ خەڵکی نێردرابێت..!!

* * *

(حوذەیفەی کوڕی یەمان)ی پسپۆڕ لە زمانی نهێنیەکان و دڵەکان لە ئامادەسازیدا بۆ دیداری خوا و، لەسەرەمەرگدا بوو، یەکێك لەو هاوەڵانەی کە لە دەوری دانیشتبوون لێیان پرسی: (فەرمانمان بەچی پێدەکەیت، گەر خەڵکی جیاوازیان کەوتە نێو)؟

حوذەیفە لەکاتێکدا کە دوا وشەکانی دەدرکاند، پێی وتن:

{پەیوەست بن بە کوڕی (سومەیە)وە.. چونکە بەراستی ئەو تا مردن لە حەق دانابڕێت}.

بەڵێ.. (عەممار) لەگەڵ حەقدا دەڕوات لەهەر کوێ بێت..ئائێستاش کە ئێمەلەسەر شوێنەواری پیرۆزی هەڵوێستەمان کردووەو، شوێنی شتە دیارەکانی ژیانە مەزنەکەی دەکەوین، وەرن با لە دیمەنێکی مەزن نزیك ببینەوە..

بەڵام، با بەرلەوەی بەرەورووی ئەم دیمەنە ببینەوە لە جوانی و بەنرخیدا.. لەپاکی و تەواومەندیەکەیدا، لە لێبڕان و سووربوونیدا.. لە سەرکەوتن و توانایدا.. وەرن با سەیری دیمەنێکی دیکە بکەین کە لەوەیان لەپێشترە و هەواڵی هاتنی دەدات و خۆی بۆ دەسازێنێت..

ئەوەش کاتی جێگیربوونی موسڵمانان بوو لە مەدینە و، پێغەمبەری دەست پاك و هاوەڵانی چاکەکاری دەوری هەستابوون و، خۆیان تەپ و تۆزاوی کردبوو لەپێناوی پەروەردگاریاندا و، ماڵەکەی ئەویان دروست دەکرد و.. مزگەوتیان بنیات دەنا و... دڵە بڕوادارەکانیان پڕ بوو لە خۆزگە و، لەخۆشیدا دەدرەوشایەوە، سوپاس و ستایشی پەروەردگاری دەکرد..

هەموان بە سنگ فراوانی و هیواوە کاریان دەکرد و... بەردیان هەڵدەگرت، یان قوڕیان دەشێلا، یا دیواریان دروست دەکرد..

دەستەیەك لێرە و، کۆمەڵێك لەوێ..

ئاسۆی بەختەوەریش ئەوەی دووبارە دەکردەوە کە ئەوان بە دەنگە خۆش و ناسکەکەیان بە بەرزی دەیانچڕی:

((لئن قعدنا والنبي يعمل　　　لذاك منا العمل المظلل))

واتە: گەر ئێمە دابنیشین و پێغەمبەر کار بکات، ئەوە کارێکی سەرلێشێواوانەیە بۆ ئێمە.

بەو جۆرە سرودیان دەچڕی و دەیانوتەوە...

پاشان دەنگی گەورەو خۆشیان زیاتر هەڵدەبڕی بۆ چڕینی سرودێکی نوێ:

((اللهم إن العيش عيش الآخرة　　　فأرحم الأنصار والمهاجرة))

خوادایا ژیان، ژیانی دواڕۆژە　　　بەزەیت بێتەوە بە ئەنصار و کۆچکەراندا

سرودی سێیەمیان:

لا يستوي من يعمر المساجدا　　　يدأب فيها قائما، وقاعدا

ومن يرى عن الغبار حائدا

وەك یەك نیە، ئەوەی مزگەوت ئاوەدان دەکات و پەرستشی بەهەستانەوەو دانیشتنەوە تێدا دەکات، لەگەڵ ئەو کەسەی کە لە تەپ و تۆزاوی بوون خۆی لادەدا

ئەمانە دروستکراوەکانی خوان کاردەکەن... سەربازەکانی ئەون و، ئاڵاهەلگری ئەون و، ماڵەکەی دروست دەکەن..

پێغەمبەرە دەسپاك وچاکەکەیشی لە گەڵیاندایە و، قورسترین بەرد هەڵدەگرێت و نارەحەتترین کار ئەنجام دەدات و.. بە دەنگی بەرز و ئاسکیش رازی دەروونی رەزامەند و دڵنیایان دەدرکێنێ و... ئاسمانیش لە سەریانەوە پیرۆزیایی لەزەوی دەکات کە ئەوانەی لەسەر خۆی هەڵگرتووە.. ژیانی گەشاوەیش خۆشترین جەژنی بەخۆیەوە دەبینێت..!!

(عەمماری کوڕی یاسر)یش لەوێدا و لەنێوەندی ئەو ئاهەنگە جەنجاڵەدا بەردێکی قورس هەڵدەگرێت و لەشوێنی خۆیەوە بەرەو جێگای مەبەستی دەبات..

موحەممەدی پێغەمبەری خودا رەحمەتی هیدایەت دەر، چاوی پێکەوت و سۆزی بۆی جوڵا و لێی نزیك بوویەوەو بە دەستی چاکەکاری ئەو تەپ و تۆزەی کە لەسەری نیشتبوو تەکاند و لە روخساری جوانی بڕواداری راما، رامانێکی پڕ لە رۆشنایی خودا، پاشان بە هەموو هاوەڵەکانی دەفەرموێت:

{هاوار لە کوڕی سومەیە..!! کۆمەڵێکی یاخی دەیکوژن}.

بۆ جارێکی تر پێشبینی کردن دووبارە دەبێتەوە.. کاتێك دیوارێك روخا کە ئەو لە بنیدا کاری دەکرد، هەندێك لە براکانی وایان گومان برد کە مردبێت و، هەواڵی مردنی دەبەن بۆ پێغەمبەر و، کاریگەری هەواڵەکە هاوەڵان شپرزە دەکات.. بەڵام پێغەمبەری خواﷺ بەوپەڕی متمانەو دڵنیاییەوە دەفەرموێت:

{عەممار نەمردووە.. کۆمەڵێکی یاخی عەممار دەکوژن}.

جا دەبێ ئەو کۆمەڵە یاخییە کێ بێ..؟؟

کەی بێت و، لە کوێ..؟؟

(عەممار)یش بەچاکی گوێی بۆ ئەو پێشبینیە هەڵخستبوو، وەك گوێ هەڵخستنی کەسێك ئاشنای راستبینی ئەوبەرچاوڕوونیە بێت کە پێغەمبەری مەزنی هەڵیگرتووە..

بەڵام نەترسا.. چونکە لەوەتی موسڵمان بووە لە هەموو چرکەساتێکی شەو و رۆژدا پاڵێوراوە بۆ مردن و شەهید بوون..

رۆژگار گوزەشت و ساڵان تێپەڕین..

پێغەمبەری خوا وەفاتی کرد و بەرەو لای خوای باڵادەست گەڕایەوە.. پاشان ئەبوبەکریش وەفاتی کرد.. دوای ئەوانیش عومەر ...و

(عوسمانی کوڕی عەففان)ی (ذو النورين) جێنشینی گرتە دەست..

پیلان لەدژی ئیسلام تا دوا هەناسە لەکاردابوو، هەوڵی دەدا بەهۆی خیانەت و وروژاندنی ئاشوب ئەوەی لە جەنگدا لەدەستی دابوو بەدەستی بهێنێت..

کوژرانی عومەریش یەکەم سەرکەوتن بوو کە ئەو پیلانانە بەدەستی هێنا و وەك رەشەبایەکی بەتین لەو ولاتەوەی کە ئیسلام کورسی و پادشاکانیانی هەرەس پێهێنابوو دەیدا بەسەر مەدینەدا..

شەهیدبوونی (عومەر) لەخۆبایی‌کردن بۆ ئەوەی بەردەوام بن لەسەر هەوڵەکانیان و، ئاژاوەی نایەوەو گەیاندیە زۆربەی ولاتەئیسلامیەکان.

لەوانەیە (عوسمان) ﷺ وەکو پێویست گرنگی بەکارەکان نەدابێت و خۆی لێ نەپاراستبێت و، بە دەمیەوە نەچووبێت، هەر بۆیە رودواوە سەختەکە روویدا و (عوسمان)ﷺ شەهید بوو، دەروازەی ئاشووب لەموسڵمانان والآ بوو.. (معاویە) دەستی دایە ململانێ لەگەڵ خەلیفەی نوێ(عەلی)داﷺ و داوای مافی خۆی کرد لە کاروبار و خەلیفایەتیدا..

دید و تێڕوانینی هاوەڵانیش هەمەچەشن بوو.. تێیاندا بوو دەستی خۆی لەو جیاوزازییە کێشابووەوەو چووبووەوە ماڵی خۆی و وتەی ئیبن عومەری کردبووە دروشمی:

(هەرکەس وتی وەرە بۆ نوێژ، بە دەمیەوە چووم

هەر کەس وتبێتی وەرە بۆ سەرفرازی، بەدەمیەوە چووم

هەرکەسیش وتبێتی وەرە بۆ کوشتنی برای موسڵمانت وسامانەکەی ببە، وتومە نەخێر)..

لە نێویشیاندا بوو دابوویە پاڵ معاویە..

هەیشیان بوو لەگەڵ عەلی خاوەن پەیمان و خەلیفەی موسڵماناندا بوو..

بڵێی لەو رۆژەدا عەممار لەگەڵ کێدا بێت؟؟

ئەو پیاوەی کە پێغەمبەری خواﷺ لەبارەیەوە فەرمووی:

(بە شوێن رێ و شوێنی عەمماردا برۆن)..؟

دەبێت ئەو پیاوە لەکام لادابێت کە پێغەمبەری خواﷺ لەبارەیەوە فەرمووی:

(ئەوەی دژایەتی عەممار بکات خوای گەورە دژایەتی دەکات)..؟

ئەو کەسەی کە پێغەمبەری خواﷺ گوێبیستی دەنگی ببوایە لە ماڵەکەی نزیك دەبێتەوە دەیفەرموو:

(باشی باشبوو بەخێر بێت، مۆڵەتی بدەن با بێت)..!!

پشتیوانی (عەلی کوڕی أبوطالب)ی کرد، نەك بێلایەن بێ یان دەمارگیر بێ، بەڵکو ملکەچ بوو بۆ حەق و، خاوەن بەڵێن بوو..

چونکە (عەلی) خەلیفەی موسڵمانان بوو، خاوەن بەڵێنی پێشەوایەتی بوو.. لە کاتێکیشدا جێنشینی وەرگرت کە شایانی بوو، لێی دەوەشایەوە..

عەلی بەر لە هەموو ئەوانەو پاش ئەوە، خاوەنی ئەو باشێتیانە بوو کە پلەو شوێنی لای پێغەمبەری خواﷺ وەك پایەی هارون بۆ موسا لێکردبوو.

ئەو عەممارەی کە لەگەڵ حەقدایە بەرەو هەرکوێ بڕوات، بەهۆی ڕۆشنایی بەرچاوڕوونی و دڵسۆزییەکەیەوە ڕێنوێنی دەکرێت بۆ لای تاکە خاوەن مافی ڕاستەقینە لەم ململانێیەدا.. لەو ڕۆژەشدا بەبۆچوونی ئەو تەنها ئیمامی عەلی خاوەن مافی ڕاستەقینە بوو، هەر بۆیە شوێنی خۆی لە پەناوە گرت.

ئیمامی عەلی‌ﷺ بەجۆرێك دڵخۆش بوو بەو پشتیوانی لێکردنەی لەو ڕۆژەدا لەوانەیە بەو شێوەیە دڵخۆش نەبو بێت و باوەڕی زیاتر پتەو بوو بەوەی کە لەسەر حەقە بۆیە پیاوی حەقی مەزن (عەممار) هاتۆتە لای ئەم و لەگەڵیدا ڕێگا دەبڕێت..

ڕۆژی ترسناکی (صەفین) هات.

ئیمامی (عەلی)یش بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو کارە پڕ مەترسیە چوویە دەرەوە کە ئەو بەیاخی بوونێکی دادەنا کە بەرپرسیارێتی خامۆش کردنی لە ئەستۆی ئەودایە..

(عەممار)یش لەگەڵیدا چوویە دەرەوە..

ئەو ساتە (عەممار) تەمەنی نەوەد و سێ ساڵ بوو..

نەوەد و سێ‌ساڵ و، بۆ شەڕ دەچێت..؟؟

بەڵێ.. چونکە لەو بڕوایەدایە کە جەنگ بەرپرسیارێتی و ئەرکی سەرشانیەتی.. و بەشێوەی کەسێکی سی ساڵە توندوتۆڵتر و جوان تر جەنگا..!!

ئەو پیاوەی هەمیشە بێدەنگ بوو، کەم قسەی دەکرد، هەر کە لێوەکانی دەجولاند ئەم نزایەی دەدرکاند:

{پەنا بەخوا دەگرم لە ئاشووب..

پەنا دەگرم بەخوا لە ئاشووب..}

لەدوای وەفاتی پێغەمبەری خواوە ﷺ بەردەوام ئەم وشانە ویردی سەر زاری بوو..

لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاریشدا، ئەم زیاتر دووبارەی دەکردەوە و پەنای دەگرت.. وەك ئەوەی دڵە بێگەردەکەی هەستی بەو مەترسییە هاتووە کردبێ کاتێ ڕۆژەکانی نزیك دەبوویەوە..

کاتێك مەترسییەکەشی ڕوویدا و، ئاژاوە و ئاشوب بەرپا بوو، (عەممار) شوێنی خۆی دەزانی و لە ڕۆژی (صەفەین)دا، لە کاتێکدا تەمەنی نەوەد و سێ ساڵ بوو—هەروەك وتمان— شمشێرەکەی گرت بە دەستیەوە تا حەقێکی پێ سەربخات کە سەرخستنی بە ئەرکی سەرشان دەزانێت..

دید و تێڕوانینی خۆیشی لەبارەی ئەو جەنگەوە ڕاگەیاند و، وتی:

{ئەی خەڵکینە:

بەرەو لای ئەو کەسانە بمانبەن کە وای دەردەخەن تۆڵەی (عوسمان) دەکەنەوە، سوێند بەخوا مەبەستیان تۆڵە سەندنەوەی نیە، بەڵکو چێژی دونیایان کردووە و، بەخۆشی قوتیان

داوە و، دەزانن کە حەق دایاندەبڕێت لەو خۆشی و ئارەزووانەی دونیایان کە کاتیان پێ دەبردە سەر..

ئەو کەسانەش رابوردویەکی وایان نیە لە ئیسلامدا کە شایانی ئەوەبێت موسڵمانان گوێڕایەڵیان بن و، دەستەڵاتدار بن بەسەریانەوە و، دڵیشیان ئەوەندە ئاشنای خوا نەبووە کە وایان لێ بکات شوێنی حەق بکەون...

بەراستیش ئەوانە خەڵکی دەخەڵەتێنن بەوەی کە وای دەخەنە روو تۆڵەی (عوسمان) دەکەنەوە.

تەنها ئەوەیان مەبەستە کە دەستەڵاتدار و پادشا بن}..[1]

---

١ بێگومان عەمماری کوڕی یاسر، کاتێك کە شان بە شانی ئیمامی عەلی دەجەنگا لە بەرامبەر معاویە و لەشکردەکەی خۆیانی پێ لەسەر حەق بوو، چونکە داوای ئەوەیان دەکرد کە معاویە و لەشکرەکەی بێتە ژێر گوێڕایەڵی کردنی ئیمامی عەلی، کاری ئەوانیان بە یاخیبوون و دەرچوون لە فەرمانی خەلیفەی موسڵمانان لە قەڵەم دەدا.

بێگومانیش معاویە و لەشکرەکەی خۆیانیان پێ لەسەر حەق بوو کە ئەم جەنگەیان بەرپاکرد و پێیان وابوو تۆڵە لە بکوژانی ئیمامی عوسمان دەکەنەوە کە ئیمامی عەلی ئەوکات نەیدەویست بیانکوژێتەوە و تۆڵەیان لێ بستێنێتەوە، چونکە ترسی ئاژاوە و ئاشووبی هەبوو و، توانای بەسەریاندا نەبوو، لەبەر ئەوەی ژمارەیان زۆر بوو، دەیویست کوشتنەوەیان دوا بخا تا هەلێکی دەسکەوێ و بیانکوژێتەوە.

ئەوەتا ئەبو دەرداو و ئەبو ئومامە چوون بۆ لای معاویە و پێیان وت لەسەر چی لەگەڵ ئەم پیاوەدا دەجەنگی، سوێند بەخوا لە خۆت و لە باوکیشت زووتر موسڵمان بووە و بۆ خزمایەتی پێغەمبەریش لە تۆ نزیکترە، لە تۆ زیاتر مافی ئەم کارەی هەیە.

معاویەش وەڵامی دانەوە و فەرمووی لەسەر خوێنی عوسمان لەگەڵیدا دەجەنگم، چونکە بکوژانی عوسمان لەلایدا جێیان بوەتەوە، دەی بڕۆن پێی بڵێن با بکوژانی ئیمامی عوسمانمان بەدەستەوە بدات، ئەوکاتە لەناو دانیشتوانی شام من یەکەم کەسم بەیعەتی پێ دەدەم.

ئەبودەرداو و ئەبوئومامەش هەردووکیان چوونە لای ئیمامی عەلی و قسەکەی معاویەیان بۆ گێڕایەوە، ئەویش پێی وتن: لە معاویە زیاتر خەمی خوێنی عوسمانم لەدڵدایە، بەڵام دەبێت بە حەکیمانە تۆڵەی بکرێتەوە، ئا ئەوانەی کە دەیانبینن خەڵکێکی یەکجار زۆر هاتنە دەرەوە و جیابوونەوە و وتیان: ئێمە عوسمانمان کوشتوە، جا کێ دەیەوێ با بێتە بەرانبەرمان و بە گژماندا بێت.

ئەبودەرداو و ئەبوئومامە لە هەڵوێستی ڕاستی هەردووکیان گەیشتن، معاویە لەسەر هەقە کە دەیەوێ تۆڵەی عوشمان بستێنێ و ئیمامی عەلی ڕاس دەکات و تۆڵەسەندنەوە لە بکوژانی عوسمان کاتی نەهاتووە.

پاشان ئاڵاکەی گرتە دەستی و، بەسەریانەوە بە شەکاوەیی بەرزی کردەوە و، هاواری لە خەڵکەکە کرد:

{سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە.. بەم ئاڵایەوە شان بەشانی پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگاوم، ئەوەتانێ ئەمڕۆش دەجەنگم...

سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە.. گەر بە سەرماندا سەریکەون تا دەگەنە (سعفات هجر)

دڵنیام لەوەی کە ئێمە لەسەر حەقین و، ئەوان ناڕەوان}...

خەڵکەکەش شوێنی عەممار کەوتن و، بڕوایان بە راستی قسەکانی هێنا..

(ئەبو عبدالرحمنی سولەمی) دەڵێت:

{لەگەڵ ئیمامی عەلی دا ﷺ بەشداری جەنگی (صەفەین)مان کرد، (عەمماری کوڕی یاسر)م بینی لەهەر لایەکی شەڕەکەوە بووایە، یا لە هەر دۆڵێك لە دۆڵەکانیدا بوایە، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ شوێنی دەکەوتن وەك ئەوەی بەیداخیان بێت}..!!

(عەممار) کە لە جەنگەکەدا دەهات و دەچوو، لەو بڕوایەدابوو کە ئەو یەکێکە لە شەهیدانی... پێشبینیەکەی پێغەمبەر ﷺ بە پیتی گەورە لەبەرچاویدا دەدرەوشایەوە:

((کۆمەڵێکی یاخی عەممار دەکوژن))...

لەپێناوی ئەوەشدا لە ئاسۆی جەنگەکەدا بەم هۆنراوەیە دەنگی دەدایەوە:

{ئەمڕۆ بە ئازیزانم شاد دەبمەوە...

بە موحەممەد و، هاوەڵەکانی}!!

پاشان وەك موشەکێکی ئاراستەکراو بەرەو شوێنی معاویە و ئەو ئەمەوییانەی کە لە دەوری بوون دەچوو بە دەنگی بەرز هاواری لێدەکردن:

لەسەر هاتنە خوارەوەی لێمان دان.

ئەمڕۆش لەسەر خراپ راڤەکردنی لێتان دەدەین، لێدانێك سەرتان لەلاشە بکاتەوە و هاوڕێ لە هاوڕێی بێ ئاگا بکات، یان حەق بگەڕێتەوە شوێنی خۆی..

---

ئەمەش هەڵوێستی عەمماری کوڕی یاسرە کاتێك کە قەیسی کوڕی عوبباد پرسیاری لێدەکات ئایا ئەم جەنگەی کە لە بەرانبەر معاویە دەیکەن فەرمانێکە لە پێغەمبەری خواتان وەرگرتووە، یان بۆچوونێکی خۆتانە کە قابیلی ڕاستی و هەڵەیە. ئەویش لە وەڵامدا وتی: بەڵکو بۆچونێکی خۆمانە و پێغەمبەری خوا فەرمانی ئاوای نە بە ئێمە و نە بە هیچ کەسێك نەکردووە.

سەرچاوە: (الخلفاء الراشدون بين الأستخلاف والأستشهاد)، (معاویەی کوڕی ئەبی سوفیان)ی مامۆستا حبیب محمد سعید. (لێکۆڵەر)

مەبەستیشی لەمە ئەوەبوو کە هاوەڵە دێرینەکانی پێغەمبەر، کە عەمماریش یەکێکیانە، دوێنێ دژی ئەمەویەکان شەڕیان کرد کە ئەبوسوفیان ئاڵاهەڵگری بێباوەڕی بوو، سوپای بێباوەڕانی بەڕێوە دەبرد..

دوێنێ لە دژیان جەنگان، چونکە قورئانی پیرۆز بە ئاشکرایی فەرمان بە شەڕکردن دەکات لەگەڵیان لەبەر ئەوەی موشریك بوون..

بەڵام ئەمڕۆ، با موسڵمانیش بووبن و، با قورئانی پیرۆزیش بە ئاشکرا فەرمان بە کوشتنیان نەکات، ئیجتهادی عەممارﷺ لە گەڕانی بە دوای حەقیقەت و، تێگەیشتنی لە مەبەستەکانی قورئان و ویستەکانی گەیاندبوویانە ئەو بڕوایەی لەدژیان بجەنگێت تا حەقی داگیر کراو دەگەڕێتەوە بۆ لای خاوەنی و، تا بۆ هەمیشە ئاگری ئاشووب و هەڵگەڕانەوە خامۆش ببێت..

هەروەها مەبەستیشی ئەوە بوو، ئەوان لە دوێنێدا دژی ئەمەویەکان جەنگان بەهۆی باوەڕ نەبوونیان بە ئاین و بڕوا نەبونیان بە قورئان...

ئەمڕۆش... بەهۆی لادانیان لە ئاین و، شێواندنی قورئان و خراپ لێکدانەوە و ڕاڤەکردنی و، هەوڵدانیان بۆ گونجاندنی ئایەتەکانی لەگەڵ ویست و ئارەزوو و پێویستییان لە دژیان دەجەنگن..!!

ئەوەتا تەمەنی نەوەد و سێ ساڵەو دواین جەنگی ژیانی بەجەرگ و ئازایانە ئەنجام دەدات..

بەر لەوەیش کە کۆچ بکات لێی کۆتا وانەی خۆڕاگری لەسەر حەق دەدا بەگوێی ژیاندا و، دواین هەڵوێستی مەزن و، بەڕێز و، فێرکاری بۆی بەجێ دەهێڵێت...

پیاوانی معاویە بەپێی توانا هەوڵیاندا عەممار دوور بخەنەوە تا بەشمشێری ئەوان نەکوژرێت، چونکە ئەو کاتە بۆ خەڵکی روون دەبێتەوە کە ئەوان (کۆمەڵە یاخیبەکە)ن، بەڵام ئازایەتی عەممار کە خۆی بەتەنها وەك سوپایەك لەدژیان دەجەنگا، هۆشی لەلا نەهێشتبوون.

هەندێك لەسەربازەکانی معاویە بۆ دەرفەتێك دەگەڕان برینداری بکەن، تا هەلیان بۆ هەڵکەوت و پێکایان..

* * *

لەشکری معاویە زۆرێك لە تازە موسڵمان بووانی لەخۆ گرتبوو.. کە بەهۆی رزگار بوونی ئەو وڵاتە زۆرانەی ئیسلام ئازادی کردن لەژێر چنگی رۆم و فارس.. زۆربەی ئەوانە بوو بوونە سووتەمەنی ئەو جەنگە ناوخۆییە کە بەهۆی ملکەچ نەبوونی معاویە بۆ پەیماندان بە عەلی وەك خەلیفە و، ئیمام هەڵگیرسا.. ئەوانە سووتەمەنی جەنگ بوون، و ئەو نەوتە بوون کە بڵێسەی ئاگرەکەیان زیاتر دەکرد..

ئەم رووداوە پڕ مەترسیە، دەکرا بە هێمنی و ئاشتی چارەسەر بکرایە گەر کاروبار بەدەست موسڵمانە پێشینەکان بووایە.. بەڵام بەر لەوەی بگاتە ئەوپەڕی توونی و تیژی دەستی کەسانێکی پێ گەیشت کە ئایندەی ئیسلامیان بەلاوە گرنگ نەبێت، و ئاگرەکەیان زیاتر خۆش دەکرد و بڵێسەدارتریان دەکرد..

بەیانیەك هەواڵی کوژرانی عەممار بڵاو بوویەوە و، موسڵمانان لە نێو خۆیاندا پێشبینیەکەی پێغەمبەری خوایان ﷺ بۆ یەکدی باس دەکرد کە رۆژگارێکی زۆر بەر لە ئێستا هاوەڵان لە کاتی دروستکردنی مزگەوتی مەدینەدا گوێبیستی بوون..

{هاوار لە کوڕی سومەیە، کۆمەڵێکی یاخی دەیکوژن}..

خەڵکەکە ئێستا دەزانن، ئەو کۆمەڵە یاخییە کێیە.. ئەو کۆمەڵەیە کە عەمماری کوشت.. ئەویش بەدەستی سوپای معاویە کوژرا..

هاوەڵانی عەلی بەمە ئیمانیان زیاتری کرد..

دەستەی معاویەش، گومان کەوتە داگیر کردنی دڵیان و، هەندێکیان ئامادەبوون بۆ هەڵگەڕانەوە و چوونە لای ئیمامی عەلی..

معاویە هەر کە ئەو هەواڵەی بیست، خێرا لەماڵ هاتە دەر و بەناو خەڵکیدا بڵاوی کردەوە کە ئەو پێش بینیە راستە و، پێغەمبەری خواﷺ پێشبینیەکەی تەواو دەرچوو کە عەممار کۆمەڵێکی یاخی دەیکوژن..

بەڵام کێ عەمماری کوشت..؟ پاشان هاواری لەو خەڵکە کرد کە لەگەڵیدا بوون و وتی:

((ئەوانە عەمماریان کوشت کە لە ماڵەکەی خۆی هێنایانە دەرێ و شەڕیان پێی کرد))..

هەندێك لەوانەی هەواو ئارەزوو لە دڵیاندا بوو بەو لێکدانەوەیە فریویان خوارد و، جەنگ لەسەر ڕەوتی خۆی بەردەوام بوو تا گەیشتە کاتی دیاری کراوی.

* * *

بەڵام عەممار.. ئیمامی عەلی لەسەر سینگی خۆی هەڵیگرت بەرەو ئەو شوێنەی کە لەگەڵ موسڵماناندا نوێژی لەسەر کرد بردی، پاشان بە جلەکانیەوە بەخاکیان سپارد..

بەڵێ، بەو جلانەیەوە کە بەخوێنی پاکی سوور بوویوو.. جا هەمووئاوریشمی دونیا و (دیباجە)ی دەست نادەن بۆ ئەوەی ببنە کفنی شەهیدێکی پایەبەرز و، دونیاویستێکی خواپەرستی وەکو عەممار..

پاشان موسڵمانان بە سەرسوڕمانەوە لەسەر گۆڕەکەی راوەستان..!!

پێش چەند ساتێك عەممار لە نێوانیاندا بوو، لە گۆڕەپانی شەڕدا هۆنراوەی دەچڕی.. دەروونی پڕ لە خۆشییەکی زۆر سەیری مژدەبەخش بە گەڕانەوە بۆ نیشتمانەکەی دەکرد و، هاواری دەکرد:

{ئەمڕۆ بە ئازیزانم شاد دەبمەوە، بە موحەممەد و هاوەڵەکانی}...!!!!

بڵێی ئەمڕۆ وادەیی هەبوبێت لەگەڵیان و زانیبێتی و، لە چاوەڕوانی کاتەکەیدا بووبێت..؟؟!!

هاوەڵان لە یەکدیان دەپرسی:

یەکێکیان بە هاوەڵەکەی وت: ئەرێ ئەو دەمەو ئێوارەی ئەو ڕۆژەت لە یادە لە مەدینە لە خزمەت پێغەمبەری خواداﷺ دانیشتبووین و.. لەناکاو روخساری گەشایەوەو و فەرمووی:

{بەهەشت بۆ عەممار بە پەرۆشە}..؟؟

هاوەڵەکەی وتی بەڵێ، هەر ئەو ڕۆژە ناوی کەسانی دیکەشی برد... لەوانە عەلی و، سەلمان و بلال...

کەواتە بەهەشت بە پەرۆش بوو بۆ عەممار..

کەوابێ، پەرۆشییەکەی درێژەی کێشا و، ئەم خۆی ڕاگرتبوو تا هەموو ئەرکەکانی بەجێ بهێنێت و، دوا ئەرکی سەرشانیئەنجام بدات..

لە ڕاستیدا بەجوانی بەجێی هێنا و، بەچاکی جێبەجێی کرد..

وادەی وەڵامدانەوەی بانگی ئەو پەرۆشیە هات کە لە بەهەشتی بەرینەوە بانگی لێدەکرد..؟؟

بەڵێ.. وەختی وەڵامدانەوەی ئەو بانگکردنەیە و... پاداشتی چاکەش هەر چاکەیە.. بەمجۆرە ڕمەکەی دانا و ڕۆشت..

کاتێکیش خۆڵی سەرگۆڕەکەی بەدەستی هاوەڵانی لەسەر لاشەی ڕێکدەخرا، گیانی دەست لەملانی چارەنووسی بەختەوەری بوو لەوێ.. لە بەهەشتی نەمریدا، کە پەرۆشییەکەی بۆ عەممار درێژەی کێشا..!

## ١٥

# عوبادەی کوڕی صامیت

# سەردەستەی کۆمەڵە موسڵمانان

یەکێکە لەو ئەنصارییانەی، کە پێغەمبەری خواﷺ لەبارەیانەوە فەرموویەتی:
{ئەنـصاریەکان بەهــەر شــوێن و رێگەیەکـدا بــڕۆن، منــیش بــە هــەمان شــوێن و رێــی ئەنصاریەکاندا دەڕۆم و، گەر هیجرەتیش نەبووایە ئەوا من یەکێك بووم لە ئەنصاریەکان}..
(عوبادەی کوڕی صامیت) جگە لەوەی کە ئەنـصارییە، یەکێکیشە لـەو سـەرکردانەیان کـە پێغەمبەر کردیە سەردەستەی کەس و کار و هۆزەکانیان..
کاتێك شـاندی یەکـەمی ئەنـصار هـات بـۆ مەککە تـا پـەیمان بدات بـە پێغەمبـەر لەسـەر مسوڵمان بوون، ئەو پەیماندانەی کە بە (عەقەبەی یەکەم) ناسـراوە، (عوبـادە)ﷺ یـەکێك بـوو لەو دوازدە بڕوادارەی کە زوو بەدەم ئیسلامەوە هاتن و، دەستی راستیان بۆ لای پێغەمبـەرﷺ درێژکرد و پەیمانیان پێدا و، دەستیان توند گوشی و بوونە پشتیوانی موسڵمانان.
کاتێك بۆ ساڵی داهاتوو وەرزی حەج هـات (پـەیمانی عەقەبـەی دووەم)ی بـەخۆوە دی، کـە شاندی دووەمی ئەنصار پەیمانیان دا، کە لە حـەفتا بـڕواداری پیـاو و ژن پێکهـاتبوو، لەمەشـدا (عوبادە) یەکێك بوو لەسەرکردەکانی شاندەکە و سەردەستەی ئەنصاریەکان.
لەوەبەدواوە دیمەنەکان یەك لەدوای یـەك دەهـاتن و.. هەڵوێـستی قوربانیـدان و کۆشش و، خۆبەختکردن بەدوای یەکدا دەهات، (عوبادە) لەهەموو ئەوانەدا بۆ تەنها جارێـك دوانەکـەوت و، رژدی نەکرد لە قوربانیداندا...
لـەو کاتـەوەی کـە خـودا و پێغەمبەرەکـەی هەڵبـژارد، بـە چـاکترین شـێوە هەڵدەسـتا بـە شوێنکەوتنی ئەو هەڵبژاردنە، هەموو وەلائـی بـۆ خـوا بـوو.. تێکـڕای پەرسـتشی بـۆ خوابـوو.. گشت پەیوەندییەکانی بـە خـزم و هاوپـەیمانـەکانی و دوژمنانیـەوە، بـەپێی ئیمانەکـەی و، ئـەو ئاکارەی کە ئیمانەکەی بەسەریدا دەسەپاند ئەنجامی دەدا..
بنەماڵەی (عوبـادە) وابەسـتەی هاوپـەیمانێتیـەکی دێـرین بـوون لەگـەڵ جولەکـەکانی (بـەنو قەینقاع) لە مەدینە..
لەو کاتەوەش کە پێغەمبەر و هـاوەڵانی کۆچیـان کـرد بـۆ مەدینـە و، جولەکـەکانیش وایـان خستە روو حەقیان بەسەریەوە نیە، هـەتا ئـەو رۆژانـەی پـاش جـەنگی بـەدر و بـەر لـە شـەڕی ئوحود هـات و جولەکـەکانی مەدینـە دەستیان دایـە خراپـەکاری و.. یـەکێك لـە هۆزەکانیـان -بەنوقەینقاع- پـەنایان بـردە بـەرهۆکاری ئاشـووب و ئاژاوەنانـەوە بـۆ موسڵمانەکان.. هـەر کـە (عوبـادە) ئـەو هەڵوێـستەیانی بـەدی کـرد، بەڵێنەکـەی لەگـەڵ هەڵوەشـاندنەوەو کۆتـایی بـە هاوپەیمانێتیەکەیان هێنا و، وتی:

{پشت بە خوا و، پێغەمبەر و، بڕواداران دەبەستم}..
ئایەت هاتە خوارێ و دەستخۆشی لەو هەڵوێست و پشتیوانیەی کرد و، فەرمووی:
﴿وَمَنْ يَتَوَلَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا فَإِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْغَالِبُونَ: هەرکەس پشت لە خوا و پێغەمبەرەکەی و بڕواداران بکات، ئەوا هەر کۆمەڵی خوا سەرکەوتوون.﴾المائدة/٥٦.

* * *

ئەم ئایەتە پیرۆزە دامەزراندنی کۆمەڵی خودا(حزبی خودا)ی ڕاگەیاند...
حزبی خوداش، هەموو ئەو بڕوادارانەیە کە بەیداخی هیدایەت و حەقیان هەڵگرتووە و لە دەوری پێغەمبەری خوادان ﷺ و، درێژەپێدەری پیرۆزی ریزی ئەو بڕوادارانەن کە بە درێژایی مێژووی کۆن هاتوون و ئەوانیش بە دەوری پێغەمبەر و نێردراوەکانی خۆیان بوون و، لەکات و سەردەمی خۆیاندا پەیامی خودای بەرزی راگری بوونەوەریان گەیاندووە..
حزبی خودا-ئەمجارەیان- تەنها بە موحەممەد ﷺ ناوەستێت، بەڵکو لەرێی نەوەکانی داهاتوو و سەردەمەکانی دیکەوە بەردەوام دەبێت، تا زەوی و ئەوەی لەسەریەتی کۆدەکاتەوە لای خودا و، هەموو بڕوادارێك بەخودا و پێغەمبەرەکەی لەخۆ دەگرێت..
بەمجۆرە، ئەو پیاوەی کە ئەم ئایەتە پیرۆزەی لەسەر دابەزی و دەستخۆشی ئەو هەڵوێستەی لێکرد و وەلائو ئیمانەکەی پتەوتر دەکات، تەنها وەك سەردەستەیەکی ئەنصارەکان لە مەدینەدا نامێنێتەوەو بەس، بەڵکو دەبێتە یەکێك لە سەردەستەکانی ئەم ئاینە کە هەموو لایەکانی زەوی پێی دەگات..
بەڵێ، (عوبادەی کوڕی صامیت) بوو بە سەردەستەی هۆزەکەی خۆی لە خەزرەج و، سەرکردەیەك لەسەرکردەکانی ئیسلام و پێشەوایەك لە پێشەوایانی موسڵمانان کە ناوی وەك ئاڵا لە زۆربەی وڵاتانی سەرزەویدا دەشەکێتەوە، نەك بۆ نەوەیەك، یان دوو نەوە، یا سێ، بۆ هەموو نەوەکان و... ماوەکانی داهاتوو... کات و سەردەمەکان.. بەڵکو بۆ تا خودا ویستی لەسەر بێت!!

* * *

ڕۆژێکیان گوێی لە پێغەمبەری خواﷺ بوو لەبارەی بەرپرسیارێتی ئەمیر و والییەکانەوە دەدوا..
گوێی لێ بوو پێغەمبەرﷺ باسی ئەو چارەنووسەی دەکرد کە چاوەڕێی هەرکەسێکە کە لە حەقدا زیادەڕەوی بکات، یان سامانێك دەخاتەئەستۆی خۆی و فێڵی تێدا دەکات.. ئەمجا لەرزێکی زۆری لێهات و، سوێندی خوارد بەخوا کە هەرگیز نەبێتە ئەمیری دووکەس..
سوێندەکەی خۆیشی بردە سەر..

لەکاتی جێنشینی (عومەر)داﷺ، (عومەر) نەیتوانی رازی بکات پلە و پایەیەك وەربگرێت، تەنها فێرکردنی خەڵکی و تێگەیاندنیان لە ئاینی نەبێت..

بەڵێ.. ئەوە تەنها کارێك بوو کە (عوبادە) لە ئەستۆی گرت و، خۆی لەهەموو کاروبارێکی دیکە کە پڕبوو لە خۆشی و، دەستەڵات و، دەوڵەمەندی و، دوورخستەوە کە مەترسی هەیە بۆ سەر ئاین و چارەنووسی.

بەمجۆرە کۆچیکرد بۆ شام لەگەڵ (مەعازی کوڕی جەبەل) و، (ئەبودەرداء)دا و... ئەو وڵاتەیان پڕ لە زانست و زانیاری و رووناکی کرد.

پاشان (عوبادە) بەرەو فەڵەستین رۆشت و بۆ ماوەیەك کاری قازییەتی گرتە دەست و، بەناوی خەلیفە (معاویە)وە وەك والی ئەوێی بەڕێوە دەبرد..

(عوبادەی کوڕی صامیت) لە کاتێکدا نیشتەجێی شام بوو چاوی بڕیبووە ئەودیوی سنوور و.. سەیری مەدینەی منەوەری پایتەختی ئیسلام و مەڵبەندی جێنشینایەتی دەکرد و، تێیدا (عومەری کوڕی خطاب)ی بەدی دەکرد.. کە پیاوێکە هاوشێوەی نیە..!!

(عوبادە)ش لە پێڕی یەکەم بوو کە باشترین و مەزنترین و کاریگەرترین رۆژانی ژیانی لەگەڵ پێغەمبەری ئازیزدا گوزەراندبوو.. ئەو نەوەیەی کە تێکۆشان وەبەری هێنا و بە قوربانیدان نەخشەی سازکرد و، بە ویستی خۆی ئیسلامی هەڵبژارد نەك لە ترسا.. گیان و سامانیشی لەپێناوی خوادا بەخشی..

(عوبادە) لەو پێڕە بوو کە موحەممەد بە دەستی خۆی پەروەردەی کردن و، لە گیان و، رووناکی و، مەزنی خۆی بەهرەوەری کردن...

خۆ گەر لەنێو زیندوواندا کەسێك هەبێت لە ژیاندا بێت و نمونەی بەرزی فەرمانڕەوایی بێت و دەروونی (عوبادە) پڕ لە خۆشی و، دڵی پڕ لە متمانە بکات، ئەوە تەنها ئەو پیاوە باڵابەرزە جێگیرەیە کە لەمەدینە دادەنیشێت.. (عومەری کوڕی خطاب)ە..

جا (عوبادە) گەر هەڵس و کەوتەکانی (معاویە)ی بەو پێوانەیە بپێوایە، ئەوا زۆر لە یەکدی دووربوون و، پێکدادان هەر دەبوو ببێت و... بوویش..!!

* * *

(عوبادە)ﷺ دەڵێت:

{پەیمانمان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ کە لەبەر خوای گەورە لە لۆمەی لۆمەکاران نەترسین}..

(عوبادە)ش چاکترین کەس بوو بۆ بەڵێن بردنە سەر.. کەواتە ئەو سڵ ناکات لە (معاویە)ی خاوەن ئەو هەموو دەسەڵاتە و، لەدژی هەموو هەڵەکانی رادەوەستێت..

خەڵکی فەڵەستین ڕۆژێکیان شتێکی زۆر سەیریان بینی و.. هەواڵی ئەو بەرەنگاربوونەوە جەسورانەیەی (عوبادە) بەرامبەر (معاویە) گەیشتبووە زۆربەی وڵاتانی ئیسلام و بوو بە پێشەنگ و چرا..

سەرەڕای ئەو نەرمییە فراوانەی (معاویە)ی پێناسرابوو، هەڵوێستەکانی (عوبادە) دڵتەنگی کرد و هەڕەشەیەکی راستەوخۆی بەرانبەر هەیبەتی دەسەڵاتی خۆی تێدا بەدی کرد.

(عوبادە)ش لەلای خۆیەوە سەیری کرد مەودای جیاوازی نێوان ئەو و معاویە زیاتر و فراوانتر دەبێت، هەربۆیە بە (معاویە)ی وت: ((سوێند بەخوا هەرگیز لە یەك جێگادا لەگەڵ تۆدا نیشتەجێ نابم)).. ئەوەبوو فەڵەستینی بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ مەدینە..

* * *

ئەمیری باوەڕداران (عومەر) خاوەنی زیرەکییەکی مەزن و، کەسێکی دووربین بوو.. زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ڕێگەنەدات کەسانی وەك (معاویە) ببنە واڵی کە پشت بە زیرەکی خۆیان دەبەستن و لەرادەبەدەر بەکاری دەهێنن بەبێ ئەوەی کە هیچ کۆمەڵە هاوەڵێکی پارێزکاری دونیانەویست و ئامۆژگاریکار و دڵسۆزیان لە دەورە بێت، تا جڵەی سەرکەشی چاوچنۆکی و ئارەزووی ئەو والییانە بگرن و، تا بۆ ئەوان و بۆ خەڵکیش ببنە یادهێنەرەوەی هەمیشەیی ڕۆژانی پێغەمبەر و سەردەمی ئەو..[1]

---

١ لەراستیدا ئیمامی عومەر یەکەمجار کە معاویەی کردە واڵی شام لاشی نەدا لەسەر کارەکەی تا سەردەمی ئیمامی عوسمان و، هیچ کاتێکیش معاویە پشتی بە زیرەکی و لێهاتوی خۆی نەبەستووە، چونکە ئەو پەروەردەی دەستی پێغەمبەر بوو ئیمان و باوەڕێکی بەتینی بەخوا هەبوو، دەشیزانی ئەگەر خوا پشتیوانی نەبێت و یارمەتی نەدات ئەوە بە هیلاك دەچێت، بۆیەش هەموو کاتێك ئەم نزایەی کە پێغەمبەری خوا بۆی کردبوو دووبارەی دەکردەوە و دەیوت: (خوایە موعاویە فێری قورئان و ژمێریاری بکە و لە سزای ڕۆژی قیامەتیش بیپارێزە).

هەروەها معاویە فەرمودەیەکی پێغەمبەری خوایﷺ بیستبوو کە بەردەوام دەترسا هەڕەشەکەی پێغەمبەر ئەویش بگرێتەوە، بەوەی کە شتێك بڵێ و کەسیش نەتوانێ وەڵامی بداتەوە یا ڕەخنەی لێبگرێ.

ئەبوقەبیل لە معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان دەگێڕێتەوە کە معاویە ڕۆژێکی جومعە دەچێتە سەر مینبەر بۆ ئەوەی موسڵمانان تاقی بکاتەوە. لە ناو وتارەکەیدا ئەمەی وت:

(سامان سامانی خۆمانە، دەستکەوتیش دەسکەوتی خۆمانە، هەرکەسێك بمانەوێ دەیدەینێ و هەرکەسێکیش نەمانەوێ نایدەینێ).

لەپێناوی ئەوەدا، هەر کە ئەمیری باوەڕداران (عوبادەیکوڕی صامیت)ی بینی گەڕایەوە بۆ مەدینە، خێرا لێی پرسی: ((عوبادە چی وای لێکردی بگەڕێتەوە))..؟؟ کاتێ چیرۆکی ئەوەی لەنێوان ئەو و معاویەدا روویدابوو گێڕایەوە بۆی، (عومەر) پێی وت:

{بگەڕێرەوە بۆ جێگای خۆت، خوا ئەو شوێنە وێران بکات کە خەڵکی وەك تۆی تیانەبێت}..!!

پاشان عومەر نامەیەکی نارد بۆ معاویە و تیایدا نووسی:

{هیچ دەستەڵاتێکت بۆ نیە بەسەر عوبادەدا}..!!

بەڵێ.. عوبادە خۆی ئەمیری خۆی بوو..

کاتێك (عومەری فاروق) ئەوها رێز لە کەسێك دەگرێت، کەوابوو کەسێکی زۆر مەزنە..

بەڕاستیش (عوبادە) زۆر مەزن بوو لە ئیمانەکەیدا و، لەراستی ویژدان و ژیانیدا..

*  *  *

---

ئەو قسەیەی کرد و کەسیش وەڵامی نەدایەوە، بۆ جومعەی دووەمیش ئەم قسەیەی دووبارە کردەوە، کەس وەڵامی نەدایەوە.. بۆ جومعەی سێیەم ئەم قسەیەی دووبارە کردەوە، یەکێك لە ناو مزگەوتەکە هەڵسا و وەڵامی دایەوە و وتی:

(نەخێر ، سامان سامانی خۆمانە و دەستکەوتیش دەستکەوتی خۆمانە، جا هەرکەسێك لێمان دەستێنێ ئەوە بە شمشێرەکانمان دەیدەینە بەر دادگای خوا).

خەلیفە معاویە لەسەر مینبەرەکەی هاتە خوارەوە و ناردی بەدوای کابرادا و بردیانە ژوورەکەی، خەڵکەکەش وایدەزانی کە ئەم وەڵامدانەوەیەی کابراکە دڵی خەلیفەی نارەحەت کرد و خەلیفەش تۆڵەی لێدەستێنێتەوە..

پاشان خەڵکەکە چوونە ژوورەوە لای خەلیفە، دەبینن پیاوەکە لەسەر تەختەکەی خەلیفە دانیشتووە، پێش ئەوەی ئەوان بە سەرسامیەوە پرسیار بکەن، خۆی هاتە قسەکردن و وتی: ئەو پیاوە منی رزگارکرد، خوا رزگاری بکات، گوێم لە پێغەمبەری خواﷺ بووە فەرموویەتی: ((دوای من چەند کاریەدەستێکدێن کاتێك قسەیەك بکەن هیچ کەس ناتوانێ وەڵامیان بداتەوە و، ئەگەر رایەکی نادروست و نارێکیان هەبێت هیچ کەس ناتوانێ راستیان بکاتەوە.. ئەو دەسەڵاتدارانە وەك مەیمون فڕێ دەدرێنە ناو ئاگری دۆزەخ)).

جا منیش جومعەی یەکەم ئەم قسەیەم کرد کەس وەڵامی نەدامەوە و جومعەی دووەمیش هەروەها، لە دڵێ خۆمدا وتم لەوانەیە من لەوانە بم.. جا لە جومعەی سێیەمدا ئەو قسەیەم دووبارەکردەوە و ئەو پیاوە هەستا و وەڵامی دامەوە و رزگاری کردم، خوا رزگاری بکات.

جا لێرەدا ئەوپەڕی خاکەرایی و ملکەچی و زەلیلی ئەو هاوەڵە بەڕێزە بەدەردەکەوێ کە هەموو کاتێك حەق گۆ بووە و ملکەچی حەقیش بووە..(لێکۆڵەرەوە).

سەرچاوە: (معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان)ی حبیب محمد سعید

لەساڵی سی و چواری کۆچیدا، لەشاری (رەملە)ی فەڵەستین، ئەم سەردەستە رێنماکارەی ئیسلام ماڵئاوایی لە ژیان کرد و، جێدەست و بۆنخۆشی خۆی بەجێهێشت..

## ١٦

# خەبابی کوڕی ئەرەت

## مامۆستای هونەری فیداکاری

چەند کەسێکی قورەیشی لەماڵ هاتنەدەرێ و، بەرەو رووی ماڵی (خەباب) هەنگاویان دەنا، تا ئەو شمشێرانەی لێ وەربگرن کە لەگەڵی پێکهاتبوون بۆیان دروست بکات..

(خەباب) ئاسنگەری شمشێر دروستکار بوو، شمشێری دروست دەکرد و دەیفرۆشت بە خەڵکی مەککە و، دەیناردە بازاڕەوە..

ئەمجارەیان وانەبوو، ئەو (خەباب)ەی لە ماڵ و کارەکەی دوور نەدەکەوتەوە، ئەوەتا چەند کەسێکی قورەیشی هاتوون بۆ لای و نەیانبینی و لەبەردەرگای ماڵەکەیدا دانیشتون چاوەڕوانی دەکەن..

پاش ماوەیەکی زۆر (خەباب) گەڕایەوەو لە روخساریدا نیشانەیەکی پرسی پرشنگدار بەدی دەکرا و، چاوەکانیشی فرمێسکی خۆشی خۆیان دەنواند.. هات و بەخێرهاتنی لە میوانەکانی کرد و دانیشت..

خێرا لێیان پرسی: ها.. خەباب.. شمشێرەکانت بۆ دروستکردین؟؟

فرمێسکەکانی خەباب وشك بووەوەو، شادیەکی درەوشاوە جێگەی گرتەوە لە چاوەکانیدا و، وەك ئەوەی لەگەڵ خۆی بدوێت وتی: کارەکەی زۆر سەیرە..

خەڵکەکە دووبارە لێیان پرسییەوە: کابرا، کاری چی..؟ ئێمە لەبارەی شمشێرەکانمانەوە پرسیار دەکەین، تەواوت کردون..؟؟

ئەمجا خەباب بەسەرنجە قوڵە خەیاڵییەکانی بە ئاگایان دەهێنێتەوە و دەڵێت:

-ئەرێ ئێوە بینیوتانە..؟ گوێتان لەقسەی بووە..؟؟

کڕیارەکان بەسەرسوڕمانەوە سەیر یەکدی دەکەن..

یەکێکیان بە گاڵتەجاڕییەوە لێی پرسی:

– ئەرێ خەباب تۆ خۆت بینیووتە..؟؟

خەباب گاڵتەی بەفێڵی هاوڕێکەی دێت و وەڵامی پرسیارەکەی دەداتەوەو دەڵێت:

– مەبەستت کێیە..؟؟

کابراش بە رقەوە وەڵامی دەداتەوە: مەبەستم لەو کەسەیە کە تۆ باسی دەکەیت..؟؟

(خەباب) پاش ئەوەی کە نیشانی دان لەوە دوورە قسەی لێ دەربهێنن و، گەر ئەو ئێستا ئیمان هێنانی بدرکێنێت لەبەردەمیاندا، ئەوا لەبەر ئەوە نیە هەڵیان خەڵەتاندبێت و، قسەیان لێ دەرهێنابێت، بەڵکو بەهۆی ئەوەوەیە کە حەقی بەدی کردووەو لە ئامێزی گرتووەو، بڕیاری داوە کەبە دەنگی بەرز باسی بکات و رایبگەیەنێت..

بەوپەڕی گەشی و خۆشی گیانیەوە، وەڵامیان دەداتەوەو دەڵێت:

– بەڵێ... بینیم و... گوێم لێی گرت... حەقم بینی لە هەوو لایەکیەوە دەردەپەڕی و، رووناکی لەدەم دەهاتەدەرەوە..

هێدی هێدی بەکرێگیراوانی قورەیشی خەریك بوو تێدەگەیشتن، یەکێکیان نەڕاندی و وتی:

– ئەو کەسە کێیە باسی دەکەیت ئەی کۆیلەی ئوم ئەنمار..؟؟

(خەباب)یش بە هێمنیەکی خوداپەرستانەوە پێی وت:

– کەسی دی هەیە جگە لەو.. برای عەرەبم.. کێی دی هەیە جگە لەو لە هۆزەکەتدا، حەقی لێ ببارێت و رووناکی لەدەم بێتە دەر..؟!

یەکێکی دیکەیان بەسامەوە هاواری لێ بەرز بووەوە:

– وا هەست دەکەم کە مەبەستت موحەممەد بێت..

(خەباب)یش بە شادییەوە سەری بۆ لەقاند و،وتی:

– بەڵێ، ئەوە کە نێردراوی خوایە بۆ لای ئێمە تا لە تاریکیەوە دەربازمان بکات بەرەو رووناکی..

(خەباب) ئیدی نازانێت لەپاش ئەو وشانە چی دیکەی وت و، چی پێ وترا، ئەوەی لەیادی ماوە تەنها ئەوەیە کە پاش ماوەیەکی زۆر بە ئاگا هاتەوە بینی میوانەکانی رۆشتوون و.. جەستە و ئەندامەکانی لاشەی ژان و ئازاریان هەیە و، خوێنی بەربووی جەستەیشی جل و بەرگ و لاشەیان خوێناوی کردووە..!!

هەردوو چاوەگەشەکەی بڕیە دەورووبەری و.. جێگاکەشی لەوە تەنگتر بوو کە جێگەی سەرنجە تیژەکانی تێدا ببێتەوە، دانی بەخۆدا گرت و، هەستایەوە بەرەو دەرەوە و، لەبەردەم دەرگای ماڵەکەیدا پاڵی دا بە دیوارەکەیەوە وەستا و، چاوە زیرەکەکانی لە گەشتێکی درێژدا بڕیە ئاسۆ و، سەرنجی راست و چەپی پێدەدا.. ئەو دوو چاوە لە ئاست رەهەندە پێڕاهاتوەکانی خەڵکیدا نەدەوەستان و... ئەوان بەدوای رەهەندێکی ون بوودا وێڵ بوون..

بەڵێ.. بەدوای رەهەندێکی بزربووی ژیانی ئەو و، هەموو ئەو خەڵکەی لەگەڵ ئەودا دەژین لە مەککە، بگرە هەموو خەڵکی گشت شوێن و ساتەکانیش، دەگەڕا...

بڵێی... ئەو قسانەی کە ئەمڕۆ لەموحەممەدیﷺ گوێ لێبوو، ئەو رۆشناییە بێت کە رێنوێنی بکات بەرەو لای ئەو رەهەندە ون بووەی ژیانی هەموو مرۆڤایەتی..؟؟

(خەباب) بەردەوام بوو لەسەر رامانی جوان و، بیرکردنەوەی قوڵ.. پاشان گەڕایەوە نێو ماڵەکەی.. هاتەوە تا برینەکانی جەستەی تیمار بکات و، ئامادەی بکات بۆ پێشوازی ئەشکەنجەدانێکی نوێ و، ژان و ئازارێکی تازە..!!

لەو رۆژەوە (خەباب) جێگای بڵندی خۆی لەنێو ئەشکەنجەدراو و چەوساواندا گرت..

جێگای بڵندی خۆی گرت لەنێوان ئەو کەسانەدا کە سەرەڕای هەژاری و، بێدەسەڵاتیان، ڕووبەڕووی لوت بەرزی قوڕەیش و توندوتیژی و سەرشێتی ئەوان دەبوونەوە..

شوێنی بەرزی خۆی لەنێو ئەوانەدا گرت کە لە دڵیاندا خۆشەویستی ئەو ئاڵایەیان چاندوە کە لە ئاسۆی ڕووندا دەشەکایەوەو جاڕی سڕانەوەی سەردەمی بت پەرستی و، قەیسەری دەدا بە گوێیاندا و.. مژدەی هاتنی جیهانێکی دەدا کە خەڵکی بەوپەڕی دڵسۆزی و لێبڕانەوە تەنها خوای گەورە دەپەرستن و.. مژدەی هاتنی ڕۆژانی بێدەستەڵات و زەحمەتکێشانی دەدا، ئەوانەی کە لە سێبەری ئەو ئاڵایەدا لەگەڵ ئەو کەسانەدا وەك یەك دەوەستن کە پێشتر بەکاریان دەهێنان و، بێبەشیان کردبوون و ئەشکەنجەیان دەدان..

بە بوێرییەکی مەزنەوە، (خەباب) وەك سەرکردەیەك هەنگاوی نا..

(شەعبی) دەڵێت:

{خەباب زۆر ئارامی گرت و، لەبەردەستی بێباوەڕاندا هیچ نەرم بوونێکی تێدا بەدی نەکرا و، گەیشتە ئەوەی بە ڕوتی پشتیان دەخستە سەر بەردی زۆر گەرم تا گۆشتەکەی توایەوە}..!!

بەڵێ.. پشکی خەباب لەئازار چەشتندا زۆر بوو، بەڵام بەرگریکردن و ئارامگرتنەکەی گەورەتر بوو لەئەشکەنجەدان..

بێباوەڕانی قوڕەیش هەموو ئەو ئاسنەی کە لە ماڵەکەی خەبابدا هەبوو بۆ دروستکردنی شمشێر، کردیانە کۆت و زنجیر و، دەیانخستە نێو ئاگر بۆی تا داغ دەبوو، پاشان جەستە و دەست و قاچەکانی پێ کۆت دەکرا..

ڕۆژێکیان لەگەڵ چەند هاوەڵێکی چەوساوە چوون بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ نەك لەبەر ترسی قوربانیدان، بەڵکو بۆ داواکردنی لەش ساغی و، وتیان: ((ئەی پێغەمبەری خوا.. ئایا داوای سەرکەوتنمان بۆ ناکەیت..؟؟)) واتە داوای سەرکەوتن و لەش ساغیمان لای خوا بۆ ناکەیت..

دەبا لێگەڕێین خەباب خۆی هەواڵەکەمان بۆ بگێڕێتەوە:

{سکاڵای خۆمان بردە لای پێغەمبەری خواﷺ لە کاتێکدا کە لەسەر عەباکەی شانی دادابوو لای کەعبەدا، وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا.. ئایا داوای سەرکەوتنمان بۆ ناکەیت..؟؟

پێغەمبەریﷺ دانیشت و، دەم و چاوی سوور هەڵگەڕا و فەرمووی:

((خەڵکانی بەر لەئێوە پیاوی وایان لێدەگیرا، چاڵی بۆ هەڵدەکەندرا و، پاشان مشاریان بۆ دەهێنا و، دەیانخستە سەر سەری و، دەیانکرد بە دوو لەتەوە، هێشتا لە ئاینەکەی پاشگەز نەدەبوویەوە..!!

یان بە شانەی ئاسنین گۆشت و ئێسکیان دا دەهێنا، بەوەش لە ئاینەکەی پاشگەز نەدەبوویەوە..!!

جا بزانن خوای گەورە ئەم ئاینەی خۆی سەردەخات تا وای لێدێت سوارێك لە شاری (سەنعا)وەبەرەو شاری (حەزرەمەوت) دێت لەکەس ناترسێت جگە لە خوا و، پەلاماری گورگ بۆ سەر مەڕەکانی، بەڵام ئێوە پەلەتانە))}..!!

(خەباب) و هاوەڵەکانی ئەو وشانەیان گوێ لێبوو، ئیمان وسووربوونیان زیادی کرد و بڕیاریان دا کە هەریەکەیان ئەو سووربوون و، ئارامگرتن و، قوربانیدانەی کە پەروەردگار وپێغەمبەرەکەی پێیان خۆشە نیشانی بدەن.

(خەباب)یش ئەو شەڕە ناڕەحەتەی بەوپەڕی ئارامگری و، خۆڕاگری و، چاوەڕێی پاداشت لای خواوە ئەنجامدا.. قورەیشیەکان هانایان بردە لای (ئوم ئەنمار)ی خاوەنی (خەباب)، کە کۆیلەی ئەو بوو بەر لە ئازادکردنی، ئەویش رازیبوو بەشداری کرد لە هەڵمەتی ئەشکەنجەدانیدا..

دەهات و ئاسنی سورکراوەی داخی دەهێنا و، دەیخستە سەر سەر و ناوچەوانی، خەبابیش لەناو ئازار دەتلایەوە، بەڵام هەناسەکانی خۆی خەفە دەکرد، تا هاوارێکی لێدەرنەچێت و لەخۆیایی بوونی ستەمکارەکانی پێڕازی بێ..!!

رۆژێکیان پێغەمبەری خواﷺ بەلایدا تێپەڕی و، لەو کاتەدا ئاسنی سورەوەکراو لەسەر سەری بوو دەیسوتاند و دەیبرژاند، دڵی لەناو سۆز و بەزەیی و خەم دا بۆی داخورپا، بەڵام ئەو رۆژە پێغەمبەرﷺ چی لەتوانادا بوو تا بۆ خەبابی ئەنجام بدات..؟؟

هیچ.. تەنها ئەوە نەبێت کە خۆڕاگری بکات و بۆی بپاڕێتەوە..

ئا لەوێدا پێغەمبەرﷺ هەردوو دەستی کراوەی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و، فەرمووی:

(خودایە خەباب سەربخە)..

ویستی خوای گەورە وابوو کە تەنها چەند رۆژێکی کەم تێپەڕ بوو (ئوم ئەنمار) تۆڵەی خێرای بۆ سەر دابەزی، وەك ئەوەی قەدەر کردبێتیە ترسێنەر بۆ ئەو و جەلادەکانی دیکە، ئەوەبوو تووشی (هارییەکی) توند و سەرسوڕهێنەر و سەیر بوو—وەك مێژوونووسان باسی دەکەن— وەك سەگ دەوەڕی..!!

ئەو رۆژە پێیان وت: هیچ چارەیەکی دیکە نیە جگە لەوەی سەری بە ئاگر داخ بکەن..!!

بەمجۆرە بەیانیو ئێوارە سەری رەقینی(ئوم ئەنمار) ئاسنی سوورکراوەی پێیدا دەهێنرا..!!

* * *

قورەیشیەکان بەئەشکەنجەدان بەرەنگاری ئیمان دەبوونەوەو.. بڕوادارانیش بە قوربانیدان رووبەڕووی ئەشکەنجەدان دەبنەوەو.. خەبابیش یەکێکە لەوانەی کە قەدەر دیاریکردبوو تا بیکاتە مامۆستایەکی هونەری فیداکاری و قوربانیدان..

(خەباب) بەردەوام بوو لەسەر بەخشینی کات و ژیانی خۆی لەپێناوی ئەو ئاینەدا کە هێشتا ئاشکرا نەکرابوو..

(خەباب) لەرۆژانی سەرەتای بانگەوازدا بە پەرستش و نوێژکردن وازی نەدەهێنا، بەڵکو توانای خۆی خستبوە گەڕ بۆ فێربوون و، لەترسی ستەمکاریی قورەیشی بە دزییەوە دەچووە ماڵی هەندێ لەو برا بڕوادارانەی کە ئیسلام بوونی خۆیان شاردبووەوە، لەگەڵیاندا قورئانی دەخوێند و فێری دەکردن..

سەرقاڵبوو بەلێکۆڵینەوەی قورئان کە ئایەت ئایەت و، سورەت.. سورەت دەهاتە خوار.. تەنانەت (عبداللە‌ی کوڕی مەسعود) کە پێغەمبەری خواﷺ لەبارەیەوە فەرموویەتی: ((هەرکەس ویستی کە قورئان وەك ئەوەی هاتۆتە خوارێ بخوێنێ، ئەوا با وەك کوڕی (ئوم عەبد) بیخوێنێ))..

دەڵێین:

تەنانەت (عبداللەی کوڕی مەسعود)یش (خەباب)ی وەك سەرچاوەیەکی گەورەی لەبەرکردنی لێکۆڵینەوەی قورئان دادەنا..

هەر ئەویش بوو قورئانی بە (فاتیمەی کچی خطاب) و (سەعیدی کوڕی زەید)ی هاوسەری دەوت، کاتێك (عومەری کوڕی خطاب) لەناکاو هات بۆ لایان و شمشێرەکەی بە شانیەوە بوو کە هاتبوو تا کاری خۆی لەگەڵ ئیسلام و پێغەمبەرەکەیدا یەکلا بکاتەوە، بەڵام هەر کە قورئانی لەو دێرانەی ئەو پەڕەیەی خەباب فێری دەکردن خوێندەوە هاوارێکی پیرۆزی لێ بەرزبوویەوە:

(موحەممەدم نیشان بدەن)..!!

(خەباب) گوێی لەو قسەیەی عومەر بوو، خێرا لەو پەنایەی خۆی حەشار دابوو هاتە دەر و، وتی:

ئەی عومەر...

سوێند بەخوا، ئومێدم وایە کە خوای گەورە تۆی تایبەت کردبێت بە نزای پێغەمبەرەکەیﷺ، گوێم لێبوو دوێنێ دەیفەرموو: ((خودایە ئیسلام بەهێز بکە بە خۆشەویسترین کەسیان لەم دوو پیاوە.. ئەبی حەکەمی کوڕی هیشام و عومەری کوڕی خطاب))..

دەست بەجێ عومەر لێی پرسی: ئەی خەباب ئێستا موحەممەد لە کوێ بدۆزمەوە..؟؟

خەباب وەڵامی دایەوە:

لەلای سەفا، لە ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەم..

(عومەر) بەرەو لای بەختەوەری زۆری و، چارەنووسی مەزنی ڕۆشت..!!

* * *

(خەبابی کوڕی ئەرەت) هەموو دیمەن و غەزاکانی لەگەڵ پێغەمبەری خودا بینیوەو، هەموو تەمەنی بە ئیمان و دڵنیاییەوە گوزەراند..

کاتێکیش لە سەردەمی (عومەر) و (عوسمان)دا (بیت المال)ی موسڵمانان پڕ بوو لە سامان، (خەباب) موچەیەکی زۆری هەبوو بەپێی ئەوەی کە لە موهاجیرە دێرینەکانە کە زوو موسڵمان بوون..

ئەم دەست مایە زۆرەش بواری بۆ خەباب رەخساند کە لە کوفە خانوویەك بۆ خۆی دروست بکات و، سامانەکەی لە شوێنێکی ماڵەکەیدا دادەنا کە هاوەڵ و میوانەکانی پێیان دەزانی و.. هەرکەس پێویستی پێی بوایە، دەچوو چەندی پێویست بوو لە سامانەکەی هەڵدەگرت..

لەگەڵ ئەوەشدا.. خەباب چاوی نەدەچووە خەو و، فرمێسکەکانی وشك نەدەبوون، هەر کە باسی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەو هاوەڵانەی بکرایە کە ژیانی خۆیان لە پێناوی خوادا بەخشی و، پاشان بەسەرفرازی گەڕانەوە بۆ لای بەر لەوەی کە دونیا بە رووی موسڵماناندا والآ بێت و، سامانی زۆریان بکەوێتە دەست.

گوێی لێ بگرن لەکاتی سەرەمەرگیدا بۆ ئەوکەسانە دەدوێت کە هاتوونەتە سەردانی.

پێیان وت:

– ئەی باوکی عبدالله، مژدەت لێبێت، سبەینێ دەگەیتەوە بە براکانت..

بە دەم گریانەوە وەڵامی دانەوە:

{هیچ ترسێکم نیە ئێستا.. بەڵام ئێوە برا و کەسانێکتان هێنامەوە یاد کە هەموو پاداشتەکەیان برد لەگەڵ خۆیان و هیچیان لە دونیا پێ‌نەبرا..

ئێمەش لەپاش ئەوان ماینەوە هەتا ئەوەندەمان لە دونیا پێ برا کە جگە لە خۆڵ جێگایەکی دیکە شك نەبەین تێیدا دابنێین}..

ئاماژەی بۆ خانووە ئاساییەکەی کرد کە دروستی کردبوو..

دواتر بۆ جارێکی دی ئاماژەی بۆ جێگای پارەکەی کرد و وتی:

{سوێند بەخوا نە بە پەت بەستومەتەوە، نە لە داواکاریشم گرتۆتەوە}..!

پاشان ئاوڕی دایەوە لەو کفنەی بۆی ئامادەکرابوو، کە بە زیادەڕەوی و دەستبلاوی دەزانی، لەکاتێکدا فرمێسك لە چاوانی دەهات وتی:

{سەیر بکەن.. ئەوە کفنەکەمە..

بەڵام (حەمزە)ی مامی پێغەمبەری خواﷺ ئەو رۆژەی کە شەهید بوو کفنی نەبوو جگە لە عەبایەکی کۆن تا پێی کفن بکەن.. سەری پێی دادەپۆشرا قاچی دەردەکەوت، کە دەدرا بە قاچیدا سەری دەردەکەوت}..!!

* * *

(خەباب) لەساڵی سی و حەوتی کۆچیدا وەفاتی کرد..
مامۆستای دروستکاری شمشێر لە سەردەمی نەفامی و..
مامۆستای دروستکردنی خۆبەختکردن و فیداکاری لە ئیسلامدا مرد... ! !
ئەو پیاوە مرد کە یەکێك بوو لەو کۆمەڵەی قورئان هاتە خوارێ و بەرگری لێ کردن و، سڵاوی لێکردن ئەو کاتەی کە هەندێك لە گەورەپیاوانی قورەیش داوایان کرد لە پێغەمبەری خواﷺ کە ڕۆژێکیان بۆ دیاری بکات و، ڕۆژێکی دیکەش بۆ هەژارانی وەك (خەباب) و (صوهەیب) و (بیلال) بێت.
کە قورئان پیاوانی روو لە خودا ئاوا بە بەرزی و ڕێزەوە لەخۆ دەگرێت و، ئایەتەکانی دادەبەزێت بۆ پێغەمبەر و پێی دەفەرموێت:
﴿وَلاَ تَطْرُدْ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِمْ مِنْ شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِمْ مِنْ شَيْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنْ الظَّالِمِينَ(٥٢)وَكَذَلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لِيَقُولُوا أَهَؤُلاَءِ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنْ بَيْنِنَا أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ(٥٣)وَإِذَا جَاءَكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِنَا فَقُلْ سَلاَمٌ عَلَيْكُمْ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ: ئەو کەسانە مەتۆرێنە و دەریان مەکە کە گشت بەیانیان و ئێواران هانا دەبەنە بەر خودای پەروەردگاریان و بۆ ڕەزامەندی ئەو کۆشش دەکەن..تۆ هیچ کارت بە کاری ئەوان نەبێ، ئەوانیش هیچ کاریان بەسەر تۆوە نیە، سا ئەگەر ئەمانە دەرکەی، تۆش لە ستەمکاران دەبی.. ئێمە ئاوا هێندێك بە هێندێکی تر تاقی دەکەینەوە، تا بڵێن: چۆن خودا لەناوماندا هەر ئەمانەی وەبەر چاکەی خۆی خستوە؟ ئاخۆ خودا لەوان باشتر شوکرانەبژێران ناناسێ؟ هەرکاتێ ئەوانە دێنە لات کە بە نیشانەکانی ئێمە بڕوادارن، پێیان بڵێ: سەلامتان لێبێ، پەروەردگارتان لەسەر خۆی نوسیوە کە بەبەر بەزەیی خۆیتان بخات.﴾الأنعام:٥٢-٥٤.
بەمجۆرە پێغەمبەرﷺ لەپاش هاتنەخوارەوەی ئەو ئایەتە هەر کە بیبینینایە ڕێزی لێدەگرتن و عەباکەی خۆی بۆ رادەخستن و، دەستی دەخستە سەر شانیان و پێی دەفەرموون:
(((بەخێربێن ئەو کەسانەی پەروەردگارم لەبارەیانەوە رایسپاردم)).
بەڵێ.. یەکێك لەو کوڕە چاکەکارانەی ڕۆژانی دابەزینی وەحی و، نەوەی قوربانیدان مرد..

* * *

پێدەچێت چاکترین شت کە ماڵئاوایی ئەوی پێ بکەین، وتەکانی ئیمامی عەلیؓ بێت کە لە کاتی گەڕانەوەی لە شەڕی (صەففەین)، چاوی بە گۆڕێکی سادەوساکار کەوت و، پرسی:
ئەمە گۆڕی کێیە..؟
وتیان: گۆڕی خەبابە...
سەری دانەواند و خەم بردیەوە و وتی:

ئەو پیاوە کێبوو کە پێغەمبەر دەستی گرت و لەبارەیەوە فەرمووی:

((هەموو ئوممەتێك ئەمینێکی هەیە، ئەمینی ئەم ئوممەتەش ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحە))..؟؟

ئەو پیاوە کێ بوو کە پێغەمبەر لە جەنگی (ذات السلاسل)دا بۆ هاریکاریکردنی (عەمری کوڕی عاص) ناردی و، کردیە ئەمیری سوپایەك کە ئەبوبەکر و، عومەری تێدابوو..؟؟

ئەو هاوەڵە کێبوو کە یەکەم کەس بوو نازناوی (ئەمیری ئەمیرەکان)ی لێنرا..؟؟

ئەو کەسە باڵابەرزە، جەستە لاوازە، دەم و چاو بێگۆشتە، ریش تەنکە، ددان کەلەی کە ددانەکانی پێشەوەی کەوتبوون کێبوو..؟؟

بەڵێ.. ئەو پیاوە بەهێزە ئەمینە کێبوو کە عومەری کوڕی خطاب لەکاتی سەرەمەرگیدا لەبارەیەوە وتی:

(گەر ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح زیندوو بوایە دەمکردە جێنشین و گەر پەروەردگارم لەو بارەیەوە پرسیاری لێبکردمایە، دەموت: ئەمینی خودا و، ئەمینی پێغەمبەرەکەیم کردۆتە جێنشین)..؟؟

ئەو پیاوە ئەبوعوبەیدەیە.. (عامری کوڕی عبداللەی کوڕی جەڕڕاح)...

لەرۆژانی سەرەتای هاتنی ئیسلامدا، بەر لەوەی کە پێغەمبەرﷺ بڕواتە ماڵی ئەرقەم، لەسەردەستی ئەبوبەکر موسڵمان بوو، لە کۆچکردنی دووەمدا چوو بۆ حەبەشە و، پاشان گەڕایەوە تا لەگەڵ پێغەمبەردا بەشداری بەدر و، ئوحود و، هەموو غەزاکان بکات، پاش ئەوەش بەردەوام بێت لەسەر رەوتی بەهێزی ئەمینی و لەدوای وەفاتی پێغەمبەریشﷺ لە خزمەتی جێنشینەکەی پێغەمبەردا بێت کە ئەبوبەکرە و، دوای ئەویش لە خزمەتی ئەمیری باوەڕداران (عومەر)دا بێت، بەجۆرێك کە پشتی کردە دونیا و، بەوپەڕی دونیانەویستی و، تەقوا و، خۆڕاگری و، دەستپاکییەوە بەدەم ئاینەکەیەوە دەچوو.

* * *

کاتێك کە ئەبوعوبەیدە بەڵێنی دایە پێغەمبەری خواﷺ کە ژیانی لەپێناوی خوادا ببەخشێت، چاك لە واتای ئەم سێ وشەیە -لە پێناوی خودا- گەیشتبوو، لەوپەڕی ئامادەباشیدا بوو تا ئەوەی ئەو رێگایە پێویستیەتی لە کۆشش و قوربانیدان پێی ببەخشێت.

لەو ساتەوەی دەستی راستی خستە دەستی پێغەمبەر و بەڵێنی پێدا، خۆی و رۆژانی خۆی و ژیانی خۆی هەمووی بە سپاردەیەك دەبینی کە خوای گەورە پێی سپاردووە تا لەپێناوی

خودا و رەزامەندی ئەودا ببیەخشێت، بەشوێن هیچ کام لە ئارەزووەکانی خۆیدا نەچێت و.. هیچ حەز و ترسێك لەڕێی خودا لای نەدات..

کاتێك کە ئەبوعوبەیدە ئەمەکدار بوو بەرانبەر ئەو بەڵێنەی کە هاوەڵانی دیکەش ئەمەکداربوون بەرامبەری، پێغەمبەرﷺ لە ڕێڕەوی ویژدان و، ژیانیدا ئەوەی تێدا بەدیکرد کە شایستەی ئەو نازناوە دڵئارایە بێت کە ڕژا بەسەریدا و، پێی بەخشی و، فەرمووی:

((ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح، ئەمینی ئەم ئوممەتەیە)).

* * *

دەستپاکی ئەبوعوبەیدە لەسەر بەرپرسیارێتیەکانی، دیارترین خاسیەتەکانی بوو.. ئەوەبوو لە غەزای ئوحوددا هەستی بە سووربوونی بێباوەڕان کرد لەسەر ڕەوتی جەنگەکە، نە لەبەر بەدەستهێنانی سەرکەوتن تێیدا، بەڵکو بەر لەوە و بە دژ لەوە، بێباوەڕان لەسەر کوشتنی پێغەمبەری مەزن سوور بوون، هەر بۆیە لەگەڵ خۆیدا پێکهات کە لە جەنگەکەدا لە شوێنی خۆیدا کە نزیك بوو لە پێغەمبەری خوا بمێنێتەوە.

بەردەوام بە شمشێرەکەی کە وەك خۆی ئەمین بوو کەوتە لێدانی سوپای بتپەرستی کە وەك گومڕا و دەستدرێژکار هاتووە و دەیەوێت ڕووناکی خوا خامۆش بکات..

هەرکاتێکیش ڕەوشی جەنگەکە و پێویستی شەڕکردن وای بخواستایە لە پێغەمبەری خواﷺ دووربکەوێتەوە سەرنجی لەلای لێدانی شمشێرەکەی نەبوو.. بەڵکو هەمیشە سەیری ئەو جێگایەی دەکرد کە پێغەمبەری تێدا وەستاوەو دەجەنگا و، بەوپەڕی پەرۆشی و دڵەڕاوکێیەوە چاودێری دەکرد.

ئەبوعوبەیدە هەرکە مەترسیەکی بەدی بکردایە لە پێغەمبەر نزیك دەبێتەوە، لەجێگای دووری خۆی هەڵدەکەندرا و خێرا بەسەر زەویەکەدا دەهات تا دوژمنانی خودا تێك بشکێنێ و، ڕوویان وەرگێڕێت بەر لەوەی کە زیان بە پێغەمبەری خوا بگەیەنن..!!

لە یەکێك لەو ڕۆیشتنانەیدا، لە کاتێکدا کە جەنگ گەیشتبووە ئەوپەڕی گەرمی، کۆمەڵە جەنگاوەرێك چواردەورەی ئەبوعوبەیدەیان گرت، چاوەکانی هەروەك کردبووە خوو، چاوی وەك چاوی باز بڕیبووە شوێنی پێغەمبەری خواﷺ، ئەبوعوبەیدە وەخت بوو لە هۆشی خۆی بچێت کە بینی تیرێك لە دەستی بێباوەڕێکەوە هاوێژرا و پێغەمبەر دەپێکێت، بە شمشێرەکەی وەك ئەوەی سەد شمشێر بێت کەوتە وێزەی ئەوانەی دەورەیان دابوو، تا بڵاوەی پێکردن و لە دەوری خۆی لادان و، بە پەلە بەرەو لای پێغەمبەر ڕۆشت، خوێنی پاکی بەدی کرد بە دەم و چاویدا دێتە خوارێ و، بینی پێغەمبەری دەستپاك بە دەستی ڕاستی خوێنەکە دەسڕێت و دەفەرموێت:

((خەڵکانێك چۆن سەردەکەون دەم و چاوی پێغەمبەرەکەیان خوێناوی کرد، لە کاتێکدا کە ئەو بۆ لای پەروەردگاریان بانگیان دەکات))..؟؟

سەیری کرد هەردوو ئەڵقەی زرێپۆشەکەی کە پێغەمبەر لەسەری دەکرد چەقیونەتە روومەتی، خۆی پێڕانەگیرا و... خێرا لێی نزیك بوویەوەو بە ددانەکانی ئەڵقەیەکیانی گرت و دەریهێنا، ددانی کەوت، پاشان ئەڵقەکەی دیکەشی دەرهێنا و، ددانێکی دیکەشی کەوت..

وا جوانە گوێ لە ئەبوبەکری صدیق راگرین ئەم دیمەنەمان بۆ باس بکات:

(کە رۆژی ئوحود هات، تیرێك هاوێژرا بۆ پێغەمبەرﷺ و دوو لە ئەڵقەکانی زرێپۆشەکەی چەقینە روومەتی، بەرەولای پێغەمبەرﷺ رۆیشتم، بینیم کەسێك لەلای رۆژهەڵاتەوە بە پەلە وەك ئەوەی بفڕێ بەرەو لای دەڕوات، لە دڵی خۆمدا وتم: خودایە بیکەیتە گوێڕایەڵی.

کاتێك گەیشتینە لای پێغەمبەرﷺ، سەیرم کرد ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاحە بەر لە من گەیشتۆتە لای، پێی وتم: ئەی ئەبوبەکر لەڕێی خوا وازم لێبێنە من لە روومەتی پێغەمبەریﷺ دەریبهێنم..

منیش وازم لێهێنا، ئەبوعوبەیدەش بە دوو ددانی پێشەوەی یەکێك لە ئەڵقەکانی دەرهێنا و، کەوتە سەر زەویەکە و لە گەڵیشیدا ددانێکی پێشەوەی کەوت..

پاشان بە ددانەکەی دیکەی ئەڵقەکەی تری گرت و دەریهێنا و، ئەویش کەوت، لەوە بەدوا ئەبوعوبەیدە لەنێو خەڵکیدا بە ددان کەل ناسرابوو).!!!

ئەو رۆژگارەیشی لێپرسراوێتی هاوەڵان زۆر فراوان و مەزن بوو، ئەبوعوبەیدە بەوپەڕی راستگۆیی و دەست پاکیەکەیەوە هەر لە ئاستی خۆیدا بوو..

کاتێك پێغەمبەرﷺ لە غەزای (خەبەطە)دا کردیە سەرکردەی سەر سێسەد و هەندێ جەنگاوەر، کە تێشوویان تەنها خورما بوو..

چالاکیەکە سەخت و، گەشتەکەش دوور بوو، ئەبوعوبەیدە بەوپەڕی لێبڕان و دڵفراوانیەوە ئەرکەکەی گرتە ئەستۆ و لەگەڵ سەربازەکانیدا کەوتە ڕێ و، خۆراکی هەر یەکەشیان بە درێژایی رۆژێك چنگێك خورمابوو، ئەو کاتەیشی خورماکە خەریك بوو تەواو ببێت، پشکی هەر یەکێکیان بوو بە تەنها خورمایەك.. کە هەموو خورماکەش تەواو بوو دەستیان دایە لێکردنەوەی (خەبەطە) واتە گەڵای دار بە کەوانەکانیان، دەیانکوتی و، ئاویان دەکرد بەسەریدا و دەیانخوارد.. لەبەر ئەوەش بوو جەنگەکە ناونرا غەزای (خەبەطە)—گەڵادار..

بێگوێدانە برسێتی و بێبەشبوون بەردەوام بوون، ئەوەی بەلایانەوە گرنگ بوو تەنها ئەوەبوو کە لەگەڵ سەرکردە بەهێزە ئەمینەکەیاندا، ئەم چالاکیە بەرزە ئەنجام بدەن کە پێغەمبەری خواﷺ هەڵیبژاردبوون بۆ ئەنجامدانی..!!

* * *

بەراستی پێغەمبەری خواﷺ زۆر زۆر ئەمینی ئەم ئوممەتەی خۆش دەویست و..
زۆر ڕێزی لێدەنا..

ئەو ڕۆژەیشی شاندی موسڵمانانی خەڵکی (نەجران)ی یەمەن هاتن و، داوایان لێی کرد کە کەسێکیان لەگەڵدا بنێرێت تا شارەزای قورئان و سوننەت و ئیسلامیان بکات، پێغەمبەری خوا پێی فەرموون:

((پیاوێکی ئەمینتان لەگەڵدا دەنێرم.. کە بەراستی ئەمینە، کە بەراستی ئەمینە، کە بەراستی ئەمینە))..!!

هاوەڵان کە گوێیان لەم ستایشەی پێغەمبەری خواﷺ بوو، هەریەکەیان ئاواتەخوازی ئەوە بوو کە پێغەمبەر هەڵیبژێرێت و، ئەو شایەتیدانە ڕاستگۆیانە ببێتە پشك و بەشی..

عومەری کوڕی خطابﷺ دەڵێت:

(هەرگیز حەزم لە ئەمیرایەتی نەکردووە، وەك ئەو حەز لێبوونی ئەو ڕۆژەم، بەو ئومێدەی کە من ئەو کەسە بم، زۆر زوو چوم بۆ نوێژی نیوەڕۆ، کاتێك پێغەمبەری خواﷺ نوێژی پێکردین و سەلامی دایەوەو لێبوویەوە، بەلای ڕاست و چەپیدا ڕووانی، خۆمم بەرزدەکردەوە تا بم بینێت..

زۆری نەبرد ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕراحی بەرچاو کەوت و بینی، بانگی کرد و پێی فەرموو: بڕۆ دادگەری لە نێوانیاندا بکە لەوەی کە جیاوازیان هەبوو تێیدا.. ئیدی ئەبوعوبەیدە ڕۆشت)..!!!

ئەم ڕووداوە ئەوە ناگەیەنێت کە لەنێو هاوەڵاندا تەنها ئەبوعوبەیدە ڕێزی هەبوبێت لای پێغەمبەر و جێگای متمانەی بووبێت.. بەڵکو ئەوە دەخاتە ڕوو کە یەکێك بوو لەو کەسانەی ئەو متمانە بەنرخە و، ئەو ڕێزلێنانە گەورەیەی بەدەستهێنا..

پاشان ئەو تەنها، یان تاکە کەس بوو کە ڕەوشی کاروبار و بانگەواز لەو ڕۆژەدا بواری ئەوەی پێدەدا کە دوور بێت لە مەدینە و، ئاکارە چاکەکانیشی ڕێگاخۆشکار بوون بۆ ئەنجام دان و دەرچوونی لەو چالاکیەدا..

ئەبوعوبەیدە هەروەك چۆن لە سەردەمی پێغەمبەردا بە ئەمینی ژیا، پاش وەفاتکردنی پێغەمبەریش هەر بە ئەمینی مایەوەو.. بەرپرسیارێتیەکانی بە ئەمانەتێکی وەهاوە دەگرتە ئەستۆی خۆی کە بەشی هەموو خەڵکی سەر زەوی دەکرد گەر دابەشکرایە بەسەریاندا..

لەژێر سایەی ئاڵای ئیسلامیشدا بۆهەر کەوێ چووبێت وەك سەربازێك، بەهۆی لێهاتوویی چاکیەوە وەك ئەمیر بووبێت وابووە.. بە ئەمیریش ڕۆشتبێت... بەهۆی خۆبەکەمزانی و دڵسۆزییەوە وەك کەسێکی ئاسایی نێو جەنگاوەران وابووە..

ئەو کاتەیشی خالیدی کوڕی وەلید.. سەرکردایەتی سوپای ئیسلامی دەکرد لە یەکێك لە جەنگە یەکلاکەرەوە گەورەکاندا و.. ئەمیری باوەڕداران (عومەر) سەرەتای سەردەمی فەرمانڕەوایی خۆی لەو کاتەدا دەست پێکرد کە ئەبوعوبەیدەی خستە جێگای خالید...

هەر کە ئەبوعوبەیدە نێردراوی (عومەر)ی پێگەیشت و ئەو هەواڵە نوێیەی پێگەیاند، هەواڵەکەی نەدرکاند و لە سینگی دونیانەویستی، زرنگی، ئەمینی، خۆیدا شاردیەوە، تاکو خالیدی سەرکردە رزگارکردنە مەزنەکەی تەواو کرد.

ئا لەو کاتەدا.. بە شێوازێکی زۆر بەرزی جوان و بەوپەڕی رێزەوە نوسراوەکەی ئەمیریباوەڕدارانی پێدا..

خالید لێی پرسی:

(خودا رەحمت پێبکات ئەی ئەبو عوبەیدە.. چی وای لێکردی کە ئەم نووسراوەت بۆ هات هەواڵم نەدەیتێ)..؟؟

ئەمینی ئەم ئوممەتەش لە وەڵامیدا وتی:

(پێم خۆش نەبوو شەڕەکەت بشکێنم، دەستەڵاتدارێتی دونیاشمان ناوێت و، بۆ دونیاش هەوڵ نادەین، هەموومان لە ئاییینی خوادا براین)..!!

* * *

ئەبوعوبەیدە دەبێتە ئەمیری ئەمیرەکان لە شام.. زۆرترین و پۆشتە و پڕچەك و تفاقترین سوپای ئیسلام دەکەوێتە ژێر فەرمانڕەوایەتی.

کە چاوت پێی دەکەوت وات دەزانی یەکێکە لە جەنگاوەران و.. کەسێکی ئاسایی نێو مسوڵمانانە..

کاتێکیش گوێی لە قسەو باسی خەڵکی شام بوو لەبارەیەوە، سەرسام بوونیان بە (ئەمیری ئەمیرەکان)یانی هەست پێکرد کە ئەوە.. خەڵکەکەی کۆکردەوەو وتاری بۆ دان..

سەرنج بدەن.. بزانن چی وت بەوانەی کە شەیدای هێز و، مەزنی و، سپاردەییەکانی بووبوون..

(ئەی خەڵکینە.. من مسوڵمانێکی قورەیشیم..

هەر کامێکتان.. سوور یان ڕەش بێت، رەوشت و تەقوای لە من زیاتر بێت دەخوازم کە من لەژێر دەستەڵاتی ئەودا بم)..!!

خوا بتپارێزێ ئەی ئەبوعوبەیدە..

خوا ئەو دینەش بژیەنێ کە تۆی وەبەرهێنا و ئەو پێغەمبەرەیشی فێری کردی..

موسڵمانێکی قورەیشی، نە کەمتر و نەزیاتر.

ئاییینی: ئیسلامە..

هۆزەکەی: قورەیش..

تەنها ئەوە ناسنامەیەتی..

بەڵام ئەو وەك ئەمیری ئەمیرەکان و، سەرکردەی زۆرینەی سوپای ئیسلام لە رووی ژمارەوەو، لە هەموویان بەهێزترو، خاوەن سەرکەوتنی مەزنتر..

بەڵام ئەو وەکو فەرمانڕەوای وڵاتی شام، فەرمانەکانی جێبەجێ دەکرێت و، خواستەکانی بەجێ دەهێنرێت..

هەموو ئەوانە و لەوەش زیاتر، نابنە مایەی سەرنج راکێشانی و، لە تێڕوانینی ئەودا هیچ سەنگێکی نیە.. هیچ سەنگێك..!!

* * *

ئەمیری ئیمانداران (عومەری کوڕی خطاب) دێتە سەردانی شام و، لەو کەسانەی هاتوونەتە پێشوازیکردنی دەپرسێت:

–کوا براکەم..؟؟

پێی دەڵێن:

– کێت دەوێ..؟

وەڵامیان دەداتەوە: ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح.

ئەبو عوبەیدە دێت و، ئەمیری باوەڕداران (عومەر) دەست دەکاتە ملی و.. پاشان بەرەو ماڵ لەگەڵیدا دەڕوات، لەنێویدا هیچ کەلوپەلێك بەدی ناکات.. تەنها شمشێرەکەی نەبێت، لەگەڵ قەڵغان و رمەکەی..

عومەر بە زەردەخەنەیەکەوە لێی دەپرسێت:

(ئەرێ بۆ وەك خەڵکی بەشی خۆت پێکەوە نەناوە)..؟

ئەبوعوبەیدە لە وەڵامیدا دەڵێت:

(ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەمە دەمگەیەنێتە جێی خۆم)..!!

* * *

رۆژێکیان، لەکاتێکدا ئەمیری باوەڕداران (عومەری فاروق) لەشاری مەدینە سەرقاڵی کاروباری جیهانی بەرفراوانی موسڵمانان بوو، ئەو هەواڵە غەمناکەی بۆ هات، کە ئەبوعوبەیدە مردووە..

فاروق پێڵووی چاوەکانی لێك نا و چاوی پڕ بوو لە ئەسرین..

ئەسرینەکان هاتنە خوارێ.. بەناچاری چاوەکانی کردەوە..

ڕەحمەتی بۆ هاوەڵەکەی نارد و، یادەوەریەکانی لەگەڵیدا بەوپەڕی سۆز و ئارامەوە هاتەوە یاد.

ئەو وتەیەی لە بارەوە دووبارە کردەوە:

(گەر ئاواتێکم هەبوایە، ئەوا تەنها ئەوەم بە ئاوات دەخواست کە ماڵێکی پڕ لە پیاوانی وەك ئەبوعوبەیدەم هەبوایە)..

* * *

ئەمینی ئوممەت لەسەر ئەو خاکەی لە بتپەرستی فارسەکان و، ستەمکاری ڕۆمەکان ، پاکی کردەوە مرد..

لەوێش ئەمڕۆ لەژێر خاکی ئوردوندا ئێسقانەکانی ئەم بەجەرگە حەشاردراوە، کە جێنشینگەی گیانی چاك و، دەروونی دڵنیای بوو..

ئیدی بۆ تۆ و.. بۆ ئەویش، گەر ئەمڕۆ گۆڕەکەی پێ بزانرێ یا نەزانرێ..

گەر ویستت پێی بگەیت هیچ پێویستت نیە بە کەسێك تا بتگەیەنێتە لای..

چونکە پەند و وانە بەجێماوەکانی، ئەوت نیشان دەدەن..!!

# ١٨

## عوسمانی کوڕی مەظعون

### خواپەرستێکی زیادە خەڵوەتگیرە

ئەگەر ویستت ریزبەندی هاوەڵانی پێغەمبەری خواﷺ بکەیت بەپێی زوو موسڵمان بوونیان، ئەوا بزانە کە خاوەنی ژمارە چواردە (عوسمانی کوڕی مەظعون)ە..

هەروەها بزانە، کە ئەم (عوسمانی کوڕی مەظعون)ە، یەکەمین مسوڵمانی موهاجیر بوو کە لە مەدینە کۆچی دوایی کرد و، یەکەمین موسڵمانیش بوو کە لە گۆڕستانی (بەقیع) بەخاك سپێردرا..

لە کۆتاییشدا بزانە، کە ئەو هاوەڵە پایە بڵندەی ئێستا سەربردەی ژیانی دەخوێنینەوە خواپەرستێکی زۆر مەزن بوو.. وەك خواپەرستانی نێو پەرستگا نا، بەڵکو وەك خواپەرستانی ژیان..!!

بەڵێ.. ژیان بە هەموو شادی و، بەرپرسیارێتی و، چاکەکانیەوە خەڵوەتگەی بوو..

خوداپەرستیەکەشی کارێکی ژیرانە بوو لە پێناوی حەق و، لێبڕانێکی بەردەوام بوو لە پێناو چاکە و چاکسازیدا..

* * *

کاتێك ئیسلام تیرۆژی سەرەتای بانگخوازی لە دڵی پێغەمبەرەوەﷺ دەگوێزایەوەو.. لە وشەکانیەوە کە هەندێك کەس بە پەنهانی و نزییەوە گوێیان لێدەبوو..

(عوسمانی کوڕی مەظعون) لەوێدا بوو.. یەکێك بوو لەو کەمینەیەی کە زۆر خێرا بەرەو لای بانگەوازی خودا هات و دەوری پێغەمبەرەکەیان گرت..

لەم پێناوەشدا تووشی هەمان سزا و ئەشکەنجە بوو، کە بڕوادارانی ئارامگر و خۆڕاگر تووشی بوون..

کاتێکیش پێغەمبەری خواﷺ ئەم ژمارە کەمە موسڵمانە دەربەدەرەی بەرەو ژیانێکی باشتر نارد و فەرمانی پێکردن کە کۆچ بکەن بۆ حەبەشە، خۆی هێشتەوە تا بەتەنها بەرەنگاری ئەشکەنجە ببێتەوە، عوسمانی کوڕی مەظعون ئەمیری دەستەی یەکەمی کۆچکاران بوو، (سائب)ی کوڕیشی لەگەڵ خۆی برد و، ڕووی کردە وڵاتێکی دوور لە دەستەڵاتی (ئەبوجەهل)ی دوژمنی خوداو، دڕندەی قوڕەیشی و.. سزا و ئەشکەنجەیان..

* * *

وەك هەموو مسوڵمانانی کۆچکردووی هەردوو کۆچەکە.. یەکەم و دووەم.. بۆ حەبەشە، (عوسمانی کوڕی مەظعون)یشرضي الله عنه پابەندبوونی بە ئیسلامەوە و، پەیوەست بوونی پێوەی

زیادی کرد..

لە راستیدا هەردوو کۆچەکە بۆ حەبەشە دیاردەیەکی دەگمەن و، سەرفرازی رەوشی ئیسلامن..

چونکە ئەوانەی بڕوایان هێنابوو بە پێغەمبەرﷺ و بە راستیان زانیبوو، شوێنی ئەو رووناکییە کەوتبوون کە بۆی هاتبوو، بە هەموو شێوەیەك بێزار بووبوون لە بتپەرستی بە گشت سەرلێشێوان و نەفامیەکانیەوە و، هەڵگری فیترەتێکی راستی وەهابوون کە تازە بە پەرستنی بتی لەبەرد داتاشراو یان لە قوڕ دروستکراو نەدەخەڵەتان..!!

کاتێك چوونە حەبەشە رووبەڕووی ئایینێکی بەرباڵو و، رێکخراو بوونەوە.. کە کەنیسە و قەشە و خواپەرستی خۆی هەبوو..

جا ئەو ئاینە -ئیدی تێڕوانینیان بەرامبەری هەرچی بێت- دوور بوو لەو بتپەرستیەی لە وڵاتی خۆیاندا لەسەری راهاتبوون و، لە پەرستنی بت بەشێوەی ناسراو و ئەو داب و نەریتانەی کە لەپاش خۆیان بەجێیان هێشتبوو..

پیاوانی کەنیسەی حەبەشەش هەوڵی خۆیان دا بۆ راکێشانی ئەو کۆچکروانە بۆ لای ئاینەکەیان و، بڕوا پێهێنانیان بە مەسیحیەت وەك ئاینێك.

لەپاڵ هەموو ئەوەدا دەبینین کە ئەو کۆچکردووانە لە سەر خۆشەویستی و پشتیوانی بێسنووری خۆیان بۆ ئیسلام و موحەممەدی نێردراوی خواﷺ مانەوە.. بەخۆشی و دڵەڕاوکێیەوە چاوەڕێی ئەو رۆژە نزیکەیان دەکرد کە تێیدا دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتە خۆشەویستەکەیان و، تەنها خودای بێهاوەڵ دەپەرستن و، شوێنی خۆیان لە پشت پێغەمبەری مەزنەوەﷺ دەگرن.. لە رۆژانی ئاشتی و هێمنی لە مزگەوتدا و.. لە گۆڕەپانی جەنگیشدا، گەر هێزی بێباوەڕان ناچاری شەڕ و کوشتاری کردن..

* * *

کەواتە کۆچکردوان لە حەبەشە بە دڵنیایی و هێمنیەوە ژیان و.. (عوسمانی کوڕی مەظعون)یش لە گەڵیاندا ژیاو لەو غوربەتەشدا فێڵ و تەڵەکەی (ئومەیەی کوڕی خەلەف)ی ئامۆزای لە یاد نەچوو بوو کە لە پاڵ ئەو ئازار و ئەشکەنجەیەی کە بەو و کەسانی دیکەی گەیاندبوو، دەستی دابووە داشۆرینی و بەڵێنی پێدەدا کە:

| | |
|---|---|
| تريش نبيلاً لا يواتيك ريشها | وتبري نبالاً، ريشها لك أجمعُ |
| وحاربت أقواما كراماً أعزة | وأهلكت أقواماً بهم كنت تفزعِ |
| ستعلم إن نابتك يوماً ملمَّةُ | وأسلمك الأوباش ما كنت تصنع |

* * *

لە کاتێکدا کە کۆچکاران لەو وڵاتەی کۆچیان بۆکردبوو پەرستشی خوایان دەکرد و، ئەوەی لە قورئان پێیان بوو دەیانخوێندەوە و، سەرەڕای غوربەت جۆشێکی گیانی کەم وێنەیان هەبوو..

هەواڵیان بۆ دەهات کە قورەیش موسڵمان بوون و، لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ کڕنووش بۆ خودای تاکی بە دەسەڵات دەبەن..

ئا لێرەدا کۆچکردوان شت و مەکی خۆیان پێچایەوەو بەوپەڕی پەرۆشی و شادیەوە بەرەو مەککە هاتنەوە، شنەبای ئەوینیان پێشیان کەوتبوو..

لەگەڵ ئەوەشدا کە لە دەوروبەری نزیک بوونەوە بۆیان دەرکەوت کە ئەو هەواڵەی لەبارەی موسڵمان بوونی قورەیشەوە پێیان گەیشتبوو درۆ بوو..

ئا لەو ساتەدا لە دەستیان دەرچووبوو، سەیریان کرد پەلەیان کردووە، بەڵام چۆن بڕۆن ئەوەش لەکاتێکدا کە لە پێش چاویان..!!!

بێباوەڕانی مەککەش گوێبیستی هەواڵی گەڕانەوەی ئەو نێچیرە بوون کە لە مێژە لە دوی وێڵ بوون و تۆڕییان بۆ گرتنی هەڵدەدا.. ئێستاش ئا ئەوەتانێ، هەلی رەخساوەو، قەدەرەکانی هێناویەتی..!!

(پەناهێندەی) لەو کاتەدا یەکێك بوو لە داب و نەریتە پیرۆز و رێزدارەکانی عەرەب، گەر پیاوێکی بێدەسەڵات لە پەنای دەستەڵاتدارێکی قورەیشیدا خۆی پەنا بدایە، ئەوا دەبوویە قەڵایەکی بەرگریکار بۆی نە خوێنی دەڕژا و، نە ئارامی دەشێوێنرا..

هەموو گەڕاوەکانیش وەك یەك نەبوون لە دەستەکەوتنی پەناداندا..

لەو پێناوەدا کەمێکیان توانیان پەنا دەستەبەر بکەن، لەوانە (عوسمانی کوڕی مەظعون) چووە پەنای (وەلیدی کوڕی موغیرە).

بەمجۆرە بە هێمنی و دڵنیایی گەڕایەوە مەککە و بەرێگاویانەکانیدا دەڕۆیشت و دەچوویە کۆڕ و دانیشتنەکانی بەبێ ئەوەی بەکەم سەیر بکرێت یان ئازار بدرێت..

* * *

بەڵام (عوسمانی کوڕی مەظعون).. ئەو پیاوەی کە قورئان گۆشی کرد و، پێغەمبەرﷺ پەروەردەی کرد، سەرنجی دەوری خۆی دەدات، دەبینێت برا موسڵمانە هەژار و بێدەستەڵاتەکانی، ئەوانەی پەنایان دەست نەکەوت.. دەبینێت تووشی ئەشکەنجە و ناڕەحەتی دەبن لە هەموو لایەکەوە و... لە هەموو رێگایەکەوە ستەم بە دوایانەوەیە..

لە کاتێکدا کە ئەو دوور لە ئازار و ئەشکەنجەی هۆزەکەی لە هێمنی و ساغیدایە و، بەمە گیانی ئازادی دەهەژێنێت و، ویژدانی پاکی ئازار دەچێژێت و، دەروونی بەسەر خۆیدا زاڵ دەکات و، لەماڵی خۆی دێتە دەرێ و سوورە لەسەر ئەوە کە لە پەناهێندەی (ولید) خۆی لا

بدات و، خۆی لەو پاراستنە دەرباز بکات کە بێبەشی کردووە لە چێژی ئازار چەشتن لە پێناوی خوا و، ڕێزی وێکچوون بە برا موسڵمانەکانی، ئەوجەوانانی بڕواداری دونیا و، مژدەکانی ئەو جیهانەی کە سبەینێ هەموو گژشە و قوژبەکانی بە ئیمان و، یەکخواناسی و، ڕووناکی، دەتەقێتەوە...

با لێگەڕێین کەسێك کە خۆی ڕووداوەکەی بینیوە بۆمانی باس بکات:

{کاتێك (عوسمانی کوڕی مەظعون) بینی کە هاوەڵانی پێغەمبەری خواﷺ لە ج ناڕەحەتیەکدان و، ئەویش ئازادە و دێت و دەچێت لە پەنای (ولیدی کوڕی موغیرە)دا، وتی: سوێند بەخوا من ئازادانە لە پەنای پیاوێکی پێڕی هاوەڵ پەرستاندا بێم و بچم و، هاوەڵان و هاوئایینانیشم تووشی ئازار و ئەشکەنجە و ناڕەحەتیەك ببن کە من تووشی نابم، ناتەواوییەکی گەورەیە لە دەروونمدا..

هەر بۆیە ڕۆشت بۆ لای (ولیدی کوڕی موغیرە) و پێی وت:

ئەی باوکی (عەبدولشەمس)، پەنادانەکەت بەس بێ و، پەناهەندەییەکەم وا بۆ گێڕایەوە..

پێی وت:

–بۆچی برازام.. لەوانەیە کەسێکی هۆزەکەم ئازاری دابێت..؟؟

وتی: نەخێر، من بە پەنای لای خوا ڕازی دەبم و، نامەوێ هانا بۆ لای کەسێکی دیکە جگە لەو ببەم..

دەبڕۆ بۆ مزگەوت و بە ئاشکرا پەنادارییم بۆ بگێڕەوە، هەروەك چۆن بەئاشکرا هاتیتە پەنام.. هەردووکیان ڕۆیشتن تا گەیشتنە مزگەوت، وەلید وتی: ئەمە عوسمانە..هاتووە پەنادارییەتیەکەیم بۆ دەگێڕێتەوە..

عوسمان وتی: ڕاست دەکات.. بەڕاستی پەناگیرێکی بە ئەمەك و بەخشندە بوو، بەڵام من پێم خۆش بوو کە جگە لە خوا کەسی دیکە نەکەمە جێگە پەنای خۆم.

دوای ئەوە عوسمان ڕۆشت و، لە کۆڕێکی قوڕەیشیەکاندا (لەبیدی کوڕی ڕەبیعە) هۆنراوەی بۆ دەوتن، ئەویش لەلایان دانیشت، (لەبید) وتی:

دڵنیابە جگە لە خوا هەموو شتێ ناڕەوایە.

عوسمان وتی: ڕاستت وت..

لەبید وتی: هەموو خۆشییەکیش هەر چاری نیە و دەبڕێتەوە.

عوسمان وتی: وانیە.. خۆشی و نیعمەتی بەهەشت نابڕێتەوە..

لەبید وتی: ئەی خەڵکی قوڕەیش، سوێند بەخوا پێشتر ئێوە دڵی هاونشینتان نەڕەنجاندووە، ئەمە چیە لەنێوتاندا ڕوودەدات..؟؟

پیاوێکی هۆزەکە هەستاوە و وتی: ئەم گەمژەیە لە ئاینی ئێمە دابڕاوە.. بۆیە دڵت هیچ زویر نەبێت بە قسەکەی..

(عوسمانی کوڕی مەظعون)یش وەڵامی دایەوەو بووە دەمەقاڵێ لە نێوانیاندا و، ئەو پیاوە هەستایەوە بۆی و مشتەکۆڵێکی دا بە چاویدا و بریندارى کرد، وەلیدی کوڕی موغیرەش لەو نزیکە بوو، بەچاوی خۆی دی کە چی تووشی عوسمان بوو، بۆیە وتی: برازام سوێند بەخوا دەتتوانی کە چاوت تووشی ئەوە نەبێت، چونکە لە ئەستۆی کەسێکدا بووی کە دەیپاراست.

عوسمان وتی: نا سوێند بە خوا چاوە ساغەکەیانم ئاتاجی ئەوەیە کە تووشی چاوەکەی دیکەم بووە لە پێناوی خوا و.. من لە پەنای زاتێکدام کە لە تۆ جەسوور و بەتواناترە ئەی باوکی عەبدولشەمس..!!!

وەلید پێی وت: گەر ویستت برازام ئەوا بگەڕێرەوە بۆ پەنای من..

عوسمان وتی: نەخێر....

عوسمان ئەو شوێنەی بەجێهێشت و چاوی ژانی دەکرد، بەڵام گیانی، خۆشی و، تۆکمەی و، مژدەی لێ هەڵدەقوڵا..

بە رێگادا بەرەو ماڵەکەی هەنگاوی دەنا و ئەو هۆنراوەیەی خۆی دەوتەوە:

| | |
|---|---|
| فإن تكُ عيني في رضا الله نالها | يدا ملحد في الدين ليس بمهتدي |
| فقد عوّض الرحمن منها ثوابه | ومن يُرضه الرحمن يا قوم يسعد |
| فإني وإن قلتم غويٌّ مضلّل | لأحيا على دين الرسول محمد |
| أُريد بذاك الله، والحق ديننا | على رغم من يبغي علينا ويعتدي |

واتە: گەر چاوم لەبەر خودا بەدەستی خوانەناسێکی رێنمایی نەکراو لێی درابێ، ئەوا خودا خۆی پاداشتی دەداتەوەو ئەو کەسەشی خودا رازی بکات، خۆشبەختم ئەی خەڵکینە، منیش با ئێوە هەر بڵێن سەرلێشێواو و گومڕایە، هەر لەسەر ئایینی موحەممەد دەژیم، مەبەستم لەوە خودایە و، ئاینەکەشمان حەقە و با کەسانێکیش هەبن شاڵاومان بهێننە سەر و لێمان بدەن.

* * *

بەمجۆرە (عوسمانی کوڕی مەظعون) وانەیەکی وەهای نواند، کە شیاوەتی و گونجاوە بۆی..

بەم شێوەیە ژیان مرۆڤێکی پایەبەرزی وەهای بەخۆوە دی کە بەم هەڵوێستە بەرزەی بوونی گوڵاوپڕژێن کرد..

بەم وشە جوانە جاویدانەی:

{سوێند بەخوا، چاوە ساغەکەیانم ئاتاجی ئەوەیە کە تووشی چاوەکەی دیکە بووە لە پێناوی خودا.. لە پەنای زاتێکدام کە لە تۆ جەسوور و بەتواناترە}..!!

جا (عوسمان) لەپاش ڕەتکردنەوەی پەناگیری لای (وەلید) تووشی ئازاردانی قوڕەیش دەبوویەوە، بەوەش زۆر شاد و بەختەوەر بوو.. ئەو ئازار و ئەشکەنجەیە بۆ ئەو وەك ئەو ئاگرە وەهابوو کە ئیمانی بەتینتر دەکرد و پاکی دەکردەوە..

بەمجۆرە لەگەڵ برا بڕوادارەکانیدا کەوتە ڕێ و، لەهیچ ئەشکەنجە و ڕێگرێك باکیان نەبوو.. هیچ توندوتیژییەکیش نەدەبووە بەربەست لەبەردەمیاندا..!!

* * *

دواتر (عوسمان)یش کۆچی کرد بۆ مەدینە لەوێ ئیدی نە ئەبوجەهل خەوی دەزڕاند و، نە ئەبولەهەب و ئومەیە و، عوتبە.. نە هیچ کام لەو داخ لە دڵانە کە شەوو ڕۆژیان لێ تێکدابوون..

لەگەڵ ئەو هاوەڵە مەزنانەدا دەڕوات بۆ مەدینە کە بەهۆی خۆڕاگری و دامەزراوییانەوە لە ئەزموونێکدا سەرکەوتن کە تەواو سەخت و ناڕەحەت و مەترسیدار بوو، ئەوانەی کۆچیان نەکرد بوو بۆ مەدینە تا پاڵی لێدەنەوەو بحەوێنەوە.. بەڵکو تاوەکو لە دەروازەیەکی فراوانی واڵاوە بەرەو هەموو گۆشە و قوژبنەکانی سەر زەوی بکەونە ڕێ و ئاڵای خودایان بە دەستەوە بێت و، بە وشە و ئایەت و ڕێنوێنییەکانی مژدە بەخەڵکی بگەیەنن..

لە خانەی کۆچ بۆ کراوی ڕووناکبووشدا، ناوکرۆکی (عوسمانی کوڕی مەظعون) و حەقیقەتی مەزنی دەگمەنی دەردەکەوێت، کە چەند خواپەرست و، دونیانەویست و، خۆپارێز و، تۆبەکارە..

کەواتە خواپەرستێکی پایەبڵندی زیرەکە، کە ناچێتە خەڵوەتگەکەیەوە لە ژیان گۆشەگیر بێت تێیدا.. بەڵکو ژیان بەکار و کردەوەو، تێکۆشانی لەپێناوی خوادا پڕ دەکات..

بەڵێ..

خوا پەرستی شەو و، سوارچاکی ڕۆژ، بەڵکو خواپەرستی شەو و ڕۆژ و، سوارچاکی هەردووکیشیان بوو پێکەوە..

خۆ گەر هاوەڵانی پێغەمبەری خواﷺ، بەتایبەتی لەو ماوەیەی تەمەنیاندا، هەموو گیانی دونیا نەویستی و خۆپارێزیان تێدا بوو‌بێت، ئەوا (عوسمان) لەم بوارەدا خاوەن سروشتێکی تایبەت بەخۆی بوو.. کە زۆر ڕۆچوبوو لە دونیانەویستی و لێبڕانیدا بەشێوەیەکی زۆر جوان، کە هەموو ژیانی، شەو و ڕۆژەکانی کردبوویە نوێژێکی هەمیشە پرشنگدار و، پاکیگارییەکی درێژی سازگار..!!

هەر کە چێژی شیرینی ڕۆچوونی لە پەرستنشدا دەچەشت دەگەیشتە ئەو خەیاڵەی هەستی بکردایە بە دابڕان لە هەموو ئەو هۆکارانەی کە خەڵکی پەیوەست دەکات بە خۆشییەکانی ژیانەوە.

هەر بۆیە بەردەوام کاڵای زبری دەپۆشی و، خواردنی سادە و هەرزانی دەخوارد..

رۆژێکیان چوو بۆ مزگەوت، لە کاتێکدا کە پێغەمبەری خواﷺ و هاوەڵانی لەوێ دانیشتبوون، ئەمیش کاڵایەکی شڕی لەبەردابوو، کە بە پارچەفەروویەك پینەی کردبوو. پێغەمبەرﷺ بەزەیی پێیدا هاتەوە، چاوی هاوەڵەکانیشی پڕ بوو لە ئەشك، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموون:

{ئەبێت ئێوە چۆن بن کە لە رۆژێکدا بەیانیەکەی جلکێك دەپۆشن و، ئێوارەکەی یەکێکی دیکە دێنە دەرەوە و.. جۆرێك خواردنی لە بەردەستدایە و... جۆرێکی دیکە هەڵدەگرێت و.. ماڵەکانی خۆتان وەکو کەعبە داپۆشیوە...؟!}.

هاوەڵان وتیان:

(حەزمان دەکرد وەهابوایە ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوجا ئێمەش لە خۆشگوزەرانی ژیانمان پێدەبرا)..

پێغەمبەرﷺ وەڵامی دانەوەو فەرمووی:

{ئەوە دێتە دی، ئێوە ئەمڕۆ چاکترن لەو کاتە}.

شتێکی ئاسایی بوو کە عوسمان گوێی لەوە بێت و، زیاتر خۆی بگرێت و لەخۆشی و شادی رابکات..!!

تەنانەت وازی لە چوونە لای هاوسەرەکەشی هێنابوو، گەر ئاگاداربوونی پێغەمبەر نەبوایە، ئەوە بوو بانگی کرد و پێی فەرموو:

{خاوخێزانیشت مافیان هەیە لەسەرت}.

* * *

پێغەمبەرﷺ زۆر زۆری خۆش دەویست..

کاتێکیش گیانی بێگەردی لە خۆسازداندا بوو بۆ کۆچکردن و خاوەنەکەی دەیکردە یەکەم موهاجیری کۆچکردوو لە مەدینە و، یەکەمین رێگابڕ بەرەو بەهەشت، لەوێدا و ئەو ساتە پێغەمبەرﷺ بە تەنیشتیەوە بوو..

سەری شۆڕ کردبووەوەو نێوچاوانی ماچ دەکرد و، بەو فرمێسکانەی لە چاوانی بەسۆزی دەهاتنە خوار بۆنخۆشی دەکرد، دەم و چاوی (عوسمان) لە چرکەساتی مردنیدا لەوپەڕی رۆشنی و درەوشانەوەیدا بوو..

پێغەمبەرﷺ بۆ ماڵئاوایکردن لە هاوەڵە ئازیزەکەی فەرمووی:

{خودا بەزەیی بێتەوە پێتدا ئەی باوکی (سائیب).. لە دونیا دەرچوویت و، هیچت لێ بەدەست نەهێنا و، ئەویش هیچی لێت دەست نەکەوت.}

* * *

لەپاش مردنیشی پێغەمبەری بەسۆز ئەو هاوەڵەی لەیاد نەکرد، بەڵکو هەمیشە باسی دەکرد و، وەسفی دەکرد.. تەنانەت پێغەمبەرﷺ وشەکانی ماڵئاوایی لێکردنی روقیەی کچیشی، کاتێك کە رۆحی کێشرا ئەوەبوو:

{بگەڕێوە بۆ لای پێشینی چاکمان، عوسمانی کوڕی مەظعون }..!!!

# ١٩

# زەید کوڕی حاریسە

## کەسێکی تری وەک ئەم خۆش نەویستووە

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاوەستا بوو سوپای ئیسلامی بەڕێ دەکرد بەرەو غەزای (مۆتە) بۆ ڕوبەڕوو بوونەوەی ڕۆمەکان و، ناوی سێ سەرکردەی سوپاکەی پێ ڕاگەیاندن و، فەرمووی:

{زەیدی کوڕی حاریسە سەرکردەتانە.. خۆ ئەگەر زەید شەهید کرا، ئەوا جەعفەر کوڕی ئەبوطالب لە جێی بێت.. گەر جەعفەریش شەهید بوو، ئەوا عبداللەی کوڕی ڕەواحە لە شوێنی بێت}..

جا دەبێت ئەو (زەیدی کوڕی حاریسە)یە کێ بێت..؟؟

ئەوە کێیە کە بەتەنها لە نێو کەسانی دیکەدا نازناوی (خۆشەویست)ی لێ نرابوو.. خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ..؟

بەڵام ڕووکەش و شێوەی، ئەوا وەك سەربردە گێڕەوان و مێژوونووسان باسیان کردووە:

((کورت و، ڕەش ئەسمەر بووە و، گرێیەك لە لوتیدا هەبووە))..

بەڵام هەواڵ و بەسەرهاتی، زۆر زۆر گەورە و مەزنە..!!

* * *

حاریسەی باوکی زەید وڵاخ و کەل و پەلی ئامادەکرد بوو بۆ (سوعدا)ی خێزانی کە دەیویست سەردانی خزمانی (بەنی مەعن)ی بکات.

هاتە دەرەوە بۆ ماڵئاوایی کردن لە خێزانەکەی کە منداڵە بچووکەکەیانی بە باوەشەوە بوو کە ناوی (زەید) بوو، هەرکە بیری دەکردەوە لەوەی خودا حافیزی لەو کاروانە بکات بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە کە خێزانەکەیشی لەگەڵیاندا دەڕۆشت، سۆز و ئەوینێکی پەنهان و سەرسوڕهێنەر پاڵی پێوە دەنا کە بەردەوام بێت لە ڕۆشتن لەگەڵ خێزان و منداڵەکەیدا..

بەڵام لە شوێنەکەی دوور کەوتبووە و، کاروانەکەش دەستی بە ڕۆشتنی خۆی کرد بوو، کاتی ئەوە بوو کە حاریسە ماڵئاوایی لە خێزان و منداڵە بچووکەکەی بکات و، بگەڕێتەوە..

بەمجۆرە بەچاوی پڕ لە ئەسرینەوە ماڵئاوایی لێکردن و.. ماوەیەکی زۆر لەجێگای خۆیدا ڕاوەستا تا لەبەر چاوی دیار نەمان و، وای هەست دەکرد کە دڵی لە شوێنی خۆیدا نەماوە.. وەك ئەوەی لەگەڵ کاروانچییاندا ئەویش ڕۆشتبێت..!!!

* * *

(سوعدا)ش هێندەی خوا ویستی لەسەر بێت لە نێو خزم و کەسەکانیدا مایەوە..

ڕۆژێکیان گەڕەکی (بەنی مەعن) لە ناکاو توچاری هێرشی هۆزێکی نەیاری بوویەوە و دای بەسەریاندا و (بەنی مەعن) تووشی شکست و دۆڕان بوون، پاشان ئەوەی گیرا گیرا و، لەنێو دیلەکانیشدا ئەو منداڵە تازە پێگەیشتووەش بردرا کە ناوی (زەیدی کوڕی حاریسە) بوو.

دایکیشی بەتەنهاو دەستی بەتاڵ گەڕایەوە بۆ لای مێردەکەی.

(حاریسە) هەر کە ئەوەی بیست وەك بروسکە لێی بدات کەوت و، کۆچانەکەی هەڵگرت و کەوتە گەڕان، بەماڵان و بیابان دا و، پرسیاری کوڕە ئازیزەکەی لە کاروانچی و هۆزەکان دەکرد و، سوکنایەتی دەروونی خۆی بەم هۆنراوەیە دەدایەوە کە لە ناسۆر و ژانی خۆیدا بۆی هاتبوو دەیوت و، بەرەنگاری حوشترەکەی دەبوویەوە:

| | |
|---|---|
| بكيت على زيد ولم أدر ما فعل | أحي فيرجـي؟ أم أتى دونه الاجل |
| فوالله ما أدري، وإني لسـائل | أغالك بعدي السهل؟ ام غالك الجبل |
| تُذكرنيه الشمس عند طلوعها | وتعرض ذكـراه إذا غربها أفـل |
| و إن هبت الارواح هيجن ذكره | فيا طول ما حزني عليه، ويا وجل |

واتە: بۆ زەید گریام و نازانم چی بەسەرهات، زیندووە و دەیدۆزمەوە؟ یان ئاکامی هاتووە. سوێند بەخوا نازانم و، هەر لەسۆراغیدام، ئایا دوای من دەشت، یا شاخ قوتی دا خۆر لە کاتی هەڵهاتنیدا دەیهێنێتەوە یادم و، لە ئاوابوونیشدا یادەکانی پشت هەڵدەکەن و ون دەبن کە گیانەکان هەڵدەکەن یادی دەورووژێت، ئێی لە غەمگینی زۆر و، ناخۆشی و تاڵیم بۆی.

* * *

کۆیلایەتی لەو سەردەمە دێرینەدا هەوڵی دەدا وەك ڕەوشێکی کۆمەڵایەتی پێویست خۆی بسەپێنێت..

بەهەمان شێوە بوو، لە (ئەسینا)، تەنانەت لە پێشکەوتووترین چاخی ئازادی و بەرەو پێشچوونیدا...

لە (ڕۆما)ش هەر وابوو..

هەموو جیهانی کۆن بەو جۆرە بوو.. (دورگەی عەرەب)یش بەهەمان شێوە..

کاتێك ئەو هۆزەی دای بەسەر (بەنی مەعن)دا و سەرکەوتنی بەدەست هێنا و، بەدیلەکانەوە گەڕایەوە، بەرەو بازاڕی (عوکاظ) ڕۆشت کە لەو سەردەمەدا هەبوو، دیلەکانیان فرۆشت..

(زەید)ی بچوکیش کەوتە دەست (حەکیمی کوڕی حوزام)، دوای ئەوەی کە کڕی و کردیە دیاری بۆ خەدیجەی پووری -خووشکی باوکی-.

(خەدیجە)ش ڕەزای خوای لێ بێت، لەو کاتەدا خێزانی (موحەممەدی کوڕی عبداللە) بوو، کە تا ئەو کاتەش نیگای بۆ نەهاتبووە خوارێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئاکارێکی مەزنی تێدا بەدی دەکرا کە مێژای ئەو ڕێزە بێت کە سبەینێ ببێتە یەکێك لە پێغەمبەران..

(خەدیجە)ش ڕۆڵی خۆی بەجێهێنا و (زەید)ی خزمەتکاری بەخشیە مێردەکەی، کردیە دیاری بۆ پێغەمبەری خوا، ئەویش بەخۆشحاڵیەوە وەری گرت دەست بەجێ ئازادی کرد و، ئیدی هەموو سۆز و چاودێرێکی لە دەروونە مەزن و دڵە گەورەکەیەوە بەرامبەری هەبوو..

لە یەکێك لە وەرزەکانی حەجدا، یەکێك لە هاونیشتمانانی کەڕەکی ماڵی (حاریسە) گەیشت بە (زەید) لە مەککە و باسی پەرۆشی و خەمی دایك و باوکیان بۆی کرد، ئەویش سڵاو و سۆز و خۆشەویستی و پەرۆشی خۆی بۆ دایك و باوکی پێیاندا ناردەوە و، بە حاجیەکانی هۆزەکەی وت:

{بە باوکم بڵێن کە من لێرە لەگەڵ بەڕێزترین باوکدام}...

هەر کە باوکی (زەید) شوێنی کوڕەکەی بۆ دەرکەوت لەگەڵ براکەیدا بەرەو لای کەوتە ڕێ..

لە مەککەش بەردەوام دەربارەی (موحەممەدی دەستپاك) پرسیاریان دەکرد.. کاتێ گەیشتنە خزمەتی پێیان وت:

{ئەی کوڕی عبدالمطلب...

ئەی کوڕی سەر گەورەی هۆزەکەت، ئێوە خەڵکی مەککەن، دیل بەرەڵا دەکەن و، نان دەرخواردی دیل دەدەن.. بۆ کوڕەکەمان هاتوینەتە خزمەتت، دەتۆش چاکەمان لەگەڵدا بکە و ئازادی بکە بۆمان}..

پێغەمبەر ﷺ دەیزانی کە (زەید) چەندە پەیوەست بووە پێوەی و، لەهەمان کاتیشدا مافی باوکی تێدا رەچاو دەکرد..

ئا لەوێدا بە (حاریسە)ی وت:

{زەید بانگ بکەن و، سەرپشکی بکەن، گەر ئێوەی هەڵبژارد ئەوە بەبێ بەرانبەر بۆ خۆتان بیبەنەوە.. خۆ گەر منیشی هەڵبژارد ئەوا سوێند بەخوا بەرانبەر هەڵنابژێرم بەسەر کەسێکدا کە منی هەڵبژاربێت}..!!

(حاریسە) کە هەر گیز چاوەڕێی ئەم هەموو لێبووردنەی نەدەکرد، روخساری گەشایەوە و، وتی:

((بەڕاستی چاکت لەگەڵ بەش کردین و، زیاد لە نیوەت پێ بەخشین)).

پاشان پێغەمبەر ﷺ ناردی بەشوێن (زەید) داو، کاتێ هات لێی پرسی:

{ئەوانە دەناسیت}..؟؟

زەید وتی: بەڵێ، ئەوە باوکمە و.. ئەوەش مام..

پێغەمبەرﷺ ئەوەی بە (حاریسە)ی وتبوو بۆی دووبارە کردەوە.. ئالێرەدا (زەید) وتی:
{کەس بەسەر تۆدا هەڵنابژێرم. تۆ باوك و، مامی}..!!
هەردوو چاوی پێغەمبەری خوا پڕ لە ئەسرینی سوپاسگوزاری و سۆز بوون، پاشان دەستی (زەید)ی گرت و، بردی بۆ سێبەری کەعبە، کە قورەیشیەکان لەوێدا کۆ بووبوونەوە پێغەمبەر بانگی کرد:
{شاهێدی بدەن کە (زەید) کوڕی منە.. میراتگریم و میراتم دەگرێت}..!!
دڵی (حاریسە) وەخت بوو لەخۆشیا بفڕێت.. کوڕەکەی هەر ئەوە نیە ئازاد بێت و بەس، بەڵکو کوڕی پیاوێکە کە قورەیش بە (ڕاستگۆی دەستپاك) ناوی دەبەن و لەنەوەی (بەنی هاشم)ە و، جێگای ڕێز و خۆشەویستی هەموو مەککەیە..
باوك و مامی گەڕانەوە بۆ لای هۆزەکەیان و، بێ خەم بوون لە بەجێ هێشتنی کوڕەکەیان لە هێمنایەتی و خۆشگوزەرانیدا بەگەورەیی لە مەککە، پاش ئەوەی کە باوکی نەیدەزانی پێشتر بیابان قوتی داوە، یان شاخ..!!

* * *

پێغەمبەر (زەید)ی کرد بەکوڕی خۆی.. ئیدی لەوە بەدوا لەنێو هەموو مەککەدا بە (زەیدی کوڕی موحەممەد) ناسرا..
لەڕۆژێکی پڕشنگداری سەرسوڕهێنەر دا، نیگا موحەممەدی دواند:
﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ، خَلَقَ الإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ، اقْرَأْ وَرَبُّكَ الأَكْرَمُ، الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ، عَلَّمَ الإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾العلق/١-٥.
پاشان دواندن، وشەکانی ئەمەی بەدوادا هات:
﴿يَاأَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ، قُمْ فَأَنذِرْ، وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ﴾المدثر/١-٣.
﴿يَاأَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ إِنَّ اللّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ﴾المائدة/٦٧.
هەر کە پێغەمبەری خوداشﷺ پەیامەکەی گرتە ئەستۆ، (زەید) دووەمین کەس بوو مووسڵمان ببێت. بەڵکو دەڵێن یەکەمین کەسیش بوو کە موسڵمان بوو..!!

* * *

پێغەمبەری خوداﷺ بە خۆشەویستیەکی زۆر مەزن خۆشی دەویست و، ئەویش هێژا و شایستەی ئەو خۆشەویستیە بوو. چونکە ئەمەکدارییەکی بێ وێنە بوو، خاوەنی گیانێکی مەزن و ویژدان و، زمان و کەسێتیەکی بێگەرد بوو..
هەموو ئەوانە و زیاد لەوەش بووبوونە رازێنەری خەسڵەتەکانی (زەیدی کوڕی حاریسە)یان (زەیدی خۆشەویست) هەروەك هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ ناویان لێ نابوو..

خاتوو (عائیشە) ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت:

{هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ (زەیدی کوڕی حاریسە)ی نەناردووە لەگەڵ هیچ سوپایەکدا نەیکردبێتە سەرکردەیان، خۆ گەر لەپاش پێغەمبەر بمایە دەیکردە جێنشینی خۆی}..

پلە و پایەی زەید لای پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتبووە ئەو ئاستە..

جا دەبێت ئەو (زەید)ە کێ بێت..؟؟

ئەو –هەروەك وتمان– منداڵێك بوو فڕێندار و، پاشان فرۆشرا، دواتر پێغەمبەر ئازادی کرد و بەرەلای کرد..

ئەو پیاوێکی کورتە باڵای، ئەسمەری، لوت فش بوو؛ لەگەڵ ئەوەشدا ئەو مرۆڤێك بوو کە دڵێکی کۆ و گیانێکی ئازادی هەبوو..

پاشانیش لە ئیسلام و، لەدڵی پێغەمبەری خودا ﷺ بڵندترین شوێن و جێگای بۆ هەبوو، جا نە ئیسلام و نە پێغەمبەرەکەی دەربەستی پلە و پایەی ڕەچەڵەك و، شێوازی ڕووکەشی نە بوون..

لە هەگبەی ئەم ئاینە مەزنەدا، ((بیلال)) دەدرەوشێتەوە، (سوهەیب) دەدرەوشێتەوە، (عەممار) و (خەباب) و (ئوسامە) و (زەید) دەدرەوشێنەوە..

هەموویان وەك چاکەکار و، سەرکردە دەدرەوشێنەوە..

بەڕاستیش ئیسلام بەهاکانی ژیانی ڕاست کردەوە، کاتێك قورئانی پیرۆز فەرمووی: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ: بەڕێزترینتان لای خودا پارێزکارترینتانە﴾حجرات/١٣

دەروازە و ئامێرەکان والابوون لەبەردەم بەهرە چاك و، توانا بێگەردە، دەستپاکە، بەخشندەکاندا..

پێغەمبەری خوداش ﷺ (زەینەب)ی کچی پوری لێ مارە کرد، بەڵام وادیارە کە (زەینەب) لەشەرماندا بەم هاوسەرگیریە ڕازی بووە کە ناکرێ بڕیاری پێغەمبەری خودا ﷺ بداتە دواوە، یان بەویستی خۆی هەڵیبژێرێت..

هەر بۆیە ژیانی هاوسەرێتیان بەرەو تێکچوون دەڕۆیشت و، شیرازەی پێکەوە مانەوەیان دەپچڕا، ئەمجا (زەید) لە (زەینەب) جیابوویەوە.

پێغەمبەریش ﷺ بەرپرسیارێتی ئەو هاوسەرگیریەی لە ئەستۆی خۆی گرت کە ئەو بەرپرس بوو لە پێکهاتنی و، بەجیابوونەوەشی کۆتایی پێ هات، جا پێغەمبەر کچە پورەکەی هێنایەی لای خۆی و مارەی کرد و بوو بەخێزانی و، دواتر هاوسەرێکی نوێی بۆ (زەید) خواست کە (ئوم کەلسومی کچی عوقبە) بوو..

جا ئاژاوە گێڕان دەستیان دایە قسە و قسەڵۆك لە نێو مەدینەدا و دەیانوت: چۆن (موحەممەد) ژنی تەلاقدراوی (زەید)ی کوڕی دەخوازێت؟؟

قورئان وەڵامی دانەوە و جیایی خستە نێوان ئەوەی وا دادەنێن کە کوڕیانە لەگەڵ کوڕی خۆیان.. هەروەها جیاوازی نێوان کوڕ و بەکوڕی خۆکردنی خستە ڕوو، بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی داب و نەریتی بەکوڕی خۆکردنی داو، رایگەیاند:

﴿مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ وَلَكِنْ رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ: محمد بابی هیچ پیاوێك لە پیاوانی ئێوە نیە، بەڵام پێغەمبەری خوایە و دواییني پێغەمبەرانە.﴾الاحزاب/٤٠.

بەم جۆرە (زەید) ناوی یەکەمی کە (زەیدی کوڕی حاریسە) بوو بۆ گەڕایەوە.

ئێستاش..

ئەو سوپایەی موسڵمانان بەدی دەکەن کە بەرەو جەنگی (جەمموح) دەڕوات..

(زەیدی کوڕی حاریسە) سەرکردەیەتی.

ئەو هێزانەیشی کە بەرەو جەنگەکانی (طەرەف) و، (ئەلعیص) و، (حیسمی)، و هی دیکە دەکشێت..

(زەیدی کوڕی حاریسە) سەرکردەی هەموویانە..

ئەو هەروەك لە خاتوو (عائیشە)مان گوێ لێ بوو پێشتر لەبارەیەوە وتی: (هەرگیز پێغەمبەر ﷺ (زەیدی کوڕی حاریسە)ی نەناردوە لەگەڵ سوپایەکدا نەیکردبێتە سەرکردەی ئەو سوپایە))..

هەتا غەزای (مۆتە) بەرپا بوو..

ڕۆمەکان بەئیمپراتۆریەتە پەك کەوتوەکەیانەوە، مەترسیان لە ئیسلام بۆ پەیدا بووبوو، نەك هەر ئەوە بەڵکو وەك مەترسییەك سەیریان دەکرد کە هەڕەشەیە لەسەر بوونی ئەوان، بەتایبەت لە وڵاتی شامدا کە لە ژێر چنگی ئەواندا بوو و، ئەم ئاینە نوێیە لەو وڵاتەدا رای دەماڵین جێگای خۆی دەکردەوە و لە فراوان بوون و گەشەدا بوو..

بەم جۆرە ئەوان شامیان کردبوویە خاڵی پاراستنیان لە دوورگەی عەرەبیدا و، وڵاتی ئیسلامدا..

پێغەمبەری خوا ﷺ لەمەبەستی ئەو دەست پێشخەریانە تێگەیشت کە ڕۆمەکان بۆ چاوترسێنی ئیسلام دەستیان دابوویە، هەر بۆیە بڕیاری دا کە ئەم دەستپێشخەر بێت و، سوور بوونی ئیسلامیان لەسەر بەرەنگاربوونەوە تێ بگەیەنێت..

بەمجۆرە..

لە مانگی (جەمادی یەکەمی) ساڵی (هەشتی کۆچی)دا سوپای ئیسلام بەرەو خاکی (بەلقاء) لە شام کەوتە ڕێ، تا گەیشتە نێو جەرگەی سوپاکانی هیرەقل کە لە ڕۆمەکان و ئەو هۆزە عەرەبە بەکرێگیراوانەی نیشتەجێی سەر سنوور پێکهاتبوو..

سوپای ڕۆمەکان لایدایە جێگایەك کە پێی دەوترا (مەشارف)..

سوپای ئیسلامیش لایدایە نزیك شارۆچکەیەك کە بە (مۆتە) ناو دەبرا و، جەنگەکەش بەناوی ئەوەوە ناو نرا..

پێغەمبەری خوا ﷺ گرنگی و بایەخ و مەترسی ئەو جەنگەی بەچاکی دەزانی بۆیە سێ خواپەرستی شەو و، سوارچاکی ڕۆژی بۆ دیاریکرد..

سیان لەوانەی کە گیانی خۆیان بەخوای گەورە فرۆشتبوو و، هیچ ئاوات و خۆزگەیەکیشیان نەبوو جگە لە شەهید بوونێکی مەزن کە بەهۆیەوە ڕەزامەندی خوایان دەست بکەوێت و، بەبینینی روخساری پیرۆزی شادببن..

ئەو سێ کەسەش بەپێی ریزبەندی سەرکردایەتی کردنی سوپاکەدا بریتی بوو لە:

*زەیدی کوڕی حاریسە.

*جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب.

*عبداللهی کوڕی رەواحە.

خوای گەورە لێیان رازی بێت و رازیان بکات و، لە تێکڕای هاوەڵانیش رازی بێت..

بەم جۆرە بینیمان پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ راوەستا و سوپای ئیسلامی بەڕێ دەکرد، ئەم فەرمانانەی خوارەوەی راگەیاند:

{زەیدی کوڕی حاریسە سەرکردەتانە..

گەر زەید شەهید کرا، ئەوا جەعفەری کوڕی ئەبو طالب لە جێی بێت،..

گەر جەعفەریش شەهید بوو، ئەوا عبداللهی کوڕی رەواحە لە شوێنی بێت}..

لە کاتێکدا کە (جەعفەری کوڕی ئەبوطالب) لە هەموو کەس زیاتر نزیك بوو لە دڵی پێغەمبەری خودا ﷺ کە ئامۆزایەتی..

سەرەڕای جەسووری و، ئازایەتی و، ناوبانگ و رەچەڵەکی، پێغەمبەری خوا ﷺ خستیە دوای (زەید)ەوە و، (زەید)ی کردە سەرکردەی یەکەمی سوپا..

ئاوەها، پێغەمبەر ﷺ هەمیشە ئەو راستییەی دەخستە روو کە ئیسلام ئاینێکی نوێیە و هاتووە تا هەموو پەیوەندییە مرۆییە بەسەرچووە خراپەکان، کە لەسەر بنەمای جیاکاری پووچ و ناڕەوا بونیات نراوە بسڕێتەوە، لە جێگای ئەواندا پەیوەندی نوێی، مەردانە و چاك، دابمەزرێنێت کە کۆڵەکەکەی مرۆڤێتی مرۆڤ بێت.!!

وەك ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ نادیارێتی و پەنهانی جەنگی داهاتوو بخوێنێتەوە و، وابوو کاتێك کە سەرکردەکانی سوپاکەی بەم شێوەیە ریزبەند کرد: زەید، ئەمجا جەعفەر، دوای ئەو عبداللهی کوڕی رەواحە..

ئەوانیش هەرسێکیان بەهەمان ریز بەند شەهید بوون و گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگاریان..!!

هەر کە موسڵمانان سوپای رۆمیان بەدی کرد دووسەد هەزار جەنگاوەری ساز و پڕ تفاقە، ژمارەکە سەرسامی کردن کە هەرگیز وایان مەزەندە نەکردبوو..

بەڵام کەی جەنگەکانی ئیمان جەنگی ژمارە زۆری بووە..؟؟

لەوێدا بێ باك چوونە پێشەوە .. (زەید)ی سەرکردەیان لە پێشەوەیە و بەیداخی پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەستەوەیە و، چووە ناو رم و تیر و شمشێرەکانی دوژمنەوە، ئەوەندەی بۆ بەدەستهێنانی ئەو پێگەیەی کە بازرگانیەکەی لەگەڵ خودا هەیبوو، کە خوای گەورە گیان و سامانی لە بڕواداران کڕیوە بەوەی بەهەشتیان بۆ هەیە دەگەڕا، هێندە بە دوای سەرکەوتندا وێڵ نەبوو.

(زەید) نە لمەکەی (بەلقاء)ی لەدەوری خۆی دەبینی، نەسوپای رۆم بەلکو لە خەیاڵی بەهەشتدا بوو و، فەرشە سەوزەکانی وەك ئاڵا لە پێش چاویدا دەشەکایەوە و، هەواڵی ئەوەی پێدەدا کە ئەمڕۆ رۆژی زەماوەندی ئەوە..

هەر بۆیە لێی دەدان و، دەجەنگا و سەری شەڕکەرانی دەپەڕاند، بەڵکو دەروازەکانی واڵا دەکرد و، ئەو بەربەست و رێگرییانەی لادەدا کە کەوتبووە نێوان ئەو دەروازە گەورە و فراوانەکەوە، کە بەرەو خانەی ئاشتی و، بەهەشتەکانی جاویدانی و، هاونشینی لای خودا، پێیدا تێدەپەریت..

(زەید) بە ئاکامی خۆی گەیشت..

گیانی لە رێگادا بوو بەرەو بەهەشت و بەخۆشییەوە خەندە لەسەر لێو بوو و، کە جەستەی خاوەنەکەی بەدی دەکرد، بە ئاوریشمی نەرم نەپێچراوەتەوە، بەڵکو خەڵتانی خوێنێکی بێگەردە کە لە پێناوی خوادا رژا..

پاشان زەردەخەنە بێ خەمە شادەکەی زیاتر دەبێت، کەدەبینێت دووەمینی سەرکردەکە جەعفەرە وەك تیر بەرەو ئاڵاکە دێت تا وەریبگرێت و، هەڵیگرێت بەر لەوەی کە لەخۆڵدا ون ببێت..

**٢٠**

# جەعفەری کوڕی ئەبوطالب

## شێوەو ڕەوشتی لەمن دەچێت

سەرنجی لاوێتی بەرزی بدەن..

تەماشایەکی جوانی هەیبەتی بکەن..

سەیری لەسەر خۆیی و ئارامگری و.. بەسۆزی و.. خێرۆمەندی و خاکەڕایی و تەقوادارییەکەی بکەن..

بڕواننە ئازایەتیەکەی کە ئاشنای ترس و بیم نیە و.. سەرنجی بەخشندەییەکەی بدەن کە ترسی لە هەژاری نیە..

دیقەتی پاکی و بێ خەوشیەکەی بدەن..

لە ڕاستگۆیی و دەستپاکیەکانی ڕابمێنن.

سەرنجی هەموو شەنگییەك لە جوانیەکانی چاکێتی و، باشی و، مەزنی بدەن و، سەرسام مەبن دواتر، چونکە ئێمە لەبەرامبەر کەسێکداین کە لەهەموو کەس زیاتر شێوە و ئاکاری لە پێغەمبەر دەچێت..

ئێوە لە بەرامبەر کەسێکدان کە پێغەمبەر بە (باوکی نەداران)ی ناو بردووە..

ئێوە لە بەرانبەر کەسێکدان کە پێغەمبەرﷺ نازناوی (خاوەن دووباڵ)ی لێناوە..

ئێوە ڕووبەڕووی (باڵداری بەهەشت)ی دەنگخۆش.. (جەعفەری کوڕی ئەبوطالب)ن..!!

گەورەیەك لە گەورەکانی یەکەمین جار بڕوایان هێنا و مەزنترین ڕۆڵیان هەبوو لە داڕشتنی ویژدانی ژیاندا..!!

هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمان بوو، و جێگای بڵندی خۆی لەنێو ئەوانەدا گرت کە زۆر زوو بڕوایان هێنا..

(ئەسمائی کچی عومەیس)ی خێزانیشی هەمان ڕۆژ لەگەڵیدا موسڵمان بوو..

ئەمانیش مەردانە و بوێرانە پشکی خۆیان لە ئەشکەنجە و، دەربەدەری چەشت..

کاتێکیش پێغەمبەر کۆچکردنی بەرەو حەبەشەی بۆ هاوەڵانی هەڵبژارد، جەعفەر و خێزانەکەیشی کۆچیان کرد و چەند ساڵێك لەوێ مانەوە و، خوای گەورە سێ منداڵی پێبەخشین: موحەممەد،و عبداللە و، عەوف..

لەحەبەشە (جەعفەری کوڕی ئەبوطالب) وتە بێژی زمانپاراوی سەرکەوتووی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی بوو..

ئەمەش بەهۆی ئەو زیرەکی دڵ و، عەقڵ ڕوونی و، زرنگی دەروون و، زمان پاراویەیەوە کە خوا پێی بەخشیبوو..

گەر ڕۆژی (موئتە) کە پاشتر تا شەهید بوون تێیدا دەجەنگێت..

جوانترین و سەرفرازترین و جاویدانترین ڕۆژی تەمەنی بوو بێت..

ئەوا ڕۆژی (گفتوگۆ) کردنی لەگەڵ نەجاشیدا لەحەبەشە، لە جوانی و، بایەخ و، سەرفرازیدا هیچ لەو کەمتر نیە..

بەراستیش ڕۆژێکی زۆر گەورە و، دیمەنێکی تەواو سەرسوڕهێنەر بوو..

چونکە قورەیش پاش کۆچی موسڵمانەکان بۆ حەبەشە لە هەوڵدانی خۆی نەکەوتبوو و، هیچ لە رق و کینەی کەمی نەکردبوو، بەڵکو دەترسا لەوەی کە لەوێ بەهێز بن و، ژمارەیان زیاد بکات و، خۆ گەر دەرفەتی زۆربوون و بەهێزبوونیشیان بۆ نەڕەخسێت، ئەوا لوت بەرزیان ئەوەی بەسەر شۆڕی دەزانی کە ئەوانە لەژێر باری ئەشکەنجە و، ئازاری ئەمان دەرچن و..

لەوێ لە شوێنی کۆچ بۆ کردوویاندا بە هیوایەکی گەورە و دڵی پێغەمبەر بۆی بەهێزێت و، سنگی ئیسلامی پێ فراوان بێت..

ئالێرەوە سەرکردەکانیان بڕیاریان دا کە دوو نێردراو بەدیاری پڕ بەهاوە ڕەوانەی لای نەجاشی بکەن و، تکای خۆیانیان پێ بگەیەنن بەڵکو ئەو کەسانەی بەئاوارەیی و پەناهێندەی هاتوونەتە لایان لەو وڵاتە دەریان بکەن..

ئەو دوو نێردراوەش: عبداللەی کوڕی ئەبی ڕەبیعە و، عەمری کوڕی عاص بوو، کەتا ئەو ساتە موسڵمان نەبوو بوون..

نەجاشی کە ئەو سەردەمە لەسەر تەختی پادشایی حەبەشە بوو، خاوەنی بڕوایەکی ڕۆشن بوو..

لەناخی دڵەوە ئاینی مەسیحی بە پاك و بێگەردی و هۆشمەندانە وەرگرتبوو، دوور لەلادان و، بەدەر لەدەمارگیری و داخران..

باسکردنی زۆر لە پێش خۆی بوو.. سەربردەی دادگەریشی ئەوەندە بەناوبانگ بوو هەرکەسێ ڕێی بکەوتایەتە ئەوێ لە هەموو جێگایەك کەپێی بگەیشتایە باسی ئەو دادگەرییەی دەکرد، لەبەر ئەوەش بوو پێغەمبەر ﷺ وڵاتەکەی ئەوی هەڵبژارد و کردیە خانەی کۆچ کردنی هاوەڵانی..

هەر لەبەر هەمان هۆش بوو قورەیش دەترسا لەوەی کە ئەوەی دەیانەوێت بۆی نەیەتەدی، هەر بۆیە هەردوو نێردراوەکەی خۆیان بەدیاری گەورە و پڕ بەهاوە ناردە لای قەشە و، گەورە پیاوانی کەنیسە لەوێ، سەرکردەکانی قورەیش هەردوو نێردراوەکەی خۆیان ڕاسپارد کە تادیاریەکان نەدەن بە بەتریکەکان نەچنە دیداری نەجاشی، هەتا دید و بۆچوونەکانی خۆیانیان پێ بگەیەنن و، ببنە تکاکار و کۆمەککاریان لای نەجاشی.

هەردوو نێردراوەکە گەیشتنە حەبەشە و کوڵ و باریان لێ خست و، چاویان بەهەموو گەورە پیاوانی ڕۆحانیان کەوت و، ئەو دیاریانەی هێنابوویان پێیان بەخشین.. پاشان دیارییەکانی نەجاشیان نارد.

بەردەوام دەروونی (قەشە و بەتریکەکان)یان لەدژی موسڵمانەکان پڕ دەکرد لە ڕق و، دەیانکردە پاڵپشت تا نەجاشی واڵێ بکەن کە لەوڵاتەکەیان وەدەریان نێ.

ڕۆژی دیداری نەجاشی دیاریکرا، کە لەبەردەمیدا ڕووبەڕووی ڕکابەرە قورەیشیەکانیان دەبنەوە کە هەردەم بەفرت و فێڵ و ئازاریانەوە بەشوێنیانەوەن.

بەویقارێکی زۆر و، بێ فیزییەکی پایە بڵندەوە، نەجاشی لەسەر کورسیە بەرزەکەی دانیشت و، ئەسقەف و پیاوانی کاربەدەستی لە دەوری بوون و، بەرامبەریشی موسڵمانانی موهاجیر بەشێوەیەکی ڕێك و پێك دانیشتن، سەبووری خودا دایگرتبوون و، لە سێبەری بەزەیشیدا بوون، هەردوو نێردراوی قورەیشیش ڕاوەستان و هەمان ئەو تۆمەتەیان دووبارە کردەوە کە پێش ماوەیەك لەم دیدارە بەرفراوانە گەورەیە لە چاو پێکەوتنێکی تایبەتدا بەنەجاشیان ڕاگەیاند بوو!

((ئەی پادشا.. چەند گەنجێکی گێژ و گێل پەنایان هێناوە بۆ وڵاتەکەت، کە لەئاینی هۆزەکەیان دابڕاون و نەهاتوونەتە نێو ئاینەکەی تۆشەوە، بەڵکو ئاینێکیان داهێناوە، کە نە ئێمە ئاشنایني و نە تۆ، هەر بۆیە گەورە پیاوانی هۆزەکەیان، لە باوك و مامە و تیرەکانیان ئێمەیان ناردووە بۆ لاتان تا بیانگێڕیتەوە بۆ لایان))..

نەجاشی ئاوڕی دایەوە لە موسڵمانەکان و، لێی پرسین:

((ئەو ئاینەتان کامەیە کە لە ئاینی هۆزەکەتان دابڕیوون و، بێ باکیشی کردوون لە ئاینی ئێمە))..؟

جەعفەر هەستایە سەر پێ.. تا ئەو ئەرکەی موسڵمانانی کۆچکردوو بەراوێژ هەڵیان بژارد بوو بۆی بەر لە هاتنیان بۆ ئەم دانیشتنە ئەنجام بدات..

بەڵێ.. جەعفەر بەو پەڕی سۆز و ڕێزەوە هەستایەوە و، سەرنجێکی خۆشەویستانەی ئەو پادشایەی دا کە پەنادارێکی چاك بوو بۆیان و، وتی:

{ئەی پادشا..

ئێمە کەسانێك بووین لەسەردەمی نەفامیدا.. بتمان دەپەرست و، گۆشتی مردارەوەبوومان دەخوارد و، خراپەمان دەکرد و، پەیوەندی خزمایەتیمان پچڕاندبوو، لە هاوسێیەتیدا خراپ بووین و، بەهێز لە نێوماندا بێ دەسەڵاتی دەخوارد.. تا خوای گەورە لە خۆمان پێغەمبەرێکی بۆ ناردین، کە ڕەچەڵەك و، ڕاستگۆیی و، دەستپاکی و، پاك و بێگەردی ئاشناین، ئەویش بەرەو لای خودا بانگی کردین تا تەنها ئەو بەخوا بزانین و بیپەرستین و، واز لەو بت و بەردانە بهێنین کە ئێمە و باو و باپیرانمان دەمانپەرست..

فەرمانمان پێ دەکات لە قسەکردندا راستگۆ بین و، سپاردە بەجێ بگەیەنین و، پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بهێنین و، هاوسێیەکی چاك بین و، واز لە شتی قەدەغەکراو و خوێنرێژی بهێنین..

رێگری ئەنجامدانی خراپەکاری و، قسەی درۆ و، خواردنی ماڵی هەتیوو، قسە هەڵبەستن بۆ ئافرەتانی داوێن پاکمان لێدەکات.. ئێمەش بەراستمان زانی و بڕوامان پێ هێنا و، شوێنی کەوتین لەوەی کە لای پەروەردگاریەوە بۆی هاتبوو، جا خودای تاك و تەنهامان پەرست و هیچ شتێکمان نەکردە هاوبەش و، ئەوەی لێی قەدەغەکردبووین ئێمەش وازمان لێ هێنا و، ئەوەشی حەڵاڵی کرد ئێمەش حەڵاڵمان کرد، جا هۆزەکەمان دایان بەسەرماندا و ، ئەشکەنجەیان داین و لەسەر ئاینەکەمان بگرە و بەردەیان بۆ دروست کردین، تا بمانگێڕنەوە بۆ پەرستنی بت و، ئەو خراپەکاریانەی کە پێشتر لەسەری بووین..

کاتێ دڵڕەقانە رووبەرووەمان بوونەوە و، ستەمیان لێکردین و، جێگەیان پێ لێژکردین و، ئێمەیان لە ئاینەکەمان دابڕی، لە وڵاتی خۆمان دەرچووین و پەنامان بۆ لای تۆ هێنا، بەو ئومێدەی لەلای تۆ ستەممان لێ نەکرێت}..

جەعفەر ئەم وشانەی وەك گزنگی بەیان درکاند و، دەروونی نەجاشی پڕ کرد لە هەست و شادی و..

ئاوڕی لە جەعفەر دایەوە و لێی پرسی:

((ئایا لەوەی بۆ پێغەمبەرەکەتان هاتۆتە خوارەوە هیچت پێیە))..؟؟

جەعفەر وتی: بەڵێ..

نەجاشی پێی وت: دەی بیخوێنەرەوە بۆم..

ئەمجا جەعفەر دەستی کرد بەخوێندنەوەی چەند ئایەتێك لە سوورەتی (مەریەم)، خوێندنەوەیەکی سەرنج راکێشی جوانی کاریگەر و.. نەجاشی گریا و هەموو قەشەکانی دەوریشی لەگەڵیدا دەستیان کرد بە گریان..

کاتێك فرمێسکە بەکوڵەکانی سڕییەوە، ئاوڕی لە هەردوو نێردراوی قورەیش دایەوە و، وتی:

{ئەمە و، ئەوەی کە عیسا هێنا بووی، لەیەك سەرچەشمەوە دەرچوون.. بڕۆنەوە سوێند بەخوا نایاندەمەوە دەستتان}..!!!

خەڵکەکە بڵاوەیان لێ کرد و، خوای گەورە بەندەکانی سەرخست، لەکاتێکدا کە هەردوو نێردراوەکەی قورەیش تووشی دۆڕانێکی خراپ بوون..

بەڵام (عەمری کوڕی عاص) کەسێکی فێڵباز و زۆرزان بوو، دۆڕان شکستی پێ نەدەدا و، سەری بۆ بێ ئومێدی کەچ نەدەکرد..

بەمجۆرە کە لەگەڵ هاوڕێکەیدا دەگەڕایەوە بۆ شوێنی حەوانەوەیان، لە بیرکردنەوە و نەخشەداناندا بوو و، بەهاوڕێکەی وت:

((سوێند بەخوا سبەینێ دەچمەوە لای نەجاشی و، شتێکی پێدەڵێم ئەم خۆشییەیان نەهێڵێت))..

هاوڕێکەی پێی وت: ((وامەکە، ئەوانە خزممانن، ئەگەرچی جیاوازیشیان هەبێت لەگەڵمان و سەرپێچیمان بکەن))..

عەمر وتی: ((سوێند بەخوا پێی دەڵێم کە ئەوانە دەڵێن عیسای کوڕی مەریەم بەندەیەکە، وەك هەموو بەندەکان))..

کەواتە ئەمەش داوێکی نوێیە کە نێردراوەکەی قورەیش بۆ موسڵمانەکانی ناوەتەوە تا بیانخاتە هەڵوێستێکی دیژوارەوە و، بکەونە نێو هەردوو بەردی دەستهاڕێکەوە، گەر وتیان: عیسای کوڕی مەریەم بەندەیەکە لە بەندەکانی خوا، ئەوا رق و قینی پادشا و قەشەکانیان لەبەرامبەر هەڵدەستێنن.. خۆ گەر ئەوەشیان رەتکردەوە کە عیسا مرۆڤ بێت، ئەوا لە ئاینەکەیان دەرچوون..!!

بۆ بەیانی بەرەو لای پادشا کەوتنە ڕێ و، عەمر پێی وت:

((ئەی پادشا: ئەمانە قسەیەکی سەیر لە بارەی عیساوە دەکەن))..

قەشەکان شڵەژان..

ئەم دەستەواژە کورتە ورتە ورتی تێ خستن و وروژاندنی..

بۆ جارێکی دی ناردیانەوە بەشوێن موسڵمانەکاندا تا لەبارەی هەڵوێستی ئاینەکەیان سەبارەت بە عیسا پرسیاریان لێ بکەن..

موسڵمانان هەستیان بەو پلانە نوێیە کرد و، کۆبوونەوە و راوێژی خۆیان دەکرد..

پاشان پێکهاتن لەسەر ئەوەی کە ئەو راستیەی لە پێغەمبەرەکەیان ﷺ بیستووە هەر ئەوە بڵێن و، هێندەی تاڵە موویەك لێی لانەدەن، ئیدی چی دەبێت با ببێت..!!

سەر لەنوێ دانیشتن سازکرا و.. سەرەتا نەجاشی دەستی کرد بەقسەکردن و لەجەعفەری پرسی:

{لە بارەی عیساوە چی دەڵێن}..؟؟

جەعفەر بۆ جارێکی کە وەك چرایەکی پڕشنگدار هەستایەوە و وتی:

{ئەوەی کە پێغەمبەرەکەمان ﷺ هێناویەتی بۆمان لەبارەیەوە ئەوە دەڵێین: عیسا بەندەی خوایە و پێغەمبەریەتی و، خوا بەخشی بەمەریەم و، رۆحیشی لەئەو بوو}..

نەجاشی راستی و دروستی ئەوەی کە لە بارەی عیساوە رایگەیاند دووپاتکردەوە و، وتی عیساش هەر هەمان شتی لە بارەی خۆیەوە وتووە..

بەڵام ریزی قەشەکان ژاژاوەی تێکەوت وەك ئەوەی نارازی بن..

ئەجاشی برواداری بەرچاو روون بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی بۆ موسڵمانەکان و، وتی:

{برۆن، ئێوە لە خاکی مندا پارێزراون و، هەر کەسێك جنێوتان پێ بدات یان ئازارتان بدات، ئەوا باجی ئەو کارەی لەسەرە کە ئەنجامی داوە}..

پاشان ئاوڕی لەدەورووبەرەکەی دایەوە و، بە پەنجەیش ئاماژەی بۆ هەردوو نێردراوەکەی قورەیش دەکرد، وتی:

{دیاریەکانیان پێ بدەنەوە، هیچ پێویستیم پێیان نیە..

سوێند بەخوا کاتێك خوای گەورە ئەم موڵکەمی بۆ گێڕامەوە بەرتیلی لێ وەرنەگرتم، جامن بێم و بەرتیلی تێدا وەربگرم}..!!!

دوو نێردراوەکەی قورەیش بەسەر شۆڕی هاتنە دەرەوە و، دەست بەجێ بەرەو مەککە ڕێیان گرتە بەر و چوونەوە بۆ ئەوێ..

موسڵمانەکانیش بەسەرۆکایەتی جەعفەر هاتنە دەرەوە تا درێژە بە ژیانی ئارامی خۆیان بدەن لە حەبەشە، تێیدا بمێننەوە هەروەك دەیان ووت: ((لە چاکترین ماڵ و.. لەگەڵ باشترین دراوسێ دا..)) هەتا خوای گەورە مۆڵەتیان دەدات کە بگەڕێنەوە بۆ لای پێغەمبەر و براکانیان و بەرە و زێدی خۆیان..

پێغەمبەری خوا ﷺ ئاهەنگی رزگارکردنی (خەیبەر)ی دەگێڕا کاتێك جەعفەری کوڕی ئەبوطالب و ئەو موسڵمانانەی کەتا ئەو ساتە لەگەڵیدا مابوونەوە لە حەبەشە، هاتنەوە..

بەهاتنەوەشی دڵی پێغەمبەر پڕ بوو لە خۆشی و، شادی و، مژدە..

دەستی کردە ملی و فەرمووی:

{نازانم بەکامیان دڵخۆش بم: بەرزگارکردنی خەیبەر.. یان بەگەڕانەوەی جەعفەر..}

ئەمجا پێغەمبەر و هاوەڵانی بۆ ئەنجامدانی ((عومرەی قەزا)) بەرەو مەککە کەوتنە ڕێ و، پاش بەجێهێنانی گەڕانەوە بۆ مەدینە و، دڵی جەعفەر پڕ لە شادی بوو بەبیستنی هەواڵی برا بڕوادارەکانی کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ غەزای —بەدر و ئوحود... چەندین دیمەن و غەزای دیکەیان ئەنجام داوە و.. چاویشی پڕ لە ئەشك بوو بۆ ئەوانەی کە بە پلەی شەهیدی گەیشتن و راستیان کرد لەگەڵ ئەو بەڵێنەی دابوویان و..

دڵی ئەمیش بۆ بەهەشت لێی دەدا و پەرۆشی بوو، لەبۆسەدا بوو بۆ دەستکەوتنی دەرفەتی شەهید بوون و، چاوەڕوانی ساتە سەرفرازەکەی دەکرد..!!

غەزای (موئتە) هەروەك پێشتر باسمان کرد، ئالاکانی لە ئاسۆدا دەشەکایەوە و بەرەو کۆڕی تێکۆشان دەجولا..

جەعفەر هەلی تەمەنی لەم غەزایەدا بەدی کرد، یا ئەوەتا سەرکەوتنێکی گەورە بۆ ئاینی خودا بەدەست دەهێنێت، یان شەهید بوونێکی مەزنی لە پێناوی خودا بۆ دەبێت..

جا لە پێغەمبەری خوا ﷺ چوویە پێشەوە بەو ئومێدەی کە لەم غەزایەدا جێگایەکی بۆ دیاری بکات..

جەعفەر بەچاکی دەیزانی کە ئەوە گەشت و سەیران نیە و.. جەنگێکی بچوك و ئاساییش نیە.. بەڵکو جەنگێکە کە ئیسلام پێشتر شەڕی وەهای بەخۆوە نەدیبوو.. جەنگ لە دژی سوپاکانی ئیمراتۆریەتێکی گەورە و بەربڵاو، کە خاوەنی چەك و تفاق و ژمارە و ئەزموون و ماڵ و سامانێکی وەهایە کە عەرەب و موسڵمانەکان هاوتای نین، لەگەڵ ئەوەشدا پڕ بەدڵ پەرۆشی بوو، یەکێك بوو لەو سێ کەسەی کە پێغەمبەر بۆ سەرکردایەتی سوپاکەی دیاری کردبوون..

سوپا بەڕێ کەوت و، جەعفەریش لەگەڵیاندا رۆشت..

لەرۆژێکی سامناکدا هەردوو سوپا بەیەك گەیشتن..

لە کاتێکدا جەعفەر مافی خۆی بوو کە تووشی سەرسامی بێت کاتێك سوپای رۆمی بەدی کرد کە خۆی لە دوو سەد هەزار جەنگاوەر دا دەبینێتەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە وەك بڕوادارێکی بەڕێز و ئامادە سازی پاڵەوانێکی بەتوانا هەستی بەشادییەکی بێ سنوور کرد و، دەیزانی کە ئەو لەدژی هاوشان و هاوشێوەی خۆی دەجەنگێت..!!

ئاڵاکەش لەوەدا بوو لە دەستی راستی (زەیدی کوڕی حاریسە) بەربێتەوە، جەعفەر خۆی گەیاندێ و بەدەستی راستی لێی وەرگرت و.. بەشێوەیەکی بێ وێنە دەجەنگا..!

جەنگانی پیاوێك کە بەدوای سەرکەوتندا وێڵ نیە، بەڵکو شەهید بوونی مەبەستە..

سەربازانی رۆم زۆر بوون و دەورەیان دا، سەیری کرد ئەسپەکەی رێگای جوڵانی نیە بۆیە لێی دابەزی و.. شمشێرەکەی ئاراستەی دوژمنەکانی کرد و.. بینی یەکێك لە دوژمنان دەیەوێت لە ئەسپەکەی نزیك بێتەوە تا سواری بێت، بەلایەوە ناڕەحەت بوو کە ئەو نەگریسە بچێتە سەر ئەسپەکەی، هەر بۆیە شمشێرەکەی بۆ درێژکرد و، ملی پەڕاند..!!

ئەمجا وەك زریان بەربوویە ریزی رۆمەکان و، ئەم هەڵبەستە ورووژێنەرەی بەدەنگی بەرز دەوتەوە:

یا حبذا الجنة و اقتـرابها　　طيبة و باردا شرابها

والروم روم، قد دنا عذابها　　كافرة بعيدة انسابها

علي اذ لاقيتها ضرابها

واتە: چەند شیرینە بەهەشت و نزیك بوونەوە لێی، کە خواردنەوەکانی خۆش و ساردە و.. رۆمیش هەر رۆمە سزا و ئەشکەنجەی نزیك بۆتەوە و، کافر و بێ بنەچەن.. هەر بۆیە لەسەرمە لێی بدەم کە پێی گەیشتم.

جەنگاوەرانی رۆم توانای ئەم پیاوەیان بۆ دەرکەوت کە وەك سوپایەکی بێ شومار دەجەنگێت..

هەر بۆیە شێتانە دەورەیان داو سوور بوون لەسەر کوشتنی و.. بەجۆرێك ئابلۆقەیان دا کە رێگای دەربازبوونی نەبێت..

بەشمشێر لە دەستی راستیان دا و، بەر لەوەی ئاڵاکەی لەدەست بکەوێتە سەر زەوی بەدەستی چەپی گرتی.. لەدەستەکەی دیکەشیان دا، ئەمجا بەباڵەکانی ئاڵاکەی راگرت..

ئالێرەدا هەموو بەرپرسیارێتی ئەو لەوەدا خۆی دەبینیەوە کە لێنەگەرێت ئاڵای پێغەمبەری خوا ﷺ تا ئەو گیانی تێدا بێت بکەوێتە سەر زەوی..

ئەو ساتەیشی جەستەی پاکی بەلادا هات و کەوت، داری ئاڵاکە لە نێو هەردوو باڵی جەستەیدا چەقی بوو و، شەکانەوەکەی بانگی (عبداللەی کوڕی ڕەواحە) دەکرد و، ئەویش وەك تیرێکی هاوێژراو بەرەو رووی هات و، بەهێزانە گرتیە دەستی و، بەرەو سەر ئەنجامێکی مەزن پێوەی کەوتە رێ.!!

بەم جۆرە، جەعفەر مردنێکی بۆ خۆی هەڵبژارد کە لە مەزنترین مردنەکانی مرۆڤ بێت..!!

بەم شێوەیە بەدیداری پەروەردگاری باڵادەستی شادبوویەوە و، بەخۆ بەختکاری یەکلاکەرەوە و، پاڵەوانێتی پێچراوەیەوە..

خودای زانا و بەئاگا پێغەمبەری لەسەر ئەنجامی شەڕەکە و، ئاکامی جەعفەر ئاگادار کرد و، ئەویش ماڵئاوایی لێکرد و گریا..

هەستایەوە و بەرەو لای ماڵی ئامۆزاکەی کەوتە رێ و، منداڵەکانی بانگ کرد و، بۆنی کردن و ماچی کردن و، چاوی پڕ بوو لە ئەسرین..

پاشان گەڕایەوە بۆ کۆڕەکەی و، هاوەڵانی دەورەیان دا بوو، شاعیری ئیسلام (حەسانی کوڕی سابیت) هەستا بۆ شیوەنی جەعفەر و هاوەڵانی وتی:

| | |
|---|---|
| غداة مضوا بالمؤمنين يقودهـم | الى الموت ميمون النقية ازهر |
| اعز كضوء البدر من ال هاشـم | ابي اذا سيم الظلامة مجسـر |
| فطاعن حتى مال غير موسـد | لمعترك فيه القنـا يتكسـر |
| فصار مع المستشهدين ثوابـه | جنان، و ملتف الحدائق اخضر |
| وكنا نرى من جعفر من محمـد | وفاء و امرا حازما حين يأمر |
| فمازال في الاسلام من آل هاشم | دعائم عز لا يزلن و مفخر |

لەدوای (حەسان)یش (کەعبی کوڕی مالیك) هەستایەوە و هۆنراوەی (الجزل)ی خۆی ئاراستە کرد:

| | |
|---|---|
| وجدا على النفر الذين تتابعوا | يومـا بمؤتة، اسـندوا لم ينقلوا |
| صـلى الاله عليهمـو من فتية | وسـقى عظامهم الغمام المسبل |
| صـبروا بمؤتة للاله نفوســـهم | حذر الردى، ومخافة أن ينكلـوا |
| اذ يهتـدون بجعفـر ولـــواؤه | قـدام أولـهــــم، فنعـــم الأول |

حتى تفرجت الصفوف وجعفر حيث التقى وعث الصفوف مجدل

فتغيـر القمر المنيـر لفقـده والشمس قد كسفت، وكادت تأفل

هەموو هەژار و نەداران بۆ باوکیان گریان، چونکە بەراستی جەعفەر باوکی هەژاران، بوو..

ئەبو هورەیرە دەڵێت:

{جەعفەری کوڕی ئەبو طالب باشترین کەس بوو بۆ هەژاران}..

بەڵێ، بەخشندەترین کەس بوو لەماڵەکەیدا کاتێك زیندوو بوو.. ئەو ساتەی ئاکامیشی هات تەنها بەوە رازی بوو کە لە هەموو شەهیدان بەخشندە تر و لەهەموویان زیاتر گیان و ژیانی کۆشش پێ کردبێت..

عبداللەی کوڕی عومەر دەڵێت:

{لە غەزای موئتەدا لەگەڵ جەعفەردا بووم، کاتێ سەیرمان کرد، بینیمان زیاد لەنەوەد جێی شمشێر و رمی پێوە دیار بوو}..!!

زیاد لەنەوەد جێ شمشێر و شوێنی رم..؟؟!!

لەگەڵ ئەوەشدا، ئایا بکوژانی توانیان زیان بەرۆح و سەرئەنجامی بگەیەنن..؟؟

هەرگیز نەیانتوانی.. شمشێر و رمەکانیشیان تەنها پردێك بوو شەهیدی پایەبەرز بەسەریدا پەڕیەوە بۆلای پەروەردگاری خاوەن بەزەیی و باڵادەستی و، جێگایەکی بڵندی بەدەست هێنا..

ئەو لەوێیە لەبەهەشتی نەبڕاوەدا، نیشانەی جەنگەکەی لەسەر هەموو جێ شمشێرێکی جەستەی لەت لەتی هەڵگرتووە..

گەر ئارەزووشتان لێ بوو، ئەوا گوێ لە پێغەمبەر ﷺ رادێرن، کە دەفەرموێت:

{لەبەهەشتدا بەدیم کرد.. دوو باڵی خوێناوی هەبوو.. قاچەکانیشی بۆیە کرابوون}..!!!

# ٢١

# عبدالله کوڕی ڕەواحە

ئەی نەفسەکەم. گەر نە شکوژرێیت هەر دەمریت !!

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بەدزی بێ باوەڕانی قورەیشەوە لەگەڵ شاندی موسڵمانانی مەدینەدا لە نزیك مەککە دانیشت و، دوازدە سەردەستەی ئەنصار تێیدا پەیمانی یەکەمیان دا، (عبداللەی کوڕی ڕەواحە) یەك بوو لەو سەردەستانەی ئیسلامیان بەرەو مەدینە هەڵگرت و، ئەوانەی کە ئەم پەیماندانەیان ڕێگای بۆ کۆچکردن سازکرد کە ئەویش پێگەیەکی چاك بوو بۆ ئاینی خودا و ئیسلام..

ئەو ساتەیشی پێغەمبەر ﷺ پەیمانێ عەقەبەی دووەمی لە حەفتاو سێ کەسی ئەنصاری خەڵکی مەدینە وەرگرت، (عبداللە)ی مەزن یەکێك بوو لەو سەردەستە پەیماندەرانە..

پاش کۆچکردنی پێغەمبەر و هاوەڵانیشی بۆ مەدینە و جێگیر بوونیان لەوێ (عبداللەی کوڕی ڕەواحە) لە هەموو ئەنصاریەکان زیاتر کاری دەکرد بۆسەر خستنی ئاینی خوا و پاڵپشتکردنی بونیاتنانی و، لە هەموویان زیاتر ئاگاداری فرت و فێڵەکانی (عبداللەی کوڕی ئوبەی) بوو کە خەڵکی مەدینە لەوەدابوون بەر لە کۆچکردنی ئیسلام بۆ ئەوێ بیکەن بەپادشا و فەرمانڕەوای، کەتاڵی ئەو دەرفەتە لەدەست چووەی لە قورگی نەدەهاتە دەرەوە، هەربۆیە زۆر زانی و فرت و فێڵی خۆی بەکاردەهێنا بۆ تەڵەنانەوە بۆ ئیسلام.

لەهەمان کاتدا (عبداللەی کوڕی ڕەواحە) بەزرنگی و بەرچاو ڕوونیەوە چاودێری ئەو فرت و فیڵانەی دەکرد و، زۆربەی هەوڵەکانی (عبداللەی کوڕی ئوبەی) بەهەدەر دابوو، فرت و فێڵەکانی لە جوڵە خستبوو..!! (عبداللەی کوڕی ڕەواحە)، خوێندەوار بوو لەژینگەیەکدا کە زۆر کەم خوێندەواری تێدا بوو..

جگە لەوە شاعیریش بوو، هۆنراوەی سازگار و بەهێز لە لێوەکانیەوە دەردەپەڕین..

لەو کاتەوەیش کە موسڵمان بوو، توانای شیعری خۆی خستبووە خزمەت ئیسلام..

پێغەمبەریش ﷺ شیعرەکانی خۆش دەویست و زۆری لێ دەبیست..

ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا دانیشت و، (عبداللەی کوڕی ڕەواحە) هات، پێغەمبەر لێی پرسی:

{ کەر ویستت شیعر بڵێیت چۆن دەیهۆنیتەوە }..؟؟

عبداللە وەڵامی دایەوە: {سەرنجی دەدەم و پاشان دەیڵێم}..

ئەمجا حازر بەدەست دەستی بەهۆنینەوە کرد:

| | |
|---|---|
| یا هاشم الخیر ان الله فضلکم | علی البریة فضلا مالـه غیر |
| إني تفرست فیك الخیر أعرفه | فراسة خالفتهم في الذي نظروا |
| ولو سألت أو استنصرت بعضهم | في حل أمرك ماردوا ولا نصروا |

فثبت الله ماآتاك من حسن تثبيت موسى و نصرا كالذي نصروا.

واتە: ئەی هاشمی چاك خودا فەزڵی ئێوەی بەسەر چاکەکاراندا، بەشێوەیەکی نەگۆڕ من پێشبینی چاکەم کردووە لە تۆدا و دەیناسم، پێشبینیەك جیاوازە لە تێروانینی دیکەی سەیرکاران جا گەر داخوازیت بوو، یان هەندێکیانت سەرخست، لە چارەسازی کاروبارتدا هەرگیز رەتی ناکەنەوە و سەرت ناخەن خودا ئەو چاکەی پێی بەخشیوویت بچەسپێنیت، وەکو موسا و سەرکەوتنێکی وەك ئەوت پێ ببەخشێت.

پێغەمبەر ﷺ دڵخۆش بوو پێی و، فەرمووی:

{لەگەڵ تۆدا، خودا بیچەسپێنێت}..

ئەو کاتەش کە پێغەمبەر ﷺ لە عومرەی قەزادا بە دەوری ماڵی خوادا دەسوڕایەوە، (عبداللەی کوڕی رەواحە) لەبەر دەستیدا بوو و، هەڵبەستی بۆ دەوت:

یارب لولا انت ماهتدينا ولا تصدقنا ولا صلينا

فـأنزلن سـكينة علينا وثبت الاقدام ان لاقينا

ان الذيـن قد بغو علينا اذا ارادوا فيتنة ابينـا

واتە)) پەروەردگارا گەر تۆ نەبای هیدایەتمان نەدەدرا و، بڕوامان نەدەهێنا و، نوێژمان نەدەکرد دەسا سەبووریت داببارێنە بەسەرماندا و، دامەزراومان بکە لەکاتی رووبەڕووبونەوە دا، ئەوانەی دەستدرێژیان کردە سەرمان، گەر مەبەستیان ئاشووب بێت خۆمانیان لێ لادەدەین))

موسڵمانانیش هۆنراوە جوانەکانیان دەوتەوە..

ئەم شاعیرە شیعر زۆرە، غەمبار بوو کاتێك ئایەتی:

﴿وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ: شاعیران، گومڕاکان لە دوویان دەچن.﴾ الشعراء/٢٢٤-دابەزی..

بەڵام دەروونی سەبووری بۆ هات کە ئایەتێکی دیکە هاتە خوارێ:

﴿إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَذَكَرُوا اللَّهَ كَثِيرًا وَانتَصَرُوا مِنْ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا: مەگەر ئەوانەی بڕوایان بە خوا هەیە و ئاکارچاکن و زۆر یادی خوایان کردووە و پاش ئەوەی چەوسێنرانەوە، هەر تۆڵەی خۆیان کردەوە.﴾الشعراء/٢٢٧.

کاتێکیش ئیسلام ناچارکرا بۆ بەرگری کردن لەخۆی بجەنگێت، (عبداللەی کوڕی رەواحە) لە غەزاکانی (بەدر) و (ئوحود) و (حودەیبیە) و (خەیبەر)دا شمشێرەکەی گرتبووە دەست و، ئەو وشانەی هۆنراوەکەی کردبوو دروشمی هەمیشەیی:

{ئەی نەفسەکەم، گەر نەشکوژرێیت هەر دەمریت}..

لە هەموو جەنگ و غەزایەکیشدا هاوارى لەبێ باوەڕان دەکرد:

خلوا بني الكفار عن سبيله      خلوا، فكل الخير في رسوله

واتە: واز لە بێباوەڕان بێنن بەرێی خۆیاندا بچن، وازیان لێ بێنن، هەموو چاکەیەك لە پێغەمبەرى خوداوەیە.

غەزاى (موئتە) بەرپا بوو..

(عبدالله) سێیەمین سەرکردەى بوو، هەروەك پێشتر لە باسى (زەید) و (جەعفەر)دا خستمانە روو..

(عبدالله) لە کاتێکدا کە سوپا مەدینەى بەجێ دەهێشت راوەستا و، هۆنراوەى دەهۆنیەوە ووتى:

لكنني أسأل الرحمن مغفرة      وضربة ذات فرع تقذف الزبدا

أو طعنة بيدي حران مجهـزة      بحربة تنفذ الاحشاء والكبدا

حتىيقال إذا مروا على جدثي      يا أرشد الله من غاز، وقد رشدا

واتە: لە خوداى بەخشندە دەخوازم لێم ببورێت و، لێدانێکى وام بەریکەوێت کە یا بریندارببوونێکى وا، بە ڕمێك کە ناوسك و جەرگ ببڕێت، هەتا گەر بەسەر لاشەکەمدا تێپەڕین بڵێن، چەند جەنگاوەرێکى بەتوانا بوو، تواناى خۆى نواند.

بەڵێ.. ئەوە خۆزگەى بوو.. بەس.. لێدانى شمشێرێك یان بەرکەوتنى ڕمێك، کە بیگەیەنێتە دونیاى شەهیدانى سەرفراز..!!

سوپا بەرەو (موئتە) کەوتە ڕێ، کاتێك موسڵمانان لە دوژمنەکەیان نزیك بوونەوە سڵیان دەکرد لە سوپاى دووسەد هەزار کەسى رۆم.. ریزى وەهایان بەدى دەکرد کۆتایى نەبوو، لە ژمارە نەدەهات..!!

موسڵمانان سەرنجى ژمارەى کەمى خۆیانیان دا و، دەستەوسان بوون و.. هەندێکیان وتیان:

((با هەواڵ بنێرین بۆ پێغەمبەرى خوا و، لە ژمارەى دوژمن ئاگادارى بکەین، جا یا ئەوەتا خەڵکمان بۆ رەوانە دەکات، یا ئەوەتا فەرمانمان پێدەکات بگەڕێینە دواوە و ئێمەش گوێڕایەڵى دەبین))..

بەڵام (عبداللەى کوڕى رەواحە) لەنێو ریزەکانیاندا وەك ڕۆژى رووناك هەستایەوە و، پێى وتن:

{ئەى خەڵکینە...

سوێند بەخوا ئێمە.. لەگەڵ دوژمنەکەماندا بەژمارە و، هێز و، زۆرى، ناجەنگین..

تەنها بەهۆى ئەو ئاینەوە دەجەنگین کە خواى گەورە ڕێزى لێناوین پێى..

دەسا بەڕێ بکەون.. سەر ئەنجام یەکێك لەم دوو چاکەیە دەبێت، یا سەرکەوتن، یان شەهید بوون}..

جا ئیماندارانی ژمارە کەمی، زۆر باوەڕدار هاواریان کرد،..

{سوێند بەخوا، (کوڕی رەواحە) راستی وت}..

ئەمجا سوپا بەرەو ئامانجی خۆی کەوتە ڕێ و، بەژمارەیەکی کەمەوە ڕووبەڕووی ئەو دووسەد هەزارە بوویەوە کە رۆمەکان بۆ شەڕێکی خوێناوی ترسناك کۆی کردبوویەوە..

هەروەك پێشتر باسمان کرد، هەردوو سوپا بەیەك گەیشتن..

سەرکردەی یەکەم (زەیدی کوڕی حاریسە) کەوت و پلەی بەرزی شەهیدی بەدەست هێنا..

سەرکردەی دووەم (جەعفەری کوڕی ئەبوطالب) شوێنی گرتەوە تا بەو پەڕی کەیف و شادی و سەربەرزیەوە ئەویش شەهید بوو..

ئەمجا نۆرەی سەرکردەی سێیەم هات، کە (عبداللەی کوڕی رەواحە) بوو، هات ئاڵاکەی بەدەستی راستی لە جەعفەر وەرگرت.. لە کاتێکدا کە جەنگ لەگەرمەدا بوو و، لەوەدا بوو ئەو موسڵمانە کەمانە لەنێو جەنجاڵی ئەو سوپا زۆر و بێ شومارەدا ون دەبوو، کە (هیرقل) هێنابووی..

ئەو کاتەی کە (عبدالله) وەك سەربازێك دەجەنگا، بەبێ دوو دڵی و سڵ کردن دەهات و دەچوو..

بەڵام ئێستا.. کە بۆتە سەرکردەی سوپا و بەرپرس لە ژیانی، لە بەرامبەر درندەی رۆمدا خەریك بوو دابمێنێت، وەك ئەوەی دوو دڵی و ترس دایگرتبێت، بەڵام هێندەی نەبرد هەموو هێزی مەترسی لە خۆی دوور خستەوە و هاواری کرد..

| | |
|---|---|
| أقسمت يا نفس لتنـزلنه | مالي أراك تكرهين الجنة |
| يا نفس إلا تقتلي تموتي | هذا حمام الموت قد صليت |
| وما تمنيت فقد أعطيـت | إن تفعلي فعلهما هديت |

واتە: ئەی نەفسەکەم، سوێندم خواردووە کە دەبێت دابەزیتە ناو جەنگەکە، چییە دەبینم رقت لە بەهەشتە؟؟ ئەی نەفسەکەم، گەر نەشکوژرێیت هەر دەمریت، ئەمەش کۆتری مەرگە و واگەیشتووە. ئەوەی ئاواتت بوو واپێت بەخشرا، گەر وەك ئەوان بکەیت، ئەوا هیدایەت دراویت.

مەبەستیشی لەوان هەردوو سەرکردەی هاوەڵی بوو کە شەهید بوون: زەید و جەعفەر.

ئەمجا وەکو زریان بەربوویە سوپای رۆم..

خۆ گەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە ئەو رۆژە وەك وادەی لەگەڵ بەهەشتدا نووسرابوو، ئەوا بە شمشێرەکەی بەردەوام لێی دەدان هەتا هەموو جەنگاوەرە کۆکراوەکانی لەناو دەبرد.. بەڵام ساتیماڵئاوای و کۆچکردنی زەنگی لێدا و سەرەتای بەرەو لای خوای گەورە گەڕانەوەی راگەیاند و، شەهید بوو..

جەستەی بەلادا هات و، گیانی بەجەرگی بێگەردی بەرەو لای پەروەردگاری بالآ دەست بوویەوە..

و گەورەترین خۆزگەی هاتەدی:

حتى يقال إذا مروا على جدثي يا أرشد الله من غاز، وقد رشدا

واتە: هەتا گەر بەسەر لاشەکەمدا تێپەڕین بڵێن، چەند جەنگاوەرێکی بەتوانا بوو، توانای خۆی نواند.

بەڵێ ئەی (عبداللهی کوڕی رەواحە)..

ئەی ئەو جەنگاوەرە بەتوانایەی، توانای خۆت نواند..!!!

لە کاتێکدا جەنگ لەسەر خاکی (بەلقاء) لە شام بەردەوام بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە لەگەڵ هاوەڵانیدا دانیشتبوو، قسەی بۆ دەکردن و قسەیان بۆ دەکرد..

لەناکاو، کە بەدڵنیایی و خۆشیەوە بۆ یەك ئەدوان، پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگ بوو، پێڵوی چاوەکانی کەمێك داخست و.. پاشان بەرزی کردەوە و بریسکەی غەم و ناسۆر و خۆشەویستی دەرکەوت..!!

سەرنجی پڕ لە داخ و کەسەری بڕیە روخساری هاوەڵانی و، فەرمووی:

{زەیدی کوڕی حاریسە ئالآکەی هەڵگرت و جەنگا تا شەهید بوو..

پاشان (جەعفەر) لێی وەرگرت و پێوەی جەنگا، تا ئەویش شەهید بوو..

کەمێك بێدەنگ بوو، دواتر دەستی کردەوە بەقسەکردن و فەرمووی:

پاشان (عبداللهی کوڕی رەواحە) گرتیە دەست جەنگا، تا شەهید بوو}..

بۆ جارێکی دی کەمێك بێدەنگ بوو، ئەمجا چاوەکانی بەرووناکیەکی، شادی، دڵنیا، بەرۆش، درەوشاوە و فەرمووی:

{بەرزکرانەوە بۆ لام لە بەهەشتدا}..!!!

ع گەشتێکی بەرزە ئەو گەشتەیان..

ع پێکهاتنێکی بەختەوەرانەیە..

هەموویان پێکەوە بۆ غەزا چوونە دەرێ..

پێکەوەش هەموویان بەرەو بەهەشت بەرز بوونەوە..

باشترین سڵاویش ئاراستەی یادی نەمریان بکرێت، ئەم وشانەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو بەرزکرانەوە بۆ لام لە بەهەشتدا}..!!

## ٢٢

# خالیدی کوڕی وەلید

## ناخەوێت و لێناگەڕێ کە سپیش بخەوێنێ!!

سەرگوزشتەیەکی سەیری هەیە..!!

ئەو پیاوەی لەرۆژی (ئوحود)دا موسڵمانانی خستە ناڕەحەتیەوە و.. رۆژەکانی دیکەش دوژمنانی ئیسلامی تووشی ناڕەحەتی کرد..!!

دەبا ئێمەش سەربردەکەی لەسەرەتاوە دەست پێ بکەین..

بەڵام چ سەرەتایەك..؟؟

ئەو خۆیشی، هیچ رۆژێکی دیکە، جگە لەو رۆژەی کە تێیدا دەستی خستە نێو دەستی پێغەمبەر و بەڵێنی پێدا، بەسەرەتای ژیانی نازانێت..

گەر لەتواناشیدا بووایە ئەوا هەموو ئەوەی چەندین رۆژ و ساڵ بەر لەو رۆژە روویداوە لەتەمەن و ژیانیدا دەیسڕییەوە...

کەواتە با ئێمە لەوێوە دەست پێ بکەین کە پێی خۆشە.. لەو چرکە ساتە بەهرەمەندەی کە تێیدا دڵی ملکەچی فەرمانی خودا بوو و، تێیدا رۆحی دایە دەستی راستی پەروەردگاری خاوەن بەزەیی-کە هەردوو دەستی هەر راستەیە- بەرەکەت و پەرۆش بۆ ئاینەکەی و، بۆ پێغەمبەرەکەی و، شەهید بوونێکی مەزن لە پێناوی هەقدا لە دڵیدا هەڵقوڵا، کە بەهۆیەوە کۆڵ و باری ئەو رۆژە بەتاڵانەی پشتیوانی ئاڕەوای تێدا دەکرد لەسەر شانی لادەبات..

رۆژێکیان بەتەنها بیری دەکردەوە و، یادەوەریە چاکەکانی لەسەر ئەو ئاینە نوێیەی کە رۆژ لە دوای رۆژ ئاڵاکانی زیاتر دەدرەوشێتەوە و دەشەکێتەوە دەهێناو و دەبرد و، لە خودای پەنهان زانی خواست کە بەهەر هۆیەکەوە بووە رێنمایی بکات و.. لەدڵی زرنگ و وریایدا مژدەکانی دڵنیابوون چەکەرەی کرد و، وتی:

{سوێند بەخوا خزمان لەسەر رێگەیەکی راستن،..

ئەو پیاوەش پێغەمبەرە..

دەسا، تاکەی..؟؟

سوێند بەخوا، دەڕۆم و، موسڵمان دەبم}..

دەبا گوێ لەخۆی رابگرین دەربارەی ئەو گەشتە پیرۆزەی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و، سەبارەت چوونی لە مەککەوە بۆ مەدینە بەمەبەستی کردنەوەی جێگایەك بۆ خۆی لەکاروانی بڕواداراندا، بۆمان بدوێت:

{.. جا پێم خۆش بوو کە یەکێك بدۆزمەوە هاوەڵیم بکات، گەیشتم بە عوسمانی کوڕی تەڵحە، ئەوەی لە نیازدا بوو بۆم باسکرد ئەویش خێرا هات بەدەممەوە و، پێکەوە لەشار کۆتایی شەو بەڕێکەوتین.. کاتێ گەیشتینە دەشتایی (عەمری کوڕی عاص)مان بینی، وتی:

سڵاوتان لێ بێت خزمینە، وتمان: سڵاو بێ لەتۆش..

وتی: بەرەو کوێ دەڕۆن؟ بۆمان باسکرد، ئەویش هەواڵی پێدان کە بەهەمان شێوەی ئێمە بەرەو لای پێغەمبەر دەڕوات تا موسڵمان ببێت..

ئەویش لەگەڵمان دا هات و بەرێکەوتین تا لەیەکەم ڕۆژی مانگی (صەفەر)ی ساڵی هەشتی کۆچی گەیشتینە مەدینە..

کاتێك چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وەك پێغەمبەرێك سڵاوم لێی کرد، ئەویش بەڕوویەکی گەشەوە وەڵامی سڵاوەکەی دامەوە و، ئەمجا موسڵمان بووم و شایەدی حەقم هێنا..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: عاقڵمەندیم لە تۆدا بەدی کرد هەر بۆیە لەخوا پاڕامەوە کە بتگەیەنێتە شوێنێکی حەق..

پەیمانم دا بەپێغەمبەری خوا و وتم: داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە لە هەموو ئەو کۆسپ و تەگەرانەی دروستم کردبێت لەبەردەم بانگەوازی خوادا..

فەرمووی: ئیسلام هەموو شتێکی پێش خۆی رادەماڵێت.

وتم: ئەی پێغەمبەری خوا لەسەر ئەوە (پەیمان دەدەم)..

فەرمووی: خودایا لە هەموو ئەو رێگریانەی کە (خالیدی کوڕی وەلید) لەبەر دەم ئاینەکەت دا دروستی کردووە خۆش ببە.

ئەمجا (عەمری کوڕی عاص) و، (عوسمانی کوڕی تەڵحە) چوونە پێشەوە و، موسڵمان بوون و پەیمانیان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ ...

ئەو داخوازیەتان بینی کە لە پێغەمبەری کرد: داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە لە هەموو ئەو کۆسپ و تەگەرانەی دروستم کردبێت لەبەردەم بانگەوازی خوادا))..؟؟

هەر کەسێك بەچاوو و، بەرچاو روونی لەو دەستەواژەیەی رابمێنێت، تێگەیشتنێکی راست و دروستی لا کەڵاڵە دەبێت سەبارەت ئەو هەڵوێستانەی کە وەك لوغز وایە لە ژیانی ئیمڕۆی شمشێری خودا و پاڵەوانی ئیسلامدا..

کاتێکیش دەگەینە ئەو هەڵوێستانە لە بەسەرهاتی ژیانییدا ئەم دەستەواژەیە رێنیشاندەرمان دەبێت بۆ تێگەیشتن و راڤەکردنی..

ئێستاش لەگەڵ خالیددا دەبین کە تازە موسڵمان بوو، تا لە سوار چاکی قورەیش و شۆڕەسوارەکەی رابمێنین و، سەرنجی لێزانی هەموو عەرەب لە کشانەوە و دان بەسەردا بدەین، کە پشت لە خواوەندەکانی باو و باپیری و سەربەرزیەکانی هۆزەکەی دەکات و، لەگەڵ

پێغەمبەر و موسڵماناندا پێشوازی جیهانێکی نوێ دەکات، خودا بۆی دیاریکردووە کە لە سایەی ئاڵای پێغەمبەر و وشەی یەکخواناسیدا راپەڕێت..

لەگەڵ (خالید) داین -کەواتە- دوای ئەوەی کە موسڵمان بوو، تا سەرگوزشتەی سەیری بەدی بکەین..

ئەرێ بەسەرهاتی هەرسێ شەهیدە پاڵەوانەکەی جەنگی موئتەتان لەیادە..؟؟

کە (زەیدی کوڕی حاریسە) و، (جەعفەری کوڕی ئەبوطالب) و، (عبداللەی کوڕی رەواحە) بوون..

کە بەڕاستی پاڵەوانی غەزای موئتە بوون لەخاکی شام.. ئەو غەزایەی کە رۆمەکان دووسەد هەزار جەنگاوەریان کۆکردبوویەوە و،موسڵمان تێیدا تووشی ناڕەحەتیەکی بێ وێنە بوون..

ئەو دەستەواژە بڵندە غەمگینەشتان لەیادە کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی هەرسێ سەرکردەی جەنگەکەی پێ راگەیاند، کاتێك فەرمووی:

{زەیدی کوڕی حاریسە ئاڵاکەی گرتە دەست و جەنگا پێوەی هەتا شەهید بوو.

پاشان (جەعفەر) وەریگرت و شەڕی کرد، تا شەهید بوو..

دواتر (عبداللەی کوڕی رەواحە) گرتیە دەست و پێوەی جەنگا تا شەهید بوو}.

ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ ئەمەندەی مابوو، هێشتمانەوە بۆ جێگای خۆی لەسەر ئەم لاپەڕانە..

ئەمەش بەشەکەی دیکەی فەرموودەکەیە:

{پاش ئەوە شمشێرێك لە شمشێرەکانی خودا ئاڵاکەی هەڵگرت و، خوای گەورە رزگاربوونی لەسەر دەستی ئەو بەدیهێنا}..

جا دەبێت ئەو پاڵەوانە کێ بێت..؟؟

ئەو قارەمانە (خالیدی کوڕی وەلید) بوو.. کەوەك سەربازێکی ئاسایی بەپەلە بەرەو غەزای (موئتە) کەوتە ڕێ لەژێر فەرمانی هەرسێ سەرکردەکەدا کە پێغەمبەر بۆ سوپاکەی دیاریکرد: زەید و، جەعفەر و، عبداللەی کوڕی رەواحە،کە هەر سێکیان بەهەمان ریزبەندی لەگۆرەپانی جەنگە خوێناویەکەدا شەهید بوون..

لەدوای شەهید بوونی دوا سەرکردە، (ثابتی کوڕی ئەقرەم) پەلاماری ئاڵاکەی دا و بەدەستی راستی هەڵیگرت و لەنێو سوپای موسڵماناندا بەرزی کردەوە تا بێ سەرویەرەیی نەکەوێتە ناوریزەکانیەوە..

هەر کە (ثابت) ئاڵاکەی هەڵگرت خێرا بەرەو لای خالیدی کوڕی وەلیدی برد و، پێی وت:

((ئاڵاکە بگرە ئەی باوکی سولەیمان))..

خالید لە کاتێکدا کە تازە موسڵمان بووبوو ئەوەی بەمافی خۆی نەزانی کە سەرکردایەتی دەستەیەك بکات کە ئەو موهاجیر و ئەنصارانەی لەنێودایە بەر لەئەو موسڵمان بوون.

ئاکار جوانی و، خۆ بەکەم زانی و، پێزانین و، باشیەك، کە ئەو شایانیەتی و گونجاوە بۆی..!!

ئالێرەدا و لەوەڵامی (ثابتی کوڕی ئەقرەم)دا وتی:

{نەخێر.. ئاڵاکە هەڵناگرم، تۆ لەمن لەپێشتر و حەقتری بۆی.. بەتەمەنیت و بەشداری بەدریشت کردووە}..

{ (ثابت) وەڵامی دایەوە و، وتی: بیگرە تۆ لەجەنگدا لەمن لێزانتری، سوێند بەخوا تەنها بۆ تۆم هەڵگرت}.

پاشان بانگی لە موسڵمانەکان کرد: ئەرێ رازین بەوەی خالید ببێتە سەرکردەتان..؟

وتیان: بەڵێ..

ئەمجا ئەم بلیمەتە چوویە سەر ئەسپەکەی و، ئاڵاکەی بەدەستی راستی هەڵگرت و بەرەو پێشەوە کەوتە رێ و وەك ئەوەی لەچەند دەرگایەکی داخراو بدات کە ساتەوەختی کرانەوەی هاتووە لەبەردەم رێگایەکی دوور و درێژدا تا ئەم پاڵەوانە هێدی هێدی بەسەریدا بڕوات، لەکاتی ژیانی پێغەمبەر و پاش وەفاتیشیدا، تا بەبلیمەتیە لەڕادە بەدەرەکەی قەدەر بیگەیەنێتە کارێك کە خودا لە چارەی نووسیووە..

پاش ئەوەی کە چارەنووسی جەنگەکە دەرکەوت، خالید سەرکردایەتی سوپای گرتە دەست، جا قوربانیانی موسڵمانەکان زۆر زۆر بوو، و باڵەکانیان شکابوو و.. سوپای رۆمی بێ شوماری لەرادەبەدەر و راماڵەریش، سەرکەوتوو، بەدەماغ بوو..

لەتوانای هیچ لێهاتوویيەکی جەنگیشدا نەبوو کە هیچ لە سەرئەنجامی شەڕەکە بگۆڕێت، و تێیدا شکست خواردوو بکاتە سەرکەوتوو، سەرکەوتوو بکاتە دۆڕاو..

تاکە کارێکیش کە چاوەڕێی بلیمەتێك بوو ئەنجامی بدات، راگرتنی زیان لێ کەوتنی سوپای موسڵمانان بوو، دەربازکردنی پاشماوەی بوو بەساغی، واتە کشانەوەی خۆپارێزی کە پاشماوەی هێزی بەشەڕهاتوو لەگۆڕەپانی جەنگەکەدا لەتیاچوون دوور دەخاتەوە.

ئەم کشانەوەیەش لەو جێگایەدا بەهیچ جۆرێك نەدەکرا..

بەڵام، گەر راستیش بێت کە (هەرگیز نابێت مەحاڵ لەدڵی کەسی مەردا هەبێت) ئەوا کێ هەیە دڵی لە خالید ئازاتر بێت و، لەو بلیمەتتر و بەرچاو ڕوونتر بێت..؟؟!

ئالێرەدا شمشێری خودا هاتە پێشەوە وەك چاوی باز بەهەردوو چاوی لە گۆڕەپانی جەنگەکە ورد بوویەوە و، بەلێزانیەکەی خۆی زۆر خێرا نەخشەی دادەناو.. سوپاکەی دابەش دەکرد لە کاتێکدا کە جەنگ لەگەرمەیدا بوو، دەیکرد بەچەند دەستەیەکەوە و، هەر دەستەیەك چالاکی خۆی بۆ دیاری دەکرد و، هونەری لەرادەبەدەر و لێزانی زۆری خۆی خستە گەڕ تا توانی کەلێنێکی فراوان و بەرین لەریزی سوپای رۆمدا دروست بکات و، موسڵمانان ساغ و بێ

زیان لێیەوە دەرباز بوون، پاش ئەوەی بەهۆی بلیمەتی پاڵەوانی ئیسلامەوە لەکارەساتێك رزگاری بوو کە لەوەدا بوو روویدات..!!

لەم جەنگەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو نازناوە مەزنەی بەخشییە خالید..

قورەیش پەیمانی خۆیان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ شکاند و، موسڵمانان بەسەرکردایەتی پێغەمبەر ﷺ بەرەو مەککە کەوتنە رێ..

پێغەمبەری خوا خالیدی کوڕی وەلیدی کردە سەرکردەی لای راستی سوپاکە..

خالید وەك سەرکردەیەك لە سەرکردەی موسڵمانان و، ئوممەتی ئیسلام، چوویە ناو مەککە، پاش ئەوەی وەك سەرکردەیەك لە سەرکردەکانی سوپای بتپەرستی دەشت و کێوەکانی بۆ ماوەیەکی زۆر ئاشنای بوون..

یادەوەریەکانی منداڵی کەوتە بیر، ساتە شیرین و خۆشەکانی و.. یادەوەری لاوێتی و، گاڵتە و گەپە بەهاوارەکانی.. هاتەوە پێش چاو..

پاشان یادەوەریەکانی ئەو رۆژگارە دوور و درێژە دەیهێنێتە جۆش کە تەمەنی خۆی تێدا کردە قوربانیەکی دۆڕاو بۆ بتە بێ دەسەڵات و هیچ و پوچەکان..

بەر لەوەی کە دڵی هەست بەپەشیمانی بکات لەسایەی دیمەنێکی جوان و بەرزیدا راچڵەکی..

دیمەنی رووناکی داپۆشەری مەککە.. دیمەنی ئەو بێدەسەڵاتانەی کە تا ئەو ساتە جەستەیان شوێنەواری ئازار و ئەشکەنجەی پێوەیە و، دەگەڕێنەوە بۆ ئەو زێدەی کە بە ستەم و زۆرداری لێی دەرکران، ئێستا لەگەڵ حیلەی ئەسپەکانیاندا دەگەڕێنەوە بۆی و، لەژێر سایەی ئاڵا شەکاوەکانی ئیسلامدا و.. ئەوەی نوێنێ بە پەنهانی بەگوێی یەکدییاندا دەچرپان لەماڵی ئەرقەم ئەمڕۆ گۆڕاوە بۆ دەنگی بەرزی (الله اکبر) کە مەککە دەلەرێنێتەوە وە (لا اله الا الله)ی سەرسوڕهێنەری سەرکەوتوو، کە وەك ئەوە وایە گەردوون لەگەڵیدا بێت و، وەك ئەوەی هەر هەمووی جەژنی بێت..!!!

ئەم موعجیزەیە چۆن روویدا..؟؟

چ راڤەیەك هەیە بۆ ئەوەی روویدا؟

هیچ.. هیچ شتێك نیە تەنها ئەو ئایەتە نەبێت کە لێشاوی سەرکەوتووان لە میانی (لا اله الا الله) و (الله اکبر)ەکانیدا دەیڵێن، لە کاتێکدا کە هەندێکیان بەشادیەوە لە یەکدی رادەمێنن و دەڵێن:

﴿وَعْدَ اللَّهِ لاَ يُخْلِفُ اللَّهُ وَعْدَهُ: بەڵێنی خوایە و، خواش لەبەڵێنی خۆی لا نادات﴾!!الروم/٦ .

خالید سەری بەرز دەکاتەوە و، بەو پەڕی ڕێز و خۆشی و سنگ فراوانیەوە لە ئاڵاکانی ئیسلام رادەمێنێت کە لە ئاسۆدا دەشەکێنەوە و، بەخۆی دەڵێت:

-بەڵێ.. ئەمە بەڵێنی خوایە و، خوداش لە بەڵێنی خۆی لانادات..!!

پاشان سەری سوپاسگوزاری لە بەرامبەر بەخششی پەروەردگاردا دادەنەوێنێت کە ڕێنموونی کرد بۆ لای ئیسلام و لەم ڕۆژە مەزنەی ڕزگارکردندا کردیە یەکێك لەوانەی ئیسلامیان بەرەو مەککە هەلگرتووە و.. نەك ئەوانەی ڕزگارکردن ناچاریان دەکات موسڵمان بن..

خالید لە پەنای پێغەمبەری خوادا دەمێنێتەوە و، توانای لێهاتووی خۆی دەخاتە خزمەت ئەو ئاینەی کە لەناخی دڵیەوە بڕوای پێ هێناوە و، هەموو ژیانی خۆی نەزر کردووە بۆی.

پاش ئەوەی پێغەمبەری خوداش گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری باڵا دەست و، (ئەبوبەکری صدیق) ئەرکی جێ نشینی گرتە ئەستۆ و، گێژە لوولوکەی هەڵگەڕاوە دەستدرێژیکار و فێڵبازەکان هەڵیکرد و بە تەڕەی سوور بوو و هەستانەوەی پڕ هات و هەرایەوە ئابلۆقەی ئاینی نوێی دەدا و.. (ئەبو بەکر) لەیەکەم سەرنجداندا چاوی دەکەوێتە سەر پاڵەوانی ئەو هەلوێستە و پیاوی گونجاوی ئەو ساتە.. باوکی سولەیمان، شمشێری خودا، خالیدی کوڕی وەلید..!!

ڕاستە کە ئەبوبەکر دەستی نەکرد بە شەڕ لەدژی هەڵگەڕاوەکان بەو سوپایە نەبێت کە خۆی سەرکردایەتی دەکرد بەڵام ئەوە هیچ ڕێگر نەبوو لەوەی کە ئەو خالیدی دانا بوو بۆ ڕۆژی یەکلاکردنەوە و، خالید لە جەنگی یەکلاکردنەوەدا کە مەترسیدارترین جەنگی هەڵگەڕاوەکان بوو، پیاوی لێهاتوو و قارەمانی خەمخۆری بوو..

لە کاتێکدا دەستەی هەڵگەڕاوەکان خۆیان ساز دەکرد بۆ ئەنجامدانی پیلانە گەورەکەیان، خەلیفەی مەزن (ئەبوبەکر) سوور بوو لەسەر ئەوەی کە خۆی سەرکردایەتی سوپای موسڵمانان بکات و، گەورە هاوەڵان هەوڵی زۆریان دا بۆ وازهێنان لەو سووربوونەی، بەڵام بێ ئەنجام بوو و زیاتر سوور بوو..

لەوانەیە ویستبێتی بەوە ئەو ڕەوشەی کە خەڵکی بانگ کردبوو بۆ شەڕ کردن گرنگی و بایەخێکی زیاتری پێ بدات، بەبۆچوونی ئەو تەنها بەشداری کردنی لەو جەنگە خوێناویەدا کە لەنێوان هێزی باوەڕ و، سوپای هەڵگەڕانەوە و تاریکیدا ڕوو دەدات ئەوەی پێ دووپات دەکرێتەوە، کە هەر دەبێت سەرکردایەتی ڕاستەوخۆی بەشێك یان هەموو سوپای موسڵمانان بکات..

لە ڕاستیدا گێرە شێوێنی هەڵگەڕاوەکان سەرەڕای دەستپێکردنی وەك یاخیبوونێکی نەیار، بەڵام مەترسی زۆر بوو..

هەموو ئەوانەی داخ لەدڵ بوون بەرامبەر ئیسلام و تێکڕای ئەوانەی کە لە بۆسەدا بوون بۆی دەرفەتی دەگمەنی خۆیان چنگ کەوت -ئیدی لەنێو هۆزە عەرەبەکاندا بێت- یا لەسەر سنوور، کە دەستەڵاتی ڕۆم و فارسی زیاد دەکرد،

ئەو دەسەڵاتەی کە هەستی دەکرد ئیسلام گەورەترین مەترسیە لەسەری، هەر بۆیە دەستی دابوویە ئاشووب گێڕی لەرێگای خۆیەوە و لە پشت پەردەوە..!!

ئەوەبوو ئاگری ئاشووب کە لەنێوان هۆزەکانی ئەسەد و، غەطفان و، عەبەس و، طیىء و، ذبیان دا، هەڵگیرسا..

پاشان هۆزەکانی (بەنی عامر و، هەوازین و، سولەیم و، بەنی تەمیم)یشی گرتەوە..

هێشتا پێکدا گژان رووی نەدابوو کۆڕرابوو بۆ سوپایەکی دەیان هەزار جەنگاوەری لەخۆ گرتبوو..

خەڵکی بەحرەین و، عومان و، موهرەش، بەدەم ئەو پلانە ترسناکەوە چوون و، ئیسلام رووبەرووی ترسناکترین گرفت بوویەوە و، خاکی دەوروبەری موسڵمانان بوویە ئاگر..

بەڵام، ئەبوبەکر لەوێدا ئامادەبوو[١] !!

ئەبوبەکر جڵەوی سەرکردایەتی سوپای گرتە دەستی و لەگەڵیاندا کەوتە رێ بەرەو شوێنی هۆزەکانی بەنی عەبەس و، مورە و، ذبیان، کە بەلەشکرێکی بێ شومارەوە بۆی هاتبوون..

شەڕ دەستی پێکرد و درێژەی کێشاو، موسڵمانان تێیدا سەرکەوتنێکی گەورە و مەزنیان بەدەستهێنا..

سوپای موسڵمانان لە مەدینە جێگیر نەبوو بوویەوە، خەلیفە ئامادەی کردن بۆ جەنگێکی دیکە..

سات لە دوای ساتیش هەواڵی هەڵگەڕاوەکان و کۆبوونەوەکانیان زیاتر مەترسیدار دەبوو و..

ئەبوبەکر بەسەرکردایەتی سوپایەك بۆ جاری دووەم کەوتە رێ، بەڵام گەورە هاوەڵان ئارامیان نەما و، یەکدەنگ بوون لەسەر ئەوەی کە خەلیفە لە مەدینە بمێنێتەوە، ئەوەبوو ئیمامی عەلی رێگەی بە ئەبوبەکر گرت و جڵەوی ئەسپەکەی گرت کە بەسواریەوە و لەپێش سوپاکەیەوە دەڕۆیشت و، پێی وت:

{بەرەو کوێ، ئەی جێ نشینی پێغەمبەری خوا..؟؟

من هەر ئەوەت پێ دەڵێم کە پێغەمبەری خوا لە رۆژی ئوحودا پێی فەرمووی:

شمشێرەکەت بخەرەوە کێلان و بەخۆت دڵتەنگمان مەکە..}

خەلیفەی موسڵمانان بەرامبەر یەکدەنگییەکی سووری موسڵمانان رازی بوو کە لە مەدینە بمێنێتەوە و سوپاکەی کرد بە یازدە کۆمەڵەوە و.. رۆڵی هەریەکەیانی دیار کرد..

خالیدی کوڕی وەلید سەردەستەی یەکێك لەو کۆمەڵە گەورانە بوو..

---

١ بۆ زیاتر ئاشنابوونی ئەم هەڵوێستە بڕوانە کتێبی (خلفاء الرسول).

کاتێکیش خەلیفە ئاڵای دەدایە دەست هەر ئەمیرێك، بەرەو لای خالید هات و پێی وت:

{لە پێغەمبەری خوام بیست دەیفەرموو: باشترین بەندەی خوا و، لێهاتووی هۆزە، خالیدی کوڕی وەلید، شمشێرێك لە شمشێرەکانی خوایە، خوای گەورە زاڵی بکات بەسەر بێ باوەڕ و دوو ڕووەکاندا}..

بەمجۆرە خالید بەردەوام لەسەر ڕێبازی خۆی بوو و، سوپاکەی لە جەنگێکەوە دەگوێزایەوە بۆ جەنگێکی دیکە و، لە سەرکەوتنێکەوە بۆ سەرکەوتنێکی تر، تا جەنگی یەکلاکردنەوە بەرپا بوو..

ئەمجا لەوێ، لە یەمامە (بەنو حەنیفە) و ئەو هۆزانەی کە دابوویانە پاڵیان، مەترسیدارترین سوپای هەڵگەڕاوەکانیان پێکهێنابوو، بەسەرۆکایەتی (موسەیلەمەی درۆزن)..

هەندێك لە سوپای موسڵمانەکانیش ڕوو بەڕووی سوپای موسەیلەمە بوو بوویەوە، بەڵام مەبەستی خۆیان بەدەست نەهێنا بوو..

جا فەرمانی خەلیفە بە سەرکردەی لێهاتوو ڕاگەیەنرا بەرەو لای (بەنو حەنیفە) بکەوێتە ڕێ..

خالیدیش بەڕێکەوت..

(موسەیلەمە)، هەر کەزانی (خالید) بەڕێکەوەیە بەرەو لایان، سوپاکەی ڕێکخستەوە و، کردیە مەترسیەکی ڕاستەقینە و، ڕکابەرێکی ترسناك..

هەردوو دەستە بەیەك گەیشتن..

کاتێك لە پەڕاوەکانی مێژوودا سەر گوزشتەی ئەو جەنگە گەورەیە دەخوێنیتەوە، سەرسام دەبیت، چونکە خۆت لە بەرامبەر جەنگێکدا دەبینیتەوە کە لە دڕندایەتی و جەور و ستەمدا لە شەڕەکانی ئەم سەردەمە دەچێت، با لەجۆری چەك و ڕەوشی جەنگیشدا جیاواز بن..

خالید لەگەڵ سوپاکەیدا چوویە سەر گردێك بەسەر یەمامەدا دەیڕوانی و، موسەیلەمەش بەلوت بەرزی و لە خۆبایی بوونەوە هات، ڕیزەکانی سوپاکەیشی لە زۆریدا کۆتاییەکەی دیار نەبوو..!!

خالید سەردەستەیی و ئاڵاکانی دایە دەست سەرکردەکانی سوپاکەی و، هەردوو سوپا بەیەکدا گژان و، جەنگێکی سامناك بەرپا بوو.. زۆر سامناك و.. شەهیدی موسڵمانان بەدوای یەکدا وەك گوڵی باخچەیەك دەکەوتن کە بەر ڕەشەبایەکی توند کەوتبێت..!!

خالید باڵا دەستی توانای دوژمنانی بەدی کرد و، بە ئەسپەکەیەوە چووە سەر تەپۆلکەیەکی نزیك و، سەرنجێکی خێرای قوڵ و زیرەکانەی گۆڕەپانی جەنگەکەی دا..

دەست بەجێ هەستی بەخاڵی لاوازی سوپاکەی کرد و ژماردی..

بینی کە بەهۆی ئەو کارە کت و پڕەی سوپای موسەیلەمە هێنای بەسەریاندا هەست کردن بە لێپرسراوێتی لاواز بووە، هەر بۆیە لە هەمان چرکە ساتدا بڕیاریدا کە دڵی تێکڕای موسڵمانان

بەرامبەر هەست کردن بە بەرپرسیارێتی تا ئەو پەڕی راچڵە کێنێت.. ئەوە بوو ڕۆشت و بانگی لە دەستە و باڵەکانی سوپاکەی کرد و، شوێنەکانی سەر لەنوێ لە گۆرەپانی شەڕدا بۆ دیاریکردنەوە و، پاشان بەدەنگە دلێرەکەی هاواری لێکردن:

{بەرێبکەون، با ئەمرۆ توانای هەموو زیندوویەك بەدی بکەین}..

هەمووتان برۆن.

ئەمجا موهاجیرەکان لەژێر ئاڵای خۆیاندا بەرێ کەوتن و، ئەنصارەکانیش لەژێر ئاڵای خۆیاندا {هەموو رۆڵەی باوکێکیش لەژێر ئاڵای خۆیدا}..

بەمجۆرە بە تەواوی روون بوویەوە کە شکست هات لە کوێوە دێت و.. دەروونەکان زیاتر پەرۆشی دایگرتن و، رووناکتر بوون و، پڕ بوو لە جەسووری و ئازایەتی..

خالیدیش ماوە ماوە، (الله اکبر) و (لا اله الا الله) دەکرد، یان هاواری لە سوپاکەی دەکرد و فەرمانی دەکرد بەسەریاندا و، شمشێرەکانی سوپاکەی دەگۆڕی بۆ ئەو قەدەرانە کە گەڕانەوەیان نیە و، هیچ شتێك ڕێگر نیە لەبەر دەم مەبەستەکانیدا..

لەچەند خولەکێکی دیاریکراودا ڕێرەوی جەنگەکە گۆڕا و سەربازەکانی موسەیلەمە بەدەیان و، سەدان و، هەزارانیان لێ دەکەوت وەك مێشێك کە بەهۆی هەناسەی پاککەرەوەی بروسکەیەکی لەناو بەرەوە هەناسەی لێ بڕا بێت..!!

لە راستیدا خالید وەك کارەبا سوور بوون و جەسووری خۆی گواستەوە بۆ سەربازەکانی و، گیانی چوویە نێو هەموو سوپاکەیەوە.. ئەوەش یەکێك بوو لە خاسیەتەکانی بلیمەتیە سەرسوڕهێنەرەکەی..

بەم شێوەیە مەترسیدارترین و توند و تیژترین جەنگی هەڵگەڕاوەکان ئەنجام درا و، (موسەیلەمە) کوژرا..

لاشەی سەربازەکانیشی گۆڕەپانی جەنگەکەیان تەنی بوو و، بۆ هەتا هەتایە خۆڵ درا بەسەر ئاڵای درۆ خوازاندا..

لە شاری مەدینەش خەلیفە نوێژی سوپاسگوزاری بۆ پەروەردگاری باڵا دەستی کرد کە ئەو سەرکەوتنە و ئەو پاڵەوانەی پێ بەخشیوون..

ئەبوبەکر بە هۆی تێگەیشتووی و بەرچاو ڕوونیەوە بۆی دەرکەوتبوو کە ئەو هێزە شەڕ خوازانەی لە دەوری سنووری ولاتەکەیەتی چ رۆڵێکی مەترسیداریان هەیە لەسەر چارەنووسی ئیسلام و پەیڕەوکارانی..

فارسەکان لە عێراق و.. رۆمەکان لەولاتی شام، دوو ئیمپراتۆریەتی تێکشکاون و، چەند تاڵە موویەکی لە تاڵەمووە بەسەر چووکانیان گرتبووەوە و خەڵکیان لە عێراق و لە شام تووشی خراپترین ئازار و ئەشکەنجە دەکرد، بەڵکو بەکاریان دەهێنان —کە زۆربەشیان عەرەب بوون—

بۆ شەڕکردن لەدژی ئەو موسڵمانە عەرەبانەی کە بەیداخی ئاینی نوێیان بەرز کردبوویەوە و، بەپاچەکانیان لە هەموو قەڵاکانی جیهانی کۆنیان دەدا و، بۆگەنی و خراپیەکانیان لا دەبرد..!

ئالێرەدا، خەلیفەی مەزن و پیرۆز ڕێنماییەکانی خۆی ئاراستەی خالید کرد کە بەسوپاکەیەوە بەرەو عێراق بکەوێتە ڕێ..

خالیدی پاڵەوانیش ڕووە و عێراق کەوتە ڕێ و، ئەم لاپەڕانە جێگای ئەوەی تێدا بوایەتەوە کە لە شوێن یەک لە دوای یەکی کەژاوەی سەرکەوتنەکانی بڕۆشتینایە، تا بەسەرهاتی سەرسوڕهێنەرمان بەدی بکردایە.

کاری خۆی لە عێراق بەنووسینی نامە بۆ هەموو والی و نوێنەرەکانی کیسرا لەسەر شار و ناوچەکانی عێراق دەست پێکرد..

{بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە بۆ سەرکردەکانی فارس..

سڵاو لەو کەسەی شوێنی هیدایەت کەوتبێت.

دواتر، سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە خزمەتکارەکانتانی بڵاوە پێ کرد و، پادشاکانتانی لێ سەندەوە و، فێڵ و تەڵەکەی لاواز کردن.

ئەو کەسەی وەك ئێمە نوێژ بکات و، ڕوو بکاتە قیبلەمان و، گۆشتی شتی سەربڕاوی ئێمەی خوارد ئەوە موسڵمانە و، ئەوی بۆ ئێمە هەبێ بۆ ئەویش هەیە و، ئەوەش لەسەر ئێمە بێت لەسەر ئەویشە ئەم نامەیە پێتان گەیشت ئەوا بارمتەم بۆ بنێرن و ببنە (ذمی)، دەنا، بەو زاتەی جگە لەو خودایەکی دیکە نیە کەسانێکتان بۆ دەنێرم مردنیان لا خۆشەویستە هێندەی خۆشەویستی ژیان لەلای ئێوە..!!!

هەواڵبەرەکانی کە بەرەو هەموو لایەکی نارد بوون گەڕانەوە بۆ لای و هەواڵی ئەوەیان پێدا کە سەرکردەکانی فارس لە عێراق سەرقاڵی کۆکردنەوەی سوپایەکی زۆرن، ئەویش کاتی خۆی بەفیڕۆ نەدا و، سەربازەکانی خۆی بردە سەر ناڕەوا تا لەناویان ببات و.. زەویش بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بۆی پێچرایەوە.

لە (ئوبلە)وە، بۆ (سەدیر) و، پاشان (نەجەف) تا (حیرە) و، (ئەنبار و، کاظمیة) لە هەموویاندا کەژاوەی سەرکەوتنی بەدوای کەژاوەی دیکەدا دەهات و، لەهەموو جێگایەك شنە بای موژدە ئاڵای ئیسلامی بەرز دەکردەوە و ژێر دەستە و بێ دەسەڵاتان دەهاتنە ژێر سایەی.

بەڵێ.. ژێر دەستە و بێ دەسەڵاتانی خەڵکی ئەو وڵاتەی کە فارسەکان داگیریان کرد بوو خراپترین سزاشیان دەدان..

چەند جوان و بەجێ بوو کە خالید شاڵاوەکەی خۆی بەدەرکردنی فەرمانێك بۆ هەموو هێزەکانی دەستپێکرد:

{جوتیارەکان تووشی زیان مەکەن و، لێیان گەڕێن با بەهێمنی لەسەر کاری خۆیان بن، مەگەر کەسانێکیان کە بێن بۆ شەڕکردن لە دژتان، ئەو کاتە بەرامبەر شەڕکەرانیان بجەنگن}..

بە سوپا سەربەرزەکەیەوە وەك چەقۆ بەسەر کەرەی تازەدا بهێنێ ڕۆیشت تا لەسەر سنووری شام ڕاوەستا..

ئا لەوێدا سەدای بانگدەران و، (الله اکبر)ی ڕزگاریخوازان دەنگی دایەوە.

بڵێی ڕۆمەکان لە شام گوێبیستی بووبن..؟؟

یان لەو (الله اکبر)انەدا بەسەر چوونی ڕۆژگار و، جیهانی خۆیان بۆ دەرکەوتبێت..؟؟

بەڵێ، گوێیان لێ بوو و.. ڕاچڵەکین و.. بڕیاریاندا کە سەرشێتانە جەنگی بێئومێدی تیاچوون ئەنجام بدەن..!

ئەو سەرکەوتنەی ئیسلام بەسەر فارسەکاندا لە عێراق بەدەستی هێنا بوو مژدە بەخشی سەرکەوتنێکی هاوشێوە بوو بەسەر ڕۆمەکاندا لە شام..

ئەنجا ئەبوبەکری صدیق چەندین سوپای ئامادە کرد و، بۆ سەرکردایەتیشی چەند کەسێکی لێهاتووی هەڵبژارد کە بریتی بوو لە ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح و، عەمری کوڕی عاص و.. یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیان و، پاشان معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان..

کاتێك کە هەواڵی ئەو سوپایانە گەیشت بە ئیمپراتۆری ڕۆم، ئامۆژگاری وەزیر و سەرکردەکانیان کرد کە لەگەڵ موسڵماناندا پێکبێن و، نەچنە جەنگانێکی دۆڕاوەوە لە دژیان..

بەڵام وەزیر و سەرکردەکانی سووربوون لەسەر شەڕ کردن و ڕایان گەیاند کە:

{سوێند بەخوا ڕێ بە ئەبوبەکر نادەین کە ئەسپەکەی بهێنێتە خاکمانەوە}..

سوپایەکیان ئامادە کرد کە ژمارەی دەگەیشتە دووسەد و چل هەزار جەنگاوەر.

سەرکردەی موسڵمانەکانیش پەیامی ترسناکی هەڵوێستەکەیان نارد بۆ خەلیفە، ئەبوبەکریش وتی:

{سوێند بەخوا چارەسەری دەردی دڵیان بەخالید دەکەم}..!!!

(کوژەری وەسوەسەکانیان).. وەسوەسەی هەڵگەڕانەوە و دوژمنایەتی و شیرك، فەرمانی خەلیفەی پێ گەیشت کە بەرەو شام بکشێت، تا ببێتە ئەمیری ئەو سوپایانەی ئیسلام کە بەر لە ئەو بەرەو ئەوێ چووە.

خالید دەست بەجێ فەرمانەکەی بەجێ هێنا و، (موسەنای کوڕی حاریسە)ی لە جێگای خۆی لە عێراق بەجێ هێشت و لەگەڵ ئەو سوپایەیدا کە هەڵیبژارد بوو کەوتە ڕێ تا گەیشتە ئەو جێگایانەی کە موسڵمانەکانی تێدا بوو لە شام و، بە بلیمەتیە سەرسوڕهێنەرەکەی سوپای موسڵمانانی ڕێکخست و شوێنی گونجاوی بۆ دیاریکرد بەماوەیەکی کەم، لە نێوەندی جەنگ و بەرەوڕوو بوونەوەشدا، لە نێو جەنگاوەرەکانیدا وەستا و وتارێکی ئاراستە کرد، لەپاش سوپاسگوزاری و ستایشی پەروەردگاری وتی:

{ئەمڕۆ ڕۆژێکە لە ڕۆژەکانی خوا، نابێت کەس شانازی تێدا بکات و خۆی پێوە هەڵبنێت..
دڵسۆزانە تێبکۆشن و مەبەستتان تەنها خوا بێت لە کارەکەتان و، وەرن با ئەمیرێتی دەستا و دەست پێ بکەین –واتە بیگۆڕینەوە– یەکێکمان ئەمڕۆ ئەمیر بێت، یەکێکی دیکە سبەینێ، یەکێکی تر دوسبەی، تا هەر هەموو ئەمیرێتی دەکەن}..
ئەمڕۆش ڕۆژێکە لە ڕۆژەکانی خوا..
ج دەستپێکێکی قەشەنگ و جوانە..!!
* نابێت کەس شانازی تێدا بکات و خۆی پێوە هەڵبنێت..
ئەمەش زیاتر قەشەنگ و جوانترە و ئەمەکدارترین خۆپارێزیی(وەرع)ـە!!
ئەم سەرکردە ژیر و مەزنە بەزاڵکردنی کەسانی دیکە بەسەر خۆیدا هیچ کەمی نەکرد، لە کاتێکدا کە خەلیفە کردبوویە سەرکردەی هەموو سوپاکان بەتێکڕای ئەمیرەکانیشیانەوە، بەڵام ئەو نەیویست کە ببێتە پاڵپشتێك بۆ شەیتان لەسەر دڵی هاوەڵانی و، دەستی لەو مافە هەمیشەییەی لە ئەمیرایەتی هەڵگرت و کردیە سەرە لە نێوان هەموویاندا وەك یەك..
ئەمڕۆ ئەمیرێك.. سبەینێ ئەمیرێکی دیکە.. دوسبەیش یەکێکی تر و.. بەو شێوەیە تا دوایی..
سوپای ڕۆمیش بە ژمارەی زۆر و چەك و تفاقیەوە، شتێکی پڕ مەترسی بوو..
سەرکردەکانی ڕۆم زانیان کە کات لە بەرژەوەندی موسڵماناندایە و، درێژە کێشانی جەنگ و زۆربوونی شەڕەکان سەرکەوتنێکی هەمیشەییان بۆ دەستە بەر دەکەن، لەبەر ئەوە بڕیارياندا کە هەموو سوپاکانیان لەیەك شەڕدا کۆ بکەنەوە بۆ سەر عەرەب تا پاش ئەو جەنگە شوێنەواریان نەمێنێت، بێگومان موسڵمانان لەو ڕۆژەدا هەستیان بە بیم و مەترسیەکی وەها کرد بوو کە دڵ و دەروونە گیان لەسەر دەستەکانی خستبووە دڵە ڕاوکێ و ترسان.
بەڵام لە ئاوەها کاتێکی ڕەش و ناخۆشدا خۆی پەنهان دابوو بۆ خزمەتکردنیان و، بەرەبەیانی هیوا و سەرکەوتن هەموو گیانیانی دەتەنی..!!
جا دەستەڵاتی ڕۆم و ژمارەی سوپای هەر چەند بێت، ئەبوبەکر، کە پیاوێکی سەرناسە، وتی:
{خالید بۆیان}..!!!
{سوێند بەخوا چارەسەری دەردی دڵیان بەخالید دەکەم}..
دەبا ڕۆم بەهەموو هەرا و هۆریایانەوە بێنە بەرامبەر موسڵمانانی لەناو بەریان..!!
خالیدی کوڕی وەلید سوپاکەی برد و، کردی بەچەند دەستەیەکەوە، نەخشەیەکی نوێی بۆ هێرش بردن و کشانەوە دانا کە لەگەڵ شێوازی ڕۆمەکاندا دەگونجا پاش ئەوەی کە شارەزای هۆکارەکانی فارسەکانی برایان بوو لە عێراق و.. هەموو پێوانەیەکی بۆ جەنگەکە دانا..

زۆر سەیر بوو، شەڕەکە بەو شێوەیە روویدا کە خالید نەخشەی بۆ کێشا و بۆی چوو، هەنگاو بەهەنگاو، جوڵە بە جوڵە، بەڕادەیەك وەك ئەوەی پێشبینی ژمارەی لێدانی شمشێرەکانی جەنگەکەی کردبێت، لە مەزەندە و پێوانەیدا هیچ هەڵەی نەکرد بوو..!!

هەموو پەلامارێك کە پێشبینی کردبوو لە لایەن رۆمەکانەوە بکرێتە سەریان، ئەنجامیان دا..

هەموو کشانەوەیەك پێشبینی کرد کردیان..

بەر لەوەی جەنگەکە روویدات ئەوەی کەمێك سەرقاڵی کردبوو، پێشبینی کردنی هەڵهاتنی هەندێك لە سوپاکەی بوو – بەتایبەت ئەوانەی کە تازە موسڵمان بوو– پاش ئەوەی کە بینی دیمەنی سوپای رۆمەکان چەند ترس و تۆقاندنی خستە دڵیانەوە..

لەراستیدا بلیمەتی سەرکەوتنی خالید لەیەك شتدا خۆی دەنوواند، کە ئەویش دامەزراوی بوو، دەیزانی کە هەڵهاتنی دوو کەس و سێ کەس، دەکرێت پچرپچڕی و ترسێك بخاتە نێو سوپاکەیەوە کە هەموو سوپای دوژمن نەتوانێت بیکات..

لە پێناوی ئەوەدا، زۆر توند و تیژ بوو – بەڵام چ توند و تیژییەك – بەرامبەر ئەوانەی چەکەکانیان فڕێ دەدەن و هەڵدێن..

ئا لەو شەڕەدا بەتایبەت – شەڕی یەرمووك – پاش ئەوەی کە سوپاکەی شوێنی خۆیان گرت – بانگی ئافرەتانی موسڵمانی کرد – و بۆ یەکەمجار شمشێری دانە دەست و، فەرمانی پێکردن، کە لە گشت لایەکی پشتی موسڵمانانەوە رابوەستن و، پێی وتن:

{ئەوەی پشتی هەڵکرد و هەڵهات، بیکوژن}..

ئەوەش ئاوڕدانەوەیەکی چاك بوو کاری خۆی بەباشی پێکا..!!

بەر لەدەستپێکردنی شەڕەکە سەرکردەی سوپای رۆم داوای لە خالید کرد کە بۆی دەربکەوێت تا چەند وشەیەکی پێ بڵێت..

خالید بۆی هاتە دەرەوە و، لە شوێنی بەتاڵی نێوان هەردوو سوپاکەدا، بەسواری ئەسپەکانیانەوە رووبەڕووی یەکدی بوونەوە..

(ماهان)ی سەرکردەی رۆم بە خالیدی وت:

{زانیومانە کە تەنها بێ بەرگی و برسێتی لە وڵاتی خۆتانەوە هێناونی..

جا ئەگەر پێتان خۆشە هەریەکەتان پۆشاك و خواردەمەنی و دە دیناری دەدەمێ و، بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆتان، بۆساڵی داهاتووش بەهەمان شێوە بۆتان دەنێرم}..!!

خالیدی مەرد و پاڵەوان ددانەکانی لەسەر یەك توند کرد و، تێگەیشت کە قسەکانی سەرکردەی رۆم چ بێ ئەدەبیەکی تێدایە..

بۆیە بڕیاری دا کە وەڵامێکی گونجاوی بداتەوە و، پێی وت:

{بزانە وەك ئەوەی تۆ باست کرد برسێتی نەی هێناوینەتە دەرەوە، بەڵام ئێمە کەسانێکین خوێن دەخۆینەوە، زانیمان کە هیچ خوێنێك خۆشتر و چاکتر نیە لە خوێنی ڕۆم، لەبەر ئەوە هاتین}..!!!

ئەمجا خالیدی پاڵەوان جڵەوی ئەسپەکەی گرت و گەڕایەوە نێو سوپاکەی و، ئاڵاکەی بەرزکردەوە و دەستپێکردنی جەنگی ڕاگەیاند..

{الله اکبر}..

{شنەی بای بەهەشت هەڵیکرد}.

سوپاکەی وەك موشەکی هاوێژراو دەردەچوو.

جەنگێکی بێ وێنە لەسەختی و ناڕەحەتیدا دەستی پێکرد..

ڕۆمەکان وەك کێو بەچەند دەستەیەك هاتن..

موسڵمانەکان بەجۆرێ بەرپەرچیان دانەوە کە چاوەڕوانیان نەکرد بوو..

موسڵمانەکان گیانفیدای و خۆڕاگرییەکی وایان نواند کە عاقڵمەندانی سەرسام دەکرد..

((ئەوەتانێ لەکاتی گەرمەی شەڕدا یەکێکیان لە (ئەبوعوبەیدەی جەڕاح) نزیك دەبێتەوە و پێی دەڵێت:

{من زۆر سوورم لەسەر شەهید بوون، جا هیچ پێویستیەکت هەیە بەپێغەمبەری خواﷺ کە پێی گەیشتم پێی رابگەیەنم}؟!

{بەڵێ.. پێی بڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەی پەروەردگارمان وادە و بەڵێنی پێدابووین بەراستی بینیمان}..

ئەمجا پیاوەکە وەك تیری هاوێژراو دەرپەڕی و.. بەئومێدی تیاچوون و کۆتایی هاتنی چوویە نێوەندی ناڕەحەتیەکان و.. بەشمشێرەکەی لێی دەدان و، بەهەزاران شمشێر لێی دەدرا تا شەهید بوو..!!

ئەوەتا ((عیکرمەی کوڕی ئەبو جەهل))یش..

بەڵێ.. کوڕی ئەبو جەهل..

کاتێك چەپۆکی ڕۆم لەسەری قورس دەبێت هاوار لە موسڵمانەکان دەکات و دەڵێت:

{بەر لەوەی کە خوا ڕێنوێنیم بکات بۆ لای ئیسلام زۆرم شەڕ دژی پێغەمبەری خواﷺ کردووە، جا ئەمڕۆ لە دوژمنانی خوا هەڵبێم}؟؟

پاشان هاواریکرد: {کێ بەڵێن دەدات لەسەر مردن}..

جا ژمارەیەکی زۆری موسڵمانەکان بەڵێنیان پێدا لەسەر مردن و پێکەوە چوونە نێو جەرگەی جەنگەکەوە، بەدوای سەرکەوتندا وێڵ نەبوون، بەڵکو شەهیدیان دەویست و.. پاشان بەرەو بەڵێن و فرۆشتنەکەیان چوون و، شەهید کران..!!

((ئەوانەی دیکەش بەسەختی بریندار کراون، ئاویان بۆ دەهێنرێت دەمیانی پێ تەڕ بکەن، کاتێك ئاوەکە دەهێنرێت بۆ کەسی یەکەمیان، ئاماژەی بە ئاوگێڕەکەدا کە بیدا بەو برایەی کە لە تەنیشتیەوەتی و برینەکەی لەم سەختترە و، زیاتریش تینوویەتی، کاتێك ئاوەکە بۆ ئەویش دەبەن، ئەویش لای خۆیەوە ئاماژەی بۆ ئەوەی تەنیشتی کرد، کە بۆ ئەویشیان برد ئاماژەی بۆ ئەوەی ئەو لایەوەی کرد..

بەمجۆرە.. هەتا گیانی زۆریەیان بەتینوویەتی دەرچوو.. بەڵام جوانترین لێبڕان و خۆنەویستی بوو..!!

بەڵێ..

لە راستیدا جەنگی (یەرمووك) بوارێکی زۆر کەم وێنە بوو بۆ گیانفیدایی.

لەنێو تابلۆکانی خۆبەختکاری سەرسوڕهێنەردا کە لێهاتووییە جەسوورەکان وێنەیان کێشا، ئەمە تابلۆیەکی دیارە.. تابلۆیەك کە وێنەی خالیدی لە خۆ گرتووە لە پێشەوەی سەد سەربازیەوە –زیاتر نا– کە دژی هاتنی رۆمن، ئەو رۆمەی ژمارەی سەربازەکانی چل هەزار کەسە، خالید هاوار لەو سەد کەسەی کە لەگەڵیایەتی دەکات:

{سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە رۆمەکان تەنها هێندە ئارام و هێزیان ماوە کە بینیتان.

منیش دەخوازم کە خوای گەورە شانەکانیان بخاتە بەر دەستتان..

سەد کەس.. رووبەڕووی چل هەزار دەبنەوە و.. سەریش دەکەون..!!

بەڵام سەر سوڕمان بۆچی؟؟

ئەی دڵەکانیان لێوان لێو نیە لە بڕوا بوون بەخودای بەرزی باڵا دەست..؟؟ و بڕوا بە پێغەمبەرە راستگۆ و دەستپاکەکەی ﷺ ؟؟ و بڕوا بە کێشەکەی، کە لە هەموو کێشەکانی ژیان زیاتر، چاك و، رێنما کار و، رێزدارە؟

خەلیفەکەشیان (ئەبوبەکری صدیق) نیە ڕەزای خوای لێ بێت، ئەو پیاوەی ئاڵای بەسەر دونیادا بەرز دەکرێتەوە لە کاتێکدا کە ئەو لە مەدینەی پایتەختی تازەی جیهانی نوێ بەدەستی خۆی مەڕی بێوەژنەکان دەدۆشێت و، هەویر بۆ نانی هەتیووەکان دەشێلێت..؟؟

ئایا سەرکردەشیان (خالیدی کوڕی وەلید)ی لەناو بەری وەسوەسەی ستەمکاری لەخۆبایی بوون و، دوژمنکاری و، شمشێری هەڵکێشراوی خودا نیە بەسەر هێزی دواکەوتوویی و، بۆگەنی و، بێباوەڕییەوە؟؟

ئایا ئەمانە، وانین..؟

کەواتە، شنەبای سەرکەوتن هەڵبکە..

بە بەهێزی و دەستەڵات و، سەربەرزی و، توندییەوە هەڵبکە..

لەراستیدا بلیمەتی (خالید) سەرکردە پێشەوایانی سوپای رۆمی سەرسام کرد بوو، بەجۆرێك وای لە یەکێکیان کرد کە ناوی (جرجە) بوو بانگی خالید بکات تا لەیەکێك لە ماوەکانی پشووی نێو جەنگەکەدا بێتە پێشەوە بۆی.

کاتێك بەیەك گەیشتن، سەرکردەی رۆم رووی دەمی کردە خالید و وتی:

{ئەی خالید..

راستم پێ بڵێ و، درۆم لەگەڵ مەکە، چونکە مرۆڤی ئازاد درۆ ناکات..

ئایا خوای گەورە لە ئاسمانەوە شمشێرێکی ناردووە بۆ پێغەمبەرەکەتان و ئەویش بەخشیبێتی بەتۆ و، لە هەر کەست هەڵکێشابێت بەزاندووتە؟؟).

خالید وتی:

{نەخێر}

پیاوەکە وتی:

{ئەی بۆ ناو نراوی شمشێری خودا؟}.

خالید پێی وت:

{خوای گەورە پێغەمبەرێکی بۆ ناردین، هەمان بوو بڕوای پێ هێنا و هەبوو بڕوای پێ نەکرد..

منیش یەکێك بووم لەوانەی بەراستم نەزانی تا خوای گەورە دڵی بۆ لای ئیسلام راکێشاین و، بەهۆی پێغەمبەرەکەیەوە رێنمایی کردین و،بەڵێنمان پێدا..

پێغەمبەریش پاڕایەوە بۆم و، پێی فەرمووم: تۆ شمشێرێکی لە شمشێرەکانی خوا، بەم جۆرە ناونرام..

سەرکردەی رۆم وتی:

{بانگەوازی خەڵکی بۆ چ شتێك دەکەن..؟}

خالید وتی:

{بۆ لای یەکخواناسی و، بۆ لای ئیسلام}

وتی:

{ئایا ئەو کەسەی ئەمڕۆ موسڵمان ببێت پاداشت و مافی وەك ئێوەی بۆ هەیە؟}

خالید وتی: {بەڵێ، چاکتریشی بۆ هەیە..}

پیاوەکە وتی: {چۆن، لە کاتێکدا ئێوە بەر لەو موسڵمان بوون..؟؟}

خالید پێی وت:

{ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ ژیاوین و، بەڵگە و موعجیزەکانیمان بینی و، حەقی هەر کەسێکە ئەوەی ئێمە بینیمان بینیبێتی و، ئەوەی ئێمە بیستمان بیستبێتی کەبە ئاسانی موسڵمان ببێت..

بەڵام ئێوە کە نەتاندیووە و گوێبیستی نەبوون، پاشتر بە نەدیتراوی بڕواتان هێناوە، ئەوا پاداشتی ئێوە چاکتر و گەورەترە گەر ڕاستگۆ بن لە نیەت و نهێنیەکانتاندا لەگەڵ خوا}..

سەرکردە ڕۆمەکە هاواری لێ هەستا و، ئەسپەکەی بەرەو لای خالید تاودا و، لە تەنیشتیەوە ڕاوەستا:

{ئیسلامم فێر بکە ئەی خالید}..!!!

موسڵمان بوو و.. دو رکات نوێژی کرد و.. هیچ نوێژێکی دیکەی دوای ئەوە نەکرد، کە هەردوو سوپا دەستیان کردەوە بەجەنگ، (جرجەی ڕۆم) لە ریزی موسڵمانەکاندا دژ بەڕۆمەکان بەئومێدی بەدەستهێنانی شەهیدی جەنگا تا بەدەستی هێنا و پێی گەیشت..!!

پاشان. ئایا ئێمە بەرەو ڕووی مەزنێتی دیمەنێکی جوانتر ئەبینەوە.. کە خالید سەرکردایەتی سوپای موسڵمانانی دەکرد لەو جەنگە سەختەدا، ئازایانە سەرکەوتن لە نێوان کەڵبەی ڕۆمەکاندا دەردەهێنێت، بەو ڕادە گوماناوی و ترسناکەی کە تێیدا بەنامەبەری هاتوو لە مەدینەوە سەرسام دەبێت کە نامەیەکی لە خەلیفەی نوێوە بۆ هێناوە — ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی خطاب..

سڵاوی عومەری بۆ موسڵمانان تێدا بوو، لەگەڵ هەواڵی کۆچی دوایی خەلیفەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوبەکری صدیق، پاشان فەرمانی کرد بەلادانی خالید لە سەرکردەیی و، دانانی (ئەبوعوبەیدەی جەڕاح) لە جێگای..

خالید نامەکەی خوێندەوە، داوای بەزەیی و ڕەحمەتی بۆ ئەبوبەکر و سەرکەوتنی بۆ عومەر کرد..

پاشان داوای لە هەڵگری نامەکە کرد کە ئەوەی لە نامەکەدا هاتووە بەکەسی ڕانەگەیەنێت و لە جێگایەک داینا و فرمانی پێکرد کە بەجێی نەهێڵێت و، نەچێتە لای هیچ کەس..

ئەمجا دەستی کردەوە بەسەرکردایەتی جەنگەکە و هەواڵی مردنی ئەبوبەکر و فەرمانەکەی عومەری شاردەوە تا ئەو سەرکەوتنە دێت کە نزیك بۆتەوە..

زەنگی سەرکەوتنی لێی دا و، ڕۆمەکان تێکشکان..

ئەمجا سەرکردەی پاڵەوان لە ئەبوعوبەیدە چوویە پێشەوە وەك سەربازێك سڵاو لە سەرکردەکەی بکات، سڵاوی لێکرد و.. لەسەرەتادا ئەبو عوبەیدە وەك گاڵتەیەك لە گاڵتەکانی سەرکردەیەك سەیری کرد کە سەرکەوتنێکی بەدەست هێنا بێت بەبیری کەسدا نەهاتبێت.. بەڵام هێندەی نەبرد سەیری کرد ڕاستیەکی تەواوە، چوو نێو چاوانی خالیدی ماچ کرد و، مەزنی دەروون و ئاکارەکانی خالیدی دەژمارد.

گێڕانەوەیەکی مێژوویی دیکەش هەیە، دەڵێت: نامەکە لە ئەمیری باوەڕدارانەوە بۆ ئەبوعوبەیدە نێردرابوو، ئەبوعوبەیدەش هەواڵەکەی لەخالید شاردەوە تا جەنگەکە تەواو بوو...

جا هەرکامیان بێت.. ئەوا ڕێبازی خالید لەهەردوو بارەکەدا مەبەستی ئێمەیە..

بەراستیش ڕێبازێکی زۆر قەشەنگ و مەزن و بەرز بوو..

لەهەموو ژیانی خالید دا هیچ هەڵوێستێکی دیکە بەدی ناکەم کە دڵسۆزی قوڵ و ڕاستگۆی بەتینی ئاوەها بخاتە ڕوو..

لای ئەو وەکو یەکە، ئەمیر بێت، یا سەرباز..

ئەمیرایەتی وەك سەربازێتی وایە، هەریەکەیان هۆکارێکە و ئەرکی سەرشانی خۆی بەرامبەر خودا کە بڕوای پێ هێناوە و، بەرامبەر پێغەمبەرەکەی کە بەڵێنی پێداوە و بەرامبەر ئەو ئاینەی کە لە ئەستۆی گرتووە و لەسایەی ئاڵاکەیدا ڕۆشتووە، پێی بەجێ دەگەیەنێت..

هەوڵدانی ئەو لە کاتێکدا کە ئەمیرێکی فەرمان بەجێهێنراوە هەروەك هەوڵدانیەتی وەك سەربازێکی گوێرایەڵ..!!

ئەو سەرکەوتنە مەزنەش بەسەر دەروونیدا بۆی ساز کردبوو، هەروەك بۆ کەسانی دیکەی پێش جێنشینەکانیشی ساز کردبوو کە فەرمانڕەوایی ئوممەتی ئیسلام و دەوڵەتی موسڵمانان بوون لەو ڕۆژەدا..

ئەبوبەکر و عومەر..

کە دوو ناون زمان توانای جوڵانی نیە بۆ ناوهێنانیان، هەتا هەموو موعجیزەکانی چاکەی مرۆڤ و، مەزنی مرۆڤ نەهێنێتە خەیاڵی خۆی..

سەرەڕای بزربوونی خۆشەویستی هەندێك کات لە نێوان عومەر و خالید دا، بێگەردی عومەر و دادگەری و، خواترسانی و، مەزنی لەرادەبەدەری، هەرگیز لای خالید جێگەی پرسیار نەبوون..

پاشان بڕیارەکانیشی هەرگیز لای ئەو جێگای گومان نەبوون، چونکە ئەو ویژدانەی کە دەیجوڵاند، لە تەقوا و، دامەزراوی و، دڵسۆزی و، ڕاستگۆیدا گەیشتبووە ڕادەیەکی وا کە ویژدانێکی پاك و پێگەیشتوو پێی بگات، ئەمیری باوەڕداران (عومەر) بە خراپ سەیری خالیدی نەدەکرد، بەڵکو شمشێرەکەی پەلە و تیژ دەهاتە پێش چاو..

لەپاش کوژرانی مالیکی کوڕی نویرە (عومەر) ئەوەی خستە ڕوو کاتێك کە پێشنیاری کرد بۆ ئەبوبەکر گۆشە گیری بکات و، وتی:

{شمشێرەکەی خالید پەلەکردنی تێدایە}..

واتە بەسوك گرتن و تیژی و، پەلەکردنی تێدایە..

(ئەبوبەکری صدیق)یش لە وەڵامیدا وتی:

{ناتوانم بەرهەڵستی شمشێرێك بکەم کە خوای گەورە زاڵی کردووە بەسەر بێ باوەڕاندا}..

(عومەر) دەیووت خالید پەلەکردنی تێدایە.. پەلە پەلییەکەی دایە پاڵ شمشێرەکەی خالید نەک خۆی، ئەو وشانەش دەربڕی ئەدەبی ئەمیری ئیمانداران نین و بەس، بەڵکو لە هەمان کاتدا ڕێزگرتنیەتی لە خالید..

(خالید)یش پیاوی شەڕە، لە لانکەوە تا دارە مەیت.

ئەو ژینگە و، پێگەیشتن و پەروەردەکردنی و، هەموو ژیانی بەر لە ئیسلام و دوای ئەویش هەر هەمووی مەیدانێك بوو بۆ سوار چاکێتی، پڕ مەترسی، لێزانانەیە..

پاشان سووربوونی رابردووی بەر لە موسڵمان بوونی و، ئەو جەنگانەی لە دژی پێغەمبەر و هاوەڵانی ئەنجامی داو ئەو لێدانانەی شمشێرەکەی لە ڕۆژانی بێ باوەڕیدا سەری بڕواداران و ڕوخساری خواپەرستانی پێ لێکردەوە، تێکڕای ئەوانە قورساییەکی زۆریان لەسەر ویژدانی هەبوو، وایان لە شمشێرەکەی کردبوو کە هەڵوەدای لە ناوبردنی هاوەڵ پەرستان بێت چەند هێندەی ئەوەی کە بەسەر موسڵمانانیدا هێنا)).

ئێوەش ئەو دەستەواژەیەتان لەیادە کە لە سەرەتای ئەم باسەوە هێنامان کە لەمیانی قسەکردنیدا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ هات، کە پێی وت:

ئەی پێغەمبەری خودا، لای خوای گەورە داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە لەسەر هەموو ئەو ڕێگرییانەی لەبەردەم ڕێگای خوادا دروستم کردووە.

وێڕای هەواڵ پێدانی لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ ، کە ئیسلام هەموو شتێکی پێش خۆی دەسڕێتەوە، ئەو هەر سوور بوو لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ پەیمانی پێ بدات کە خوای گەورە لە هەموو ئەو کارانەی، پێشتر بەشمشێرەکەی دەستی ئەنجامی داوە، ببورێت..

شمشێریش کاتێك بەدەستی شۆڕەسوارێکی جەربەزەی وەك (خالیدی کوڕی وەلید)ەوە دەبێت و، پاشان ئەو دەستەی کە پێی گرتووە ویژدانێکی پەرۆشی گەرمەی پاکبوونەوە و قەرەبووکردنەوە و، داپۆشراو بە خۆشەویستی و پشتیوانیەکی ڕەها بۆ ئاینێك کە پلان و دژایەتی دەورەدراو بیجوڵێنێت، ئەوا زۆر سەخت دەبێت لەسەر ئەو شمشێرە کە دەست لە بنەما ڕەق و، تیژییە ڕقێنراوەکانی هەڵبگرێت..

بەم جۆرە شمشێرەکەی خالیدمان بینی سەر ئێشەی بۆ خاوەنەکەی دروست دەکرد.

ئەو کاتەی دوای ڕزگارکردنی مەککەش پێغەمبەر ﷺ ناردی بۆ لای هەندێك لە هۆزە عەرەبەکانی نزیك شاری مەککە، پێی فەرموو:

{وەك بانگخوازێك دەتنێرم، نەك جەنگاوەر} .

شمشێرەکەی بەسەریدا زاڵ بوو ڕۆڵی جەنگاوەری تێدا بەرجەستە کرد و.. وازی لە ڕۆڵی بانگخوازی هێنا کە پێغەمبەر ڕایسپاردبوو، هەر ئەوەش بوو وای کرد لە پێغەمبەر ﷺ غەمگین و ناڕەحەت ببێت کاتێك هەواڵی کارەکانی خالیدی پێگەیشت، هەستایەوە و ڕووی کردە قیبلە و، هەردوو دەستی بەرزکردەوە و، بەم وتەیەی پۆزشی بۆ خوای گەورە هێنایەوە:

{خودايا خۆم بەرى دەكەم لەوەى خاليد ئەنجامى داوە}

پاشان عەلى نارد بۆ لايان خوێنى دانێ و پارە و سامانى بۆ گێڕانەوە.

وتراويشە كە خاليد بەوە پاكانەى بۆ خۆى كردووە كە (عبداللّەى كوڕى حوزافەى سەهەمى) پێى وتوە: پێغەمبەرى خوا فەرمانى شەڕكردن لەگەڵياندای پێكردوون لەبەر ئەوەى موسڵمان نابن..

خاليد خاوەنى توانايەكى نائاسايى بوو و.. پاڵەپەستۆيەكى زۆرى لەسەر دروست كردبوو بۆ داڕوخانى هەموو جيهانى كۆنى..

خۆ گەر ئێمە لێى رابمێنين كاتێك بتى (عوزا) دەڕوخێنێت كە پێغەمبەر ناردبووى بۆ روخاندنى.

يان گەر سەرنجى بدەين كە بەپاچەكەى ئەو بينا بەردينەى دەروخاند، وەك پياوێك دەهاتە بەر چاومان كە لە دژى تێكڕاى سووپايەك بجەنگێت، سەرى تاكەكانى دەپچڕاند و ريزەكانى پەرتەوازە دەكرد.

ئەو بەدەستى راستى و، بەقاچيشى لێى دەدا و، هاوارى لە پارچە ورد وردبووەكان و، خۆڵە داكەوتووەكەى دەكرد:

{ئەى عوزا بڕوام پێت نيە ، نەك پاك و بێگەرد بيت

من بينيم خواى گەورە سەر شۆڕى كردى..!!}.

پاشان ئاگرى لە خاكەكەى بەردەدا و دەيسوتاند..!

هەموو دياردەكانى هاوەڵ پەرستى و پاشماوەكانى لەبۆ چوونى خاليد دا-وەك عوزا جێگايەكى لەو جيهانە نوێيەدا نيە كە خاليد لە سايەى ئاڵاكەيدا راوەستابوو..

خاليد بەهيچ شتێكى ديكە لە شمشێرەكەى ئاشنا نەبوو بۆ پاكتاوكردنى.

هەر بۆيە.. {باوەڕم بەتۆ نيە ، نەك بێگەردى بۆت

من بينيم خواى گەورە سەرشۆڕى كرديت}..!!

گەر ئێمەش لەگەڵ ئەميرى باوەڕداران (عومەر)دا ئەو خۆزگەيەمان هەبايە، كە بريا شمشێرەكەى خاليد بەدەر بووايە لەو پەلە پەليیە، ئەوا لەگەڵ ئەميرى باوەڕداران (عومەر)يش، ئەم وتەيەى دووبارە دەكەينەوە:

{ئافرەتان دەستەوسانن لەوەى كەسێكى ديكەى وەك خاليد وەبەربێنن}..!!

ئەو رۆژەى خاليد كۆچى دوايى كرد (عومەر) زۆر زۆر بەكوڵ بۆى گريا و، خەڵكى دواتر زانيان كە ئەو تەنها بۆ لەدەستدانى ناگرى، بەڵكو بۆ دەرفەتە دەگريا كە مردن لە دەستى (عومەر)ى دا كە دەيويست خاليد بكاتەوە بە ئەمير پاش ئەوەى قسە و قسەڵۆكى خەڵكى لەسەر لاچوو و، هۆيەكانى كۆشە گير كردنى نەما، گەر مردن پێى نەگەيشتبايە و خاليد خێرا بەرەو ديدارى پەروەردگارى نەگەڕايەتەوە.

بەڵێ، ئەو پاڵەوانەش خێرا بەرەو ئارامگاکەی لەبەهەشتدا گەڕایەوە..

ئێستا بۆی هەیە بحەوێتەوە..؟؟ چونکە ئەو کەسێك بوو سەر زەوی هیچ کەسی دیکەی وەك ئەو دوژمنی حەوانەوەی بەخۆیەوە نەدیووە..؟؟

ئێستا کات و ساتی ئەوەیە جەستەی شەکەتی بۆ کەمێ بسرەوێ..؟؟ هەر ئەو بوو هاوەڵان و دوژمنانی لە پیاهەڵدانیدا دەیانوت:

{ئەو پیاوە ناخەوێت و، لێناگەڕێت کەسیش بخەوێت}..؟؟

بەڵام ئەو گەر سەرپشك بکرایە ئەوا ئەوەی هەڵدەبژارد کە خوای گەورە تەمەنی درێژتر بکردایە و کات و ساتی زیاتر پێ ببەخشایە تا درێژە بە تێکشکانی پاشماوە بۆگەنەکان بدات و، لەسەر کار و جیهاد کردنی لەپێناوی خوا و ئیسلامدا بەردەوام بێت

جا گیانی ئەم پیاوە و بۆنی خۆشی بۆ هەمیشە دەمێنێتەوە، بەردەوامە، کاتێك ئەسپ دەحیلێنێت و، رمەکان دەبریسکێنەوە و، بەیداخەکانی یەکخواناسی بەسەر سوپاکانی ئیسلامەوە دەشەکێتەوە..

دەڵێت:

{شەوێك کە تێیدا بوکێکی رازاوەم بۆ بێنن، یا مژدەی لەدایکبوونی کوڕێکم پێ بدرێت، خۆشەویستر نیە لام لە شەوێکی سەرما و سۆڵەی توند، کە لەگەڵ پۆلێك لە خەباتکاراندا، لە دژی بێباوەڕان رۆژ بکەمەوە}..

لە پێناوی ئەوەشدا، پەژارە و کەسەری ژیانی -بەبۆ چوونی خۆی- ئەوەبوو کە لەسەر نوێنگەکەی بمرێت، لە کاتێکدا کە هەموو ژیانی بەسەرپشتی ئەسپەکەیەوە و، لە سایەی بریسکەی شمشێرەکەیدا بەسەر بردووە..

ئەو کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەشداری غەزای کرد و، هەڵگەڕاوەکانی داپڵۆسی.

تەخت و تاراجی فارس و رۆمی لەگەڵ خاکدا یەکسان کرد و، بەڕاکردن بەسەر زەویدا رۆشت، هەنگاو بە هەنگاو لە عێراق، هەتا رزگاریکرد بۆ ئیسلام و لە وڵاتی شامیش شەقاو شەقاو، تا هەر هەمووی بۆ ئیسلام رزگارکرد..

وەك سەرکردەیەك، کە نارەحەتی و خۆبەکەمزانینی سەربازێك تێیدا رەنگی دابوویەوە و، وەك سەربازێك کە هەڵگری بەرپرسیارێتی سەرکردە و پێشەنگی بوو.

داخ و کەسەری ژیانی پاڵەوان ئەوەیە کە لەسەر نوێنگەکەی بمرێت..!!

ئالێرەدا کە ئەسرینەکانی بەخوڕ لەدیدەی دەخزانە خوارێ وتی:

{لەو شەڕە و ئەو هێرشە بەشدار بووم و، هیچ جێگایەکی جەستەم نەماوە جێگەی لێدانی شمشێری پێوە نەبێت، یا جێ دەمی رم، یا شوێنی تیر..

ئێستاش ها ئەوە لەسەر نوێنگەکەم وەکو وشتر بەسەر لوتدا دەمرم، دەسا باچاوی ترسنۆکەکان بێ خەو بێت}..!!

ئەمانە ئەو وشانەن ئەو کاتە ساتی وتنیان نیە، مەگەر هەر پیاوێکی ئاوا بتوانێت بیڵێت.
ئەو ساتەیش لە پێشوازی چرکە ساتەکانی ماڵئاوایدا بوو، دەستی کرد بەوەسیەت کردن..
دەزانن وەسیەتی بۆ کێ کرد..؟؟
بۆ خودی عومەری کوڕی خطاب..!!
دەزانن چی لەدوای خۆی بەجێ هێشتبوو..؟
ئەسپەکەی و چەکەکەی..!!
هیچی دیکە..؟؟
هیچی دی، لەوەی کە خەڵکی کۆی دەکاتەوە و هەیانە..!!
چونکە ئەو کە زیندوو بوو هیچی بەلاوە گرنگ نەبوو، جگە لە بایەخدانی بەسەرکەوتن و بەدەستهێنانی باڵا دەستی بەسەر دوژمنانی حەقدا.
لە شت و مەکەکانی دونیاشدا هەمووی لەسەر هیچ شتێك سوور نەبوو..
تەنیا یەك شت نەبێت، کە بەوپەڕی خۆشەویستیەوە سووربوو لەسەری.. کە ئەویش (قەلنسوت)ەکەی بوو..
لە رۆژی یەرموکدا لێی کەوت و، خۆی و خەڵکەکەش زۆر لەدوی گەڕان.. کاتێك لەسەر ئەوە سەرزەنشت کرا وتی:
{هەندێك لە مووی پەرچەمی پێغەمبەری خودای تێدا بوو و زۆر پێی گەشبین بووم و، پێی سەردەکەوتم}.
لە دواییدا، لاشەی ئەم پاڵەوانە لە ماڵەکەی بەسەر شانی هاوەڵان هێنرایە دەرەوە و دایکی پاڵەوانی کۆچکردوو بەدوو چاوی سوور بوونی ئاوێتە بەغەمەوە لێی دەڕوانی و لە ماڵئاواییدا وتی:
تۆ لە هەزاران هەزار کەسی هۆز باشتری، کاتێك روخساری مەردان بکەوێتە ململانێ... لە ئازایەتی دا..؟ تۆ لە باوکی شێران ئازاتری کە لەراوی شێر دەگەڕێنەوە... لە سوارچاکیشدا..؟
تۆ شۆڕەسوار تری لەو لافاوە بەخوڕەی کە لە نێو شاخەکانەوە لێشاو دێنێت.

انت خير من الف الف من القو م اذا ما كبت وجوه الرجال
اشجاع..؟ فأنت اشجع من لي ث عضنفر يذود عن اشبال
اجواد..؟ فأنت اجود من سيل غامر يسيك بين الجبـال

(عومەر) کە گوێبیستی ئەوەبوو،. زیاتر دڵی داخورپا.. و فرمێسکەکانی بەخوڕتر بوون و.. وتی:
{راستت وت..
سوێند بەخوا ئەو ئاوەها بوو}..
ئەمجا پاڵەوان لە گڵکۆکەیدا بەخاك سپێردرا..

هاوەڵانیشی کە دونیا کش و مات و، ملکەچ و بێدەنگ بوو، بەملکەچیەوە راوەستان..

تەنها حیلەی ئەسپێك هات و ئەو بێدەنگیەی شکاند -وەك ئەوەی بەبیری ئێمەدا بێت- کە پاش ئەوەی رەشۆکەی لابرد بوو خێرا دەهات و، شەقامەکانی مەدینەی بەراکردن بەدوای تەرمی خاوەنەکەیدا بڕیبوو، کە دڵتەنگی و بۆنی خۆشی ئەو بەڕێوەی دەبرد.

کە گەیشتە کۆمەڵە خەڵکە بێدەنگەکە و گۆڕەشێدارەکە سەری وەك ئاڵا بڵند کرد.

بەبەرزی حیلاندی.. تەواو وەك ئەو کاتەی کە پاڵەوانەکەی بەسەر پشتەوە بوو و، هەڕەشەی لە تەخت و تاراجی فارس و رۆم دەکرد و، چارەسازی دەردی دڵی بتپەرستی و دەستدرێژکارانی دەکرد و، هەموو هێزێکی شەڕەنگێز و هاوەڵ پەرستی لەسەر رێگەی ئیسلام رادەماڵی..

مایەوە و-چاوەکانی لەسەر گڵکۆکەی نەدەتروکاند- سەری بەرز کردەوە و نەوی کرد و، دەیجوڵاند بۆ گەورە و پاڵەوانەکەی و، سڵاوی ماڵئاوایی لێدەکرد..!!

پاشان بەسەر بەرزی بێدەنگ راوەستا، نێو چاوانی بڵند بوو، بەڵام چاوەکانی بەخوڕ ئەشکیان لێدەباری.!!

(خالید) لەگەڵ چەکەکەیدا (وەقف)ی کردوون لە پێناوی خوا.

بەڵام.. داخۆ هیچ شۆڕە سوارێك پاشی خالید دەتوانێت بچێتە سەرپشتی..؟؟

یان پشتی بۆ هیچ کەسێکی دیکە نەوی دەکات..؟؟

ئێی ئەی پاڵەوانی هەموو سەرکەوتنەکان.. و

ئەی بەرەبەیانی گشت شەوەزەنگەکان..

بەراستی تۆ بەگیانی سوپاکەتەوە بەسەر سەختی لێشاوی هێرشبەراندا زاڵ دەبوویت کە بەسەربازەکانت دەوت:

{کاتی سەر لەبەیانی خەڵکەکە خەم و خەفەتیان لادەچێت}

تا وەك پەندێك لە تۆوە مایەوە..

ئەوەتا تۆ ئێستا کە، خەفەتەکانت تەواوکرد.

دەسا ئەی باوکی سولەیمان، سوپاس بۆ بەیانیەکەت..!!

سەربەرزی و، بۆنی خۆش و، نەمری بۆ یادت ئەی خالید..!!

لێمان گەڕێ.. لەگەڵ ئەمیری باوەڕداران (عومەر)دا ئەو وشە سازگارە پاراوانە بڵێینەوە کە لە کاتی ماڵئاوایی لێکردن و شیوەنگێڕانیدا بۆت وتی:

خودای گەورە رەحم بەباوکی سولەیمان بکات.

ئەوەی لای خوای گەورە هەیە چاکترە لەوەی لە ژیاندا تێیدابووە.

بەراستی سوپاسگوزارانە ژیا و بەختەوەرانەش کۆچی کرد.

## ٢٣

# قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە

## فێڵبازترین کەسی عەرەب بوو گەر موسڵمان نەبوایە

سەرەڕای گەنجێتیەکەی، ئەنصاریەکان وەك سەرکردە هەڵس و کەوتیان لەگەڵدا دەکرد..

لەبارەیەوە دەیان وت: ((گەر بمانتوانیایە بە سامانەکەمان ریشێکمان بۆ قەیس بکڕیایە، ئەوا دەمانکڕی)).

لەبەر ئەوەی کۆسە بوو، هیچ خەسڵەتێکی سەرکردەی لە داب و نەریتی هۆزەکەیدا کەم نەبوو جگە لەو ریشە نەبێت کە پیاوەکانیان روخساری خۆیان پێ هەیبەتدار دەکرد، جا دەبێت ئەو گەنجە کێ بێت کە هۆزەکەی حەزیان دەکرد دەست لە هەموو سامانەکانیان هەڵبگرن بەرامبەر بە ریشێك کە روخساری ئەوی پێ دابپۆشن و، رووکەشی دەرەکی مەزنییە راستەقینەکەی و، سەرکردایەتیە سەرکەوتووەکەی پێ تەواو بکەن..؟؟

ئەوە (قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە)یە.

لە خانەدارترین و دێرینترین خانەوادەکانی عەرەبە.. ئەوماڵەی کە پێغەمبەر ﷺ لە بارەیەوە فەرمووی:

{خانەدانی سیمای خەڵکانی ئەم ماڵەیە}..

ئەو لێزانەش کە فێڵ و تەڵەکە و، لێهاتووی و، زیرەکی لێ هەڵدەقوڵێ و، لەبارەی خۆیشیەوە راستگۆیانە وتویەتی:

{گەر ئیسلام نەبوایە، فرت و فێڵێکی وەهام دەکرد عەرەب بەرگەی نەگرتایە}..!!

چونکە ئەو زیرەکێکی، زۆر فێڵزانی، مێشك کراوە بوو.

لەرۆژی (صەفەین)یشدا لە شوێنی خۆیدا بوو لەتەك ئیمامی عەلیدا بەرامبەر معاویە و.. لەگەڵ خۆیدا دادەنیشت و نەخشەی فرت و فێڵێکی دەکێشا کە لە توانایدا بێت معاویە و ئەوانەی لە تەکیدایە بەرۆژێك یان چەند رۆژێك لەناو ببات، بەڵام ئەو فرت و فێڵەی خۆی دەپشکنی کە بەهۆی زیرەکیەکەیەوە بۆی هاتبوو و، بەفێڵێکی خراپی مەترسیداری دەهاتە پێش چاو و، ئەو ئایەتەی قورئانی پیرۆزی دەهاتەوە یاد کە دەفەرموێت:

﴿وَلَا يَحِيقُ الْمَكْرُ السَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِ: فرووفێڵیش هەر یەخەی خاوەنی دەگرێ.﴾ فاطر/٤٣.

دەست بەجێ پاشگەز دەبوویەوە و، داوای لێخۆشبوونی لەخوا دەکرد و، زمانی حاڵیشی دەیوت:

{سوێند بەخوا گەر بۆ معاویە بلوێت بەسەرماندا زاڵ ببێت، ئەوا تەنها بەهۆی زیرەکیەکەیەوە زاڵ نابێت بەسەرماندا بەڵکو بەهۆی وەرع و تەقوای ئێمەوە بۆی دەست دەدا زاڵ ببێت}..!!

جا ئەو ئەنصاریە خەزرەجیەی نێو ماڵێکی سەرکردەیەکی مەزن، چاکە و رەوشت پاکی لە باو و باپیرانەوە بۆ مابووەوە.. سەعدی کوڕی عوبادە، سەرکردەی خەزرەج بوو کە دواتر بەدیداری دەگەین..

کاتێك موسڵمان بوو دەستی (قەیسی) کوڕی گرت و بردیە خزمەت پێغەمبەرەوە و وتی:

{ئەمە خزمەتکارتە ئەی پێغەمبەری خوا}..

پێغەمبەریش لە (قەیس)دا هەموو خەسڵەتێکی زاڵبوون و دەرکەوتەکانی چاکسازی تێدا بەدی کرد..

هێنایە لای پێشەوە و نزیکی کردەوە و (قەیس) بەردەوام خاوەنی ئەو جێگایە بوو..

(ئەنەس)ی هاوەڵی پێغەمبەر لەو بارەیەوە دەڵێت:

{قەیسی کوڕی سەعد بۆ پێغەمبەر، وەك جێگەی پاسەوان وابوو بۆ سەرکردە}..

لە کاتێکدا کە قەیس، بەر لە موسڵمان بوونی بەو زیرەکییەی خۆی کە خەڵکی بەرگەی بیرکردنەوەیان نەدەگرت مامەڵەی لەگەڵ خەڵکیدا دەکرد و، کەس نەبوو لەنێو مەدینە و دەوروبەریدا هەزار حساب بۆ لێزانیەکەی نەکات.. کاتێکیش موسڵمان بوو، ئیسلام فێری کرد کە دڵسۆزانە هەڵس و کەوت بکات، نەك بە فێڵ و لێزانیەکەی و، لەراستیشدا نەوەیەکی چاکە کار بوو بۆ ئیسلام و، فێڵ و لێزانیەکەی وەلاخست و، ئیدی لەوە بەدوا هەڵمەتە لەناوبەرەکانی پێ نەدەچنی و.. هەر کە رووبەرووی هەڵوێستێکی سەخت ببوایەتەوە، سۆزی دەجوڵا بۆ فرت و فێڵزانیە کۆت کراوەکەی و، دەستەواژە هەمیشەییەکەی دەوتەوە:

{گەر ئیسلام نەبایە، فرت و فێڵێکم لە عەرەب دەکرد بەرگەی نەگرتایە}..!!

لەنێو خەسڵەتەکانیشدا تەنها دەست باویەکەی لە زیرەکییەکەی زیاتر بوو و.. خانەدانی و دەست باویش ئاکارێکی کت و پڕی قەیس نەبوو، بەڵکو ئەو لە رۆڵەی ماڵێکی دێرینی بەخشندە و دەست باودابوو و، خانەوادەی (قەیس)یش –لەسەر داب و نەریتی بەخشندە و دەوڵەمەندانی ئەو کاتەی عەرەب بوون–.

بانگکارێکیان لەسەر یەکێك لەبەرزاییەکانیان دانا بوو میوانی بە رۆژدا بۆ نانخواردن بانگ دەکرد..

یان ئاگری دادەگیرساند بۆ رێبواری نامۆ و نەشارەزا تا بەهۆیەوە شەو رێ دەربکەن و.. خەڵکی لەو رۆژگارەدا دەیانووت: ((هەر کەس حەزی لە بەز و گۆشتە، با بچێتە سەر خوانی دولەیمی کوڕی حاریسە))..

(دولەیمی کوڕی حاریسە)ش باپیرەی دووەمی (قەیس) بوو..

جا لەو ماڵە دێرینەدا (قەیس) بە بەخشندەی و لێبوردەیی گۆشکرا..

ڕۆژێکیان ئەبوبەکر و عومەر لەبارەی دەستکراوەیی‌و بەخشندەیی قەیسەوە دەدوان، وتیان:

{گەر واز لەبەخشندەیەتی ئەولاوە بهێنین، ماڵەکەی باوکی تیا دەبات}..

(سەعدی کوڕی عوبادە)ش بەو قسەیەی ئەوانی زانی کە لەبارەی (قەیس)ی کوڕییەوە وتبوویان، بۆیە وتی:

((کێ لەبەرەی (باوکی قوحافە– واتە ئەبوبەکر) و، کوڕی خطاب پۆزشم بۆ دێنێتەوە.. کوڕەکەم رژد دەکەن بەسەرمدا))..!!!

ڕۆژێکیان قەرزێکی زۆری دابوویە برایەکی نەداری..

لەوادەی دیاریکراوی دانەوەیدا پیاوەکە ئەمەکدارانە چوو بۆ لای قەیس و قەرزەکەی بۆ گێڕایەوە، بەڵام ئەو وەرینەگرت و پێی وت:

{ئێمە شتێك بەخشیبێتمان وەری ناگرینەوە}..!!

فیترەتی مرۆڤیش رێبازێکی هەیە لێی لا نادات و، پەیڕەوێکی هەیە نایگۆڕێت.. هەر بۆیە کە بەخشندەیی هەبوو ئازایەتیشی لەگەڵدا دەبێت..

بەڵێ.. بەخشندەیی راستەقینە و ئازایەتی راست دوانەیەکن، هیچ یەکێکیان لەوی دیکە دواناکەوێت.. خۆ گەر بەخشندەی بەدەر لە ئازایەتی هەبوو، ئەوا بزانە کە ئەوەی بەدی دەکەیت بەخشندەیی نیە.. بەڵکو رووکەشێکی بەتاڵ و درۆزنانەی روکەشەکانی خۆهەڵنان و پڕوپاگەندە کردنە و.. ئەگەر ئازایەتیش هەبوو بەبێ بەخشندەیی، ئەوا بزانە کە ئەوەش ئازایەتی نیە، بەڵکو ویستێکە لە ویستەکانی خۆسەپاندن و ستەمکاری..

کاتێك (قەیس) بەدەستی راستی جڵەوی بەخشندەییەکەی گرتبوو و، بەهەمان دەستی راستیش جڵەوی ئازایەتی و بوێری گرتبوو..

وەك ئەوەی مەبەستی شاعیری ئەم کۆپلەیە ئەو بێت:

اذا ما راية رفعت لمجد تلقاها عرابة باليمين

جا ئەو ئازایەتیەی لە هەموو ئەو غەزایانەدا دەدرەوشایەوە کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەشداری کرد کاتێ کە پێغەمبەر زیندوو بوو..

درێژەی بەو درەوشاوەییەدا، لەو جەنگانەشدا کە پاش کۆچکردنی پێغەمبەر بۆ لای پەروەردگاری باڵا، بەشداری تێدا کرد..

ئەو ئازایەتیەش پشت بەراستگۆیی دەبەستێت لە بری فێڵ و تەڵەکە و.. بەرەو ڕوونبوونەوە و ڕووبەڕووبوونەوە بچێت، نەك پێچ و پەناو هەڵخەڵەتاندن، خاوەنەکەی گیرۆدەی ناڕەحەتی و سەختی دەکات بەجۆرێ کە ئازاری دەدات و شەکەتی دەکات..

لەو ستاوەش (قەیس) توانای لەرادەبەدەری لەسەر فرت و فێڵ و پێچ و پەنا پشت گوێ خست، ئەو جۆرە ئازایەتیە روون و ئاشکرایەی هەڵگرتبوو، ئەو نارەحەتیانەی کە بەهۆیەوە تووشی دەبێت و ئەو نەهامەتیانەی بۆی دێت لەبەر چاوی بوو..

ئازایەتی راست و دروستیش تەنها لە متمانەی خاوەنەکەیەوە سەرچاوە دەگرێت..

ئەو متمانەیەش ئارەزوو یا ویستێك نیە، بەڵکو راستگۆیی لەگەڵ دەروون و، دڵسۆزیی بۆ حەق پێکی دێنێت..

بەم جۆرە کاتێك جیاوازی کەوتە نێوان ئیمامی عەلی و معاویە، دەبینین لەتەك دەروونی خۆیدا بەتەنها دەمێنێتەوە و، بەدوای راستیدا وێڵە لە رێی بۆ چوونیەوە، هەتا گەر بینی ئیمامی عەلی لەسەر حەقە، ئەوا سەربەرزانە و، ئازا و، چاونەترسانە لەگەڵیدا دەبێت..

لە جەنگەکانی (صەفەین) و، (جەمەل) و، (نەهرەوان)دا (قەیس) یەکێك بوو لە پاڵەوانە بوێرەکانی ئاڵا هەڵگری ئەنصار و، هاواری دەکرد:

| | |
|---|---|
| هذا اللواء الذي كنا نحق به | مع النبي، وجبيريل لنا مدد |
| ما ضر من كانت الانصار عيبته | الا يكون له من غيرهم احد |

واتە: ئەمە ئەو بەیداخەیە کە لەگەڵ پێغەمبەردا بووین هەڵمان گرتبوو، (جبریل)یش پشتیوانمان بوو زیانی پێ نەگەیشتووە هەر کەس ئەنصاریەکان سەربازی بێت و هیچ کەسی دیکەی نەبێت.

ئیمامی (عەلی)یش کردبوویە فەرمانڕەوای میسر..

معاویەش هەمیشە چاوی بڕیبووە میسر.. هەردەم وەك بەنرخترین گەوهەری تاجی چاوەڕوانکراوی بێت..

لە پێناوی ئەوەشدا هەر کە (قەیس)ی بینی فەرمانڕەوایەتیەکەی پێ دەدرێت شێتی دایگرت و دەترسا لەوەی کە (قەیس) بۆ هەتا هەتایە ئەو لە میسر دابڕێت، هەتا گەر ئەو سەرکەوتن بەسەر ئیمامی عەلیشدا بەدەست بهێنێت، سەرکەوتنێکی یەکلاکەرەوە..

بەم شێوەیە بەهەموو هۆکارە فێڵاویەکانی و، بەو تەڵەکە بازیانەی کە لە هیچ سڵی نەدەکرد، دووزمانی لە دژی (قەیس) دەکرد لای ئیمامی عەلی، هەتا ئیمام لە میسر بانگی کردەوە..

ئالێرەدا خۆی تێگەیشت کە (معاویە) ئەم گەمەیەی لە دژی ئەو ئەنجام داوە پاش ئەوەی کە هەوڵەکانی بۆ دانە پاڵ خۆی، تاوەکو لە دژی ئیمامی عەلی سنگ پڕ رق و کینە بکات و، هەتا پشتیوانی بۆی کەم بکاتەوە.. کەواتە، چاکترین بەرپەرچدانەوەی فرت و فێڵی معاویە، خۆشەویستی و پشتیوانیکردنی زیاتر بۆ ئیمامی عەلی و، بۆ حەق کە ئیمامی عەلی نوێنەرایەتی دەکات، ئەوەش لە هەمان کاتدا جێ باوەڕکردنی تەواو و جەخت لەسەر کراوە لای قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە..

بەم شێوەیە بۆ چرکە ساتێك وای هەست نەکرد کە ئیمامی عەلی لایداوە لەسەر میسر.. ئەمیرێتی و، فەرمانڕەوایی چیە، هەموو پلە و پایەکان لای (قەیس) تەنها ئامێرێکن بۆ خزمەتکردنی حەق بەکاردەهێنرێن و، راوەستانیشی لەگەڵ ئیمامی عەلیدا لە گۆرەپانی جەنگدا هۆکارێکی دیکەیە کە گرنگی و جوانیەکەی کەمتر نیە..

ئازایەتی (قەیس) دەگاتە چڵە پۆپەی راستگۆیی و ژیرییەکەی، لە پاش شەهید بوونی ئیمامی عەلی و پەیمانندان بەحەسەن..

قەیس بڕوای هێنا کە (حەسەن)، میراتگری راستەقینەی پێشەوایەتیە، هەر بۆیە پەیمانی پێدا و بێ باك لە تووشبوونی مەترسی پشتیوانی لێکرد..

کاتێکیش (معاویە) ناچاری کردن بۆ دانانی شمشێرەکانیان، قەیس دێت سەرکردایەتی پێنج هەزار لەوانە دەکات کە سەری خۆیان تاشیبوو بۆ ماتەمینی شەهید بوونی ئیمامی عەلی..

ئیمامی حەسەن وای بەچاك دەزانی کە برینی موسڵمانان سارێژ بکات کە لاواز بوونی درێژەی کێشاوە و، رادەیەك بۆ ئەو کوشتارە لەناوبەرە فەوتێنەرە دابنێت و، لەگەڵ معاویەدا بکەوێتە وتو وێژەوە پاشان بەڵێنی پێ بدات..

ئالێرەدا (قەیس) سەر لە نوێ بیر لە رەوشەکە دەکاتەوە و، سەیر دەکات هەڵوێستی ئیمامی حەسەن هەر چەند راست و دروست بێت، ئەوا سەربازەکانی (قەیس) ئەو مافی راوێژکردنیان لەبارەی دیاریکردنی چارەنووسیان هەیە لە ئەستۆیدا، بەم جۆرە کۆیان دەکاتەوە و وتارێکیان ئاراستە دەکات:

{گەر بتانەوێت شەڕتان پێدەکەم تا پەلە لە کوژرانتان بکەم، گەر حەزیشتان لێ بێ ئەوا هێمنایەتیتان بۆ دەستەبەر دەکەم}..

سەربازەکانیشی کاری دووەمیان هەڵبژارد و، هێمنایەتی لای معاویە بۆ وەرگرتن، کە دەروونی تەواو کرایەوە کاتێ بینی قەدەری وایە جڵەوی حەوانەوەی لە دەست بەهێزترین رکابەری بەتین و مەترسیدارترین کەس لەسەر سەرەنجامەکەیەتی..

ساڵی پەنجا و نۆی کۆچی لە شاری مەدینە، ئەو لێزانە کە ئیسلام بوویە دایەنگای لێزانیەکەی، کۆچی دوایی کرد..

مرد ئەو پیاوەی کە دەیووت:

گەر لەبەر ئەوە نەبووایە لە پێغەمبەری خوا م ﷺ بیستووە دەیفەرموو:

{فێڵ و، هەڵخەڵەتاندن لە ئاگر دایە، ئەوا تەڵەکەبازترین کەسی ئەم ئوممەتە دەبووم}..

لە ئاشتیدا مرد و، رەوتی پیاوێکی راستگۆی، روونی، بەخشندەی، ئازای لە پاش خۆی لە ژیاندا بەجێ هێشت..

بەڵێ.. مرد و.. لەپاش خۆی رەوتی پیاوێکی دەستپاکی لەسەر ئەو شتانەی کە هی ئیسلام بوون لەلای لە (ئەستۆگرتن) و، بەڵێن و، پەیماندان بەجێ هێشت..

# ٢٤

# عومەیری کوڕی وەهەب

## شەیتانی نەفامی و حەواری ئیسلام

لە رۆژی بەدردا، یەکێك بوو لەو سەرکردانەی قورەیش کە شمشێریان بۆ هەڵمەتبردنە سەر ئیسلام بەدەستەوە گرتبوو.

پیاوێکی دوور بینی مەزەندە کاربوو، هەر بۆیە هۆزەکەی دایاننابوو تا سەرنج بدات و ژمارەی ئەو موسڵمانانەی لەگەڵ پێغەمبەردا هاتوون بۆ رووبەڕووبوونەوەیان بزانێت و، سەیر بکات لە پشتیانەوە بۆسە یان هێزی کۆمەککار هەیە.

جا (عومەیری کوڕی وەهەبی جەمەحی) بەئەسپەکەیەوە کەوتەڕێ و بەدەوری سەربازگەی موسڵمانەکاندا سوڕایەوە و، دواتر گەڕایەوە بۆ لای هۆزەکەی و پێی وتن: (سێ سەد کەسن، کەمێك زیاترە یان کەمتر)، لە راستیدا مەزەندەکەی راست بوو، لێیان پرسی: ئەی هێزی کۆمەککاریان لە پشتەوە هەیە؟ لە وەڵامیاندا وتی:

{هیچمان لە پشتیانەوە بەدی نەکرد.. بەڵام ئەی خەڵکی قورەیش، سوارانێکم بینی مردنێکی حەتمیان هەڵگرتبوو لەگەڵ خۆ.. کەسانێکن جگە لە شمشێرەکانیان هیچ بەربەست و پەناگەیەکیان نیە..

سوێند بەخوا وای دەبینم پیاوێکیان لێ ناکوژرێت تا یەکێکی لێ نەکوشتبین، خۆ گەر هێندەی ژمارەی خۆیانیان لێ کوشتین، ئەوا لەدوای ئەوە ژیان چ خۆشیەکی تێدایە..؟؟

ئێوەش بیروڕای خۆتان تاوتوێ بکەن}..

هەندێك لە گەورە پیاوانی قورەیش کەوتە ژێر کاریگەری قسەکانی و، لەوەدابوو کە پیاوەکانیان کۆبکەنەوە و بەبێ شەڕ بەرەو مەککە بگەڕێنەوە، گەر (ئەبوجەهل) نەبووایە کە ئەو بیروڕایەی پوچەڵ کردنەوە و، ئاگری بوغز و کینە و، ئاگری جەنگی لە دەروونیاندا داگیرساند، کە خۆی یەکەم سوتاوی بوو..

خەڵکی مەککە: بە (شەیتانی قورەیش) ناویان دەبرد..

بەڵام (شەیتانی قورەیش) لە رۆژی بەدردا تووشی نارەحەتیەك بوو، کە نەخۆی و نە هۆزەکەی هیچ سوودیان لێ نەبینی، جا سوپای قورەیش بەسەرشۆڕی و تێکشکاوی بەرەو مەککە گەڕانەوە و،(عومەیری کوڕی وەهەب)یش هەندێ لە مەدینە دواکەوت.. چونکە کوڕەکەی بەدیلی کەوتبووە دەستی موسڵمانەکان..

رۆژێکیان لە کۆڕ و کۆبوونەوەیەکدا لەگەڵ (صەفوانی کوڕی ئومەییە)ی ئامۆزای دانیشت.. صەفوان بوغز و کینەیەکی یەکجار تاڵی دەخواردەوە، چونکە (ئومەیەی کوڕی خەلەف)ی باوکی لە رۆژی بەدردا تیاچوو بوو و، بیرە داڕووخاوەکان ببونە گۆڕی پارچەکانی مەیتەکەی.

(صەفوان) و (عومەیر) پێکەوە دانیشتن و ڕق و کینەی خۆیان هەڵدەڕشت..
با لێگەڕێین (عەروەی کوڕی زوبەیر) ئەو گفتوگۆیە درێژەمان بۆ بگێڕێتەوە:
{صەفوان لە کاتێکدا باسی کوژراوانی بەدری دەکرد وتی: سوێند بەخوا لە دوای ئەوان ژیان هیچ خۆشیەکی تێدا نیە..!!
عومەیر پێی وت: ڕاستت وت، سوێند بەخوا گەر لەبەر ئەو قەرزە نەبووایە کە لەسەر شانمە و توانای دانەوەیم نیە و، لەبەر ئەو منداڵانەم نەبایە کە دەترسم دوای خۆم تیا بچن ئەوا بەسواری بەرەو لای موحەممەد دەچووم تا دەمکوشت، بیانوویەکم هەیە لای دەمکردەبەهانە:
دەمووت لە پێناوی ئەو کوڕە دیلەمدا هاتووم.
(صەفوان) ئەوەی قۆستەوە و وتی:
قەرزەکەت لەسەر من.. من لەبری تۆ دەیدەمەوە.. منداڵەکانیشت لەگەڵ منداڵەکانمدا دەژیەنم هەتا مابن..
ئەمجا عومەیر پێی وت: کەوابوو با ئەمە نهێنی بێت لە نێوانماندا..
پاشان (عومەیر) فەرمانی کرد شمشێرەکەیان بۆ تیژکردەوە و ژەهراویان کرد، دواتر کەوتە ڕێ تا گەیشتە مەدینە.
لە کاتێکدا کە (عومەری کوڕی خطاب) لەگەڵ کۆمەڵێك لە موسڵماناندا لە بارەی ڕۆژی بەدرەوە دەدوان و، باسی ئەو ڕێزەیان دەکرد کە خوای گەورە لێی نان، عومەر سەرنجی دا، (عومەیری کوڕی وەهەب)ی بەدی کرد وڵاخەکەی لەبەر دەرگای مزگەوتدا بەستۆتەوە و، شمشێرەکەی بەشانەوەیە، وتی:
ئەو سەگە (عومەیری کوڕی وەهەب)ی دوژمنی خوایە، سوێند بەخوا تەنها بۆ خراپەکاری هاتووە.
هەر ئەو بوو لە ڕۆژی بەدردا لێمان نزیك بوویەوە و مەزەندەی کردین بۆ هۆزەکەی..
پاشان عومەر چوو بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی وت:
ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەتا (عومەیری کوڕی وەهەب)ی دوژمنی خوا دڕندانە بە شمشێرەکەیەوە هاتووە..
پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:
بیکەرە ژوورەوە بۆ لام.. ئەمجا عومەر چوویە لایەوە و قایشی شمشێرەکەی لەملی پێچا و، بەو پیاوە ئەنصارییانەی کە لەگەڵیدا بوون وت: وەرنە خزمەت پێغەمبەری خوا و دابنیشن و ئاگاداری ئەو پیاوە پیسە بن، چونکە متمانەی پێ ناکرێت..
(عومەر) هێنایە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و، بەقایشی شمشێرەکەی ملی بەستبوو کاتێ پێغەمبەر بینی فەرمووی: وازی لێ بێنە عومەر، نزیك بەرەوە عومەیر..
عومەیر هاتە پێشەوە و وتی: (بەیانیتان باش، ئەمەش سڵاوی سەردەمی نەفامی بوو..

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: خوای گەورە بەسڵاوێکی چاکتر لە سڵاوەکەی تۆ ئەی عومەیر ڕێزی لێناوین.. کە ئەویش سڵاوی ئەهلی بەهەشتە.

عومەیر وتی: ئەی موحەممەد ئەوە بەلای منەوە شتێکی تازەیە.

پێغەمبەر فەرمووی: چی وای لێکردوویت بۆ ئێرە بێیت..؟؟

وتی: هاتووم بۆ ئەو دیلەی کە لەلاتانە.

پێغەمبەر فەرمووی: ئەی ئەو شمشێرە چییە لە ملتدا..؟؟

عومەیر وتی: خوا لەناوی بەرێت چ شمشێرێکە، جا هیچ سوودێکی هەبووە بۆمان..؟!

پێغەمبەر ﷺ لێی دووبارە کردە و فەرمووی: ڕاستم پێ بڵێ عومەیر، بۆچی هاتویتە..؟

وتی: تەنها بۆ ئەوە هاتووم و بەس.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆ ئەوە نەهاتوویت بەڵکو تۆ و صەفوانی کوڕی ئومەییە لە بەردەلانێك دانیشتبوون باسی قورەیشیە کوژراوەکانی نێو بیرەکانتان دەکرد، پاشان وتت: گەر لەبەر ئەو قەرزە نەبێت کە لەسەرمە و، لەبەر منداڵەکانیشم نەبێت ئەوا بەرێدەکەوتم تا موحەممەدم دەکوشت، ئەمجا صەفوان قەرزەکەت و منداڵەکانیشی گرتە ئەستۆ بەو مەرجەی کە من بکوژیت، خوای گەورەش ڕێگر و بەربەستە لە نێوان تۆ و ئەو کارەدا..!!!

ئا لەو ساتەدا عومەیر هاواری کرد: اشهد ان لا اله الا الله، و انك رسول الله..

ئەوە کارێك بوو تەنها لە نێوان من و صەفواندا بوو و، سوێند بەخوا تەنها خوای گەورە هەواڵی پێداویت، جا سوپاس بۆ خوا کە ڕێنوێنی کردم بۆ لای ئیسلام..

ئەمجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بە هاوەڵەکانی: براکەتان لە ئاین تێبگەیەنن و قورئانی پێ بخوێنن و دیلەکەشی بۆ بەر بدەن..!!

بەم جۆرە عومەیری کوڕی وەهەب موسڵمان بوو..

بەم شێوەیە (شەیتانی قورەیش) موسڵمان بوو و، ڕۆشنایی پێغەمبەر و ئیسلام بەجۆرێك دایپۆشی کە لە چرکە ساتێکدا بگۆڕێت بۆ حەواریەکی ئیسلام.!!

عومەری کوڕی خطاب دەڵێت:

{سوێند بەو زاتەی گیانمی بەدەستە، بەراز خۆشەویستر بوو لەلام لە عومەیر کاتێك کە دەرکەوت لێمان.. ئەمڕۆش لە هەندێك لە منداڵەکانم خۆشەویسترە لە لام.

عومەیر دانیشت و بەقوڵی بیری لە لێبووردەیی ئەم ئاینە و، مەزنی پێغەمبەر دەکردەوە، ڕۆژە بەتاڵەکانی نێو مەککەی هاتەوە یاد بەر لە کۆچکردنی پێغەمبەر و یارانی بۆ مەدینە، کەتێیدا تەڵەی بۆ ئیسلام دادەنا و شەڕی لەگەڵدا دەکرد.

پاشان نەهامەتی و شەڕکردنی ڕۆژی بەدری بیرکەوتەوە..

دواتر ئەوەتا ئەمڕۆ شمشێرەکەی هەڵگرتووە و هاتووە پێغەمبەری پێ بکوژێت.

هەموو ئەمانە لە چرکە ساتێکدا دەسڕێتەوە بە وتنی: (لا اله الا الله، محمد رسول الله)...!!

چ لێبووردەیی و، چ بێگەردی و، چ متمانە بەخۆ بوونێکە ئەم ئاینە مەزنە لەخۆی گرتووە..!!

ئەرێ ئاوا ئیسلام لە کتوپڕێکدا هەموو هەڵەکانی پێشتری دەسڕێتەوە و، هەموو ستەم و دوژمنکاریەکانی لە بیری موسڵمان دەچێتەوە و، دڵیانی بۆ دەکەنەوە و، لە ئامێزی دەگرن..!؟

ئەرێ بەم جۆرە، ئەو شمشێرەی کە پێیەوە هاتبوو و، پەیمانی لەسەر خراپترین پێچانەوە و، خراپترین تاوان دابوو، هێشتا لە پێش چاویان دەبریسکێتەوە، هەموو ئەوە لەیاد دەکرێت و، ئێستا تەنها ئەوە باس دەکرێت کە عومەیر بەموسڵمان بوونی -لەیەك چرکە ساتدا- بووەتە یەکێك لە موسڵمانەکان و هاوەڵانی پێغەمبەر، ئەوەی بۆ ئەوان هەبێت بۆ ئەمیش هەیە و، ئەوەشی لەسەر ئەوان بێت لەسەر ئەمیشە؟!!

ئەرێ بەم شێوەیە، ئەوەی کە عومەری کوڕی خطاب بەر لەچەند ساتێك دەیویست بیکوژێت، لای عومەر دەبێتە کەسێکی خۆشەویستتر لە کوڕ و کچەکانی..؟؟!!

جا گەر تەنها چرکە ساتێکی راستگۆیی، کە عومەیر تێیدا موسڵمان بوونی خۆی راگەیاند، لای ئیسلام ئەو هەموو پێزانین و رێزلێنان و پاداشت و بەرزییەی هەبێت، کەوابوو ئیسلام ئاینێکی زۆر مەزنە..!!

لە ماوەیەکی کورتدا عومەیر ئاشنای ئەرکی سەرشانی خۆی بەرامبەر ئەو ئاینە بووە.. کە دەبێت هێندەی لە دژی جەنگاوە خزمەتی بکات و.. ئەوەندەی کە لەدژی بانگەشەی کردبوو بانگەشە بکات بۆ لای،..ئەوەی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی پێیان خۆشە لە راستگۆیی و، جیهاد و، گوێڕایەڵی نیشان بدات و.. بەم جۆرە رۆژێکیان هاتە خزمەت پێغەمبەر و وتی:

{ئەی پێغەمبەری خوا: من زۆر هەوڵم داوە بۆ خامۆشکردنی رووناکی خودا و، زۆر ئازاری ئەوانەم داوە کە لەم ئاینی خوای گەورە بوون و، جاپێم خۆشە کە رێگەم بدەیت بچمەوە مەککە و، بانگەوازی خەڵکی بکەم بۆلای خوا و، بۆ لای پێغەمبەرەکەی و، بۆ لای ئیسلام، بەڵکو خوای گەورە رێنوێنیان بکات، دەنا لەسەر ئاینەکەی خۆیان ئەشکەنجەم دەدان هەروەك چۆن هاوەڵەکانی تۆم لەسەر ئاینەکەیان ئازاردا}..

ئا لەو رۆژانەدا، کە عومەیر مەککەی بەجێ هێشتوو رووە و مەدینە، (صەفوانی کوڕی ئومەیە) کە عومەیری هەڵنابوو بۆ چوونە دەرەوە بەمەبەستی کوشتنی پێغەمبەر، لوت بەرزانە بەشەقامەکانی مەککەدا دەهات و دەچوو، کۆڕ و دانیشتنەکانی پڕ لە خۆشی و شادی دەکرد..!

کاتێك کە خزم و براکانی دەربارەی نهێنی و دڵخۆشی و گەشانەوەی پرسیاریان لێ بکردایە، لە کاتێکدا کە ئێسك و پرسکی باوکی لەنێو بیرەکانی مەککەدا گەرمن، بەلەخۆبایی بوونەوە دەستەکانی دەدا بەیەکدا و بەخەڵکی دەوت: ((مژدەتان لێ بێت بەرووداوێك کە پاش چەند رۆژێك هەواڵەکەیتان پێدەگات و، کارەساتی بەدرتان لەبیر دەباتەوە..!!

جا هەموو بەیانیەك دەچوویە قەراغی مەککە و لە کاروانچی و سوارەکانی دەپرسی: (ئەرێ هیچ لە مەدینە رووی داوە)؟

ئەوانیش وەڵامیان بەجۆرێك بوو کە ئەم پێی خۆش نەبوو و، مایەی رازی بوونی نەبوو، کەسیان رووداوێکی وای لە مەدینەدا بەدی نەکردبوو جێگای گرنگی پێدان بێت..

صەفوان بێ ئومێد نەبوو.. بەڵکو بەردەوام بوو لەسەر پرسیارکردن لەرێبواران، هەتا رۆژێکیان بەهەندێکیان گەیشت و لێی پرسین: ئەرێ هیچ لە مەدینە رووی داوە))؟؟

رێبوارەکەش پێی وت: با.. رووداوێکی زۆر مەزن روویداوە..!!

روخساری (صەفوان) گەشایەوە و دەروونی پڕ بەدونیا لێوان لێو بوو لە شادی و خۆشی..

بۆیە خێرا بەپەرۆشانە لە رێبوارەکەی پرسیەوە: چی روویداوە؟ بۆمی بگێڕەوە)).

پیاوەکە وەڵامی دایەوە: (عومەیری کوڕی وەهەب) موسڵمان بوو و، ئەوەتا لەوێ شارەزای ئەو ئاینە دەبێت و، فێری قورئان دەبێت..!!

زەوی لەپێش چاوی صەفوان سوڕایەوە و.. ئەو ڕوداوەشی مژدەی بەهۆزەکەی دەدا پێی و، چاوەڕوانی دەکرد تا کارەساتی بەدری لەبیر بباتەوە، ئەوەتا ئەمڕۆ لەم هەواڵە دڵتەزێنەدا بۆی هات و کردیە خۆڵەمێش..!!

رۆژێکیان رێبوارەکە گەیشتەوە ماڵەکەی و.. عومەیر شمشێرەکەی بەرزکردبوویەوە گەڕایەوە بۆ مەککە و، خۆی بۆشەڕ سازکردبوو، یەکەم کەسیش (صەفوانی کوڕی ئومەیە)ی بینی..

هەر کە چاوی پێی کەوت بیری لەوە کردەوە شاڵاوی بکاتە سەر، بەڵام شمشێرە ئامادەکەی دەستی عومەیر هێنایەوە هۆشی خۆی و، تەنها بەوتنی هەندێك جنێو بەعومەیر وازی هێنا و بەرێی خۆیدا رۆشت..

(عومەیری کوڕی وەهەب) بەموسڵمانی گەڕایەوە مەککە، لەکاتێکیشدا کە هەر ئەو بوو بەر لەچەند رۆژێك بەبێ باوەڕی لێی چوویە دەرەوە.

چوویە ناوی بەشێوەی جوانی رۆژی موسڵمان بوونی عومەری کوڕی خطاب و، دەست بەجێ لەدوای موسڵمان بوونی هاواری کرد:

{سوێند بەخوا هەر جێگایەك بەبێ باوەڕی تێیدا دانیشتبم، دەبێت بە ئیمانداریش تێیدا دابنیشم}..

وەك ئەوەی كە ((عومەیر)) ئەو وشانەی كردبێتە دروشم و، ئەو هەڵوێستەی كردبێتە پێشەنگ.

سووربوون لەسەر بەخشینی گیانی لە پێناوی ئەو ئاینەدا كە سەردەمانێك لە دژی جەنگابوو... لە هەڵوێستێكی وەهادا بوو كە رێی پێ بدات ئازار و ئەشكەنجەی ئەو كەسانە بدات كە بیانەوێت ئازاری پێ بگەیەنن.

بەمجۆرە دەستی دایە قەرەبوونەوەی ئەوەی لەدەستی دابوو و.. پێش كات و سات كەوتبوو بەرەو ئامانجەكەی و، بەشەو و رۆژ ئیسلامی رادەگەیاند، بەئاشكرا و نهێنی..

لەدڵیشدا ئیمانێك هەبوو كە ئاسایش و، رێنوێنی و، رۆشنایی دەباراند بەسەریدا..

وشەی حەقیشی لەسەر زار بوو، بانگەشەی خەڵكی پێدەكرد بۆ دادگەری و چاكە و خێر..

شمشێرەكەشی بەدەستی راستیەوە بوو، ئەو رێگرانەی پێ دەترساند كە بەربەستیان لەرێگەی ئەوانەدا دادەنا كە بروایان هێنا بوو بەخوا و، جا لەچەند هەفتەیەكدا ئەوانەی لەسەر دەستی (عومەیری كوڕی وەهەب) ئیمانیان هێنا بوو، ژمارەیان لەهەموو مەزەندە كردنێك زیاتر بوو كە بێت بەخەیاڵدا.

ئەمجا (عومەیر) لە كەژاوەیەكی درێژی پرشنگداردا بردنی بۆ شاری مەدینە.

ئەو بیابانەشی كە لە گەشتەكەیاندا بەسەریدا دەڕۆیشتن سەرسامی و شادی خۆی بەرامبەر ئەو پیاوە نە دەشاردەوە كە بەر لە ماوەیەك شمشێرەكەی بەدەستەوە گرتبوو بەسەریدا گوزەرا و، بەرەو مەدینە شەقاوی دەنا تا پێغەمبەر بكوژێت.. پاشان جارێكی دیكە بەسەریدا لەمەدینەوە بەڕوخسارێكی جودا لەوەی كە پێوەی رۆشت هاتەوەو لەسەر پشت وشترەكەی بەسنگ فراوانیەوە قورئانی دەخوێند.. دواتر ئەوەتا بۆ جاری سێیەم بەسەریدا دەڕوات.. لەپێش كەژاوەیەكی دوورودرێژی ئەو بڕوادارانەوە كە چۆڵاییەكەیان پڕ كردووە لە (لا اله الا الله) و (الله اكبر)..

بەڵێ بەراستی ئەوە هەواڵێكی مەزنە.. هەواڵی گۆڕانی (شەیتانی قورەیش) بەهۆی هیدایەتی خواوە بۆ دڵسۆزێكی نەبەرد لە دڵسۆزەكانی ئیسلام و، بەردەوام لە تەنیشت پێغەمبەری خواوە بوو لە هەموو غەزا و دیمەنەكاندا و، خۆشەویستی و پشتیوانی بۆ ئاینی خودا بەپتەوی مایەوە پاش وەفاتكردنی پێغەمبەری خوا لە دونیا.

لە رۆژی رزگاركردنی مەككەشدا (عومەیر) (صەفوانی كوڕی ئومەیە)ی هاوەڵ و كەسی نزیكی لەیاد نەكرد و رۆشت بۆ لای و لەبارەی ئیسلامەوە دوا و بانگی دەكرد بۆ لای پاش ئەوەی كە هیچ گومانێك بەرامبەر راستگۆیی پێغەمبەر و، راستی پەیامەكەی نەما..

بەڵام صەفوان كەل و پەلی خۆی كۆكردبوویەوە بەرەو (جەدە) بڕوات تا لێیەوە بەرەو یەمەن بپەڕێتەوە..

بەزەیی و، پەرۆشی عومەیر بۆ صەفوان زۆر زیادی کرد و، سوور بوو لەسەر ئەوەی کە بەهەموو هۆکارێك لە چنگی شەیتانی دەریکات.

هەر بۆیە خێرا بەرەو لای پێغەمبەری خوا ﷺ رۆشت و پێی وت:

{ئەی پێغەمبەری خوا، (صەفوانی کوڕی ئومەیە) سەر گەورەی هۆزەکەیەتی و، لەتۆ هەڵهاتووە و چۆتە دەرێ تا خۆی بخاتە دەریاوە دەسا سەلامەتی پێ ببەخشە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

ئەو پارێزراوە.

وتی: ئەی پێغەمبەری خوا نیشانەیەکی بدەرێ تا بزانێت کە پارێزراو دەبێت، ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ ئەو عەمامەیەی کە پێیەوە هاتبووە مەککە پێی بەخشی}..

دەسا با لێگەڕێین (عروەی کوڕی زوبەیر) باسەکەمان بۆ تەواو بکات:

{جا عومەیر پێیەوە چوویە دەرەوە هەتا پێی گەیشت کە دەیویست لەدەریاوە بپوات، پێی وت: ئەی صەفوان، دایك و باوکم فیدات بێ توخوا.. توخوا خۆت ناڕەحەت مەکە.. ئەمە ئەمانی پێغەمبەری خوایە ﷺ بۆم هێناویت.

صەفوان پێی وت: تیاچوون بۆ تۆ، لەبەر چاوم ون بیە و مەمدوێنە..

وتی: ئێی صەفوان.. دایك و باوکم فیدات بێ، پێغەمبەری خوا ﷺ باشترین کەس و، چاکە مەندترین کەس و، لەسەر خۆترین کەس و، باشترین کەسە.. سەربەرزی ئەو سەربەرزی تۆیە و.. رێزی ئەو رێزی تۆیە..

وتی: من لەخۆم دەترسم..

وتی: ئەو لەوە لەسەر خۆ تر و بەڕێز ترە..

ئەمجا لەگەڵیدا گەڕایەوە تا لای پێغەمبەری خوا ﷺ رایگرت..

ئەمجا صەفوان بەپێغەمبەری ﷺ وت: ئەمە وای دەخاتە روو کە ئەمانت بەمن داوە..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: راست دەکات..

صەفوان وتی: دوو مانگم بۆ دابنێ تا خۆم هەڵیبژێرم.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چوار مانگت بۆ هەبێت تا هەڵیبژێریت}..

دواتر صەفوان موسڵمان بوو..

عومەیریش بە موسڵمان بوونی بەختەوەربوو..

جا (عومەیری کوڕی وەهەب) درێژەی بە رێبازی پیرۆزی بەرەو لای خوادا و، بەشوێنی پێی پێغەمبەری مەزندا دەڕۆیشت کە خوای گەورە رێنوێنی خەڵکی کرد بەهۆیەوە لە تاریکی دەربازی کردن بەرەو رووناکی.

کاتێك کە سوپاکانی ئیسلام لە گۆشە جیاجیاکانی سەر زەویدا.. بەفراوانی و سەرکەوتوییی لەشەڕدا بوو.. دانایەکی سەرسوڕهێنەر نیشتەجێی شاری مەدینە بوو..

دانایەك کە دانایی و هۆشمەندی لەوشەکانیدابەجۆرێ خۆی دەنواند کە گەورەتر بوو لە بریسکانەوە و جوانی..

هەر کە پرسیاری لێ بکرایە بەوانەی دەوروبەری خۆی دەوت:

{باشترین کردەوەی خۆتان و، وەرگیراوترینیان لای پەروەردگارتان و، گەشە دارترینیان لە پلە و نمرەدا و، چاکتر لەوەی دژی دوژمن بجەنگێت و، لەملیان بدەیت و لە ملت بدەن، و باشتر لە درهەم و دینارتان پێ رابگەیەنم..؟؟}..

جا ئەوانەی کە بەبێ دەنگی سەریان نەوی کردبوو گوێیان بۆ شل کرد بوو سەریان بەرزدەکردەوە و خێرا دەیانپرسی:

{ئەو شتە چییە.. ئەی ئەبودەرداء}..؟؟

ئەبودەردائیش کە سیمای لە سایەی رۆشنایی ئیمان و داناییەکەیدا دەدرەوشایەوە، ئەگەڕایەوە سەر باسەکەی خۆی و درێژەی پێدەدا:

{یادی خودا..

یادی خودا زۆر گەورەترە}..!!

ئەم داناییە سەرسوڕهێنەرە بەفەلسەفەکەی بانگەشەی بۆ گۆشەگیری نەدەکرد و مەبەستیشی لەو وشانە مژدەی خراپ و، کشانەوە لە هەنگاوەکانی ئاینی نوێ نەبووە.

ئەو هەنگاوانەی کە جیهاد کردن لە ریزی هەرەپێشەوەیدایە..

بەڵێ.. ئەبودەرداء ئەو پیاوە نەبوو، چونکە لەوەتی موسڵمان بووە شمشێرەکەی هەڵگرتووە و لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لەجیهاددا بوو، تاسەرکەوتنی خوا و رزگارکردن هات..

بەڵام لەو پێڕە بوو کە لە خودی خۆی و لە بوونی پڕ لەزیندوویەتیدا، هەر ساتێ تەنیا ببوایە، بۆ بیرکردنەوە و، هانای ببردایەتە بەر میحرابی دانایی و، ژیانی خۆی لە پێناوی ژیاندنەوەی راستی و دڵنیابووندا نەزرکردبوو..؟؟

بەڕاستی (ئەبودەرداء)ی دانای مەزنی ئەو رۆژگارە، مرۆڤێك بوو خاوەنی پەرۆشیەکی بێ سنوور بوو بۆ بینینی خوا و پێغەمبەرەکەی، ئەوا لە هەمان کاتدا باوەڕی هێنابوو کە ئەو

ئیمانە بەو ئەرك و تێگەیشتنانەی هەیەتی، چاکترین و تاکترین رێگەیە بۆ گەیشتن بە حەقیقەت..

بەم جۆرە خۆی لەگەڵ ئیمانەکەیدا تاك کردەوە و خۆی پێ سپارد و، ژیانی خۆی بەپێی ئەو ئیمانە بەجەسووری و، تێگەیشتووی و، مەزنییەوە زاخاو دەکردو بەسەر ئەو رێگایەشدا رۆیشت تا گەیشتە جێ و، لەسەر ئەو رێبازە چوو تاگەیشتە ئاستی ئەو پەڕی راستی پتەو و.. هەتا شوێنی بڵندی تەواوی خۆی لەگەڵ راستگۆیاندا گرت کاتێك لە پەروەردگاری دەپاڕایەوە و ئەم ئایەتانەی دەخوێندەوە:

﴿ان صلاتي و نسكي و محياي ومماتي لله رب العالمين﴾الانعام /١٦٢.

بەڵێ.. جیهاد کردنی (ئەبودەرداء) بەرامبەر دەروونی و، لەگەڵ خۆیدا تا ئەو ترۆپکە بڵندە، تا ئەو باڵا دەستیە دوورە.. تا ئەو لێبڕانی پەرستنە.. کۆتایی هات..

کە ژیانی – هەموو ژیانی– والێکردبوو بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان بێت..!!

ئێستاش.. وەرن تا نزیك ببینەوە لەو دانا و خواپەرستە.. ئەو رۆشناییە بەدی ناکەن کە بەدەوری نێو چەوانیدا دەدرەوشێتەوە..؟؟

ئەرێ بۆنی ئەو گوڵ و گوڵزارەی لەلایەوە دێت ناکەن..؟؟

جا بەراستی ئەوە رۆشنایی دانایی و، بۆنی ئیمانە..

ئیمان و لەم پیاوە ئارامگرەدا داناییش بەیەك شاد بوون، بەیەك شادبوونێکی بەختەوەرانە، بەڵام چ بەختەوەرییەك..!!!

لەدایکی پرسیار کرا دەربارەی باشترین کردەوە کە پێی خۆش بووبێت.. لەوەڵامدا وتی: {بیرکردنەوە و پەندوەرگرتن}..

بەڵێ.. بەراستی تەواو بەئاگابوو لەو فەرمایشتەی خوای گەورە کە لە زۆر ئایەتدا هاتووە:

﴿فاعتبروا ياأولي الابصار﴾الحشر/٢.

لەکاتێکیشدا کە هانی براکانی خۆی دەدا لەسەر رامان و بیرکردنەوە، پێی دەوتن: {یەك سەعات بیرکردنەوە چاکترە لەپەرستشی شەوێك}..

جا بەراستی پەرستشی و رامان و گەڕان بەدوای حەقیقەتدا دەستی بەسەر دەروون و.. هەموو ژیانیدا گرتبوو..

ئەو رۆژەیش بڕوای هێنا بە ئیسلام وەك ئاینێك و، پەیمانی دا بەپێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەو ئاینە بەرێزە، یەکێك بوو لە بازرگانە سەرکەوتووە بەناوبانگەکانی مەدینە و، بەشێکی ژیانی بەر لە موسڵمان بوونی لە بازرگانی کردندا گوزەراندبوو، بەڵکو بەر لە کۆچکردنی پێغەمبەر و موسڵمانان بۆ مەدینە..

لەگەڵ ئەوەشدا کە کاتێکی زۆر کەم بەسەر موسڵمان بوونیدا تێپەڕیبوو هەتا..

با لێ گەڕێین خۆی باسەکەمان بۆ تەواو بکات:

{بازرگان بووم کاتێك کە بڕوام هێنا بەپێغەمبەر ﷺ و موسڵمان بووم..
ویستم کە پەرستش و بازرگانی پێکەوە بۆم بسازێن بەڵام نەکرا..
منیش دەستم لە بازرگانی هەڵگرت و رووم کردە خواپەرستی..
جا ئەمڕۆ پێم خۆش نیە خەریکی کڕین و فرۆشتن بم و رۆژانە سێ دینار قازانج بکەم، تەنانەت گەر دوکانەکەشم لەدەرگای مزگەوتدا بێت..
بەڵام بزانن کە من پێتان ناڵێم: خوای گەورە کڕین و فرۆشتنی حەرام کردووە.
بەڵام پێم خۆشە لەو کەسانە بم کە لەبازرگانی کردن و کڕین و فرۆشتن لەیاد کردنی خوایان دانابڕێت}..!!!

خۆ بینیتان چۆن دەدوێت و مافی تەواوی کێشەکەی دەدات و، دانایی و راستگۆیی لەنێو وشەکانیدا دەبریسکێنەوە..؟؟

ئەو خێرا بەر لەوەی پرسیاری لێ بکەین کە: ئایا خوای گەورە بازرگانی حەرام کردووە ئەی ئەبودەرداء؟

خێرا ئەو پرسیارەی هاتووە بەخەیاڵماندا لادەبات و، ئاماژە بۆ ئەو مەبەستە بەرزە دەکات کە دەیەوێت و، لەپێناویدا دەستی لەبازرگانی کردن هەڵگرتووە سەرەڕای سەرکەوتنی تێیدا..

بەراستیش پیاوێك بوو بەدوای تایبەتمەندییەکی رۆحی و باڵا دەستییەکدا وێڵ بوو کە بەرەو بەرزترین پلەی تەواو مەندی رێپێدراو بۆ ئادەمیزادی ببات..

لەراستیشدا پەرستشی وەك شەوڕەوییەك دەویست کە بەرزی بکاتەوە بەرەو جیهانی باڵای چاکە و، بیگەیێنێتە لای حەق لەپایەداریەکەیدا و، حەقیقەت لەسەر چەشمەکەیدا و، خۆ گەر تەنها وەك چەند ئەرکێك مەبەستی بوایە کە بەجێ بهێنرێ و، قەدەغەکراوانێك وازی لێ بهێنرێت، ئەوا دەیتوانی کە لەگەڵ بازرگانێتی وکارەکانیدا کۆی بکاتەوە..

جا چەند لە بازرگانان هەیە و پیاو چاکن و.. چەند پیاو چاکی بازرگانیش هەیە لەنێو هاوەڵانی پێغەمبەری خواشدا ﷺ چەندەها کەس هەبوو کە بازرگانی و کڕین و فرۆشتنیان داینەبڕیبوون لەیادی خوا.. بەڵکو هەوڵیان دا بوو بۆ گەشەکردنی بازرگانی و سامانەکەیان تا خزمەتی کێشەی ئیسلامی پێ بکەن و، پێداویستیەکانی موسڵمانانی پێدابین بکەن..

بەڵام بەرنامەی ئەو هاوەڵانە هیچ لە بەرنامەی (ئەبودەرداء) کەم ناکاتەوە، هەروەك چۆن بەرنامەی ئەم هیچ لەپرۆگرامی ئەوان کەم ناکاتەوە و، هەریەکەیان ئەو کارە ئەنجام دەدات کە بۆی دروستکراوە..

ئەبودەرداش هەستی بەهەستیارییەکی راستگۆیانە کردبوو بۆ ئەوە دروستکراوە کە ژیانی خۆی بۆ نەزر کردبوو..

تایبەتمەندێتی لەگەڕان بەدوای حەقیقەتدا بەئەنجامدانی ئەو پەڕی بوارەکانی خۆ ماندووکردن بەپێی ئەو ئیمانەی کە ڕێنوێنی کردبوو بۆ لای پەروەردگاری و، پێغەمبەرەکەی و، بۆ لای ئیسلام..

گەر حەزتان کرد ناوی بنێن سۆفیگەری..

بەڵام سۆفیگەری پیاوێکی زرنگی بڕواداری و، توانای فەیلەسوفی و، ئەزموونی جەنگاوەر و، تێگەیشتنی هاوەڵانی بۆ دەستەبەر بوو بوو و، وای لە سۆفیگەریەکەی کردبوو کە بزاڤێکی زیندوو بێت بۆ بنیاتنانی رۆح، نەك تەنها سێبەرێکی چاك بێت بۆ ئەو بنیاتە..!!

بەڵێ..

ئا ئەوە (ئەبودەرداء)ی هاوەڵ و قوتابی پێغەمبەری خوایە ﷺ..

ئا ئەوەیە (ئەبودەرداء)ی خوا پەرست و، دانا..

پیاوێك بوو بە هەردوو قاچی شەقی لەدونیادابوو، لەسنگی خۆی دەرکردبوو..

پیاوێك بوو لەگەڵ خۆیدا چوویە خەڵوەت تادایپۆشی و پاکی کردەوە و، تا بوویە ئاوێنەیەکی بێگەرد و دانایی و، راستبینی و، چاکەی تێدا دەرکەوت و، ئەبودەرداى کردە مامۆستایەکی مەزن و دانایەکی بەهێز..

بەختەوەرن، هەموو ئەوانەی ئەچنە لای و، گوێی لێ دەگرن..

دەساوەرن ئەی هۆشمەندان با لەداناییەکەی نزیك ببینەوە..

با لە فەلسەفە و تێڕوانینی بەرانبەر شادی و رازاوەییەکانی دەست پێ بکەین..

ئەوەتا قوڵایی گیانی کەوتبووە ژێر کاریگەری ئەو ئایەتە جوانەی قورئانی پیرۆز دەربارەی:

﴿الَّذِي جَمَعَ مَالاً وَعَدَّدَهُ، يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُ أَخْلَدَهُ: ئەوەی ماڵی کۆکردەوە ودەیبژێرێ، وا خەیاڵ دەکا دراوەکەی لە مردن دەیپارێزێ.﴾ الهمزة/٢-٣.

تا قوڵایی گیانی لەژێرکاریگەری ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەردا بوو:

((ما قل وكفى، خير مما كثر وألهى: ئەوی کەمی بێت و بەش بکات، چاکترە لەوەی زۆری هەبێت و گومڕای بکات))..

هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:

{چەند لەتواناتان بوو لە خەم و خەفەتی دونیا خۆ دوور بگرن، چونکە هەر کەسێك دونیا گەورەترین خەمی بوو، ئەوا خوای گەورە پەرتەوازەی دەکات و، هەژاریەتیەکەی دەخستە نێو چاویەوە..

ئەو کەسەیش رۆژی دوایی گەورەترین خەمی بوو خوای گەورە بۆی کۆ دەکاتەوە و، دەوڵەمەندییەکەی دەخاتە دڵیەوە و، خوای گەورە هەموو چاکەیەکی زۆر خێرا بۆ دەنێرێت}.

لە پێناوی ئەوەدا، شینی بۆ ئەو کەسانە دەکرد کە کەوتوونەتە بەندی چاوچنۆکی دەوڵەمەندی و دەڵێت:

{خودایا پەنات پێ دەگرم لە پارچە پارچە بوونی دڵ..

پرسیاری لێ کرا:

پارچە پارچە بوونی دڵ چییە ئەبودەرداء..؟؟

لەوەڵامدا وتی:

ئەوەیە کە لە هەموو دۆڵێکدا سامانم هەبێت}..!!!

بانگەشەی خەڵکی دەکرد بۆ بەدەستهێنانی دونیا بەهۆی دەستبەرداربوونیەوە.. لەراستیشدا ئەوە خاوەنمەندێتی راستەقینەیەتی.. بەڵام راکردن بەدوای چاوچنۆکیەکانیدا کە کۆتایی بۆ نیە، ئەوا ئەمە خراپترین جۆری بەندایەتی و کۆیلەیەتیە.

ئالێرەدا دەیووت:

((هەر کەسێ دەستی لە دونیا هەڵنەگرتبێت، ئەوا دونیا بۆ ئەو نیە))..

سامانیش لای ئەو هۆکارێکە بۆ گوزەرانێکی رەزامەندی مامناوەند و بەس..

پاشان لەسەر خەڵکی پێویستە کە بەحەڵاڵی بەدەستی بهێنن و، بەنەرم و نیانی و میانڕەوی پەیدای بکەن، نەك بەسوور بوون و خۆ ماندووکردن..

ئەو دەیووت:

{تەنها شتی باش بخۆ و..

بەس شتی باش بەدەست بهێنە و..

تەنها شتی باش بێتە ناوماڵەکەتەوە}.

نامەیشی بۆ هاوەڵێکی دەنووسی و دەیووت:

{دوای ئەوە، تۆ لە پانتایی دونیادا خاوەنی هەر چی هەیت، بەر لەتۆ هی کەسی دیکە بووە و..

لەدوای تۆش بۆ کەسی تر دەبێت.. تەنها ئەوەی لێ بۆ تۆیە کە بەکاری بهێنیت بۆ خۆت.. ئەوا لە پێشتری دابنێ لەوەی کە ماڵ و سامان کۆبکەیتەوە تا ببێتە میرات بۆ کوڕەکەت، بزانە کە بۆ یەکێك لەم دووانەی کۆ دەکەیتەوە:

یان بۆ کوڕێکی چاکە کە لە گوێڕایەڵی خوادا بەکاری دێنێت و، بەختەوەر دەبێت بەوەی کە تۆ ماندوو بوویت بۆی..

یاخود کوڕێکی سەرکەشە و، لەسەر پێچی خوادا بەکاری دێنێت و، بەوەی کە تۆ بۆت کۆ کردۆتەوە بەدبەخت دەبێت..

دەسا متمانەت هەبێ بەو رزق و رۆزییەی کە لای خودایە و، خۆت دەرباز بکە}..!

هەموو دونیا لەدیدەی ئەبودەرداءدا شتێکی رووت بوو..

کاتێك (قوبرس) رزگار کرا و دەستهاتەکانی جەنگ هێنرایەوە بۆ مەدینە، خەڵکی سەیریان کرد ئەبودەرداء دەگری.. بەسەرسامیەوە لێی نزیك بوونەوە و لێیان پرسی و، (جوبەیری کوڕی نەفیر) پرسیارەکەی ئاڕاستە کرد:

پێی وت:

{ئەی ئەبودەرداء چی وات لێدەکات لە رۆژێکدا بگریت کە خوای گەورە ئیسلام و خەڵکەکەی سەرفراز کردووە}..؟؟

جا ئەبودەرداء بەدانایيەکی زۆر و تێگەیشتنێکی قوڵەوە وەڵامی دایەوە:

{تیاچیت ئەی جوبەیر..

سوکترین دروستکراون لای خوا ئەگەر واز لە فەرمانەکانی بهێنن..

لەکاتێکدا کەنەتەوەیەکی بە دەستەڵات و، سەرکەوتوو، خاوەن موڵك بێت و، واز لەفەرمانی خودا بهێنێت و، بگاتە ئەوەی کە دەیبینێت}..!!

بەڵێ..

بەمە هۆکاری ئەو شکستە خێرایەی دەخستە روو کە سوپاکانی ئیسلام بە وڵاتە رزگارکراوەکانیان دەگەیاند.. کە ئەویش ئیفلاسی ئەو وڵاتانەیە لە رۆحانیەتێکی راستگۆیانە کە بیانپارێزێت و، ئاینێکی راست و دروست پەیوەستی بکات بە خوداوە..

جا ئالێرەوە، مەترسی رۆژگارێکی هەبوو کەبەسەر موسڵمانەکاندا بێت و زنجیرەکانی ئیمان بپسێت و پەیوەست بوون و پابەندبوونیان بە خوا و ڕاستی و چاکە بێ هێز ببێت و، رووتبوونەوە لەدەستیان دەربچێت، بەهەمان ئاسانی کە پێشتر هات بۆ لایان..!!

هەروەك چۆن تێکڕای دونیا لەبەر دیدەیدا رووت بوو، بەهەمان شێوە پردێك بوو بۆ ژیانێکی نەبڕاوە و شەنگتر.

هاوەڵانی لە کاتێکدا کە نەخۆش بوو هاتنە دیدەنی، بینیان لەسەر جێگایەك نووستووە کە لەپێستە دروستکراوە..

پێیان وت: ((گەر ئارەزووت لێ بووایە نوێنگەیەکی باشتر و نەرمترت دەبوو..))

لەکاتێکدا سۆمای چاوی بڕیبووە داهاتوویەکی دوور، بەپەنجەی ئاماژەی بۆ کردن و وتی:

{ماڵی ئێمە لەوێیە..

بۆ ئەوێ کۆدەکەینەوە و.. هەر بۆ ئەوێش دەگەڕێینەوە..

بۆ ئەوێ کۆچ دەکەین و.. بۆ ئەوێش کار دەکەین}..!

ئەم تێڕوانینەی ئەبودەرداء بۆ ژیان تەنها تێروانینێك نەبوو بەس، بەڵکو بەرنامەی ژیانیشی بوو..

(یەزیدی کوڕی معاویە) داخوازی کیژەکەی (ئەبودەرداء)ی کرد ڕەتی کردەوە و، بەداخوازییەکەی رازی نەبوو.. پاشان کوڕێکی هەژاری چاکەکار داخوازی کرد و، ئەویش لێی مارەکرد..

خەڵکی سەریان سوڕما لەو هەڵس و کەوتەی، جا ئەبودەرداء تێی گەیاندن و وتی:

{گومانتان چییە بەرانبەر ئەبودەرداء گەر خزمەتکار و خزمەتگوزارانی پادشا لەبەری هەستانەوە و رازاوەیی کۆشك و تەلارەکان سەرسامی کرد..

ئاینەکەی لەچیدایە ئەو رۆژە}..؟؟!!

ئەمەیە دانایی دەروون بەهێزی، دڵ وریا..

کە دونیا و هەموو ئەو شتانەی دەروون کەمەندکێش دەکەن بۆ لای و دڵی بۆی لێدەدات ڕەت دەکاتەوە..

ئەو بەم کارەی لە بەختەوەری هەڵنایەت بەڵکو بەرەو لای رادەکات..

چونکە بەختەوەری راستەقینە لای ئەو ئەوەیە کە خاوەنی دونیا بێت، نەك دونیا خاوەنی تۆ بێت.

هەرکاتێکیش داواکاریەکانی خەڵکی لەژیاندا سنووری قەناعەت و مامناوەندیتر راوەستا، هەر کاتێك ئاشنای حەقیقەتی دونیا بوون وەك پردێك کە بەسەریدا دەپەڕنەوە بۆ ماڵی ئۆقرەگرتن و حەوانەوە و جاویدانی، هەر کاتێك ئاوەهایان کرد، ئەوا پشکیان لە بەختەوەری دروست و تەواو و مەزنتر دەبێت..

هەر ئەو دەیووت:

{چاکە لەوەدا نیە ماڵ و منداڵت زیاد بکات، بەڵکو چاکە لەوەدایە کە لەسەر خۆیت مەزنتر بێت و، زانستت زیاد بکات و، لەپەرستشی خوادا چاك بیت بۆ خەڵکی}..

لەسەردەمی خەلیفایەتی (عوسمان)یشدا، کاتێك (معاویە) والی بوو لە شام، ئەبودەرداء لەسەر داوای خەلیفە چووە ئەوێ بۆ وەرگرتنی پۆستی قازییەتی..

جا لەشام لەکەمیندا بوو بۆ هەموو ئەوانەی کە خۆشیەکانی دونیا گومڕای کردوون و، بەردەوام باسی ڕێبازی ژیانی پێغەمبەر و، دونیا نەویستی ئەو و، شێوەی ژیانی دەستەی یەکەمی شەهیدان و راستگۆیانی دەکرد..

(شام)یش لەو رۆژگارەدا مێرگوزارێکی پڕ لە شادی و بەخششی بوو..

خەڵکەکەش بێزار بووبوون بەو پیاوەی کە بەئامۆژگاریەکانی شت و مەك و دونیایان لەبەر چاو ناشیرین دەکات..

جا ئەبودەرداء کۆی کردنەوە و، وتارێکی بۆدان:

{ئەی خەڵکی شام..

ئێوە بران لەئایندا و، هاوسێن لەماڵدا و، پشتیوانی یەکدین بەرانبەر دوژمنان..

بەڵام چییە دەتانبینم شەرم ناکەن..؟؟
ئەوەی کە نایخۆن کۆی دەکەنەوە.. و
ئەوەی تێیدا نیشتەجێ نابن بونیات دەنێن..
داوای ئەوە دەکەن کە پێی ناگەن..
خەڵکانی بەر لەئێوە کۆیان دەکردەوە و، دەیانپاراست..
ئومێدەوار بوون و، درێژەیان پێدەدا.. و
بونیاتیان دەنا و، زۆر پتەویان دەکرد..و
جا ئەوەی کۆیان کردبوویەوە لەناو چوو.. و
ئومێدەکەشیان بوویە گومڕایی.. و
ماڵەکانیشیان بوویە گۆڕ..
ئەوە هۆزی (عاد) بوون، نێوانی (عەدەن) و (عومان)یان پڕ لە سامان و منداڵ کردبوو..}
پاشان خەندەیەکی گاڵتە ئامێز کەوتە سەر لێوی و، بەهەردوو دەستی ئاماژەی بۆ خەڵکە کۆبووەکە کرد و، بەگاڵتەجارییەکی گەرمەوە هاواری کرد:
{کێ ئەوەی لە هۆزی (عاد) بەجێما بەدوو درهەم لێم دەکڕێت}..؟!!
پیاوێکی سەرسوڕهێنەر، جوان، پڕشنگدار، داناییەکەی بڕوادارانەبوو و، هەستیشی خۆ پارێزانە و، ئاوەزیشی بەتین و تێگەیشتوو چاك بوو..!!
پەرستش لای (ئەبودەرداء) لەخۆبایی بوون و سەر لێ شێوان نەبوو، بەڵکو بەدوای چاکەدا گەڕان و کەوتنە بەر سۆز و بەزەیی خودایە و، ملکەچییەکی هەمیشەییە کە تێیدا مرۆڤ هەست بەلاوازی خۆی دەکات، بەهۆی فەزڵی پەروەردگاریەوە لەسەری.
ئەو دەڵێت:
{لە هەموو سەردەمتاندا بەدوای چاکەدا بگەڕێن و خۆتان بدەنە سۆز و بەزەیی خودا، چونکە خودا ڕەحمەت و بەزەییەکی پاك و خۆشی هەیە دەیدات بەهەر کەسێك لەبەندەکانیدا کە بیەوێت..
داوا لەخوا بکە کە نەنگییەکانت دابپۆشێت و، ترسەکانتان ئارام بکاتەوە}..
جا بەڕاستی ئەو دانایە هەمیشە چاو کراوە بوو بەرانبەر لەخۆبایی بوون لەپەرستشدا و، خەڵکی ئاگادار دەکردەوە لەو لەخۆبایی بوونەی کە تووشی هەندێك لە ئیمان لاوازەکان دەبوو کاتێك تووشی لە خۆبایی بوون دەبوون بەهۆی پەرستشەکانیانەوە و، خۆیان بەسەر خەڵکی دیکەدا پێ هەڵدەنا و شانازیان پێوە دەکرد..
دەبا گوێی بۆ رادێرین، دەڵێت:
{تۆزقاڵێك لەچاکەی کەسێکی بەتەقوا و دڵنیا، پەسەندتر و باشترە لەو هێندەی چیاکان پەرستشی لەخۆبایی بووان}..

هەروەها دەیووت:

{داوای شتێك لە خەڵکی مەکەن کەخرابێتە ئەستۆیان..

بەبێ پەروەردگاریان لێپرسینەوەیان لەگەڵ مەکەن..

ئاگاتان لەخۆتان بێت، چونکە ئەو کەسەی کەوتە شوێن ئەوەی شت لەخەڵکیدا ببینێت غەمبارییەکەی درێژە دەکێشێت}..!!

ئەو نایەوێت بۆ خوا پەرستان کە هەر چەند پلە و پایەی لە پەرستشدا بەرزببێتەوە (قەرزاریەك) لە دەروونی خۆیدا ببڕێت بەرانبەر بەندەکان.

لەسەری پێویستە سوپاسگوزاری خودا بێت لەسەر سەختی و، بەپاڕانەوەی و جوان هەڵس و کەوت کردن و نیەتەکانی کۆمەکی ئەوانە بکات کە بەو جۆرە سەرخستنە نەگەیشتوون.

ئایا هیچ داناییەك ئاشنان جوانتر و بەهادارتریێت لەدانایی ئەم دانایە..؟؟

(ئەبوقەلاب)ەی هاورێی بۆمان دەگێڕێتەوە و، دەڵێت:

{رۆژێکیان (ئەبودەرداء) بەلای پیاوێکدا گوزەری کرد کە گوناهێکی کرد بوو و، خەڵکی جنێویان پێدەدا، ئەو رێگری لێکردن و ووتی: ئەگەر ئێوە لەچاڵێکدا بتاندۆزیایەتەوە.. ئایا دەرتان نەدەهێنایەوە..؟

وتیان: بەڵێ دەرمان دەهێنایەوە..

وتی: کەوابوو جنێوی پێ مەدەن و، سوپاسی خودا بکەن کە ئێوەی لەو گوناهە پاراستووە.

وتیان: ئەی تۆ رقت لێی نیە..؟

وتی: من رقم لەکارەکەیەتی، گەر وازی لێ هێنا ئەوا برامە}..!

جا گەر ئەوە یەکێك بوو لە رووەکانی پەرستش لای (ئەبودەرداء)، ئەوا رووەکەی دیکەی زانست و زانیارییە..

جا (ئەبودەرداء) زۆر رێزی زانستی دەگرت و بەپیرۆزی دەزانی.. پیرۆز رایدەگرت وەك دانا و، پیرۆز رایدەگرت وەك خواپەرست و، دەیوت:

{هیچ کام لە ئێوە نابێتە تەقوادار تا نەبوویێتە زانا..

بەهۆی زانستیش جوان نابێت، تا کاری پێ نەکات}..

بەڵێ..

زانین لای ئەو تێگەیشتنە، رەوشت و زانیاری و، پەیڕەو.. فیکر و ژیانە..

هەر بۆیە پیرۆز راگرتنەکەشی پیرۆزێتی پیاوێکی دانایە، دەبینین بانگەشە دەکات کە مامۆستا وەك فێرخواز وایە و هەردووکیان وەك یەکن لە چاکە و، پلە و پایە و، پاداشتدا..

وای بۆ دەچوو کە مەزنی ژیان بەر لە هەموو شتێك پەیوەستە بەزانستی چاکەوە..

ئەوەتانێ دەڵێت:

{چییە دەتانبینم دەڕۆن و، نەزانەکانتان فێرناکەن؟؟
بزانن مامۆستای چاك و فێرخواز لە پاداشتدا وەك یەکن و.. لەدوای ئەوان خێر و چاکە لەکەسانی دیکەدانیە}..
هەروەها دەیووت:
{خەڵکی سێ جۆرە..
زانا..
فێرخواز..
سێیەمیش نەزانێکە هیچ خێری تێدا نیە}.
هەروەك پێشتر بینیمان، زانین لەدانایی (ئەبودەرداء)دا دانابڕێت لە کردەوە..
دەڵێت:
{ئەوەی لەهەموو شتێك پتر مەترسیم لێی هەیە لەسەر خۆم ئەوەیە کە لە رۆژی قیامەتدا لە پێشەوەی دروستکراوەکاندا پێم بوترێت: ئەی عوەیمیر، هیچ فێربوو بوویت؟؟
منیش بڵێم: بەڵێ..
جا پێم بوترێت: جا بەوەی کە فێری بوو بوویت چ کارێکت ئەنجام دا..؟؟}.
(ئەبودەرداء) زۆر رێزی لەزاناپانی کردار پەسەند دەنا و بەرز و بەرێز سەیری دەکردن، و لە پەروەردگاری دەپاڕایەوە و دەیووت:
{خودایا من پەنات پێ دەگرم لەوەی کە لە دڵی زانایان نەفرەتم لێ بکات..
پێیان وت:
{چۆن دڵیان نەفرەتت لێ دەکات؟
ئەمجا دەیوت:
{بەوەی کە رقیان لێم بێت..!}
خۆ بینیتان..؟؟
ئەو لە رق لێ بوونی زانادا نەفرەتێك بەدی دەکات کە بەرگەی ناگرێت.. لەبەر ئەوە ملکەچ دەکات بۆ پەروەردگاری تا پەنای بدات لێی..
(ئەبودەرداء)ی دانا ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد کە برایەکی چاك بن و، پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤدا لەسەر بنەمای سروشتی مرۆیی دابمەزرێت و، دەڵێت:
{سەرزەنشت کردنی براکەت چاکترە بۆت لە لەدەستدانی، کێ وەك برای تەواوت وایە بۆت؟
((بەبراکەت ببەخشە و نەرم و نیان بە بەرانبەری..
گوێڕایەڵی ئێرەیکار مەبە بەرانبەری و، وەك ئەوت لێ دێت..
سبەینێ مردن دێتە لات و، دابڕانی بەسە بۆت..

جا چۆن دەگریت لە پاش مردنی، لە کاتێکدا تا لەژیاندا بوو مافی خۆیت پێ نەدا}..؟؟

چاودێریکردنی خودا بۆ بەندەکانی ڕێسایەکی چەسپاوە (ئەبودەرداء) مافەکانی برایەتی لەسەر بونیات دەنێت..

ئەوەتانێ دەڵێت:

{زۆر نیگەران دەبم کە ستەم لەیەکێك بکەم.. بەڵام زۆرتر و زیاتر نیگەران و پەست دەبم، کە ستەم لەیەکێك بکەم لە دژی من پشت بەخودای گەورە و باڵا دەست ببەستێت}..!!

ئێی لە مەزنی دەروون و، پرشنگداری گیانت ئەی (ئەبودەرداء)..!!

خەڵکی ئاگادار دەکرد لەخەڵەتاندنی خەیاڵ، کاتێك وا گومان دەبەن کە بێدەستەڵاتە دابڕاوەکان نزیکترن لەوەی کە بکەونە ژێر دەست و، چەپۆکیانەوە..!!

باس دەکات کە ئەوانە لە بێدەستەڵاتیەکەیاندا هێزێکی بەتینیان هەیە کاتێك پەنا دەبەنە بەر پەروەردگاری باڵا دەستیان بەهۆی بێ دەستەڵاتیانەوە و، کێشەکەیان دەخەنە بەر دەستی، کە بەسوك سەیریان دەکرێت لەلایەن خەڵکیەوە..!!

ئا ئەوە بە –ئەبودەرداء–ی دا..!!

ئا ئەوەیە –ئەبودەرداء–ی دونیا نەویستی، خوا پەرستی، ئارامگر..

ئا ئەوەیە ئەو –ئەبودەرداء–ەی گەر خەڵکی سەریان لەتەقواکەی سوڕمایە و، داوایان لێ بکردایە بۆیان بپاڕێتەوە و، بەخاکەڕاییەکی پڕ متمانەوە وەڵامی دەدانەوە:

{چاك مەلە نازانم و.. لەنغرۆبوون دەترسێم}..!!

هەموو ئەمانە و، هێشتا چاك مەلە ئاشنا نیت ئەی (ئەبودەرداء)..؟؟

بەڵام چی سەیر بێت، کە تۆ پەروەردەی پێغەمبەر ﷺ و..

قوتابی قورئان و.. کوڕی سەرەتای هاتنی ئیسلام و.. هاوەڵی ئەبوبەکر و عومەر و، هەموو پیاوانی دیکە بیت.. سەرسامی لە چی..!؟.

۲٦

زه‌یدی کوڕی خه‌تتاب

هه‌ڵوکه‌ی ڕۆژی یه‌مامه

ڕۆژێکیان پێغەمبەرﷺ دانیشتبوو، کۆمەڵێك لە موسڵمانان لە دەوری بوون و قسەوباس بەردەوام بو، پێغەمبەر چەند ساتێك سەری داگرت و بێدەنگ بوو، پاشان ڕووی دەمی کردە ئەوانەی دەوری و فەرمووی:

{پیاوێکتان لەنێودا هەیە کە دانێکی لە دۆزەخدا لەکێوی ئوحود قورسترە}.

ئەمجا ترس، بگرە تۆقین لە تووشبوونی ئاشووب لە ئایندە دەهات بە خەیاڵی هەموو ئەوانەی ئامادەی ئەو دانیشتنە بوون لەگەڵ پێغەمبەری خوداﷺ.. هەر یەکەیان سڵی دەکرد و دەترسا لەوەی کە خۆی تووشی هەڵگەڕانەوەی خراپ و ئاخرشەڕی بێت..

بەڵام هەموو ئەوانەی کە ئەو ڕۆژە قسەکەیان ئاراستە کرا کۆتاییان بەچاکە هات و، پەیمانی خۆیان بردەسەر و لەپێناوی خوادا شەهید بوون و، تەنها (ئەبو هورەیرە) و (ڕەجاڵی کوڕی عونفوە) بە زیندوویی مانەوە لێیان.

جا بەردەوام (ئەبوهورەیرە) لەشی دەلەرزی لەترسی ئەوەی نەبادا ئەو پێشبینیەی پێغەمبەر لەودا بەدی بێت. هەر بۆیە چاوی نەدەچووە خەو و، مێشکی هێور نەدەبوویەوە، تا قەدەر پەردەی لەسەر ئەو بەدبەختە هەڵماڵی و.. (ڕەجاڵ) لە ئیسلام هەڵگەڕایەوە و پەیوەندی کرد بە (موسەیلەمەی درۆزن)ەوەو، گەواهیدا کە پێغەمبەرە.

ئا لێرەدا ئەو پێشبینیەی پێغەمبەرﷺ بە خراپ هەڵگەڕانەوەو چارەنووس خراپی هاتە دی و ڕوون بوویەوە..

ئەم (ڕەجاڵی کوڕی عونفوە)یش، ڕۆژێکیان چوو بۆ لای پێغەمبەر و بەڵێنی پێدا و موسڵمان بوو و، کاتێك ئیسلامی لێوەرگرت گەڕایەوە بۆ لای هۆزەکەی.. ئیدی نەگەڕایەوە بۆ شاری مەدینە تا پاش وەفاتی پێغەمبەر و دیاریکردنی (ئەبوبەکری صدیق) بە خەلیفەی موسڵمانان..

هەواڵی خەڵکی یەمامە و کۆبوونەوەیان لە دەورەی (موسەیلەمە) گەیاندیە ئەبوبەکر و، پێشنیاری کرد بۆ (ئەبوبەکر) کە بیکاتە نێردراوی بۆ لایان هەتا لەسەر ئیسلام دامەزراویان بکات، خەلیفەش مۆڵەتی پێدا..

ئەمجا (ڕەجاڵ) بەرەو لای خەڵکی یەمامە کەوتە ڕێ.. کاتێك چاوی بە ژمارەی بێشوماریان کەوت وای گومان برد کە ئەوان سەردەکەون و، دەروونی سەرکەشی دواندی کە هەر ئەمڕۆ لەنێو دەوڵەتەکەی (موسەیلەمە)دا جێگایەك بۆ خۆی بکاتەوە کە وای گومان دەبرد بەڕێوەیەو دێت، وازی لە ئیسلام هێنا و، چوویە ڕیزی (موسویلەمە)وە کە وادەو بەڵێنی پێدابوو.

جا مەترسی (ڕەجاڵ) لەسەر ئیسلام سەختتر بوو لە مەترسی خودی موسویلەمە.

لەبەر ئەوەی، ئیسلام بوونی پێشتری قۆستەوەو، ئەو ڕۆژانەی سەردەمی پێغەمبەر کە لە مەدینەدا ژیابوو و، لەبەرکردنی ئایەتی زۆری لە قورئان و، نوێنەرایەتی کردنی ئەبوبەکری خەلیفەی موسڵمانان.. هەموو ئەوانەی خراپ قۆستەوە بۆ پاڵپشتیکردنی دەستەڵاتی (موسەیلەمە) دووپاتکردنەوەی پێغەمبەرایەتیە درۆینەکەی..

بەنێو خەڵکیدا دەگەڕا و پێی دەوتن: کە گوێی لە پێغەمبەری خواﷺ بوو دەیفەرموو: {ئەو (موسەیلەمەی کوڕی حەبیب)ی بەشدار کرد لە کارەکەیدا}.. جا کە پێغەمبەریشﷺ مردبێت، ئەوا ڕەواترین کەس بە هەڵگرتنی بەیداخی پێغەمبەرێتی و نیگا لەدوای ئەو، موسەیلەمەیە..!!

بەراستیش ژمارەی ئەوانەی لە دەوری موسەیلەمە کۆبوونەوە زۆر زیادیان کرد بەهۆی ئەو درۆیانەی (ڕەجال)ەوەو... بەهۆی قۆستنەوەی ئەو تەڵەکەبازیەی پەیوەندی پێشتری بە ئیسلام و پێغەمبەرەوە.

هەواڵەکانی (ڕەجال)یش دەگەیشتە مەدینە و، موسڵمانان خەم و پەژارەیان تینی سەندبوو بەرانبەر ئەو هەڵگەڕاوە مەترسیدارە کە سەر لە خەڵکی دەشێوێنێت، سەر لێشێوانێکی زۆر خراپ و، بەو سەرلێشێواندنەش بازنەی ئەو جەنگە فراوانتر دەکات کە موسڵمانان ناچارن ئەنجامی بدەن..

ئەو کەسەیشی لەنێو هاوەڵانی زیاتر ڕقی لێی بوو و، دەسوتا بۆ گەیشتن بە (ڕەجال)، هاوەڵێکی پایەبەرز بوو کە سەرگوزشتەی ژیانی لە پەرتوکەکانی سەربردە و مێژوودا لەژێر ئەم ناوە شیرینەدا دەدرەوشێتەوە" (زەیدی کوڕی خطاب)..!

زەیدی کوڕی خطاب..؟؟

پێویستە کە ناسیبێتتانەوە..

برای عومەری کوڕی خطاب..

بەڵێ.. برای گەورەو.. لەپێشتریەتی..

بەر لە عومەر هاتبووە ژیان و، لەو بەتەمەنتر بوو..

بەر لەویش موسڵمان بووبوو.. هەروەك چۆن بەر لەویش لەپێناوی خوادا شەهید بوو..

* * *

بەراستیش (زەید) قارەمانێکی سەرسوڕهێنەر بوو لە پاڵەوانیدا و.. کاری بێدەنگ و ڕۆچوو لە بێدەنگیدا کرۆکی پاڵەوانێتیەکەی بوو.

ئیمان بوونیشی بەخوا و پێغەمبەرەکەی و بە ئاینەکەی ئیمانێکی پتەو بوو و، لەهیچ غەزایەك و مەیدانێکدا لە پێغەمبەری خواﷺ دوانەکەوتبوو..

لە هەموو غەزایەکدا ئەو بەدوای سەرکەوتندا وێڵ نەبوو، هێندەی کە بەشوێن شەهیدبووندا دەگەڕا..!!

لەرۆژی ئوحودیشدا، کاتێك شەڕ گەرم بوو لەنێوان موسڵمانان و بێباوەڕاندا، زەیدی کوڕی خطاب شمشێری دەوەشاند و، لێی دەدان.

عومەری کوڕی خطابی برای چاوی پێی کەوت کە قەڵغانەکەی لێی کەوتووە و، زۆر لە پێشە کە دوژمنان زیانی پێبگەیەنن، بۆیە عومەر هاواری لێکرد:

{ئەی زەید، قەڵغانەکەی من ببە و پێوەی بجەنگە}..

زەید وەڵامی دایەوە:

{ئەی عومەر! ئەوەی تۆ لە شەهیدبوون دەتەوێت، منیش دەمەوێت}.!!!

بەبێ قەڵغان، بەشێوەیەکی زۆر قارەمانانە و، ئازایەتیەکی بێوێنە جەنگا.

* * *

وتمان" کە زەید ﷺ ئاگری تێبەربووبوو بۆ گەیشتن بە رەجال و ئاواتەخواز بوو کە لەناوبردنی ژیانی پیسی ئەو لە بەختی تەنها ئەودا بێت.. چونکە (رەجال) بە بۆچوونی (زەید) تەنها هەڵگەڕاوەیەك نەبوو بەس.. بەڵکو درۆزنێکی... دووڕووی، حەرام باز بوو.

بەهۆی بڕوابێبوونەوە هەڵنەگەڕاوەتەوە.. بەڵکو بەهۆی مەرامبازی هیچ و پوچ و، دووڕوویی قێزەون و خوار و خێچەوە هەڵگەڕاوەتەوەو (زەید)یش لە رق لێ بوونی دووڕوویی و درۆدا، تەواو وەك عومەری برای وابوو..!

هەردووکیان، رقی ناجوولێت و، بوغز و کینەی نایەتە جۆش، وەك ئەوەی کە دووڕوویی ئاوێتەی هەلپەرستی و، مەبەستی خراپی دەیورووژاند.

لە پێناوی ئەو مەبەستە نزمانەدا (رەجال) رۆڵی خراپی خۆی بینی و، ژمارەی ئەوانەی دەوری (موسەیلەمە)ی خراپ خەڵەتاند و زیادی کردن و، بەم کارەی ژمارەیەکی زۆریانی بەرەو مەرگ نارد کە لە جەنگی هەڵگەڕاوەکاندا لەناو چوون.. یەکەم جار سەری لێشێواند و دواجاریش تووشی تیاچوونی کرد.. بەڵام لەپێناوی چیدا..؟ لەپێناوی چارچنۆکیەکی گڵاودا کە دەروونی رازاندبوویەوەو، ئارەزووەکانی جوانیان کردبوو بۆی و، (زەید) خۆی ئامادە کردبوو کە بەدەست بەسەرداگرتنی ئەو ئاشووبە کۆتایی بە ژیانی بڕوادارانەی خۆی بهێنێت، بە کوشتنی (موسەیلەمە) نا، بەڵکو بە لەناوبردنی کەسێك کە لەو مەترسیدارترەو، تاوانبارترە کە ئەویش (رەجالی کوڕی عونقود)ە..

* * *

رۆژی یەمامە بە سەختی و نادیاری دەستی پێکرد.

خالیدی کوڕی وەلید سوپای ئیسلامی کۆکردەوەو بەسەر شوێنەکانیاندا دابەشکرد، بەڵام ئاڵای سوپاکەی دایە دەست کێ..؟؟

دایە دەست (زەیدی کوڕی خطاب)..

ئەوە بوو هۆزی (بەنوحەنیفە)ی شوێنکەوتەی (موسەیلەمە) شەڕێکی سەختی خوێناویان کرد..

شەڕەکە لە سەرەتادا بەسەر موسڵمانەکاندا شکایەوە، زۆر کەسیان لێ شەهید بوو.

(زەید) بینی هەستی تۆقاندن بەدڵی هەندێك لە موسڵماناندا دەهات، ئا لەوێدا چوویە سەر تەپۆڵکەیەك و هاواری لە براکانی کرد:

{ئەی خەڵکینە.. دان بگرن بەخۆتاندا و، لە دوژمنەکەتان بدەن و، بەرەو پێشەوە هەڵمەت ببەن.. سوێند بەخوا قسە ناکەم هەتا خوای گەورە هەرەسیان پێدێنێ، یان پێی دەگەم و ئەوجا بە بەڵگەکەمەوە لەگەڵی دەدوێم}..!!

ئەمجا لەسەر تەپۆڵکەکە دابەزی، ددانەکانی جیڕ کردبووەوە، بەجۆرێ کە زمانی بۆ چرپەیش نەدەجوڵاند.

چارەنووسی جەنگەکە کە لای ئەو لەسەر چارەنووسی (رەجال) چڕ بووبوویەوە، هەر بۆیە بەنێو جەنگاوەرە زۆرەکاندا وەك تیر دەڕۆیشت و، بەدوای (رەجال)دا وێڵ بوو تا دۆزییەوە..

ئا لەوێدا لەلای راست و چەپیەوە بۆی دەرچووو! کاتێك کە لێشاوی جەنگەکە نێچیرەکەی قوت دەدا و ونی دەکرد، زەید بەدوایدی دەچوو تا جارێکی دیکە شەپۆلەکان سەرلەنوێ دەیهێنایەوە سەرەوە، ئەمجا زەید لێێ نزیك دەبوویەوە و شمشێرەکەی بۆ دادەهێنایەوە، بەڵام شەپۆلی مرۆ زۆرەکە جارێکی دیکە (رەجال)ی قوت دەدایەوە، زەیدیش بە شوێنیدا دەڕۆیشت تا لە دەستی دەرنەچێت..

تا لە دواییدا ملی دەگرێت و بە شمشێرەکەی سەری پڕ لەخۆبایی‌بوون و، درۆ و، پیسی لێکردەوە..

بە لەناوچوونی درۆزنەکەش هەموو خەڵکەکەیشی لەناودەچوون، جا بیم و ترس کەوتە دەروونی (موسەیلەمە) و گەرم و گوڕی (موحکەمی کوڕی توفەیل) و پاشان سوپاکەی (موسەیلەمە)یشی نەهێشت، کە کوژرانی (رەجال) وەك ئاگری رۆژێکی رەشەبا کەوتە ناویەوە.

چونکە (موسەیلەمە) بەڵێنی سەرکەوتنی تەواوی پێدابوون و، بەوەی کە ئەو (رەجالی کوڕی عونفوە) و (موحکەمی کوڕی توفەیل) پاش سەرکەوتنەکەیان هەڵدەستن بە بڵاوکردنەوەی ئاینەکەیان و دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان..!!

ئا ئەوەتا ئێستاش (رەجال) بە مردوویی کەوتووە.. کەوابوو پێشبینییەکەی موسەیلەمە هەمووی درۆ دەرچوو و، سبەینێش (موحکەم) لەناو دەچێت و، دوای سبەینێش (موسەیلەمە)..!!

بەم جۆرە ئەو لێدانەی (زەید) ئەم هەموو داڕمانەی لە ریزەکانی سوپای (موسەیلەمە)دا بەرپاکرد..

موسڵمانەکانیش، هەر کە هەواڵەکە لەنێویاندا بڵاوبوویەوە عەزمیان وەك شاخ بەرز بوویەوەو، برینداره‌کانیان سەرلەنوێ هەستانەوەو، شمشێرەکانیان هەلگرتەوە، بەبێ گوێدانە برینەکەیان..

تەنانەت ئەوانەشی کە لەسەر لێواری مەرگ بوون و، تەنها مانەوەیەکی کەم و هانکەهانکێکی کەمی ماڵئاواییکردن پەیوەستی دەکردن بە ژیانەوە، هەواڵەکە وەك خەونێکی جوان بەرگوێیان کەوت، خوازیاری ئەوەبوون کە گوێوتینیان تێدا بوایە و بەهۆیەوە بگەڕابانایەتەوە ژیان و تا بجەنگانایەوە و، ئەو کۆتاییە جوانەی سەرکەوتنەکەیان بەدی بکردایە..

بەڵام چۆن ئەوەیان بۆدەبێت، لەکاتێکدا دەروازەکانی بەهەشت واڵاکراون بۆ پێشوازییان و ئەوان ئێستا گوێبیستی ناوەکانی خۆیان دەبن، کە بانگ دەکرێت بۆ ئامادەبوون..؟؟!

* * *

(زەیدی کوڕی خەتتاب) هەردوو دەستی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و سوپاسی بەخششەکەی پەروەردگاری کرد.. پاشان هاتەوە بۆ شمشێرەکەی و، بۆ لای بێدەنگیەکەی، چونکە ئەو چەند چرکەساتێ بەر لە ئێستا سوێندی خوارد بە خوا کە هیچ قسە نەکات تا سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت یا شەهید دەبێت..

جەنگەکەش ئەوا لە بەرژەوەندی موسڵمانان دەڕوات و.. سەرکەوتنی تەواویان نزیك دەبێتەوە و زۆر خێرا دەێت..

ئا لێرەدا (زەید) شنەبای سەرکەوتنی بەدیکرد ئەهات، هیچ کۆتاییەکیشی بۆ ژیانی جوانتر لەم کۆتاییە بەدی نەدەکرد، هەر بۆیە ئاواتەخواز بوو کە خوای گەورە لە ڕۆژی یەمامەدا شەهیدی پێ ببەخشێت..

جا شنەبای بەهەشت هەڵیکرد و دەروونی پڕلە ڕۆشنایی و، چاوەکانی پڕ لە ئەشك و، چەسووریەکەشی سوورتر کرد..

هەربۆیە وەك کەسێك بەدوای چارەنووسی مەزنیدا بگەڕێت دەستی کرد بە شمشێر وەشاندن.. تا پاڵەوانەکە شەهید بوو.

بەڵکو بڵێین: بە شەهیدی هەڵفڕی.

بە مەزنی بەرز بوویەوە، سەرفراز و، بەختەوەر..

سوپای ئیسلامیش سەرکەوتوانە گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە..

لەکاتێکدا کە (عومەر) لەگەڵ خەلیفە (ئەبوبەکرد)دا پێشوازی لەو گەڕاوە سەرکەوتوانە دەکرد، (عومەر) بە پەرۆشەوە چاوی بۆ براکەڕاوەکەی دەگێڕا..

(زەید)یش پیاوێکی زۆر باڵابەرز بوو کە لەبەر بڵندی دیار بوو، ناسینەوەی بەچاو لە دوورەوە کارێکی ئاسان بوو..

بەڵام بەرلەوەی (عومەر) چاوەکانی ماندوو بکات، موسڵمانە گەڕاوەکان لێی نزیك بوونەوە و سەرەخۆشی (زەید)ی لێبکەن.

عومەر وتی:

{خودا رەحم بە زەید بکات..

بۆ هەردوو شتە چاکەکە پێشم کەوت..

بەر لە من موسڵمان بوو.. و

پێش منیش شەهید بوو..}

*   *   *

لەو سەرکەوتنە زۆرانەی کە ئیسلام بەدەستی دەهێنا و بەسەریدا دەڕژا، زەید بۆ یەك چرکە سات لەیادی عومەری فاروق)ی برای لانەدەچوو..

هەمیشە دەیوت:

{هەر بایەك لە رۆژهەڵاتەوە هەڵیکردبێت، بۆنی (زەید)م تێیدا کردووە}..

بەڵێ..

بای رۆژهەڵات بۆنی زەید و، رەنگی ئاکارە بەرزەکانی هەڵدەگرێت..

بەڵام، گەر ئەمیری باوەڕداران مۆڵەت بدات، ئەمەم بۆ دەستەواژە جوانەکەی زیاد دەکرد، کە چەند وشەیەکن لەگەڵیاندا گۆشەکانی چوارچێوەکە تەواو دەبێت..

ئەویش ئەمەیە:

هەر شنەبایەکی سەرکەوتنی ئیسلام لە رۆژی یەمامەوە هەڵیکردبێت، موسڵمانان بۆنی زەید و پاڵەوانێتی زەید و... ناڕەحەتی زەید و... مەزنی زەیدیان تێدا هەست پێکردبوو..!

*   *   *

لەژێر سایەی بەیداخی پێغەمبەرداﷺ پیرۆزبێت لە نەوەکانی خطاب..

پیرۆزبێت لێیان ئەو رۆژەی موسڵمان بوون و.. پیرۆز بێت لێیان رۆژانی جیهادکردنیان و شەهیدبوونیان .. پیرۆزبێت لێیان ئەو رۆژەی زیندوو دەکرێنەوە..!

# ٢٧

## ئەڵقەی گۆڕی عەبدوڵڵا

## هەڵۆکەی ڕۆژی ئوحود

﴿مِنْ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلاً: لەناو بڕواداراندا پیاوی وا هەن، ئەو پەیمانەی بە خوایان دا، پێکیان هێنا، جا لەوانە هەیە گیانی بەخشیوە و، هێندێکیشیان چاوەڕوانن و تۆزقاڵێکیش سۆزی خۆیان نەگۆڕیوە.﴾الأحزاب/٢٣.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوەو، پێشوازی لە ڕوخساری هاوەڵانی کرد و، لەکاتێکدا کە ئامازەی بۆ (تەڵحە) دەکرد فەرمووی:

{ئەو کەسەی پێی خۆشە کە سەیری پیاوێك بکات بەسەر زەویدا دەڕوات و، گەیشتووە بە بەڵێنەکەی خۆی، ئەوا با سەیری (تەڵحە) بکات}..

هیچ مژدەیەك نەبوو هاوەڵانی پێغەمبەر ئاوەها ئاواتەخوازی بن و، دڵیان بە پەرۆش بێت بۆی زیاد لەوەی کە پێغەمبەر بە سنگی (تەڵحەی کوڕی عبیداللە)یدا هەڵواسی..

کەوابوو دڵنیابوو لە سەرئەنجامی چارەنووسی ژیانی.. کە دەژی و، دەمرێت و، یەکێکە لەو کەسانەی کە ڕاستیان کرد لەگەڵ ئەوەی کە پەیمانیان پێدابوو و تووشی ئاشوبیش نابێت و، ماندوویەتی زۆری بۆ نابێت..

چونکە پێغەمبەر مژدەی بەهەشتی پێدا، جا دەبێت ژیانی ئەم مژدەپێدراوە بەڕێزە چی بێت..؟!

* * *

ئەو لە بازرگانیەکدا بوو لە خاکی (بوصرا) کاتێك کە بە ڕاهیبێك لە چاکترین ڕاهیبەکانیان گەیشت و، هەواڵی بەم دا کە ئەو پێغەمبەرەی لە وڵاتی حەرەم دەردەکەوێت و، پێغەمبەرانی چاکەکار پێشبینیان کردوە، ئەوا کاتی هاتووەو ڕۆژەکانی دەرکەوتوون.

(تەڵحە)ی ئاگادار کرد کە کەژاوەکەی لە دەست دەرنەچێت، چونکە کەژاوەی ڕێنوێنی و بەزەیی و دڵسۆزییە..

کاتێك (تەڵحە) پاش بەسەربردنی چەند مانگێك لە (بوصرا) و لە گەشت، گەڕایەوە بۆ شارەکەی کە مەککە بوو، هەستی بە ژاوەژاوێك کرد لەنێو خەڵکەکەیدا و.. گوێی لێبوو کە بە هەرکەسیان دەگەیشت یان بە هەر کۆمەڵێکیان دەگەیشت، باسی (موحەممەدی ئەمین).. و نیگایان دەکرد کە بۆی دێت و.. لەبارەی ئەو پەیامەوە دەدوان کە هێناویەتی بە تایبەت بۆ عەرەب و، بۆ هەمو خەڵکیش.

یەکەم کەسیش کە تەڵحە پرسیاری دەربارە کرد ئەبوبەکر بوو، زانی کە ماوەیەکی زۆر نیە لەگەڵ کاروان و بازرگانیەکەیدا گەڕاوەتەوەو، شان بەشانی (موحەممەد) وەك بڕوادارێکی خۆڕاگر راوەستاوە..

ئەمجا تەڵحە بە خۆی وت: موحەممەد و، ئەبوبەکر..؟؟

سوێند بەخوا، ئەو دوانە هەرگیز لەسەر گومڕایی کۆنابنەوە..[١]

موحەممەد گەیشتووەتە تەمەنی چلساڵی و، لەمیانی ئەو تەمەنەدا تەنها درۆیەکمان لێ نەبینیوە... جا ئایا ئەمڕۆ بە ناوی خوای گەورەوە درۆ دەکات و دەڵێت ئەو رەوانەی کردووم و نیگای ناردووە بۆم..؟؟

ئەمە ئەو شتەیە کە باوەڕپێکردنی زۆر ئەستەمە..

جا تەڵحە بە پەلە هەنگاوەکانی رووەو ماڵی ئەبوبەکر هەڵگرت..

قسەوباسی نێوانیان درێژەی نەکێشا، چونکە پەرۆشی بۆ دیداری پێغەمبەرﷺ و پەیمان پێدانی لە لێدانی دڵی خێراتر بوو..

جا ئەبوبەکر لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ لای پێغەمبەرﷺ و، موسڵمان بوو و جێگای خۆی لەنێو ئەم کاروانە پیرۆزەدا گرت..

بەم جۆرە تەڵحە لەو کەسانە بوو کە زۆر زوو موسڵمان بوو..

* * *

سەرەڕای پلەوپایەی لەنێو هۆزەکەیدا و دەوڵەمەندی زۆری و، بازرگانیە سەرکەوتووەکەی، کەچی پشکی خۆی لە ئەشکەنجەدا چەشت و کاری ئەو و ئەبوبەکر بە (نەوفەلی کوڕی خوەیلید) سپێردرابوو کە بە (شێری قورەیش) ناودەبرا، بەڵام ئەشکەنجەدانیان زۆری نەخایاند و، زۆر زوو قورەیش هەستی بە نەنگی ئەو کارەیان کرد و، لە سەرئەنجامی ئەوکارەیان ترسان..

کاتێکیش فەرمان بە موسڵمانەکان کرا کە کۆچ بکەن، تەڵحەش کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە و، دواتر لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ بەشداری هەموو مەیدان و غەزاکانی کرد–جگە لە غەزای بەدر–، چونکە پێغەمبەرﷺ لەگەڵ (سەعیدی کوڕی زەید)دا بۆ کارێك ناردبوونیە دەرەوەی مەدینە..

---

[١] بگەڕێوە بۆ کتێبی (وجاء أبوبکر).. تێبینی/ ئەو کتێبەش لە نووسینی نووسەرە و بەزمانی عەرەبیە و ئێستا لەژێر ناوی (خلفاء الرسول)دا هەیە.

کاتێك کارەکەیان ئەنجامدا و گەڕانەوە بۆ مەدینە، پێغەمبەر و هاوەڵانی لە غەزای بەدر دەگەڕانەوە، زۆر غەمبار بوون بەوەی پاداشتی بەشداریکردنیان لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ بۆ جیهادکردن لە یەکەم غەزادا لەدەست دەرچوو..

هەرچەندە کە پێغەمبەر دڵنیاییەکی تەواوی پێبەخشین، کاتێك کە هەواڵی پێدان کە هەمان پاداشت و بەخششی جەنگاوەرانیان هەیە بە تەواوی، نەك هەر ئەوە بەڵکو لە دەستکەوتەکانی جەنگەکەش وەك بەشداریوانی بەشی بۆ دانان..

* * *

جەنگی (ئوحود)یش دێت تا هەموو ستەمکاری قورەیش و گشت تۆڵنایەکیان بەدی بکات کە هاتووە تۆڵەی ڕۆژی بەدر بکاتەوەو لە چارەنووسییان دڵنیا بێت و موسڵمانان تووشی دوا تێکشکانێك بکات کە قورەیش بە کارێکی سانا و قەدەرێکی‌دانراوی دادەنا..!!

جەنگێکی خوێناوی بەرپابوو و زۆر زوو زەوی بە لاشەی خراپەکاران داپۆشرا... و کارەکە بەسەر بێ باوەڕاندا کەوت..

پاشان کاتێك موسڵمانەکان چاویان پێیان کەوت پاشەکشە دەکەن، چەکەکانیان دانا و، تیرهاوێژان لەجێگای خۆیان هاتنە خوارەوە تا پشکی خۆیان لە دەستکەوتەکان ببەن..

تا لە ناکاو سوپای قورەیش لەکاتی بێئاگایی ئەماندا لە پشتەوە گەڕایەوە نێوەندی شەڕەکە و جڵەوی جەنگەکەی کەوتە دەست..

ئەمجا جەنگەکە بە گەرمی و توووند وتیژی و خوێناوی بەردەوام بوو و، ئەو کارە کوتو پڕەش کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر پەرتەوازەکردنی ڕیزی موسڵمانەکان..

تەڵحە سەرنجی ئەو لایەی جەنگەکەی دا کە پێغەمبەری خوداﷺ تێیدا وەستابوو، دەبینیی کە بۆتە ئامانجی هێزی بتپەرستی و بێباوەڕان، هەر بۆیە خێرا بەرەو لای پێغەمبەر ڕۆشت.. ڕێگەی دوورودرێژی بڕی ئەگەریش بە پێوانە کورت بوو..!

ڕێگایەك کە لەسەر هەموو بستێکی تووشی دەیەها شمشێری هار و، دەیان ڕمی سەرشێت دەبوویەوە!!

لە دوورەوە پێغەمبەری خودایﷺ بەدی کرد خوێن لە هەردوو ڕوومەتی دێت و، ئارامی لەسەر گرتووە، ئەمجا ئارامی لێبڕا و، بە باز و دوو بازێك ئەو ڕێگا نارەحەتەی بڕی لەبەردەم پێغەمبەریشدا ئەوەی لێی دەترسا بەدی کرد.. شمشێری بێباوەڕەکان بەرەو ڕووی دێن و، دەوریان داوەو دەیانەوێت زیانی پێ بگەیەنن..

ئەمجا تەڵحە وەك پایەیەی مەحکەم ڕاوەستا و، شمشێرە بڕەرەکەی بەراست و چەپدا دەوەشاند..

کە پێغەمبەری ئازیزی بینی خوێنی بەربووەو، ئازارەکانیشی ئاخ و ئۆفی پێکردبوو، هاوکاری کرد و دووری خستەوە لەو چاڵەی کە پێی تێکەوتبوو.

ئەو بە دەستی چەپ و سنگی یارمەتی پێغەمبەریﷺ دەدا، تا بیگەیەنێتە جێگایەکی ئارام و بە دەستی راستیشی –خودا دەستی راستی پیرۆز بکات– شمشێری دەوەشاند و لەگەڵ ئەو بێباوەڕانەدا دەجەنگا کە دەوری پێغەمبەریان گرتبوو و، بازنەی جەنگەکەیان وەك کوللە پڕ کردبوو..!!

با لێگەڕێین (ئەبوبەکری صدیق) ئەو دیمەنەمان بۆ باس بکات..

عائشە دەڵێت:

{ئەبوبەکر کە باسی رۆژی ئوحود دەکرا، دەیوت: ئەوە هەمووی رۆژی تەڵحە بوو.. من یەکەم کەس بووم گەیشتمە لای پێغەمبەرﷺ، جا پێغەمبەر بە من و ئەبوعوبەیدەی فەرموو: بگەنە براکەتان...، سەیرمان کرد، بینیمان حەفتا برین زیاتر شوێنی لێدان و جۆرەی پێوە بوو.. پەنجەکانی قرتابوو.. ئێمە فریای کەوتین و بارەکەیمان راست کردەوە}.

* * *

لە هەموو بەسەرهات و غەزاکاندا، تەڵحە لە پێشەوەی ریزی ئەو کەسانەدا بوو، کەمەبەستیان تەنها خودای گەورەو، خۆبەختکردن بۆ ئاڵای پێغەمبەر بوو.

جا تەڵحە لە نێوەندی کۆمەڵی موسڵماناندا دەژیا و، لەگەڵ خواپەرستاندا پەرستشی خوای دەکرد و، لەگەڵ موجاهیداندا لە پێناوی خوادا جیهادی دەکرد و، بە هەردوو مەچەکیش لەگەڵ مەچەکی برا موسڵمانەکانیدا بنەماکانی ئەو ئاینە نوێیەیان دەچەسپاند کە هاتووە خەڵکی– هەموو خەڵك– لە تاریکیەوە بەرەو رووناکی ببات..

مافی پەروەردگاریشی بەجێ هێنا، ئەوا دەڕوات بەسەر زەویدا کار دەکات و، لەسایەی فەزڵی خوادا دەخوازێت بازرگانیەکەی قازانجمەند و، کاروبارەکانی سەرکەوتوو بێت.

چونکە بەراستی تەڵحەﷺ لە هەموو موسڵمانان دەوڵەمەندترو، لە هەمووشیان زیاتر سامانەکەی لە گەشەدا بوو..

هەموو سامانەکەیشی لە خزمەتی ئەو ئاینەدا بوو کە لەگەڵ پێغەمبەری خوداﷺ ئاڵاکەی هەڵگرتووە.. بەبێ ئەندازە لێی دەبەخشی..

خوای گەورەش بەبێ ئەندازە گەشەداری دەکرد بۆی!

پێغەمبەری خوداشﷺ نازناوی (تەڵحەی خەیر) و (تەڵحەی بەخشندە) و (تەڵحەی لێشاو)ی لێنابوو بەهۆی بەخشندەییە بە تەوژمەکەیەوە.

چەند زۆری لە سامانەکەی بەجارێ ببەخشیایە، خوای گەورە زیاتر بۆ دەگێڕایەوە..

(سوعدای کچی عەوف)ی خێزانی بۆمان باس دەکات و دەڵێت:

{ڕۆژێکیان چوومە ژوورەوە بۆ لای تەڵحە، بینیم غەمبارە، لێم پرسی: ئەوە چیتە..؟؟ وتی: ئەو سامانەی کە لەلامە.. وا زۆر بووە کە غەمباری کردوم و ناڕەحەتی کردووم.. پێم وت: چی لەسەرتە.. دابەشی بکە..

جا هەستا و خەڵکی بانگ کرد و، لێی دابەش کردتا یەك درهەمی لێ نەمایەوە}..

جارێکی دیکەش زەوییەکی خۆی بە نرخێکی بەرز فرۆشت و، سەرنجی تورەگەی پارەکەی کرد و فرمێسك بە چاویدا هاتە خوارێ و، پاشان وتی:

(پیاوێك ئەم سامانەی لەماڵەکەیدا هێشتۆتەوەو نازانێ چی چاوەڕێی دەکات، بەخودای هەڵخەڵەتاوە)..

پاشان هەندێك لە هاوەڵانی بانگ کرد و ئەو سامانەی پێ هەڵگرتن و، بە کوچە و کۆڵانەکانی مەدینەدا دەڕۆیشت و دابەشی دەکرد، هەتا گەیشتە نیوەشەو یەك درهەمی پێ نەمابوو..!!

(جابری کوڕی عبداللە)ش لەو بارەیەوە دەڵێت:

{هیچ کەسم نەدیبوو هەرگیز سامانی خۆی بەبێ داواکردن ببەخشێت لە تەڵحەی کوڕی عبیداللە زیاتر}.

لە هەموو کەس زیاتریش بۆ خزم و کەسە نزیکەکانی باشبوو و، دەستگرۆی هەموشیانی دەکرد هەرچەند زۆر بوون.

لەو بارەیەشەوە دەربارەی وتراوە:

{... لێنەدەگەڕا هیچ کەس لە (بەنی تەمیم) نەدار بێت دەنا خەرجی خۆی و منداڵەکانیشی پێدەدا و..

بێوەژنەکانی بەشوو دەدانەوەو، خزمەتی هەژارەکانیانی دەکرد و، قەرزی قەرزاربووەکانی دەدایەوە}..

(سائبی کوڕی زەید) دەڵێت:

{هاوڕێیەتی (تەڵحەی کوڕی عبیداللە)م کردووە، لە سەفەر و ماڵەوەشدا لەگەڵیدا بووم، هیچ کەسم نەبینیوە وەك تەڵحە لە درهەم و، پۆشاك و، خواردەمەنیدا بەخشندە بێت}..!!

ئەو ئاشوب و ئاژەوە دیارەش لە سەردەمی خەلافەتی (عوسمان)داﷺ بەرپا دەبێت.. تەڵحە پشتگیری بەڵگەی رکابەرەکانی عوسمان دەکات و، هانی زۆریەیان دەدات لەسەر ئەو گۆڕانکاری و چاکسازیانەی داوایان دەکرد..

جا ئایا بەم هەڵوێستە، بانگەشەی بۆ کوشتنی (عوسمان) دەکرد، یان ڕازی بوو بەوە..؟؟ نەخێر...

گەر بیزانیایە کە ئەو ئاژاوەو ئاشووبە درێژە دەکێشێت تا لە کۆتایی کارەکەدا رق و کینەیەکی دڵتەزێن دەردەپەڕێت، هەناسەی لەخۆ دەبڕی لەو تاوانە قێزەونەدا کە دەرئەنجام (خاوەنی دوو رووناکی=ذو النورین) عوسمانﷺ بوویە قوربانی..

دەڵێین: گەر بیزانیایە کە ئەو ئاشووبە دەگاتە ئەو نەهامەتی و کۆتاییە، ئەوا بەرەنگاری دەبوو و، هەموو هاوەڵانی دیکەش لەگەڵیدا بەرەنگاریان دەکرد کە لە سەرتای کارەکەوە پشت گوێیان خستبوو بەو پێیەی کە بزاڤێکی نەیار و بەئاگامێنەرەو، هیچی دی..

هەرچەندە ئەو هەڵوێستەی تەڵحە بوویە (گرێی ژیانی) پاش ئەو شێوازە ناشیرینەی کە گەمارۆی ماڵی (عوسمان) درا و کوژرا، هەر کە ئیمامی (عەلی)یش بەڵێنی لە موسڵمانان وەرگرت لە مەدینە، تەڵحە و زوبەیریش لەوانە بوون، تا دواتر هەردووکیان مۆڵەتیان لێخواست و بۆ بەجێهێنانی عومرە چوون بۆ مەککە..

لە مەککەشەوە بەرەو بەسرا کەوتنە رێ، کە لەوێ سوپایەکی زۆر کۆبووبوویەوە بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی عوسمان..

* * *

شەڕی (جەمەل)یش روویدا و هەردوو دەستەی، داواکارانی خوێنی عوسمان و، ئەو دەستەیەی پشتیوانی عەلی دەکرد بە یەك گەیشتن..

ئیمامی عەلی هەر کە بیری لەو هەڵوێستە ناڕەحەتە دەکردەوە کە ئیسلام و موسڵمانان پێیدا تێدەپەڕن لەم ناکۆکیە ترسناکەدا، خەمەکانی دەبوونە لێشاو و، فرمێسکی چاوەکانی دەهاتنە خوارێ و، گریانی بەکوڵی بەرز دەبوویەوە..!!

ئەو پەلکێشی ئەو چاڵە ناڕەحەتە کرا..

بەو پێیەی کە خەلیفەی موسڵمانانە، ناتوانێت و، ئەو مافەیشی نیە کە لێبوردە بێت بەرانبەر هەر هەڵگەڕانەوەیەك بەرانبەر دەوڵەت، یان هەر راپەڕینێکی چەکداری دژی دەسەلاتداری شەرعی.

کاتێکیش هەڵدەستایەوە بۆ سەرکوت کردنی هەڵگەڕانەوەیەکی لەو جۆرە، ئەوا لەسەری پێویستە کە رووبەڕووی برا و هاوەڵ و شوێنکەوتەکانی پێغەمبەر و ئاینەکەی ببێتەوە، ئەوانەی کە ماوەیەکی زۆر لەگەڵیاندا دژ بە سوپا بێباوەڕان جەنگا و، پێکەوە و لەسایەی بەیداخی یەکخواناسیدا شەڕەکان لەناو یەکتردا تاواندبوونیەوەو بێگەردی کردبوون و، کردبوونیە برا، بگرە برای تەواو پێکەوە پەیوەست.

جا ئەمە چ چاڵێکە..؟ و چ تاقیکردنەوەیەکی تاڵە..؟

لە پێناوی دۆزینەوەی دەروازەیەکی دەربازبوون لەو نەهامەتییە و، بۆ پاراستنی خوێنی موسڵمانان، ئیمامی عەلی پەنای بۆ هەموو هۆکارێك برد و، هیچ تکایەك نەما نەیکردبێت.

ئەو رەگەزانەی لە دژی ئیسلام دەجەنگا، هەر ئەوانە، کە لەسەر دەستی دەوڵەتی ئیسلامی بە چارەنووسی سەختیخۆیان گەیشتن لە رۆژگاری دەستەڵاتی عومەریبەزندا، ئەو رەگەزانەی کە تەونی ئاشووبی چنیبوو و، بەردەوام دنەی دەدا و چاودێرییبەنگاوەکان و گەورەبوونی دەکرد..

* * *

ئیمامی عەلی زۆر گریا، کاتێك (عائیشە)ی دایکی بڕوادارانی بەدی کرد لە کەژاوەکەیدا بە پێشەوەی سوپایەك کە ئێستا دێن بۆ شەڕکردن لەگەڵیدا..

کاتێکیش لە نێوەندی سوپاکەدا تەڵحە و زوبەیری (هەردوو حەواری پێغەمبەر)ی بەدی کرد، داوای لە تەڵحە و زوبەیر کرد کە بێنە دەرەوە بۆ لای، هاتنە دەرەوە هەتا ملی ئەسپەکانیان تێك پەڕین..

جا بە تەڵحەی وت:

{ئەی تەڵحە، خێزانی پێغەمبەری خودات هێناوەو شەڕی پێوە دەکەیت و، خێزانەکەی خۆیشت لەماڵەوە حەشار داوە}..؟؟

پاشان بە زوبەیری وت:

{ئەیزوبەیر..

سوێندت دەدەم بە خودا، لە یادتە رۆژێکیان پێغەمبەری خوداﷺ بەلاتدا تێپەڕی و ئێمە لە فڵان جێگا بووین، جا پێی فەرموویت: ئەیزوبەیر، ئایا عەلیت خۆش ناوێ..؟؟ وتت: ئایا کوڕی خاڵۆ و، ئامۆزایخۆم و، ئەو کەسەی کە لەسەر ئاینەکەمە خۆشم نەوێت..؟؟ جا پێی فەرموویت: ئەی زوبەیر، سوێند بەخوا شەڕی لەدژ دەکەیت و، تۆش ستەمکاریت}..!!

زوبەیرڕضي الله عنه وتی: بەڵێ ئێستا دێتەوە یادم و، بەراستیلەبیرم کردبوو ئەوە، سوێند بەخوا شەڕت بەرامبەر ناکەم..

جا زوبەیر و تەڵحە خۆیان لادا لە بەشداریکردن لەو جەنگە ناوخۆییە..

کە کارەکەیان بۆ روون بوویەوە دەست بەجێ خۆیان لادا و، کاتێك (عەمماری کوڕی یاسر)یان بینی لە ریزی عەلیدا دەجەنگێت و، ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوایانﷺ بە عەممار هاتەوە یاد:

{دەستەیەکی یاخی دەتکوژێت}..

خۆ گەر عەممار لەم جەنگەدا بکوژرێت کە تەڵحە بەشداری تێیدا کردووە ، کەواتە تەڵحە لەناو یاخیەکاندایە..

* * *

تەڵحە و زوبەیر لە جەنگەکە کشانەوەو، ژیانی خۆیشیان بوویە نرخی ئەو کشانەوەیە، بەڵام بە چاو ئارامیەوە چوونەوە بۆ لای خوای گەورە بەهۆی ئەو بەرچاوروونی و ڕێنوێنیەی کە پێیدابوون..

بەڵام زوبەیر ئەوا پیاوێك بەناوی (عەمری کوڕی جەرموز) شوێنی کەوت و بە ناڕەوا و فێڵ لەکاتی نوێژدا کوشتی..!!

تەڵحەش، مەروانی کوڕی حەکەم تیرێکی لێدا و ژیانی کۆتایی پێ هێنا..

* * *

کوژرانی (عوسمان) لە دەرونی تەڵحەدا چەسپی بوو، هەتا-وەك پێشتریش وتمان- بوویە گرێکوێرەی ژیانی.

هەموو ئەمە، لەکاتێکدا کە ئەو بەشداری کوشتنەکەی نەکردبوو و، کەسی هان نەدابوو لەسەری، بەڵکو پشتگیری بەرهەڵستکاری لەدژی کردبوو، لە رۆژێکدا کە وا دیار نەبوو کە ئەو بەرهەڵستکارییە درێژە دەکێشێ و گرفت دەنێتەوە هەتا دەگۆڕێت بۆ ئەو تاوانە دڕندانەیە..

کاتێك لە رۆژی (جەمەل)دا شوێنی خۆی گرت لەگەڵ سوپای دژ بە ئیمامی (عەلی کوڕی ابوطالب) داوای خوێنی عوسمانی دەکرد، خوازیار بوو کە ئەم هەڵوێستەی ببێتە هەڵوەرینێك کە لە ناڕەحەتی ویژدانی بیحەسێنێتەوە..

بەر لە جەنگەکەش دەپاڕایەوەو ملی کەچ دەکرد و بەدەنگێکی پڕ هەنسك و گریانەوە، دەیوت:

{خودایا ئەمڕۆم بۆ عوسمان لێ وەربگرە هەتا رازی بیت}..

کاتێکیش عەلی و زوبەیر وەك ئەوەی باسمان کرد بەرەورووی یەکدی بوونەوە، وشەکانی عەلی هەموو لایەنەکانی رۆشن کردەوەو، راستیان بەدی کرد و، گۆڕەپانی جەنگەکەیان بەجێ هێشت.

بەڵام شەهیدبوون بۆیان هەڵگیرابوو..

بەڵێ.. شەهیدبوون بۆ تەڵحە بوو بێی دەگات و دەگات پێی لە هەرکوێ بێت..

ئەی پێغەمبەر لەبارەیەوە نەیفەرموو:

{ئەمە لەو کەسانەیە کە بەڵێنی خۆی بەجێهێناوە، هەرکەس پێی خۆشە شەهیدێك بەدی بکات کە بەسەر زەویدا دەڕوات، ئەوا با سەرنجی تەڵحە بدات}..؟؟

کەوابوو شەهید بە چارەنووسی دیاریکراو و گەورەی خۆی گەیشت و کارەساتی (جەمەل)یش کۆتایی هات..

(عائیشە)ی دایکی بڕوادارانیش تێگەیشت کە ئەو لە کارەکانیدا پەلەی کردووە، ئەمجا شاری بەسرای بەجێهێشت و گەڕایەوە (بیت الحرام) لە مەدینە، دەستی خۆی لەو ململانێیە

کێشایەوە، ئیمامی عەلیش هەمو هۆکارێکی گەشت و ڕێزلێنانی لەو سەفەردەیدا بۆ دەستەبەر کرد..

* * *

کاتێکیش عەلی بەسەر شەمیدانی جەنگەکەدا دەگەڕا و نوێژی لەسەر هەموو ئەوانەی لەگەڵیدابوون و، ئەوانەیشی لەدژی بوون دەکرد..

کاتێك لە بەخاك سپاردنی تەڵحە و زوبەیر بوویەوە، راوەستا و بە چەند وشەیەکی پایەدار ماڵئاوایی لێکردن و، لە کۆتاییەکەیدا وتی:

{دەخوازم کە من و، تەڵحە و، زوبەیر و، عوسمان لەو کەسانە بین کە خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِمْ مِنْ غِلٍّ إِخْوَانًا عَلَى سُرُرٍ مُتَقَابِلِينَ﴾الحجر/٤٧..}

پاشان سەرنجێکی بەسۆز و غەمگینی گڵکۆکەیانی داو، وتی:

{بەم دوو گوێیەی خۆم بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: تەڵحە و زوبەیر دراوسێمن لە بەهەشتدا}..

# ٢٨

# زۆربەی کوردی عەوام
# حەواری پێغەمبەری خودا

کە باسی تەڵحە دێتە ئارا، ناوی زوبەیریشی لەگەڵدا دێت..
باسی (زوبەیر)یش بەبێ ناوهێنانی (تەڵحە) ناکرێت.
کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ برایەتی دەخستە نێوان هاوەڵانی لەشاری مەککە بەر لە کۆچ کردن، برایی خستە نێوان تەڵحە و زوبەیرەوە.
هەموو جارێکیش پێغەمبەرﷺ پێکەوە دەربارەیان دەدوا و، دەی فەرموو:
((تەڵحە و زوبەیر، دراوسێمن لە بەهەشتدا))
هەردووکیشیان وەك یەك لە خزمایەتی و رەچەڵەکدا دەگەنەوە بە پێغەمبەری خودا.
تەڵحە لە (مورڕەی کوڕی کەعب)دا دەگاتەوە بە پێغەمبەر.
زوبەیریش، رەچەڵەکی لە (قوصەی کوڕی کیلاب)دا دەگاتەوە بە پێغەمبەر، هەروەها (صەفیە)ی دایکیشی پووری-خوشکیباوکی- پێغەمبەری خوایە.
هەردووکیشیان-تەڵحە و زەبەیر- لە هەموو کەس زیاتر لە پێوەدانگەکانی ژیاندا بە یەکدی دەچوون..
بە یەکچوونیش لە نێوانیاندا زۆر بوو... لە پەروەردەبوون و، دەوڵەمەندی و، بەخشندەیی و، بەهێزی ئاین و.. جوامێریدا و.. هەردووکیشیان لەوانەبوون کە زوو موسڵمان بوون و.. لەو دەکەسەن کە موژدەی بەهەشتیان پێدراوە، لەو شەش هاوەڵەی راوێژکردن بوون کە (عومەری کوڕی خطاب) کاری دیاریکردنی خەلیفەی لەپاش خۆی پێ سپاردن.
تەنانەت چارەنووسیشیان تەواو وەك یەك بوو.. بگرە یەك سەرئەنجامیش بوو..!!

* * *

زوبەیر وەك باسمان کرد زۆر زوو موسڵمان بوو و.. یەکێك بوو لەو حەوت کەسەی کە خێرا بەرەو ئیسلام هاتن و، لەگەڵ پێشەنگە پیرۆزەکاندا لە ماڵی ئەرقەم بەشدار بوو.
لەو کاتەشدا تەمەنی پازدە ساڵ بوو.. بەم جۆرە لە منداڵیدا رێنوێنی و رۆشنایی و چاکەی بەسەردا رژا..
لە منداڵیشەوە شۆرەسوارێکی بوێر بوو، تەنانەت مێژوونووسان وا باس دەکەن کە یەکەم شمشێر هەڵکێشرابێت لە پێناوی ئیسلامدا، شمشێری زوبەیر بوو.
لە رۆژانی سەرەتای هاتنی ئیسلامدا، کە موسڵمانان ژمارەیەکی زۆر کەم بوون لە ماڵی ئەرقەم خۆیان پەنا دابوو.. رۆژێکیان ئەو پروپاگەندەیە بڵاوبوویەوە کە پێغەمبەر کوژراوە..

ئەوەی بە زوبەیر کرا پەلاماری شمشێرەکەی دا و هەڵیکێشا و، بە گەنجێتیەوە وەك گەردەلول بە شەقامەکانی مەککەدا دەڕۆیشت..!!

یەکەمجار چوو، لە هەواڵەکە دڵنیا بێت، سوور بوو لەسەر ئەوەی کە گەر ئەوە راست بێت ئەوا بەو شمشێرەی بەربێتە قورەیشیەکان تا یا لەناویان دەبا یان لەناوی دەبەن.

لەوسەری مەککە گەیشت بە پێغەمبەری خواﷺ و، لێی پرسی کە چی بەسەرهاتووە..؟

زوبەیریش هەواڵەکەی پێدا و.. پێغەمبەریشﷺ بۆی پاڕایەوەو داوای چاکەی بۆ خۆی و سەرکەوتنیشی بۆ شمشێرەکەی کرد.

سەرەڕای پلەوریزی زوبەیر لەنێو هۆزەکەیدا، ئەویش پشکی خۆی لە سزا و ئەشکەنجە و دەربەدەرکردن بەدەستی قورەیشیەکان چەشت.

مامیشی ئەرکی ئەشکەنجەدانی لە ئەستۆ گرتبوو.. لە نێو حەسیرێکدا دەیپێچایەوەو، ئاگری دەکردەوەو دوکەڵەکەی دەکرد بەسەریدا تا هەناسەی لێ ببڕێت، لە کاتێکدا کە لە ژێر ناڕەحەتی ئەشکەنجەدانیدا بوو بانگی لێدەکرد: گومڕا بە بە پەروەردگاری موحەممەد، ئەم ئەشکەنجەیەت لەسەر لادەدەم..

زوبەیر کە لەو رۆژەدا گەنجێکی تازەپێگەیشتووی، ئێسك نەرم بوو، بە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی سامناکەوە وەڵامی مامەی دایەوە:

{نەخێر..

سوێند بەخوا، هەرگیز ناگەڕێمەوە بۆ بێباوەڕی}..

ئەمجا زوبەیر کۆچ دەکات بۆ حەبەشە، هەردوو کۆچ -یەکەم و دووەمیش-، پاشان دەگەڕێتەوە تا لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بەشداری هەموو شەڕەکان دەکات و، هیچ غەزا و جەنگێکی لەدەست دەرناچێت.

چەند زۆر بوو ژمارەی ئەو برینانەی کە بە جەستەی زوبەیرەوە بوون و پاش سارێژبوونیشیان وەك میدالیایەك کە پاڵەوانێتی و سەروەرییەکانی زوبەیر بگێڕێتەوە شوێنیان بە لاشەیەوە مابوو.

دەبا گوێ رادێرین بۆ یەکێك لە هاوەڵانی ئەو میدالیا زۆرانەی کە بەسەر جەستەیەوە بوو بەدی کردوە، بۆمان باس دەکات و دەڵێت:

{هاوڕێیەتی زوبەیری کوڕی عەوامم کرد لە هەندێك گەشتیدا و جەستەیم بەدی کرد، بینیم هەلاهەلا بوو بە شمشێر و، سەر سنگیشی بەهۆی شوێنی لێدانی شمشێر و رمەوە وەك بێژنگی لێهاتبوو.

پێم وت: سوێند بەخوا ئەوەی بە جەستەی تۆوە بینیم هەرگیز بەهی کەسی دیکەوە نەمبینیوە..

پێی وتم: سوێند بەخوا هەموو برینەکانم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووەو لەپێناوی خوادا بریندار بووم}..

لە جەنگی ئوحودیشدا پاش ئەوەی سوپای قورەیش پشتیان هەڵکرد و بەرەو مەککە گەڕانەوە، پێغەمبەر ئەو و ئەبوبەکری دانا بۆ چاودێریکردنی لەشکری قورەیش و شوێنکەوتنیان هەتا بۆیان دەردەکەوێت کە موسڵمانان هێزیان ماوەو بیر لە هاتنەوە بۆمەدینە و درێژەدان بە شەڕ نەکەنەوە.

ئەمجا ئەبوبەکر و زوبەیر سەرکردایەتی حەفتا موسڵمانیان کرد و، لەگەڵ ئەوەی کە ئەوان کەوتبوونە شوێن سوپایەکی سەرکەوتوو، بەڵام ئەو لێزانیەتییە جەنگیەی کە ئەبوبەکر و زوبەیر بەکاریان هێنا وای لە قورەیشیەکان کرد وا گومان بەرن بە هەڵەداچوون لە مەزەندەکردنی زەرەرو زیانی موسڵمانەکاندا و، وایان لێکردن کە ئەو دەستە بەهێزە کە ئەبوبەکر و زوبەیر بەهێزیەکەیان خستە روو، بەرەتای سوپای پێغەمبەرە وا دیارە دەیەوێت شاڵاوی بەدواداکەوتنیان بەشێوەیەکی ترسناك دەست پێبکات، هەر بۆیە قورەیش کەوتنە خۆیان و، بە پەلە رووەو مەککە کەوتنە رێ..!!

لە رۆژی (یەرموك)یشدا زوبەیر بە تەنها بۆ خۆی سوپایەك بوو.. کاتێك بینی زۆربەی ئەو موسڵمانانەی کە ئەم سەرکردایەتی دەکردن لە بەردەم لێشاوی کێوی رۆمەکاندا خەریکە شکست دێنن، بەدەنگی بەرز وتی: (الله اکبر) و.. بە تەنها ئەو کێوە سەختەی بڕی و، بە شمشێرەکەی لێی دەدان و.. دواتر بە نێوەندی ئەو ریزە پڕ مەترسیدارانەدا گەڕایەوە، شمشێرەکەیشی بۆ سڵکردنەوە بەدەستی راستی گرتبوو..!

زوبەیرﷺ گەلێك تامەزرۆی شەهیدی بو و، زۆر ئارەزوومەندی مردن بوو لەپێناوی خوادا..

لەو بارەیەوە دەیوت:

{تەڵحەی کوڕی عبیداللە ناوی پێغەمبەرانی لە کوڕەکانی دەنا و، دەیزانی کە لەپاش موحەممەد پێغەمبەری دیکە نیە..

منیش ناوی شەهیدانم لە کوڕەکانم دەنا بەو ئومێدەی کە شەهید بین}..!

بەم جۆرە کوڕەکەی ناونا (عبداللەی کوڕی زوبەیر) بەناوی هاوەڵی شەهید (عبداللەی کوڕی جەحش)، کوڕێکی دیکەشی ناونابوو (مونزیر) بەناوی هاوەڵی شەهید (مونزیری کوڕی عەمر)ەوە. یەکێکیدیکەشیانی ناونابوو (عوروە) بەناوی هاوەڵی شەهید (عوروەی کوڕی عەمر)ەوە.. کوڕێکی تریشیانی ناوی (حەمزە) بوو، بەناوی شەهیدی پایەبەرز (حەمزەی کوڕی عبدالمطلب)ەوە.. یەکێکیشی ناونابوو (جەعفەر) بە ناوی شەهیدی مەزن (جەعفەری کوڕی ابوطالب)ەوە.. ناوی یەکێکی دیکەشیانی نابوو (موصعەب) بەناوی هاوەڵی شەهید (موصعەبی کوڕی عومەیر)ەوە.. ناوی یەکێکی دیکەشیانی نابوو (خالد) بەناوی هاوەڵی شەهید (خالیدی کوڕی سەعید)ەوە..

بەم جۆرە ناوی شەهیدانی هەڵدەبژارد بۆ ناونانی کوڕەکانی، بەو ئومێدەی کە ئەو ڕۆژە ئاکامیان دێت شەهید ببن..!!

دەربارەی سەرگوزەشتەشی وتراوە:

(هەرگیز کاری والییەتی و جبایە و کۆکردنەوەی سەرانە و، هیچ شتێکی لە ئەستۆ نەگرتووە جگە لە جیهادکردن لە پێناوی خوا}.

هەر بۆیە لایەنی چاکی وەك جەنگاوەرێك لە پشت بەستنی تەواوی بە خۆی و، متمانە بەخۆبوونیدا خۆی دەنواند.

خۆگەر سەد هەزار جەنگاوەر لە جەنگدا بەشدار بوونایە لەگەڵیدا، سەیرت دەکرد وەك ئەوەی خۆی بە تەنهابێت دەجەنگا و... وەك ئەوەی بەرپرسیارێتی جەنگ و سەرکەوتن تەنها لەسەر شانی ئەوە.

چاکمەندی جەنگاوەرێتی ئەویش لە خۆڕاگری و، بەهێزی مێشکیدا خۆی دەبینییەوە.

لە ڕۆژی ئوحوددا سەرنجی دیمەنی (حەمزە)ی خاڵۆی دا کە بێباوەڕەکان دڵڕەقانە جەستەی مردوویان شێواندبوو، هەر بۆیە وەك کێوێك لە بەردەمیدا راوەستا و ددانەکانی لەسەر یەك توند کردبوو و، توند دەسکی شمشێرەکەی گرتبوو و، تەنها بیری لە تۆڵەسەندنەوەیەکی سامناکی دەکردەوە، تا زۆر زوو نیگا هاتە خوارێ و قەدەغەی کرد لە پێغەمبەر و موسڵمانان کە بیریشی لێ بکەنەوە..!!

کاتێك گەمارۆدانی (بنی قریظە)ش درێژەی کێشا و خۆیان نەدا بەدەستەوە، پێغەمبەر لەگەڵ عەلی کوڕی ابوگالبدا ناردی، لەبەردەم قەڵا سەختەکەیاندا وەستا و لەگەڵ ئیمامی عەلیدا دەیوت:

{سوێند بەخوا، یا ئەوەتا ئەوەی بەسەر حەمزە هات بەسەرتان دێنین، یان ئەو قەڵایەتان پێ دەکەینەوە}..

پاشان بە تەنها خۆیان هەڵدایە نێو قەڵاکەوەو..

بەهێزی سەرسوڕهێنەریان، ترس و بیمیان خستە دڵی ئەوانەی نێو قەڵاکەو دەروازەکانیان بۆ موسڵمانەکان والاکرد..!!

لە ڕۆژی (حونەین)یشدا چاوی کەوت بە (مالیکی کوڕی عەوف)ی پێشەوای هەوازن و سەرکردەی سوپاکانی بێباوەڕی لەو غەزایەدا.. پاش شکست هێنانیان لەنێو دەستەیەك لە هاوڕێکانی، پاشماوەی سوپا شکست خواردووەکەیدا راوەستاوە، بە تەنها چووەنێویانەوەو، پەرتەوازەی کردن و، لەو جێگا پەنهانانەی کە خۆیان تێدا مەڵاس دابوو بۆ هەندێك لە سەرکردەکانی موسڵمانان کە لە شەڕەکە دەگەڕانەوە، وەدەری نان..!!

* * *

پشکی ئەو لە خۆشویستنی وڕێزلێنانی لای پێغەمبەر زۆر مەزن بوو..

پێغەمبەریشﷺ شانازی پێوە دەکرد و دەیفەرموو:

{هەموو پێغەمبەرێك حەوارییەكی هەبووە، زوبەیری کوڕی عەوامیش حەواری منە}..

چونکە ئەو تەنها ئامۆزای نەبوو و بەس، یان تەنها مێردی ئەسمائی کچی ئەبوبەکری خاوەن دوو پشتێن نەبوو و بەس، بەڵکو لە هەمان کاتدا ئەمەکدارێکی بەهێز و ئازا و، مەرد و بەخشندە و لەخۆبوردوو بوو، گیان و ماڵی خۆی بەخشیبێت بەخودای پەروەردگاری جیهانیان.

بەراستیش (حسانی کوڕی سابیت) چاکی پێکاوە کە لەبارەیەوە دەڵێت:

| | |
|---|---|
| أقـام علـى عهـد النبـي وهديـه | حواريّـه والقـول بالفعـل يعدل |
| أقـام علـى منـهاجـه وطـريقـه | يوالـي ولـي الحق، الحقّ أعـدل |
| هو الفارس المشهور والبطل الذي | يصـول، اذا ما كان يـوم محجّـل |
| لـه من رسـول الله قـربـى قريبـة | ومن نصرة الاسـلام مجد مُؤَثَّـل |
| فكم كـربـه ذبّ الزبيـر بسـيفه | عن المصطفى، والله يعطي ويجزل |

واتە: لە سەردەمی پێغەمبەردا لەسەر ڕێنوێنی ئەو دەگوزەرا و حەواری ئەوبوو، قسەیش بەکردەوە دەسەلمێنرێ.. لە سەر ڕێباز و ڕێچکەی ئەو ڕوی لە ڕەوگەی ڕاست بوو، هەقیش دادپەروەرانەترە.. ئەو شۆڕەسوارێکی ناودار و ئەو پاڵەوانەیە کە لە ڕۆژی تەنگانە و سەختدا دەهات و دەچوو.. خزمێکی نزیکی پێغەمبەری خودایەو، لە سەرخستنی ئیسلامیشدا سەربەرزییەکی زۆری هەیە.. چەندی تەنگانە بە شمشێرەکەی لادا لە ڕێی پێغەمبەردا و، هەر خودایش دەبەخشێت و پاداشت دەداتەوە.

* * *

بەراستی پایەبەرز و ئاکار مەزن بوو.. ئازایەتی و بەخشندەییەکەیشی وەك ئەسپی برەو وابوو..!!

بازرگانێتیەكی سەرکەوتووشی بەڕێوە دەبرد و، سامانێکی زۆریشی هەبوو، بەڵام هەمووی بۆ ئیسلام بەخشی تا بە قەرزاری گیانی سپارد..!!

پشت بەستنیشی بەخوای گەورە پێگەی بەخشندەییەکەی و، پێگەی ئازایەتی و گیان بەختکردنەکەی بوو.

تەنانەت گیانیشی بەخشی و، (عبدالله)ی کوڕیشی ڕادەسپارد کە قەرزەکانی بداتەوەو دەیوت:

{گەر قەرزەکانت بۆ نەدرایەوە، ئەوا پشت بە گەورەکەم ببەستە}

عبدالله لێی پرسی: مەبەستت لە گەورەکەت کێیە..؟

لە وەڵامدا وتی: {خودا، کە چاکترین گەورەو باشترین پشتیوانە}..

عبدالله دواتر دەڵێت:

{سوێند بەخوا، گێرۆدەی هەر ناڕەحەتیەك ببومایە لە دانەوەی قەرزەکەیدا، دەموت: ئەی گەورەی زوبەیر قەرزەکانی بدەرەوە، بۆی دەبژارد و دەستەبەری دەکرد}..

لە رۆژی (جەمەل)یشدا بەو شێوەی کە باسمان کرد لە قسەو باسماندا لەسەر (تەڵحە)، کۆتایی و چارەنووسی (زوبەیر) بەو جۆرە بوو..

کاتێك بۆی دەرکەوت کەوا رەوایە کە دەستی لە جەنگەکە بکێشێتەوە، یەکێك لەوانەی کە هەمیشە مەبەستیان بوو ئاشووب و ئاژاوە بەردەوام بێت، لەکاتێکدا کە لە بەرامبەر پەروەردگاریدا بوو نوێژی دەکرد، ئەو سەرپێچیکەرە شمشێرێکی لێدا..

ئەمجا ئەو پیاوکوژە رۆشتەوە بۆ لای ئیمامی عەلی و وای گومان دەبرد کە موژدەیەکی خۆشی پێیە بۆی، کاتێك کە هەواڵی دەستدرێژیکردنەکەی بۆ سەر زوبەیر پێدەگەیەنێت و، کاتێك کە ئەو شمشێرەی کە لێی سەندبو دەخاتە بەر دەستی، پاش ئەنجام دانی تاوانەکەی.

بەڵام عەلی τ هاواری کرد کاتێك کە زانی بکوژی زوبەیر لە دەروازەکەیدایەو مۆڵەت دەخوازێت بێتە ژوورێ، هاواریکرد و فەرمانی دا کە دەری بکەن و وتی:

{مژدەی چونە نێو ئاگر بدەن بەبکوژی کوڕی صەفیە}..

کاتێکیش شمشێرەکەی زوبەیریان بردە لای ئیمامی عەلی، ماچی کرد و زۆر بە سەرسامیەوە گریا و، وتی:

{شمشێرێکە سوێند بەخوا دەمێکە خاوەنەکەی ناڕەحەتی سەر رێی پێغەمبەری خوای پێ لادەبات}..!!

ئا لێرەدا و هەر سڵاوێك کە ئاراستەی زوبەیری بکەین لە کۆتاییدا قسەکانماندا، جوانتر و شیاوتر بێت لە وشەکانی ئیمامی عەلی..؟؟

سڵاو لە زوبەیر بێت لە ژیان و مردنیدا.

سڵاو، پاشان سڵاو، لەسەر حەواری پێغەمبەری خوا.

* * *

٢٩

# خوبه‌یبی كوڕی عه‌دی

# پاڵه‌وانێك .. به‌سه‌رخاچه‌وه‌ !!

ئائێستاش..

ئەی مەردینە! رێ والآکەن لەبەردەم ئەم پاڵەوانەدا..

لە هەموو لایەکەوە، لە گشت جێگایەکەوە وەرن..

بە تاك و، بە کۆمەڵ بێن..

خێرا و، ملکەچانە وەرن..

کۆببنەوە، تاوەکو وانەیەکی بێوێنەی فیداکاری وەربگرن..!!

دەڵێن:ئەرێ ئەو هەموو سەرگوزشتەیەی بۆت باسکردین وانەی بێوێنەی فیداکاری نەبوون..!!

بەڵێ، وانە بوون..

لە شان و شکۆشدا نمونە و هاوشێوەی نەبوو..

بەلام ئێوە ئائێستا لەبەردەم مامۆستایەکی نوێی هونەری قوربانیداندان.. مامۆستایەك گەر بەدیکردنیتان لەدەست بچێت، چاکەی زۆرزۆرتان لەدەست چووە، زۆر زۆر.. ئەی خاوەن بیروبڕواکانی هەموو نەتەوەو ولاتێك! رووبکەنە ئێمە..

ئەی شەیدایانی پایەبەرزی هەر کات و سەردەمێك روو لە ئێمە بکەن..

هەروەها ئێوەش ئەی ئەوانەی لەخۆبایی بوون قورسی کردوون و، گومانتان بەرانبەر ئاینەکان و ئیمان خراپە..

بە لەخۆباییبونتانەوە وەرن..!

وەرن سەرنج بدەن کە ئاینی خودا چۆن پیاوان وەبەردێنێ..

وەرن رامێنن چ جەسووری و... بەرگری و... چ خۆڕاگری و توندییەکە.. چ فیداکاری و.. چ پشتیوانی و خۆشەویستیەکە..

بە تەنها یەك وشەیش، چ مەزنییەکی لەرادەبەدەر و سەرسوڕهێنەرە بڕواهێنان بە حەق دەیرژێنێ بەسەر کەسانی دڵسۆزیدا..!!

ئەرێ ئەو جەستە لەخاچ دراوە بەدی دەکەن..؟؟

ئەی هەموو نەوەکانی مرۆڤ، ئەوە بابەتی وانەی ئەمڕۆمانە...

بەڵێ...

ئەو جەستە لە خاچدراوەی بەردەمتان بابەت و، وانە و، مامۆستامانە..

ناویشی (خوبەیبی کوڕی عەدی)یە.

بەچاکی ئەم ناوە پایەبەرزە لەبەر بکەن.

لەبەری بکەن و، جاڕی بۆ بدەن، چونکە بەراستی مایەی ڕێزە بۆ سەرجەم مرۆڤ و... گشت ئاین و، هەموو ڕێباز و.. تێکڕای ڕەگەز و، هەموو سەردەمەکان..!!

* * *

ئەم لە تیرەی ئەوسی شاری مەدینە و ئەنصاریەکانیەتی.

کە پێغەمبەری خواﷺ چووە مەدینە، ئەو هاتە خزمەتی و بڕوای هێنا بە خودای پەروەردگاری جیهانیان.

پیاوێکی ڕۆح سوکی، دەروون ناسکی، باوەڕ پتەوی، ویژدان نەرم بوو، وەك شاعیری ئیسلام (حەسانی کوڕی سابیت) پیایدا هەڵداوە:

صقراً توسّط في الأنصار منصبهُ     تسمح السّجيّة محضاً غير مؤتشب

واتە: هەڵۆیەك بوو لە نێو ئەنصاریەکان پلەوپایەی، لێبوردەیی و بنەچە پاکی و بێخەوشی بوو.

کاتێکیش ئاڵاکانی غەزای بەدر بەرز کرایەوە، ئەو لەوێدا سەربازێکی بەجەرگ و، جەنگاوەرێکی گیان لەسەر دەست بوو.

(حارسی کوڕی عامری نەوفل)یش یەکێك بوو لەو بێباوەڕانەی کە لەکاتی چوونیدا بۆ جەنگ هاتە سەر ڕێی ئەویش بە شمشێرەکەی لەناوی برد.

پاش کۆتایی هاتنی جەنگەکە و، گەڕانەوەی پاشماوەی شکست خواردووی دۆڕاوی قورەیش بەرەو مەککە، کوڕەکانی (حارس) هەواڵی کوژرانی باوکیانیان پێگەیشت و، بەچاکی ناوی ئەو موسڵمانەیان لەبەر کرد کە لە شەڕەکەدا کوشتبووی کە ئەویش (خوبەیبی کوڕی عەدی) بوو..!!

* * *

موسڵمانانیش لە بەدر گەڕانەوە بەرەو مەدینە و، بەردەوام بوون لەسەر بونیاتنانی کۆمەڵگەی نوێیان..

(خوبەیب)یش، خواپەرست و، لێبڕاو بوو، لە نێوچەوانیدا سروشتی لێبڕاوان و، ڕووناکی خوداپەرستانی هەڵگرتبوو..

ئا لەوێدا بە گیانێکی ئەڤیندارانەوە پەرستشی خۆی دەکرد و.. شەو هەڵدەستا شەونوێژی دەکرد و، بەڕۆژدا بەڕۆژوو دەبوو، خودای پەروەردگاری جیهانیانی بە پیرۆز و بێگەرد دەگرت.

* * *

رۆژێکیان پێغەمبەرﷺ ویستی کە نهێنیەکانی قورەیش تاقی بکاتەوەو، مەبەستی خۆسازدان و جوڵە و، ئامادەباشیان بۆ غەزایەکی نوێ بۆ روون ببێتەوە.. بۆ ئەم کارە لەنێو هاوەڵانیدا دە پیاوی هەڵبژارد.. کە (خوبەیب) یەکێکیان بوو، (عاصمی کوڕی سابیت)یشی کرد بە لێپرسراویان.

سوارەکان بەرەو ئامانجەکەیان کەوتنە رێ تاگەیشتنە جێگایەك لەنێوان (عەسفان) و (مەککە)دا، هەواڵی هاتنیان گەیشت بە گەڕەکێکی (هوزەیل) کە پێیان دەوتن (بەنو حەیان)، ئەوانیش خێرا سەد پیاویان لەچاکترین تیرهاوێژەکانیان ئامادەکرد و، دەستیاندایە چاودێریکردنیان و، شوێن پێیان هەڵدەگرتن.

خەریك بوو بێ هیوابن لە دۆزینەوەیان، گەر یەکێکیان هەندێك ناوکە خورمای کەوتووی لەسەر زەوییەکە بەدی نەکرایە.. چەند دانەیەکی لێ هەڵگرت و بەو لێزانیە سەرسوڕهێنەرەی هەیەتی لێی راما، پاشان هاواری کرد لەوانەی کە لەگەڵیدا بوون:

{ئەمە ناوکەخورمای (یەثریب)ە، دەبا شوێنی بکەوین تا دەمانگەیەنێتە لایان}..

بە شوێن ناوکە خورما کەوتووەکانی سەر زەویەکەدا رۆیشتن، تا لە دورەوە ئەو نێچیرانەی بەدوایاندا وێڵ بوون بینیمان..

(عاصمی)ی سەرکردەی دە پیاوەکە هەستی کرد کە بەدوایانەوەن، داوای لە هاوەڵەکانی کرد کە بچنە ترۆپکێکی بەرزی سەر کێوەکە..

سەد تیرهاوێژەکەش نزیك بوونەوەو، لە خوارەوەی کێوەکەیش دەوریان گرتن و، بەچاکی گەمارۆیان دان و..

داوایان لێکردن کە خۆیان بدەن بەدەستەوە، پاش ئەوەی بەڵێنیان پێدان کە هیچ خراپەیەکیان بەرانبەر ئەنجام نادەن..

هەر دە پیاوەکە ئاوڕیان لە (عاصمی کوڕی سابیتی ئەنصاری)ﷺی سەرکردەیان دایەوە..

چاوەڕێی فەرمانی بوون..

هەرکە ئەویش وتی:

سوێند بەخوا من ناچمە خوارەوە پەنادراوی بێ باوەڕ بم..

خودایا هەواڵمان بگەیەنە بە پێغەمبەرەکەت}..

دەست بەجێ تیرهاوێژەکان دەستیان دایە تیرهاویشتن بۆیان.. لەوێدا (عاصمی) سەرکردەیان لەگەڵ حەوت لە یاوەرانیدا شەهید بوو..

هاواریان لەو سێیەی دیکەشیان کرد، کە خاوەنی وادە و بەڵێنیانن بەرانبەریان گەر بێنە خوارەوە.

ئەمجا هەرسێکیان: (خوبەیبی کوڕی عەدی) و دوو هاوەڵەکەی هاتنە خوارێ..

تیرهاوێژەکان لە(خوبەیب و زەیدی کوڕی دیسیننە)ی هاوەڵی نزیك بوونەوەو پشتێنەکانیان کردەوەو، بەستنیانەوە..

کاتێك هاوەڵی سێیەمیان سەرەتای خیانەتکردنیانی بەدی کرد، بڕیاریدا کە دەبێت ئەویش وەك عاصم و هاوەڵانی دیکە بمرێت..

بەو شێوەیەش کە دەیویست شەهید بوو.

بەم جۆرە هەشت کەس لە مەزنترین باوەڕدارانی خاوەن ئیمان و، ئەمەکدار و، بە وەفا بۆ خودا و پێغەمبەرەکەی لەناوچوون..!!

خوبەیب و زەید هەوڵیان دا کە خۆیان لە پەتەکانی دەستیان دەرباز بکەن، بەڵام زۆر توند بەسترابوو..

ئەمجا تیرهاوێژە دەستدرێژیکارەکان بەرەو مەککەیان بردن و، فرۆشتنیان بە بێباوەڕەکان.. ناوی (خوبەیب) کەوتە بەر گوێیان..

کوڕەکانی (حارسی کوڕی عامر)ی کوژراوی ڕۆژی بەدر، بەچاکی ئەو ناوەیان هاتەوە یاد و، بوغز و کینەی سنگیانی هەژاند.

خێرا ڕۆیشتن بۆ کڕینی و،.. لەمەشدا زۆر ...ەرانی مەککە، ئەوانەی کە لە جەنگی (بەدر)دا باوك و سەرکردەکانیان لەدەست دا ...ستی تۆڵەسەندنەوە، کێبڕکێیان بوو بۆ کڕینی.

لە کۆتاییدا هەموو پێکهاتن لە سەری و دەستیان ئامادەکردنی بۆ چارەنووسێك کە سارێژی بوغز و کینەیان بکات، بەرامبەر تەنها ئەو نا، بەڵکو لە هەموو موسڵمانان..!!

کەسانێکی دیکەش دەستیان خستە سەر (زەیدی کوڕی دیسیننە)ی هاوەڵی خوبەیب و ئەویش بە هەمان شێوە سزا و ئەشکەنجەیان دەدا..

* * *

خوبەیب دڵی و، کاری خۆی و، سەرئەنجامی دایە دەست خودای پەروەر...ی جیهانیان.

دەروون بەرز و، بە وره لەسەر خوداپەرستیەکەی بەردەوام بوو و، هێندە سەبوری خودای لەدڵدابوو کە بەرد بتوێنێتەوەو، ناخۆشی لاببات..

خودای لەگەڵدابوو... ئەویش لەگەڵ خودا بوو..

هەستی بەو بەزەییە و دڵنیاییە دەکرد کە خوا پێی بەخشیبو.

ڕۆژێکیان یەکێك لە کچەکانی (حاریس) کە لەنێو ماڵی ئەواندا بەند کرابوو، هاتە ژوورەوە بۆ لای، خێرا لە شوێنی خۆی چوویە دەرەوە و بانگی خەڵکی کرد تا شتێکی سەیر ببینن..

{سوێند بەخوا بۆڵە ترێیەکی گەورەم بەدەستیەوە بینی لێی دەخوارد..

لەکاتێکدا کە بە ئاسن بەستراوەتەوە.. لە هەموو مەککەشدا دەنکە ترێیەك نەبوو.. وا گومان دەبەم کە ئەوە رزق و رۆزییەك بێت خوا بە (خوبەیب)ی بەخشیبێت}....!!

بەڵێ.. ئەوە رزق و رۆزییەك بوو خودا بە بەندە چاکەکارەکەی دابوو، هەروەك چۆن پێشتر بە (مەریەمی کچی عیمران)یش درا، ئە رۆژەی کە:

﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا قَالَ يَامَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَرْزُقُ مَنْ يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ: هەرجارێکی زەکەریا لە میحرابدا سەری دەدا، دەیدی بژێوی لەلایە، گوتی: مریەم! تۆ ئەم بژێوەت لە کوێ بوو؟ گوتی: لەلایەن خوداوە بۆم هاتووە، خودا بۆ هەرکەسێ حەز کا رۆزی بێ هەژمار دەنێرێ.﴾ آل عمران/٣٧.

* * *

بێباوەڕان هەواڵی تیاچوونی (زەیدی کوڕی دیسیننە)ی برایانﷺ گەیاند بە خوبەیب..

وایان گومان دەبرد کە بەوە مێشکی تێك دەدەن و، ئازاری مردنی پێدەچێژن، ئەوان بێئاگابوون لەوەی کە خودای خاوەن میهر و بەزەیی میواندارى کردووەو، سەبووری و بەزەیی خۆی بەسەردا رژاندووە.

ئەمجا دەستیاندایە سازشکردنی لەسەر ئیمانەکەی و، هانیان دەدا کە رزگاری دەبێت گەر بێباوەڕ بێت بەرامبەر موحەممەد و، بەر لەویش بەرانبەر ئەو پەروەردگارەی بڕوای پێ هێناوە.. بەڵام ئەوان وەك ئەو کەسە وابوون کە دەیەوێت تیر بگرێتە خۆر..!!

بەڵێ ئیمانی خوبەیب وەك خۆر بەهێز و، دوور و، ئاگرلوی و، رووناکی بەخش بوو..

هەموو ئەوانەی رووناك دەکردەوە کە رووناکییان لێی دەخواست، گشت ئەوانەی گەرم دەکردەوە کە گەرمیان لێبڕابوو، ئەو کەسەیشی لێی نزیك ببوایەتەوەو دژی بوەستایە دەیسوتاند و لەناوی دەبرد.

کاتێك کە بێئومێد بوون لەوەی دەیانویست، پاڵەوانەکەیان بەرەو چارەنووسی برد و... هێنایانە دەرەوەو بەرەو جێگایەکیان برد کە پێی دەوترا (تەنعیم)، جا شەهیدکردنی لەوێدا بوو..

هەرکە گەیشتنە ئەوێ خوبەیب مۆڵەتی لێ خواستن کە دوو رکات نوێژ بکات، ئەوانیش وایان گومان دەبرد کە لەگەڵ خۆیدا بدوێت بکاتە ئەو بڕیارەی کە خۆی بدات بە دەستەوەو بێباوەڕی خۆی بەرامبەر خودا و پێغەمبەر و ئاینەکەی رابگەیەنێت..

ئەمجا (خوبەیب) بە ملکەچی و، هێمنی و و، خۆ بەکەمزانینەوە دوو رکات نوێژی کرد و.. شیرینی ئیمان لە گیانیدا سەرڕێژی دەکرد و، حەزی دەکرد کە هەر نوێژی بکردایەو، بەردەوام لە نوێژدا بوایە..

بەڵام ئاوڕی لە بکوژەکانی دایەوەو پێی وتن:

{سوێند بەخوا، گەر لەبەر ئەوە نەبوایە وابزانن ترس و بیمی مردنم هەیە، نوێژەکەم زیاتر درێژ دەکردەوە}..!!

پاشان هەردوو دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوەو، وتی:

{خودایە، یەك بەیەکیان بژمێرە و، بە کۆمەڵ بیانکوژە}

دواتر جەسورانە لە روخساریان راما و دەستی بە هۆنراوە وتن کرد:

ولست أبالي حين أقتل مسلماً على أيي جنب كان في الله مصرعي

وذلك في ذات الإله وإن يشأ يبارك على أوصال شلو ممزع

واتە: کە بە موسڵمانی دەکوژرێم، ئیدی بە هەرلایەکدا لەپێناوی خوادا بێت تیاچوونم، ئەمەش لە پێناوی خودایەکدا گەر بیەوێت، ئەو رێگەی خێرا دەکات کە نێچیر لە دەست راوچی رادەکات و پیرۆزی دەکات.

* * *

لەوانەیە کە ئەوە بۆ یەکەمجار بووبێت لە عەرەبدا پیاوێك لەخاچ بدەن و پاشان بەسەر خاچەکەوە دەیکوژن.. هاتن لە دا[illegible] [illegible]اچێکی گەورەیان ئامادە کرد و خوبەیبیان پێوە بەستەوەو.. هەرچوارپەلیا[illegible] دا و، بێباوەڕەکان بەشێوەیەکی زۆر کۆبوونەوەو.. تیرهاوێژەکانیش رمەکانیان تیژکر[illegible]

هەموو ئەو درندەیەتیە بەرانبەر ئەو پاڵەوانە لەخاچ دراوە بەهێواشی بەرێوە دەچوو..!!

چاوەکانی لێك نەنا و، سەبووریيە سەرسوڕهێنەرە پرشنگدارەکەی روخساری لانەچوو.

رمەکان بۆ هاویشتن ئامادەکران و، شمشێرەکانیش بۆ داڕنینی گ[illegible]تی.

ئا لێرەدا یەکێك لە سەرکردەکانی قورەیشی لێی نزیك بوویەوەو پ[illegible]ت:

{پێت خۆشە کە موحەممەد لە شوێنی تۆدا بوایەو، تۆش بە س[illegible] سەلامەتی لەنێو خاووخێزانتدا بویتایە}؟؟

لێرەدا و بەس، خوبەیب وەك رەشەبا بە گژ بکوژەکانیدا چوو و، هاواری کرد:

{سوێند بەخوا، پێم خۆش نیە من بە خۆشی و ئاسودەیی لەنێو ماڵ و منداڵ[illegible] ببم و درکێك بچێت بەپێی پێغەمبەری خوادا}..

هەمان ئەو وشە مەزنە بەرزانەی کە (زەیدی کوڕی دیسینە)ی هاوڕێی کردی لەکاتێکدا کە ئەوان بیریان لە کوشتنی دەکردەوە..!! هەمان ئەو وتە سەرنج راکێشە جوانە بەرزانەی کە دوێنێ زەید وتی و.. ئەمڕۆ خوبەیب دەیڵێت.. وای لە ئەبوسوفیان کرد کە هێشتا موسڵمان نەبووبوو، هەردوو دەستی بە توندی بدا بە یەکدا و بە رقەوە بڵێ:

{سوێند بەخوا هیچ کەسم نەدیوە کەسێکی دیکەی ئاوەها خۆش بوێت کە هاوەڵانی موحەممەد، موحەممەدیان خۆش دەوێت)...!!

* * *

ئەو وشانەی (خوبەیب) مۆڵەتدان بوو بە رم و شمشێرەکان کە مەبەستی خۆیان لە جەستەی بپێکن و، ئەوانیش سەرشێت و درندانە تێی بەربوون.

لە نزیکی ئەو دیمەنەش کۆمەڵێك باڵندەو هەڵۆ دەسوڕانەوە، وەك ئەوەی چاوەڕێی لێبوونەوەی قەسابەکان و رۆیشتنیان بکەن تا ئەوان لەو جەستەیە نزیك ببنەوە بیکەنە جەمێکی چەور..

بەڵام هەر زوو خێرا بانگ کران و کۆبوونەوەو، دەنووکەکانیان دا بە یەکدا وەك ئەوەی قسە لەگەڵ یەکدیدا بکەن و نهێنی بۆ یەك بدرکێنن.

جا لەناکاو فڕین و بەئاسماندا تێپەڕین و، دوور رۆیشتن ... دوور.. دوور.. وەك ئەوەی بە هەست و غەریزەی خۆیان بۆن وبەرامەی پیاوێکی چاکەکاری خۆڕاگریان کردبێت کە لە جەستە لەخاچدراوەکە دەهات، ئەوانیش شەرم گرتنی لەوەی نزیك ببنەوە لێی یان خراپەی بەرانبەر بکەن...!!

کۆمەڵە باڵندەکە بە پاکی و بەویژدانی بەرەو ئاسمانی بەرین فڕین..

دەستەی بێباوەڕ و ستەمکار و دەستدرێژیکەرەکانیش گەڕانەوە بۆ خانە پڕ لە رق و کینەکانیان لە مەککە.

(خوبەیب) ئەو کاتەی بەرزیان کردەوە بۆ سەر قەدی ئەو دارخورمایەی کە خاچەکەیان لێدروست کردبوو، کاتێك هەرچوار پەلیان بەست..

ئەو لەو ساتەدا، سیمای خۆی بەرەو ئاسمان کردبوو و پەنای بۆ پەروەردگاری مەزنی دەبرد و، دەیوت:

{خودایە ئێمە پەیامی پێغەمبەرەکەتمان گەیاند، تۆش ئەمڕۆ ئەوەی بەسەرمان دێنن پێی بگەیەنە}..

خوای گەورەش پاڕانەوەکەی گیرا کرد..

لەکاتێکدا کە پێغەمبەر لە مەدینە بوو، هەستێکی وا پتەو دایگرت کە هاوەڵانی لە ناڕەحەتیدان و.. جەستەی یەکێکیانی بە هەڵواسراوی هاتە پێش چاو..

دەست بەجێ بانگی میقدادی کوڕی عەمر و زوبەیری کوڕی عەوامی کرد و، بەسواری ئەسپەکانیانەوە کەوتنە رێ و، بەردەوام خێرا بەسەر زەیدا دەڕۆیشتن.

تا خوای گەورە گەیاندنیە جێگای مەبەست و، جەستەی خوبەیبی هاوەڵیان داگرت و، پارچەزەوییەکی بێگەردی زەوی چاوەڕوانی بو تا لەژێر خاکە شێدارەکەیدا لەخۆی بگرێت..

* * *

هەتا ئەمڕۆکەش هیچ کەس نازانێت گڵکۆی خوبەیب لە کوێدایە..

لەوانەیە ئەوە گونجاو و شایانتر بێت بۆی، هەتاوەکو بەردەوام شوێنکەی لە یادگەی مێژوودا بە پاڵەوانێتی و بەسەر خاچیشەوە لە ویژدانی ژیاندا بێت بمێنێتەوە..!!

## ۳۰

عومه یری کوړی سه عهد

جنداوی نه ځی خوی

ئەرێ (سەعیدی کوڕی عامر)تان لە یادە..؟؟

ئەو پیاوە دونیانەویستە خواپەرستە تۆبەکارەی کە ئەمیری باوەڕداران (عومەری کوڕی خطاب) بەزۆر رازی کرد تا ببێتە والی شام.

لە سەرەتای ئەم کتێبەماندا لە بارەیەوە دواین و، دونیانەویستی و بەرزێتی و، خۆپارێزی تەواو سەیری ئەومان بەدیکرد..

ئا ئێستاش ئەوەتا لەسەر رووپەڕی ئەم لاپەڕانەدا بە برایەکی ئەو شاد دەبین، نەک هەر برای، بەڵکو جمکی ئەو، لە خۆپارێزی و، دونیانەویستی و، بەرزێتی و... دەروونی بەرزێتیدا بە شێوەیەکی کەم وێنە دەدرەوشێتەوە..!!

ئەو کەسەش (عومەیری کوڕی سەعد)ە..

کە موسڵمانان نازناوی (چنراوی تەنها خۆی)یان لێنابوو!!

جا بەلاتەوە سەیر نەبێت کە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا یەکدەنگ بن لەسەر ئەوەی ئەو نازناوەی لێ بنرێت بەهۆی ئەو هەموو باشێتی و، تێگەیشتن و، رووناکییەی کە هەیان بوو..!!

سەعدی قورئانخوێنی باوکی ﷺ.. لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەشداری بەدر و غەزاکانی دیکەی کردبوو و بە ئەمەکداری لە سەر وادەو بەڵێنی خۆی مایەوە تا بە شەهیدی گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری لە جەنگی (قادسیە)دا.[1]

سەعد دەستی کوڕەکەی خۆی گرت و لەگەڵ خۆی بردیە خزمەت پێغەمبەر و، بەڵێنی دا بە پێغەمبەر و موسڵمان بوو.. لەو ساتەوەی (عومەیر) موسڵمان بوو، خواپەرستێکی دامەزراو بوو لە میحرابی خوای گەورەدا..

لە خۆدەرخستن هەڵدەهات و، هانای بۆ بەر سوکنایی سێبەری خوا دەبرد..

دووریت لەوەی کە بتوانی هەرگیز لە ریزەکانی پێشەوەدا بەدیت بکردایە، مەگەر لە نوێژدا، چونکە لەمەیاندا دەچووە ریزی یەکەم تا پاداشتی پێشکەوتوان بەدەست بهێنێ.. یان لە جیهاددا، ئەو بەراکردن دەچوویە ریزەکانی پێشەوە، بەو ئومێدەی کە لە پێڕی شەهیدان بێت..!

---

١ لە سیرەی ئیبن هیشام ئەو سەربردەیەی کە لەلاپەڕە (٥١٩)ی بەرگی یەکەمی چاپی (حلب)ی دووەمدا، وا خراوەتە روو کە باوکی عومەیر سەعدێکی دیکەیەو، بەر لە غەزای تەبووک کە هێشتا پێغەمبەر زیندوو بووە ئەو مردووە، بەڵام ابن سعد لە (الطبقات الکبری)دا-ج٤-لاپەڕە٣٢٤ چاپی بەیروتدا دەڵێت: ئەوە (سەعد القاریء)ە، ئێمەش ئەو بۆچوونەمان هەڵبژارد.

ئیدی جگە لەوە، ئەو لە خەڵوەتدا بوو لەگەڵ خۆیدا و، چاکەکاری و خێر و چاکسازی و تەقوای خۆی گەشە پێدەکرد..!!

تۆبەکار بوو، بۆ گوناهەکانی دەگریا..!!

داوێن پاك بوو، تۆبەکاری داوادەکرد.!!

لە گشت کات و جێگایەکدا، رێبوارێك بوو بەرەو لای خوا بەڕێوە بوو.

* * *

خودای گەورەش خۆشەویستی ئەوی خستبووە دڵی هاوەڵان و، مایەی چاو و دڵڕۆشنییا ن بوو.. چونکە بە تینی ئیمانەکەی و، بێگەردی دەروونی و هێوری رێگاکەی و بۆنخۆشی خەسڵەتەکانی و، درەوشانەوەی سیمای، هەموو ئەوانە وایان لێدەکرد کە مایەی شادی و رازانەوە بێت بۆ هەموو ئەوانەی لە تەکیدا دادەنیشتن، یان دەیانبینی و، هیچ کەس و شتێکی بەسەر ئاینەکەیدا زاڵ نەدەکرد.

رۆژێکیان گوێی لە (جولاسی کوڕی سوەیدی کوڕی صامت)ی خزمی بوو.. لە ماڵی خۆیان، وتی: (ئەگەر ئەو پیاوە راست بێت، ئەوا ئێمە لەکەر خراپترین)..!!

مەبەستی لەو پیاوەش پێغەمبەری خواﷺ بوو.

(جولاس)یش لەو کەسانە بوو کە لە ترساندا موسڵمان بووبوون.

(عومەیری کوڕی سەعد) ئەو دەستەواژەیەی بیست و، رق و سەرسامی لە دەروونی ئارام و هێوریدا تەقییەوە..

رق، چونکە یەکێك لەوانەی کە خۆی بە موسڵمان دادەنێت بەو شێوە ناشیرینە لەبارەی پێغەمبەرەوە دەدوێت..

سەرسام، چونکە بەرپرسیارێتی خۆی بەرامبەر ئەوەی گوێبیستی بوو بەخەیاڵیدا هات، پێی ناخۆش بوو..

ئەرێ ئەوەی بیستی بیگێڕێتەوە بۆ پێغەمبەری خوا؟؟

جا چۆن، لەکاتێکدا کە قسەی نێو مەجلیس سپاردەیە..؟

ئەی بێدەنگ بێت و ئەوە لە سنگی خۆیدا بپێچێتەوە..؟؟

بەڵام چۆن..؟؟

ئەی ئەمەك و خۆشەویستی و پشتیوانیەکەی بەرانبەر ئەو پێغەمبەرە کامەیە کە لە تاریکی دەربازی کردن و، بەرەو رووناکی هێنان..؟

بەڵام سەرسامیەکەی درێژەی نەکێشا و، بڕواهێنان بەوەی بە دەروونڈا بێتن هەمیشە دەروازە بۆ خاوەنەکەی دەبینێتەوە..

هەر بۆیە دەست بەجێ (عومەیر) وەك پیاوێکی بەهێز و، بڕوادارێکی بەتەقوا هەڵس وکەوتی کرد.. ڕووی دەمی کردە (جولاسی کوڕی سوەید):

{ئەی جولاس، سوێند بەخوا تۆ لە خەڵکی خۆشەویستری لەلام و، لە هەموو کەسیش باشتر بووی بۆم و، لە گشتیان ئازیزتری لام کە توشی ناخۆشییەك بیت..

ئێستاش قسەیەکت کرد، گەر بڵاوی بکەمەوە زیانت پێدەگات.. گەر بێدەنگ بم لەسەری، ئەوا ئاینەکەم لەدەست دەردەچێت و، مافی ئاینیش لەپێشترە لە ئەمەك و، من ئەوەی کە وتت دەیگەیەنم بە پێغەمبەری خوا}..!

جا (عومەیر) بە تەواوی ویژدانی پارێزکاری خۆی رازی کرد.

چونکە ئەو–یەکەمجار– مافی تەواوەی سپاردەیەتی مەجلیسەکەی دا و، بەهۆی دەروون بەرزیەکەیەوە خۆی لەوە دوورگرت کە هەستێت بە ڕۆڵی قسەهێنەر و قسەبەر..

دووەم جار ئەو مافی تەواوی ئاینەکەی دا و، پەردەی لەسەر دووڕووییەکی گومان لێکراو هەڵدایەوە.

سێ یەم جاریش دەرفەتی پاشگەزبونەوە لەو هەڵەیە و داوای لێخۆشبوون کردن لەخوای دا بە جولاس، کاتێك ڕاستەوخۆ پێی ڕاگەیاند کە بە پێغەمبەری خوای دەگەیەنێت، خۆ گەر ئەو لەوێدا وەهای بکردایە، ئەوا ویژدانی (عومەیر) ئاسوودە دەبوو، هیچ پێویستی بەوە نەبوو کە بە پێغەمبەریﷺ رابگەیەنێت..

بەڵام جولاس هەستی خۆزلکردن و سوربوون لەسەر خراپە دایگرت و، هیچ وشەیەکی پۆزش و لێبوردن خوازی لە زاری نەهاتە دەر، ئەمجا عومەیر بەجێی هێشت و پێی وت:

{بەپێغەمبەری خودای رادەگەیەنم بەر لەوەی نیگا بێتە خوارێ و بەهۆی ئەو گوناهەی تۆوە بە هاوەڵپەرستم دابنێ}..

ئەمجا پێغەمبەری خواﷺ ناردی بە شوێن جولاسدا و بانگی کرد، کە هات دەیوت شتی وام نەوتووە، بگرە سوێندی درۆشی خوارد بەخوا..!!

بەڵام ئایەتی قورئان هاتە خوارێ و رەوا و ناڕەوای لە یەك جودا کردەوە:

﴿يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ مَا قَالُوا وَلَقَدْ قَالُوا كَلِمَةَ الْكُفْرِ وَكَفَرُوا بَعْدَ إِسْلَامِهِمْ وَهَمُّوا بِمَا لَمْ يَنَالُوا وَمَا نَقَمُوا إِلَّا أَنْ أَغْنَاهُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ مِنْ فَضْلِهِ فَإِنْ يَتُوبُوا يَكُ خَيْرًا لَهُمْ وَإِنْ يَتَوَلَّوْا يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَمَا لَهُمْ فِي الْأَرْضِ مِنْ وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ واتە: سوێند بە خودا دەخۆن کە ئەوەیان نەدرکاندووە، کەچی قسەی خوانەناسانەیان کرد، دیارە لەپاش موسڵمان بوون لەدین پەشیوان بوونەوە، ویستیان شتێ بکەن کە نەیانتوانی پێکی بێنن، هەر بۆیەش رکیان بۆتەوە کە خودا و پێغەمبەری خودا بەو چاکەی دەگەڵی کردوون، ناگزووری بۆ نەهێشتوون. ئەگەر پەشیمان ببنەوە، هەر بە قازانجی خۆیانە و، ئەگەر هەر ڕوویان وەرگێڕا، خودا لەم دنیا و لەو

دنیا ئازاری بەژانیان دەدا و، لەم زەوییەدا نە کەس دۆستایەتیان دەکا و، نە یاوەریان دەست دەکەوێت﴾التوبة/٧٤.

(جولاس) ناچار بوو دان بە قسەکەی دابنێ و لە گوناهو هەڵەکەی پەشیمان ببێتەوە، بە تایبەتی لەو کاتەی کە بینی ئایەتە پیرۆزەکە هەڕەشە و گوڕەشەی لێدەکات و لە هەمان کاتیشدا بەڵێن و وادەی بەزەیی و ڕەحمەتی خوای پێ دەدات گەر تۆبە بکا و خۆی لە گوناه داماڵێ، (فإن يتوبوا يكُ خيراً لَهُمْ: ئەگەر پەشیمان ببنەوە، هەر بە قازانجی خۆیانە).

ئەو هەڵس وکەوتەی عومەیریش خێر و بەرەکەت بوو بۆ جولاس، ئەوەبوو تەوبەی کرد و ئیسلامەتی خۆی جوانتر کرد..

پێغەمبەریشﷺ گوێی عومەیر)ی گرت و لە ستایشی ئەو کارەیدا فەرمووی:

{ئەی گەنج...

گوێیەکانت ئەمەکدار بوون...

پەروەردگاریشت بە ڕاستگۆی دانایت}.!!

* * *

لەراستیدا بۆ یەکەم جار بەر لەچوار ساڵ، ئەو کاتەی کە پەرتووکی (بين يدى عمر)م دەنووسی، بە دیداری (عومەیر) خۆشحاڵ بووم..

بەجۆرێ سەرسام بووم کە هیچ شتێك بەو جۆرە سەرسامی نەکردبووم، وەك بەسەرهاتی ئەو لەگەڵ ئەمیری باوەڕداراندا.. ئەو بەسەرهاتەی کە ئێستا بۆتانی دەگێڕمەوە، تا لە ڕێیەوە ئەوپەڕی مەزنێتیتان بۆ دەربکەوێت.

* * *

خۆتان دەزانن کە ئەمیری باوەڕداران (عومەر)ﷺ وەك ئەوەی قەدەرەکەی هەڵبژێرێت ئاوەها والیەکانی هەڵدەبژارد..!!

لەنێو دونانەویست و پارێزکار و، دەستپاکە ڕاستگۆکاندا هەڵیدەبژاردن.. ئەوانەی کە لە والیێتی و ئەمیرایەتی هەڵدەهاتن و، پێی ڕازی نەدەبوون مەگەر ئەو کاتە ڕازی ببونایە کە ئەمیری باوەڕداران زۆری لێبکردنایە..

سەرەڕای ئەوپەرچاوروونییە تیژەو، شارەزاییە هەمەلایەنییە، زۆر بیری دەکردەوەو، ورد دەبوویەوە لە هەڵبژاردنی والی و بریکارەکانیدا و..

بەردەوام ئەو دەستەواژە هەمیشەییەی دووبارە دەکردەوە.

{پیاوێکم دەوێت کە لەناو هۆزەکەیدایە و، ئەمیریان نیە وەك ئەمیریان بێت وا دیاربێت.. کاتێکیش لەنێویاندایە وئەمیریانە، وەك ئەوەی کەسێکی ئاسایی نێوانیان بێت وا دەربکەوێت..!!

والییەکم دەوێت، خۆی لە کالا و، خواردن و، خانو و ماڵدا لە خەڵکی جودا نەکاتەوە..

نوێژیان لە نێودا بکات و... داتوەرانە شت لە نێوانیاندا بەش بکات و.. دادگەرانە فەرمانڕەواییان بکات و... دەرگاکەیشی بەرووی پێویستیەکانیاندا دانەخات}.

لەبەر ڕۆشنایی ئەو پێودانگە توندوتیژانەدا ڕۆژێکیان (عومەیری کوڕی سەعد)ی هەڵبژارد و کردی بە وای (حومص)..

عومەیر هەوڵی دا کە خۆی لەو کارە دەرباز بکات و رزگاری ببێت، بەڵام ئەمیری باوەڕداران سەپاندی بەسەریدا..

عومەیر ئیستخارەی کرد و، بەرەو ئەرك و کارەکەی کەوتە رێ..

لە شاری (حومص)، ساڵێکی تەواوی بەسەردا رابورد، هیچ خەراجێکی لێوە نەهات بۆ مەدینە.. بگرە هیچ نامەیەکیشی لێوە نەگەیشتە ئەمیری باوەڕدارانﷺ...

عومەر بانگی نوسیارەکەی کرد و، پێی وت:

{نامە بۆ عومەیر بنووسە، تا بێت بۆ لامان}..

ئا لێرەدا مۆڵەتتان لێدەخوازم تا وێنەی ئەو بەیەك گەیشتنەی عومەر و عومەیر وەك خۆی لە پەرتوکی (بین یدی عمر)دا هاتووە بخەمە روو بۆتان.

((ڕۆژێکیان شەقامەکانی مەدینە پیاوێکی قژگژی تۆزاوی بەخۆوە دی، ماندوویەتی سەفەری پێوە دیاربوو، وەخت بوو هەنگاوی بۆ نەنرێت بەهۆی ئەو ماندویەتیە زۆرەو، ئەو هیلاکیەی تووشی ببووبوو..

توورەکەیەکی پشت و راخەرێك بەسەر شانی راستیەوە بوو..

گۆزەیەکی بچوکی ئاویشی بەسەر شانی چەپیەوە بوو..!

خۆی دابوو بەسەر گۆچانەکەیدا و، کۆڵە سوك و بێکێشەکەی بەوە گرنگ نەبوو..!!

هێور هێور بەرەو کۆڕ و دانیشتنی عومەر هەنگاوی دەنا..

– سڵاوت لێبێت ئەی ئەمیری باوەڕداران..

عومەریش وەڵامی سڵاوەکەی دایەوەو، ئەو ماندویەتی و کۆششەی ناڕەحەت بوو، لێی پرسی:

– ئەوە چیتە عومەیر..؟؟

– ئەوەمە کە دەیبینی.. نابینی لاشەم رێك و راستە و، خوێنم بێگەردە و، دونیام پێیە و بە شاخەکانی رایدەکێشم..؟؟!!

عومەر وتی: چیت پێیە..؟؟

عومەیر وتی: هەگبەم پێیە و توێشووی خۆمی تێدا هەڵدەگرم..

دەفرێکیشم کە خواردنی تێدا دەخۆم و.. گۆزەیەکیشم کە ئاوی دەستنوێژ گرتن و خواردنەوەی تێدا هەڵدەگرم و.. گۆچانێکیشم کە پێی دەڕۆم و، بەرپەرچی هەر دوژمنێکی پێدەدەمەوە کە بێتە رێم..

جا سوێند بەخوا دونیا تەنها شوێنکەوتەی شت و مەکەکانمە..!!

عومەر وتی: بەپێ هاتوویت..

عومەیر: وتی: بەڵێ..

عومەر: کەسێکت نەدۆزیەوە وڵاخێکت بداتێ پێی بڕۆیت..؟

عومەیر: ئەوان قسەیان نەکرد و.. منیش داوام نەکرد..

عومەر: ئەی چیت کردووە لەوەی داومانەتە دەستت..؟؟

عومەیر: چومە ئەو وڵاتەی رەوانە کردم، پیاوچاکانیم کۆکردەوە و، ئەرکی کۆکردنەوەی سەرانە و سامانیانم دایە دەستیان، هەتا کۆیان کردەوە لە شوێنی خۆیدا دامنا.. گەر هیچ شتێکی بۆ تۆ تێدا بمایا بۆم دەهێنایت..!!

عومەر: خۆ هیچت بۆ نەهێناوین..؟

عومەیر: نەخێر..

ئەمجا عومەر بە سەرسامی و بەختەوەرییەوە هاواری کرد:

– بەڵێن بۆ عومەیر تازە بکەنەوە..

عومەیریش بە لەخۆبردنێکی مەزنەوە وەڵامی دایەوە:

–ئەو رۆژانە بەسەر چوون.. ئیدی نە بۆ تۆ و، نە بۆ هیچ کەسێکی دیکەی دوای تۆ کار ناکەم..!!

ئەم دیمەنە (سیناریۆ)یەك نیە وێنەی بکێشین، گفتوگۆیەك نیە دروستی بکەین.. بەڵکو رووداوێکی مێژووییە،[1] خاکی مەدینەی پایتەختی ئیسلام رۆژێك لە رۆژانی جاویدانی و مەزنیی بەخۆیەوە بینیووە.

جا چ پێرێك بوون لە پیاوان ئەو مەردە پایەبەرزانە..؟!!

* * *

---

١ لە کتێبی (حلیة الأولیاء) ج١، کە یەکێکە لەوسەرچاوانەی کە لە پێشەکی ئەم کتێبەدا دامان ناون و پشتمان پێبەستوون، ئەم رووداوەی تێدا خراوەتە روو.

عومەرﷺ ئاوتی دەخواست و دەیوت:

{ئاواتەخوازم کە چەند پیاوێکی وەك عومەیرم هەبوایە تا بۆ کاروباری موسڵمانان پشتم پێ ببەستایە}..

لەبەرە ئەوەی عومەیر کە هاوەڵەکانی بەراستی پیایاندا هەڵداوە (چنراوی تەنها خۆی بوو) بەسەر هەموو لاوازییەکی مرۆڤدا زاڵ بوویوو کە بوونی ماندیمان و، ژیانی گوماناویمان دروستی دەکات..

ئەو رۆژەی کە لەسەر ئەم خواپەرستە مەزنە نوسرابوو کە بە ئەزموونی والییەتی و فەرمانڕەوایی تێپەڕێت، خۆپارێزییەکەی تەنها روناکی و گەشە و دروشانەوەی زیاد کرد..

ئەو لە کاتێکدا کە فەرمانڕەوای (حومص) بوو، ئەرکەکانی فەرمانڕەوای موسڵمانی لەچەند وشەیەکدا وێنە کێشا، کە هەمیشە لەسەر دوانگە دەیدا بەگوێی کۆمەڵی موسڵماناندا.

ئەویش ئەوەیە کە:

{ئیسلام دیوارێکی بەرگریکارە و، دەرگایەکی پتەوە

دیواری ئیسلامیش دادگەرییە و، هەقیش دەروازەکەیەتی.

خۆ گەر دیوارەکە کەلەبەری تێکەوت و، دەروازەکەی شکا، ئەوا ئیسلام دادەگیرێت..

هەتا ئێستاش ئیسلام بە بەرگریکاری ماوەتەوە تا دەسەڵاتداری توند بێت

توندێتی دەستەڵاتداریش کوشتن بە شمشێر و، لێدان بە قامچی نیە..

بەڵکوقازییەتی کردنیانە بە هەق و، وەرگرتنە لێیان بە دادگەرانە}..!!

ئائێستاش کە ئێمە ماڵئاوایی لە عومەیر دەکەین و.. بە بەرزی و ملکەچیەوە سڵاوی لێدەکەین، وەرن با سەرمان و نێوچەوانمان دابنەوێنین:

بۆ چاکترین مامۆستا" موحەممەد..

بۆ پێشەوای تەقواکاران" موحەممەد..

بۆ بەزەیی خوا کە پێشکەشی خەڵکی کردووە تا ژیان ماوە.

درود و سڵاو و، بەرەکەتی خودای لەسەر بێت..

سڵاو لە خانەوادەی بێگەردی بێت...

سڵاو لە سەر هەموو هاوەڵانی چاکەکاری بێت..

گەر قورئانت بە دەستی ڕاستت گرت و، سەرنجت دا و، بەجوانی و سورەت دوای سورەت، ئایەت لەدوای ئایەت بەنێو باخە پڕ بەرووبوومەکانیدا ڕۆشتیت، بزانە لەنێو ئەو کەسانەی کە پێویست دەکات سوپاس و پێزانینتانی ئاراستە بکەیت لەسەر ئەو کارە مەزنە، پیاوێکی گەورە هەیە ناوی (زەیدی کوڕی سابیت)ە..!!

ڕوودلوەکانی کۆکردنەوەی قورئان کە دێتە باسکردن، لە گەڵیشیدا باسی ئەم هاوەڵە پایە بەرزە دەکرێت..

ئەو ساتەیشی گوڵبارانی سەر ئەو کەسانە دەکرێت چاکەی کۆکردنەوەی قورئان و ڕیزبەندی و لەبەرکردن بۆ ئەوان دەگەڕێتەوە، پشکی (زەیدی کوڕی سابیت) لەم گوڵبارانەدا زۆر مەزنە..

* * *

ئەو یەکێکە لە ئەنصارییەکانی مەدینە..

تەمەنیشی ئەو کاتەی پێغەمبەری خواﷺ کۆچیکرد بۆ مەدینە، یازدە ساڵ بوو، جا ئەو منداڵە بچوکە لەگەڵ موسڵمانانی دیکەی خاوخێزانیدا موسڵمان بوو و، پیت و فەڕی نزایەکی پێغەمبەر ڕژا بەسەریدا..

باوك و خزمانیشی لە غەزای (بەدر)دا هێنایان لەگەڵ خۆیان، بەڵام پێغەمبەر بەهۆی کەمی تەمەن و بچوکی جەستەیەوە گێڕایەوە..

لە غەزای (ئوحود)یشدا هاوڕێ لەگەڵ چەند هاوتەمەنێکی خۆیدا چوونە خزمەت پێغەمبەر پێداگرتنی خۆیان لەسەر بەشداریکردن پێگەیاند تا لە هەر جێگایەکی نێو ڕیزی موجاهیداندا بێت وەریان بگرێت..

خزم و کەس و کارەکانیشیان لە خۆیان زیاتر پێیان دادەگرت و تکایان دەکرد و سووربوون لەسەر ئەو داوایە..

پێغەمبەر سەرنجێکی سوپاسگوزارانەی ئەو سوارچاکە بچووکانەی دا و، وا دیار بوو کە لەم غەزایەشدا بەهانە بۆ ڕێگەنەدانیان لە بەشداریکردن دەهێنێتەوە.

بەڵام یەکێکیان، کە(ڕافیعی کوڕی خەدیج) بوو، چوویە بەردەمی پێغەمبەری خـــواﷺ حەربەیەکی هەڵگرتبوو و بەدەستی ڕاستی بەشێوەیەکی جوان دەیجوڵاند و بە پێغەمبەری ﷺ وت:

{من وەك دەبینیت ڕم هاوێژم و، ڕم هاوێژی بەچاکی شارەزام، مۆڵەتم بدە بەشدار بم}..

جا پێغەمبەر دەستخۆشی ئەو پاڵەوانێتیە تازەپێگەیشتووە، جوانەی، بە زەردەخەنەیەکی ڕازیبوون لێ کرد و، پاشان مۆڵەتی پێدا..

هاوتەمەنەکانی هێندەی تر ورووژان.

ئەمجا نووەمیان هاتە پێشەوە، کە (سەمرەی کوڕی جوندب) بوو و، بە ئەدەبەوە دەستی کرد بە هەڵکردنی دەستە بەهێزەکانی و، هەندێك لە کەس و کارەکەی بە پێغەمبەریان وت:

{سەمرە زۆران بازی لەگەڵ رافع دەکات}..

پێغەمبەریش بە زەردەخەنەیەکی بەسۆز دەستخۆشی لێکرد و مۆڵەتی دا..

تەمەنی هەریەك لە (رافیع) و (سەمرە) گەیشتبووە پازدە ساڵ و، لەپاڵ گەشەی بەهێزی جەستەیاندا.

لە هاوتەمەنەکان تەنها شەش بێچووە شێر مابونەوە، لەوانە (زەیدی کوڕی سابیت) و (عبداللەی کوڕی عومەر)..

ئەمانیش دەستیاندا هەوڵ و کۆشش، جارێ بە تکا و پاڕانەوە، جارێ بە فرمێسك و گریان، جارجارێکیش بە نیشاندانی هێزی بازوویان.

بەڵام تەمەنیان بچووك و، جەستەیان هەڵ و، پێغەمبەر وادەی بەشداریکردنی غەزای داهاتووی پێدان..

بەم جۆرە (زەید) لەتەك براکانیدا رۆڵی و رێك لەپێناوی خوادا، ساڵی پێنجی کۆچی و لە غەزای (خەندەق)دا دەستی پێکرد..

کەسێتی موسڵمانی بڕواداری ئەو بە شێوەیەکی خێرا و لەبەرچاو گەشەی دەکرد و، تەنها وەك موجاهیدێك دەرنەکەوت و بەس، بەڵکو وەك رۆشن بیرێکی هەمەلایەن و، ئەوەبوو قورئانی لەبەر دەکرد و، نیگای پێغەمبەری دەنووسییەوەو، باڵادەست بوو لە زانین و داناییدا و، ئەو ساتەیشی پێغەمبەر راگەیاندنی ئایینەکەی بە تێکڕای جیهانی دەرەوە دەست پێکرد و، نامەی بۆ پادشا و قەیسەرەکانی سەر زەوی نارد، فەرمانی بە زەید کرد ـ ێری هەندێك لە زمانەکانیان ببێت، ئەویش لە ماوەیەکی کەمدا فێری بوو..

بەم شێوەیە کەسێتی (زەید) دەرکەوت و جێگایەکی بڵندی لەنێو کۆمەڵگای نویدا گرت و، بوویە مایەی رێز و ستایشی موسڵمانان.

(شەعبی) دەڵێت:

{(زەیدی کوڕی سابیت) چوو سواری وڵاخەکەی بێت، (ئیبن عەباس) وڵاخەکەی بۆ گرت، (زەید) پێی وت: وازی لێبێنە ئەی ئامۆزای پێغەمبەری خوا.. (ئیبن عەباس) لە وەڵامیدا وتی: نەخێر، دەبێت ئاوەها بین بەرانبەر زاناکانمان}..

(قەبیصە)ش دەڵێت:

{(زەید) سەردەستەی دادوەوی و، فەتواو، خوێندنەوەی قورئان و زانستی دابەشکردنی میرات بوو لە مەدینەدا} ..

(سابیتی کوڕی عوبەید)یش دەڵێت:

{هیچ پیاوێکم نەدیوە لەماڵەکەی خۆیدا هێندەی زەید زمان شیرین و، لە کۆڕ و دانیشتندا ڕێزدار بێت} ..

(ئیبن عەباس)یش دەڵێت:

{ئەو هاوەڵانەی پێغەمبەر کە قورئانیان لەبەر کردبوو دەیانزانی کە (زەیدی کوڕی سابیت لەو کەسانەیە کە زۆر شارەزان لە زانست و زانیاریدا} ..

ئەو پیاهەڵدانانەی کە هاوەڵانی لە بارەیەوە دەیڵێن زیاتر ئاشنای ئەو پیاوەمان دەکات کە قەدەر ڕێزی چالاکیەکی لە بەبەهاترین چالاکیەکانی هەموو مێژووی ئیسلامی لەخۆگرتووە بۆی.. کە ئەویش کۆکردنەوەی قورئانە.

* * *

لەو ساتەوە نیگا بەرەو دڵی پێغەمبەر ڕێی خۆی گرتەبەر تا ببێـە یەکێك لە ڕێنیشاندەران، کەژاوەی قورئان و بانگەوازەکەیشی بەم ئایەتە جوانانە دەست پێکرد:

﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ، خَلَقَ الإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ، اقْرَأْ وَرَبُّكَ الأَكْرَمُ، الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ، عَلَّمَ الإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾العلق/١-٥.

ئا لەو دەستپێکەوە، کە نیگا دەهات بۆ پێغەمبەرﷺ، هەرکە ڕووی دەکردە لای خودا ڕووناکی و ڕێنوێنی دەخواست.

لە میانەی هەموو ساڵەکانی پەیامەکەدا،کاتێك کە پێغەمبەر لە غەزایەك دەبوویەوە، تا دەست بە یەکێکی دیکە بکات و... ئەو دەمەی فرت و فێڵ و جەنگی تێك دەشکاند، تا ڕووبەڕووی نەیارەکانی دیکەی ببێتەوە و... جیهانێکی نوێ بونیات بنێ بەوپەڕی لێبڕانەوە..

نیگای بۆ دەهاتە خوارێ و، پێغەمبەر دەیخوێندەوەو، رایدەگەیاند، ئا لێرەدا دەستەیەکی پیرۆز سووربوونیان لەسەر قورئان هەر لە سەرەتاوە جولا و، هەندێکیان دەستیان دایە لەبەرکرنی بەپێی توانا، هەندێکی دیکەشیان کە نووسین شارەزا بوون، ئایەتەکانیان بە نووسراوی دەپاراست..

لە ماوەی نزیکەی بیست و یەك ساڵدا، قورئانی پیرۆز ئایەت ئایەت، یان چەندین ئایەت لەدوای چەندین ئایەت هاتە خوارێ و، بەپێی بۆنەی هاتنەخوارەوەو هۆکارەکانی و، ئەو قورئان لەبەر کارانە و ، تۆمارکارانەش، بە پشتیوانی خودای باڵادەست، کاری خۆیانیان رادەپەڕاند..

قورئانی پیرۆزیش بە تەنها جارێك پێکەوە هەرهەمووی نەهاتە خوارێ، چونکە پەرتوکێکی دانراو، یان بابەتێك نیە.

بەڵگە و رێنیشاندەری (نەوەیەکی نوێ)یە و بەپێی سروشتی بونیات دەنرێت، خشت لەدوای خشت و، رۆژ لەدوای رۆژ، بیروباوەڕەکەی رادەبوو و، دڵ و فیکر و ویستی بەپێی ویستی خودا پێکدەهات و، بە کەم و کورتیەوە خۆی ناسەپێنێ، بەڵکو ئەزموونی مرۆیی ئەم ئوممەتە بە رێگای متمانەبوونی تەواو بەو ویستە خوداییە بەرێوە دەبات.

پاشان دەبوو قورئان پارچە پارچە و بەش بەش بێتە خوارێ، تا چاودێری ئەو ئەزموونە بە پێی رەوتی گەشەسەندوو، هەڵوێستە نوێیەکانی و، ئەو گرفتانەی دێنە رێی بکات.[1]

قورئان لەبەرکاران و نووسەرانی ئامادەبوون، هەروەك پێشتر باسمان کرد-بۆ لەبەرکردنی قورئان و نووسینەوەی- لە سەرووی هەموویانەوە (عەلی کوڕی ابوطالب) و، (ئوبەی کوڕی کەعب) و، (عبداللەی کوڕی مەسعود) و، (عبداللەی کوڕی عەباس) و، خاوەنی ئەو کەسێتیە پایە بڵندەش کە ئێستا لێی دەدوێین: (زەیدی کوڕی سابیت) بوو رەزای خودا لە هەموویان بێت..

* * *

پاش ئەوەی قورئان هاتە خوارەوە و، لە ماوەی کۆتایی هاتنەخوارەوەیدا، پێغەمبەر سورەت و ئایەتەکانی بە ریزکراوی دەخوێندەوە بۆ موسڵمانەکان.

دوای وەفاتی پێغەمبەریش ﷺ، موسڵمانان یەکسەر سەرقاڵ بوون بە شەڕ لە دژی هەڵگەڕاوەکان.. لە جەنگی (یەمامە)شدا.. کە پێشتر لە کاتی قسەکردنمان دەربارەی (خالیدی کوڕی وەلید) و (زەیدی کوڕی خطاب) لێی دواین، ژمارەی ئەو قورئان لەبەرانەی کە شەهیدبون زۆر زۆر و کاریگەر بوو..هەر کە ئاگری هەڵگەڕاوەکان خامۆش بوو و دامرکایەوە، (عومەر) خێرا چوویە لای (ئەبوبەکری صدیق) رضي الله عنه تاوەکو سوور بن لەسەر ئەوەی کەبە پەلە (قورئان کۆبکەنەوە) بەر لەوەی قورئان لەبەرکارەکانی دیکەش مردن و شەهیدبوونیان پێ بگات.

ئەمجا خەلیفەی ئیستخارەی بە پەروەردگاری کرد و.. راوێژی لە هاوەڵەکانی کرد و.. بانگی (زەیدی کوڕی سابیت)ی کردو و پێی وت:

{تۆ گەنجێکی ژیریت و تۆمەتێکت نادەینە پاڵ}..

پاشان فەرمانی پێکرد کە دەست بکات بە کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز و، سوودمەند بێت لە کەسانی خاوەن ئەزموونی ئەو بوارە..

(زەید)یش هەستا بە ئەنجامدانی ئەو کارەی کە چارەنووسی تێکڕای ئیسلام وەك ئاینێك لەسەری وەستاوە..!

---

١ بڕوانە کتێبی (كما تحدث القرآن)

لە ئەنجامدانی ئەم کارەشدا کە سەختترین و مەزنترین کارە تووشی ناڕەحەتی زۆر بوو، بەردەوام خەریکی کۆکردنەوەی ئایەت و سورەتەکان بوو لە دەمی ئەوانەی کە لەبەریان بوو، بەپێی پێگەی شوێنی نووسینیان و، بەراوردکردنیان، بەرهەڵستی دەکرا و دڵی دەشکا، تاوەکو قورئانی بە ڕێککراوی و گونجاوی کۆکردەوە..

هەموو ئەو هاوەڵانەی پێغەمبەریش کە لەگەڵ پێغەمبەردا ژیابوون و لە پێغەمبەریانەوەﷺ گوێبیستی بووبوون لە ماوەی تێکڕای ساڵانی هاتنەخوارەوەی قورئاندا کارەکەیان بێ هەڵە دایە قەڵەم؟، بە تایبەت زانایان و قورئان لەبەرکاران و نووسەرانیان..

زەید لە کاتێکدا وێنەی ئەو سەختیە زۆر گەورەیە دەکێشێت کە پیرۆز و پایەدارە، کارەکەی دروست کرد، دەڵێت:

{سوێند بەخوا، گەر داوای گوێزانەوەی شاخێکیان لێبکردمایە لە جێگای خۆی، ئەوا ساناتر بوو لام لەوەی کە فەرمانی کۆکردنەوەی قورئانیان پێکردم}..!!

بەڵێ...

(زەید) گەر شاخێك، یان چەند شاخێك لەسەر شانی هەڵبگرێت، دەروونی ئاسوودەترە پێی لەوەی کە بچوکترین هەڵە بکات لە گواستنەوەی ئایەتێك یان تەواوکردنی سورەتێکدا..

ویژدان و ئایینی لە ئاست هەموو سەختی و ناڕەحەتیەکدا خۆڕاگرە.. جگە لەو جۆرە با کەم و بێ مەبەستیش بێت.

بەڵام ئەو پشتیوانی خوا و، ئەو وادە و بەڵێنەی لەگەڵدابوو کە دەفەرموێت:

﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ: بەخۆمان ئەم قورئانەمان ناردۆتە خوار و، هەر خۆشمان دەیپارێزین.﴾الحجر/٩.

ئەوەبوو لە کارەکەیدا سەرکەوتوو بوو، بە جوانترین شێوە ئەرك و بەرپرسیارێتیەکەی سەرشانی ئەنجام دا.

* * *

ئەوەش قۆناغی یەکەمی کۆکردنەوەی قورئان بوو..

کە ئەمجارە بە نووسراوی لە چەند پەڕاوێکدا کۆکرایەوە...

هەرچەندە کە دەرکەوتەی جیاوازی لەنێوان ئەو پەڕاوانەدا روخساری بوو، ئەزموونەکەی بۆ سەلماندنی هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ کە پێویستە هەموویان لە یەك پەڕاودا کۆبکەنەوە.

ئەوەبوو لە سەردەمی جێنشینایەتی (عوسمان)دا، لەکاتێکدا کە موسڵمانەکان بەردەوام بوون لەسەر رزگارکردن و شاڵاوەکانیان و، لە شاری مەدینە دوور بوون و، لە غەریبایەتیدا بوون..

تا لەو رۆژانەدا، لە کاتێکدا کە ئیسلام هەر رۆژە و دەستە لە دوای دەستە پێشوازی لەوانە دەکرد کە موسڵمان دەبوون و، پەیمان و بەڵێنیان دەدا، مەترسی فرەپەڕاوی دەرکەوت کاتێك جیاوازی لە خوێندنەوەی قورئاندا کەوتە روو، هەتا لە نێوان هاوەڵانی زوو موسڵمان بوو و ئەوانەی سەرەتادا..

لێرەدا دەستەیەك لە هاوەڵانﷺ لە سەرووی هەموویانەوە (حوزەیفەی کوڕی یەمان) هاتنە خزمەت خەلیفە(عوسمان) و پێداویستی یەکخستنی پەڕاوەکانیان خستە روو بۆی...

خەلیفەش ئیستخارەی بە پەروەردگاری کرد و راوێژی لەگەڵ هاوەڵانیدا کرد..

هەروەك چۆن پێشتر (ئەبوبەکری صدیق) پشتی بە (زەیدی کوڕی سابیت) بەست، (عوسمان)یش بە هەمان شێوە پشتی پێ بەست..

(زەید)یش هاوەڵ و دۆستەکانی کۆکردەوە و، پەڕاوەکانیان لە ماڵی (حەفصەی کچی عومەر) هێنا کە لای ئەو پارێزراو بوو، ئەمجا (زەید) و هاوەڵەکانی دەست بەکاربوون بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە مەزن و بەرزەیان..

هەموو ئەوانەشی هاریکاری (زەید)یان دەکرد لە نووسەرانی (نیگا) و، ئەو کەسانە بوون کە قورئانیان لەبەرە..

لەگەڵ ئەوەشدا هەرکە جیاڕابوونایە–زۆرکەمیش جیاڕادەبوون– خێرا بیروبۆچوونی (زەید) و قسەی (زەید)یان دەکردە پاساو و بەڵگە و یەکلاکەرەوە.

* * *

ئائێستاش کە ئێمە قورئانی پیرۆز بە ئاسانی دەخوێنینەوە.. یان بە خوێندنەوەی گوێبیست دەبین.. ئەوا ئەو سەختی و نەهامەتیە زۆرانەی کە ئەوانەی خوای گەورە فەرامەمی هێنان بۆ کۆکردنەوەو لەبەرکردنی نایەت بە خەیاڵماندا..!!

بە تەواوی، هەروەك ئەو ناڕەحەتیانەی چەشتیان و، ئەو گیانانەی بەخشیان، لە کاتێکدا کە جیهادیان دەکرد لە پێناوی خوا، تا ئاینێکی بەتین لەسەر زەوی بڕیار بدرێت و، تاریکاییەکانی سەر زەوی بە رۆشنایی ئەو ئاینە رابماڵن..

* * *

لە ماڵێکی پڕ ناز و نیعمەت و، رازاوە بە سەروەریی و، لە باوکێك کە لە نێو قورەیشدا پێشەنگی سەرۆکایەتی بەشی بوو، (خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص) لە دایك بوو خۆ گەر مەبەستتان بوو زیاتر ئاشنای رەچەڵەکی ببن ئەوا بڵێن: کوڕی ئومەیەی، کوڕی عەبدولشەمسی، کوڕی عەبدولمەناف..

ئەو رۆژەی تیرۆژەکانی روناکی لە گشت لایەکی مەککەدا بە شەرمەوە دەڕۆیشت و، دەدوا کە (موحەممەدی ئەمین) لەبارەی نیگاوە دەدوێت کە لە ئەشکەوتی (حراء)دا بۆی هاتووەو، لەبارەی پەیامێکەوە کە لە پەروەردگارەوە بۆی هاتووە تا بیگەیەنێت بە بەندەکانی، لەو ساتەدا دڵی (خالید) گوێی بۆ ئەو رۆشناییە هەڵخستبوو و بووبووە شاهید..!!

دەروونی لە خۆشیاندا لە شەقەی باڵی دەدا، وەك ئەوەی لەگەڵ ئەم پەیمانەدا وادە و ژوانی هەبێت و.. دەستی کردبوو بە چاودێری کردنی رێ و شوێنی تیرۆژەکانی ئەو روناکییە و.. هەر کە گوێی لێبوایە گەورەپیاوانی هۆزەکەیان لەبارەی ئەو ئاینە نوێیەوە دەدوێن، لایان دادەنیشت و بە سنگ فراوانیەکی شاراوەوە گوێی لێدەگرتن و، جارجارێکیش بە وشەیەك، یان چەند وشەیەك بەشداری قسەکانیانی دەکرد کە پاڵی پێوە دەنا بەرەو رووگەی بڵاوبوونەوە و، کەوتنە ژێر کاریگەری و، ئاماژەپێدان..!

ئەوانەی لەو رۆژەدا دەیانبینی، لاوێکی لەسەرخۆی هێمنی، زیرەکی بێدەنگییان بەدی دەکرد، لەکاتێکدا کە لە ناخیدا ئاهەنگێکی پڕ جوڵە و خۆشی و شادی بوو. کە تێیدا تەپڵ لێدرا و.. ئاڵا بەرزکرایەوەو.. شەیپوری تێدا دەنگی دەدایەوە و.. سرودی تێدا گەرمی دەکردەوە و.. گۆرانی پاك و بێگەردی دەچڕی..

جەژنێك کە هەموو جوانیەکانی جەژن و، شادی و پەرۆشی جەژن و، هەرای جەژنی تێدابوو..!! ئەمیش وەك لاوێك ئەو جەژنە گەورەیەی لە سنگیدا شاردبووەوەو، نهێنیەکەی خەفەکردبوو، چونکە گەر باوکی بیزانیایە کە ئەو هەموو پێشوازییە گەرمەی لە بانگەوازەکەی (موحەممەد) لە ناخیدا هەڵگرتووە، ئەوا ژیانی دەکردە قوربانی خواوەندەکانی (عەبدولمەناف)..!!

بەڵام هەناسە ناوەکیەکانمان کاتێك کارێك دەشارێتەوەو، دەگاتە رادەی پڕبوون ئەوا توانای بەرلێگرتنی نابێت..

رۆژێکیان..

هێشتا ڕۆژ نەبۆتەوەو، (خالید)یش لە زیندەخەونەکەیدایە تا ئەو ساتە و، چارەسازی خەوێکی زۆرگران و تەواو کاریگەر و، گوزارشت لە جوانی دەکات..

کەوابوو دەڵێین: شەوێکیان، (خالیدی کوڕی سەعید) لە خەویدا بینی لە لێواری چاڵە ئاگرێکی مەزندا راوەستاوەو باوکیشی لە پشتیەوەیەتی بە هەردوو دەستی بەرەو ئاگرەکە پاڵی پێوە دەنێت و، دەیەوێت بیخاتە ناویەوە، پاشان پێغەمبەری خودای بینی بەرەو ڕوی دێت و، بە دەستی راستی پیرۆزی کراسەکەی گرت و لە ئاگر و بڵێسەکەی دووری خستەوە..

ئەمجار لە خەوەکەی بێدار بوویەوە، نەخشەی کاری ڕۆژی نوێی پێبەخشیبوو، دەست بەجێ بەرەو ماڵی (ئەبوبەکر) کەوتە ڕێ و، خەوەکەی بۆ گێڕایەوە.. خەونەکەشی لە راستیدا پێویستی بە لێکدانەوە نەبوو..

(ئەبوبەکر) پێی وت:

{ئەوە خێر و چاکەیە و بۆ تۆ ویستراوە.. ئەوەش پێغەمبەری خوایەﷺ شوێنی بکەوە، چونکە بەراستی ئیسلام بەربەستە بۆت لە ئاگر}..

ئەمجا (خالید) دەکەوێتە ڕێ و بەدوای پێغەمبەری خواداﷺ دەگەڕا تا بگاتە شوێنەکەی و پێێ بگات و، دەربارەی بانگەوازەکەی پرسیاری لێدەکات و، پێغەمبەریشﷺ وەڵامی دەداتەوە:

{بڕوا بهێنیت بە خودای تاك و تەنیا و، هیچ هاوەڵێکی بۆ دانەنێیت.. و بڕوا بهێنیت بە موحەممەد کە بەندە و پێغەمبەریەتی و..

واز لە پەرستنی بتەکان بهێنیت کە هیچ نابینن و نابیستن و، هیچ سود و زیانێك ناتوانن بگەیەنن}...

ئەمجا (خالید) دەستی راستی دەهێنێت و، پێغەمبەری خوداشﷺ بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە بە دەستی راستی دەیگرێت و، (خالید) دەڵێت:

{من گەواهی دەدەم کە تەنها (الله) خودایە و..

گەواهی دەدەم کە (موحەممەد)یش پێغەمبەری خودایە}..!!

چرپە و سرودەکانی ناخی دەردەچن...

هەموو ئەو ئاهەنگەی لە ناخیدا بوو دەردەچێت و.. هەواڵەکە دەگاتە باوکی.

* * *

ئەو ڕۆژەی (خالید) موسڵمان بوو، تەنها چوار تا پێنج کەسی دیکە بەرەو ئیسلام هاتبوون، کەواتە ئەو لەو پێنج کەسەدا" پێشەنگ بوو کە بەرەو ئیسلام هاتن.

کاتێك یەکێك لە کوڕەکانی (سەعیدی کوڕی عاص) بەو زووییە موسڵمان دەبێت، ئەوە- بەبۆچوونی سەعید- کارێکە دەبێتە مایەی گاڵتەجاڕی و سوکایەتیە بۆی لە نێو قوڕەیشدا و،

زەوی لەژێر دەستەڵاتیدا دەهەژێت.

بەم شێوەیە بانگی خالیدی کرد و، پێی وت: (ئەرێ راستە تۆ شوێنی (موحەممەد) کەوتویت و، گوێی لێ دەگریت کە سوکایەتی بە خواوەندەکانمان دەکات)...؟؟

خالید وتی:

{سوێند بەخوا موحەمەد راستگۆیە..

بەراستی منیش بڕوام هێناوە پێی و شوێنی کەوتووم}..

ئا لێرەدا باوکی کەوتە لێدانی، پاشان خزاندیە ژوورێکی تاریکی نێو ماڵەکەی و، تێیدا بەندی کرد، دوای ئەوە بە برسێتی و تینوێتی ماندووی دەکرد و دەیترساند...

(خالید)یش لە پشتی دەروازە داخراوەکەوە هاواری لێدەکردن:

{سوێند بەخوا ئەو راستگۆیە و، منیش بڕوام پێیەتی}.

دواتر (سەعید) بۆی دەرکەوت کە ئەوەی بە سەر کوڕەکەیدا دەهێنێت بەس نیە، هەر بۆیە رۆژێکیان هێنایە دەرەوەو بردیە بەر گەرمای مەککە و، خستیە نێو بەردە قورس و گرانە بلێسەدارەکانیەوە و سێ رۆژ نەیهێشت سێبەری بەریکەوێت..!!

تنۆکێك ئاویش بەر لێوی نەکەوێت..!!

ئەمجا باوکەکە لە کوڕەکەی بێئومێد بوو و، گەڕاندیەوە بۆ ماڵەکەی خۆی و، دەستی کرد بە هەڵنان و، ترساندنی و.. هەڕەشەی لێدەکرد و دەیترساند و... (خالید)یش وەك حەق خۆڕاگر بوو و، بە باوکی دەوت:

{لەبەر هیچ شتێك واز لە ئیسلام ناهێنم، بە ئەو دەژیم و، لەسەر ئەویش دەمرم}..

سەعید هاواری کرد:

{کەوابوو دووریکەوەرەوە لێم گەمژەی بێمێشك، سوێند بە لات خۆراکت لێ دەگرمەوە}..

(خالید)یش وەڵامی دایەوە:

{... خوای گەورە باشترین رۆزی دەرە}..!!

ئەمجا ئەو ماڵەی بەجێ هێشت کە پڕ بوو لە خۆراك و پۆشاکی رێك و جوان و رۆشت..

رۆشت بەرەو نەبوونی و بێبەشبوون..

بەڵام باکی لەچی بێت..؟؟

ئەی ئەو ئیمانەکەی لەگەڵدا نیە..؟؟

ئەی ئەو هەموو سەروەری ویژدان و، هەموو مافی خۆی لە چارەنووسیدا نەپاراستووە..؟؟

کەواتە برسێتی و، بێبەشبوون و، ئەشکەنجە چیە..؟؟

کاتێك مرۆڤ خۆی لەگەڵ حەقێکی مەزنی وەك ئەو حەقەدا دەبینێتەوە کە (موحەممەد)ی پێغەمبەری خوا بانگەشەی بۆ دەکات، جا ئایا لە هەموو جیهاندا شتێکی بەنرخ ماوە نەیبوبێت لە قازانجی خۆی لە مامەڵەیەکدا کە خوای گەورە خاوەنیەتی پێ بەخشیبوو، بەم جۆرە

(خالیدی کوڕی سەعید) بە قوربانیدان ئەشکەنجەی لادەدا و، بەهۆی ئیمانەکەیەوە بەسەر بێبەشبووندا زاڵ دەبوو.

ئەو کاتەیش پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە هاوەڵانی بڕواداری کە بۆ دووەمین جار بەرەو حەبەشە کۆچ بکەن، (خالیدی کوڕی سەعید) یەکێك بوو لەوانەی خۆیان ئامادەکرد بۆی..

لەوێش (خالید) هێندەی خوای گەورە ویستی لەسەر بێت مایەوە، پاشان لەگەڵ براکانیدا لە ساڵی حەوتدا، گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی خۆیان و، سەیریان کرد موسڵمانەکان لە رزگارکردنی خەیبەر بوونەتەوە..

ئەمجا (خالید) لە شاری مەدینە لە نێو کۆمەڵگای موسڵمانی نوێدا نیشتەجێ بوو کە ئەو یەکێ بوو لەو پێنج کەسە کە سەرەتایی هاتنیان بینیووە، بونیاتیان ناوەو، پێغەمبەر بۆ هەر غەزایەك بچێت و، هەر دیمەنێك بەدی بکات، (خالید)یش لە ریزی پێشەوەی بەشداربوانیەتی.

(خالید)یش بە زوو موسڵمان بونەکەی و، بە جێگیربونی ویژدان و رێبازەکەی، جێگای رێز و خۆشەویستی بوو..

زۆر رێزی بڕوابوونی خۆی دەگرت و، ساختەیی تێدا نەدەکرد و نەیدەخستە سازشەوە.

پێغەمبەرﷺ بەر لە وەفاتکردنی کردبوویە والی (یەمەن)..

کاتێك هەواڵی پێگەیشت (ئەبوبەکر) بووە بە جێنشین و، بەڵێنی پێدراوە، دەستی لە کارەکەی هەڵگرت و گەڕایەوە بۆ مەدینە.

لە کاتێکدا کە ئەو رێزی بێپایانی (ئەبوبەکر)ی لەپێش چاو بوو..

لەگەڵ ئەوەشدا وای دەبینی کە رەواترین کەس بۆ جێنشینی یەکێکە لە بەنی هاشم:

بۆ نمونە (عەباس).. یان (عەلی کوڕی ابوطالب).. لەسەر قەناعەتەکەی خۆی مایەوە و پەیمانی بە (ئەبوبەکر) نەدا.

ئەبوبەکر بەرانبەر بەوە بەردەوام بوو لە سەر خۆشویستن و رێزگرتنی و، زۆری لێ نەدەکرد لەسەر پەیمان دان، رقیشی لێی نەبوو لەبەر ئەوەی پەیمانی نەداوە، لە نێو موسڵمانەکانیشدا هەر کە ناوی بهێنرایە خەلیفەی مەزن یەکسەر لەبارەیەوە دەدوا و، بە شێوەیەك کە شایستەی بێت قسەی لەسەری دەکرد.

پاشتر بیروبۆچوونی (خالیدی کوڕی سەعید) گۆڕا، ئەوە بوو رۆژێکیان لە نێو ریزی موسڵمانەکاندا رێی بۆ خۆی کردەوە و بەرەو پێشەوە رۆیشت و (ئەبوبەکر)یش لەسەر دوانگە بوو، ئەوە بوو پەیمانێکی راستگۆیانەی بەتینی پێدا..

* * *

(ئەبوبەکر) سوپاکانی بەرەو شام بەڕێدەخست و، ئاڵایەکی دایە دەست (خالیدی کوڕی سەعید) و بوو بە یەکێك لە سەرکردەکانی سوپا..

بەڵام بەر لە بەرێکەوتنی هێزەکان لە مەدینەوە، (عومەری کوڕی خطاب) بەرهەڵستی کرد لە سەرکردایەتی کردنی (خالیدی کوڕی سەعید) و، بەردەوام داوای لە خەلیفە دەکرد هەتا بڕیارەکەی لەبارەی سەرکردایەتی کردنی (خالید)ەوە بگۆڕێت..

هەواڵەکە دەگاتەوە بە (خالید)، ئەویش تەنها هێندە دەڵێت:

{سوێند بەخوا، بە سەرکردە دانانەکەم دڵخۆشی نەکردم، و لابردنەکەیشم زیانی نەبوو بۆم}..!!

(ئەبوبەکری صدیق)یشﷺ بەرەو ماڵێ (خالید) دەڕوات و پۆزشی بۆ دێنێتەوە، هەڵوێستە نوێیەکەی خۆی بۆ ڕاڤە دەکات و، پرسیاری لێدەکات کە لەگەڵ کام سەردەستە و سەرکردەکانی سوپادا حەز دەکات بڕوات" لەگەڵ (عەمری کوڕی عاص) کە ئامۆزایەتی..؟ یان لەگەڵ (شەرحەبیلی کوڕی حەسنە)؟

(خالید)یش وەڵامێکی دەداتەوە، کە مەزنی و تەقوای ناخی دەردەخات:

{ئامۆزاکەم، لەبەر خزمایەتیەکەی خۆشەویستە لام، (شەرحەبیل)یش لەبەر ئاینەکەی خۆشەویستە لام}..

پاشان بەوە ڕازی دەبێت کە سەربازێك بێت لە دەستەی (شەرحەبیلی کوڕی حەسنە)دا..

(ئەبوبەکر) بەر لەوەی سوپاکان بەرێبکەون (شەرحەبیل)ی بانگ کرد و پێی وت:

{سەرنج بدە (خالیدی کوڕی سەعید) و بزانە کە مافی هەیە بەسەرتەوە، هەروەك ئەوەی کە تۆ حەزت دەکرد کە مافی خۆت بزانرایە، گەر لە شوێنی ئەودابوویتایە و، ئەو لە شوێنی تۆداببوایە..

تۆ ئاشنای پلە و پایەی ئەوی لە ئیسلامدا..

دەزانیت کە کاتێ پێغەمبەری خوا وەفاتی کرد، ئەو یەکێك بوو لە والیەکانی..

منیش کردمە سەرکردە، پاشان بیروڕام گۆڕا..

بەڵکو ئەوەش ببێتە چاکە بۆی لە ئاینەکەیدا و، هیچ کەسیش بەهۆی سەرکردایەتیکردنەوە خۆشبەخت نەبووە..!!

سەرپشکیشم کرد لە هەڵبژاردنی جێگەی خۆی لای ج سەرکردەیەك بێت، جا ئەو تۆی هەڵبژارد بەسەر ئامۆزاکەیدا..

خۆ گەر تووشی شتێك هاتیت پێویستت بە بیروڕای کەسێکی بە تەقوای ئامۆژگاریکار هەبوو، ئەوا با یەکەم کەس کە بیروڕای وەربگریت" (ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح) بێت، پاشان (مەعازی کوڕی جەبەل).. سێیەمیش (خالیدی کوڕی سەعید)، بزانە کە تۆ لای ئەوانە ئامۆژگاری و چاکەت دەست دەکەوێت..

ئاگاداریش بە لەوەی کە بیروڕای خۆت بسەپێنیت بە سەریاندا، یان لێیانی بشاریتەوە}..

لە پێگەی (مەرج صوفەر)دا لە خاکی شام، لە کاتێکدا کە شەڕ لە نێوان موسڵمانەکان و ڕۆمەکاندا بە شێوەیەکی ترسناك و خوێناوی بەردەوام بوو، لە پێشەوەی ئەو کەسانەی کە پاداشتیان کەوتە سەر خودا، شەهیدێکی پایەبڵند بوو، لە ساتی لاوێتیەوە تاکاتی شەهیدبوونی ڕێگای ژیانی بە ڕۆیشتنێکی ڕاستگۆیانەی بڕوادارانەی ئازایانە بڕی..

موسڵمانان لە کاتێکدا کە بەسەر شەهیدانی جەنگەکەدا دەگەڕان بینیان، وەك پیشەی هەمیشەیی، هێمن و لەسەرخۆ، زیرەك و بێدەنگ، بەهێز و جەسوور، ئەمجا وتیان:

{خودایە لە خالیدی کوڕی سەعید ڕازی بە}...!!!

* * *

## ٣٣

# ئەبو ئەییوبی ئەنصاری

## بەگەنجی و پیری بەرەو کۆڕی تێکۆشان بڕۆن

پێغەمبەرﷺ دەچوویە شاری مەدینە و بەوەش کۆتایی بە گەشتی کۆچکردنە سەرکەوتووەکەی دەهێنا و، سەرەتای ڕۆژانی پیرۆزی لە خانەی کۆچ دەست پێدەکرد کە قەدەر ئەوەی بۆ ئەو لەخۆی گرتبوو تێیدا بۆ هیچ کەسێکی دیکەی هەڵنەگرتبوو لە دونیادا..

پێغەمبەر بە نێوەندی ئەو کۆمەڵە خەڵکەدا گوزەشت کە ریزەکان و دڵ و دەروونیان پڕ لە جۆش و، ئەوین و، پەرۆشی بوو.. بە سواری حوشترەکەیەوە دەڕۆیشت کە خەڵکی دەوری رەشۆکەیان بە قەرەباڵغی گرتبوو، هەرکەس دەیویست خۆی میوانداری پێغەمبەری خوا بکات..

کەژاوەکە گەیشتە ماڵەکانی (بەنی سالمی کوڕی عەوف)، جا هاتنە رێگای وشترەکە و وتیان: ((ئەی پێغەمبەری خوا، لای ئێمە لابدە، ژمارەمان زۆرە و، خاوەنی توانا و شت و مەکین)).

پێغەمبەریش لە کاتێکدا کە ئەوان دەستیان گرتووە بە رەشۆی وشترەکەیەوە پێیان دەڵێت:

{رێگای بۆ چۆڵ بکەن، چونکە فەرمان پێکراوە}.

ئەمجا کەژاوەکە دەگاتە گەڕەکی (بەنی بەیاضە)، دواتر لای (بەنی سەعد) و، گەڕەکی (بەنی حارثی کوڕی خەزرەج)، دواتر گەڕەکی (بەنی عەدی کوڕی نەجار) و.. هەموو یەکێك لەو هۆزانەش دەهاتنە سەر رێی وشترەکەی و، تکایان لێدەکرد کە بە دابەزینی لەلایان بەختەوەریان بکات، پێغەمبەریش خەندەی سوپاسگوزاری لەسەر لێوانی بوو، وەڵامی دەدانەوە:

{رێگای بۆ چۆڵ بکەن، چونکە فەرمان پێکراوە}.

پێغەمبەر دیاریکردنی جێگای دابەزینی واز لێهێنابوو بۆ قەدەر، چونکە ئەو دابەزینەی مەترسی و پلە و پایەی خۆی دەبێت و.. لەسەر خاکەکەی مزگەوت بونیات دەنرێت کە لێوەی پەیام و روناکی خودا بۆ تێکڕای دونیا پرشنگ دەدات و.. لە پەنایشەوە ژوور یان چەند ژورێك لە قوڕ و خشت دروست دەکرێت.. کە لە شت و مەکی دونیا تەنها بڕی پێویستی تێدایە، یان هێندەی زۆر پێویستی!! تێیدا مامۆستا و پێغەمبەرێك نیشتەجێ دەبێت کە بۆ ئەوە هاتۆتە ژیان تا گیانی داڕوخاوی ببوژێنێتەوەو هەموو رێز و سڵاوێکی ببەخشێتە ئەو کەسانەی کە وتیان: (پەروەردگارمان خودایە و پاشان لەسەری جێگیربوون).. بە ئەوانەی کە باوەڕیان

هێنا و ئیمانەکەیان بەستەم دانەپۆشی.. بە ئەوانەش لە ئاینداریاندا دڵسۆز بوون بۆ خودا، بە ئەوانەی لە سەر زەویدا چاکساز بوون و خراپەخواز نەبوون.

بەڵێ.. پێغەمبەرﷺ بەردەوام بوو لەسەر وازهێنان لەو دیاریکردنە بۆ قەدەر کە هەنگاوەکانی بەڕێوە دەبات..

لە پێناوی ئەوەشدا، ئەویش رەشۆی وشترەکەی واز لێ هێنابوو بەرەڵای کرد و بەهیچ شێوەیەك نەیگرتبوو و نەچووە سەر رێی هەنگاوەکانی و، پڕ بە دڵ رووی کردە خودا و بە زمانی پاڕایەوە:

{خودایە چاکەم بۆ هەڵبژێرە و، هەڵبژێرە بۆم}..

جا لە بەرانبەر ماڵی (بەنی مالیکی کوڕی نەجار)دا وشترەکە وەستا.. پاشان هەستایەوەو بە دەوری جێگاکەدا سوڕایەوەو، دواتر گەڕایەوە بۆ یەکەم جێگەی راوەستانی و، بارگەی خست و، لەو جێگایەدا جێگیر بوو و، پێغەمبەریش بە گەشبینی و دڵخۆشیەوە لەسەری دابەزی..

یەکێك لە موسڵمانەکان بە روخساری گەش و خۆشحاڵیەوە هاتە پێشەوەو، بارەکەی هەڵگرت و، بردیە ماڵەوەی و دواتر گەڕایەوە داوای لە پێغەمبەر کرد کە بچێتە ژوورێ و پێغەمبەریش بە شوێنیدا رۆیشت و پیت و فەڕی لێ دەباری.

ئەرێ دەزانن ئەو بەختەوەرە وادەپێدراوەی کە وشترەکە لەبەردەم ماڵەکەیدا وەستا و، پێغەمبەر بوویە میوانی و، هەموو خەڵکی مەدینە خۆزگەیان بەو بەخت گەورەییەی دەبرد..؟

ئەو پیاوە پاڵەوانی ئەم سەرگوزشتەیەمانە.. ئەبوئەیوبی ئەنصاری.. (خالیدی کوڕی یەزید)ە، نەوەی (مالیکی کوڕی نەجار).

* * *

ئەوە یەکەمین دیداری (ئەبوئەیوبی ئەنصاری) نەبو لەگەڵ پێغەمبەری خوادا..

پێشتر، ئەو کاتەی شاندێکی خەڵکی مەدینە چوونە شاری مەککە بە مەبەستی پەیماندان بە پێغەمبەری خوا، ئەو پەیمانە پیرۆزەی کە بە (پەیمانی عەقەبەی دووەم) ناسراوە.. (ئەبوئەیونی ئەنصاری) یەکێك بوو لەو حەفتا بروادارەی کە دەستی راستیان توند خستە دەستی راستی پێغەمبەری و پەیمانیان پێدا و بوونە سەرخەری.

ئائێستاش، کە پێغەمبەری خوا تەشریفی هێناوە بۆ مەدینە و، دەیکاتە پایتەختی ئایینی خودا، ئەوا بەخت فراوانی (ئەبوئەیوبی ئەنصاری) وایکرد کە ماڵەکەی ببێتە یەکەم ماڵ کە کۆچکەری مەزن و، پێغەمبەری ئازیز تێیدا نیشتەجێ ببێت.

پێغەمبەر ویستی لە نهۆمی یەکەمی ماڵەکەدا لابدات.. بەڵام هەر کە (ئەبوئەیوب) چوویە نهۆمی سەرەوە بۆ ژوورەکەی خۆی موچڕکەی پێدا هات و، نەیتوانی خۆی بە راکشاوی یان بە

پێوە لە جێگایەکدا ببینێتەوە، کە لە جێگایەکدا بێت بەرزتر لەو جێگایەی کە پێغەمبەری خوای تێدایە و تێیدا دەخەوێت..!!

هەر بۆیە هات و تکای زۆری لە پێغەمبەر کرد و داوای کرد کە بگوێزێتەوە بۆ نهۆمی سەرەوە، پێغەمبەریش داواکەی بەجێ هێنا.

پێغەمبەریش تێیدا دەمێنێتەوە تا مزگەوت دروست دەکرێت و، لە تەنیشیەوە ژوورێکی بۆ دروست دەکەن.

لەو کاتەوەی کە قورەیش دەستی کردە خۆسازدان دژ بە ئیسلام و شالاوی خۆی بۆ سەر خانەی کۆچ لە مەدینە دەست پێکرد و، هۆزەکانی کۆکردەوەو، سوپای پێکەوە نا بۆ خامۆشکردنی روناکی خودا..

ئا لەو ساتەوە، (ئەبوئەیوبی ئەنصاری) لەسەر کاری جیهادکردن لە پێناوی خوادا راهات..

جا لە بەدر و، ئوحود و، خەندەق و، تێکڕای مەیدان و غەزاکاندا، پاڵەوانانە تێیدا ئامادە بوو خۆی و ماڵی لە پێناوی پەروەردگاری جیهانیاندا دەکردە قوربانی..

پاش وەفاتکردنی پێغەمبەریش، لە هیچ جەنگێك دوانەکەوتووە کە لەسەر موسڵمانان پێویست کرابێت ئەنجامی بدەن، هەرچەندە زۆر سەخت و ناڕەحەت و پڕ مەترسیش بووبێت..!

ئەو دروشمەیش کە هەمیشە دووپاتی دەکردەوە، بە شەووڕۆژ.. بە ئاشکرا و نهێنی، ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە بوو:

﴿انفِرُوا خِفَافًا وَثِقَالاً: سوکبار بن یان گرانبار بن، بەرەو غەزا برۆن﴾التوبه/٤١.

جارێکیان.. لە سوپا دواکەوت بەهۆی ئەوەی کە خەلیفە یەکێك لە لاوە موسڵمانەکانی کردبووە بەرپرسی و، ئەویش قەناعەتی بە ئەمیرێتیەکەی نەبوو.

تەنها ئەو جارە و بەس.. لەگەڵ ئەوەشدا هەستکردن بە پەشیمانی لەسەر ئەو هەڵوێستەی هەمیشە دەروونی دەهەژاند و، دەیوت:

{من چیم لەسەرە کە کێ دەکەن بە سەردارم}..؟؟

پاشان دوای ئەوە هیچ جەنگێکی لەدەست دەرنەچوو!!

هێندەی بەس بوو کە سەربازێك بێت لە سوپای ئیسلامدا و، لەسایەی ئاڵاکەیدا بجەنگێت و، پارێزگاری شان و رێزی بکات..

ئەو ساتەیشی ناکۆکی کەوتە نێوان (عەلی) و (موعاویە)، بەبێ دوودڵی خۆی پشتیوانی ئیمامی (عەلی) کرد.. چونکە ئەو ئیمامە بوو کە پەیمانی موسڵمانانی پێدراوەو.. کە شەهیدیش بوو، خەلیفایەتی یەکلابوویەوە بۆ (موعاویە)، (ئەبوئەیوب) بە دەروونە دونیا نەویستە، خۆڕاگرە، تەقوادارەکەیەوە وەستا و، تەنها هێندەی لە دونیا دەویست کە جێگایەکی هەبێت لە جەنگدا و، لەنێو ریزی موجاهیداندا شوێنێکی هەبێت.

بەو جۆرە، هەر کە سوپای موسڵمانان بەرەو (قوستەنتینیە) کەوتە ڕێ، لەگەڵیاندا ڕۆشت و، شمشێرەکەی هەڵگرت و، بەدوای شەهیدبوونێکی مەزندا دەگەڕا کە ماوەیەکی زۆر بوو دڵی بۆی لێی دەدا و پەرۆشی بوو..!!

لەو جەنگەشدا بریندار بوو..

کاتێك کە سەرکردەی سوپاکە هاتە سەردانی، ئەو دوا هەناسەکانی کێبڕکێیان بوو لەگەڵ ڕۆیشتنندا بۆ دیداری خوا..

جا سەرکردەکە، کە (یەزیدی کوڕی موعاویە) بوو، لێی پرسی:

{ئەی ئەبوئەیوب، چیت پێویستە}؟

جا، هیچ کەس لە ئێمەی هەیە بێت بە خەیاڵیدا، یان بزانێت، پێویستی (ئەبوئەیوب) چی بوو..؟؟

نەخێر.. بێ گومان پێویستی ئەو ئەوەیە کە بەگیانەکەی شتێك ببەخشێ کە هەموو بۆچوون و خەیاڵێکی مرۆڤ لە ئاستیدا دەستەوسانە..!!

داوای لە (یەزید) کرد، کە مرد لاشەکەی بەسەر وڵاخەکەیەوە هەڵگرن و، تا دوورترین ماوەی خاکی دوژمن کە لە تواناددا بێت بیبەن و، لەوێدا بەخاك بسپێردرێت، پاشان سوپاکەی بە درێژایی ئەو ڕێگایە تاو بدات، تا گوێبیستی دەنگی پێی ئەسپی موسڵمانەکان بێت لەسەر گڵکۆکەی و، ئەوساتە بزانێ، کە ئەوان گەیشتوونەتە ئەو سەرکەوتن و بردنەوەیەی کە دەیانویست..!

ئەرێ وا دەزانن کە ئەوە هۆنراوە بێت..؟

نەخێر.. ئەوە خەیاڵیش نیە، بەڵکو واقیع و، حەقێکە کە دونیا لەو ڕۆژەدا بەخۆیەوە بینی و، ڕاوەستا و چاو و گوێی ڕادێشت و، خەریك بوو بڕوا نەکات بەوەی کە دەیبیستێت و بەدی دەکات..!!

(یەزید)یش ڕاسپاردەکەی (ئەبوئەیوب)ی بەجێهێنا..

لەناو جەرگەی (قوستەنتینیە)دا-کە ئەمڕۆ پێێ دەڵێن (ئەستانبوڵ)- لاشەی ئەو پیاوە مەزنە و، ئەو قارەمانە گەورەیە بەخاك سپێردرا..!!

تەنانەت بەر لەوەی کە ئیسلام ئەو ناوە پڕ بکات، ڕۆمەکانی خەڵکی (قوستەنتینیە) بەچاوی ڕێزەوە دەیانڕوانیە (ئەبوئەیوب) لە گڵکۆکەیدا..

جێگای سەرسوڕمانە کە دەبینیت هەموو ئەو مێژوو نووسانەی کە ئەو ڕووداوانەیان تۆمار کردووە دەڵێن:

{ڕۆمەکان دەهاتنە سەر گۆڕەکەی و، سەردانیان دەکرد و.. لە کاتی تووش بوونی تەنگانەدا داوای دەربازبوونیان لێدەکرد}..!!

* * *

سەرەڕای ئەوەی کە جەنگەکان ژیانی (ئەبوئەیوب)یان تەنی بوو، بواریان نەدەدا کە شمشێرەکەی دابنێ و بحەوێتەوە، سەرەڕای ئەوە، هەموو ژیانی ئەو هێمنی بوو، وەك شنەبای دەمەویەیان..

چونکە ئەو فەرموودەیەکی بیستبوو لە پێغەمبەرﷺ، باش لێی تێگەیشتبوو:

{گەر نوێژت کرد ئەوا وەك کەسێك نوێژ بکە کە ماڵئاوایی دەکات..

قسەیەك مەکەن کە دواتر پۆزشی بۆ بهێننەوەو..

بێ ئومێد بن لەوەی کە لەدەستی خەڵکدایە}..

بەمجۆرە، زمانی خۆی لە ئاشووب وەرنەداو.

دەروونی خۆی نەبرپە هیچ چاوچنۆکیەك..

هەموو ژیانی بە شێوەی پەرۆشیانەی خواپەرستێك و فرمێسك رێژ بەسەر دەبرد..

ئەو کاتەیشی ئەجەلی هات، لە هەموو دونیادا هیچ پێویستیەکی نەبوو جگە لەو ئومێدەی کە لە پاڵەوانێتیو، مەزنیەکەیدا، هاوشێوەی ژیانی بوو:

{لاشەکەم بەرەو دوور... دوور ببەن.. لە خاکی رۆمدا و پاشان لەوێ بمنێژن}..

بڕوای تەواوی بە سەرکەوتن هەبوو و، بە رۆشنایی بەرچاوروونیەکەی ئەو جێگایەی بەدی دەکرد و، جێگای خۆی دەگرێت لە نێو کۆمەڵی موسڵماناندا و، کە هاتوونەتە نێو رووناکی و تیشکدانەوەکەی..

پاشان ویستی کە دوا ویستگەی ژینی ئەوێ بێت، لە پایەتەختی ئەو وڵاتە، کە جەنگی کۆتایی و یەکلاکەرەوەی تیدا روودەدات و، دەتوانێت لەژێر خاکە چاکەکەیدا، چاودێری سوپای موسڵمانان بکات لە پێشڕەویکردنیدا و، گوێبیستی شەکانەوەی ئاڵاکانی و، حیلەی ئەسپەکانیان و، دەنگی پێیەکانیان و، شریخەی شمشێرەکانیان بێت..!!

ئەوە رۆژێکی چۆڵەوانییە لەوێ..

ئیدی گوێبیستی شریخەی شمشێر و، حیلەی ئەسپ نابێت.

تازە ئەوەی کرا کرا، لە داهاتوویەکی دووردا لەسەر جوودی گیرسایەوە.

بەڵام هەموو رۆژێ لە بەیانیەوە تا ئێوارە، گوێبیستی جوانی بانگ دەبێت لە بڵندگۆ بەرزەکانی ئاسۆوە..

کە الله أکبر

الله اکبر

گیانی پڕ ئاواتیشی لەدوا خانەی جاویدان و سەرفرازیەکەیدا وەڵام دەداتەوە:

(هذا ما وعدنا الله ورسوله

وصدق الله ورسوله).

* * *

# ٣٤

## عەبباسی کوڕی عبدالمطلب

## ئاوگێڕی مەکە

لە ساڵێکی وشکەساڵیدا، ئەو ساتەی خواپەرستان و لات تووشی برسێتی و نەهاتی هاتن، ئەمیری باوەڕداران (عومەر) و موسڵمانان بەرەو دەشتی فراوانی دەرەوە هاتنە دەرێ نوێژی باران بارین ئەنجام بدەن و، رووبکەنە خودای خاوەن بەزەییان کە هەورو بارانیان بۆ بنێرێ...

(عومەر) راوەستا، لەکاتێکدا کە دەستی راستی (عەباس)ی بە دەستی راستی خۆی گرتبوو، بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان و، وتی:

{خودایا، ئێمە نوێژەبارانەمان بە پێغەمبەرەکەت ئەنجام دەدا کە لە نێوماندا بوو..

خودایە ئەمڕۆش ئێمە بە مامەی پێغەمبەرەکەت نوێژەبارانە دەکەین، دەسا بارانمان بۆ ببارێنە..}.

جا موسڵمانەکان لە جێگای خۆیاندا نەجوڵان هەتا هەور هات و، باران دەستی کرد بە بارین و، مژدەی بەخشیەوەو، جۆگەکانی تێرئاو کرد و، زەوی بەپیت کرد.

هاوەڵانیش بەرەو رووی (عەباس) بوونەوەو، دەستیان دەکردە ملی و، ماچیان دەکرد و، پیرۆزباییان لێدەکرد و، دەیانوت:

{پیرۆز بێت لێت.. ئەی ئاوگێڕی مەککە}..

جا دەبێ ئەم ئاوگێڕەی مەککە کێ بێت..؟؟

ئەوە کێیە کە (عومەر) بەهۆیەوە پەنای بردە لای خودا.. (عومەر)یش وەك دەزانین چەندە بە تەقوا و لەپێش بوون و خاوەن جێ و شوێنە لای خودا و پێغەمبەرەکەی و لای بڕواداران..؟

ئەو پیاوە (عەباس)ە، مامی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

پێغەمبەریش هێندەی خۆش دەویست بەو ئەندازەیەش رێزی لێدەناو، لە ستایش و پیاهەڵدانی چاکەمەندیدا دەیفەرموو:

{ئەمە پاشماوەی باووباپیرانمە}....

* * *

{ئەوە (عەباسی کوڕی عبدالمطلب)ە، بەخشندەترین و بەسۆزترین خزم دۆستی قورەیشە}..!!

هەروەك چۆن (حەمزە) مامی پێغەمبەر و هاوتەمەنی بوو، (عەباس)یشؓ بە هەمان شێوە بوو.. جیاوازیشیان لە تەمەندا تەنها دوو سێ ساڵ بوو، کە تەمەنی (عەباس) لە تەمەنی پێغەمبەر زیاتر بوو..

بەم جۆرە (موحەممەد) و (عەباس)ی مامی، دوو منداڵی یەك تەمەن و، دوو لاوی یەك نەوە بوون..

بۆیە تەنها نزیکی خزمایەتی هۆکاری نزیکایەتیان و خۆشەویستی نێوانیان نەبوو بەس، بەڵکو هاوتەمەنی و، هاوڕێیانیش بە هەمان شێوە هۆکار بوون..

شتێکی دیکەش هەبوو پێغەمبەر هەمیشە لە پێوانەیدا دەیخستە پلەی یەکەم.. کە ئەویش ئاکاری (عەباس) و کارە چاکەکانی بوو..

چونکە بەراستی (عەباس) بەخشندە بوو، بەخشندەییەکی زۆر زیاد، هەتا وەك ئەوەی لێهاتبوو کە رێزلێنانی مامەی یان خاڵی بێت..!!

زۆریش سەردانی خزم و کەس و کاری دەکرد و، بەهۆی هیچ یەك لە دەستەڵات، یان پلەوپایە و، سامان جیاوازی لە نێوانیاندا نەدەکرد..

ئەویش بۆ ئەمە و ئەوە، تا رادەی لێزانی لێهاتوو بوو، بەهۆی ئەو زیرەکی و لێزانییەی خۆیەوە کە لە نێو قورەیشدا هەیبوو، توانی کە زۆر ئاستەنگ و ئازار لە پێغەمبەرﷺ دوور بخاتەوە کاتێك کە بانگەوازەکەی ئاشکرا کرد..

* * *

(حەمزە) هەروەك لە میانەی قسەوباسەکانماندا پێشتر لەبارەیەوە بینیمان چارەسەری دەستدرێژی قورەیشی کرد بە شمشێرە ئاگرینەکەیشی سەری ئەبوجەهلی شکاند..

بەڵام (عەباس)، بەهۆی زیرەکی و لێزانیەکەیەوە زۆر سوودی بە ئیسلام گەیاند، هەروەك چۆن ئەو شمشێرانەی بەرگریان لە مافی دەکرد و لە پاراستیدا سوودیان هەبوو..!!

(عەباس) موسڵمان بوونی خۆی رانەگەیاند تا ساڵی رزگارکردنی مەککە، هەر ئەوەشە وای کردووە زۆر لە مێژوونووسان لە ریزی ئەو کەسانەی دادەنێن کە موسڵمان بوونی دواکەوتووە.

بەڵام هەندێ گێڕانەوەی دیکەی مێژوو هەیە کە وای دەخاتە روو زوو موسڵمان بوویێ بەڵام موسڵمان بوونەکەی خۆی شاردبێتەوە..

(ئەبورافع)ی خزمەتکاری پێغەمبەرﷺ دەڵێت:

{خزمەتکاری (عەباسی کوڕی عبدالمطلب) بووم، ئیسلام هاتبووە نێوان ئێمەی ئال و بەیتەوە، (عەباس) موسڵمان بوو، پاشان (ئوم فەضل) موسڵمان بوو.. ئەمجا منیش موسڵمان بووم..

بەڵام (عەباس) موسڵمان بوونەکەی خۆی دەشاردەوە}..

ئەمە گێڕانەوەی (ئەبورافع)ە کە لەبارەی باروبۆخی (عەباس) و موسڵمان بوونیەوە دەدوێت بەر لە غەزای بەدر..

کەوابوو (عەباس) موسڵمان بووە..

شوێن و جێگایشی لە مەککە پاش کۆچکردنی پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانی نەخشەیەك بوو مەبەستی خۆی بە چاکترین شێوە بەجێ هێنا..

قورەیشیەکانیش گومانەکانی خۆیان لە نیەتی (عەباس) نەدەشاردەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا رێگەیەکیان بەدی نەدەکرد بۆ دژایەتیکردنی، بەتایبەتی کە ئەو لە روخساری کاریدا بەو جۆرە بوو کە ئەوان لە رێچکە و ئاین پێی رازین..

هەتا کە غەزای (بەدر) هاتە پێشەوە، قورەیشیەکان بە هەڵێکیان زانی کە نهێنیەکانی (عەباس) و راستیەکانی پێ دەربکەوێت..

(عەباس)یش لەوە زیرەکتر بوو کە بێئاگا بێت لەلایەنەکانی ئەو فێڵ و تەڵەکە خراپەی کە قورەیشییەکان بەهۆیەوە چارەسازی لایەنە شکست خواردووەکانی خۆی پێ دەکرد و، پلانەکانی پێ دادەڕشت..

خۆ گەر ئەو سەرکەوتوو بێت لە ئاگادارکردنەوەی پێغەمبەرﷺ لە هەواڵەکانی قورەیش و جوڵانیان، ئەوا قورەیشیش دەیبەنە نێو جەنگێکەوە کە بڕوای پێ نیە و نایەوێت.. لەگەڵ ئەوەشدا سەرکەوتنی کاتی زۆر ناخایەنێت و بەسەر قورەیشیەکاندا هەڵدەگەڕێتەوە و دەبێتە هۆی دۆڕان و تێکشکانیان..

* * *

هەردوو دەستە لە غەزای بەدردا بەیەك گەیشتن...

شمشێرەکانیان لە بەیەکداپژانێکی ترسناکدا بە یەکدا هاتن، کە چارەنووسی هەر دەستە و، کۆمەڵێکیان دیاری دەکات..

پێغەمبەریش هاواری لە هاوەڵانی دەکرد و دەیفەرموو:

{پیاوانێکی نەوەی (بەنی هاشم) و، خەڵکێکی دیکەش بەزۆر هێنراون، هیچ پێویستیان بە شەڕکردن لەگەڵ ئێمەدا نیە. هەرکەس لەنێوە گەیشت بە یەکێکیان با نەیکوژێت..

هەرکەس گەیشتە (ئەبو بوختەری کوڕی هیشامی کوڕی حارسی کوڕی ئەسەد) با نەیکوژێت..

هەرکەس گەیشت بە (عەباسی کوڕی عبدالمطلب) با نەیکوژێت، چونکە ئەو بەناچاری هێنراوە}..

پێغەمبەریش لەم فەرمانەیدا تەنها مەبەستی جیاکردنەوەی (عەباس)ی مامی نەبوو بە تایبەت، چونکە ئەوە کات و ساتی جیاکردنەوە نەبوو..

(موحەممەد)یشﷺ لەو کەسانە نیە کە ببینێ سەری هاوەڵانی لە جەنگێکی حەقدا لێدەکرێتەوە، بێت تکا بۆ مامەی بکات لە کاتێکدا کە شەڕ بەردەوامە، گەر بیزانیایە مامەی لە هاوەڵپەرستانە..

بەڵێ...

پێغەمبەر کە قەدەغەکراوە لێی داوای لێخۆشبوون–تەنها داوای لێخۆشبوون بۆ ابوطالبی مامی بکات– لە کاتێکدا کە (ابوطالب) ئەو هەموو پشتیوانی و هەوڵ و قوربانیەی بۆ ئەو و ئیسلام هەبوو..

ئەوەش شتێکی گونجاو و بەجێ نیە، کە لە غەزای بەدردا بێت بەو کەسانەی کە باوك و باپیری هاوەڵپەرستی خۆیان دەکوژن بڵێت: مامەم جیابکەنەوەو مەیکوژن..!!

بەڵام گەر پێغەمبەر راستی مامی ئاشنا بێت و، بزانێت کە موسڵمان بوونی لە سنگیدا شارتۆتەوە، هەروەك زۆرکەسی دیکەش ئەو خزمەکەتگوزارییە ناسیارانەیان دەزانی کە بۆ ئیسلام ئەنجامی دابوو.. هەروەك لە دواییدا دەزانرێ کە بە ناچاری و بێزاری هێنراوە تا لەو کاتەدا ئەرکی سەرشانیەتی کە کەسێك وابووبێت رزگاری بکات و، لە کوشتنی خۆی بپارێزێت چەندە پێی بکرێت..

خۆ گەر (ئەبوبوختەری کوڕی حارس) نەزانراوە موسڵمانێتی شاردبێتەوەو، بە نهێنی وەك (عەباس) سەری نەخستووە..

هەموو چاکە و باشێتی ئەو ئەوەبوو کە لەگەڵ سەرکردەکانی قوڕەیشدا زیانی بە موسڵمانان نەدەگەیاند و ستەمی لێ نەدەکردن و، بەو کارانەیان رازی نەبوو، بە ناچاری و بێزاری لەگەڵیاندا بەرەو غەزای بەدر هاتوە.

گەر (ئەبو بوختەر) ئەوە حاڵی بێت، ئەوا بەهۆی تکاکردنی پێغەمبەرەوە بۆی سەرکەوتنی بۆ خوێنی بەدەست هێنا تا نەڕژێت و، بۆ ژیانیشی هەتا تیانەبرێت..

جا ئایا موسڵمانێك کە ئیسلام بوونی خۆی شاردبێتەوە، شایستەتر نیە بەو تکاکردنە.. پیاوێك کە لە سەرخستنی ئیسلامدا هەڵوێستی دیاری هەبێت و، هی دیکەشی کە پەردەی شاراوەی بەسەردا دابێت..؟؟

بەڵێ.. (عەباس) بەراستی ئەو موسڵمانە و، ئەو سەرخەرە بوو..

دەبا تۆزێ بگەڕێینەوە بۆ دواوە تا سەرنج بدەین..

* * *

لە پەیمانی عەقەبەی دووەمدا کاتێك کە لە وەرزی حەجدا شاندێکی ئەنصار هاتن بۆ مەککە کە حەفتا و سێ پیاو و دوو ئافرەت بوون، تا پەیمان بدەن بە خودا و پێغەمبەرەکەی و، پێکبێت لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ کە کۆچ بکات بۆ مەدینە، پێغەمبەر هەواڵی ئەو شاندە و ئەو

پەیمانەی گەیاندە مامی و.. پێغەمبەرﷺ لە هەموو بیرویڕچوونەکانیدا متمانەی بەمامی هەبوو..

کاتێکیش وادەی ئەو کۆبوونەوەیە هات کە بە نهێنی و پەنهانی ئەنجام درا، پێغەمبەر و مامی بە یەکەوە هاتنە دەرەوە بەرەو ئەو جێگایەی کە ئەنصاریەکان چاوەڕوانیان دەکرد.

(عەباس) ویستی کە رادەی راستی خەڵکەکە تاقی بکاتەوەو پەیمانی تەواویان لێ وەربگرێت بۆ پێغەمبەر..

با لێبگەڕێین یەکێك لە ئەندامانی شاندەکە هەواڵەکەمان بۆ بگێڕێتەوە، وەك بیستویەتی و دیویەتی:

ئەو کەسەش (کەعبی کوڕی مالیك)ە‌ﷺ:

{... جا لە دۆڵێکدا دانیشتین چاوەڕوانی پێغەمبەری خوامانﷺ دەکرد هەتا هات و (عەباسی کوڕی عبدالمطلب)ی لەگەڵدا بوو.. (عەباس) قسەی کرد و وتی: ئەی خەڵکی خەزرەج، (موحەممەد) وەك دەزانن لە ئێمەیە و، لە هۆزەکەی خۆمان پاراستومانە و ئەو لە نێو هۆزەکەیدا سەرفرازە و رێزلێگیراوە لە شارەکەیدا، بەڵام ئەو پێی خۆش نیە و حەز دەکات بەلای ئێوەدا بشکێتەوەو بگاتە لاتان..

خۆ گەر ئێوە ئەمەکدارن بەرامبەر ئەو بەڵێنانەی پێتان داوەو، دەیپارێزن لەوانەی کە دژایەتی دەکەن، ئەوا ئێوە و ئەوەی هەڵتان گرتووە..

خۆ گەر ئێوە وای دەبینن کە وەریدەگرن و سەرشۆڕی دەکەن لەپاش هاتنی بۆ لاتان، ئەوا لە ئێستاوە وازی لێ بێنن}...

(عەباس) ئەو وشە یەکلاکەرەوە جەخت لەسەر کراوانەی دەکرد و، چاوەکانیشی وەك چاوی هەڵۆ بڕیبووە روخساری ئەنصاریەکان.. چاودێری کاریگەری قسەکانی و کاردانەوەی خێرای دەکرد..

(عەباس) تەنها بەوەش وازی نەهێنا، زیرەکیە مەزنەکەی، زیرەکیەکی کرداری بوو لە بواری مادییدا دەچێتە سەر راستیەکان و، رووبەڕووی هەموو رەهەندەکانی دەبێتەوە وەك وردبینێکی پسپۆڕ.

ئا لێرەدا بە پرسیارێکی زیرەکانە کە ئاراستەی ئەنصاریەکانی کرد و درێژەی بە قسەکانی دا و وتی:

{شەڕم بۆ باس بکەن، کە چۆن بەرامبەر دوژمنەکەتان دەجەنگن}..!!؟؟

(عەباس) بە زرنگی خۆی و ئەزموونی لەگەڵ قوڕەیشدا تێدەگات کە شەڕ هەردەبێت و لە پێشدا لەنێوان ئیسلام و هاوەڵپەرستاندا، قوڕەیشیش دەست لە ئاین و سەروەری و مکوڕی خۆی هەڵناگرێت و سازش ناکات..

ئیسلامیش کە رەوایە دەست لە مافە رەواکانی خۆی هەڵناگرێت بۆ ناڕەوا..

جا ئایا ئەنصاریەکان-خەڵکی مەدینە- خۆڕاگرن لە شەڕدا کاتێ بەرپا دەبێت..؟؟
یان ئەوان-لەرووی هونەرییەوە- هاوشانی قورەیشن و، هونەری هەڵمەتبردن و کشانەوە و کوشتار دەزانن..؟؟
لەپێناوی ئەوەدا، ئەو پرسیارەی پێشووی کرد:
{شەڕم بۆ باس بکەن، کە چۆن بەرامبەر دوژمنەکەتان دەجەنگن}..؟؟
هەموو ئەو ئەنصاریانەی کە گوێیان بۆ قسەکانی (عەباس) راگرتبوو وەك کێو خۆڕاگر بوون.. هەرکە (عەباس) لە قسەکانی بوویەوە، بەتایبەت لەو پرسیارە کاریگەرە پاڵپێوەنێرە بوویەوە، ئەنصاریەکان دەستیان کرد بە قسەکردن..
سەرەتا (عبداللهی کوڕی عەمری کوڕی حەرام) بە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە دەستی پێکرد:
{ئێمە-سوێند بەخوا- پیاوی شەڕین.. گۆشکراوین پێی و، بەسەریدا رۆیشتووین و، لە باووباپیرەگەورەکانمانەوە بۆمان ماوەتەوە...
تیری بۆ دەهاوێژین، تا نامێنێت..
پاشان بە رم لێی دەدەین، تا دەشکێت...
دواتر بە شمشێر تێی بەردەبین و، لێی دەدەین هەتا خێراترین کەسی لە ئێمە یان لە دوژمن دەمرێت}..!!
(عەباس)یش بە رووگەشیەوە وەڵامی دانەوە:
{کەواتە ئێوە پیاوی جەنگن، ئایا زرێتان لەلا هەیە}..؟؟
وتیان:
{بەڵێ.. زرێی گشتگیرمان هەیە.}..
پاشان گفتوگۆیەکی جوان و مەزن لەنێوان پێغەمبەری خواﷺ و ئەنصاریەکاندا ئەنجام درا.. قسە و گفتوگۆیەك کە-بەپشتیوانی خوا- دواتر لە لاپەڕەکانی دیکە دەیخەینە روو..

* * *

ئا ئەوە هەڵوێستی (عەباس) بوو لە پەیمانی عەقەبەدا..
وەك یەکە ئێدی، گەر ئەو کاتە بەنهێنی موسڵمان بووبێت، یان هێشتا لە بیرکردنەوەدا بووبێت، ئەو هەڵوێستە مەزنەی شوێنی ئەو لەنێو هێزە ئاوابووەکانی تاریکی و سپێدەی داهاتوو دیاری دەکات و، رەهەندەکانی مەردایەتی و ریشەقوڵی دەردەخات..!!

* * *

ئەمجا ڕۆژی (حونەین) دێت، گیانبەخشی ئەو هێمنە لەسەرخۆیە لایەنی نەرم و نیانی دووپات بکاتەوە، لە گۆڕەپانی جەنگدا ئەو جۆرە پاڵەوانێتیە بخاتە روو کە کات و شوێنی لە کاتی پێویستدا پڕ دەکات و، هەڵوێست بەهێزیەوە بەسام دەبێت لەکاتێکدا کە جگە لەو کاتە پێویستانەدا، ئارامگرتووە لەژێر پەراسوەکانیدا و شاردراوەتەوە لەبەرچاوان..!!

* * *

لەساڵی هەشتەمی کۆچیدا و، پاش ئەوەی کە خوای گەورە مەککەی رزگارکرد بۆ پێغەمبەر و ئاینەکەی، لای هەندێك لە هۆزە بڵاوەکانی نێو دوورگەی عەرەبیدا گران بوو کە ئاینی نوێ ئەو هەموو سەرکەوتنە بەو خێراییە بەدەست بهێنێت..

جا هۆزەکانی (هەوازن و سەقیف و نەسر و جوشەم) و چەند هۆزێکی کە کۆبوونەوەو، بڕیاریان دا کە جەنگێکی یەکلاکەرەوە دژی پێغەمبەر و موسڵمانان ئەنجام بدەن..

وشەی (هۆزەکان) لێرەدا نابێت لە سروشتی ئەو شەڕانەی کە پێغەمبەر بە درێژایی ژیانی ئەنجامی دا بمانخەڵەتێنێت و، وا تێبگەین کە تەنها چەند پێکدادانێکی شاخاوی بچوکە، هیچ جەنگێك نیە وەك شەڕی ئەو هۆزانە لە پێگەی خۆیاندا توند و خوێناوی بێت..!!

تێگەیشتنیش لەم راستیە مەزندەیەکی تەواوی ئەو هەوڵە بێ وێنەیەمان ناداتێ کە پێغەمبەری خوای ﷺ و هاوەڵانی ئەنجامیان داوە و بەس، بەڵکو مەزندەیەکی راست و دروست و تەواومان لەبارەی بەهای ئەو سەرکەوتنە مەزنە کە ئیسلام و بڕواداران بە دەستیان هێنا و، تێڕوانینێکی روونی سەرخستنی خودا لەم سەرکەوتن و سەرخستنەدا دەخاتە روو بۆمان..

* * *

ئەو هۆزانە لە چەند ریزێکی بێ شوماری جەنگاوەرانی دڵرەقدا کۆبوونەوە.

مووسڵمانانیش بە دوازدەهەزارەوە هاتنە دەرەوە بۆیان..

دوازدە هەزار..؟؟

لەکێ...؟؟

لەو کەسانەی کە لە دوێنێیەکی نزیکدا مەککەیان رزگارکرد و، هاوەڵپەرستی و بتەکانیان فڕێدایە چاڵی کۆتایی و ناخۆشیان و، ئاڵاکانیان بەرز بوویەوەو ئاسۆکانی پڕ کرد بێ ئەوەی کەس لاساری یان سەرقاڵی بکات..!!

ئەمە شتێکە مایەی لەخۆبایی بوونە.

موسڵمانانیش مرۆڤن، پاشان، ئەوانیش لەبەردەم ئەو لەخۆباییبوونەدا لاواز بوون کە زۆری و یاسایان و، سەرکەوتنی گەورەیان لە مەککە بۆی دروست کردن، وتیان:

{ئەمڕۆ لەبەر کەمی بەسەرماندا زاڵ نابن}...

لەکاتێکدا کە پێشتر ئاسمان بەڵێنی بۆ مەبەستێکی پیرۆز و بەرێزتر لە سەرکەوتنی پێدەدان، پەنا بردنی ئەوان بۆ هێزی سەربازییان و، لەخۆباییبوونیان بەسەرکەوتنیان لە جەنگا، کارێکی خراپە و پێویستە زۆر زوو لێی پاشگەز ببنەوە، جا بە کتوپڕیەکی چارەسازیش بێت..

ئەو کارە کت و پڕ چارەساز ئامێزەش شکستێکی گەورە بوو لەسەرەتای جەنگەکەدا، هەتا ملیان کەچ کرد بۆ خوا و، خۆیان بێبەری کرد لە توانای خۆیان بۆ توانای ئەو و، لەهێزی خۆیانەوە بۆ هێزی ئەو و، ئەمجا شکستەکە گۆڕدرا بۆ سەرکەوتن و، قورئانی پیرۆز هاتە خوارێ و بە موسڵمانەکانی فەرموو:

﴿وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئًا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ(٢٥)ثُمَّ أَنزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ الَّذِينَ كَفَرُوا وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ: خودا لەگەلیك شوێن بە هاناتان هات، رۆژی حونەینیش هەروەها، کە هەرچەندە بەزۆری خۆتان دەنازین، کەچی هیچ بەهرەی بۆ نەدان، ئەم زەمینە فراوانەتان لێ تەنگ بوو، لە دواییدا هەموو پاشەکشەتان کرد و بەرەودوا گەڕانەوە.. پاشان خودا دڵنیایی بۆ پێغەمبەرەکەی خۆی و بڕواداران رەوانە کرد و، زۆر پێشمەرگەی دابەزاند کە نەتاندەدیتن، خوانەناسانی سزا دا و، سزای خوانەناسەکان هەر ئەمەیە.﴾التوبة/٢٥-٢٦.

* * *

دەنگی (عەباس) و خۆڕاگریەکەی لەو رۆژەدا لە گەشەدارترین دیاردەکانی سەبووری و سەرکەوتن بوو.. لەکاتێکدا کە موسڵمانەکان لە یەکێك لە دۆڵەکانی (تیهامە) کۆبوو بوونەوەو چاوەڕوانی هاتنی دوژمنەکەیان دەکرد، هاوەڵپەرستان بەر لەوان چووبوونە دۆڵەکە و لەنێو لاپاڵ و شیوەکانیدا بۆسەیان بۆ نابوونەوەو، چەکەکانیان تیژکردبووەوە، دەستیان بە جڵەوی دەستپێشخەرییەوە گرتبوو..

لەساتی بێئاگابووندا، لە کارێکی کت وپڕی سەرسوڕهێنەردا دایان بەسەر موسڵمانەکاندا و، وای لێکردن بۆ دوور رابکەن و، کەس ئاوڕ لە کەس نەداتەوە..

پێغەمبەری خوداشﷺ کە شوێنەواری ئەو هێرشە لەناکاوە قڕستراوەی بینی کە بەسەر موسڵماناندا هات، چووە سەر ئەسپە سپیەکەی و هاواری کرد:

{بۆ کوێ دەڕۆن خەڵکینە..؟؟

بگەڕێنەوە بۆ لام..

من پێغەمبەرم و درۆناکەم..

من نەوەی -عبدالمطلب-م}..

ئا لەو کاتەدا تەنها (ئەبوبەکر) و (عومەر) و (عەلی کوڕی ابوطالب) و (عەباسی کوڕی عبدالمطلب) و کوڕەکەی (فەزڵی کوڕی عەباس) و (جەعفەری کوڕی حارس) و (رەبیعەی کوڕی حارس) و (ئوسامەی کوڕی زەید) و (ئەیمەنی کوڕی عەبید) و چەند هاوەڵێکی دیکە لە دەوری پێغەمبەر بوون.

ئا لەوێدا ئافرەتێك هەبوو کە جێگایەکی بڵندی لەنێو پیاوان و پاڵەواناندا گرتبوو..

ئەویش (ئوم سولەیمی کچی میلحان) بوو..

شڵەژان و لەرزینی موسڵمانانی بینی و، سواری وشترەکەی (ئەبوتەڵحە)ی مێردیﷺ بوو و، خێرا بەرەو لای پێغەمبەر چوو..

کاتێك کە کۆرپەڵەکەی ناوسکی جووڵا –کە سکی پڕ بوو–، عاباکەی لابرد و توند سکی خۆی پێ بەست و کاتێ گەیشتە لای پێغەمبەرﷺ خەنجەرەکەی بەدەستی راستیەوە گرتبوو، پێغەمبەر زەردەخەنەیەکی بۆ کردو پێی فەرموو:

{ئوم سولەیم..؟؟}

وتی:

{بەڵێ.. باوك و دایکم بە قوربانت بێ ئەی پێغەمبەری خوا..

ئەوانە دەکوژم کە تۆ دەڕوخێنن، هەروەك چۆن ئەوانە دەکوژیت کە لە دژت دەجەنگن، چونکە ئەوانە شایستەی ئەوەن}..

زەردەخەنەکە زیاتر لەسەر روخساری پێغەمبەری متمانەدار بە وادەی پەروەردگاری گەشایەوەو پێی فەرموو:

{خوای گەورە بەسە و چاکتریشە ئەی ئوم سولەیم}..!!

* * *

ئا لێرەدا کە پێغەمبەری خواﷺ ئا لەو هەڵوێستەدایە، (عەباس) لە تەنیشیەوە بوو، بگرە لە بەردەمیدا بوو، رەشۆی ولاخەکەی گرتبوو، بەگژ مردن و مەترسیدا دەچوو..

پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێکرد کە هاوار لە خەڵکەکە بکات، (عەباس)یش کەسێکی بەخۆوە بۆی دەنگ گەورە بوو، دەستی کرد بە بانگ کردنیان:

{ئەی خەڵکی ئەنصار..

ئەی خاوەن بەڵێنەکان}..

وەك ئەوەی دەنگی بانگبەری قەدەر و ترسێنەری بێت..

خێرا هەڵاتوانی بەردەم ناڕەحەتیە لەناکاوەکەی زرینگاندەوە، کە لەو لاو ئەولای دۆڵەکەدا بڵاوببوونەوەو، هەتا بە یەك دەنگ وەڵامیان دایەوە:

{لبیك.. لە خزمەت داین.. لە خزمەت داین}..

هەڵگەڕانەوەو وەك ڕەشەبا گەڕانەوە، هەتا یەکێکیان وشترەکەی یان ئەسپەکەی نەدەڕۆیشت، لەسەری دادەبەزێ و شمشێر و زرێیەکە و کەوانەکەی هەڵدەگرێت و، بەرەو لای دەنگی (عەباس) دەچوو..

سەرلەنوێ شەڕەکە.. بەشێوەیەکی خوێناوی و، توند دەستی پێکردەوە..

پێغەمبەری خوداشﷺ هاواری کرد:

{ئێستاکە شەڕ گەرم بووە}...

بەراستیش شەڕ گەرم بووبوو..

کوژراوانی (سەقیف) و (هەوازن) خزان و، ئەسپەکانی خودا زاڵ بوون بەسەر ئەسپەکانی لاتدا و، خوای گەورە سەبووری خۆی بەسەر پێغەمبەرەکەی و بڕواداراندا باراند..!!

* * *

پێغەمبەری خواﷺ (عەباس)ی مامی زۆر زۆر خۆشدەویست، هەتا ئەو ڕۆژەی غەزای بەدر تەواو بوو نەنوست، کە مامەی لەنێو دیلەکاندا شەوی بردە سەر..

پێغەمبەریشﷺ ئەو سۆزەی خۆی نەشاردەوە کاتێك لەبارەی خەوزڕانەکەیەوە پرسیاری لێکرا، لە کاتێکدا خوای گەورە سەرکەوتنێکی بێوێنەی پێبەخشیبوو، لە وەڵامدا فەرمووی:

{گوێم لە نکەنکی (عەباس) بوو بە بەستراوەیی}..

هەندێك لە موسڵمانەکان گوێبیستی قسەکانی پێغەمبەر بوون و، یەکێکیان خێرا بەرەو شوێنی دیلەکان چوو، کۆتەکانی (عەباس)ی شل کرد و، گەڕایەوە و هەواڵی دا بە پێغەمبەری خودا و پێی وت:

{ئەی پێغەمبەری خودا..

من لە کۆتەکانی (عەباس)م هەندێك شل کرد}..

بەڵام بۆ تەنها (عەباس)..؟

ئا لێرەدا پێغەمبەر بە هاوەڵەکەی فەرموو:

{بڕۆ وا لە هەموو دیلەکان بکە}..

بەڵێ، خۆشەویستی پێغەمبەر بەرامبەر مامەی، ئەوە ناگەیەنێت کە جیای بکاتەوە لەو خەڵکەی کە ڕەوشێکی وەك یەك کۆی کردونەتەوە..

کاتێکیش بڕیاردرا فیدیە لە دیلەکان وەربگیرێت، پێغەمبەر فەرمووی بە مامەی:

{ئەی عەباس..

فیدیەی خۆت و، -عەقیلی کوڕی ابوطالب-ی برازات و، -نەوفلی کوڕی حارس- و، -عوتبەی کوڕی عەمر-ی برای -حارسی کوڕی فەهر-ی هاوپەیمانت بدە، تۆ خاوەن سامانیت}...

(عەباس) ویستی کە بێ فیدیەدان لە دیلی دەرباز بێت، بۆیە وتی:
{ئەی پێغەمبەری خوا، من موسڵمان بووم، بەڵام هۆزەکەم بەزۆر هێنامیان}..
بەڵام پێغەمبەرﷺ سوور بوو لەسەر ئەوەی کە فیدیە بدات و، بۆ ئەو بۆنەیە ئایەتی قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوەو فەرمووی:
﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لِمَنْ فِي أَيْدِيكُمْ مِنَ الأَسْرَى إِنْ يَعْلَمْ اللَّهُ فِي قُلُوبِكُمْ خَيْرًا يُؤْتِكُمْ خَيْرًا مِمَّا أُخِذَ مِنْكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ: ئەی پێغەمبەر! تۆ بەو دیلانە بڵێ کە لەبەر دەستی ئێوەدان، ئەگەر خودا ئاگای لێبێ چاکەیەکتان لەدڵدایە، چاکتر لەوەی لێتان سەنراوە پێتان دەداتەوە و لێتان خۆش دەبێ، خودا لە گوناهان دەبوورێ و دلۆڤانە.﴾الأنفال/٧٠.
بەمجۆرە (عەباس) فیدیەی لەبری خۆی و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون دا و، بەرەو مەککە گەڕایەوە..

لەدوای ئەوە قورەیش عاقڵمەندی و چاوڕوونیەکەیان بۆ نەخەڵەتێنرا، پاش ماوەیەك سامانەکەی کۆکردەوەو شت و مەکەکەی هەڵگرت و ، خۆی گەیاندە لای پێغەمبەر لە خەیبەر، تا شوێنی خۆی لە کەژاوەی موسڵمانان و کاروانی بڕوادارانادا بەدەست بهێنێت و.. بۆیە جێگای خۆشەویستی و رێزێکی گەورە لای موسڵمانان، بەتایبەت کە رێز و خۆشەویستی پێغەمبەریان بەرامبەری دەبینی و گوێیان لێدەبوو لەبارەیەوە دەفەرموێ:
{عەباس لەجێگەی باوکمە..
جا هەرکەس ئازاری (عەباس) بدات ئازاری منی داوە}
ئەمجا (عەباس) نەوەیەکی پیرۆزی خستەوە.
کە (عبداللەی کوڕی عەباس)ی زانای ئوممەت یەکێکە لەو نەوە پیرۆزانەی.

* * *

لە رۆژی هەینی چواردەی مانگی رەجەبی ساڵی سی و دووی کۆچی خەڵکی بەرزاییەکانی مەدینە گوێبیستی هاوارکارێك بوون جاڕی دەدا:
{رەحمەتی خوا لەو کەسە بێت ئامادەی ناشتنی (عەباسی کوڕی عبدالمطلب) دەبێت}.
تێگەیشتن کە (عەباس) مردووە..
ئەمجار خەڵکێکی بێشومار هاتنە دەرەوە بۆ ناشتنی بەجۆرێ کە شاری مەدینە شتی وەهای بەخۆوە نەدیبوو..
خەلیفەی ئەو رۆژە (عوسمان)ﷺ نوێژی لەسەرکرد و..
لەژێر خاکی (بەقیع)دا جەستەی (ئەبولفەضل).. بە چاوگەشی، لە نێو ئەو چاکەخوازانەدا کە راستیان کرد لەگەڵ ئەو بەڵێنەیان دا کە بە پەروەردگاریان دابوو ئۆقرەی گرت و حەوایەوە ..!!

ڕاستە کە زیرەکی مرۆڤ لەسەر خۆی دەوەستێت..

خاوەن توانا ڕیزپەڕەکانیش زۆرجار ناڕەحەتی زۆریان تووش دەبێت، لەکاتێکدا کە دەبوو سوپاس و پێزانینیان پێ بکات..!!

هاوەڵی پایەبەرز (ئەبوهورەیرە)ش یەکێکە لەوانە..

خاوەنی بەهرەیەکی ڕیزپەڕ بوو لە تواناو هێزی بیریدا.

ئەو، هونەری گوێڕاگرتن زۆر چاك شارەزابوو، بیریشی ئاشنای هونەری لەبەرکردن و هەڵگرتن بوو..

گوێی دەگرت و، تێی دەگەیشت و، لەبەری دەکرد، دواتر یەك وشە.. یان یەك پیتی لەوەی کە تێی گەیشتبوو لەیاد نەدەچوو، هەرچەندە تەمەنی درێژ ببوایەو، ڕۆژگاری بەسەردا تێپەڕ ببوایە..!

لەپێناوی ئەوەدا بەهرەکەی ئەوەی بۆ ڕەخساندبوو کە لە زۆربەی هاوەڵانی زیاتر فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ لەبەر بکات و، لە هەمووشیان زیاتر فەرموودە ڕیوایەت بکا.

کاتێك کە سەردەمی (فەرموودە هەڵبەستەکان—الوضاعین) هات کە پسپۆڕ بوون لە درۆکردن بەدەم پێغەمبەری خواوەﷺ، ئەبوهورەیرەیان کردبووە بەهانەی خۆیان، ڕێز و ناوداری ئەویان لە گێڕانەوەی فەرموودە لە پێغەمبەرەوەﷺ قۆستبووەوە، هانی هەر فەرموودەیەکیان هەڵبەستایە دەیانوت: (ئەبوهورەیرە) وتی..!

خەریك بوو بەو کارەیان ناوبانگی (ئەبوهورەیرە) و پلەوپایەیان وەك فەرموودەگێڕەوەیەك لە پێغەمبەرﷺ دەخستە جێگەی گومان و ژێر پرسیارەوە، گەر ئەو هەوڵە باش و ڕێزپەڕە نەبوایە کە گەورەچاکەکاران ئەنجامیان دا و ژیانی خۆیان کردە قوربانی و تەرخانیان کرد بۆ خزمەتکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەر و ڕەتکردنەوەی هەموو هەڵبەستراو و زیادکراوێك تێیدا.

ئا لێرەدا (ئەبوهورەیرە) لەنێو جاڵجاڵۆکەی درۆ و دەلەسەکان دەرباز بوو، کە بەهۆیەوە خراپەکاران مەبەستیان بوو کە لە ڕێیەوە دزە بکەن بۆ ناو ئیسلام و دواتریش ئازار و تاوانەکەی بدەن بە کۆڵی ئەودا..!!!

ئائێستاش.. هەرکە گوێبیستی وتاربێژێ، یان مامۆستا، یان وتار خوێنێکی هەینی دەبین ئەم دەستەواژە ئاشنایە دەڵێت: (عن أبي هريرة ﷺ قال: قال رسول اللهﷺ...).

دەڵێم: کاتێك گوێبیستی ئەو ناوە دەبیت بەو جۆرە، یان کاتێك کە زۆر پێی دەگەیت و، لە زۆر جێگای پەڕاوی فەرموودە و، ژیاننامە و، فیقە و، ئایندا بەشێوەیەکی گشتی بەدی دەکەیت، بزانە کە بە هاوەڵێك دەگەیت کە لە زۆربەی هاوەڵان زیاتر سەرقاڵی هاوەڵێتی و گوێگرتن بوو.

چونکە گەنجینەی فەرموودە شیرینەکان و ئەو رێنوێنیە داناییانەی کە لە پێغەمبەرەوەﷺ لەبەری کرد، نموونەی زۆر کەمە..

ئەو، بەهۆی ئەو بەهرەو ، ئەو گەنجینەیەی کە هەیبوو، لە زۆربەی هاوەڵان بەتواناتر بوو لە گێڕانەوەی ئەو رۆژانەی کە پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانی ﷺ تێیدا ژیان و پێی گەیاندن-گەر ئیمانت پتەو و دەروونت بەپەرۆش بێت- بەو ئاسۆیانەی کە چاکەکانی (موحەممەد) و هاوەڵانی بەخۆی دی، کە مانای خوێن بەژیان دەبەخشێ و، تێگەیشتن و پێگەیشتنی بەرەو لای رێنوێنی دەکرد.

خۆ گەر ئەم دێڕانە پەرۆشی ئەوەیان کردبوێت کە ئاشنای ئەبوهورەیرە ببیت و گوێبیستی سەربوردە و بەسەرهاتی ببیت، ئەوا فەرموو ئەوە تۆ و ئەوەی کە دەتەوێت..

ئەو یەکێکە لەوانەی کە شۆڕشی ئیسلام هەموو ئەو گۆڕانکاریە مەزنانەی هێنایە ئارا تێیدا رەنگی دابوویەوە.

لە کرێگرتەییەوە بۆ سەرگەورە.

لە ونبوویەکی نێو جەنجاڵی، بۆ ناودار و پێشەوا..!!

لە کەسێکی کڕنۆش بەری بەردەم بەردێکی داتاشراو، بۆ بڕواداڕێك بەخودای تاك و تەنهای خاوەن دەسەڵات..

ئەوەتا خۆیشی دەدوێت و دەڵێت:

{بەهەتیوی گەورە بووم و، بە نەداری کۆچم کرد و.. کرێگرتەی (بوسرەی کچی غەزوان) بووم بە نانەسکێ..!!

لەکاتی دابەزینیاندا خزمەتم دەکردن و، لەکاتی سواربوونی وڵاخەکانیان بۆم دەگرتن..

ئێستاش ئەوەتام خودا ژنی پێ بەخشیوم و، سوپاسی خوا دەکەم کە ئایینی کردۆتە پاڵپشت و، ئەبوهورەیرەشی کردۆتە پێشەوا}..!

* * *

لەساڵی حەوتی کۆچیدا لە کاتێکدا کە پێغەمبەرﷺ لە خەیبەر بوو، هاتە خزمەتی پێغەمبەر و بە ویستی خۆی و پەرۆشییەوە موسڵمان بوو.

لەو ساتەوەی کە پێغەمبەری بینی و پەیمانی پێدا هەرگیز لێی جودا نەدەبوویەوە لەکاتی خەوتنندا نەبێت..

بەم جۆرە ئەو چوار ساڵە بۆخۆی تەمەنێك بوو.. تەمەنێکی فراوان و زۆر و، پڕ لە گوفتار و کردار و گوێگرتنی چاك بوو..

* * *

ئەبوهورەیرە بەهۆی فیترەتی راستی خۆیەوە ئەو رۆڵە گەورەیەی خۆی بۆ دەرکەوت کە دەتوانێت بۆ خزمەتکردنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئەنجامی بدات..

پاڵەوانانی جەنگ لەنێو هاوەڵاندا زۆرن..

فوقەها و، بانگخوازان و مامۆستایان زۆرن..

بەڵام ژینگە و کۆمەڵەکە نووسین و نووسەری تێدا نەبوو.

لەو سەردەمانەدا، هەموو گرۆی ئادەمیزاد، نەك بە تەنها عەرەب، گرنگیان بە نووسین نەدەدا و، نووسین لە نیشانەکانی پێشکەوتنی هیچ کۆمەڵگایەك نەبوو.

بگرە ئەورووپاش بەهەمان شێوە بوو تا چەند چەرخێکی لەمەوبەر.

زۆریەی پادشانشینەکانیشیان، لەسەروی هەموویانەوە (شارلمان) نەخوێندەوار بوون، خوێندنەوەو نووسین ئاشنا نەبوون، لە هەمان کاتدا خاوەنی زیرەکی و توانایەکی چاك بوون..

* * *

دەگەڕێینەوە بۆ قسەکانی خۆمان، تا ببینین کە ئەبو هورەیرە بەهۆی فیترەتیەوە پێداویستی ئەو کۆمەڵگا نوێیەی کە ئیسلام بوونیاتی دەنێت درك پێ دەکات بۆ کەسانێك کە کەلەپوور و داب و نەریتەکانی بپارێزێت، لەو رۆژانەدا ژمارەیەکی کەمی هاوەڵان هەبوو دەیانزانی بنووسن، پاشان هەندێکیان دەرفەتی ئەوەیان نەبوو کە پێغەمبەر هەرچی فەرموو تۆماری بکەن..

ئەبوهورەیرەش خوێندەوار نەبوو، بەڵکو لەبەرکار بوو، خاوەنی ئەو دەرفەتەش بوو، یان خۆی یەکلاکردبووەوە بۆ ئەو مەبەستەی، چونکە خاوەنی زەوی و زارێك نەبوو تا بیچێنێت و بازرگانیشی نەبوو تا بەدوایدا بچێت!!

ئەو کاتێ خۆی بینی درەنگ موسڵمان بوو، سووربوو لەسەر ئەوەی کە قەرەبووی ئەوە بکاتەوە کە لەدەستی چووە، ئەمەش بەوەی کە شوێن پێی پێغەمبەرﷺ هەڵبگرێت و بچێتە کۆڕ و دانیشتنەکانیەوە..

پاشان ئاشنای ئەو بەهرەیەی خۆی بوو کە خوای گەورە پێی بەخشیبوو، کە ئەویش بیری فراوانی بەهێزی بوو، کە بەهۆی نزای پێغەمبەرەوەﷺ بەوەی کە خوای گەورە پیرۆزتری بکات بۆ خاوەنی پرشنگدار و فراوانتر و بەهێزتر بوو..جا ئیدی بۆ نەبێتە یەکێك لەوانەی کە لەبەرکردنی ئەو کەلتورە لە ئەستۆیان بگرن و بۆ نەوەکانی داهاتووی بگوازنەوە..؟؟

بەڵێ.. ئەمە رۆڵی ئەوە کە بەهرەکانی سازی کردبوو بۆ ئەنجامدانی و، لەسەری پێویست بوو کە بەبێ تەمبەڵی پێی هەستێت..

* * *

ئەبوهورەیرە لەو کەسانە نەبوو کە دەیاننوسی، بەڵام هەروەك باسمان کرد زۆر زوو شتی لەبەردەکرد و مێشکی بەهێز بوو.

نە خاکێکی هەبوو تێیدا بچێنێت و نە بازرگانیەك سەرقاڵی بکات، پاشان لە گەشت و دانیشتنەکاندا لە پێغەمبەر دانەدەبڕا..

بەمجۆرە خۆی و وردبینی مێشکی سازکردبوو بۆ لەبەرکردنی فەرموودە و رێنوێنیەکانی پێغەمبەری خواﷺ..

کاتێك پێغەمبەریشﷺ گەڕایەوە لای پەروەردگاری باڵادەست، ئەبوهورەیرە دەستی دایە گێڕانەوەی فەرموودە و، سازکردنی، بەجۆرێك هەندێك لە هاوەڵان سەریان سوڕدەما: ئەم هەموو فەرموودەی لەکوێ بوو، کەی بیستی و تێی گەیشت..

ئەبوهورەیرەش رۆشنایی خستە سەر ئەو دیاردەیە، وەك ئەوەی بەرامبەر ئەو گومان و دوودڵیانەی کە بۆ هەندێك لە هاوەڵان دروست بوو بەرگری لەخۆی بکات، وتی:

{ئێوە دەڵێن زۆر لەبارەی پێغەمبەرەوەﷺ قسە دەکات و دەڵێن: ئەو موهاجیرانەی کە بەر لەو موسڵمان بوون ئەو فەرموودانە باس ناکەن..؟؟

هاوەڵانی موهاجیرم کاروباری نێو بازاڕ سەرقاڵی کردبوون و، هاوەڵانی ئەنصاریش بەهۆی زەوی و زاریانەوە سەرقاڵ بوون..

منیش پیاوێکی نەدار بووم و، زۆر لە کۆڕ و دانیشتنەکانی پێغەمبەری خوادا ئامادە دەبووم، کاتێ کە ئەوان لەوێ نەبوون من لەوێ بووم و، ئەوەی ئەوان لە یادیان بکردیایە من لەیادم دەما..

پێغەمبەریشﷺ رۆژێکیان باسی کرد بۆمان و فەرمووی: کێ عەباکەی رادەخات تا لە قسەکانم دەبمەوە، پاشان بیداتەوە بەخۆیدا و هیچی لە یاد نەچێت لەوەی کە لە منی بیستووە..! ئەمجا عەباکەی منی راخست و قسەی بۆ کردن، پاشان دامەوە بە خۆمدا، سوێند بەخوا هیچم لەیاد نەچوو لەوەی کە گوێم لێی بوو..

سوێند دەخۆم بەخوا، ئەگەر لەبەر ئەو ئایەتەی قورئانی پیرۆز نەبوایە، هەرگیز باسی هیچ شتێکم بۆ نەدەکردن، کە ئەویش ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَىٰ مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ أُولَٰئِكَ يَلْعَنُهُمُ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ: ئەو کەسانەی، ئەو شتانەی لەو کتێبەدا هەیە و بۆ شارەزایی مرۆڤە، لەپاش ئەوەی ناردومانەتە خوارەوە، لەخەڵکی دەشارنەوە، خودا و هەموو نەفرینکاران نەفرینی لێدەکەن.﴾البقرة/١٥٩}

ئەبوهورەیرە بەم جۆرە راڤەی نهێنی پێشکەوتنی خۆی دەکات لە زۆر گێڕانەوەی فەرموودە لە پێغەمبەری خوداوەﷺ.

ئەو-یەکەم- لە کەسانی دیکە زیاتر دەستی بەتاڵ بووە بۆ هاوەڵێتی کردنی پێغەمبەر.

پاشان خاوەنی مێشکێکی بەهێز بوو، کە پێغەمبەر زیاتر بەرەکەتداری کرد و بەهێزتر بوو..

دوای ئەوە بەهۆی حەزپێکردنیەوە فەرموودە ناگێڕێتەوە، بەڵکو بەهۆی ئەوەی کە بڵاوکردنەوەی ئەو فەرموودانە بەرپرسیارێتی ئایینەکەی و ژیانیەتی، ئەگینا حەق و چاکەی نەئەدرکاند و، ئەوکاتەش کەمتەرخەم بوو، پاداشتی کەمتەرخەمەکانیش چاوەڕێی دەکرد.

لە پێناوی ئەودا فەرموودەی وەردەگرت و دەیگێڕایەوە، هیچ شتێك نەدەبووە ڕێگر و هیچ کۆسپێکی لە رێدا نەبوو بۆ فەرموودە گێڕانەوە.. هەتا رۆژێکیان ئەمیری بڕواداران (عومەر) پێی وت:

{یا ئەوەتا واز لە گێڕانەوەی فەرموودەی خوا دەهێنیت، یان ئەوەتا دوورت دەخەمەوە بۆ خاکی (دەوس)}..

مەبەستی خاکی هۆز و کەس و کارەکەی بوو.

ئەم رێلێگرتنەی ئەمیری باوەڕداران تۆمەت نەبوو بۆ ئەبوهورەیرە، بەڵکو ئەوە پاڵپشتی تێڕوانینێك بوو کە (عومەر) بونیاتی دەنا و دووپاتی دەکردەوە، کە ئەویش بریتی بوو لە: لەسەر موسڵمانان پێویستە لەو سەردەمەدا بەتایبەت کە جگە لە قورئان هیچ شتێکی دیکە نەخوێننەوە، لەبەر نەکەن، هەتا قورئان لە دڵ و دەروون و عەقڵیاندا دادەمەزرێت و دەچەسپێت..

چونکە قورئان پەڕاوی ئیسلامە و، دەستوور و، فەرهەنگیەتی، زۆر قسەکردنیش دەربارەی پێغەمبەری خواﷺ، بەتایبەت لەو ساڵانەی پاش وەفاتکردنیدا کە قورئانی تێدا کۆدەکرایەوە دوودڵیەکی دروست کردبوو کە هیچ پێویستی نەدەکرد و بێ سوود بوو..

لەبەر ئەوە (عومەر) دەیووت:

{بە قورئانەوە سەرقاڵ بن، چونکە قورئان فەرمایشتی خودایە}.

هەروەها دەیوت:

{کەمتر فەرموودە لە پێغەمبەری خواوە بگێڕنەوە، ئەوانە نەبێت کە کاری پێدەکرێت}.

کاتێك (ئەبوموسای ئەشعەری)یشی نارد بۆ عێراق، پێی وت:
{تۆ دەچیت بۆ لای کەسانێك کە مزگەوتیان هەیە وەك پورەی هەنگ بە قورئانەوە سەرقاڵن، جا وازیان لێ بێنە بەوەی کە پێوەی سەرقاڵن و، سەرقاڵیان مەکە بە فەرموودەوە، لەوەشدا من هاوبەشتم}..
قورئانیش بەشێوەیەکی زۆر زامن کۆکرایەوە، بێئەوەی شتی دیکەی تێبکەوێت کە تێیدا نەبوبێت..
بەڵام فەرموودەکان (عومەر) ناتوانێت زەمانەی ئەوە بکات کە زیادە یان ساختەی تێدا نەکرێت، یان بکرێتە هۆکارێك بۆ درۆکردن بەدەم پێغەمبەری خواﷺو لێدانی ئیسلام..
ئەبوهورەیرەش رێزی تێڕوانینەکەی (عومەر)ی دەگرت، بەڵام لە هەمان کاتدا متمانەی بەخۆی و دەست پاکی خۆی هەبوو، نەیدەویست کە ئەو فەرموودە و زانیاریانە نەدرکێنێت کە لەو بڕوایەدایە شاردنەوەیان تاوان و تیاچوون بێت.
بەم جۆرە.. هیچ دەرفەتێکی نەدەدۆزییەوە بۆ خستنەڕووی ئەوەی لە سنگیدایە لە فەرموودە کە بیستویەتی و تێی گەیشتووە جگە لە گێڕانەوە و باسکردنی..

* * *

لەگەڵ ئەوەشدا هۆکارێکی گرنگ هەبوو، کە رۆڵێکی گەورەی هەبوو لە وروژاندنی ناڕەحەتی بۆ ئەبوهورەیرە، بەهۆی زۆر گێڕانەوەو باسکردنی فەرمودەکانیەوە.
چونکە لەو رۆژگارەدا فەرموودەناسێکی دیکە هەبوو کە فەرموودەی لە پێغەمبەرەوەﷺ دەگێڕایەوە و زیادەڕەوی تێدا دەکرد و، موسڵمانانیش لە هاوەڵان دڵنیا نەبوون لە زۆری فەرموودە گێڕانەوەی، کە ئەویش (کەعبی ئەحبار) بوو کە پێشتر جولەکە بوو پاشان موسڵمان بوو.

* * *

رۆژێکیان (مەروانی کوڕی حەکەم) ویستی توانای لەبەرکردنی ئەبوهورەیرە تاقی بکاتەوە، بانگی کرد بۆ لای خۆی، دایینیشاند و داوای لێکرد کە فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوەﷺ بۆ بگێڕێتەوە، لە کاتێکدا کە نووسەرانی خۆی لە پشتی پەردەوە دانابوو، فەرمانی پێکردبوون کە ئەبوهورەیرە هەرچی وت بینوسن.
پاش تێپەڕبوونی ساڵێك، مەروان جارێکی دیکە بانگی کردەوەو، ئەو فەرموودانەی لێ پرسیەوە کە نووسەرەکەی تۆماری کردبوو، ئەبوهورەیرەش یەك وشەی لەیاد نەچووبوو!!
جا لەبارەی خۆیەوە دەیوت:

{هیچ کام لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا لە من زیاتر فەرموودەی لە پێغەمبەری خواوە نەگێڕاوەتەوە، جگە لە (عبداللە‌ی کوڕی عەمری کوڕی عاص)، چونکە ئەو دەینووسیەوە، من نەمدەنووسی} ...

ئیمامی (شافیعی)یش-رەحمەتی خوای لێبێت- لەبارەیەوە دەڵێت:

{ئەبوهورەیرە لە هەموو فەرموودەگێڕەوەکانی سەردەمی خۆی زیاتری لەبەر کردبووە}..

(بوخاری)یش-رەحمەتی خوای لێبێت- دەڵێت:

{هەشت سەد یان زیاتر لە هاوەڵان و شوێنکەوتوان و زانست خوازان لە ئەبوهورەیرەوە فەرموودەیان گێڕاوەتەوە}.

بەم جۆرە ئەبوهورەیرە قوتابخانەیەکی گەورە بوو کە مانەوەو جاویدانی بۆ نووسرا..

ئەبو هورەیرەﷺ لە خواپەرستە بەردەوامەکان بوو، بە سەرە لەگەڵ ژن و کچەکەیدا هەموو شەو شەونوێژیان دەکرد و.. ئەو سێیەکی هەڵدەستا و ژنەکەیشی سێیەکی و کچەکەشی سێیەکی هەڵدەستا.. بەمجۆرە هەر سەعاتێکی شەو تێپەڕیایە ماڵی ئەبوهورەیرە پەرستش و یادی خودا و نوێژی تێدا ئەنجام دەدرا!!

لەپێناوی تەنها سەرقاڵ بوونیشی بۆ هاوەڵێتی پێغەمبەرﷺ بە رادەیەك ناڕەحەتی و برسێتی چەشت کە کەسی دیکە وەك ئەوی لێ نەهاتبێت..

ئەوەتا خۆی بۆمان باس دەکات: کە چۆن برسێتی ریخۆڵەکانی دەهێنا ژان، ئەمجا بەردی دەبەستەوە بە سکیەوە و دەستی دەگرت بە جەرگیەوە، لە مزگەوتدا دەکەوت و دەبورایەوە هەتا هەندێك لە هاوەڵانی وایان گومان دەبرد کە فێ(صرع)ی لەگەڵدایە، ئەو فێ گرتوو نەبوو..!

کاتێك کە موسڵمان بوو هیچ گیروگرفتێکی ژیانی نەمابوو کە نیگەرانی بکات و بەلایەوە گرنگ بێت جگە لە یەك گرفت نەبێت کە بەهۆیەوە خەو نەدەچووە چاوی..

ئەو گرفتەش دایکی بوو" چونکە لەو کاتەدا ئامادە نەبوو موسڵمان بێت..

تەنها هێندە نا، بەڵکو ئازاری کوڕەکەی دەدا و ناوی پێغەمبەری خودای بە خراپ دەهێنا لای..

ڕۆژێکیان ئەبوهورەیرە گوێی لێبوو قسەی ناخۆشی بە پێغەمبەری خواﷺ دەوت، بە گریان و دڵتەنگیەوە لەلای هەستا و، بەرەو مزگەوتی پێغەمبەر ڕۆیشت..

دەبا گوێ بۆ خۆی رادێرین پاشماوەی هەواڵەکەمان بۆ باس بکات:

{.... جا هاتم بۆ لای پێغەمبەری خوا بە گریانەوە و، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، دایکی ئەبو هورەیرەم بانگ کرد بۆ لای ئیسلام، بەڵام رازی نەبو و، ئەمڕۆش بانگم کردەوە بەڵام قسەی ناخۆشی بەرانبەر تۆ کرد، داوا لە خوا بکە کە رێنوێنی دایکی ئەبوهورەیرە بکات بۆ لای ئیسلام..

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: خودایا ڕێنوێنی دایکی ئەبوهورەیرە بکە..
ئەمجا چوومە دەرەوە و بەخێرایی ڕۆیشتم تا مژدەی پاڕانەوەکەی پێغەمبەری خودای بدەمێ، کاتێك گەیشتمە دەرگاکە بینیم داخراوەو گوێم لە خوڕەخوڕی ئاوبوو، بانگی لێکردم: ئەی ئەبوهورەیرە لە جێگای خۆت بوەستە..
پاشان جلەکانی لەبەر کرد و سەرپۆشەکەی دا بە سەریدا و هاتە دەرەوەو وتی: أشهد أن لا اله الا الله، وأشهد أن محمداً رسول الله.
ئەمجا گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەری خواﷺ لە خۆشیانا دەگریام، هەروەك چۆن پێشتر بەهۆی دڵتەنگیەوە دەگریام، وتم: مژدەت لێبێ ئەی پێغەمبەری خوا، خوای گەورە پاڕانەوەکەی گیراکردیت..
خوای گەورە هیدایەتی دایکی ئەبوهورەیرەی دا بۆ لای ئیسلام..
پاشان وتم: ئەی پێغەمبەری خوا! داوا بکە لە خوا کە من و دایکم لای بڕواداران خۆشەویست بکات..
پێغەمبەریش فەرمووی: خودایا ئەم بەندە بچوکەت و دایکی لای هەموو ژن و پیاوێکی بڕوادار خۆشەویست بکە}..

* * *

ئەبوهورەیرە بە خواپەرستی و، موجاهیدی ژیا و.. لە هیچ غەزا و، گوێڕایەڵیەك دوانەدەکەوت.
لەکاتی خەلافەتی (عومەری کوڕی خطاب)داﷺ کردیە والی بەحرەین.
(عومەر)یش وەك دەزانین لە لێپرسینەوەی والیەکانیدا زۆر توند بوو، گەر یەکێکیان بکردایەتە والی و لەو کاتەدا خاوەنی دوو پۆشاك بوایە، ئەوا دەبوو کە ئەو ڕۆژەی دەستی لە والیێتی هەڵدەگرت لە دونیادا تەنها دوو پۆشاکەکەی هەبوایە و.. چاکتریش کە وازی لێدێنێت تەنها پۆشاکێکی هەبێت..!!
بەڵام گەر، کە وازی لە والیێتی دەهێنا نیشانەی دەوڵەمەندی پێوە دیاربوایە، ئەوە لەو کاتەدا لە دەست لێپێچینەوەی (عومەر) دەرباز نەدەبوو، هەرچەندە سەرچاوەی دەوڵەمەندیەکەیشی حەڵاڵ و ڕێ پێدراو بێت!
دونیایەکی دیکە.. (عومەر) پڕی کردبوو لە جوانی و موعجیزە..!!
کاتێکیش ئەبوهورەیرە بوو بە والی بەحرەین هەندێ ماڵی کۆکردەوە، لە سەرچاوەی حەڵاڵەوە، (عومەر) بەوەی زانی و بانگی کرد بۆ مەدینە..
با لێگەڕێین ئەبوهورەیرە باسی ئەو گفتوگۆ خێرایەمان بۆ بکات کە لە نێوانیاندا روویدا:

{عومەر پێی وتم:
ئەی دوژمنی خودا و، دوژمنی کتێبەکەی، دزیت لە ماڵی خودا کردووە..؟؟
وتم: من نە دوژمنی خودام و، نە دوژمنی کتێبەکەی،.. بەڵام دوژمنی هەرکەسم کە دژایەتیان بکات..
منیش لەو کەسانە نیم دزی لە ماڵی خوا بکەم..!
وتی: ئەی لە کوێ دە هەزارت کۆکردەوە..؟؟
وتم: ئەسپم هەبوو زاوزێی کرد و، لەگەڵ بەخششی یەك لەدوای یەکی مانگانە..
عومەر وتی: دەی بیبەخشە بە (بەیتولمال)ی موسڵمانان}...!!
ئەمجا ئەبوهورەیرە سامانەکەی دا بە (عومەر) و پاشان دەستی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و وتی: {خودایە لە ئەمیری باوەڕداران خۆش ببە}...
پاش ماوەیەك (عومەر) ئەبوهورەیرەی بانگ کرد و داوای لێکرد سەرلەنوێ بیکاتە والی، ئەویش رەتی کردەوەو داوای لێبوردنی کرد و رازی نەبوو.
عومەر پێی وت: بۆچی؟؟
ئەبوهورەیرە وتی:
هەتا سوکایەتی بە ناموسم نەکرێت و، سامانم ببرێت و لە پشتم بدرێت..
پاشان وتی:
دەشترسم بەبێ زانین دادوەری بکەم.
و بەبێ لەسەرخۆیی قسە بکەم..

* * *

رۆژێکیان زۆر تامەزرۆی گەڕانەوە بۆ لای خودا بوو..
لە کاتێکدا ئەوانەی هاتبوونە سەردانی داوای چاکبوونەوەیان لە نەخۆشیەکەی بۆ دەکرد، ئەو لە خودا دەپاڕایەوەو دووبارەی دەکردەوە و دەیوت:
{خودایە من حەزم لە دیدارتە، دە تۆش حەز بە دیدارم بکە}..
ساڵی پەنجا و نۆی کۆچی لە تەمەنی حەفتا و هەشت ساڵیدا کۆچی دوایی کرد..
لەنێو ئارامگرتووە چاکەکارەکانی (بەقیع)دا لاشەی سپاردراوی جێگەیەکی پیرۆزی گرت...
لە کاتێکدا کە ئەوانەی لەگەڵ جەنازەکەیدا هاتبوون لە گەڕانەوەدا بوون، زۆر لەو فەرموودانەیان دەوت کە لە پێغەمبەر خوداوە لەبەری کردبوو بۆیان.
لەوانەیە یەکێك لە تازە موسڵمان بووەکانیش سەری لارکردبێتەوە بۆ لای هاوڕێکەی و لێی بپرسێت:

– بۆچی ئەم گەورە کۆچ کردووەمان نازناوی (ئەبوهورەیرە)ی لێنرا..؟؟
جا هاوڕێکەی کە شارەزای ئەوەیە وەڵامی دەداتەوە:
– لە سەردەمی نەفامیدا ناوی (عەبدلشەمس) بوو، کە موسڵمان بوو پێغەمبەر ناوی نا (عبدالرحمن).. جا زۆر بەسۆز بوو بەرانبەر گیانلەبەران و، پشیلەیەکی هەبوو، نانی پێدەدا و، هەڵیدەگرت و، خاوێنی دەکردەوەو، شوێنی بۆ دەکردەوە.. وەك سێبەر هەمیشە لەگەڵیدا بوو..
بەمجۆرە بانگکرا: ئەبوهورەیرە(باوکی پشیلە).. ڕەزای خودای لێبێت و ڕازی بکات.

* * *

٣٦

# بەڕای کوڕی مالیک

# خودا و بەهەشت

ئەو دوو کەسەی کە بۆ خودا ژیان و، پەیمانێکیان دا بە پێغەمبەری خوداﷺ کە لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا گەشەی کرد و بوژایەوە.

یەکێکیان (ئەنەسی کوڕی مالیك) خزمەتکاری پێغەمبەری خواﷺ بوو.

(ئوم سولەیم)ی دایکی لە تەمەنی بیست ساڵیدا هێنایە خزمەت پێغەمبەری خودا وتی: {ئەی پێغەمبەری خودا..

ئەمە (ئەنەس)ی خزمەتکارتە، خزمەتت بکات، لای خوا بۆی بپاڕێرەوە}..

جا پێغەمبەر نێوچەوانی ماچ کرد و دوعایەکی بۆ کرد کە تەمەنی درێژی بە چاکە و پیرۆزی بەسەر برد..

پێغەمبەر بۆی پاڕایەوە و فەرمووی:

{خودایا سامان و، کوڕی زۆری بدەرێ و، بەرەکەتداری بکە بۆی و، بیخەرە بەهەشتەوە}..

ئەمجا نەود و نۆ ساڵ ژیا و، کوڕ و کوڕەزای زۆری پێدرا، هەروەها خوا لە رزق و ڕۆزی باخێکی فراوانی دڵڕفێنی پێ بەخشیبوو، کە لە ساڵێکدا دووجار سێوی دەگرت..!!

* * *

دووەمین برایشیان (بەرائی کوڕی مالیك) بوو..

ژیانی مەزنی گیان لەسەردەستانەی خۆی بەسەربرد و، دروشمی:

{خودا و، بەهەشت}.. بوو.

هەرکەسێك لە کاتی شەڕکردنی لە پێناوی خوادا ببینیایە، سەرسوڕهێنەریەکی بەدی دەکرد لە سەروی سەرسوڕمانەوە بوو..

چونکە (بەراء) لەو کەسانە نەبوو کە لەکاتی شەڕکردنی بە شمشێرەکەی لە دژی بێباوەڕان بەدوای سەرکەوتندا وێڵ بوون، با لەو کاتەشدا سەرکەوتن باشترین ئامانج بوویێت..

بەڵکو ئەو عەودالی شەهیدبوون بوو..

هەموو ئومێدی ئەوەبوو کە بە شەهیدی بمرێت و، لەسەر خاکی بەرز لە جەنگەکانی حەق و ئیسلامدا بەڵێنەکەی بەجێ بهێنێت.

لەپێناوی ئەوەشدا لە هیچ مەیدان و غەزایەك دوانەکەوت..

ڕۆژێکیان براکانی چوونە سەردانی، ڕوخساری خوێندنەوەو پاشان وتی:

{پێدەچێت کە لەوە بترسن لەسەر نوێنگەکەم بمرم..

تا سوێند بەخوا، پەروەردگارم بێبەشم ناكات لە شەهیدی}..!!

گومانەكەیشی راست دەرچوو تێیدا و، (بەراء) لەسەر جێگاكەی نەمرد، بەڵكو لە یەكێك لە جوانترین جەنگەكانی ئیسلامدا بە شەهیدی گیانی سپارد..!!

* * *

پاڵەوانێتی (بەراء) لە رۆژی (یەمامە)دا هەر لەخۆی دەهات.. شیاو بۆ پاڵەوانێك كە (عومەری كوڕی خطاب) رایدەسپارد كە هەرگیز نەكرێتە سەركردە، چونكە جەسووری و چاونەترسی و، ڕاكردنی بەدوای مردندا.. هەموو ئەمانە لە جەنگاوەرانی دیكەی ژێر سایەی سەركردایەتیەكەی تووشی مەترسیەك دەكرد كە لە تیاچوون دەچوو..!!

(بەراء) لە رۆژی (یەمامە)دا راوەستا و، سوپای موسڵمانان بە سەركردایەتی (خالید) ئامادەبوو بۆ رووبەڕوو بوونەوە، وەستا چاوەڕێی ئەو چركەساتانەی دەكرد كە بەسستی وەك چەند ساڵێك بێت دەگوزەرا، بەر لەوەی سەركردە فەرمان بكات بە شاڵاو بردن..

هەردوو چاوی تیژی بەخێرایی و زرنگی دەگێڕا بەسەر هەموو گۆڕەپانی جەنگەكەدا، وەك ئەوەی بەدوای چاكترین جێگادا وێڵ بێ بۆ مردنی پاڵەوانەكە..!!

بەڵێ، جگە لەو مەبەستە هیچ شتێكی دیكە لە هەموو دونیادا سەرقاڵی نەكردبوو..

بێ باوەڕانی بانگەشەكاری تاریكی و ناڕەوایی بە شمشێرە بڕەڕەكەی زۆریان لێدەكەوت..

تا دواتر و لە كۆتایی شەڕەكەدا بەدەستی بێباوەڕێك لێدانێكی بەركەوت، كە بەهۆیەوە جەستەی كەوتە سەر زەوی، لە كاتێكدا گیانی بەرەو لای كۆمەڵی پایەبەرز لە زەماوەندی شەهیدان و، جەژنی پیرۆزبووەكاندا رێگای دەگرتە بەر..!!

* * *

خالید هاواری كرد: الله اكبر، جا ریزە تۆكمەكان بەرەو لای قەدەرەكانیان كەوتنە رێ و، لە گەڵیشیاندا (بەراءی كوڕی مالیك)ی شەیدای مردن بەڕێ كەوت..

رۆیشت و بە شمشێرەكەی دروێنەی شوێنكەوتوانی موسەیلەمەی درۆزنی دەكرد و، ئەوانیش وەك گەڵای پایز لەژێر توندی دەستەڵاتیدا هەڵدەوەرین..

لەشكری (موسەیلەمە) بێهێز و كەم نەبوو.. بەڵكو مەترسیدارترین سوپای هەموو هەڵگەڕاوەكان بوو..

بەزۆری ژمارە و چەك و تفاقی و بە شەڕكردنی جەنگاوەرەكانی، مەترسیەك بوو لەسەروی هەموو مەترسیەكانەوە..

بە بەرگرییەكی ئەوپەڕی توند وەڵامی هێرشی موسڵمانەكانیان دایەوە هەتا لەوەدابوو كە جڵەوی سەركەوتن بگرنە دەست و بەرگریكردنەكەیان بگۆڕێت بۆ هێرش بردن..

ئا لێرەدا ترسێك کەوتە ریزی موسڵمانەکانەوەو، سەرکردە و وتاربێژەکانیان دەچوونە سەر پشتی ئەسپەکانیان و وشەی دامەزراویان ئاراستە دەکرد و، وادە و بەڵێنی خودایان دەهێنایەوە یاد..

(بەرائی کوڕی مالیك)یش دەنگی بڵند و خۆش بوو..

(خالید)ی سەرکردە بانگی کرد و پێی وت: قسە بکە ئەی (بەراء)..

جا (بەراء) بە چەند وشەیەك هاواری کرد، کە لە سوپاسگوزاری و، جوانی و، بەهێزیدا بێوێنە بوو..

ئەویش ئەوەبوو:

{ئەی خەڵکی مەدینە..

ئەمڕۆ مەدینەتان نیە..

بەڵکو خودا و، بەهەشتتان هەیە}..

چەند وشەیەك کە گیانی بێژەرەکەی و پێشبینی خاسیەتەکانی دەخاتە روو.

بەڵێ..

ئەوە خودا و، بەهەشتان هەیە..!!

ئا لەو پێگەیەدا، ناکرێت خەیاڵات بۆ لای هیچ شتێکی دیکە بڕوات..

تەنانەت شاری مەدینەی پایتەختی ئیسلام و، ئەو وڵاتەی کە ماڵ و خاووخێزان و منداڵێ خۆیان تێیدا بەجێهێشتووە، نابێت بیری لێبکەنەوە، چونکە ئەگەر ئەمڕۆ شکست بهێنن، ئەوا مەدینەیان ئیدی هەرگیز نابێت..

وشەکانی (بەراء) رۆیشتن وەك.. وەك چی..؟

هەر وێکچوواندنێك بۆی ستەمە لە حەقیقەتی شوێنەوار و کاریگەریەکەی..

با بڵێین: وشەکانی (بەراء) رۆیشت و بەس..

کاتێکی کەمی بەسەردا تێپەڕی شەڕەکە گەڕایەوە سەر دۆخی سەرەتای..

موسڵمانەکان بەرەو پێشەوە دەچوون و، سەرکەوتنێکی تەواویان پێشی خۆیان دابوو..

بێباوەڕەکانیش بە شکستێکی بێزارەوە دەکەوتن..

(بەراء)یش لەوێدا لەگەڵ براکانیدا بە ئاڵاکەی (موحەممەد)ەوەﷺ بەرەو وادەی مەزنی دەڕۆیشتن..

بێباوەڕان بە راکردن بەرەو دواوە گەڕانەوەو، چوونە نێو باخچەیەکەوەو خۆیان تێدا پەنا دا..

شەڕەکەیش بە خوێنی موسڵمانان سارد بووەوە، وا دیاریبوو کە بەم فرت و فێڵەی شوێنکەوتوانی موسەیلەمە و سوپاکەی پەنایان بۆ بردووە دەکرێت چارەنووسی شەڕەکە بگۆڕدرێت..

ئا لێرەدا (بەراء) چوویە سەر گردێکی بەرز و هاواری کرد:
{ئەی کۆمەڵی موسڵمانان..
هەڵمبگرن و فڕێم دەن بەسەریاندا لە باخچەکەدا}..
ئەی پێم ئەوتن کە بەدوای سەرکەوتندا ناگەڕێت بەڵکو عەوداڵی شەهید بوونە..!!
لەم نەخشەیەشدا باشترین کۆتایی بۆ ژیانی و، چاکترین وێنەی مردنی بۆ خۆی هەڵبژاردبوو..!!
چونکە ئەو کاتێك دەخرێتە ناو باخچەکەوە، دەروازەکە لە موسڵمانان دەکاتەوە، لە هەمان کاتدا شمشێری بێباوەڕەکان لاشەی هەلاهەلا دەکەن، لەو کاتەشدا دەرگاکانی بەهەشت خۆی دەڕازێنێتەوەو والآ دەبێت بۆ پێشوازی زاوایەکی نوێ و، سەربەرزی دیکە..!!

* * *

(بەراء) چاوەڕێی نەکرد تا خەڵکەکە هەڵیبگرن و بیخەنە ناو باخچەکەوە، چویە سەر دیوارەکەی و، خۆی خستە نێو باخچەکە و دەروازەکەی کردەوەو، ئەمجا سوپای ئیسلام تێکی شکاند.
بەڵام خەونەکەی (بەراء) نەهاتە دی، نە شمشێری بێباوەڕان لەناوی برد، نە ئەو تیاچوونەیشی بۆ بوو کە خۆی بەتەمای بوو..
(ئەبوبەکر)یش ﷺ راستی وتووە لەبارەیەوە:
{سوور بوو لەسەر مردن.. ژیانی پێ بەخشرا}،،!!
راستە کە جەستەی ئەم پاڵەوانە لەو کاتەدا زیاد لە هەشتا لێدانی شمشێری بێباوەڕەکانی بەرکەوتبوو، هەشتا برین زیاتری تێ کەوتبوو، هەتا مانگێکی تەواو دوای شەڕەکەیش، (خالیدی کوڕی وەلید) خۆی سەرپەرشتی چارەسەرکردنی دەکرد..
راستە هەموو ئەو شمشێرانەی کە بەری کەوتووە ئامانج و خۆزگەی ئەوی نەهێنا دی..
بەڵام ئەوەش (بەراء) تووشی نائومێد بوون ناکات.. سبەینێ شەڕێکی دیکە روودەدات و، جەنگ و شەڕی دیکەی بەدوادا دێت..
پێغەمبەری خوا ﷺ پێشبینی ئەوەی بۆ کردبوو کە پاڕانەوەی لای خوا گیرایە..
جا ئەوەی لەسەریەتی تەنها ئەوەیە لە پەروەردگاری بپاڕێتەوە هەردەم کە شەهیدی پێ ببەخشێت، پاشان لەسەری پێویستە پەلە نەکات، چونکە هەموو ئاکامێك وادەی خۆی هەیە..!!
هەموو برینەکانی رۆژی (یەمامە)ی (بەراء) ساڕێژ دەبێ..

ئەمجا لەگەڵ سوپای موسڵمانانندا بەڕێدەکەوێت، کە بەرەو لەناوبردنی هێزی تاریکی دەچوون.. ئا لەوێدا دوو ئیمپراتۆریەتی پان و بەرینی تیابەر، رۆم و فارس، بە سوپا دەستدرێژیکارەکانیان وڵاتی خودایان داگیر کردبوو، خەڵکەکەیان دەکردە کۆیلە..

(بەراء) بە شمشێرەکەی لێی دەدا و، لە جێگەی هەر لێدانێکیشی دیوارێکی بڵند لە بونیاتنانی جیهانێکی نوێ دادەمەزرا کە لەژێر سایەی ئاڵای ئیسلامدا خێرا وەك رۆژی رووناك گەشەی دەکرد..

* * *

لە یەکێك لە شەڕەکانی عێراقدا، فارسەکان لە شەڕکردنیاندا پەنایان بردە بەر دڕندایەتیەکی زۆر خراپ کە لە توانایاندا بوو..

قولاپی چەسپ کراو بە زنجیر و سوورکراو بە ئاگریان بەکارهێنا و، لە قەڵاکانیان دەیانهاوێشت، بەر هەر کەس بکەوتایە لەو موسڵمانانەی کە نەیاندەتوانی خۆی لێ دوور بخەنەوە لێی گیردەبوو هەڵیان دەکێشا..

(بەراء) و برا مەزنەکەیشی (ئەنەسی کوڕی مالیك) لەگەڵ دەستەیەك لە موسڵمانەکاندا کاری یەکێك لەو قەڵایانەیان پێ سپێردرابوو..

بەڵێ لەناکاو یەکێك لەو قولابانە بەریووەوە و، لە (ئەنەس) گیر بوو و، ئەنەس لەبەر گەرمی نەیتوانی زنجیرەکە بگرێت تا خۆی لێ دەرباز بکا..

(بەراء) چاوی بەو دیمەنە کەوت و.. خێرا بەرەو لای براکەی هات کە زنجیرە سوورەوەبووەکە بەرەو سەر دیواری قەڵاکە بەرزی دەکردەوەو.. بە دەستی زنجیرەکەی گرت و بەوپەڕی توانایەوە دەستی دایە و خەریکی بوو هەتا کردیەوەو پچڕاندی و ئەنەس رزگاری بوو، (بەراء) و ئەوانەی لەگەڵیدابوون سەرنجێکی دەستیان دا لەجێگەی خۆیدا نەمابوو..!!

هەموو گۆشتەکەی توابووەوە، تەنها پەیکەری ئێسکەکەی بە سوتاوی و رەشی مابویەوە..!!

جا ئەم پاڵەوانە ماوەیەکی دیکە لە چارەسازی هێواشی لەسەرخۆدا بەسەر برد.. تا چاك بووەوە..

* * *

بەڵام کاتی ئەوەیە کە ئەم شەیدای مەرگە بە ئاواتی بگات..؟؟

بەڵێ.. ئێستاکێ..!!

ئا ئەوەتا جەنگی (توستور) دێتە پێشەوە تا تێیدا موسڵمانەکان ڕووبەڕووی سوپای فارسەکان ببنەوەو..

ببێتە جەژنیش بۆ (بەراء)، بەلام چ جەژنێك..

* * *

خەڵکی ئەهواز و، فارسەکان لە سوپایەکی چڕوپڕدا کۆبوونەوە تا جەنگی موسڵمانەکان بکەن..

ئەمیری باوەڕداران (عومەری کوڕی خطاب)یش نامەیەکی نووسی بۆ (سەعدی کوڕی ئەبووەقاص) لە کوفە تا سوپایەك بنێرێت بۆ ئەهواز.

نامەیەکیشی نووسی بۆ (ئەبوموسای ئەشعەری) لە بەصرە تا سوپایەك رەوانەی ئەهواز بکات، لە نامەکەدا بۆی نووسیبوو:

{(سوهەیلی کوڕی عەدی) بکە بە ئەمیری سەربازەکان..

با (بەرائی کوڕی مالیك)یشی لەگەڵدا بێت}..

جا ئەوانەی لە کوفەوە هاتبوون لەگەڵ ئەوەی لە بەسرەوە ڕۆشتبوون بە یەك گەیشتن تا رووبەڕووی سوپای ئەهواز و لەشکری فارسەکان ببنەوە لە شەڕێکی سەختدا..

ئەو دوو برا مەزنەش لەنێو سەربازە بڕوادارەکاندا بوون.. (ئەنەسی کوڕی مالیك)و.. (بەرائی کوڕی مالیك)..

شەڕەکە بە زۆرانبازی دەستی پێکرد، (بەراء) بە تەنها خۆی سەد پاڵەوانی فارسی لەناو برد..

پاشان شەڕ گەرم بوو لە نێوان سوپاکاندا و، ژمارەیەکی زۆر زۆر کوژراو لە هەردوو لا دەکەوتن..

هەندێك لە هاوەڵان لە کاتێکدا کە جەنگ بەردەوام بوو، لە (بەراء) نزیك بوونەوەو بانگیان کرد و پێیان وت:

{ئایا (بەراء) ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەرت لەبارەی خۆتەوە لەیادە:

((قژ بژێکی تۆزاوی دەم و چاو ئاوساو بێت و گوێی پێ نەدات، ئەگەر سوێند بخوات لەسەر خوای گەورە، سوێندەکەی ناشکێنێت، (بەرائی کوڕی مالیك) یەکێکە لەوانە..؟

ئەی (بەراء)، سوێند لەسەر پەروەردگارت بخۆ، کە شکستیان پێ بهێنێت و سەرمان بخات}..

جا (بەراء) دەستەکانی بەرەو ئاسمان بە ملکەچیەوە بەرزکردەوەو داوای کرد:

{خودایە شانیانمان بخە بەردەست..

خودایا بیانشکێنە.. و

سەرمان بخە بەسەریاندا..

ئەمڕۆ منیش بگەیەنە بە پێغەمبەرەکەت}..

سەرنجێکی قۆڵی (ئەنەس)ی برای دا کە لە نزیکیەوە دەجەنگا.. وەك ئەوەی ماڵئاوایی لێ بکات..

ئەمجا موسڵمانەکان بە شێوەیەکی وا بوێرانە دەرپەڕین کە دونیا جگە لەوان لەکەسی دیکەی نەبینیوەو..

سەرکەوتنێکی روون و ئاشکرایان بەدەست هێنا.

*　　*　　*

(بەراء)یش لە نێو شەهیدەکانی جەنگەکەدا بوو، زەردەخەنەیەکی شادی وەك گزنگی بەرەبەیان روخساری بەرزکردۆتەوە و.. دەستی راستی لەسەر خۆڵەکە تێکەڵ بوو بە خوێنەکەی..

شمشێرەکەیشی لە تەنیشیەوە بوو.. بەهێز و بێ کەلێن، رێك و بێ شکاوی.. بەراستی رێبوارەکە گەیشتەوە خانەی خۆی..

لەگەڵ برا شەهیدەکانیدا کۆتاییان بە گەشتی تەمەنێکی پایەبڵند و مەزن هێنا و، بانگیان لیّکرا:

﴿أَنْ تِلْكُمُ الْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ: ئەمە ئەو بەهەشتەیە کە پێتان دراوە، لە پاداشتی ئەو کارانەی کردووتانە.﴾الأعراف/٤٣.

*　　*　　*

لەنێو کەسانی زوو موسڵمان بوو و، کۆچکردوانی سەرەتا بۆ حەبەشە و، پاشان بۆ مەدینە..

لەنێو ئەو تیرهاوێژە زرنگانەدا کە لە پێناوی خوادا بەچاکی تاقیکرانەوە، ئەو پیاوە زۆر بالابەرزە، رووخسار گەشە، دڵ دامەزراوە (عوتبەی کوڕی غەزوان)ە..

حەوتەمین کەسە لەوانەی زۆر زوو موسڵمان بوون و، دەستی راستیان خستە نێو دەستە راستی پێغەمبەری خواوەﷺ و، بەڵێنیان دا و بەرەنگاری قورەیش بوونەوە بەو هەموو توانا و دەسەلاتەی کە هەیبوو بۆ تۆلەسەندنەوە.

لە رۆژانی سەرەتای بانگەوازدا.. رۆژانی تەنگانە و سەختی، (عوتبەی کوڕی غەزوان) خۆی راگرت لەگەڵ براکانیدا، ئەو خۆگرتنە بەرزەی کە دواتر بوویە توێشووی مرۆڤایەتی کە بە درێژایی رۆژگار لێی تێر دەبوو و، گەشەی پێ دەکرد.

هەر کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی کرد بە هاوەلانی کە کۆچ بکەن بۆ حەبەشە، (عوتبە)ش لەگەڵ کۆچکاراندا چوویە دەرەوە..

بەلام پەرۆشی بۆ پێغەمبەرﷺ لێنەگەڕا لەوێ جێگیر ببێت، هەر بۆیە زۆر خێرا رێگای دەشت و دەر و دەریای گرتەبەر و گەڕایەوە بۆ مەککە و، لە پەنای پێغەمبەردا بوو تا سالی کۆچکردن بۆ مەدینە هات، ئەمجا (عوتبە)ش لەگەڵ موسڵمانەکاندا کۆچی کرد..

لەو ساتەوەی قورەیش پەلاماردانی خۆی دەست پێکرد و پاشانیش کە شەڕی کرد، (عوتبە) رم و تیرەکانی بە شانەوە بو، بە لێزانیەکی بێوێنەوە دەیهاوێشت و، لەگەڵ برا بڕوادارەکانیدا بەشداری دەکرد لە هەرەس پێهێنانی جیهانی کۆنی بە هەموو بت و هەڵبەستراوەکانیەوە..

ئەو رۆژەیش پێغەمبەری ئازیز گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری بالادەست چەکەکەی دانەنا، بەلکو بەردەوام لەسەر زەویدا دەجەنگا و، لە شەڕکردنیش لەگەڵ فارسەکاندا کۆششی مەزنی هەیە..

* * *

ئەمیری باوەڕداران (عومەر) ئەرکی رزگارکردنی (ئەبولە)ی پێسپارد، تا خاکەکەی لە فارسەکان پاک بکاتەوە کە کردبوویانە خالێکی بازدان بەسەر هێزە شالاویەرەکانی ئیسلام بۆ نێو ئیمبراتۆریەتی فارسی، تا ولاتی خودا و بەندەکانی رزگار بکەن.

(عومەر) لەکاتی بەرێکردنیدا لەگەڵ سوپاکەیدا پێی وت:

{لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لەگەڵتدان بەڕێ بکەوە، تا دەگەنە ئەوپەڕی خاکی عەرەب و... سەرەتای خاکی عەجەم..
لەسەر بەرەکەت و قسمەتی خودا بەڕێ بکەوە..
هەر کەس وەڵامی دایتەوە بانگی بکە بۆ لای خوا..
هەرکەسیش ئیمانی نەهێنا، سەرانەی لێ بسێنە...
دەنا شمشێر بەکاربێنە بێ زیادەڕۆیی..
دوژمن لەناو بەرەو، لەخوای پەروەردگارت بترسە}..

* * *

(عوتبە)ش بە سەرکردایەتی سوپایەك کە گەورە نەبوو کەوتەڕێ، تا گەیشتە (ئەبولە)..
فارسەکان لەوێدا سوپایەکیان لە بەهێزترین سوپاکانیان مۆڵ دابوو..
عوتبەش سوپاکەی خۆی ڕێککرد و، لە پێشەوەی ڕاوەستا و، رمەکەی بە دەستیەوە گرتبوو، کە خەڵکی لەو ڕۆژەوەی فێری رم هاویشتن بووە شکستیان لێ نەدیبوو..!!
جا هاواری لە سوپاکەی کرد:
{الله اکبر، پەیمانەکەی هاتە دی}..
وەك ئەوەی نادیارێکی نزیك بخوێنێتەوە، دوای چەند پەلامارێکی پیرۆز (ئەبولە) کەوتە دەستیان و خاکەکەیان لەسەربازانی فارس پاك کردەوە و، خەڵکەکەی رزگار بوو لە چەوسانەوە کە لە مێژە دەچەوسێنرانەوەو.. خودای مەزنیش وادە و بەڵێنی خۆی بردە سەر..
(عوتبە) لەجێی (ئەبولە) نەخشەی شاری بەصرای کێشا و، ئاوەدانی کردەوەو مزگەوتە گەورەکەی دروست کرد..
ویستی ئەوێ بەجێ بهێڵێت و بگەڕێتەوە بۆ مەدینە و، تا لە دەستەڵاتدارێتی هەڵ بێت، بەڵام ئەمیری باوەڕداران فەرمانی پێکرد کە بمێنێتەوە..
جا (عوتبە) لەجێگای خۆی مایەوەو نوێژی بە خەڵکەکەی دەکرد و، لە ئاینەکەیان تێی دەگەیاندن و، دادگەرانە دادوەری نێوانیانی دەکرد و، جوانترین نمونەی دونیانەویستی و پارێزکاری سادە گوزەرانی پیشان دەدان.
بە هەموو تواناشیەوە لە دژی ڕابواردن و زیادەڕەوی تێدەکۆشا، هەتا هەندێك لەوانەی ئارەزوومەندی خۆشگوزەرانی و ئارەزووەکان بوون سەرزەنشتیان کرد..
ئا لێرەدا (عوتبە) هەستا وتارێکی ئاراستە کردن و وتی:
{سوێند بەخوا، حەوتەمین کەس بووم لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ جگە لە گەڵای دار خۆراکمان نەبوو بیخۆین هەتا ناودەممان بریندار دەبوو..

ڕۆژێکیان عەبایەکم بۆ هات، کردم بە دوو کەرتەوە، نیوەیم دا بە (سەعدی کوڕی مالیك) و، نیوەکەی دیکەشم پۆشی}..

* * *

عوتبە لە مەترسی دونیا بۆ سەر دینی زۆر دەترسا و، بۆسەر موسڵمانانیش ترسی هەبوو، هەر بۆیە لەسەر ڕازیبوون و زیری گوزەران ڕای دەهێنان.

زۆر کەسیش هەوڵیان دا کە لەو ڕێبازەی خۆی لای بدەن و، هەستکردن بە بەرپرسیارێتی و، ئەو مافانەی کە بەرپرس هەیەتی لە دەروونیدا بوروژێنن، بەتایبەت لەو وڵاتانەدا کە پێشتر بەم جۆرە بەرپرسە دونیانەویستە کەم خۆرلنە رانەهاتووەو، خەڵکەکەیشی وا ڕاهاتوون کە ڕێزی روکەشی بەرز و رازاوە بگرن.. جا (عوتبە) وەڵامی دەدانەوە و، دەیوت:

{پەنا دەگرم بەخوا کە لە دونیاتاندا مەزن بم و، لای خوای گەورە بچووك}..!

ئەو کاتەیشی بێزاری لە ڕوخساری خەڵکیدا بەدی کرد بەهۆی توندی ئەو بەوەی کە لەسەر ڕازیبوون و کەم خۆری ڕابێن، پێی وتن:

{سبەینێ لەدوای من ئەمیرەکانتان دەبینن}..

وەرزی حەج هات و، یەکێك لە براکانی لەجێی خۆی لە بەصرا بەجێ هێشت و چوو بۆ حەج، کە حەجی کرد، سەردانی مەدینەی کرد، لەوێدا داوای لە ئەمیری باوەڕداران کرد کە لە ئەمیرایەتی لای بدات..

بەڵام (عومەر) وازی نەدەهێنا لەم پێرە پایە بڵندەی دونیا نەویستانی هەڵهاتوو کە تێکڕای مرۆڤایەتی شەیدای بوون.

پێی دەوتن:

{سپاردراوەکانتان دەخەنە سەر شانی من..

پاشان بە تەنها بەجێم دەهێڵن..؟؟

نا، سوێندم بەخوا هەرگیز لاتان نابەم}..!!

بەم شێوەیە وەڵامی (عوتبەی کوڕی غەزان)یشی دایەوە..

ئەو کاتەیشی کە (عوتبە) تەنها ئەوەی لە توانادا بوو کە گوێڕایەڵی بێت، سواری وڵاخەکەی بوو تا بگەڕێتەوە بۆ بەصرە..

بەڵام بەر لەوەی سواری بێت رووی کردە قیبلە و، هەردوو دەستی ملکەچی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوەو، لە پەروەردگاری باڵادەستی پاڕایەوە کە هەرگیز نەیگێڕێتەوە بۆ بەصرە و، بەرەو فەرمانڕەوایەتی..

پاڕانەوەکەیشی گیرابوو..

لە کاتێکدا کە بەڕێوە بوو بەرەو ویلایەتەکەی ئاکامی هات و..

گیانی بەرەو لای پەروەردگاری گەڕایەوە و پێچرابوویەوە بەو هەوا و بەخششانەی ئەنجامیدا بەو دونیانەویستی خۆگرتنەی لە گوناه..

و بەو نیعمەتانەی خوای گەورە پێی بەخشیبوو..

و بەو پاداشتانەی کە خوای گەورە بۆی ئامادەکردبوو..

* * *

# ٣٨

# سابیتی کوڕی قەیس

## وتاربێژی پێغەمبەری خوا

(حەسسان) شاعیری پێغەمبەری خوا و ئیسلام بوو..
(سابیت)یش وتاربێژی پێغەمبەری خوا و ئیسلام بوو..
وشەکان بە بەهێزی و، بەرزی و، پڕ واتایی و، جوانی لە زاری دەهاتنە دەر..
لەساڵی شاندەکاندا، شاندێکی (بەنی تەمیم) هاتنە مەدینە و بە پێغەمبەری خوایانﷺ وت:
{هاتووین شانازیەکانی خۆمانت بۆ باس بکەین، جا مۆڵەت بدە بە شاعیر و وتاربێژەکەمان}..
پێغەمبەریشﷺ زەردەخەنە گرتی و، پێی فەرموون:
{ئەوە مۆڵەتم دا بە وتاربێژەکەتان، با بڵێت}..
جا (عوطاردی کوڕی حاجب) هستا و خۆی هەڵدەکێشا بە شانازیەکانی هۆزەکەیەوە..
کاتێك کە لێبوویەوە، پێغەمبەرﷺ بە (سابیتی کوڕی قەیس)ی فەرموو: هەستە وەڵامیان بدەرەوە..
(سابیت)یش هەستایەوە وتی:
{سوپاس و ستایش بۆ خوا، کە ئاسمانەکان و زەوی دروستکراوی ئەوەو، فەرمانی خۆی تێدا بەدی هێناون و، بە زانینی کورسیەکەی فراوان کردووە، هیچ شتێك نیە هەرگیز لە فەزڵی ئەو نەبێ..
پاشان بە توانای ئەوەی کە کردووینەتیە پێشەوا، لە چاکترین دروستکراوانی خۆی نێردراوێکی هەڵبژارد، کە بنەچەی لە هەموان رێزدارترە و، لە هەموان راستگۆترە و، لە پایەدا لەهەمووان باشترە، جا پەیامی خۆی بۆ ناردە خوارێ و، کردیە متمانەپێکراوی لەسەر دروستکراوەکانی، جا هەڵبژاردەی خوا بوو لە ناو هەموو خەڵکدا..
پاشان خەڵکی بانگ کرد بۆ بڕواهێنان پێی، جا کۆچکارانی هۆزەکەی و خزمانی نزیکی بڕوایان پێ هێنا و،، باشترین خەڵك لە ڕەچەڵەکدا و، چاکترینیان لە کردەوەدا..
دواتر ئێمەی ئەنصار یەکەمین کەس بووین بە دەمیەوە چووین..
جا ئێمە پشتیوانی خودا و، وەزیرەکانی پێغەمبەرەکەین}...

* * *

(سابیت) لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ بەشداری شەڕی (ئوحود) و، غەزاکانی دیکەی کرد..
گیانفیدایییەکەیشی بەجۆرێکی تەواو سەرسوڕهێنەر و.. مایەی سەرسام بوون بوو..!!

لە شەڕی هەڵگەڕاوەکانیشدا، هەمیشە لە پێشەوە بوو، ئاڵاهەڵگری ئەنصار بوو، بە شمشێرەکەیشی کە نە کول دەبوو نە دەشکا شمشێری دەوەشاند..

لە جەنگی (یەمامە)شدا، کە پێشتر چەند جارێك باسمان لێوە کرد، (سابیت) شوێنەواری ئەو هێرشە لەناکاوەی بینی کە سوپای (موسەیلەمەی درۆزن) بۆ سەر موسڵمانەکان ئەنجامیان دا، جا بە دەنگە گڕە بەرزەکەی هاواری کرد:

{سوێند بەخوا، لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ بەم جۆرە شەڕمان نەدەکرد}..

ئەمجا رۆیشت و زۆر دوورنەکەوتەوەو، گەڕایەوەو خۆی وەك مردوو لێکردبوو، کفنی لەبەر کردبوو، جارێکی کە هاواری کردەوە:

{خودایە من بێبەریم لەوەی ئەوانە هێناویانە}

مەبەستی لەشکردەکەی موسویلەمە بوو..

{داوای لێبوردنیشت لێدەکەم لەوەی کە ئەمانە ئەنجامیان دا..}

مەبەستی کەمتەرخەمی موسڵمانەکان بوو لە شەڕکردندا..

سالمی خزمەتکاری پێغەمبەری خوداشﷺ چووە پاڵی، کە ئاڵاهەڵگری موهاجرین بوو..

جا هەردووکیان چاڵێکی قوڵیان بۆ خۆیان هەڵکەند و چوونە ناویەوەو راوەستان و خۆڵیان کرد بە سەریدا هەتا نیوەی هەریەکەیان داپۆشرا..

بەو جۆرە راوەستان.. وەك دوو کێوی بڵند، نیوەی هەر یەکەیان لەنێو قوڵایی چاڵەکەدا جێگیر بوو.. لە هەمان کاتدا نیوەکەی سەرەوەیشی- سینگ و ناوچەوان و باسکەکانی- بەرەو رووی سوپاکانی بت پەرستی و درۆ دەبویەوە..

بە شمشێرەکانیان لە هەرسەربازێکی سوپای موسویلەمەیان دەدا کە لێیان نزیك ببوایەتەوە هەتا هەردووکیان لە شوێنی خۆیاندا شەهید بوون و، خۆری هەردووکیان بەرەو ئاوابوون رۆیشت..!!

ئەو دیمەنەیانﷺ مەزنترین هاوار بوو کە رۆڵی هەبوو لە هاتنەوەی موسڵمانەکان بۆ جێگەی خۆیان، کە سوپای (موسەیلەمەی درۆزن)یان کردە خۆڵی ژێر پێیان..!!

* * *

(سابیتی کوڕی قەیس)یش.. ئەو پیاوەی لە وتاربێژی و شەڕکردندا باڵادەست بوو، هەڵگری دەروونێکی گەڕاوە و، دڵێکی ملکەچ بوو، لە موسڵمانان زیاتر ترسی لە خوا هەبوو و شەرمی لێ دەکرد..

کاتێك ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزیش هاتە خوارێ:

﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ: خودا ئەوانەی خۆش ناوێت کە بەفیزەوە بەرێگادا دەڕۆن و شانازی بەخۆیانەوە دەکەن.﴾لقمان/١٨.

(سابیت) دەروازەی ماڵەکەی داخست و، دانیشت دەگریا.. و مانەوەی لەماڵدا بەو جۆرە

درێژەی کێشا، هەتا هەواڵی ئەو کارەی گەیەنرا بە پێغەمبەری خواﷺ، ئەویش بانگی کرد و لێی پرسی.

(سابیت) وتی:

{ئەی پێغەمبەری خوا، من حەزم لە پۆشاکی جوان و، پێڵاوی شەنگە، جا ترسام کە بەوە لە شانازیکاران بم}..

پێغەمبەرﷺ بە زەردەخەنەیەکی ڕازیمەندەوە، وەڵامی دایەوە:

{تۆ لەوانە نیت..

بەڵکو بەچاکی دەژیت و..

بە چاکیش دەمریت و..

دەچیتە بەهەشت}..

کاتێك ئەو ئایەتەش هاتە خوارێ:

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلاَ تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَنْ تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنْتُمْ لاَ تَشْعُرُونَ: ئەی گەلی باوەڕداران! نەکەن دەنگتان بەسەر دەنگی پێغەمبەر کەوێ، شێوازی ئاخاوتنیشتان لەگەڵی، بەشێوەی ئاخاوتنی نێوان خۆتان نەبێت، نەوەکو بەبێ ئەوەی بەخۆتان بزانن کارەکانتان لێ پوچەڵ بێتەوە.﴾الحجرات/٢.

(سابیت) دەروازەیماڵەکەی داخست و دەستی کرد بە گریان.

پێغەمبەریشﷺ کە نەیدەبینی پرسیاری لەبارەوە کرد و، ناردی بە شوێنیدا و بانگی کرد..

(سابیت)یش هات..

جا پێغەمبەر لەهۆی دیارنەبوونەکەی پرسی، وەڵامی دایەوە:

{من پیاوێکی دەنگ گەورەم..

پێشتر دەنگم بەرز دەکردەوە بەسەر دەنگتدا ئەی پێغەمبەری خوا..

کەوابوو کردەوەکانم پوچەڵ بوونەوەو، من لە پێڕی ناو ئاگرم}..!!

پێغەمبەریشﷺ وەڵامی دایەوە:

{تۆ لەوانە نیت..

بەڵکو بەپاکی دەژیت و..

بەشەهیدی دەکوژرێیت و..

خوای گەورەش دەتخاتە بەهەشتەوە}..

* * *

لە سەربردەی (سابیت) دا ڕووداوێك ماوە، کە ئەوانەی بیرکردنەوەو تێڕوانینیان لەنێو جیهانی تەنگی ماددیاندا کورتی هێناوە کە دەستی لێدەدەن، یان دەیبینن، یا بۆنی دەکەن،

پێی ناحەوێنەوە..!!

لەگەڵ ئەوەشدا، ڕووداوەکە ڕاستە و، ڕاڤەکەیشی ڕوون و ئاسانە بۆ هەر کەسێك کە لەگەڵ بینینیدا بەرچاوڕوونی بخاتە کار..

پاش ئەوەی کە (سابیت) لە شەڕەکەدا شەهید بوو، یەکێك لە تازە موسڵمان بووەکان بەلایدا تێپەڕی کرد و زرێپۆشە بەنرخەکەی بەسەر لاشەی (سابیت)ەوە بەدی کرد و وای گومان برد کە مافی خۆیەتی بیبات بۆ خۆی و بردی..

با لێگەڕێین گێڕەرەوەکە خۆی بۆمانی باس بکات:

{.. لەکاتێکدا کە پیاوێك لە موسڵمانەکان خەوتبوو، (سابیت) هاتە خەونی و، پێی وت:

وەسیەتێکت بۆ دەکەم، جا نەکەی بڵێیت: ئەوە خەونە و ئەنجامی نەدەیت..

من کە دوێنێ شەهید بووم، پیاوێك لە موسڵمانەکان بەلامدا تێپەڕی و، زرێپۆشەکەی بردم..

ماڵەکەیشی لەوپەڕی خەڵکەکەیە و، ئەسپەکەیشی قەد بڵندە-واتە لە جڵەوەکەیدا-، مەنجەڵێکی بەسەردا داوە، لەسەر مەنجەڵەکەش کەلوپەلی داناوە.

جا بڕۆ بۆ لای (خالید)، فەرمانی پێ بکە بنێرێت بە دوایدا و بیهێنێتەوە..

کاتێك گەیشتیتەوە مەدینە و چوویتەوە لای (ئەبوبەکر)ی جێنشینی پێغەمبەری خوا، پێی بڵێ: کە من ئەوەو ئەوە قەرزم لەسەرە..

با هەستێت بە دانەوەی..

کاتێك پیاوەکە لە خەوەکەی ڕابوو، چوویە لای (خالیدی کوڕی وەلید) و، خەونەکەی بۆ گێڕایەوە..

جا خالید یەکێکی نارد زرێپۆشەکە بهێنێتەوە، هەروەك (سابیت) باسی کردبوو بە تەواوی دۆزییەوە..

کە موسڵمانەکانیش گەڕانەوە مەدینە، موسڵمانەکە خەونەکەی بۆ خەلیفە گێڕایەوە و، ئەویش وەسیەتەکەی (سابیت)ی بەجێ هێنا..

لە ئیسلامدا وەسیەتی مردوو بەو جۆرە بەجێ نەهێنراوە پاش مردنی، تەنها ئەو وەسیەتەی (سابیتی کوڕی قەیس) نەبێت}..

* * *

زۆر ڕاستە کە مرۆڤ نهێنییەکی گەورەیە..

﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ: ئەو کەسانەی لەڕێی خوادا کوژراون، هەرگیز بە مردوویان حیساب مەکەن، بەڵکو زیندوون و خودا بژێویان دەداتێ.﴾آل عمران/١٦٩.

## ٣٩

# ئوسەیدی کوڕی حوضەیر

# پاڵەوانی ڕۆژی سەقیفە

میراتگری لە باووباپیرانیەوە ئاکاریەرزی بوو..

باوکی کە (حوضەیری کوڕی کەتائیب)ە سەرگەورەی (ئەوس) و، یەکێك بوو لە پیاوماقوڵانی عەرەب و، جەنگاوەرە بەجەرگەکانی سەردەمی نەفامیدا..

شاعیرێك لەبارەیەوە وتویەتی:

| | |
|---|---|
| لو أن المنایا، حدنَ عن ذي مهابةٍ | لَهِبْنَ (حُضَیراً) یوم غلّق واقماً |
| یطـوف به، حتى اذا اللیـل جنّـه | تبـوّأ منـه مقعــدا متنـاغمــا |

(ئوسەید) رێز و، ئازایەتی و، بەخشندەیی لە باوکیەوە بۆ مابوویەوەو، بەر لەوەی کە موسڵمانیش ببێت، یەکێك بوو لە سەرگەورەکانی مەدینە و پیاوماقوڵانی عەرەب و، تیرهاوێژە زیرەکەکانیان..

کاتێك کە ئیسلامیش پاکی کردەوەو، بەرەو سەر رێگای راست و بەجێی پەروەردگاری باڵادەست و سوپاسکراو رێنوێنی کرا، جەسووریەکەی زیادی کرد و، پلەو رێزی گەشەدارتر بوو، ئەو رۆژەی کە جێگای خۆی گرت، بوو بە یەکێك لە پشتیوانانی خودا و پشتیوانانی پێغەمبەرەکەی و، هاتە ریزی ئەو کەسانەی زۆر زوو موسڵمان بوون.

* * *

موسڵمان بوونیشی زۆر خێرا و، یەکلاکەرەوەو، بەرێزانە بوو..

کاتێك کە پێغەمبەرﷺ (موصعەبی کوڕی عومەیر)ی نارد بۆ مەدینە تا ئەو موسڵمانە ئەنصاریانەی لە پەیمانی عەقەبەی یەکەمدا بەڵێنیان دابوو بە پێغەمبەر فێریان بکات و تێیان بگەیەنێت و، کەسانی دیکەش بەرەو لای ئاینی خودا بانگ بکات.

لەو کاتەدا، (ئوسەیدی کوڕی حوضەیر) و، (سەعدی کوڕی مەعاذ) کە سەرگەورەی هۆزەکانیان بوون، پێکەوە دانیشتن و لەبارەی ئەو کارە ناوخۆیەوە دەدوان کە لە مەککەوە هاتووەو ئاینەکەی ئەمان بە پڕوپوچ دادەنێت و، بانگەشە بۆ لای ئاینێکی نوێ دەکات کە پێی ئاشنا نین..

(سەعد) بە (ئوسەید)ی وت: بەرەو لای ئەو پیاوە بەرێ بکەوەو قسەی پێ بڵێ و رێگری لێبکە..

(ئوسەید)یش خەنجەرەکەی هەڵگرت و بەرەو شوێنی میوانداری (موصعەب) کەوتەرێ کە لە ماڵی (ئەسعەدی کوڕی زورارە) بوو کە یەکێکە لە سەرگەورەکانی مەدینە و پێشتر موسڵمان بوو بوو..

لە کۆڕ و دانیشتنەکەی (موصعەب) و (ئەسعەدی کوڕی زورارە)شدا، (ئوسەید) خەڵکێکی بینی بە گرنگی و بایەخەوە گوێیان بۆ ئەو وشە چاکانە راگرتبوو کە (موصعەبی کوڕی عومەیر) بۆی دەکردن و بانگی دەکردن بۆ لای خوا..

جا (ئوسەید) سەرسامی کردن بە توڕەبوون و هەڵچوونەکەی.

(موصعەب) پێی وت:

{دەکرێت دابنیشیت و گوێراگریت.. لە هەرچی رازی بوویت ئەوا وەری دەگریت و، هەرچیشت پێناخۆش بوو، واز لەوە دەهێنین کە حەزت پێی نیە}..؟؟

* * *

(ئوسەید) پیاوێکی عەقڵ رۆشنی دڵ زیرەك بوو، بەجۆرێ خەڵکی مەدینە ناویان لێنابوو (کامل).. کە ئەوەش نازناوێك بوو پێشتر باوکی پێی ناسرابوو..

هەر بۆیە کاتێك (موصعەب)ی بەدی کرد تێگەیشتن و عەقڵ دەکاتە دادوەر، خەنجەرەکەی لە زەویەکەدا چەقاند و، بە (موصعەب)ی وت:

– بەراستی باشت وت، چیت لایە بیڵێ..

ئەمجا (موصعەب) دەستی دایە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز و، راڤەکردنی بانگەشەی ئاینی نوێ بۆی.

ئەو ئاینە راستەی کە موحەممەد فەرمانی راگەیاندنی و، بڵاوکردنەوەی بنەماکانی پێکراوە.

ئەوانەی ئامادەی ئەو دانیشتنە بوون دەڵێن:

{سوێند بەخوا، ئیسلاممان لە روخساری (ئوسەید)دا بەدی کرد بەر لەوەی کە قسە بکات.. لە درەوشانەوەو کرانەوەیدا هەستمان پێکرد}..!!

* * *

هەر کە (موصعەب) لە قسەکانی بووەوە (ئوسەید) بە سەرسامیەوە هاواری کرد:

{چەند قسەیەکی جوان و بەجێیە..

چی دەکەن ئەگەر بتانەوێت بێنە نێو ئەم ئاینەوە}..؟

(موصعەب) پێی وت:

{جەستە و، پۆشاکەکانت پاك بکەیتەوە، شایەتی حەق بدەیت و، پاشان نوێژ بکەیت}..

ئوسەید، خاوەن کەسایەتیەکی دامەزراو و بەهێزی بێگەرد بوو، ئەویش کە ئاشنای رێگەی خۆی بوو، بۆ چرکەساتێك لەبەردەم ویستە چەسپاوەکەیدا دوودڵ نابێ..

دوای ئەوە (ئوسەید)، بەبێ هیچ دواخستن و خاوەخاویەك هەستا بۆ پێشوازی کردنی ئەو ئاینەی کە دڵی بۆی کرایەوە، گیانی پێی گەشەدار بوو، خۆی شۆرد و پاکژبوویەوە، پاشان

کڕنووشی بۆ پەروەردگاری جیهانیان برد و، موسڵمان بوونی خۆی راگەیاند و، ماڵئاوایی لە رۆژانی بتپەرستی و نەفامێتی خۆی کرد..!!

دەبوو (ئوسەید) بگەڕێتەوە بۆ لای (سەعدی کوڕی مەعاذ)، تا هەواڵی ئەو ئەرکەی پێ بگەیەنێت کە خستیە ئەستۆی، ئەرکی رێگرتن لە (موصعەبی کوڕی عومەیر) و دەرکردنی..

گەڕایەوە بۆ لای (سەعد)..

هەرکە نزیك بوویەوە لە کۆڕ و دانیشتنەکەی، (سەعد) بەوانەی دەوروبەری خۆی وت:

{سوێند دەخۆم، کە (ئوسەید) بە روخسارێکی دیکە، جیا لەوەی کە رۆیشت گەڕایەوە}..!!!

بەڵێ..

لە راستیدا بە روخسارێکی پڕ تاڵی و تووڕەیی و، گرژییەوە رۆیشت و..

بە روخسارێکی داپۆشراو بە ئۆخەژن و سۆز و روناکیەوە هاتەوە..!!

* * *

(ئوسەید) بڕیاری دا کە کەمێك زیرەکیەکەی بخاتە گەڕ..

ئەو دەزانێت (سەعدی کوڕی مەعاذ) لە بێگەردی ناو دەروون و، توندی جەسوری و، ساغی بیرکردنەوەو مەزەندەکردنیدا تەواو وەك ئەمە..

دەزانێت کە لە نێوان ئەو و ئیسلامدا جگە لە گوێ لێبوونی ئەو فەرمایشتانەی خوای گەورە کە ئەم بیستی هیچی دیکە نیە، کە نێردراوی پێغەمبەر بۆ لایان (موصعەبی کوڕی عومەیر) بەچاکی دەزانێت بیخوێنێتەوە و راڤەی بکات..

خۆ گەر بڵێ بە(سەعد) من موسڵمان بووم، دە تۆش هەستە و موسڵمان ببە، ئەوا رووبەڕووبوونەوەیەکە سەرەنجامەکەی مسۆگەر نیە..

کەوابوو پێویستە لەسەری کە بەجۆرێ دەمارگیری (سەعد) بوروژێنێت کە پاڵی پێوە بنێت بۆ کۆڕ و دانیشتنی (موصعەب) تا ببیستێت و ببینێت..

جا چ رێگایەك بۆ ئەوە بگرێتە بەر..؟

* * *

(موصعەب) هەروەك پێشتر باسمان کرد، میوانی (ئەسعەدی کوڕی زورارە) بوو، (ئەسعەدی کوڕی زورارە)ش کوڕی پوری (سەعدی کوڕی مەعاذ) بوو..

ئا لێرەدا (ئوسەید) بە (سەعد)ی وت:

{بۆیان باسکردوم کە (بەنی حارثە) هاتونەتە دەرێ بۆ سەر (ئەسعەدی کوڕی زورارە) تا بیکوژن، دەشزانن کە کوڕی پوری تۆیە}..

(سەعد) هەستایەوە، دەمارگیری و تووڕەیی پاڵی پێوە دەنا، خەنجەرەکەی هەڵگرت و خێرا بەرەو ئەو جێگەیەی کە (ئەسعەد) و (موصعەب) و، ئەو موسڵمانانەی لێبوو کە لەگەڵیدابوون ڕۆیشت..

کاتێ نزیک بوویەوە لەدانیشتنەکەیان هیچ ژاوەژاو و دەنگەدەنگێکی بەدی نەکرد، بەڵکو بێدەنگی باڵی کێشابوو بەسەر هەموویاندا و، (موصعەبی کوڕی عومەیر)یش لە ناوەڕاستیاندا بوو بە ملکەچییەوە ئایەتەکانی خوای گەورەی بۆ دەخوێندنەوەو، ئەوانیش بە گرنگی و بایەخێکی مەزنەوە گوێیان لێ ڕاگرتبوو.

لێرەدا هەستی بەو تەڵەیە کرد کە (ئوسەید) بۆی نابوویەوە تا وای لێبکات بەرەو ئەو دانیشتنە بڕوات و گوێ ڕادێرێت بۆ ئەو شتانەی کە نێردراوی ئیسلام (موصعەبی کوڕی عومەیر) دەیڵێت..

لە ڕاستیشدا فیراسەتی (ئوسەید) بەرامبەر هاوەڵەکەی ڕاست دەرچوو، هەر کە (سەعد) گوێی هەڵخست، خوای گەورە سنگی کردەوە بۆ ئیسلام و، بەخێرایی تیشك جێگای خۆی لە نێو ریزی باوەڕدارانی پێشیندا گرت.

* * *

(ئوسەید) لە دڵ و عەقڵیدا خاوەنی ئیمانێکی پتەو و پرشنگدار بوو..

ئیمانەکەیشی نەرم و نیانی و لەسەرخۆیی و مەزندەدروستی پێ بەخشیبوو، بەجۆرێ کە هەردەم جێگای متمانە بێت..

لە جەنگی (بەنی موصطەلەق)دا (عبداللەی کوڕی ئوبەی) ڕق و قینی هەستا و، بەو خەڵکەی مەدینەی وت کە لە دەوری بوون:

{ئێوە وڵاتی خۆتانتان بۆ حەڵاڵ کردن و، سامانی خۆتانتان لەگەڵدا بەشکردن.. بەڵام سوێند بەخوا، ئەگەر ئەوەی لە دەستاندایە لێیانتان بگرتایەتەوە، ئەوا ڕوویان دەکردە جێگەیەکی دیکە.

دەسا سوێند بەخوا، کە گەڕاینەوە بۆ مەدینە، بەهێز و ڕێزدارمان سەرشۆڕ و بێدەسەڵاتمان دەردەکات}..

هاوەڵی پایەبەرز (زەیدی کوڕی ئەرقەم) گوێی لەو وشانە بوو، بگرە گوێی لەو ژەهرە دووڕوویییە ئاگرینە بوو، هەربۆیە پێویست بوو لەسەری کە ئەو هەواڵە بگەیەنێت بە پێغەمبەری خوا ﷺ.

پێغەمبەری خواش ﷺ زۆر ناڕەحەت بوو، (ئوسەید) پێی گەیشت، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو:

– ئەوەت پێنەگەیشتووە کە هاوڕێکەتان وتوویەتی..؟؟

(ئوسەید) وتی:

- چ هاوڕێیەك ئەی پێغەمبەری خوا..؟؟

پێغەمبەر فەرمووی:

- (عبداللەی کوڕی ئوبەی)..!!

ئەمجا (ئوسەید) وتی:

- چی وتووە..؟؟

پێغەمبەر فەرمووی:

- وای خۆستۆتە روو کە ئەگەر گەڕایەوە مەدینە، ئەوا بەهێز و رێزدارترین کەس بێدەسەلات و سەرشۆڕەکان دەردەکات.

(ئوسەید) وتی:

- سوێند بەخوا، تۆ ئەی پێغەمبەری خوا، بە پشتیوانی خوای گەورە دەیکەیتە دەرەوە.. سوێند بەخوا ئەو سەرشۆڕ و بێدەسەلاتە و، تۆ سەرفراز و بە دەسەلاتی..

پاشان (ئوسەید) وتی:

{ئەی پێغەمبەری خوا، بەزەیت بێتەوە پێیدا، سوێند بەخوا، خوای گەورە کە تۆی بۆ ناردین، هۆزەکەی خەریکی رێککاری بوون تا بیکەنە پاشای مەدینە، هەر بۆیە وا دەزانێت کە ئیسلام ئەو دەسەلاتەی لێ سەندووە}..

ئا بەم بیرکردنەوە هێمنە قوڵە هاوسەنگە روونە، (ئوسەید) هەمیشە چارەسەری کێشەکانی بە زیرەکییەکی خێرا و لەجێ دەکرد.

لە رۆژی (سەقیفە)شدا، بەهۆی وەفاتی پێغەمبەری خواوە ﷺ دەستەیەك لە ئەنصاریەکان، لە سەرووی هەموویانەوە (سەعدی کوڕی عوبادە) رایانگەیاند کە جێنشینی مافی رەوای ئەوانە و، گفتوگۆ درێژەی کێشا و، وتوێژەکان دایان بە یەکدا، هەڵوێستی (ئوسەید)-هەروەك دەزانین کە ئەو سەرگەورەیەکی ئەنصاری گەورە بوو- هەڵوێستێکی کارا بوو لە یەکلاکردنەوەی هەڵوێستەکەدا و، وشەکانیشی وەك گزنگی بەیان وابوو لە دیاریکردنی ئاراستەکاندا..

(ئوسەید) هەستا و بەو دەستە ئەنصارییەی هۆزەکەی وت:

{دەزانن کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە کۆچەرەکان بوو..

جا جێنشینەکەیشی دەکرێت کە لە کۆچەرەکان بێت..

بەراستیش ئێمە پێشتر پشتیوانی پێغەمبەری خوا بووین..

ئەمڕۆش لەسەرمان پێویستە کە پشتیوانی جێنشینەکەی بین}..

لە راستیدا وشەکانیش سارد و سەلامەت بوو..

* * *

(ئوسەیدی کوڕی حوضەیر) بە خواپەرستی و، ملکەچی بۆ خودا و، فیداکاری گیان و سامانی لە پێناوی چاکەدا ژیا و، ڕاسپاردەکەی پێغەمبەری خوایﷺ بۆ ئەنصاریەکان خستبووە بەرچاوی:

{ئارام بگرن.. هەتا لەسەر حەوزی کەوسەر پێم دەگەنەوە}..

بەڕاستیش بەهۆی ئاینەکەی و ئاکاری، جێگای ڕێز و خۆشەویستی (ئەبوبەکر) بوو، بەهەمان شێوە و هەمان جێگە و پلەوپایەی هەبوو لە دڵی ئەمیری باوەڕداران (عومەر) و، هەموو هاوەڵاندا

گوێگرتن لە دەنگی لە کاتی خوێندنی قورئاندا یەکێك لەو دەستکەوتە گەورانە بوو کە هاوەڵان بە پەرۆش بوون بۆی..

ئەو دەنگە ملکەچە سەرسوڕهێنەرە ڕوناککەرەوەیەی کە پێغەمبەرﷺ هەواڵی ئەوەی دا کە شەوێکیان مەلائیکەتەکان نزیك بوونەوە بۆ بیستنی..

لە مانگی شەعبانی ساڵی بیستی کۆچیدا، (ئوسەید) مرد..

ئەمیری باوەڕداران تەنها بەوە ڕازی بوو کە تابووتەکەی لەسەر شانی خۆی هەڵگرێت..

هاوەڵان لاشەی ئەو ئیماندارە مەزنەیان لەژێر زەوی (بەقیع)دا بەخاك سپارد.. و

گەڕانەوە بۆ مەدینە و یادی چاکەکانیان دەکردەوە و ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری ئازیزیان لەبارەیەوە دووبارە دەکردەوە:

{ئوسەیدی کوڕی حوضەیر، چاکترین پیاوە}..

* * *

٤٠

# عبدالرحمن كوري عه وف

# چي ده تگريه ني ياوكي محمـــد ؟!

ڕۆژێکیان، لە کاتێکدا کە شاری مەدینە بێدەنگ و ئارام بوو، تەپ و تۆزێکی چڕوپڕ لە دەوروبەری نزیك دەبوویەوە، کە بەرز دەبوویەوەو زۆر دەبوو بەجۆرێ وەخت بوو بەری ئاسمان بگرێت.

ڕەشەبا ئەم شەپۆلی تەپ و تۆزە زەردباوەی پاڵ پێوە دەنا کە لە لمی نەرمی بیابان بەرز دەبوویەوە، دەهات و لە دەروازەکانی شاری مەدینە نزیك دەبوویەوەو، بە توندی بە ڕێگاکاندا تێپەڕ دەبوو.

خەڵکی وایان دەزانی کە گێژەڵوکەیەکە لم رادەماڵێت و بڵاوی دەکاتەوە، بەڵام زۆر زوو لە پشتی پەردەی تەپ و تۆزەکەوە گوێبیستی هەراو دەنگەدەنگێك بوون کە پێشبینی کاروانێکی گەورەو درێژی دەخستە روو..

کاتێکی زۆر کە بەسەر چوو، هەتا حەوت سەد وڵاخ بە بارەوە شەقامەکانی مەدینەیان جەنجاڵ کرد و هەژاندیان و، خەڵکی یەکدیان بانگ دەکرد تا دیمەنە زۆرەکەی بەدی بکەن و، شاد و خۆشحاڵ ببن بەو خێر و پیت و فەڕەی کە هەڵیگرتووە..

* * *

(عائیشە)ی دایکی باوەڕداران، کە دەنگی گەیشتنی ئەو کاروانە زۆرەی بەرگوێ کەوتبوو.. پرسی: ئەوە چییە لە مەدینە روو دەدات..؟؟

وەڵامی درایەوە: ئەوە کاروانی (عبدالرحمن)ی کوڕی عەوف)ە لە شامەوە هاتووە بازرگانی پێیە..

دایکی بڕواداران وتی:

– کاروانێك ئەو هەموو دەنگەدەنگەی هەیە..؟!

– بەڵێ.. ئەی دایکی بڕواداران.. حەوسەد وڵاخە..!!

دایکی بڕواداران سەری لەقاند و، سەرنجێکی دووری دا، وەك ئەوەی بەدوای یادی دیمەنێکدا بگەڕێت کە بینیبێتی، یان قسەیەك کە گوێی لێبووبێت..

پاشان وتی:

{بەڵام من لە پێغەمبەری خودامﷺ بیستبوو دەیفەرموو:

(عبدالرحمن)ی کوڕی عەوف)م بینی بە گاگۆڵکە دەچوویە بەهەشتەوە}..

* * *

(عبدالرحمنی کوڕی عەوف) بە گاگۆڵکە دەچێتە بەهەشتەوە..؟
باشە بۆچی بە خێرایی و هەنگاونان لەگەڵ هاوەڵانی پێشینی پێغەمبەردا ناچێتە ناوی..؟
هەندێك لە هاوەڵان ئەو قسەیەی (عائیشە)یان پێگەیاند، هاتەوە یادی کە ئەو قسەیەی زیاد لە جارێك لە پێغەمبەرەوەﷺ گوێ لێبووە بە چەند شێوەیەك..
جا بەر لەوەی بارەکانی بازرگانیەکەی بکاتەوە، هەنگاوەکانی بە ئاراستەی ماڵی (عائیشە) هەڵگرت و پێی وت: فەرموودەیەکت هێنامەوە یاد کە لە بیرم نەچووەتەوە..
پاشان وتی:
{بەڵام من تۆ دەکەم بە شاهێد کە ئەم کاروانە بە بارەکانیەوەو، بەو پەتانەش کە بارەکانی پێ بەستراوەتەوەو، بە کۆپانەکانیەوە، لە پێناوی خوای گەورەدا دەبەخشم}..
ئەمجا باری حەوت سەد وڵاخ لە ئاهەنگێکی چاکەی مەزندا بەشکرا بەسەر خەڵکی مەدینە و دەوروبەریدا..!!
تەنها ئەم روداوەو بەس، وێنەی تەواوی ژیانی ئەم هاوەڵەی پێغەمبەریﷺ کە (عبدالرحمنی کوڕی عەوف) دەنوێنێت.
ئەو بازرگانێکی سەرکەوتووە، تا ئەوپەڕی سەرکەوتوویی..
دەوڵەمەندیشە، زیاتر لە دەوڵەمەندی زۆر گەورە..
بڕوادارێکی هۆشمەندیشە و، رازی نابێت شادی و بەختی دونیا خۆشی و شادی ئاینەکەی ببەن و، ئەوە رەت دەکاتەوە کە دەوڵەمەندییەکەی لە کاروانی موسڵمانان و پاداشتی بەهەشت دوای بخات..
جا (عبدالرحمن)ﷺ سامانەکەی بە دەستکراوەیی و بەخشندەیی و شادیەوە دەبەخشێت..!!

* * *

کەی و، چۆن ئەم پیاوە مەزنە موسڵمان بوو..؟
لە راستیدا ئەو زۆر زوو موسڵمان بوو..
بگرە لە ساتەکانی یەکەمی بانگەوازدا و، بەر لەوەی پێغەمبەری خواﷺ بچێتە ماڵی ئەرقەمەوەو بیکاتە بارەگای بینینی یاوەرانی، ئەو موسڵمان بوو..
هەر بۆیە یەکێکە لەو هەشت کەسە پێشەنگەی هاتن بەدەم بانگەوازی ئیسلامەوەو موسڵمان بوون..
(ئەبوبەکری صدیق) ئیسلامی بۆ ئەو و (عوسمانی کوڕی عەفان) و (زوبەیری کوڕی عەوام) و (تەڵحەی کوڕی عبیداللە) و (سەعدی کوڕی ئەبووەقاص) باس کرد، جا بابەتەکە لێڵ نەبوو

لایان و گومان خلوەخاوی پێ نەکردن، بەڵکو لەگەڵ (ئەبوبەکر)دا بە پەلە بەرەو لای پێغەمبەری خواﷺ کەوتنە رێ تا پەیمانی پێ بدەن و ئاڵای ئیسلام هەڵبگرن.

جا لەو ساتەوە کە موسڵمان بوو تا ئەو کاتەی گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری لە تەمەنی حەفتاو پێنجەمین ساڵیدا، نمونەیەکی سەرسوڕهێنەری بڕواداری مەزن بوو، هەر ئەوەش بوو وای کرد لە پێغەمبەرﷺ لەنێو ئەو دە کەسەیدا دابنێت کە مژدەی بەهەشتی پێدابوون و.. وای لە (عومەر)یش کرد کە لەنێو ئەو شەش هاوەڵەی راوێژکردنیدا دابنێت کە خەلیفایەتی دوای خۆی لەنێو ئەواندا دابنرێت و، وتی: (پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد و رازی بوو لێیان)..

(عبدالرحمن) دەستبەجێ لەدوای موسڵمان بوونی پشکی خۆی لە دەربەدەری و دژایەتی قورەیش پێ برا..

کاتێك کە پێغەمبەریشﷺ فەرمانی کرد بە هاوەڵانی کە کۆچ بکەن بۆ حەبەشە، (عبدالرحمن) کۆچی کرد و پاشان گەڕایەوە بۆ مەککە و... دواتر لە کۆچکردنی دووەمدا کۆچیکردەوە بۆ حەبەشە و پاشان گەڕایەوە بۆ مەدینە و.. بەشداری (بەدر) و (ئوحود) و، تێکڕای جەنگەکانی دیکەی کرد..

* * *

لە بازرگانیەکەیدا بەجۆرێك بەختدار بوو کە بووبووە مایەی سەرسوڕمان و سەرسام بوونی و، خۆی لەو بارەیەوە دەڵێت:

{وام دەبینی، گەر بەردێکم بەرز بکردایەتەوە، زیو و ئاڵتونم لەژێریدا دەدۆزیەوە}..!!

بازرگانیکردنیش لای (عبدالرحمنی کوڕی عەوف)رضي الله عنه چلێسی و قۆرغکاری نەبوو..

بگرە سوور بوونیشی نەبوو لەسەر کۆکردنەوەی سامان و تامەزرۆیوونی دەوڵەمەندی..

نەخێر..

بەڵکو کار و، ئەرکێکی سەرشانی بوو کە سەرکەوتن تیایاندا نزیکتری دەکردەوە لە دەروون و، زیاتر تێکۆشان..

(عبدالرحمن) هەڵگری سروشتێکی بەجۆش بوو، کە ئاسوودەبوونی خۆی لە کارکردنی چاکدا دەبینیەوە لە هەرکوێ بێت..

کەوابوو ئەو ئەگەر لە مزگەوتدا نەبوو تا نوێژ بکات، یا لە غەزادا تا جیهاد بکات، ئەوا لە بازرگانیەکەیدا بوو کە گەشەیەکی زۆری کردبوو، هەتا کاروانەکانی وای لێهاتبوو لە میصر و شامەوە، بە هەموو پێداویستیەکانی دورگەی عەرەب لە خۆراك و پۆشاك بەرەو مەدینە دەهات..

رێڕەوی کۆچکردنەکەی لەسەرەتای کۆچکردنی موسڵمانان بۆ مەدینە، زیاتر ئەو سروشتە بەجۆشەیمان بۆ دەخاتەڕوو.

بەرنامەی پێغەمبەر لەو کاتەدا وابوو برایەتی بخاتە نێوان هەموو دوو هاوەڵێك، (موهاجیر)ێکی مەککە و (ئەنصار)یەکی خەڵکی مەدینە.

ئەم براییەش بەجۆرێ بوو کە مایەی سەرسام بوونی عەقڵ بوو، ئەنصاریەکی خەڵکی مەدینە دەهات هەموو ئەوەی کە هەیبوو لەگەڵ برا موهاجیرەکەیدا بەشی دەکرد.. تەنانەت جێگاکەشی، گەر دوو ژنی هەبوایە، دەیویست یەکێکیانی تەڵاق بدات، تا براکەی بیخوازێت..!!

لەو ساتەشدا پێغەمبەری ئازیز برایی خستنە نێوان (عبدالرحمنی کوڕی عەوف) و (سەعدی کوڕی رەبیع)..

دەبا گوێ بۆ هاوەڵی پایەبەرز (ئەنەسی کوڕی مالیك)ﷺ رابگرین، کە ئەوەی روویداوە دەیگێڕێتەوە بۆمان!

{... جا (سەعد) بە (عبدالرحمن)ی وت: براکەم، من لە هەموو خەڵکی مەدینە زیاتر سامانم هەیە، بڕوانە نیوەی ماڵەکەم و بیبە!!

دوو ژنیشم هەیە، سەرنج بدە کامیانت بەدڵ بوو تا تەڵاقی بدەم و، بیهێنیت..!

(عبدالرحمنی کوڕی عەوف) پێی وت:

{خوای گەورە پیت و فەڕ بخاتە ماڵ و خێزانتەوە..

بەڵکو بازاڕم نیشان بدەن}..

پاشان چووە دەرەوە بۆ بازار و، شتی کڕی و.. فرۆشتی و.. قازانجی کرد}..!!

ژیانی بەم شێوەیە بردە سەر لە مەدینە، لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ و پاش وەفاتیشیدا، لە بەجێهێنانی تەواوی مافی ئاین و، کاری دونیا و.. بازرگانی قازانجەکەی سەرکەوتوو بوو، کە خاوەنەکەی-وەك خۆی دەڵێت- گەر بەردێکی لە شوێنی خۆی بەرز بکردایەتەوە ئاڵتون و زیوی ل ژێریدا دەدۆزیەوە..!!

ئەوەشی وای لە بازرگانیەکەی کردبوو سەرکەوتوو پیرۆز بێت، حەڵاڵێتی و، دوورکەوتنەوەی تەواو بوو لە حەرام، بگرە لە گوماناویش..

هەروەها ئەوەی زیاتر سەرکەوتوو پیت و فەڕداری کردبوو ئەوەبوو کە تەنها بۆ (عبدالرحمنی کوڕی عەوف) نەبوو بەس، بەڵکو پشکی گەورەی بۆ خوای گەورە بوو، دەیگەیاند بە کەس و کار و، برایانی و، پۆشتەسازی سوپاکانی ئیسلام..

گەر بازرگانی و دەوڵەمەندی، بە ژمارەی دانەکانی و قازانجەکانی سەرژمێر بکرێت، ئەوا سامانەکەی (عبدالرحمنی کوڕی عەوف) ڕێژەو ژمارەی بەوەی کە لە پێناوی پەروەردگاری جیهانیاندا دەیبەخشی دەزانرا..!!

ڕۆژێکیان گوێی لە پێغەمبەری خوابوو پێی فەرموو:

{ئەی کوڕی عەوف، تۆ لە دەوڵەمەندەکانی..

بە گاگۆڵکێش دەچیتە بەهەشتەوە..

قەرز بدە بە خوای گەورە، قاچەکانت بۆ دەکاتەوە}..

لەو ساتەوە کە ئەو ئامۆژگاریەی لە پێغەمبەری خوا بیست، قەرزی زۆر باشی بە پەروەردگاری دەدا، خوای گەورەش بۆی چەند بارە دەکردەوە.

ڕۆژێکیان زەوییەکی فرۆشت بە چل هەزار دینار، پاشان هەمووی بەخشیەوە بەسەر خزم و کەس و کارەکەی لە هۆزی (بەنی زوهرە) و، دایکانی بڕواداران و، موسڵمانە هەژارەکاندا.

جارێکیشیان پێنج سەد ئەسپی پێشکەش بە سوپای ئیسلام کرد و.. جارێکی دیکەش هەزار و پێنج سەد وشتر ی بە بارەوە بەخشی..

لە سەرەمەرگیشدا، رایسپارد کە پەنجا هەزار دیناری ببەخشن لە پێناوی خوادا و، هەر کەس لەوانەی کە بەشداری بەدریان کردبووە و ماون یەکی چوارسەد دیناریان پێ بدرێت، تەنانەت (عوسمانی کوری عەففان)ﷺ، سەرەڕای دەوڵەمەندیەکەی پشکی خۆی وەرگرت و وتی: (سامانی عبدالرحمن حەڵاڵ و بێگەردە و، چێژکردنی ساغی و پیت و فەڕە).

* * *

(عبدالرحمنی کوری عەوف) خاوەن و گەورەی سامانەکەی بوو نەك بەندەی..

خۆ ماندونەکردنیشی لە کۆکردنەوەو لەسەریەك دانانی بەڵگەی ئەوەیە..

بگرە بە سانایی لەماڵی حەڵاڵ گردی دەکردەوە و.. پاشان تەنها بۆ خۆی نەبوو بەس.. بەڵکو خزم و کەس و کار و برایان و هەموو کۆمەڵگاکەیشی لەگەڵ ئەودا لێی بەهرەمەند دەبوون.

زۆری ئاستی بەخشین و دەستگیرۆیکردنی گەیشتبووە رادەیەك کە دەوترا:

{هەموو خەڵکی مەدینە پشکدارن لە سامانەکەی عبدالرحمن‌دا.

قەرزی بە سێیەکیان دەدا و..

سێیەکیشیان قەرزەکانی بۆ دەبژاردنەوە..

سێیەکیش دەیدانێ و پێی دەبەخشین..}!!

ئەو دەوڵەمەندیەشی مایەی ئاسودەیی و شادی دەروونی نەبوو، گەر ئەو توانایەی پێنەدایە کە پشتیوانی ئاینەکەی و، کۆمەکی برایانی پێبکات..

لەدوای ئەوەش، هەردەم لە دەوڵەمەندیەکەی دەترسا..

ڕۆژێکیان خواردنی بەربانگی بۆ هێنرا، لەکاتێکدا کە بەڕۆژوو بوو..

کاتێ سەرنجی دا ئارەزووی خواردنی نەما و گریا و، وتی:

{(موصعەبی کوڕی عومەیر) کە لە من چاکتر بوو شەهید بوو، عابایەك کرایە کفنی کە سەری داپۆشرایە، قاچەکانی بەدەرەوە بوون، قاچەکانیشی داپۆشرایە، سەری بەدەرەوە دەبوو..

(حەمزە)ش کە لە من چاکتر بوو شەهید بوو، تەنها عابایەك هەبوو بکرێتە کفنی.

پاشان دونیا بۆ ئێمە راخرا هێندەی کە راخرا و، ئەوەندەی کە هەمانە پێمان بەخشرا.

من دەترسم کە چاکەکانمان پێشخرابێت بۆمان}..!!

ڕۆژێکیان لەسەر خوانێك لای هەندێك لە هاوەڵان کۆبوونەوە.

هەر کە خواردنەکە لە بەردەمیاندا دانرا دەستی کرد بە گریان، لێیان پرسی:

— چی دەتگریەنێ ئەی باوکی موحەممەد..؟

وتی:

{پێغەمبەری خواﷺ وەفاتی کرد، خۆی و خاووخێزانیشی تێر بە سکی خۆیان نانی جۆیان نەخوارد.. وا نابینم دواخرانمان بۆ شتێك بێت چاکەی ئێمەی تێدا بێت}..!!

هەروەها، دەوڵەمەندیەکەی یەك کەم لەخۆباییبوون و لوت بەرزی بۆ دروست نەکردبوو..

تەنانەت لەبارەیەوە وتراوە: گەر کەسێکی نامۆ کە نەیناسیبایە لەکاتێکدا لەگەڵ خزمەتکارێکیدا دانیشتبوایە، نەیدەتوانی کە لێکیان جیابکاتەوە!!

بەڵام گەر ئەو کەسە نامۆیە ئاشنای بەشێکی تێکۆشانی (عبدالرحمن) و تاقیکردنەوەکانی ببوایە، ئەوا دەیزانی لە ڕۆژی (ئوحود)دا بیست برینی پێوەبوو، یەکێك لەو برینانەش شەلییەکی هەمیشەیی لە قاچێکیدا دروست کردبوو.. هەروەها لە ڕۆژی (ئوحود)دا چەند ددانێکیشی کەوت و، زمان گیرانێکی ئاشکرای لە کاتی گۆکردن و قسەکردنیدا دروست کرد.

ئا لەو کاتەدا، ئەو کەسە نامۆیە دەیتوانی کە بزانێت ئەو پیاو باڵابەرزە، روخسار گەشە، پێست نەرمە، شەلە، زمان گیرە لە ئەنجامی پێکرانی ڕۆژی (ئوحود)، (عبدالرحمنی کوڕی عەوف)ە..!!

ڕەزای خوای لێ بێت و خوا رازی بکات..

* * *

سروشتی مرۆڤ وای راهێناوین کە دەوڵەمەندی داوای دەسەڵاتداریتی دەکات..

بەو واتایەی کە دەوڵەمەندەکان هەمیشە پێیان خۆشە کە دەسەڵاتێکیان هەبێت پارێزگاری سامانەکەیان بکا و زیادی بکات و، ئارەزوومەندی لوت بەرزی و خۆبەگەورەزانین و ئیرەییان فێربکات کە دەوڵەمەندی دەیوروژێنێت هەردەم..

خۆ گەر (عبدالرحمنی کوڕی عەوف)مان بەدی بکردایە لەو دەوڵەمەندییە بەرینەیدا، ئەوا مرۆڤێکمان دەبینی کە بەشێوەیەکی سەیر سروشتەکانی مرۆڤی لەم بوارەدا دادەماڵێ و بەرەو بەرزییەکی نایابی دەبرد..!

ئەوە لەکاتێکدا روویدا کە (عومەری کوڕی خطاب)ﷺ گیانی پاکی دەسپارد و، شەش پیاوی لە هاوەڵانی پێغەمبەری خواﷺ هەڵدەبژارد تا لەنێو خۆیاندا جێنشینی نوێ دیاری بکەن..

پەنجەکان ئاماژەیان بۆ (عبدالرحمنی کوڕی عەوف) دەکرد و روو لەو بوون..

هەندێك لە هاوەڵانیش لەو بارەیەوە قسەیان لەگەڵدا کردبوو کە ئەو لەو شەش کەسە رەواترە بۆ جێنشینی، وتی:

{سوێند بەخوا، پەتێك هەڵبگیرێت و، بخرێتە گەردنم، پاشان بەرەو لایەکی دیکەم رابکێشن خۆشەویستترە لام لەوە}..!!

بەمجۆرە، هێشتا شەش کەسە هەڵبژێراوەکان کۆبوونەوەی خۆیان ساز نەکردبوو تا یەکێکیان هەڵبژێرن بۆ جێنشینی لەدوای (عومەری فاروق)، هەواڵی بە پێنج براکەی دیکەی دا کە ئەو دەست لەو مافەی خۆی هەڵدەگرێت کە (عومەر) بۆی داناوە، کاتێك کە کردی بە یەکێك لەوانەی کە لەنێوانیاندا خەلیفە دیاری بکرێت.. هەر بۆیە لەسەریان پێویستە کە تەنها لەنێوان خۆیان خەلیفە دیاری بکەن-واتە لەنێو پێنج کەسەکەی دیکەدا-..

زۆ ڕیەزوویی ئەو دونیا نەویستیەی لە وەرگرتنی پلەوپایەدا گەیاندیە جێگای ناوبژیوان لەنێوان ئەو پێنج بەرێزەی دیکەدا و، رازی بوون کە ئەو لەنێوانیاندا خەلیفە دیاری بکات و، ئیمامی عەلی پێی وت:

{لەپێغەمبەری خوام بیستﷺ وای باسدەکردبیت کە ئەمینی خەلکی ئاسمان و، ئەمینی خەلکی زەویت}..

(عبدالرحمنی کوڕی عەوف)یش (عوسمانی کوڕی عەفان)ی دیاری کرد بۆ خەلیفایەتی و، ئەوانی دیکەش وازۆی دیاریکردنەکەیان کرد.

* * *

ئەمە حەقیقەتی پیاوێکی دەوڵەمەندە لە ئیسلامدا..

ئایا بینیتان کە ئیسلام چی لێکرد هەتا بەرزی کردەوە بەسەر دەوڵەمەندیدا، بەو هەموو لەخۆباییکەر و سەرلێشێواندنەی کە هەیەتی و، چۆن بە جوانترین شێوە زاخاوی دا..؟؟

ئا ئەوەتا لەساڵی سی و دووی کۆچیدا، گیان دەدا..

(عائیشە)ی دایکی بڕوادارانیش دەیەوێت بەرێزێك بەهرەمەندی بکات کە جگە لەو بە کەسی دیکە نەدرابێت، هەربۆیە لەکاتێکدا کە لەسەر نوێنگەی مردنە داوای لێدەکات کە لە ژورەکەی ئەودا و لە تەنیشت پێغەمبەر و، ئەبوبەکر و، عومەرەوە بەخاك بسپێردرێت..

بەڵێ ئەو موسڵمانێکە ئیسلام بەچاکی پەروەردەی کردوە، شەرم دەکا لەوەی کە خۆی بەرز بکاتەوە بۆ ئەو جێگایە..!!

پاشان ئەو وادە و بەڵێنێکی پێشتری هەیە لەگەڵ (عوسمانی کوڕی مەظعون)[1]دا، کە ڕۆژێکیان پێکهاتن کە: هەرکامیان دوای ئەوی دیکە مرد، لە تەنیشت هاوەڵەکەیەوە بنێژرێت..

* * *

لەکاتێکدا گیانی بۆ گەشتێکی نوێی خۆی ساز دەکرد، چاوەکانی فرمێسکیان لێدەباری و، زمانیشی لەبەرخۆیەوە دەجوڵاند و دەیوت:

{دەترسم نەگەیەنرێم بە هاوەڵانم بەهۆی ئەو سامانە زۆرەی کە هەمبوو}..

بەڵام سەبوری خوای گەورە زۆر زوو دایدەگرت و، روخساری بە روپۆشێکی تەنکی شادی پرشنگداری مژدەدەری دڵنیاکار دایدەپۆشی..

هەردوو گوێیشی هەڵخستبوو.. وەك ئەوەی کە دەنگێکی خۆشی هەبێت و لێی نزیك بێتەوە..

لەوانەیە ئا لەو ساتەدا گوێبیستی راستێتی ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەرﷺ بووبێت کە ماوەیەکی زۆر بوو پێی فەرمووبوو:

{(عبدالرحمن)ی کوڕی عەوف) لە بەهەشتدایە}..

هەروەها لەوانەیە گوێبیستی پەیمانی خوای گەورە بووبێت لەو قورئاندا:

﴿الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ لاَ يُتْبِعُونَ مَا أَنفَقُوا مَنًّا وَلاَ أَذًى لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ: ئەو کەسانەی ماڵ لەرێی خوادا دەبەخشن و بەچاویاندا نادەنەوە و تووشی ئازارێکیان ناکەن، پاداشتیان لای پەروەردگاریانە وهیچ ترس و خەمێکیان لەسەر نیە.﴾البقرة/٢٦٢.

---

١ (عوسمانی کوڕی مەظعون) پێشتر لەم کتێبەدا و لەژمارە (١٨)دا باسمان کرد.

## ٤١

# عبدالله‌ی کوڕی عه‌مری کوڕی حه‌رام

# مه‌لائیکه‌ته‌کان سێبه‌ریان بۆ کردبوو

ئەو کاتەی حەفتا پیاوە ئەنصاریەکە لـە پـەیمانى عەقەبـەی دووەمـدا پـەیمانیان دەدا بـە پێغەمبەری خوا، (عبداللّەی کوڕی عەمری کوڕی حەرام)-باوکی جـابری کـوڕی عبـدالله- یـەکێك بوو لەو ئەنصاریانە..

کاتێك پێغەمبـەری خـوداشﷺ سـەرگەورە(نـەقیب)ی لـەنێو هەڵبـژاردن، (عبـداللّەی کـوڕی عـەمر) یـەکێك بـوو لـە سـەرگەورەکان و.. پێغەمبـەری خـوداﷺ کردیـە سـەرگەورەی سـەر هۆزەکەی کە (بەنی سەلەمە) بوو..

کە گەڕایشەوە بۆ مەدینە، سەروسامان و، خـزم و خوێشی خـستە خزمـەتی ئیـسلامەوە.. پـاش کۆچـکردنی پێغەمبـەریش بـۆ مەدینـە، ئـەبوجابر هـەموو خۆشـبەختی خـۆی لـە هاوڕێیەتیکردنی پێغەمبەرداﷺ بەشەوو بەڕۆژ دەبینیەوە..

* * *

لە جەنگی (بەدر)یشدا موجاهیدانە هاتە دەرێ و، پاڵەوانانە جەنگا..

لە غەزای (ئوحود)یشدا مردنی خۆی هاتە پێش چاو بەر لەوەی موسڵمانان بۆ جەنگ بچنە دەرەوە..

ئەو هەستە راستگۆیانە دایگرت کە ناگەڕێتەوە، دڵی وەخت بوو لە خۆشیا باڵ بگرێتەوە!!

ئەم هاوەڵە پایەبەرزە -جابر-ی کوڕی بانگ کرد و پێی وت:

{من وادەبینم لەم جەنگەدا دەکوژرێم.. بگرە لەوانەیە یەکەمین شەهیدی موسڵمانەکانیش بم..

جا من سوێند بەخوا، جگە لە پێغەمبەری خواﷺ لە تۆ خۆشەویستتر بەجێ ناهێڵم.. قەرزێکم لەسەرە، بیدەرەوەو، لەگەڵ خوشکەکانتدا باش بە}..

* * *

بۆ دەمەو بەیانی رۆژی دوایی موسڵمانەکان بۆ رووبەڕووبوونەوەی قورەیشیەکان چونە دەرەوە.. ئەو قورەیشەی کە بە سوپایەکی بێشومارەوە هاتبو شارە هێمنەکەیان داگیر بکات..

جەنگێکی ترسناك بەرپا بوو، لە سەرەتادا موسڵمانان سەرکەوتنێکی خێرایان بەدەست هێنا، کە دەکرا سەرکەوتنی یەکلاکەرەوەش بێت، گەر ئەو تیرهاوێژانەی پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێکردبوون کە لە جێگای خۆیاندا بمێننەوەو هەرگیز چۆڵی نەکەن، ئەو سەرکەوتنە خێرایە

بەسەر قوڕەیشدا لەخۆبایی کردن و، شوێنەکانی خۆیان بەسەر کێوەکەوە بەجێ نەهێشتبایە و سەرقاڵ نەبوونایە بە کۆکردنەوەی دەستکەوتەکانی سوپای دۆڕاوەوە..

ئەو سوپایەی کە زۆر خێرا شکانی خۆی کۆکردەوە کاتێ بینی پشتی موسڵمانەکان بە تەواوەتی چۆڵ بووە، پاشان لە پشتەوە بە هێرشێکی لەناکاو سەرسامیان کردن و، سەرکەوتنی موسڵمانەکان گۆڕدرا بۆ شکست..

* * *

لەم جەنگە سەخت و تاڵەدا، (عبداللەی کوڕی عەمر) ماڵئاوایکار و شەهیدانە جەنگا.. کاتێك لەپاش جەنگەکە موسڵمانەکان چوون بۆ سەیرکردنی شەهیدەکانیان.. (جابری کوڕی عبدالله) بەدوای باوکیدا دەگەڕا، تا لەنێو شەهیدەکاندا دۆزییەوە، سەیری کرد بێباوەڕەکان شێواندویانە، هەروەك چۆن پاڵەوانانی دیکەشیان شێواندووە..

لە کاتێکدا (جابر) و هەندێك لە کەس و کاری بۆ شەهیدی ئیسلام (عبداللەی کوڕی عەمری کوڕی حەرام) دەگریان، پێغەمبەری خوداشﷺ بەلایاندا تێپەڕی لەکاتێکدا کە دەگریان، فەرمووی:

{بۆی بگرین..

یان بۆی نەگرین..

مەلائیکەتەکان بە باڵەکانیان سێبەریان بۆ کردووە}..!!

* * *

ئیمانی (ئەبوجابر) درەوشاوەو بەتین بوو..

خۆشەویستی-بگرە ئەوپەڕی ئەوینی- بۆ مردن لەپێناوی خوادا ئەوپەڕی خۆزگە و ئاواتی بوو..

پێغەمبەری خوداشﷺ دواتر هەواڵی مەزنی لەبارەیەوە درکاند، هەواڵێك کە ئەوینی مەزنی بۆ شەهیدی دەنواند..

ڕۆژێکیان پێغەمبەرﷺ بە (جابر)ی کوڕی فەرموو:

{ئەی جابر..

خوای گەورە هیچ کەسی نەدواندوە لە پشتی پەردەوە نەبێت..

بەڵام رووبەڕوو لەگەڵ باوکتدا دوا..

پێی فەرموو: ئەی بەندەکەم، داوا بکە تا پێت ببەخشم..

وتی: ئەی پەروەردگار، داوات لێدەکەم کە بمگێڕیەوە بۆ دونیا، تا دووبارە لە پێناوتدا بکوژرێم..

خوای گەورە پێی فەرموو:

پێشتر ئەوەم باسکردووە: ئەوان ناگەڕێنەوە بۆی..

وتی: ئەی پەروەردگار، ئەم بەخششەی پێت داوین، رایبگەیەنە بەوانەی دوای ئێمە..

جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:

﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ، فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمْ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا بِهِمْ مِنْ خَلْفِهِمْ أَلاَّ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ: ئەو کەسانەی لەڕێی خوادا کوژراون، هەرگیز بە مردوویان حیساب مەکەن، بەڵکو زیندوون و خودا بژێویان دەداتێ. دڵیان خۆشە بەو چاکەیەی کە خودا دەربارەی کردوون، شادن بەوەش کە ئەوانەی وا نەگەیشتوونە ئەمان و بەجێماون، هیچ ترسێکیان لەسەر نابێ و هیچ خەمێکیان لەبەر نابێ.﴾آل عمران/١٦٩-١٧٠.

کاتێك کە موسڵمانەکان دەچوونە سەر شەهیدە چاکەکارەکانیان پاش کۆتایی هاتنی جەنگی (ئوحود).. ئەو ساتەی کە خزمانی (عبداللەی کوڕی عەمر) لاشەکەیان ناسیەوە، ژنەکەی لەگەڵ براکەیدا کە ئەویش بە هەمان شێوە لەگەڵیدا شەهید بووبوو، خستنیە سەر وشترەکەی و، هات بە بیریدا کە بیانباتەوە بۆ مەدینە تا لەوێ بیاننێژێت و، هەروەك هەندێك لە موسڵمانەکان شەهیدەکانی خۆیان بەوجۆرە لێکرد..

بەڵام بانگدەری پێغەمبەری خوداﷺ گەیشت پێیان و فەرمانی پێغەمبەری پێگەیاندن کە: {کوژراوەکان لە شوێنی کوژرانیاندا بەخاك بسپێرن}..

جا هەریەکەیان شەهیدی خۆی هێنایەوە..

پێغەمبەری ئازیزیشﷺ سەرپەرشتی بەخاك سپاردنی هاوەڵە شەهیدەکانی دەکرد، ئەو شەهیدانەی کە ئەو پەیمانەی بەخوای گەورەیان دابوو بردیانە سەر و، گیانی بەرزی خۆیان بە لێبوردەیی کردە قوربانی بۆ خودا و پێغەمبەرەکەی.

کە نۆرەی (عبداللەی کوڕی حەرام) هات بە خاك بسپێردرێت، پێغەمبەری خواﷺ بانگی کرد:

{(عبداللەی کوڕی عەمر) و، (عەمری کوڕی جەموح) لە یەك گۆڕدا بنێژن، چونکە لە دونیادا زۆر یەکدیان خۆشدەویست و، دڵساف بوون بەرامبەر بەیەك}..

* * *

ئائێستاش.. لەمیانەی ئەو ساتانەی کە گڵکۆ بەختەوەرەکەیان سازدەکرد بۆ پێشوازی هەردوو شەهیدە ئازیزەکە، وەرن با پێکەوە سەرنجێکی خۆشەویستانەی شەهیدی دووەم (عبداللەی کوڕی جەموح) بدەین..

* * *

# عەمری کوڕی جەموح

## دەمەوێ بەم شەلییەمەوە لە بەهەشتدا بگەڕێم

زاوای (عبداللّٰه‌ی کوڕی عەمری کوڕی حەرام) بوو، چونکە مێردی (هیندی کچی عەمر)ی خوشکی بوو..

ئەم کوڕەی (جەموح)یش یەکێك بوو لە سەرگەورەکانی مەدینە و، پیاوماقوڵێك لە پیاوماقوڵانی (بەنی سەلمە) بوو..

(مەعاذی کوڕی عەمر)ی کوڕی، کە بەر لەخۆی موسڵمان بوو یەکێك بوو لەو حەفتا ئەنصاریەی بەشداری پەیمانی (عەقەبە)ی دوەمییان کرد.

جا (مەعاذی کوڕی عەمر) و (مەعاذی کوڕی جەبەل)[1]ی هاوڕێی بەوپەڕی پەرۆشیەکی گەنجانەی بڕواداری بوێرانەوە خەڵکی مەدینەیان بۆ لای ئیسلام بانگ دەکرد..لەو دەمەشدا لەنێو خەڵکدا وا باوبوو کە پیاوماقوڵان وێڕای ئەو بتە گەورانەی کە لە پەرستگاکانیاندا دانرابوون هەموو خەڵکی دەیانپەرست، لە ماڵەکانیشیاندا بتی بچوکیان دادەنا..

(عەمری کوڕی جەموح)یش بەو پێیەی کە پیاوماقوڵ و سەرگەورە بوو، بتێکی دروستکردبوو، ناوی (مەناف)ی لێنابوو، لە ماڵەکەیدا دایانابوو..

(مەعاذی کوڕی عەمر) لەگەڵ (مەعاذی کوڕی جەبەل)ی هاوڕێیدا پێکهاتبوون لەسەر ئەوەی کە بتەکەی (عەمری کوڕی جەموح) بکەنە مایەی گاڵتەجاڕی و یاریکردن.

شەو چوونە سەری و، هەڵیان گرت و فڕێیان دایە ئەو چاڵەی کە خەڵکی شتی پیس و زبڵی تێ فڕێدەدا.

(عەمر)یش کە دەمەو بەیانی هەستا سەرنجی دا (مەناف) لەجێگای خۆی بەدی نەکرد و، بەدوایدا گەڕا تا بینی لەو چاڵەدا فڕێدراوە.. جا توڕە دەبێت و دەڵێت:

– دەك تیابچن، کێ ئەمشەو دەستدرێژی کردۆتە سەر خواوەندەکانمان..!؟

پاشان دەیشوات و، پاکی دەکاتەوە و، بۆنی خۆشی لێدەدات..

شەوی نوێی بەسەردا هاتەوە، هەردوو (مەعاذ)– (مەعاذی کوڕیعەمر) و (مەعاذی کوڕی جەبەل) هەمان شتیان بەسەر بتەکەدا هێنایەوە، هەموو شەوێك بەو جۆرە.

هەتا (عەمر) هەراسان بوو، شمشێرەکەی هێنا و خستیە سەر گەردنی (مەناف) و پێی وت:

گەر چاکەت تێدایە بەرگری لەخۆت بکە..!!

---

١ پێشتر باسکرا.

بۆ بەیانی کە هەستا سەیری کرد لەجێی خۆیدا نەماوە.. بەڵکو لە هەمان چاڵدا فرێدراوە، ئەمجارە بەتەنهاش نەبوو لە چاڵەکەدا.. بەڵکو لەگەڵ سەگێکی تۆپیودا توند پێکەوە بە گوریسێك بەسترابونەوە..

لەکاتێکدا کە تورە و، پەست و، سەرسام بوو بوو، هەندێك لە پیاوماقوڵانی مەدینە کە پێشتر موسڵمان بووبوون لێی نزیك بوونەوەو، بە دەستیان ئاماژەیان بۆ بتە فڕێدراوەکە دەکرد کە بە سەگێکی تۆپیوەوە بەسترابوویەوەو، عەقڵ و دڵ و تێگەیشتنی (عەمری کوڕی جەموح)یان دواند و، باسی پەروەردگاری حەق و، خاوەن توانا و دەسەڵاتیان بۆ دەکرد، کە هیچ شتێك هاوشێوەی نیە..

دەربارەی (موحەممەد)ی (صادق الامین) قسەیان بۆ دەکرد، کە هاتۆتە دونیا تا ببەخشێت، نەك وەرگرێت.. ڕێنوێنی بکات، نەك سەر بشێوێنێت..

دەربارەی ئیسلامیش، کە هاتووە تا مرۆڤەکان لە کۆت و بەند رزگار بکات—هەموو کۆت و بەندێك— ، هاتووە خۆشی و ڕەحمەتی خودای تێدا زیندوو بکاتەوەو ڕووناکی ئەویان لەدڵدا پەخش بکات.

جا لە چەند ماوەیەکی کەمدا (عەمر) خۆی و ئایندەی خۆی بینیەوە..

لە چەند چرکەساتێکدا ڕۆشت و، پۆشاکەکانی و جەستەی خاوێن کردەوەو و، پاشان خۆی بۆن خۆش و ڕێك و پێك کرد و، بەسەری بەرز و دەروونی گەشاوەوە کەوتەڕێ، تا پەیمان بدات بە دوایین پێغەمبەر و، جێگای خۆی لەنێو بڕواداراندا بگرێت.

* * *

لەوانەیە کەسێك بێت بەبیریدا و بپرسێت: کەسانێکی وەك (عەمری کوڕی جەموح).. کە سەرگەورەو پیاوماقوڵی هۆزەکانیان بوون.. چۆن بڕوایان دەهێنا بەو بتە گاڵتەجاڕیانە بەو جۆرە ئەو هەموو بڕوایە..؟

چۆن عەقڵیان لەو گێلییە نەیدەپاراستن..

وە چۆن ئەمڕۆ— لەگەڵ موسڵمان بوون و قوربانیدانیاندا— لەڕیزی گەورەپیاواندا دەیاندوێنین..؟

کردنی ئەم جۆرە پرسیارانە لە ڕۆژگاری ئێستادا زۆر سانایە، کە منداڵێکیش بەدی ناکەین عەقڵی وای لێبکات تەختەیەك دابتاشێت و لە ماڵەکەیدا دایبنێت و بیپەرستێ..

بەڵام لەو ڕۆژگارەی کە ڕابوورد، سۆزی مرۆڤ جێگای ئەو جۆرە کارانەی تێدا دەبوویەوە بەبێ ئەوەی کە زیرەکی و تێگەیشتنیان هیچ تەڵەکە و فێڵێکی بەرانبەر ئەو داب و نەریتانە تێدابێت..!!

(ئەسینا) بەسە بۆمان وەك نمونە..

(ئەسینا) لە سەردەمی (بارکلیز) و (فیساگۆرس) و (سوقرات)دا..

ئەو (ئەسینا)یەی کە لە پێشکەوتنی فیکریدا گەیشتبووە ئاستی سەرسام کردنی عەقڵ، ئا لەو کاتەدا هەموو خەڵکەکەی، فەیلەسوف و، داهوەر و، جەماوەرەکەی بڕوایان بەو بتە داتاشراوانە هەبوو، بڕواداریيەك تا ئەوپەڕی گێلی و گاڵتەجاڕی! !

چونکە ویژدانی ئاینی لەو چەرخە دورانەدا لەگەڵ پێشکەوتنی عەقڵدا بە هێڵێکی تەریبدا نەدەڕۆیشتن.

* * *

(عەمری کوڕی جەموح) دڵ و، ژیانی بە پەروەردگاری جیهان سپاردبوو، سەرەڕای زۆر بەخشندەیی و دەستبڵاویەکەی، ئیسلام زیاتر بەخشندەتری کرد و، هەموو سامانەکەی خستە خزمەت ئاینەکەی و براکانی..

پێغەمبەرﷺ لە کۆمەڵێك خەڵکی (بەنی سەلمە)-هۆزەکەی (عەمری کوڕی جەموح)-ی پرسی:

- کێ سەرگەورەتانە ئەی بەنی سەلمە..؟

وتیان: (الجعد بن قیس)، لەسەر ئەو رژدیەی کە تێیدابوو..

ئەمجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی:

{جا چ دەردێك لە رژدی سەختترە! !

بەڵکو سەرگەورەتان ئەو دەموچاو پانە سپیەیە، (عەمری کوڕی جەموح)ە}..

ئەم گەواهیدانەی پێغەمبەری خواﷺ رێزلێنانی (عەمری کوڕی جەموح) بوو، چ رێزلێنانێك..!

لەمبارەیەوە شاعیری ئەنصاریەکان وتویەتی:

فسوَّد عمرو بن الجموح لجوده وحقّ لعمرو بالنّدى أن يُسَوَّدا
إذا جاءه السُّؤَّالُ أذهب مالـه وقـال خـذوه، إنه عـائـد غـدا

واتە: پیاهەڵدانی (عەمری کوڕی جەموح) لەبەر بەخشندەییەکەی مافی خۆی بوو کە بانگ بکرێت و پیایدا هەڵبدرێت.. گەر داواکەر ماڵەکەی هەموو ببردایە، دەیوت: بیبەن، سبەینێ دێتەوە..

جا (عەمری کوڕی جەموح) هەروەك چۆن سامانەکەی لەپێناوی خوای گەورەدا بەخشی، دەیویست کە گیان و ژیانیشی ببەخشێت..

بەلام.. بەچ شێوەیەك؟؟

ئەو قاچێکی بەجۆرێکی وەها شەل بوو کە بە کەڵکی بەشداریکردنی شەڕ نەیەت.

خاوەنی چوار کوڕیش بوو، هەموویان موسڵمان بوون و، پیاوانێکی بەجەرگ بوون و، لەگەڵ پێغەمبەری خوداﷺ بۆ شەڕکردن دەچوونە دەرەوەو، بەردەوام بوون لەسەر بەجێهێنانی فەرزی جیهاد..

لە جەنگی بەدردا (عەمر) هەوڵیدا بەشداری بکات، جا کوڕەکانی چوونە خزمەت پێغەمبەرﷺ تکایان لێکرد کە باوکیان رازی بکات بەوەی کە نەیەتە دەرەوە، یان گەر قەناعەتیشی نەکرد فەرمانی پێ بکات..

هەرواش بوو، پێغەمبەرﷺ پێی راگەیاند کە ئیسلام لێی بوراوە لە بەشداریکردنی جیهاد وەك فەرزێك بەهۆی کەم ئەندامیەکەیەوە کە خۆی لە شەلییەکی زۆردا دەنواند..

لەگەڵ ئەوەشدا دەستی دایە زۆرلێکردن و تکاکردن.. تا پێغەمبەر فەرمانی پێکرد کە لە مەدینە بمێنێتەوە.

جەنگی (ئوحود)یش هات، عەمر چووە خزمەت پێغەمبەرﷺ و لێی پاڕایەوە کە مۆڵەتی بەشداربوونی بدات و پێی وت:

{ئەی پێغەمبەری خوا.. کوڕەکانم دەیانەوێت رێگەم نەدەن کە بۆ جیهاد کردن لەگەڵتدا بێمە دەرەوە..

جا سوێند بەخوا من ئومێدەوارم کە بەم شەلیەمەوە لە بەهەشتدا بگەڕێم}..

لە بەرامبەر ئەو سووربوونە مەزنەیدا پێغەمبەرﷺ مۆڵەتی دا کە بێتە دەرەوەو بەشداری بکات، جا چەکەکەی هەڵگرت و، بەخۆشی و سنگ فراوانیەوە بە شەلی کەوتە رێ و، بە دەنگێکی ملکەچانە لە پەروەردگاری پاڕایەوە:

{خودایا شەهیدیم پێ ببەخشە و مەمگێڕەوە بۆ ناو کەس و کارەکەم}..!

* * *

هەردوو لەشکر لە رۆژی (ئوحود)دا بەیەك گەیشتن..

(عەمری کوڕی جەموح) و هەرچوار کوڕەکەیشی بە شمشێرەکانیان کەوتنە لێدانی سوپای تاریکی و بێباوەڕی..

(عەمر)یش لە نێو ئەو خەڵك و هەرایەدا هەنگاوی دەنا و، لەگەڵ هەر هەنگاوێکیشیدا شمشێرەکەی سەری یەکێك لە بتپەرستەکانی لێدەکردەوە..

ئەو بە دەستی راست شمشێری دەوەشاند و، پاشان سەرنجی ئاسۆی بەرزی دەوروبەری خۆی دەدا و، وەك ئەوەی پەلەی بێت بۆ هاتنی ئەو مەلائیکەیەی کە گیان دەکێشێت و، پاشان بەرەو بەهەشتی دەبات..

بەڵێ.. ئەو بەراستی شەهیدبوونی لە پەروەردگاری خواست و، تەواو دڵنیاش بوو لەوەی کە خوای گەورە پاڕانەوەکەی گیراکردووە..

بەڵێ ئەو ئامەزرۆیە - چ ئامەزرۆییەک- بەوەی کە بە قاچی شەلی لە بەهەشتدا مەنگاو بنێت تا خەڵکەکەی بزانن کە موحەممەدی پێغەمبەری خواﷺ چۆن هاوەڵانی خۆی دیاری دەکرد و، چۆن پیاوانی پەروەردە دەکرد..!!

* * *

بەڵێ ئەوەی کە چاوەڕێی بوو پێی گەیشت.

لێدانی شمشێرێکی بەرکەوت و، ساتەوەختی زەماوەندەکەی ڕاگەیاند..

زەماوەندی شەهیدێکی پایەبڵند بەرەو بەهەشتی جاویدانی و، فیردەوسی خودای میهرەبان..!!

* * *

لەکاتێدا کە موسڵمانەکان شەهیدەکانیان بەخاك دەسپارد، پێغەمبەرﷺ ئەو فەرمانەی دەرکرد -کە پێشتر گوێبیستی بووین-.

{سەرنج بدەن، (عبداللەی کوڕیحەرام) و (عەمری کوڕی جەموح) لەیەك گۆڕدا بنێژن، چونکە هەردووکیان لە دونیادا یەکیان خۆشدەویست و دڵساف بوون بەرامبەر بەیەك}..!!

* * *

ئەمجا هەردوو شەهیدە هاوڕێ ئازیزەکە لەیەك گۆڕدا بەخاك سپێردران، لەژێر گڵکۆی ئەو خاکەدا کە جەستەی بێگەردیانی گرتە خۆ، پاش ئەوەی کە پاڵەوانێتی بێوێنەیانی بینی.

پاش تێپەڕبوونی چل و شەش ساڵ بەسەر بەخاك سپاردن و هاوڕێیەتیان، لافاوێکی زۆر بەهێز هات و خاکی گۆڕەکەیانی داپۆشی، بەهۆی کانیەکەوە کە (موعاویە) لەوێوە هێنابووی، جا موسڵمانەکان خێرا کەوتنە گواستنەوەی جەستەی شەهیدەکان، ئەوانەی بەشداری گواستنەوەی لاشەکانیان کرد لەبارەیانەوە دەڵێن:

{لاشەیان هەر نەرم بوو..

دەست و قاچیان دەجوڵێنرا}....!!

(جابری کوڕی عبداللە) لەو کاتەدا زیندووبوو، لەگەڵ خزم و کەس و کارەکەیدا ڕۆشت تا لاشەی (عبداللەی کوڕی عەمری کوڕی حەرام)ی باوکی و لاشەی (عەمری کوڕی جەموح)ی مێردی پوری بگوێزێتەوە..

لەگۆڕەکەی خۆیاندا بینینی، وەك ئەوەی نوستبن وابوو.. زەوی هیچی لێ نەخواردبوون و، ئەو خەندەی ڕەزامەندی و شادیەی ئەو ڕۆژەیان لەسەر لێو دانەبڕابوو کە بەرەو لای خوای گەورە بانگ کران، ئایە سەرتان سوڕماوە..

سەرتان سوڕنەمێنێ..

چونکە ئەو گیانە مەزنە تەقوادارە، بێگەردانەی، کە بە سەر چارەنوسیاندا زاڵ بوون.. لە جەستەکاندا کە ساز بووە بژی، ڕێژەیەك لە بەرگری(مناعة) بەجێدەهێڵێت کە هۆکارەکانی شیکردنەوەو، داڕزانی ناو خاك لادەبات..

٤٣

# حەبیبی کوڕی زەید

# ئەفسانەی فیداکاری وخۆشەویستی

لە پەیمانی عەقەبەی دووەمدا کە پێشتر چەند جارێ لێی دواین و، تێیدا حەفتا پیاو و دوو ئافرەتی خەڵکی مەدینە پەیمانیان دا بە پێغەمبەرﷺ، (حەبیبی کوڕی زەید) و (زەیدی کوڕی عاصم)ی باوکیﷺ لەو حەفتا پیاوە پیرۆزە بوون..

(نوسەیبەی کچی کەعب)ی دایکیشی یەکێك بو لەو دووئافرەتەی کە پەیمانیان دا بە پێغەمبەری خوداﷺ..

ئافرەتی دوەمیش پوری -خوشکی دایکی- بوو..!!

کەوابوو بڕوادارێکی دێرینە و ئیمانی بە شادەمارەکانیدا ڕۆچووە..

لەپاش کۆچکردنی پێغەمبەری خوداشﷺ بۆ مەدینە لە پەنایدا ژیا و، لەهیچ غەزایەکدا دوانەکەوت و، لەهیچ کارێکدا کەمتەرخەمی نەنواند..

* * *

ڕۆژ گارێك هات باشووری دوورگەی عەرەب دوو درۆزنی پیسی بەخۆوە دی کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتیان دەکرد و، خەڵکیان بەرەو سەرلێشێوان دەدایە پێش خۆیان..

یەکەمیان کە (ئەسوەدی کوڕی کەعبی عەنسی) بوو لە (صەنعا)..

دووەمیش لە یەمامە دەرکەوت، کە (موسەیلەمەی درۆزن) بوو..

هەردو درۆزنەکە دەستیان دابوە هاندانی خەڵکی لە دژی ئەو بڕوادارانەی هۆزەکانیان کە بەدەم بانگەوازی خودا و، پێغەمبەرەوە چووبوون و، هانیان دەدان لەدژی نێردراوانی پێغەمبەری خوا بۆ ئەو جێگایانە..

لەسەری ئەوەشەوە، دەستیان دایە شێواندنی خودی پێغەمبەرایەتی و، خراپە و تاریکیان لەسەر زەیدا بڵاودەکردەوە.

* * *

پێغەمبەر ڕۆژێکیان سەرسام بوو بە هاتنی نێردراوی (موسەیلەمە) کە نامەیەکی هێنابوو تێیدا هاتبوو: (لە موسەیلەمەی پێغەمبەری خوداوە، بۆ موحەممەدی پێغەمبەری خودا.. سڵاوت لێبێت..

پاش ئەوە، من بەشدارکراوم لەو کارەدا لەگەڵ تۆدا و، نیوەی زەوی بۆ ئێمەیەو، نیوەکەی دیکەیشی بۆ قورەیشە، بەڵام قورەیشیەکان هۆزێکی دەستدرێژیکارن)..!!!

پێغەمبەریش یەکێك لە نوسەرانی هاوەڵی بانگ کرد و، وەڵامی موسەیلەمەی پێ نووسی:

{بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان..
لە موحەممەدی پێغەمبەری خوداوە، بۆ موسەیلەمەی درۆزن..
سڵاو لەو کەسەی شوێن روناکی دەکەوێت..
پاش ئەوە، زەوی موڵکی خودایە و، بۆ هەرکەسی بیەوێت لە بەندەکانی پێی دەدات و، سەرئەنجامیش بۆ تەقوادارانە}..!

ئەو وشانەی پێغەمبەر وەك گزنگی بەری بەیان هات و، ئابڕوی بڕۆزنەکەی (بەنی حەنیفە)ی برد کە وای گومان دەبرد پێغەمبەرایەتی موڵکەو، ئەویش هات و داوای نیوەی زەوی و نیوەی بەندەکانی دەکرد..!

ئەمجا نێردراوەکەی (موسەیلەمە) وەڵامەکەی پێغەمبەری ﷺ لەگەڵ خۆیدا بردەوە بۆ (موسەیلەمە)، بوە مایەی زیادبوونی گومڕایی و سەرلێشێواویەکەی.

* * *

درۆزنەکە دەستی دایە بڵاوکردنەوەی بوختان و هەڵبەستراوەکانی و، زیاتر ئەشکەنجەدانی بڕواداران و هاندانی لە دژیان زیادی کرد، هەربۆیە پێغەمبەر وای بەچاك زانی کە نامەیەکی بۆ بنێرێت و تێیدا رێگری ئەو بێعەقڵیانەی بکات..

بۆ ئەم کارەش پێغەمبەرﷺ (حەبیبی کوڕی زەید)ی دیاری کرد تا نامەکەی پێدا بنێرێت بۆ موسەیلەمە..

(حەبیب)یش کەوتە هەنگاونان و، بەوپەڕی شادیەوە بۆ ئەم کارە پایەبڵندە کەوتەڕێ کە پێغەمبەری خوداﷺ پێی سپاردبوو ، ئومێدەوار بوو کە دڵی موسەیلەمە رێنوێنی بکات بۆ لای حەق و، (حەبیب)یش پاداشت و خەڵاتی مەزنی دەست بکەوێت..

* * *

رێبوارەکە گەیشتە شوێنی مەبەست و..
نامە پڕ لە روناکیەکەی دایە موسویلەمەی درۆزن و، زیاتر لە سەرلێشێواوی و گومڕایدا رۆچوو..

لەکاتێکدا کە موسەیلەمە تەنها بێمێشکێکی بوختانچی بوو، هەموو رەوشتێکی بوختانچی بێمێشکیشی تێدابوو..!!

بەم شێوەیە، هیچ مەردایەتی و رەوشت جوانی عەرەب و پیاوەتی تێدا نەبوو کە رێگریان بکردایە لە رشتنی خوێنی نێردراوێك کە نامەیەکی نوسراوی هێناوە.. ئەو کارەی کە عەرەبەکان رێزیان لێدەنا و پیرۆز بوو بەلایانەوە..!!

قەدەری ئاینی مەزنی ئیسلام ویستی وەهابوو کە وانەیەکی نوێ زیاد بکات بۆ سەر وانە مەزنەکانی پاڵەوانێتی کە بە گوێی تێکڕای مرۆڤایەتیدا دەدا، وانەیەك کە ئەمجارە بابەت و مامۆستاکەی لەیەك کاتدا ( حەبیبی کوڕی زەید) بێت.. ! !

* * *

موسەیلەمەی درۆزن هۆزەکەی خۆی کۆکردەوەو، بۆ یەکێك لەڕۆژە دیارەکان بانگی کردن..

ئەوجا (حەبیبی کوڕی زەید)ی نێردراوی پێغەمبەری خوداﷺ هێنرا و شوێنەواری ئەشکەنجەدانی توند کە تاوانباران بەسەریاندا هێنابوو، بەو ئومێدەی گیان بوێری بڕفێنن و، لەبەرچاوی خەڵکەکەدا سەرکز و بێدەسەلات دەرکەوێت و، خێرا بڕوا بهێنێت بە موسەیلەمە کاتێك کە لەبەردەم خەڵکەکەدا بۆ لای ئەو بڕوایە بانگەشە دەکرێت و.. بەوەش موسەیلەمەی درۆزنی دۆڕا و موعجیزەیەکی خەیاڵی لەبەردەم هەڵخەڵەتێنراوەکانیدا بەدەست دەهێنێت.

* * *

موسەیلەمە بە (حەبیب)ی وت:

– شاهێدی دەدەیت کە (موحەممەد) پێغەمبەری خوایە..؟

(حەبیب) وتی:

– بەڵێ" شاهێدی دەدەم کە (موحەممەد) پێغەمبەری خوایە.

ڕوو زەردیەکی سەرشۆڕانە ڕوخساری موسەیلەمەی داگرت و، دووبارە لێی پرسیەوە:

– شاهێدیش دەدەیت کە من پێغەمبەری خودام..؟؟

(حەبیب)یش بە گاڵتەجاڕییەکی مرێنەرەوە وەڵامی دایەوە:

– من هیچ نابیستم.. ! !

ئەمجا ڕەنگی زەردی سەرشۆڕانەی سەر ڕوخساری موسەیلەمەی درۆزن گۆڕا بۆ ڕەشێکی قین لەدڵانەی ڕێ‌لێ‌ونبوو.

لەڕاستیدا نەخشەکەی شکستی هێنا و، ئەشکەنجەکەی بێبەرهەم بوو، لەبەردەم ئەو کەسانەشدا کە کۆی کردبوونەوە تا موعجیزەکەی ببینن زللەیەکی بەهێزی بەرکەوت کە هەیبەتی درۆزنی خستە ناو قوڕەوە..

ئا لەوێدا وەك گای سەربڕاو بۆڕاندی و، هاواری پیاوکوژەکەی کرد کە پێشتر نوکی شمشێرەکەی کرد بە جەستەی (حەبیب)دا..

پاشان دەستی دایە پارچەپارچەکردنی جەستەی، پارچەپارچە و، کوت کوت و، ئەندام لەدوای ئەندام..

پاڵەوانە مەزنەکەش هیچی دیکەی زیاد نەدەکرد بۆسەر ورتەورتەکەی و سرودی ئیسلامەکەی دووپات دەکردەوە:

{لا اله الا الله، محمد رسول الله}.

*　　*　　*

خۆ گەر (حەبیب) ئەو ڕۆژە بە شتێ لە ئاسانکاری رووکەش بۆ موسەیلەمە ژیانی خۆی دەرباز بکردایە و، ئیمانەکەی لەنێو سنگیدا بشاردایەتەوە، موسڵمان بوونەکەشی هیچ خراپەیەکی بەسەردا نەدەهات..

بەڵام ئەو پیاوەی کە لەگەڵ باوك و، دایك و، براو، پوریدا ئامادەی پەیمانی عەقەبە بوو، لەو ساتە گرنگە پیرۆزەوە بەرپرسیارێتی پەیمانەکەی و ئیمانەکەی بە تەواوەتی و بەبێ کەم و کوڕی لە ئەستۆ گرت، نەدەکرا کە چرکەساتێکی ڕۆژی هاوسەنگی رابگرێت لەنێوان ژیانی و مەبدەئەکەیدا..

پاشان هیچ هەلێکی وای لەبەردەمدا نەبوو تا هەموو ژیانی بەدەست بهێنێت وەك ئەم دەرفەتە دەگمەنەی کە چیرۆکی تێکڕای ئیمانی خۆی تێدا بینیەوە.. لە خۆڕاگری و، مەزنی و، پاڵەوانێتی و، قوربانیدان و، شەهیدبوونی لە پێناوی ڕێنوێنی و حەق خەریك بوو لە جوانی و ڕێکوپێکیدا زیاتر بێت لە هەموو سەرکەوتن و باڵادەستیەك..!!

*　　*　　*

هەواڵی شەهیدبوونی نێردراوە بەڕێزەکەی گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ و، لەبەردەم حوکمی پەروەردگاریدا ئارامی گرت، چونکە ئەو بە روناکی خودا ئایندەی موسەیلەمەی درۆزنی بەدی دەکرد و، خەریك بوو لەناوچوونی بەچاوی خۆی ببینێت..

بەڵام (نوسەیبەی کچی کەعبی دایکی (حەبیب) بۆ ماوەیەکی زۆر دڵانی جیڕکردەوە، پاشان سوێندێکی تەواوی خوارد کە تۆڵەی کوڕەکەی لە خودی (موسەیلەمە) بکاتەوە و، رم و شمشێرەکەی بگێڕێت بەنێو گۆشتە پیسەکەیدا..

ئەو قەدەرەیشی کە لەو ڕۆژەدا دەیڕوانییە دڵتەنگی و ئارامگری و خۆڕاگریەکەی، مایەی سەرسوڕمانێکی زۆر بوو، لە هەمان کاتدا بڕیاری دا کە لە پەنایەوە بوەستێت تا سوێندەکەی بەجێ دەهێنێت..!!

*　　*　　*

خولێکی کورتی رۆژگار سوڕایەوەو.. بەهۆیەوە جەنگە زیندوەکە بەرپابوو، جەنگی یەمامە..

(ئەبوبەکری صدیق)ی جێنشینیی پێغەمبەری خواﷺ سوپای ئیسلامی ئامادەکرد تا بەرەو یەمامە بکەوێتە ڕێ کە (موسەیلەمە) تێیدا گەورەترین لەشکری ئامادەکردبوو..

(نوسەیبە)ش لەگەڵ سوپادا کەوتەڕێ و..

چوە نێو گەرمەی جەنگەکەوە و، بە دەستی راستی شمشێرەکەی هەلگرتبوو، رمەکەیشی بە دەستی چەپیەوە بوو، زمانیشی لە هاوارکردن نەدەکەوت:

{موسەیلەمەی دوژمنی خوا کوا} ..؟

کاتێ (موسویلەمە)ش کوژرا و، شوێنکەوتەکانی وەك خوری شیکراوە کەوتنە سەر زەوی و، بەیداخەکانی ئیسلام بە سەربڵندی و سەرکەوتوویی بەرز بوونەوە.. (نوسەیبە) کە جەستەی پایەداری بەهێزی پڕ لە جێگای برین و لێدانی رم بوو، راوەستا..

راوەستا و پێشوازی لە روخساری کوڕە ئازیزەکەی شەهید(حەبیب) دەکرد و، بینی کات و شوێنی پڕکردووە..!!

(نوسەیبە) چاوی بە هەرلایەکدا و بۆ لای هەر ئاڵایەك لە ئاڵا شەکاوە سەرکەوتوە شادەکان بگێڕایە روخساری (حەبیب)ی کوڕی بە شەکاوەیی و .. سەرکەوتوویی و.. شادی لەسەر بەدی دەکرد..

٤٤

# ئۆبەی کوڕی کەعب

## زانیاریێن لی ئیرقەدینێن

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خواﷺ پرسیاری لێکرد:
{ئەی باوکی مونذیر..؟؟
چ ئایەتێکی قورئانی پیرۆز مەزنترە..؟؟}
لە وەڵامیدا وتی:
{خودا و پێغەمبەرەکەی زاناترن}..
پێغەمبەرﷺ پرسیارەکەی لێ دووبارە کردەوە:
{ئەی باوکی مونذیر..؟؟
چ ئایەتێکی قورئانی پیرۆز مەزنترە..؟؟}
لە وەڵامیدا وتی:
{﴿اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾البقرە/٢٥٥.}
ئەمجا پێغەمبەری خواﷺ دەستی دا بەسەر سینگیدا و، لەکاتێکدا شادی بەسەر ڕوخسارییەوە دەدرەوشایەوە پێی فەرموو:
{زانیاریت لێ پیرۆز بێت ئەی باوکی مونذیر}..
ئەو (باوکی مونذیر)ەی کە پێغەمبەری ئازیز پیرۆزبایی ئەو زانیاری و تێگەیشتنەی لێکرد کە خوای گەورە پێی بەخشیبوو، هاوەڵی پایەبەرز (ئوبەیی کوڕی کەعب) بوو..
(ئوبەی) ئەنصارییەکی هۆزی خەزرەجە و، بەشداری پەیمانی عەقەبە و، غەزای بەدر و، جەنگەکانی دیکەی کردووە.
لەنێو ئەوانەدا کە زۆر زوو موسڵمان بووبوون گەیشتبووە پایەیەکی بڵند و، ئاستێکی بەرزی وەها هەتا ئەمیری باوەڕداران (عومەر)ﷺ لەبارەیەوە وتی:
{ئوبەی سەرگەورەی موسڵمانانە}...
(ئوبەیی کوڕی کەعب) لە پێشەوەی ئەو کەسانە بوو کە (وەحی)یان دەنووسیەوە و، نامەکانیان دەنووسی..
لە لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز و، خوێندنەوەو، تێگەیشتنی ئایەتەکانیدا، لەسەرکەوتوان بوو،،
ڕۆژێکیان پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو:
{ئەی (ئوبەیی کوڕی کەعب)..
من فەرمانم پێکراوە کە قورئانت فێر بکەم}..
(ئوبەی) دەیزانی کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانەکانی لە (وەحی)یەوە وەردەگرێت..

ئا لێرەدا بە شادییەکی زۆرەوە لە پێغەمبەری خودایﷺ پرسی:
{ئەی پێغەمبەری خودا، دایك و باوکم بە قوربانت بن.. ئایا ناوی خۆمیان هێنا بۆت}..؟؟
پێغەمبەر وەڵامی دایەوە:
{بەڵێ..
بەناوی خۆتەوەو، رەچەڵەکتەوە، لە ئاسمانی سەرەوە}..!!
جا موسڵمانێك لە دڵی پێغەمبەری خوادا ﷺ بگاتە ئەو ئاستە بەراستی موسڵمانێکی مەزنە، زۆریش مەزن..
بەدرێژایی ساڵانی پێکەوەبوونیشی، (ئوبەیی کوڕی کەعب) لە نزیك پێغەمبەری خوداوەﷺ بوو، لەو کانیاوە سازگارە بەخشەرەی هەڵدەگۆزی..
پاش گوێزانەوەی پێغەمبەری خواﷺ بۆ لای پەروەردگاری باڵادەست، (ئوبەی).. لە پەرستشەکەی و، بەهێزی ئاینەکەی و، ئاکاریدا لەسەر بەڵێنەکەی بەردەوام بوو..
هەمیشە بەئاگاهێنەر و ترسێنەری هۆزەکەیشی بوو..
رۆژانی سەردەمی پێغەمبەری ﷺ دەهێنانەوە یاد، لەگەڵ ئەو بەڵێن و، خووڕەوشت و، دونیانەویستیەی کە ئەوان لەسەری بوون..
لەو وتە پرشنگدارانەیشی کە لەنێو هاوەڵاندا دەیوتەوە:
{بەڕاستی ئێمە کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووینﷺ، تێڕوانینمان یەك بوو، کە لێشی جودا بووینەوە، تێڕوانینەکانمان بەراست و چەپدا جوودابوویەوە}..
بەردەوام بوو لەسەر تەقواداری و، دونیانەویستی و، دونیا نەیتوانی تووشی ئاشووب یان هەڵخەڵەتاندنی بکات..
چونکە ئەو حەقیقەتەکەی لە کۆتاییەکەیدا بەدی دەکرد..
جا مرۆڤ چەند بژی و، چەند لەنێو ناز و خۆشیدا بگوزەرێ، دەگاتە رۆژانێك کە هەموو ئەوانەی تێیدایە دەگۆڕێت بۆ گەرد و تۆزو جگە لە کردەوەی چاك، یا کارێکی خراپ کە ئەنجامی دابێت هیچی دیکەی بەدەستەوە نامێنێت..
لەبارەی دونیاشەوە (ئوبەی) دەڵێت:
{خۆراکی ئادەمیزاد، بۆتە نمونە بۆ دونیا..
سەرنج بدە گەر خوێی تێ بکەیت و، خۆراکەکەی چی بەسەر دێت}..؟؟
(ئوبەی) کە قسەی بۆ خەڵکی دەکرد گەردن و گوێیەکان بە پەرۆش و گوێڕاگرتنەوە رێزیان لێدەنا.. چونکە لەو کەسانە بوو کە لەبەر خوای گەورە لەهیچ کەسێکی دیکە نەدەترسا و.. هیچ ویستێکیشی لە دونیا داوا نەکردبوو.
ئەو دەمەی وڵاتی ئیسلامیش فراوان بوو، موسڵمانەکانی بینی بە ناڕەوا خۆیان لەگەڵ والیەکاندا دەگونجاند، هات وشە ترسێنەرەکانی ئاڕاستە کردن:

{ بە پەروەردگاری کەعبە تیاچوون ..
بەڵام من خەفەت ناخۆم بۆیان، بەڵکو خەفەت بۆ ئەو موسڵمانانە دەخۆم کە لە ناویان دەبەن}..

* * *

لەپاڵ زۆر پارێزکاری و تەقواکەیدا، هەرکە باسی خودا و، رۆژی دوایی بکرایە دەگریا.. ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزیش خۆی بیخوێندایە، یا گوێبیستی ببوایە، دەیهەژاند و هەموو گیانی دەهێنا لەرزە..
بەڵام ئایەتێك لەنێو ئەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆزدا، کە گوێبیستی دەبوو یان خۆی دەیخوێندەوە بەجۆرێکی بێوێنە خەم و خەفەت دایدەگرت..
کە ئەویش ئایەتی:
﴿قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِنْ فَوْقِكُمْ أَوْ مِنْ تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُمْ بَأْسَ بَعْضٍ: بڵێ، خودا توانای هەیە کە لەلای سەروتانەوە یان لەلای ژێرتانەوە ئازارتان بۆ بنێرێ، یان بتانکاتە چەند دەستە و تێکتان بەردا و ئازار لە یەکتر بچێژن.﴾الانعام/٦٥.
ئەوەیشی کە نۆبەی زیاتر لێی دەترسا کە بەسەر ئومەتی ئیسلامیدا بێت ئەوەبوو کە رۆژێك بێت بەسەریدا کە هێز و توانای نەوەکانیان لەنێوان خۆیاندا پەرش و بڵاوبێت..
هەمیشەش داوای سەلامەتی لەخوای گەورە دەکرد و.. بەراستیش هەندێك لە ناز و نیعمەتی خودای گەورەی بەسەردا رژابوو..
بەبڕواداری و دڵنیایی و، پاداشت وەرگرتنەوە گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری..

لە تەمەنی سی ویەك ساڵیدا موسڵمان بوو..

لە تەمەنی سیوحەوت ساڵیشدا شەهید بوو..

جا لەنێوان ڕۆژی موسڵمان بوونی و، ڕۆژی کۆچکردنیدا، (سەعدی کوڕی مەعاذ) ڕۆژانێکی بەرزی لە خزمەتکردنی دینی خودا و پێغەمبەردا بەسەر برد.

* * *

سەرنج بدەن!

ئەو پیاوە ڕوخسار جوانە، پایەدارە، زۆر باڵابەرزە، ڕوخسار گەشە، بەخۆوە بووە، مەزنە بەدی دەکەن..؟؟

ئەوە خۆیەتی..

بەخێرایی و ڕاکردن بەرەو ماڵی (ئەسعەدی کوڕی زورارە) ڕێگا دەبڕێ تا ئەو پیاوە- موصعەبی کوڕی عومەیر- ببینێ کە لە مەککەوە (موحەممەد) ناردویەتی بۆ شاری مەدینە، هەتاوەکو مژدەی یەکخواناسی و ئیسلامیان پێبدات..

بەڵێ.. ئەو بەرەو ئەوێ دەگوزەرێ تا ئەو پیاوە نامۆیە بە ئاینەکەیەوە بکاتە دەرەوەی شاری مەدینە و.. واز لە خەڵکی مەدینە و ئاینەکەیان بهێنێت..!!

* * *

بەڵام هەرکە لە کۆڕی (موصعەب) نزیك دەبێتەوە کە لە ماڵی (ئوسەیدی کوڕی زورارە)ی کوڕی پوریەتی دڵی بە شنەبایەکی شیرین دەبوژێتەوە کە بای لێخۆشبوون و خۆشبەختی بۆی دەهێنێت..

هەرکە گەیشتە لای دانیشتوانی کۆڕەکە و، جێی خۆی گرت لە نێویاندا و، گوێی ڕادێرا بۆ وشەکانی (موصعەب)، هیدایەتی خوای گەورە دەروون و گیانی ڕوناك کردەوە.

لە یەکێك لە قەدەرە سەرسوڕهێنەرەکاندا، سەرکردەی ئەنصاریەکان خەنجەرەکەی فڕێدەدات و، دەستی ڕاستی دەهێنێت پەیمان دەدات بە پێغەمبەری خوا..

بە موسڵمان بوونی (سەعدی کوڕی مەعاذ)یش خۆرێکی نوێ لە مەدینەدا هەڵدێت، کە زۆر دڵ لە خولگەیدا دەسوڕێتەوە و لەگەڵ موحەممەددا دەبنە بەجێهێنەری فەرمانەکانی پەروەردگاری جیهانیان..!!

* * *

سەعد موسڵمان بوو و، هەنگاوەکانی موسڵمان بوونی پاڵەوان و مەزنانە هەڵگرت.
ئەو دەمەی پێغەمبەری خوا و هاوەڵانی کۆچیان کرد بۆ شاری مەدینە ماڵەکانی (بەنی عەبدولئەشهەل) -هۆزەکەی سەعد- دەستپێکی دەروازەکان بوو بۆ کۆچکاران و، تێکڕای سامانەکانیشیان بەبێ منەت و، ئازاردان و.. لێپرسینەوە لەبەردەستیاندا بوو..!!

* * *

غەزای بەدر دێت..
پێغەمبەری خوداشﷺ هاوەڵانی کۆچەری و پشتیوانانی کۆدەکاتەوە، تا لەو بارەیەوە راوێژیان پێ بکات..
رووی پیرۆزی کردە لای ئەنصاریەکان و پێی فەرموون:
{بیروباوەڕتانم پێ بدەن خەڵکینە}.
جا (سەعدی کوڕی مەعاذ) هەستایەوە وەك بەیداخ و.. وتی:
{ئەی پێغەمبەری خوا..
ئێمە بڕوامان هێنا پێت و، بەراستمان زانیت و، گەواهیمان دا کە ئەوەی هێناوتە حەقە، لەسەر ئەمەش پەیمان و بەڵێنمان پێداویت..
دەسا ئەی پێغەمبەری خوا، بەرەو ئەوەی دەتەوێت بڕۆ و، ئێمەش لەگەڵتین..
سوێند بەو زاتەی کە بە حەق رەوانەی کردوویت، گەر بەنێو ئەو دەریایەدا بمانبەیت و بڕۆیت، ئێمەش لەگەڵت دێین و، تاکە پیاوێکمان دواناکەوێت و، ناترسین لەوەی کە سبەینێ دوژمنمان رووبەڕومان ببێتەوە..
ئێمە ئارامگرین لەجەنگدا و، راستگۆین لە رووبەڕووبوونەوەدا..
بەڵکو خوا لەئێمەدا ئەوەت نیشان بدات کە مایەی چاورووونیت بێت..
دەسا لەسەر بەرەکەتی خودا بمانبە}..

* * *

وشەکانی سەعد وەك مژدە گەشانەوە، روخساری پێغەمبەریش بەرەزامەندی و بەختەوەری و شادی گەشایەوە، بەموسڵمانەکانی فەرموو:
{بڕۆن و مژدەتان لێبێت، خوای گەورە وادەی پێداوم کە یەکێك لەو دوو دەستەیەتان پێدەدات..
سوێن بەخوا.. دەڵێی سەیری تیاچوونی ئەو هۆزە دەکەم}..

* * *

لە غەزای ئوحودیشدا و کاتێك کە موسڵمانان لەژێر کاریگەری ئەو دەستدرێژیە لەناکاوەی سوپای بێباوەڕاندا کە بەسەریاندا هێنان، چلۆ لە سەرنجدانی شوێنی (سەعدی کوڕی مەعاز)دا بەهەڵەدا نەدەچوو..

لەراستیدا ئەو قاچەیکانی بە تەنیشت پێغەمبەرەوەﷺ لەسەر خاك چەسپاندبوو، بە شێوەیەکی بوێرانە کە شایستەی ئەو بێت، بەرگری لێدەکرد و ئازار و ترسی لێ دوور دەخستەوە!!

* * *

غەزای خەندەقیش هات، تا مەردایەتی و پاڵەوانێتی سەعد بەشێوەیەکی گەش و پایەدار زیاتر پرشنگ بداتەوە..

جەنگی خەندەقیش نیشانەیەکی ئاشکرای سەر فێڵ و تەڵەکەی دەستدرێژیکارانە کە بەشوێن موسڵمانانەوە بوو بەبێ هۆ، لە دژێکەوە کە لە دژایەتیکردنەکەیاندا ئاشنای هیچ داد و پەیمانێك نین.

لەکاتێکدا کە پێغەمبەری خواﷺ و هاوەڵانی لەشاری مەدینە بەهێمنی و ئاسایش سەرقاڵی پەرستشی پەروەردگاریان بوون و، لەسەر گوێڕایەڵیان بەردەوام بوون و، خوازیار بوون کە قورەیش دەست لە شاڵاو و جەنگەکانی هەڵبگرێت، لەو کاتەدا دەستەیەك لە سەرکردەکانی جولەکە لە دەرفەتێکدا بەدزییەوە دەڕۆن بۆ مەککە و قورەیشیەکان لە دژی پێغەمبەری خودا هان دەدەن و، پەیمان و بەڵێنیان پێدەدەن کە پشتیوانی قورەیشیەکان بکەن گەر لەگەڵ موسڵمانەکاندا ڕووبەڕوو ببنەوە..

بەراستیش لەگەڵ هاوەڵپەرستەکاندا پێکهاتن و، پێکەوە نەخشەی جەنگ و داگیرکاریان دانا..

لە ڕێگای گەڕانەوەشیاندا بۆ مەدینە یەکێ لە گەورە هۆزەکانی عەرەب کە هۆزی (غەطەفان) بوو هانیان دان و لەگەڵ سەرگەورەکانیان پێکهاتن کە بچنە سوپای قورەیشەوە..

نەخشەی جەنگ دانرلو، جەنگاوەران دابەشکران.. قورەیشیەکان و غەطەفان بە سوپایەکی ئێجگار گەورەوە هێرش دەکەنە سەر شاری مەدینە..

جولەکەکانیش هەڵدەستن بە ڕۆڵی ئاژاوەچێتی لەناوخۆی مەدینە و دەوروبەری لەو کاتەدا کە سوپای هێرشبەر هەڵدەکوتێتە سەری..!!

کاتێ پێغەمبەرﷺ دەرکی کرد بە پلانە نامەردانەکە دەستی دایە خۆسازدان بۆی و.. فەرمانی کرد بە هەڵکەندنی خەندەق بە دەوری شاری مەدینەدا تا بەر لە لێشاوی هێرشبەران بگرێت.

(سەعدی کوڕی مەعاذ) و (سەعدی کوڕی عوبادە)یشی نارد بۆ لای (کەعبی کوڕی ئەسەد)ی سەرگەورەی هۆزی (بەنی قورەیظة)ی جولەکە، تا راستی هەڵوێستی ئەوانیان بۆ روون ببێتەوە بەرانبەر ئەو جەنگە چاوەڕوانکراوە، لەو کاتەشدا پەیمان و بەڵێندان هەبوو لەنێوان پێغەمبەری خوداﷺ و جولەکەکانی (بەنی قورەیظة)دا..

هەر بۆیە کاتێ نێردراوەکانی پێغەمبەر گەیشتنە لای سەرگەورەی (بەنی قورەیظة) سەرسام بوون کە پێیان وتن:

((هیچ پەیمان و بەڵێنێك نیە لەنێوان ئێمە و موحەممەددا))..!!

پێغەمبەرﷺ زۆر لای سەخت بوو کە خەڵکی مەدینە توچاری ئەو داگیرکاریە گەورەیە و، ئەو ئابلۆقە فەوتێنەرە بکات، هەر بۆیە بیری کردەوە کە (غەطەفان) لە قورەیش دابڕێت و، سوپای هێرشهێنەر نیوەی ژمارەی سەربازەکانی و، نیوەی هێزەکەی لەدەست بدات، ئەوەبوو هات و لەگەڵ سەرکردەکانی غەطەفاندا کەوتە وتوێژ کە دەستیان لەم جەنگە بکێشنەوە، بەرانبەر بەوەش سێیەکی بەروبومی مەدینەیان پێدەدرێت.. سەرکردەکانی (غەطەفان)یش بەوە رازی بوون و، هیچی نەمابوو کە پێکهاتنەکە لە پەیماننامەیەکی متمانە پێکراودا بنووسرێت..

ئا لەو ئاستەی هەوڵەکەدا، پێغەمبەری خوداﷺ راوەستا و بەمافی خۆی نەزانی کە بە تەنها لەو کارەدا بڕیار دەربکات، هەر بۆیە هاوەڵانی بانگ کرد تا راوێژیان پێ بکات لەو بارەیەوە.

لەمەشدا پێغەمبەرﷺ گرنگییەکی تایبەتی دا بە بیروبۆچوونی (سەعدی کوڕی مەعاذ) و (سەعدی کوڕی عوبادە)، چونکە ئەوان گەورەی مەدینە بوون و، بەمەش ئەوان لە هەموو کەس لەپێشترن بۆ گفتوگۆکردن لەسەر ئەو کارە و، هەڵوێست وەرگرتن بەرامبەری..

* * *

پێغەمبەرﷺ بەسەرهاتی ئەو وتوێژەی بۆ گێڕانەوە کە لەگەڵ سەرکردەکانی (غەطەفان)دا ئەنجامی داوەو.. هەواڵی دانێ کە ئەو پەنای بردۆتە بەر ئەو هەوڵە، تا ئەو هێرشە مەترسیدارو، ئابلۆقە ترسناکە، لەشاری مەدینە و خەڵکەکەی دوور بخاتەوە..

هەردوو (سەعد) لە پێغەمبەری خودایان پرسی:

{ئەی پێغەمبەری خودا..

ئایا ئەوە بیروبۆچونێکی خۆتە هەڵیدەبژێری، یان نیگایە و خودا فەرمانی پێکردویت}؟؟

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:

{فەرمانێکە من هەڵیدەبژێرم بۆتان..

سوێند بەخوا، ئەمەم تەنها لەبەر ئەوە ئەنجامدا چونکە وام بینی کە عەرەب ئێوەیان خستۆتە نێو کەوانێکەوەو نیشانەیان لێ گرتوون و، لە هەموو لایەکەوە دەورەیان تەنیون، منیش ویستم کە ئەو هێزەیان تا رادەیەك بەرامبەرتان بشکێنم}.

(سەعدی کوڕی مەعاذ) هەستی کرد کە توانایان وەك مەرد و باوەڕدار رووبەڕوی تاقیکردنەوەیەك بۆتەوە، بەڵام چ تاقیکردنەوەیەك..

لێرەدا وتی:

{ئەی پێغەمبەری خوا..

ئێمە و ئەوان لەسەر شیرك و و بت پەستی بووین و، نە پەرستشی خوامان دەکرد و نە دەمان ناسی، ئەوانیش چاویان نەبڕیبوە ئەوەی کە دەنکە خورمایەکی شارەکەمان بخۆن، مەگەر بەخشین و میوانداری یان فرۆشتن بێت..

ئینجا کاتێ کە خوای گەورە بە ئاینی پیرۆزی ئیسلام ڕێزی لێناین و، ڕێنوێنی کردین بۆ لای و، سەرفرازی کردین بە تۆ و بە ئیسلام، سامانی خۆمانیان پێ بدەین..؟؟

سوێند بەخوا هیچ پێویستیمان بەوە نیە..

سوێند بەخوا بەس شمشێریان پێدەدەین.. هەتا خوای گەورە دادوەری دەکات لەنێوان ئێمە و ئەواندا}..!!

دەست بەجێ پێغەمبەرﷺ لە بۆچونەکەی پاشگەز بووەوە و، هەواڵی دا بە سەرگەورەی (غەطەفان) کە هاوەڵانی رازی نەبوون بە پرۆژەی وتوێژ و، ئەویش بڕیاری ئەوانی پەسند کردووەو پابەندە پێوەی..

* * *

پاش چەند رۆژێك شاری مەدینە رویەڕووی ئابلۆقەیەکی ترسناك بوویەوە..

لەراستیدا ئەوان ئەو ئابلۆقەیان بۆ خۆیان هەڵبژارد، زیاد لەوەی کە بەسەریاندا سەپێنرابێ، ئەمەش بەهۆی ئەو (خەندەق)ەی کە بەدەوری شاردا هەڵیان کەندبوو تا ببێتە سوپەر و پارێزەریان..

موسڵمانەکانیش کاڵای جەنگیان پۆشی..

(سەعدی کوڕی مەعاذ)یش شمشێر و رمەکەی هەڵگرت هاتە دەرەوە لەبەر خۆیەوە هۆنراوەی دەوتەوە:

لَبِّثْ قليلا يشهد الهيجا جمل ما أجمل الموت اذا حان الأجل!

لەیەکێك لە هەڵمەتەکانیشدا باسکی سەعد تیرێکی کوژەری بەرکەوت، کە یەکێك لە بێباوەڕکان تێی گرتبوو.

جا خوێن لە دەمارەکانی هاتە دەروەو فریاگوزاریەکی کاتی بە پەلەیان بۆ ئەنجام دا تا خوێنەکەی بوەستێتەوە، پێغەمبەریشﷺ فەرمانی کرد کە هەڵیبگرن و بیبەن بۆ مزگەوت و، تێیدا چادرێکی بۆ هەڵبدەن تا لەکاتی چارەسازیدا هەمیشە نزیك بێت لێی..

جا موسڵمانەکان لاوە مەزنەکەیان هەڵگرت بۆ شوێنەکەی لە مزگەوتی پێغەمبەر..

(سەعد)یش چاوی هەڵهێنا و سەرنجی ئاسمانی داو، وتی:

{خودایا، گەر شتێك لە جەنگی قورەیش ماوە ئەوا بمهێڵەرەوە بۆی..

چونکە هیچ هۆزێك نیە ئەوەندە حەز بکەم لە دژیان بجەنگم وەك ئەو هۆزەی ئەشکەنجەی پێغەمبەرەکەیان دایت و، بەدرۆزنیان دانا و، دەریانکرد..

ئەگەر شەڕیشت لەنێوان ئێمە و ئەواندا تەواو کردوە، ئەوا ئەوەی تووشم بووە بیکەرە رێگەی شەهیدبوونم..

مەم مرێنە هەتا چاوم روون دەبێتەوە بە نەمانی بەنی قورەیظە..!! }

* * *

بۆ تۆیە پاداشتی خودا ئەی سەعدی کوڕی مەعاذ..!

کێ دەتوانێ جگە لەتۆ قسەی وا بکات، لە ئاوەها هەڵوێستێکدا..؟؟

خودای گەورەش پاڕانەوەکەی گیرا کرد..

هەر ئەو پێکرانە بوو بەرێگەی شەهیدی و، پاش مانگێك لەژێر کاریگەری ئەو برینەدا بەرەو لای پەروەردگاری گەڕایەوە..

بەڵام نەمرد تا دڵی ئاسودە بوو بەرانبەر (بەنی قورەیظە)..

چونکە پاش ئەوەی کە قورەیشیەکان بێئومێد بوون لە چوونە ناو مەدینە و، ترس و بیم کەوتە ریزی سوپاکەیانەوە، هەموویان چەك و تفاقەکانیان هەڵگرت و، بەسەرشۆڕی گەڕانەوە بۆ مەککە..

پێغەمبەری خوداشﷺ وای بینی کە وازهێنان لە (بەنی قورەیظە) کە هەر کاتێك ویستیان ناپاکی بەرانبەر مەدینە ئەنجام بدەن، کارێکە ناکرێت ئیدی چاوپۆشی لێ بکرێت..

ئا لێرەدا فەرمانی کرد بە هاوەڵانی کە بەرەو بەنی قورەیظە بڕۆن..

لێرەشدا بیست و پێنج رۆژ ئابلۆقەیان دان..

کاتێك کە هەستیان کرد دەربازبوونیان بۆ نیە لەدەست موسڵمانەکان، خۆیان دا بەدەستەوەو، تکای خۆیان خستە بەردەم پێغەمبەری خواﷺ، ئەویش بەدەمیانەوە چوو، تکاکەیشیان ئەوەبوو کە (سەعدی کوڕی مەعاذ) ناوبژیوانی نێوانیان بکات.. سەعدیش لە سەردەمی نەفامیدا هاوپەیمانیان بوو.

* * *

پێغەمبەرﷺ هەندێ هاوەڵانی نارد و سەعدی کوڕی مەعاذ یان هێنا لە چادرگەکەی کە لەنێو مزگەوتدا تێیدا تیمار دەکرا..

بەسەر وڵاخێکەوە هات و، ماندوویەتی و نەخۆشی پێوە دیار بوو..

پێغەمبەر پێی فەرموو:

{ئەی سەعد، فەرمان دەربارەی بەنی قورەیظة بدە}..

جا سەعد هەوڵە ناپاکەکانی هاتەوە یاد کە دواترینیان شەڕی خەندەق بوو کە وەخت بوو شاری مەدینە و خەڵکەکەی تووشی تیاچوون بێت..

بۆیە سەعد وتی:

{وادەزانم کە شەڕکارەکانیان بکوژێن و..

ژن و منداڵەکانیان بکرێنە خزمەتکار و..

سامانەکانیان دابەش بکرێت..}.

بەم شێوەیە سەعد نەمرد هەتا دەروونی ئاسودە بوو بەرانبەر( بەنی قورەیظة)..

* * *

مەترسی برینەکەی سەعد رۆژ لەدوای رۆژ، بگرە سات لەدوای سات ترسناکتر دەبوو..

رۆژێکیان پێغەمبەری خودا چوو بۆ سەردانی و، سەیری کرد لە چرکەساتەکانی ماڵئاواییدایە، جا پێغەمبەر سەری هەڵگرت و خستیە کۆشیەوە، لەخوای گەورە پاڕایەوە:

{خودایا، سەعد لە پێناوی تۆدا تێکۆشا و..

بڕوای بە پێغەمبەرەکەت هێنا و..

ئەوەی لەسەری بوو بەجێی هێنا..

جا گیانی بە چاکترین شێوەی وەرگرتنی گیان وەربگرە}..

وشەکانی پێغەمبەرﷺ بەسەر گیانی ماڵئاوایکاریدا فێنکی و هێمنی داباراند.

هەوڵی دا، چاوەکانی کردەوە بەو ئومێدەی کە روخساری پێغەمبەری خوا دوایین شت بێت کە لە ژیانیدا چاوی پێی دەکەوێت و، وتی:

{سڵاوت لێ بێ ئەی پێغەمبەری خوا..

منیش شاهێدی دەدەم کە پێغەمبەری خودایت}..

ئا لەو کاتەدا پێغەمبەر سەرنجی روخساری سەعدی دا و، فەرمووی:

{خۆشی لەتۆ ئەی باوکی عەمر}..

* * *

ئەبوسەعیدی خودری ﷺ دەڵێت:

{لەو کەسانە بووم کە گۆڕیان بۆ سەعد هەڵکەند..

هەر کە چینێکی خۆڵەکەمان هەڵکەند، بۆنی میسکمان دەکرد..

هەتا تەواو هەڵمان کەند}...

مردنی سەعد لای موسڵمانەکان زۆر سەخت بوو..

بەڵام سەرەخۆشیان، زۆر پایەبڵند بوو، کاتێك گوێبیستی پێغەمبەرەکەیان بوون دەیفەرموو:

{عەرشی خودای گەورە بۆ مردنی سەعدی کوڕی مەعاذ لەرزیەوە}..

لەگەڵ ناوهێنانی (سەعدی کوڕی مەعاز)دا باسی (سەعدی کوڕی عوبادە)ش دەکرێت..

چونکە هەردووکیان سەرگەورەی خەڵکی مەدینە بوون..

(سەعدی کوڕی مەعاز) گەورەی ئەوس..

(سەعدی کوڕی عوبادە)ش گەورەی خەزرەج بوو..

هەردووکیشیان، زۆر زوو موسڵمان بوون و، ئامادەی پەیمانی عەقەبە بوون و، وەك سەربازێکی گوێڕایەڵ و، بڕوادارێکی راستگۆ لە پەنای پێغەمبەری خواداﷺ ژیان..

لەوانەیە (سەعدی کوڕی عوبادە) لەنێو هەموو ئەنصاریەکاندا تاکە کەس بێت کە پشکی خۆی لەو ئازار و ئەشکەنجەی قورەیش چەشتبێت کە بەسەر موسڵمانەکاندا دەهات لەشاری مەککە..!!

ئاسایی بوو کە قورەیش ئازار و ئەشکەنجەی ئەوانە بدات کە لەنێویاندا دەژیان و، لە مەککە نیشتەجێ بوون..

بەڵام پیاوێکی خەڵکی مەدینە تووشی ئەو ئەشکەنجەدانە بێت.. کە تەنها پیاوێکی ئاسایی نەبێت و بەس... بەڵکو سەرکردەیەکی گەورە بێت لە سەرگەورە و پیاو ماقووڵەکانیان، ئەم کارە قەدەر وای کرد کە تەنها بەشی (سەعدی کوڕی عوبادە) بێت..

ئەمەش لەدوای ئەوەی پەیمانی عەقەبە بەنهێنی بەستراو، ئەنصاریەکان ئامادەبوون بڕۆنەوە، قورەیشـیەکان بە پەیماندان و پێکهاتنی ئەنصاریەکانیان لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ زانی بەوەی کە کۆچ بکات بۆ مەدینە و ئەوانیش لەوێ لە دەوری دەبن بەرانبەر هەر هێزێکی هاوەڵپەرستان و تاریکی..

شێتێتی قورەیش هاتە جۆش و، دەستیان دایە شوێنکەوتنی سوارە ڕۆیشتوەکان تاکو گەیشتن بە (سەعدی کوڕی عوبادە) و بێ باوەڕەکان لەگەڵ خۆیاندا هێنایانەوە، بە گوریسی وڵاخەکەی هەردوو دەستیان بەستبووەوە بە ملیەوەو هێنایانەوە بۆ مەککە و، لە دەوری کۆبوونەوەو کەوتنە لێدانی و ئەوەی حەزیان لێی بوو لە ئازار و ئەشکەنجە بەسەریان هێنا..!!

کێ ئەمە بەسەر سەعدی کوڕی عوبادە دەهێنێت؟

ئەو سەرگەورەیەی مەدینە، کە دەمێکە پەنایان بۆ بردووەو، بازرگانێتیەکانی پاراستبوون و، رێزی لە شاندەکانیان گرتبوو، کاتێ یەکێکیان لە مەککە دەچوو بۆ مەدینە..؟؟

لەراستیدا ئەوانەی کە گرتیان و، ئەوانەیشی کە لێیان دەدا نەیان دەناسی و ئاشنایەتی پلەوپایەی نەبوون لەنێو هۆزەکەیدا..

بەڵام، وا دەزانیت گەر بیانناسیایە وازیان لێدەهێنا؟؟

ئەی ئەشکەنجە و ئازاری ئەو سەرگەورانەی مەککەیان نەدا کە موسڵمان بوون..؟؟

قورەیش لەو رۆژگارەدا شێت بوو، دەبینی کە هەموو تواناکانی نەفامێتیەکەی، خۆی ساز دەدا بۆ شکست خواردن بە بانگی حەق، هەر بۆیە هیچ رێبازێکی شك نەدەبرد بۆ دامرکاندنەوەی رق و قینەکەی جگە لە ئەشکەنجە..

-وەك وتمان- بێ باوەڕەکان لە دەوری سەعدی کوڕی عوبادە کۆبوونەوەو لێیان دەدا و دەستدرێژیان دەکردە سەر..

با لێ گەڕێین (سەعد) پاشماوەی باسەکەمان بۆ بگێڕێتەوە:

{... جا سوێند بەخوا کاتێ کە لەبەر دەستیاندا بوم یەکێك لە قورەیشیەکان بەرەو لام هات، پیاوێکی کەشی، سپی، باڵابەرزی پیاوانە..

لەدڵی خۆمدا وتم: گەر لەنێو ئەم هۆزەدا کەسێك هەبێت چاکەی لێ بوەشێتەوە، ئەوا ئەمەیانە..

کاتێ لێم نزیك بووەوە دەستی بەرزکردەوەو زللەیەکی زۆر توندی لێدام..

لەدڵی خۆمدا وتم: نا.. سوێند بەخوا، لەدوای ئەمە چاکە لە کەسیاندا نیە..!!

سوێند بەخوا کاتێ لەبەر دەستیاندا بووم، رایاندەکێشام، یەکێك لەپیاوەکانیان هات بۆ لام و، وتی: ماڵوێران، پەناداریت لەگەڵ هیچ قورەیشیەکدا نیە..؟

وتم با.. من پەناداری حارسی کوڕی حەربی کوڕی ئومەییەم..

پیاوەکە وتی: دەسا بە دەنگی بەرز ناویان بهێنە و، باسی ئەوە بکە کە پەناداری هەیە لەنێوانتاندا، منیش وام کرد..

جا پیاوەکە رۆشت بۆ لایان و، هەواڵی پێدان کە پیاوێکی خەزرەجی لە (أبطح) لێی دەدرێت و ناوی ئەمان دەهێنێت و، باسی ئەوە دەکات کە پەناداری هەیە لەگەڵیاندا..

لەبارەی ناومەوە پرسیاریان کردبوو.. وتبووی: سەعدی کوڕی عوبادە..

وتبویان: راست دەکات بەخوا، جا هاتن و لە چنگیان دەربازکردم}..

(سەعد) دوای ئەو دوژمنکاریەی کە تووشی هات لەکاتی خۆیدا مەککەی بەجێهێشت، تا بزانێ قورەیش چەند بە تاوان خۆی پڕ چەك دەکات بەرانبەر کەسانێکی بێپەنا، کە بانگەشەی خەڵکی دەکەن بۆ لای چاکە و، حەق و، ئاشتی..

لەراستیدا ئەو دوژمنکاریە زیاتر عەزمی جەزم کرد، بڕیاری دا کە لیبڕێت بۆ سەرخستنی پێغەمبەری خواﷺ و هاوەڵانی و ئیسلام.

پێغەمبەری خواﷺ کۆچ دەکات بۆ شاری مەدینە و.. بەر لەخۆیشی هاوەڵانی کۆچیان کردبوو..

ئا لەوێدا (سەعد) سامانەکەی خستە خزمەت کۆچەران..

(سەعد) هەر خۆی بە فیترەت و بۆماوەیی بەخشندە بوو..

چونکە ئەو کوڕی (عوبادەی کوڕی دولەیمی حاریسە) بوو، کە ناوبانگی بەخشندەیی و دەستکراوەیی لە سەردەمی نەفامیدا بەرفراوانتر بوو لە گشت ناوبانگێك..

بەراستی بەخشندەیی (سەعد) لە ئیسلامدا بوە نیشانەیەك لە نیشانەکانی ئیمانی بەهێز و پتەوی.

فەرموودەگێڕەوەکان لەبارەی بەخشندەییەکەیەوە دەڵێن:

(دەفری پڕ خۆراکی سەعد لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بەهەموو ماڵەکانیدا دەسوڕایەوە)..

هەروەها دەیانوت:

(پیاوێکی ئەنصاری یەك کەس یان دوو.. یان سێ کەس لە موهاجیرانی دەبردەوە لەگەڵ خۆی بۆ ماڵ..

بەڵام (سەعدی کوڕی عوبادە) هەشتا کەسی لەگەڵ خۆی دەبردەوە)..!!

لەبەر ئەوەش بوو، سەعد هەمیشە داوای چاکە و رزق و رۆزی زیاتری لە پەروەردگاری دەکرد و دەیوت:

(خودایا کەم بە کەڵکی من نایەت و، باش نابم لەسەری)..!!

لەپێناوی ئەوەشدا، شایستەی ئەو پاڕانەوەی پێغەمبەری خودا بوو ﷺ کە بۆی کرد:

(خودایا بەرەکەت و بەزەیی خۆت بەسەر خاوخێزانی سەعدی کوڕی عوبادەدا برێژە).

* * *

سەعد بە تەنها سامانەکەی نەخستبووە خزمەت ئیسلامی پیرۆز، بەڵکو هێز و لێهاتوویی خۆیشی خستبوە خزمەت..

بەراستیش تیرهاوێژێکی کارامە و چاك بوو.. لە جەنگەکانیشدا کە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بەشداری دەکرد فیداکاری جەسورانەی یەکلاکەرەوە بوو.. (ئیبن عەباس) ﷺ دەڵێت:

لە هەموو شوێنگەیەکدا پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ئاڵای هەبوو..

ئاڵای موهاجیرین، بە دەست (عەلی کوڕی ابوطالب)ەوە بوو..

هی ئەنصارەکانیش، بەدەست (سەعدی کوڕی عوبادە)وە..

* * *

وا دیارە توندی سروشتی دیاری ئەم کەسێتیە بەهێز بووە..

چونکە ئەو توند بوو لەسەر حەق و..

توندیش لە خواستنی شتێکدا کە بە مافی خۆی بزانیایە..

بڕوایشی بەکارێك هەبوایە هەڵدەستا بە ڕاگەیاندنی بەشێوەیەکی ئاشکرای بێ پێچ و پەنا و، سووربوونێك کە ئاشنای دەست لێ هەڵگرتن نەبێت..

جا ئەم توندیە، یاخود ئەم توندڕۆییە، ببوە پاڵنەری سەر گەورەی ئەنصار بەرەو هەڵوێستی وەها کە لەسەری دەکەوت زیاد لەوەی قازانجمەند بێت لێی..

* * *

لەرۆژی ڕزگارکردنی مەککەدا پێغەمبەری خوداﷺ کردیە سەردەستەی کۆمەڵێك لە لەشکری موسڵمانان..

هەر کە گەیشتە دەوروبەری دەروازەکانی (البلد الحرام) مەککە هاواری کرد:

((ئەمڕۆ ڕۆژی داستانە..

ئەمڕۆ، حەرامەکان حەڵاڵ دەبن))..

جا (عومەری کوڕی خطاب)ﷺ گوێی لێی بوو، دەست بەجێ خۆی گەیاندە خزمەت پێغەمبەری خوداﷺ و وتی:

(ئەی پێغەمبەری خوا..

گوێ بگرە بزانە سەعدی کوڕی عوبادە چی وتوە..

دڵنیانین لێی کە لەنێو قوڕەیشیەکاندا پەلاماردانی هەبێت)..

ئەمجا پێغەمبەرﷺ فەرمانی کرد بە عەلیﷺ کە خۆی بگەیەنێتە لای و ئاڵاکەی لێ وەربگرێت و، لەجێی ئەو ئەمیر بێت..

سەعد کاتێ مەککەی بەدی کرد سەرشۆڕانە خۆی داوەتە دەست سوپای موسڵمانانی ڕزگارکار،، دیمەنی ئەشکەنجەدانی بڕواداران و، ئازاردانی خۆی، ئەو ڕۆژەی بەسەریان هێنا.. هاتەوە یاد..

هەموو ئەو جەنگانەشی بیرکەوتەوە کە قوڕەیشیەکان دژ بە هۆزەکەی و بانگخوازانی ئەنجامیان دا و.. هەموو تاوانیشیان ئەوە بوو کە دەیانوت: (لا اله الا الله) جا توندوتیژیەکەی وای لێ کرد کە لە ڕۆژی ڕزگارکردنی مەزندا جنێو بە قوڕەیش بدات و هەڕەشە بکات..

* * *

هەر ئەم توندیە، یان بڵێ ئەم توندڕۆییە کە بەشێکی سروشتی (سەعد)ی پێکهێنابوو، هەر ئەوەش بوو لە ڕۆژی (سەقیفە)دا وای لێکرد کە ئەو هەڵوێستە دیارەی هەبێت.

بەهۆی وەفاتی پێغەمبەرەوەﷺ، کۆمەڵێك لە ئەنصاریەکان لە دەوری کۆبونەوە لە (سەقیفەی بەنی ساعیدە) و داوایان لێدەکرد کە جێنشینی پێغەمبەری خواﷺ لە ئەنصارەکان بێت..

جێنشینی پێغەمبەری خوداشﷺ ڕێزێك بوو بۆ خزمانی لە دونیا و قیامەتدا..
پاشان ئەو کۆمەڵە ئەنصارە دەیانویست کە بەدەستی بهێنن و بۆیان ببێت..
بەڵام پێغەمبەری خواﷺ لەکاتی نەخۆشیەکەیدا ئەبوبەکری لەجێی خۆی دانابوو نوێژیان پێ بکات و، هاوەڵانیش لەم لەجێی خۆ دانانە تێگەیشتن کە پشتگیری دیاردەی دیکەی دەکرد کە پێغەمبەری خواﷺ ئەبوبەکری.. دووەمین کەسی نێو ئەشکەوتەکەی.. زیاد کرد.
دەڵێین: تێگەیشتن کە ئەبوبەکر لە هەموان لەپێشتر بوو بۆ جێنشینی..
بەمجۆرە (عومەری کوڕی خطاب)ﷺ ئەم بۆچونەی دەربڕی و پێوەی پابەند بوو.. لەکاتێکدا (سەعدی کوڕی عوبادە) بۆچونێکی دیکەی هەبوو و دەستی پێوە گرت، بەجۆرێ کە وای لە زۆرێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوداﷺ کرد کە ئەم هەڵوێستەی بەجوان نەزانن، کە مایەی ڕەتکردنەوەو ناڕەزاییان بوو..

* * *

بەڵام (سەعدی کوڕی عوبادە) بەم هەڵوێستەی ڕاستگۆیانە بەدەم سروشت و خەسڵەتەکانی خۆیەوە چوو..
چونکە ئەو-وەك باسمان کرد- زۆر توند وابەستە بوو بە بیروبۆچونیەوەو، زۆر سوور بوو لەسەر قسەلەڕوویی و ڕوونیەکەی..
هەڵوێستی پاش جەنگی (حونەین) لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ئەو خەسڵەتەیمان پێ نیشان دەدات..
ئەوەبوو کاتێك موسڵمانەکان لەو جەنگەدا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، پێغەمبەرﷺ دەستی دایە دابەشکردنی دەستکەوتەکانی بەسەر موسڵمانەکاندا و.. لەو ڕۆژەدا زۆر گرنگی بە تازە موسڵمان بووەکان دا، کە بریتی بوون لەو پیاوماقوڵ و سەرگەورانەی کە تازە موسڵمان ببوبون، پێغەمبەری خوداﷺ ویستی کۆمەکیان بکات و زیاتر دڵیان پەیوەست بێت، هەروەك چۆن بەشی جەنگاوەرە نەدارەکانی دا..
ئەو کەسانەیشی زوو موسڵمان بووبوون دانیە دەست ئیسلامەتیەکەیان و، هیچی لە دەستکەوتەکانی ئەو جەنگە پێنەدان..
بەخشینی پێغەمبەری خوداﷺ تەنها بەخشینی ڕێزێك بوو هەموو خەڵك سووربوون لەسەری..
دەستکەوتەکانی جەنگیش لەوکاتەدا بووبووە دەستمایەیەکی گرنگ و گوزەرانی موسڵمانانی پێ بەڕێوە دەچوو..
بەم شێوەیە ئەنصاریەکان بە دڵتەنگیەوە پرسیان: بۆچی پێغەمبەری خواﷺ بەشی خۆیانی لە دەستکەوت و سامان پێنەدان..؟؟

حەسانی کوڕی سابیتی شاعیریش دەڵێت:

وانت الرسول فقل یا خیر مؤتمن ... للمؤمنین اذا ما عدد البشر
علام تدعي سلیم، وهی نازحة ... قدام قوم، هموا آووا وهم نصروا
سماهم الله انصارا بنصرهم ... دین الهدی، و عوان الحرب تستعر
وسارعوا في سبیل الله و اعترفوا ... للنائبات، وما خاموا وما ضجروا

شاعیری پێغەمبەری خوا لەم بەیتە شیعرانەدا گوزارشتی لەو بێزاریە کردووە کە ئەنصاریەکان هەستیان پێکرد، کە بینیان پێغەمبەرﷺ ئەوەی کە ویستی لە هاوەڵان پێی دان و، هیچی بەمان نەدا..

(سەعدی کوڕی عوبادە)ی سەرگەورەی ئەنصاریەکانیش ئەوەی بینی و، بیستی کە هۆزەکەی لەنێو خۆیاندا ئەو قسەیە دەدەن بەگوێی یەکدیدا، بەم هەڵوێستە رازی نەبوو، بەدەم سروشتە ئاشکرا راستە لەڕووەکەیەوە چوو، دەست بەجێ خۆی گەیاندە پێغەمبەری خوداﷺ و، وتی:

((ئەی پێغەمبەری خوا..

ئەم کۆمەڵەی ئەنصار شتێك بوەتە گرێ لەسەر دڵیان، بەهۆی شێوازی دابەشکردنی ئەو دەستکەوتەی بەدەستهێنرا.. لەنێو هۆزەکەی خۆتد دابەشت کرد و، بەخششی مەزنت دا بە هۆزەکانی عەرەب و، هیچ بەشی ئەم کۆمەڵەی ئەنصاری تێدا نەبوو))..

بەم جۆرە ئەو پیاوە قسە لەڕووە رازی دەروونی خۆی و، ئەوەی دەهات بەبیری هۆزەکەیدا درکاند و.. وێنەیەکی راست و دروستی هەڵوێستەکەی بۆ پێغەمبەر خستە روو..

جا پێغەمبەری خواﷺ لێی پرسی:

((بۆچوونی تۆ چی یە لەوبارەیەوە ئەی سەعد))..؟؟

بەو مانایەی کە بۆچونی هۆزەکەت ئەوەبێ، ئەی بۆچونی تۆ چی یە..؟؟

(سەعد)یش بە هەمان قسە لەڕووییەوە وەڵامی دایەوە:

((منیش لەهۆزەکەی خۆمم))..

پێویستە تا کۆتایی لەگەڵ چیرۆکەکەدا بڕۆین، چونکە جوانیەکی بێ هاوتای تێدایە..!!

سەعد هۆزی ئەنصاری خۆی کۆکردەوە..

پێغەمبەری خوداشﷺ هات بۆ لایان، روخساری غەمگینیانی خوێندەوەو.. زەردەخەنەیەکی گەشی پێزانی جوانیەکانیان و رێزلێنانی کارەکەیان کرد..

پاشان فەرمووی:

((ئەی کۆمەڵی ئەنصار..

شتێکم لەئێوە پێگەیشتووە، کە لە دڵی خۆتاندا شتێکتان بەرامبەرم بۆ دروست بووە..؟؟

ئایا ئێوە لە سەرلێشێواندا نەبوون کاتێ هاتمە لاتان و، خوای گەورە هیدایەتی دان..؟؟

نەدار بوون و، خوا دەوڵەمەندی کردن..؟؟

دوژمن بوون و، خوای گەورە دڵەکانتانی پێکەوە پەیوەست کرد)..؟؟

وتیان:

بەڵێ، خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی چاکەیان بەسەرمانەوە زۆرە و چاکترن.

پێغەمبەر فەرمووی:

((بۆ وەڵامم نادەنەوە ئەی کۆمەڵی ئەنصار..؟؟))

وتیان:چیت وەڵام بدەینەوە ئەی پێغەمبەری خوا..؟؟

خودا و پێغەمبەرەکەی چاکەیان بەسەرمانەوە زۆرە و چاکتریشن..

پێغەمبەر فەرمووی:

بەڵام سوێند بەخوا گەر بتانویستایە دەتانوت و، راستیشتان دەکرد و راستگۆبوون:

بەدرۆخرابویتەوە کە هاتیە لامان، ئێمەش بڕوامان پێکردی..

بەشکستی هاتی و، سەرمانخستی..

بە نەداری هاتی و، کۆمەکمان کردی..

دەرکراو بوویت و، پەنامان دایت..

ئەی کۆمەڵی ئەنصار.. لە دەرونی خۆتاندا خۆشەویستی دونیاتان بینیوە کە هۆزێکم پێ وابەستە کرد تا موسڵمان ببن و، ئێوەشم بە ئیسلامەتی خۆتان سپارد..؟؟

ئایا رازی نابن ئەی کۆمەڵی ئەنصار، کە خەڵکی مەڕ و وشتر ببەن و، ئێوەش بە پێغەمبەری خوداوە بگەڕێنەوە بۆ لای کۆڵ و بارەکانتان..؟؟

جا سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، گەر لەبەر کۆچکردن نەبوایە من یەکێك دەبووم لە ئەنصار.. گەر خەڵکیش هەر یەك بە رێگایەکدا بڕۆن، من رێگای ئەنصارم دەگرتە بەر..

خودایە بەزەییت بێتەوە بە ئەنصاریەکان و..

نەوەی ئەنصاریەکان و..

نەوەی نەوەی ئەنصاریەکاندا))..!!

ئا لەوێدا ئەنصاریەکان هێندە گریان تا ریشیان تەڕ بوو..

چونکە وشەکانی پێغەمبەری پایەبەرزی مەزن دڵەکانیانی پڕ کرد لە سەبوری و، گیانیان لە دەوڵەمەندی و، دەروونیان پڕ لە ساغی..

جا هەموویان، بە سەعدی کوڕی عوبادەشەوە هاواریان کرد:

((رازی بوین بەوەی پێغەمبەری خوا پشك و بەشمان بێت))..

* * *

لە ڕۆژانی سەرەتای جێنشینایەتی (عومەر)دا، سەعد چوو بۆ لای ئەمیری باوەڕداران و، بە هەمان قسە لەڕووی توندڕۆیانەیەوە پێی وت:

((ئەبوبەکری هاوڕێت-سوێند بەخوا- لەتۆ خۆشەویستتر بوو لەلامان..

سوێند بەخوا وام لێهاتووە حەزم نیە بەدراوسێیەتیت))..

عومەریش بە هێمنی وەڵامی دایەوە:

((هەرکەس حەزی لە دراوسێیەتی کەسێك نەبێت، لای بار دەکات))..

سەعد گەڕایەوەو وتی:

((من دەگوێزمەوە بۆ دراوسێیەتی کەسێکی لەتۆ چاکتر))..!!

* * *

سەعدﷺ بەو وشانەی کە ئاراستەی عومەری ئەمیری باوەڕدارانی کرد بۆ ئەوە نەبوو کە ڕق و قینی خۆی دەربڕێت، یان گوزارشت لە بێزاری خۆی بکات..

چونکە هەرکەس ڕازی بووبێت پێغەمبەری خواﷺ پشك و بەشی بێت، پشتیوانی و خۆشەویستی کەسێکی وەك عومەر ڕەت ناکاتەوە، کە هەمیشە جێگای ڕێز و خۆشەویستی پێغەمبەر بووە..

بەڵکو سەعد کە یەکێکە لەو هاوەڵانەی کە قورئانی پیرۆز باسی کردون: ﴿رحماء بینهم﴾الفتح/٢٩..

ویستی کە چاوەڕێی ڕەوشێك نەکات، کە جیاوازی لەنێوان ئەو و جێنشینی موسڵماناندا دروست بێت، جیاوازییەك کە ئەو نایەوێت و، پێێ ڕازی نیە..

* * *

کۆڵ و باری پێچایەوە بەرەو شام بڕوات..

هەر کە گەیشتە ئەوێ و لەخاکی (حوران) دابەزی ئاکامی هات و، بەرەو لای پەروەردگاری میهرەبانی گەڕایەوە..

٤٧

# ئوسامەی کوڕی زەید

# خوشەویستی کوڕی خوشەویست

ئەمیری باوەڕداران (عومەری کوڕی خطاب)ﷺ سەرقاڵی دابەشکردنی شت و مەکی (بەیتولمال) بوو بەسەر موسڵمانەکاندا..

نۆرەی (عبداللە ی کوڕی عومەر) هات و، عومەر بەشی خۆی پێدا..

پاشان نۆرەی (ئوسامەی کوڕی زەید) هات و، عومەر دوو هێندەی (عبداللە)ی کوڕی خۆی پێدا..

لەکاتێکدا عومەر بەپێی ڕێز و پایە و ناڕەحەتی چەشتنیان لەپێناوی ئیسلامدا شتی بەسەر خەڵکیدا بەش دەکرد، (عبداللە ی کوری عومەر) لەوە دەترسا کە شوێن و جێی لە ئیسلامدا لەدواوە بێت، لەکاتێکدا کە ئومێدەوار بوو بەهۆی گوێڕایەڵیی، تێکۆشان و، دونیانەویستی و، پارێزکارییەوە لای خوای گەورە لە موسڵمانە پێشەنگەکان بێت..

ئا لێرەدا لە باوکی پرسی: (فەزڵی ئوسامەت دا بەسەر مندا، لە وەختێکدا ئەوەی من لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بینیومە ئەو نەیبینیوە))..؟

عومەریش وەڵامی دایەوە:

((ئوسامە لەتۆ خۆشەویستتر بوو لای پێغەمبەری خواﷺ..

باوکیشی لەباوکت زیاتر خۆشەویستر بوو لای پێغەمبەری خواﷺ))..!!

جا دەبێ ئەوە کێ بێت کە خۆی و باوکی لە دڵی پێغەمبەردا خۆشەویستیان گەیشتبێتە ئاستێك کە کوڕی عومەر و عومەریش پێی نەگەیشتبن..؟؟

ئەوە (ئوسامەی کوڕی زەید)ە..

لەنێو هاوەڵانیشدا نازناوی (خۆشەویستی کوڕی خۆشەویست)ی هەبوو..

(زەیدی کوڕی حاریسە)[1]ی باوکیشی خزمەتکاری پێغەمبەری خودا بووﷺ و، پێغەمبەری بەسەر باوك و دایك و کەس و کاریدا هەڵبژارد، ئەو (زەید)ەی کە ڕۆژێکیان پێغەمبەر لەنێو کۆمەڵێك لە هاوەڵانیدا رایگرت و فەرمووی:

((شاهێد بن ئێوە کە ئەم زەیدە کوڕی منە و، میراتگرمە و میراتگریم))..

لەنێو موسڵمانانیشدا هەر بە (زەیدی کوڕی موحەممەد) ناویان دەبرد هەتا قورئانی پیرۆز داب و نەریتی (تەبەنی) بە منداڵکردنی هەڵوەشاندەوە..

ئەم ئوسامەیە کوڕیەتی..

---

١ بڕوانە بەسەرهاتی ژمارە(١٩)ی ئەم پەرتوکە بۆ خوێندنەوەی ژیانی.

(ئوم ئەیمەن)ی دایکیشی دایەنی پێغەمبەری خوا بووە..
روخساری دەرەوەی بۆ هیچ شتێك دەستی نەدەدا.. هیچ شتێ..
چونکە ئەو وەکو مێژوونووسان لەبارەیەوە دواون: رەشێکی لوت هەڵۆڵ بووە..
بەڵێ.. بەم دوو وشەیەو بەس، مێژوو قسەی خۆی دەربارەی ئوسامە کورت دەکاتەوە..
بەڵام، کەی ئیسلام گوێی بە شێوازی دەرەوەی خەڵکی داوە..؟
کەی.. لەکاتێکدا کە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێت:
((ئێمە لەوانەیە قژپرژێکی، تۆزاوی، جل و بەرگ شڕ کە کەس ئاوڕی لێ ناداتەوە، گەر سوێند لەسەر خوای گەورە بخوات خوا سوێندەکەی ناخات)).

* * *

کەوابوو با واز لە شێوەی دەرەکی ئوسامە بهێنین..
با لەپێستە ڕەشەکەی و، لوتە هەڵۆڵەکەی بگەڕێین، چونکە تێکڕای ئەوانە لە تەرازوی ئیسلامدا سەنگیان نیە..
با سەرنج بدەین خۆشەویستی و پشتیوانیەکەی چۆن بوو..؟ قوربانیدانی بەچ جۆرێ بوو..؟
چی لەداوێن پاکیەکەیدا بوو..؟ لەجێگیریەکەی و..؟ پارێزکاری و دڵنیاییەکەی و..؟ مەزنی و ژیانی پڕیدا هەبوو..؟!
لەهەموو ئەوانەدا گەیشتبووە ئەو ئاستەی شایانی ئەو خۆشەویستیی و رێزگرتنە زۆرەی پێغەمبەر بێتﷺ:
((ئوسامەی کوڕی زەید خۆشەویستترین کەسە لای من و، ئومێدەوارم کە لە پیاوچاکانتان بێت و، راتان دەسپێرم کە چاك بن لەگەڵیدا))..

* * *

ئوسامەﷺ خاوەنی هەموو ئەو ئاکارە مەزنانە بوو کە نزیکی بکات لەدڵی پێغەمبەر و، گەورەبێت لای.. چونکە ئەو کوڕی دوو موسڵمانی بەڕێزی زوو موسڵمان بوو بوو کە زۆر زوو بەرەو ئیسلام هاتن و، لە زۆربەیان زیاتر خۆشەویستی و پشتیوانیان لە پێغەمبەر دەکرد و لێی نزیك بوون..
لەو منداڵە بێگەردانەی ئیسلامیش کە لە سەردەمی ئیسلامدا لەدایك بوون و، لە فیترەتی بێخەوشیدا گۆش کران، بەبێ ئەوەی گەرد و تۆزی نەفامی و تاریکیەکانی بگرێت..
هەروەها ئوسامەﷺ زۆر زۆر زیرەك و، خۆ بەکەم زان بوو، لێبڕانیشی لەپێناوی خودا و پێغەمبەردا بێسنور بوو.

پاشان ئەو دوای ئەوەش، لە ئاینی نوێدا نوێنەرایەتی قوربانیانی رەنگەکانی دەکرد کە ئیسلام هات کۆت و بەندی جوداخوازی و شتە قێزەونەکانی لێی رامالّی..

جا ئەم رەشە لوت هەلّۆلّە لە دلّی پێغەمبەری خوا و، لە ریزی موسلّماناندا خاوەنی جێگایەکی بلّند بوو، چونکە ئەوەی خودا رازی لەسەرە بۆ بەندەکانی چۆنیەتی پایەو رێزی لەنێو خەلّکیدا راستکردۆتەوەو فەرمویەتی:

﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ: رێزدارترینتان لەلای خودا پارێزکارترینتانە﴾الحجرات/١٣.

بەم شێوەیەش بینیمان پێغەمبەری خواﷺ لە رۆژی رزگارکردنی مەزندا چووە شاری مەککە و ئەم رەشە لوت هەلّۆلّە (ئوسامەی کوری زەید) بە تەنیشتیەوە بوو.

پاشان بینیمان کە لە خۆشترین و جوانترین ساتەکانی ئیسلام و، سەرکەوتنەکەیدا، کە دەچووە کەعبە بیلال و ئوسامە لەلای راست و چەپیەوە بوون.. دوو پیاوی پێست رەشی قەترانی، بەلاّم ئەو پەیامی خوایەی کە لە هەردوو دلّی گەورەی بێگەردیاندا هەلّیانگرتبوو ئەو هەموو رێز و بەرزییەی پێ بەخشیبوو..

* * *

لە تەمەنێکی کەمدا، کە بیست سالّی تێنەپەراندبوو، پێغەمبەر (ئوسامەی کوری زەید)ی کردە فەرماندەی سوپا، کە (ئەبوبەکر و عومەر) لە نێو جەنگاوەرەکانیدا بوون..!!

ورتەورت کەوتە نێو هەندێ لە موسلّمانەکان و کارەکەیان پەلاوە گران بوو، بەزۆریان دەزانی کە ئوسامەی کوری زەیدی تازەپێگەیشتوو فەرماندەی سوپایەك بێت کە گەورەپیاوانی ئەنصار و موهاجیرینی تێدایە..

قسە و باسەکەیان گەیشتەوە بە پێغەمبەری خواﷺ، ئەویش چوویە سەر دوانگە و، سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد و، پاشان فەرمووی:

((هەندێ کەس تانە و تەشەر لە فەرماندەیەتی ئوسامەی کوری زەید دەگرن و..
پێشتریش تانە و تەشەریان لە فەرماندەریەتی باوکی دەدا..
جا باوکی شایستەی فەرماندەیەتی بوو..
ئوسامەش هەر شایانیەتی..
ئەو لەدوای باوکی خۆشەویسترین کەسە لای من..
من ئومێدەوارم کە لە پیاوچاکانتان بێت و..
راتان دەسپێرم کە چاك بن لەگەلّیدا))..

بەرلەوەی سوپا بەرەو شوێنی مەبەست بکەوێتە رێ پێغەمبەری خوداﷺ وەفاتی کرد، بەلاّم لە راسپاردە داناییەکەیدا بۆ هاوەلاّنی ئەوەی بەجێ هێشتبوو:

((ناردنی ئوسامە جێبەجێ بکەن..
ناردنی ئوسامە جێبەجێ بکەن..))

خەلیفەی موسڵمانان (ئەبوبەکر) بەم شێوەیە ئەو راسپاردەیەی پیرۆز راگرت و، وێڕای ئەو رەوشە نوێیەی کە وەفاتی پێغەمبەر هێنایە ئارا، (ئەبوبەکر) هەر سوور بوو لەسەر بەجێهێنانی راسپاردە و فەرمانەکەی، ئەوەبوو سوپای موسڵمانان بە سەرۆکایەتی (ئوسامە) بەرەو مەبەستەکەی کەوتە رێ، پاش ئەوەی کە خەلیفە مۆڵەتی لێ خواست کە (عومەر) لەلای خۆی بهێڵێتەوە لەشاری مەدینە..

لەکاتێکدا کە (هەرقل)ی ئیمپراتۆری رۆم هەواڵی وەفاتی پێغەمبەری بیست، لەهەمان کاتدا هەواڵی ئەو سوپایەی موسڵمانانی پێگەیشت کە بە سەرکردایەتی (ئوسامەی کوڕی زەید) بۆ پاککردنەوەی شام کەوتۆتە رێ، سەری سوڕما لەوەی کە موسڵمانەکان ئەوەندە بەهێز بن کە وەفاتی پێغەمبەرەکەیان کاریگەری نەبێت لەسەر نەخشە و توانایان.

بەم شێوەیە رۆمەکان خاو بونەوە و، ئیدی سنوری شامیان نەکردە شوێنی چاودێری کردنی لانەی ئیسلام لە دورگەی عەرەبیدا..

سوپا بێ زیان گەڕایەوەو.. موسڵمانەکان لەبارەیەوە وتیان:

((هیچ سوپایەکمان نەبینیوە وەك سوپای ئوسامە بێ زیان))..!!

رۆژێکیان (ئوسامە) وانەی تەمەنی وەرگرت.. وانەیەکی کاریگەر.. ئوسامە گوزەراندی و تێکڕای ژیانی تێدا گوزەرا لەو ساتانەوە کە پێغەمبەر بەرەو پەروەردگاری باڵادەست گەڕایەوەو تا ئەو ساتەی (ئوسامە) بەرەو لای پەروەردگاری گەڕایەوە لەسەردەمی کۆتایی خەلافەتی موعاویەدا..

دوو ساڵ بەر لە وەفاتی پێغەمبەرﷺ کردیە ئەمیری دەستەیەك و ناردی بۆ رووبەڕووبونەوەی هەندێ لە هاوەڵپەرستان کە دژایەتی ئیسلام و موسڵمانانیان دەکرد.

ئەوەش یەکەم ئەمیرێتی بوو (ئوسامە) بیگرێتە دەست..

لەم چالاکیەشیدا سەرکەوتن و بردنەوەی بەدەست هێنا و، هەواڵی سەرکەوتنەکەشی بەر لە هاتنەوەی گەیشتە پێغەمبەری خواﷺ و پێی دڵخۆش و شادمان بوو..

دەبا گوێ لە ئوسامە رابگرین پاشماوەی هەواڵەکەمان بۆ باس بکات:

((.. جا چوومە خزمەت پێغەمبەرﷺ و، مژدەدەر مژدەی رزگارکردنەکەی پێدابوو، روخساری گەشاوە بوو.. لەخۆی نزیك کردمەوە و، پاشان فەرمووی: بۆم بدوێ..

جا منیش دەستم کرد بە گێڕانەوەو.. بۆم باسکرد کە لەکاتێکدا هێزەکە شکستیان خوارد گەیشتمە سەر پیاوێکیان و رمەکەم لەسەر سینگی دانا، وتی: لا اله الا الله، منیش رمەکەم لێدا و کوشتم..

روخساری پێغەمبەرﷺ گۆڕا و فەرمووی:
((تیاچوون بۆ تۆ، ئەی ئوسامە..؟
ئەی چی دەکەیت بە (لا اله الا الله)..؟
((تیاچوون بۆ تۆ، ئەی ئوسامە..؟
ئەی چی دەکەیت بە (لا اله الا الله)..؟

هەر دووبارەی دەکردەوە لێم هەتا وام لێهات حەزم دەکرد کە خۆم لە تێکڕای کردەوەکانم دابماڵرامایە و، ئەو ڕۆژە سەرلەنوێ موسڵمان بومایە..

نا سوێند بەخوا، هەرگیز کەسێ ناکوژم کە وتبێتی (لا اله الا الله)، پاش ئەوەی کە گوێبیستی ئەوە بووم لە پێغەمبەری خوا.))

* * *

ئەمە ئەو وانە مەزنە بوو کە ژیانی ئوسامەی خۆشەویستی کوڕی خۆشەویستی ئاراستە کرد لەو ڕۆژەوەی کە لە پێغەمبەری خواوە گوێی لێ بوو تا ئەو ساتەی بەرازیبوویی و دڵنیایی دونیای بەجێهێشت..

ئەوەش وانەیەکی گەورەبوو..

وانەیەك مرۆڤایەتی پێغەمبەر و، دادگەری و، بەرزی بنەما و، مەزنی ئاینەکەی و ئاکاری خستە ڕوو..

ئەو پیاوەیشی کە پێغەمبەر دڵگران بوو بۆ کوژرانی و ناڕازی بوو لە کوژرانی بە دەستی ئوسامە، پیاوێکی هاوەڵپەرست و جەنگاوەر بوو..

کاتێك کە وتیشی (لا اله الا الله).. لە کاتێکدا وتی کە شمشێرەکەی بە دەستی ڕاستییەوە بوو، پارچەکۆشتی جەستەی ئەو موسڵمانانەی پێوەبوو کە لێی کربووبوەوە.. بۆیە وتیشی تا لە لێدانێکی کوژەر دەربازی ببێت، یان دەرفەتێك بۆ خۆی برەخسێنێت ئاراستەی خۆی تێدا بگۆڕێت و سەرلەنوێ بگەڕێتەوە بۆ شەڕکردن..

لەگەڵ ئەوەشدا، لەبەر ئەوەی کە وتی و، زمانی هاتە گۆ پێی، ژیانی پارێزراو و خوێنی حەرام دەبێت، لەو چرکەساتەدا و، لەبەر هەمان هۆ..

ئیدی چی لە دەروندا بێت و، نیەت و مەبەستی هەرچی بێت..

ئوسامەش تا کۆتایی ژیانی بە چاکە لەوانە تێگەیشت..

جا گەر ئەو پیاوە، لەم هەڵوێستەدا، پێغەمبەر ڕێگری لە کوشتنی بکات تەنها لەبەر ئەوەی کە وتی (لا اله الا الله).. ئیدی دەبێت چۆن بێت بەرانبەر ئەوانەی کە بڕوادارن لەراستیدا و، موسڵمانی ڕاستەقینەن..؟

بەم جۆرە بینیمان کاتێ ئاشوبی گەورە لەنێوان ئیمامی عەلی و لایەنگرانی لەلایەك و، موعاویە و لایەنگرانی لەلایەکی دیکە هەڵگیرسا، بەتەواوی بێلایەن بوو.

ئوریش (عەلی) خۆشدەویست و، حەقی لای ئەو دەبینی.. بەڵام چۆن بە شمشێرەکەی موسڵمانێك بکوژێت کە بڕوای بە خودا و پێغەمبەر هەیە، لە کاتێکدا کە پێغەمبەر سەرزەنشتی کرد لەسەر کوشتنی جەنگاوەرێکی بێباوەڕ کە لە ساتی شکان و هەڵهاتنیدا وتویەتی: لا اله الا الله..؟!

ئا لێرەدا نامەیەکی ئاڕاستەی ئیمامی عەلی کرد و تێیدا وتی:

گەر تۆ لەنێو کەڵبەی شێردا بویتایە،

پێم خۆش بوو کە لەگەڵتدا بم تێیدا..

بەڵام ئەمە کارێکە بەباشم نەزانی))..!!

هەر بۆیە بەدرێژایی ئەو ململانێ و جەنگە لە ماڵەکەی خۆیدا بوو..

کاتێك هەندێ لە هاوەڵانی هاتنە لای لەبارەی ئەو هەڵوێستەیەوە قسەیان لەگەڵ کرد، پێی وتن:

((هەرگیز کەسێك ناکوژم بڵێت لا اله الا الله)).

یەکێکیان پێی وت: ئەی خوا نافەرموێت ﴿وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ: لەگەڵیان بجەنگن هەتا ئاژاوە نامێنێ و دین گشتی دینی خوا دەبێ﴾الانفال/٣٩.؟

ئوسامەش لە وەڵامیدا وتی:

((ئەوانە هاوەڵپەرست بوون و، ئێمە لەدژیان جەنگاین هەتا ئاشوب هەڵنەگیرسێت و هەموو ئاین بۆ خوا بێت))..

* * *

لەساڵی پەنجاو چواری کۆچیدا، ئوسامە پەرۆشی دیداری خوا بوو، گیانی لەنێو پەلەکانیدا کەوتە چوڵە و، دەیویست کە بگەڕێتەوە بۆ نیشتمانی یەکەمی.

دەروازەکانی بەهەشت کرانەوە، تا پێشوازی لە یەکێك لە چاکەکارە تەقوادارەکان بکات.

# عبدالرحمن کوري ته بوبه کړ

# تا کوتاپې پاڼه واله

نموونەیەکی ڕوونی ئاکاری عەرەب بوو بە هەموو قوڵی و، ڕەهەندەکانیەوە.

لەکاتێکدا کە باوکی یەکەمین بڕوادار و.. ڕاستگۆ بوو کە بڕوای هێنا بە خودا و پێغەمبەرەکەی، ئیمانێك کە هاوشێوەی نیە و.. دووەم کەسی نێو ئەشکەوتەکەش بوو لەگەڵ پێغەمبەردا.. ئەو وەك بەرد لەگەڵ ئاینی هۆزەکەی و، بتەکانی قوڕەیشدا خۆڕاگر بوو..!!

لە غەزای بەدریشدا وەك جەنگاوەر لەگەڵ سوپای بێباوەڕاندا هات..

لە جەنگی ئوحودیشدا سەردەستەی ئەو ڕم هاوێژانە بوو کە قوڕەیش ئامادەی کردبوون بۆ جەنگ لە دژی موسڵمانەکان.

بەر لەوەی کە هەردوو سوپا بەیەکدا بدەن، وەك نەریت خولی زۆرانبازی دەستی پێکرد..

(عبدالرحمن) ڕاوەستا و داوای کرد کە یەکێك لە موسڵمانەکان بۆی بێتە دەر و لەگەڵیدا بجەنگێت.

ئەبوبەکری صدیق-ی باوکیﷺ هەستایەوە بەرەو لای بڕوات و لەگەڵیدا بجەنگێت، بەڵام پێغەمبەری خودا گرتی و، نەیهێشت زۆرانبازی لەگەڵ کوڕەکەیدا ئەنجام بدات.

* * *

عەرەبی ڕەسەن هیچ شتێك وەك پشتیوانیکردنی تەواوی لەوەی بڕوای پێیەتی جودای ناکاتەوە..

گەر بڕوای هێنا بە ئاینێك، یان بە فیکرەیەك، بیروبۆچوونی دەخاتە ژێر جڵەوی و، هیچ ڕێگایەك بۆ کردنەوەی ئەو کۆتە نیە، مەگەر خودا بۆچوونێکی نوێ دڵ و دەروونی بەبێ ساختە و خەڵەتاندن پڕ بکات.

سەرەڕای ڕێز و پێزانی باوکی لای (عبدالرحمن) و، متمانەی تەواوی بە تەواوەندی عەقڵی و، مەزنی دەروون و ئاکاری، کەچی پشتیوانی و خۆشەویستی بۆ بۆچوونەکەی خۆی بەسەریدا زاڵ بوو، موسڵمان بوونی باوکی وای لێ نەکرد کە شوێنی بکەوێت.

بەم جۆرە لە شوێنی خۆیدا مایەوەو، بەرپرسیارێتی بۆچوون و بیرەکەی خۆی هەڵگرت و، بەرگری لە خواوەندەکانی قوڕەیش دەکرد و، لەسایەی بەیداخەکەیدا لەدژی بڕواداران دەجەنگا.

بەهێزانی ڕەسەنی لەم پێڕە، حەقیان لێ ناشاردرێتەوە گەر ماوەیەکی زۆریش بخایەنێت..

چونکە ڕەسەنایەتی ناخیان و، ڕۆشنایی ڕوونی و دڵسۆزیان، لەکۆتایی کارەکەدا ڕێنوێنیان دەکرد بەرەو لای ڕاستی و، لەگەڵ هیدایەت و چاکەدا کۆی دەکردنەوە.

هەر واش بوو، ڕۆژێکیان کاتژمێری قەدەر زەنگی لێدا و، لەدایکبوونێکی نوێی (عبدالرحمن ی کوڕی ئەبوبەکری صدیق)ی ڕاگەیاند..

چراکانی ڕێنوێنی دەروونیان رووناك کردەوەو تێکڕای میراتەکانی نەفامی لەتاریکی و شێواندن ڕامالّی و.. خودای بێهاوەڵی تاك و تەنهای لە هەموو بوونەوەر و شتێکی دەوروبەریدا بەدی کرد و، هیدایەتی خوای گەورە سێبەری خۆی کێشا بەسەر دەروون و جوانیەکانیدا، کەوابوو ئێستا کێ ئەو لە موسڵمانانە..!!

دەست بەجێ هەستایەوە بەرەو خزمەتی پێغەمبەری خوا کەوتە ڕێ، وەك تەویەکارێك بەرەو ئاینی هەق..

ڕوخساری ئەبوبەکر لە خۆشیاندا گەشایەوە کە بینی کوڕەکەی پەیمان دەدات بە پێغەمبەری خودا.

ئەو بەکافری پیاو بوو.. ئەوەتا ئێستاش پیاوانە موسڵمان دەبێت، هیچ چاوچنۆکییەك پاڵی پێوە نانێت و، هیچ ژینێك کەمەندکێشی ناکات.. بەڵکو بڕوامێنانێکی تێگەیشتوانەی ڕاست هیدایەتی خودا و سەرخستنی ئەوەی بەسەردا باراند.

جا (عبدالرحمن) دەستی دایە قەرەبووکردنەوەی هەموو ئەوەی کە لەدەستی دابوو، بەخستنەگەڕی هەموو هەوڵی لەپێناوی خودا و، پێغەمبەرەکەی و، ئیسلامدا..

* * *

لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ و، ڕۆژگاری خەلیفەکاندا دوای خۆی، (عبدالرحمن) لەهیچ جەنگێك دوانەکەوت و، وازی لەجیهادی ڕێپێدراو نەهێنا..

لەڕۆژی یەمامەشدا تاقیکردنەوەیەکی مەزن بوو، خۆڕاگری و بوێریەکەی ڕۆڵی گەورەی هەبوو لە بەدەستهێنانی جەنگەکە لە جەنگی سوپای موسەیلەمە و هەڵگەڕاوەکان.. بگرە هەر ئەو بوو کە کۆتایی بە گیانی (موحکەمی کوڕی توفەیل) هێنا، کە عەقڵی ڕێکخەری موسەیلەمە بوو، هەروەك چۆن بەهێزەکەی گرنگترین پێگەی ئەو قەلایەی دەپاراست کە سوپای هەڵگەڕاوەکان لەناویدا خۆی پەنادابوو، هەر بۆیە کاتێك (موحکەم) بە شمشێری (عبدالرحمن) هات بەلادا و کەوت و، ئەوانەی دەوروبەری پەرتەوازە بوون، دەروازەیەکی فراوانی گەورەی قەلاکە والابوو جەنگاوەرە موسڵمانەکان لێوەی چوونە ژوورەوە..

خەسڵەتەکانی (عبدالرحمن) لەسێبەری ئیسلامدا گەشاوەتر و سەنگینتر بوو.. جا پشتیوانی خۆشەویستی بۆ بۆچوون و تێڕوانینی و، سووربونی تەواوی لەسەر شوێنکەوتنی ئەوی بەڕاست و حەقی دەبینی و، ڕەتکردنەوەی خۆ بەکەمزانی و مەرایی کردنە.

هەموو ئەو ئاکارانە کرۆکی کەسێتی و ژیانی بوو و، لەژێر کاریگەری گومڕابوونی هیچ ویستێکدا یان لەبەر کاریگەری ترس، دەست بەرداری نەبوو، تەنانەت ئەو ڕۆژە سامناکەش،

ئەو ڕۆژەی کە موعاویە بڕیاری دا کە بە زەبری شمشێر پەیمان بۆ یەزید وەربگرێت.. جا نامەی پەیماندانی نووسی بۆ مەروانی کاربەدەستی لەسەر مەدینە و، فەرمانی پێکرد کە لە مزگەوتدا بیخوێنێتەوە بۆ موسڵمانەکان..

مەروانیش وای کرد و، لەوەدا بوو لە خوێندنەوەی ببێتەوە، (عبدالرحمن ی کوڕی ئەبوبەکر) هەستایەوە تا ئەو ناڕەزاییەی مزگەوتەکەی گرتبووەوە بیگۆڕێت بۆ ناڕەزایی دەربڕینی وتراو و بەرەو ڕووبەڕووبوونەوەیەکی بەرز و، وتی:

{سوێند بەخوا چاکەتان بۆ ئوممەتی موحەممەد نەویستووە، بەڵکو دەتانەوێت بیکەنە هەرقەلیەت.. هەر کە هەرقەلێك مرد، هەرقەلێکی دیکە بچێتە شوێنی}.!!

عبدالرحمن ئا لەو ساتەدا هەموو ئەو مەترسیانەی بەدی کرد کە چاوەڕێی ئیسلامە گەر معاویە ئەم کارەی بۆ بچێتە سەر و، فەرمانڕەوایی لە ئیسلامدا کە بەڕاوێژ خەڵکی فەرمانڕەوای خۆیان هەڵدەبژارد، گۆڕی بۆ قەیسەریەت یا کیسرایییەت کە بەهۆی لەدایك بوون و ڕێکەوتەوە قەیسەر لەدوای قەیسەر دەسەپێنێت بەسەریاندا..!!

* * *

هەرکە عبدالرحمن ئەم وشە توندانەی بەڕووی مەرواندا دا، دەستەیەك لە موسڵمانان پشتیوانیان کرد، لە سەرووی هەموشیانەوە (حوسەینی کوڕی عەلی) و، (عبدالله ی کوڕی زوبەیر) و (عبدالله ی کوڕی عومەر)..

دواتر پاش ڕەوشێکی سەرکوتکارانە (حوسەین و عبدالله ی کوڕی زوبەیر و عبدالله ی کوڕی عومەر) ناچار کران بێدەنگ بن لەئاست ئەو پەیمان وەرگرتنەدا کە معاویە بڕیاری دابوو بە زەبری شمشێر وەری بگرێت.

بەڵام عبدالرحمنی کوڕی ئەبوبەکر بەردەوام پوچەڵی ئەو پەیمان وەرگرتنەی بەئاشکرا رادەگەیاند، موعاویەش نێردراوێکی بە سەدهەزار درهەمەوە نارد بۆ لای، دەیویست بەهۆیەوە کەمەندکێشی بکات، جا عبدالرحمن فڕێی دا دواوەو، بە نێردراوەکەی موعاویەی وت:

{بگەڕێرەوە بۆ لای و پێی بڵێ: عبدالرحمن ئاینەکەی خۆی بۆ دونیای تۆ نافرۆشێت}.

کاتێك پاش ئەوەی زانی کە موعاویە خۆی سازکردووە بێت بۆ مەدینە، ئەو دەست بەجێ بەرەو مەککە ڕۆیشت..

خوای گەورە ویستی وابوو کە ئاشووبی ئەم هەڵوێست و خراپی سەرئەنجامی هەر هێندە بێت.

لەوەدا بگاتە دەوروبەری مەککە و بۆ کەمێك تێیدا نیشتەجێ بێت، گیانی دەرچوو و بۆ لای پەروەردگاری گەڕایەوە.. پیاوان لەسەر شانیان بەرەو بەرزاییەکانی مەککە هەڵیانگرت و لەوێدا

بەخاکیان سپارد، لەژێر ئەو خاکەی کە سەردەمی نەفامیشی بینیبوو.. موسڵمان بوونیشی بەدی کردبوو..!!

کە موسڵمان بوونی پیاوێکی راستگۆی، ئازادی، بوێر بوو..

ئەو خۆڕاگرە، تەویەکارە، خواپەرستەی کە ئێستاکێ لەبارەیەوە دەدوێین (عبداللەی کوڕی عەمری کوڕی عاص)ە.

ئەوەندەی کە باوکی مامۆستا بوو لە زیرەکی و لێزانی و فرت و فێڵزانیدا.. ئەمیش مامۆستایەکی خاوەن شوێنێکی بڵند بوو لەنێو خواپەرستان، دونیانەویستی، دیاردا..

هەموو کاتی خۆی و، تێکڕای ژیانی بۆ پەرستش تەرخان کردبوو..

شیرینی ئیمان مەستی کردبوو، شەوو ڕۆژ بەشی خواپەرستی و خەڵوەتی ئەویان نەدەکرد..

* * *

بەر لەباوکی موسڵمان بوو، لەو ساتەوەی دەستی ڕاستی خستە دەستەڕاستی پێغەمبەری خواوە ﷺ پەیمانی پێدا، دڵی بەڕوناکی خودا و ڕوناکی گوێڕایەڵ بوونی وەك بەرەبەیانی بێوێنە ڕۆشن بوو.

یەکەمجار سەرقاڵی قورئانی پیرۆز بوو کە بەش بەش دەهاتە خوارەوە، هەر کە ئایەتێك دادەبەزی لەبەری دەکرد و تێی دەگەیشت، هەتا هەمووی هاتە خوارێ و تەواو بوو، هەمووی لەبەر بوو..

تەنها لەبەر ئەوە لەبەری نەدەکرد کە مێشکی بەهێز بێت و، لەنێویدا پەرتوکێکی لەبەرکراو لەخۆ بگرێت..

بەڵکو بۆیە لەبەری دەکرد تا دڵی پێ ئاوەدان بکاتەوەو، تا لەدوای ئەوە بەندەی گوێڕایەڵی بێت و، ئەوەی حەڵاڵ کراوە حەڵاڵی بکات و، ئەوەی حەرام کراوە حەرامی بکات و، بەدەم هەموو ئەو شتانەوە بچێت کە بانگەشەی بۆ دەکات، پاشان سەرگەرمی خوێندنەوەو، تێگەیشتن و، دەورکردنەوەی بێت و.. لەباخە جوانەکانیدا خۆی بڕازێنێتەوە، بەو خۆشیانەی کە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بەسەریدا دەڕشت دەروونی فراوان دەبوو، چاو بە فرمێسك بوو بۆ ئەو ترسانەی دەیورووژاند..!!

عبداللە وەك ئەوەی بۆ ئەوە دروست کرابێت تا ببێتە خەڵوەتکارێکی خواپەرست، هیچ شتێکی دونیا نەیدەتوانی لایبدات لەوەی کە بۆی دروست کراوەو ڕێنوێنی کراوە بۆی..

کە سوپای ئیسلام بۆ جیهاد و ڕوبەڕووبوونەوەی بێباوەڕان دەچوو، لە پێشەوەی ڕیزی ئەو کەسانەدا دەمانبینی کە ئارەزومەندی شەهیدی بوون، بەگیانێکی خۆشەویست و، سوربونێکی شەیدایانەوە..

کە شەڕیش تەواو دەبوو، لەکوێ بوو..؟؟

لە مزگەوتی گەورە بوو، یان لە مزگەوتی ماڵەکەی خۆی، لە ڕۆژدا بەڕۆژو و، بەشەویشدا شەونوێژی دەکرد و، زمانی ئاشنای هیچ قسەوباسێکی دونیا نەبوو، هەرچەندە ڕێپێدراویش بێت، بەڵکو هەمیشە بەیادی خوا پاراو بوو، قورئانەکەی دەخوێند، یان سوپاسگوزاری دەکرد، یا داوای لێخۆشبوونی گوناهەکانی دەکرد..

هێندە بەسە ئاگاداری ڕەهەندەکانی پەرستش و خەڵوەتی بین، کە دەبینین ئەو پێغەمبەرەی هاتووە بانگەشەی خەڵکی بکات بۆ پەرستنی خوا، ناچار دەبێت کە دەست وەربدات لە ڕۆچونە زیادەی عبدالله لە پەرستشدا..!!

بەمجۆرە گەر یەکێك لە روخسارەکانی ئامۆژگاری لە ژیانی عبدالله ی کوڕی عەمردا ئاشکراکردنی گەنجینەی دەروونی مرۆڤ بێت لە توانای زۆر بۆ گەیشتن بەوپەڕی پلەی پەرستش و لێبڕان و چاکە، ئەوا روخسارەکەی دیکەی سووربوونی ئاینە لەسەر مەبەست و میانڕەوی لە گەشەپێدانی هەموو باڵادەستی و تەواومەندێتیەك، هەتا دەروون پەرۆشی و خۆشیەکانی بمێنێت..

ساغی و دروستی جەستەش بمێنێت..!!

پێغەمبەری خواﷺ زانی کە (عبدالله ی کوڕی عەمری کوڕی عاص) ژیانی لەسەر یەك ڕێڕەو دەگوزەرێنێ جگە لە چوونە دەرەوە بۆ غەزا، هەموو ڕۆژەکانی دیکەی لە بەرەبەیانەوە تا بەرەبەیانی داهاتەوە لە پەرستشی بەردەوامدا بەسەر دەبرد.. ڕۆژو و نوێژ و، قورئان خوێندن..

پێغەمبەرﷺ بانگی کرد بۆ لای خۆی و، لەبارەی مەبەستی خواپەرستیەکەیەوە پرسیاری لێ کرد.

پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو:

{هەواڵم پێ گەیشتووە کە تۆ بەڕۆژدا بەڕۆژویت و، نایشکێنی و، بە شەویشدا شەونوێژ دەکەیت و ناخەویت؟

هێند بەسە بۆت کە لە مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بیت.

عبدالله وتی: من لەوە زیاترم لەتوانادایە..

پێغەمبەرﷺ فەرمووی:

هێندە بەسە بۆت کە لە هەموو هەفتەیەکدا دوو ڕۆژ بەڕۆژوو بیت..

عبدالله وتی: دەی من لەوە زیاتریشم لەتوانادایە..

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی:

کەوابوو چاکترین ڕۆژوت بۆ هەیە، وەك ڕۆژووی داود، ڕۆژ نا ڕۆژێك بەڕۆژو دەبوو..

ئەمجا پێغەمبەرﷺ لێی پرسی:
زانیویشمە کە هەموو قورئان بە شەوێك دەخوێنیت.
دەترسم کە پیر بویت بێزار ببیت لە خوێندنەوەی..!!
بە مانگێك یەکجار تەواوی بکە..
بە دەڕۆژ بیخوێنە..
بەسێ ڕۆژ تەواوی بکە..
پاشان پێی فەرموو:
من ڕۆژوو دەگرم و، بەربانگیش دەکەمەوە..
شەونوێژ دەکەم و، دەشخەوم..
ژنیش دەهێنم، جا هەر کەس لە سوننەتی من هەڵگەڕایەوە
ئەوە لەمن نیە))

عبداللە ی کوڕی عەمریش زۆر تەمەنی درێژ بوو، کاتێك کە بەناو ساڵدا چوو و هێز و توانای کەم بوو، هەمیشە بیری لە ئامۆژگاریەکەی پێغەمبەر دەکردەوە و دەیوت:

((بریا روخسەتەکەی پێغەمبەری خوام وەریگرتایە))..

* * *

بڕواداریکی ئاوەها زۆر ئەستەم بوو لە جەنگدا-هەرجەنگێك- بیدۆزیتەوە کە لەنێوان دوو کۆمەڵی موسڵماندا بەرپابوو بێت.

جا ئیدی چۆن قاچەکانی هەڵیانگرتووە لە مەدینەوە بەرەو (صفین) و، جێگای خۆی لەنێو سوپای موعاویەدا گرت لە کاتی ململانێیدا بەرامبەر ئیمامی عەلی..؟

لەراستیدا ئەم هەڵوێستەی عبداللە، شایانی لێ وردبونەوەیە، هێندەی ئەوەی کە پاش تێگەیشتنمان لێی شایستەی ڕێز و بەگەورەگرتنە..

بینیمان کە عبداللە ی کوڕی عەمر سەرقاڵی پەرستش بوو بەجۆرێ وەخت بوو کە ببێتە مەترسیەکی تەواو لەسەر ژیانی-ئەو کارەی کە هەمیشە باوکی سەرقاڵ کردبوو- سکاڵای دەکرد لێی لای پێغەمبەری خوا.

لەکۆتا جاریشدا کە پێغەمبەر فەرمانی پێکرد کە پەرستشی کەمتر بکاتەوەو کاتەکانی بۆ دیاری کرد، عەمر ئامادە بوو، جا پێغەمبەر دەستی عبداللەی گرت و، خستیە نێو دەستی (عەمری کوڕی عاص)ی باوکیەوە.. پێی فەرموو:

{ئەوەی فەرمانم پێت کرد بەجێی بهێنە و.. گوێڕایەڵی باوکت بە}..

سەرەڕای ئەوەی کە عبداللە بەهۆی ئاین و ئاکاریەوە، گوێڕایەڵی باوك و دایکی بوو، بەڵام فەرمانی پێغەمبەری خوا بۆی، بەو جۆرەو لەو بۆنەیەدا کاریگەریەکی تایبەتی هەبوو لەسەری..

(عبداللە ی کوڕی عەمر) تەمەنی درێژی گوزەراند، بۆ چرکە ساتێك ئەو دەستەواژە کورتەی لەیاد نەچوو:

{ئەوەی فەرمانم پێت کرد بەجێی بهێنە و.. گوێڕایەڵی باوکت بە}..

* * *

لە کەژاوەی ڕۆژگاری ساڵ و ڕۆژەکانی بەدوای یەکدا هات و..

موعاویە لەشام ڕازی نەبوو پەیمان بە ئیمامی عەلی بدات..

ئیمامی عەلیش ڕازی نەبوو ملکەچی ئەو هەڵگەڕانەوە ناڕەوایە بێت..

ئەمجا شەڕ بەرپا بوو لەنێوان ئەو دوو کۆمەڵە موسڵمانەداو.. ڕووداوی (جەمەل) ڕوویدا و.. ڕووداوی (صفین) هات.

(عەمری کوڕی عاص)یش ڕێبازی خۆی هەڵبژاردبوو لەگەڵ معاویەدا، دەیزانی کە موسڵمانەکان چەند ڕێزی (عبداللە)ی کوڕیان لایە و چەند متمانەیان بە ئاینداریەکەی هەیە، ویستی وای لێبکات کە بۆ جەنگ بێتە دەرەوە، تاکو لای موعاویە بەهۆی هاتنیەوە زۆری دەست بکەوێت..

بەم جۆرە (عەمر) زۆر گەشبین بوو بە ئامادەبوونی عبداللە لەگەڵیدا کاتی جەنگ و، ناڕەحەتیەکانی ڕزگارکردنی شام و ڕۆژی یەرموکی لەگەڵدا لەیاد نەدەچوو..

ئەو ساتەیش هات بە خەیاڵیدا کە بۆ (صفین) بڕوات بانگی کرد و پێی وت:

ئەی عبداللە! خۆت ئامادەکە بۆ چوون، تۆ لەگەڵ ئێمەدا دەبیت بۆ شەڕ.

عبداللە ش لە وەڵامیدا وتی:

((چۆن بێم..؟ لەکاتێکدا کە پێغەمبەری خواﷺ ڕایسپاردم کە هەرگیز شمشێر لەسەر گەردنی موسڵمان دانەنێم..؟؟))

ئەمجارە عەمر بەلێزانیەکەی هەوڵیدا بڕوای پێ بهێنێت کە ئەوان بەم دەرچوونەیان دەیانەوێت کە بگەنە بکوژانی عوسمان و تۆڵەی خوێنی پاکی بکەنەوە..

پاشان قسە سەرسوڕهێنەرە یەکلاکەرەوەکەی خۆی بەکوڕەکەی وت:

{ئەی عبداللە! لەبیرتە دوایەمین ئامۆژگاری پێغەمبەری خواﷺ بۆت، کاتێك دەستی گرتی و خستیە نێو دەستمەوە و فەرمووی پێت:

گوێڕایەڵی باوکت بە؟..

ئێستا من پێت دەڵێم کە لەگەڵماندا بێیت و بجەنگیت}..

عبداللەی کوڕی عەمر گوێڕایەڵی باوکی بوو هاتە دەرێ و لای خۆیەوە وای دانابوو کە شمشێر هەڵنەگرێت و لەدژی موسڵمان نەجەنگێت..

بەڵام چۆن ئەوەی پێ دەکرێت..؟؟

ئێستا ئەوەندەی بەسە کە لەگەڵ باوکیدا بچێتە دەرێ.. بەڵام کاتێ کە جەنگ بەرپا دەبێت ئەوساتە بەجۆرێکە خوا دەیبات بەڕێوە..!

شەڕ بە سەختی هەڵگیرسا..

مێژوونووسان جیا ڕان لەوەی کە عبداللە لە سەرەتاکەیدا بەشداری کردووە یان نا..

ئێمەش دەڵێین لە سەرەتاوە بەشدار بووە، چونکە شەڕەکە زۆری نەخایاند، هەتا روداوێك رویدا و وای لە عبداللە ی کوڕی عەمر کرد کە بە ئاشکرا شوێنی خۆی لە دژی شەڕ و لەدژی موعاویە بگرێت..

ئەویش بریتی بوو لەوەی کە (عەمماری کوڕی یاسر)[1] لە ریزی سوپای ئیمامی عەلی دا دەجەنگا و عەممارێش جێگای رێزی زۆری هاوەڵانی پێغەمبەر بوو.. لەوەش زیاتر، لەرۆژگارێکی زووەوە پێغەمبەر پێشبینی تیاچوون و کوژرانی دابوو..ئەمەش ئەوکاتە بوو کە پێغەمبەر و هاوەڵانی مزگەوتی خۆیان لەشاری مەدینە دروست دەکرد لەپاش کۆچکردنیان بۆ ئەوێ و.. بەردەکان زۆر قورس و گەورە بوون مرۆڤی زۆر بەتوانا نەیدەتوانی کە یەك بەرد زیاتر یان لێ هەڵبگرێت.. بەڵام عەممار بەهۆی زۆر خۆشی و شادییەوە دوو دوو هەڵیدەگرت، رۆژێکیان پێغەمبەر چاوی پێی کەوت و بە دوو چاوی پڕ لە ئەشکەوە سەرنجی دا و فەرمووی:

{وای لە کوڕی سومەییە، کۆمەڵێکی لاڕێ دەیکوژن}..

هەموو ئەو هاوەڵانەی بەشداری بونیاتنانی مزگەوتەکەیان دەکرد-گوێبیستی ئەو پێشبینیە بوون، هەتا ئێستاش لەیادیانە.

عبداللە ی کوڕی عەمریش یەکێك بوو لەوانەی گوێیان لێی بوو..

لە دەستپێکی شەڕی نێوان سوپای عەلی و دەستەی موعاویەدا، عەممار دەچوویە سەر بەرزایی و بەوپەڕی دەنگی هاواری دەکرد:

دەگەینەوە بە ئازیزان.. بە موحەممەد و هاوەڵان.

کۆمەڵێك لە سوپای موعاویە رێککەوتن لەسەر کوشتنی و، رمێکی گوناهبارانەی تێگرت و، بەرەو جیهانی شەهیدای سەرفراز گواستیەوە..

هەواڵی کوژرانی عەممار وەك رەشەبا بڵاوبوویەوە.

عبداللە ی کوڕی عەمریش تۆڵەسێن و شۆڕشگێڕانە راپەڕی:

---

١ پێشتر لە ژمارە(١٤) باسمان کرد.

– ئەوە عەممار کوژرا..؟؟
– ئێوەش کوشتتان..؟؟
– کەوابوو، ئێوە کۆمەڵە لاڕێ کەن..
– ئێوە جەنگاوەرە سەرلێشێواوەکانن..!!
وەك ترسێنەر بەنێو سوپای موعاویەدا کەوتە ڕێ و، وورەی دەهێنانە خوارەوەو، هاواری دەکرد بەنێویاندا کە لەڕێدەرچوون، چوونکە ئەوان عەممariان کوشتووەو پێغەمبەریش بەر لە بیست و حەوت ساڵ لە نێو دەستەیەك لە هاوەڵانیدا پێشبینی ئەوەی کرد کە دەستەیەکی لەڕێ دەرچوو دەیکوژێت..
قسەکەی عبدالله گەیەنرایە موعاویە، ئەویش عەمر و عبدالله ی کوڕی بانگ کرد و بە عەمری وت:
{ئەم شێتەتمان لەکۆڵ ناکەیتەوە..؟
عبدالله وتی:
{من شێت نیم، بەڵام لە پێغەمبەری خودامﷺ بیست بە عەمماری فەرموو: دەستەیەکی لەڕێدەرچوو دەتکوژێت}..
موعاویە پێی وت:
{ئەی بۆ لەگەڵمان هاتی}..؟
عبدالله وتی:
{چونکە پێغەمبەری خوا فەرمانی پێکردم کە گوێڕایەڵی باوکم بم و، منیش لە هاتندا گوێڕایەڵی بووم، بەڵام لەگەڵتاندا ناجەنگم}..
لەکاتێکدا کە ئەوان پێکەوە دەدوان، یەکێك هاتە ژوورەوە مۆڵەت بۆ بکوژی عەممار بخوازێت تا بێتە ژوورەوە بۆ لای موعاویە، عبدالله ی کوڕی عەمریش بە دەنگی بەرز هاواری کرد:
{مۆڵەتی بدە و، مژدەی دۆزەخیشی بدەرێ}..
موعاویە سەرەڕای لەسەرخۆیی و، پشوودرێژی، رق و قینی هەستا و هاواری کرد بەسەر (عەمر)دا:
(گوێت لێ نیە چی دەڵێت)..
جا عبدالله بە هێمنیەکی تەقوادار و دڵنیاییەوە ئەوەی بۆ موعاویە دوپات کردەوە کە ئەوەی وتویەتی حەقە و، ئەوانەی عەممariان کوشتووە لەڕێ دەرچوون..
ئاوڕیشی لەباوکی دایەوەو وتی:
{گەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە پێغەمبەری خوا فەرمانی پێکردم کە گوێڕایەڵت بم لەگەڵ تۆ ئەم ڕێگەم نەدەگرت}..

ئەمجا موعاویە و عەمر هاتنە دەرەوەو سوپاکەیان بەسەر کردەوەو سەرسام بوون کاتێ بینیان هەموو خەڵك دەربارەی ئەو پێشبینیەی پێغەمبەر لەبارەی عەممارەوە دەدوان:

{دەستەیەکی لەڕێدەرچوو دەتکوژێت}.

عەمر و موعاویە هەستیان کرد کە ئەم ورتەورتە بۆی هەیە کە بگۆڕێت بە یاخیبوون و هەڵگەڕانەوە لە موعاویە.. هەر بۆیە بیریان کردەوە هەتا فێڵ و تەڵەکەی خۆیان دۆزییەوەو دەستیان کرد بە بڵاوەکردنەوەی بەنێو خەڵکدا..

دەیانوت:

{بەڵێ، پێغەمبەری خواﷺ ڕۆژێکیان فەرمووی بە عەممار: دەستەیەکی لەڕێ دەرچوو دەتکوژن..

پێشبینیەکەی پێغەمبەریش ڕاستە..

ئەوەتا عەممار کوژرا..

بەڵام کێ کوشتی..؟؟

ئەوانە کوشتیان کە لەماڵی خۆی هێنایانە دەر، لەگەڵ خۆیاندا بۆ شەڕ}..!!

لەم جۆرە هەڕاجەشدا دەتوانرێت هەموو بۆچوونێك بایەخی بۆ پەیدا بکرێت، بەم شێوەیە ئەو بۆچونەی موعاویە و عەمر ڕەواجی بۆ پەیدا بوو..

هەردوو کۆمەڵ دەستیان بەشەڕ کردەوە..

عبدالله ی کوڕی عەمریش بۆ مزگەوتەکەی و، پەرستشی گەڕایەوە.

* * *

ژیانی تەنها بە خەڵوەتگا و پەرستشەوە بەسەر برد..

بەڵام دەرچوونی بۆ (صفین)–تەنها دەرچوون–، هەمیشە سەرچاوەی دڵەڕاوکێی بوو.. هەر کە یادی دەکەوتەوە، دەگریا و دەیوت:

{من چیم بوو، لە صفین..؟؟

چیم بوو، لە کوشتاری موسڵمانان}..؟؟

* * *

ڕۆژێکیان، لەکاتێکدا کە لەگەڵ هەندێك لە هاوەڵانی لە مزگەوتی پێغەمبەر دانیشتبوو، حوسەینی کوڕی عەلیﷺ بەلایاندا تێپەڕی کرد و، سڵاویان لەیەکدی کرد..

کاتێ کە تێپەڕی کرد، عبدالله بەوانەی دەوروبەری خۆی وت:

{پێتان خۆشە کە خۆشەویسترین کەسی سەر زەویتان لای ئەهلی ئاسمان پێ بڵێم..؟

ئەو کەسەیە کە ئێستا بەلاماندا تێپەڕی.. حوسەینی کوڕی عەلی یە..

لەڕۆژی (صفین)ەوە نەیدواندوم..

ئەوم لێ ڕازی بێت لام خۆشەویستترە لە وشتری سوور}..!!

لەوێ لەماڵی حوسەین، ئەو دوو بەڕێزە بەیەك گەیشتن..

سەرەتا عبدالله ی کوڕی عەمر دەستی کرد بە قسەکردن و، باسی (صفین) کرا، حوسەین بە گلەییەوە لێی پرسی:

{چی وای لێ کردی لەگەڵ موعاویەدا بێیت بۆ شەڕکردن}..؟

عبدالله وتی: {ڕۆژێکیان عەمری کوڕی عاصی باوکم لای پێغەمبەری خوا ﷺ شکاتی لێ کردم و پێی وت:

(عبدالله ڕۆژانە هەمووی بەڕۆژووەو، بەشەویشدا هەمووی شەونوێژ دەکات..

جا پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی پێم:

((ئەی عبدالله، نوێژ بکە و بخەوە.. ڕۆژوو بگرە و بەربانگ بکەرەوە.. گوێڕایەڵی باوکت بە..

کاتێك کە ڕۆژانی صفین هات، باوکم سوێندی لێ خواردم کە لەگەڵیاندا بچم، منیش چووم..

بەڵام سوێند بەخوا نە شمشێرێکم وەشاندووە، نە ڕمێك..

نە تیریشم هاویشتووە..!!

لەکاتێکدا کە گەیشتبووە حەفتاودوو ساڵەی تەمەنی پیرۆزی..

لە وەختێکدا کە لە شوێنی نوێژکردنیدا بوو، ملکەچانە دەپاڕایەوە لە پەروەردگاری و، سوپاسگوزاری خوای دەکرد، بەرەو گەشتی هەمیشەیی بانگ کرا، ئەویش بە پەرۆشییەکی مەزنەوە بەدەم داوەکەوە ڕۆشت..

بەرەو لای ئەو برایانەی کە بەر لەخۆی بەچاکی گەڕابوونەوە، گیانی ئەمیش ڕۆیشت و لەشەقەی باڵیدا..

مژدەدەریش لەلای پەروەردگاری باڵادەستەوە بانگی دەکرد:

﴿يَاأَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ، ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً، فَادْخُلِي فِي عِبَادِي، وَادْخُلِي جَنَّتِي: تۆش ئەی گیانی دڵنیا، بە ڕەزامەندییەوە بگەڕێوە لای پەروەردگارت، هەرچۆن ئەوت لەخۆت ڕازی کرد، سا تۆش وەرە ناو بەندەکانی من و، وەرە ناو بەهەشتی من﴾الفجر/٢٧-٣٠.

## ٥٠

# ئەبو سوفیانی کوڕی حارس

## لەتاریکییەوە بەرەو ڕوناکی

ئەمە (ئەبوسوفیان)ێکی دیکەیە و، (ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب) نیە..

سەرگوزەشتەی ژیانیشی، چیرۆکی ڕێڕونی پاش سەرلێشێواو و.. خۆشەویستی دوای ڕق لێبوون و.. بەختەوەری دوای ناڕەحەتیە..

چیرۆکی بەزەیی فراوانی خوای گەورەیە کاتێ دەروازەکانی واڵا دەکات بۆ پەناهەندەیەك کە خۆی خستۆتە بەر دەستی خوا پاش ئەوەی کە ماندوبوون کەنەفتی کرد..!!

بیهێننە پێش چاوی خۆتان، (ئیبن حارس) بیست ساڵ لە دژایەتیکردنی بەردەوامی ئیسلامدا بەسەر برد..!! بیست ساڵ لەو ساتەوەی پێغەمبەری خوا نێردرا، هەتا نزیك بوونەوەی فەتحی گەورە، (ئەبوسوفیانی کوڕی حارس) یارمەتی قورەیش و هاوپەیمانەکانی دەدا و، بە شیعرەکانی هەجوی پێغەمبەری دەکرد، لەهیچ کۆمەڵێك دوانەدەکەوت کە قورەیشیەکان بۆ شەڕکردن ئامادەیان بکردایە..!!

هەرسێ براکەیشی، (نەوفل) و، (ڕەبیعە) و، (عبداللە)، بەر لە خۆی موسڵمان بووبوون..

ئەم (ئەبوسوفیان)ـەش، ئامۆزای پێغەمبەری خوابووﷺ و، کوڕی (حارسی کوڕی عبدالمطلب) بوو.. هەروەها برای شیری پێغەمبەرﷺ بوو، چونکە (حەلیمە سەعدییە)ی دایەنی پێغەمبەر چەند ڕۆژێك شیری پێی داوە..

ڕۆژێکیان قەدەر بۆ ئایندەی بەختەوەری بانگی کرد و، ئەویش (جەعفەر)ی کوڕی بانگ کرد و، بە خاووخێزانەکەی وت: ئێمە سەفەر دەکەین..

– بۆ کوێ ئەی ئیبن حارس..؟؟

– بۆ لای پێغەمبەری خوا، تا لەگەڵیدا بڕوا بهێنین بەخودای پەروەردگاری جیهانیان..

بەسواری وڵاخەکەیەوە کەوتە ڕێ و، تەوبەکارانە دەیبڕی..

لەلای (ئەبواء) سەرەتای سوپایەکی بێشوماری بەدیکرد و، تێگەیشت کە پێغەمبەرە و دەیەوێت شاری مەککە ڕزگار بکا..

بیری کردەوە.. چی بکات..؟؟

پێغەمبەر خوێنی ئەوی بەهۆی زمان درێژی و جەنگ کردنی زۆری لە دژی ئیسلام حەڵاڵ کردووە..

هەر بۆیە هەرکەس لە سوپاکەیان ئەم ببینێت، بەپەلە دێت بۆ تۆڵە لێ سەندنەوەی..

لەسەری پێویستە کە فێڵێك بدۆزێتەوە تا خۆی یەکەمجار دەگەیەنێتە بەردەم پێغەمبەری خوا، بەر لەوەی کە یەکێك لە موسڵمانەکانی بەدی بکات..

ئەمجا (ئەبوسوفیانی کوڕی حارس) دەم و چاوی خۆی پێچایەوە بەجۆرێ کە نەدەناسرایەوە، دەستی جەعفەری کوڕی گرت و، بەپێ زۆر ڕۆیشت، تا پێغەمبەری خوای بینی لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوەڵانیدا دەهات، خۆی پەنادا هەتا سوارەکان دابەزین..

جا لەناکاودا خۆی خستە بەردەم پێغەمبەر و دەمامکەکەی سەر ڕوخساری لادا و پێغەمبەر ناسیەوە، ناوچاوی لێ وەرگێڕا، ئەبوسوفیان لەلایەکی دیکەوە هاتەوە، پێغەمبەرﷺ خۆی لێ لادا..

ئەمجا (ئەبوسوفیان) و (جەعفەر)ی کوڕی هاواریان کرد:

(نشهد أن لا اله الا الله نشهد أن محمداً رسول الله)..

لەپێغەمبەرﷺ نزیك بوویەوەو وتی:

{ئەی پێغەمبەری خوا! سەرزەنشت نەما}..

پێغەمبەریش وەڵامی دایەوە:

{سەرزەنشت نیە ئەی ئەبوسوفیان}..

پاشان دایە دەست عەلی کوڕی ئەبوتالب و پێی فەرموو:

((ئامۆزاکەت فێری دەستنوێژگرتن و سوننەت بکە و بیهێنەرەوە بۆ لام))..

(عەلی)ش بردی و پاشان گەڕایەوە، پێغەمبەر پێی فەرموو:

((بانگ بکە لەو خەڵکە کە پێغەمبەری خوا لە ئەبوسوفیان ڕازی بووە، ئێوەش لێی ڕازی بن))..

چرکەساتێکی ژین، خوای گەورە پێی دەفەرموێت: پیرۆزبیە و، چەندین قۆناغ و مەودای سەختی و سەر لێشێواوی دەپێچێتەوە و، دەروازە بێ سنوورەکانی بەزەیی بۆی واڵا دەبێت..!!

* * *

ئەبوسوفیان پێش ئەوەی موسڵمان ببێت، کاتێك کە لەگەڵ قورەیشیەکاندا بوو لە بەدردا و دەجەنگا، شتێکی بەدی کرد کە بووە مایەی سەرسام بوونی..

جا لەو جەنگەدا (ئەبولەهەب) دواکەوت و لەجێی خۆی (عاصی کوڕی هیشام)ی نارد..

بەوپەڕی ئارامیەوە (ئەبولەهەب) چاوەڕێی هەواڵی شەڕەکەی دەکرد، وردەوردە هەواڵی شکستی خراپی قورەیشی بۆ هات..

ڕۆژێکیان، لەکاتێکدا (ئەبولەهەب) لەگەڵ پیاوێکی قورەیشیدا لای (زەمزەم) دانیشتبوو، سوارێکی بەدی کرد بەرەو لای ئەمان دەهات، کە نزیك بوویەوە بینی (ئەبوسوفیانی کوڕی حارس)ە.. جا (ئەبولەهەب) لێی نەگەڕا و، خێرا بانگی کرد: وەرە برازا، بەخوا هەواڵێکت پێیە.. بۆمان باس بکە دەنگ و باسی ئەو خەڵکە چۆن بوو..؟!

ئەبوسوفیانی کوڕی حارس وتی:

{سوێند بەخوا، هەر ئەوەیە کە ئێمە شانی خۆمان خستە بەردەستیان، چۆنیان ویست دەیانکوشتین و، دیلیان کردین بەپێی ئارەزووی خۆیان..

سوێند بەخوا سەرزەنشتی قورەیشم نەکردووە.. چونکە پیاوانێکی سپیمان رویەڕوویوویەوە بەسەر ولاخی بازووەوە، لەنێوان ئاسمان و زەویدا، هیچ ساتێك وەك ئەوان نەبوو و، هیچ شتێکیش لەبەردەمیاندا خۆی ڕانەدەگرت}..!!

ئەبوسوفیان مەبەستی لەوە ئەوەبوو کە مەلائیکەت لەگەڵ پێغەمبەر و موسڵمانەکاندا دژ بەمان شەڕیان کردووە..

جا دەبێ چی وای لێ کردبێت لەو ڕۆژەدا پاش ئەوەی کە بینی موسڵمان نەبێت..؟؟

گومان ڕێگەی دڵنیابوونە و، ئەوەندەی گومانەکانی ئەبوسوفیان گیر و بەتین بوو، ئەوا دڵنیابوونەکەی کە هات پتەو و بەهێزتر دەبێت..

بەڵێ ڕۆژی دڵنیابوون و ڕێڕوونی هات و، هەروەك بینیمان موسڵمان بوو، باوەڕی هێنا بەخودای پەروەردگاری جیهانیان..

* * *

لە یەکەمین چرکەساتی موسڵمان بوونیشیەوە، خواپەرست و، موجاهیدانە لەگەڵ کاتدا پێشبڕکێی بوو، تا شوێنەواری پێشووی بسڕێتەوەو، قەرەبووی کاتی لەدەست چووی بکاتەوە..

لەگەڵ پێغەمبەردا پاش فەتحی مەککە بەشداری جەنگەکانی دیکەی کرد..

لەڕۆژی (حونەین)یشدا، کاتێك کە بێباوەڕەکان بۆسەیەکی ترسناکیان بۆ موسڵمانەکان نایەوە و، لەناکاودا دەورەیان گرتن بەجۆرێك کە هەستیان نەدەکرد هەڵمەتێکی لەناوبەریان بۆ دێت، موسڵمانەکان هۆشیان لەلای خۆیان نەما و، زۆربەی جەنگاوەرەکانی پشتیان هەڵکرد، پێغەمبەر لە جێگای خۆیدا جێگیر بوو، بانگی لێدەکردن:

{بەرەو لای من بێن خەڵکینە..

من پێغەمبەرم و درۆ ناکەم..

من کوڕی عبدالمطلب-م..}..

ئا لەو چرکەساتە سامناکانەدا، کەسانێکی کەم هەبوون بەهۆی ئەو هێرشە لەناکاوەوە هۆشی خۆیان لەدەست نەدابێ..

(ئەبوسوفیانی کوڕی حارس) و (جەعفەر)ی کوڕی لە نێویاندا بوون..

(ئەبوسوفیان)یش ڕەشۆی ولاخەکەی پێغەمبەری گرتبوو، کاتێ ئەوەی ڕوویدەدا بینی، زانی کە ئەو دەرفەتەی بۆی دەگەڕا ڕەخساوە.. بەوەی کە ئاواتی خۆی بەدی بێنێ و لەپێناوی خوای گەورەدا و، لەبەردەم پێغەمبەری خوادا شەهید بێت..

بەدەستی چەپ جڵەوی وڵاخەکەی گرتبوو، بە دەستی راستیشی شمشێری دەکرد بە سینگی بێباوەڕەکاندا..

جا موسڵمانەکان گەڕانەوە بۆ شوێنی شەڕەکەو دەورویەری پێغەمبەر و، خوای گەورەش سەرکەوتنی تەواوی کردە بەشیان..

کاتێ تەپ و تۆزی شەڕەکە لاچوو.. پێغەمبەر تەماشای کرد بینی بیوادارێك رەشۆی ئەسپەکەی گرتووە..

هەر ئەوە، هێشتا لە شوێنی خۆیدایە، لەسەرەتای شەڕەکەوە تا کۆتایی، جا پێغەمبەر لێی راما و پاشان فەرمووی:

{ئەوە کێیە..؟!

ئەبوسوفیانی کوڕی حارسی برامە..؟؟}

هەرکە ئەبوسوفیان گوێی لە وتەکەی پێغەمبەری بوو کە فەرمووی (برام)..

لەخۆشی و رێزدا دڵی لە شەقەی باڵی داو، خۆیدا بەسەر هەردوو قاچی پێغەمبەری خوادا و ماچی کرد و، بە فرمێسکەکانی دەیشۆرد..

هەستی شاعیرێتیشی لەخۆشی ئەو نیعمەتی ئازایەتی سەرخستنەی خوای گەورە پێی بەخشی بزوا:

| | |
|---|---|
| لَقَد عَلِمَتْ أفنــاءُ كعـب وعامـر | غَداةَ حُنَيْنٍ حِينَ عَمَّ التَّضَعْضُعُ |
| بأني أخو الهَيجاء، أركَبُ حَدَّها | أمــام رَسُــولُ الله لا أتـتَعْتَـعُ |
| رَجـاءَ ثَـوابِ الله، واللهُ راحمٌ | إليه –تَعالى– كُلُّ أمرٍ سَيَرجِعُ |

* * *

ئیدی ئەبوسوفیان بەشێوەیەکی مەزن سەری کردە پەرستش و، لەپاش وەفاتی پێغەمبەریش، گیانی پەیوەست بوو بە مردنەوە تا لەماڵی ئاخیرەتدا بگاتەوە بە پێغەمبەری خوا.. ئەوەندەی گوزەراندی و ژیا وە مردن ئاواتی ژیانی بوو..

رۆژێکیان خەڵکی بینیان لە بەقیع گۆڕ هەڵدەکەنێت و، رێك و ئامادەی دەکات، کاتێ کە سەرسامی خۆیان دەربڕی بەرانبەر ئەوەی دەیکات، پێی وتن:

{من گۆڕی خۆم ئامادە دەکەم}..

لە پاش سێ رۆژ و بەس، لەکاتێکدا لەماڵی خۆی راکشابوو، خاووخێزانی لە دەوری بوون و دەگریان، چاوەکانی بە دڵنیاییەکی بەتینەوە کردەوەو رووی تێکردن و پێی وتن:

((مەگرین بۆ من، چونکە لەوساتەوەی موسڵمان بووم هیچ گوناهێکم نەکردووە))..!!

بەرلەوەی سەری بچەمێتەوە بۆ سەر سینگی، بەرەو سەرەوە بەرزی کردەوە، تا سڵاوی ماڵئاوایی لەدونیا بکات..!!

٥١

عیمرانی کوڕی حوصەین

هاوسێوەی مەلائیکەتەکان

لەساڵی خەیبەردا، هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خواﷺ و پەیمانی پێدا..

جا لەو ساتەوەی دەستی راستی خستە نێو دەستی راستی پێغەمبەرەوە، دەستی راستی جێگەی رێزێکی زۆر بوو، لەسەرخۆی پێویست کرد کە ئەو دەستەی تەنها لە هەموو ئیشێکی چاك و بەرێزدا بەکاری بهێنێت..

ئەم دیاردەیە دەیخاتە روو کە خاوەنەکەی چەندە خاوەنی هەستێکی وردە..

* * *

(عیمرانی کوڕی حوصەین)یش وێنەیەکی بەرجەستەبووی وێنەکانی راستگۆیی و، دونیانەویستی و، پارێزکاری و، توانەوە بوو لە خۆشەویستی و گوێڕایەڵی خوادا..

لەسەرخستن و نیعمەتی رێنوێنی خوای گەورەش زۆری پێ بەخشرابوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەمیشە دەگریا و، دەگریا و، دەیوت:

{بریا خۆڵێ بوومایە و، رەشەبا بڵاوەی پێ بکردایە}..!!

لەبەر ئەوە ئەم پیاوانە بە هۆی گوناه کردنیان لە خوا نەدەترسان، چونکە دوای موسڵمان بوونیان بە کەمی گوناهیان کردووە.

ئەمەش لەبەر ئەوەی هێندەی پەی بردنیان بە مەزنی و پایەبڵندی خوا، هێندەی تێگەیشتنیان لە دەستەوسانیان لە شوکرانەبژێری و پەرستشی، هەرچەندی مل کەچ بکەن و، بچنە رکوع و، چەند کڕنوش ببەن و بیپەرستن، لێی دەترسان و سڵیان دەکردەوە لێی..

رۆژێکیان هاوەڵانی پێغەمبەر پرسیاری ئاگریان لە پێغەمبەری خوا کردﷺ و، وتیان:

((ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوە بۆ کاتێ کە لە خزمەت تۆداین ئێمە دڵمان نەرم دەبێت و، دونیامان لەبەرچاو دەکەوێت، وەك ئەوەی قیامەت بەچاوی خۆمان ببینین.. هەتا ئەو کاتەی لای تۆ بەجێ دەهێڵین و، دەگەینەوە لای ماڵ و منداڵ و، دونیامان، خۆمانمان لەیاد دەچێت..؟؟))

پێغەمبەریشﷺ پێی فەرموون:

((سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، گەر بەردەوام بوونایە لەسەر ئەو حاڵەی کە لە لای منن، ئەوا مەلائیکەتەکان بە بەرچاوتانەوە تەوقەیان لەگەڵدا دەکردن، بەڵام کاتە و.. کاتە..))..

(عیمرانی کوڕی حوصەین)یش ئەم فەرمودەیەی بیست و، حەز و ئارەزووی بڵێسەی دا، وەك ئەوەی لەسەر خۆی دانابێت کە دانەنیشێت تا بەو ئامانجە بڵندە نەگات، گەر ژیانیشی

لەپێناودا بەخشیبێت، هەروەك ئەوەی هیممەتەكەی بەوە رازی نەبووبێت كە ژیانی.. كاتە و.. كات بگوزەرێنێ.. ویستی كە هەمووی یەك ساتی بەردەوامی پڕ موناجات و، روو لەخودای پەروەردگاری جیهانیان بێت..!!

* * *

لە سەردەمی خەلافەتی (عومەری كوڕی خەتتاب)دا ئەمیری بڕواداران عومەر ناردی بۆ بەصرە تا خەڵكەكەی شارەزا و فێر بكات.. كاتێ لە بەصرە كۆڵ و باری كردەوە، هەركە خەڵكی بەصرە ناسیان بۆ موبارەكی دەچوونە لای و، بە تەقواكەی دڵگەش دەبوون..

شێخ حەسەنی بەصری و ئیبن سیرین دەڵێن:

((هیچ هاوڵێكی پێغەمبەری خواﷺ نەهاتۆتە بەصرە لە عیمرانی كوڕی حوصەین پایەدارتر بێت..))

عیمران رازی نەبوو بەهیچ شتێك كە لە خواپەرستی دایببڕێت و، لە پەرستشدا رۆچوو بوو، خواپەرستی بەجۆرێ لەخۆی گرتبوو تا وای لێهاتبوو وەك ئەوەی كە سەر بە جیهانی دونیا نەبێت كە لەسەر زەویەكەی و لەنێو خەڵكەكەیدا دەژی..

بەڵێ..

وەك مەلائیكەیەكی لێهاتبوو كە لەنێو مەلائیكـەتـەكـانـدا بژی، دەیـانـدوێنێت و دەیدوێنن و، تەوقەیان لەگەڵدا دەكات و تەوقەی لەگەڵدا دەكەن..

* * *

ئەو ساتەیشی ململانێی گەورە لەنێوان موسڵمانانندا بەرپابوو.. عیمرانی كوڕی حوصەین تەنا هەڵوێستێكی بێلایەنانە نەوەستا لەنێوان دەستەی ئیمامی عەلی و دەستەی موعاویەدا، بەڵكو لەنێو خەڵكیدا دەنگی بەرزكردبووەوە و هاواری لێدەكردن كە واز بهێنن لە بەشداریكردنی ئەو جەنگەدا و، بەچاكترین شێوە باوەش بە ئاشتیدا بكەن و.. بە خەڵكی دەوت:

((لەسەر لوتكەی شاخێك بژنی ئاوس بەخێو بكەم تا كاتی مردن لام خۆشترە لەوەی كە لە دژی یەكێك لەو دوو كۆمەڵەدا، تیرێك بهاوێژم، ئیدی بیپێكم یان نەیپێكم))..

هەر موسڵمانێكیشی پێ بگەیشتایە ئامۆژگاری دەكرد و دەیوت:

((لە مزگەوتدا بمێنەرەوە..

گەر هاتنە سەرت، بڕۆوە ماڵی خۆت..

گەر لە ماڵەكەشتدا هاتنە سەرت، خۆت و سامانەكەتیان ویست، لەگەڵیاندا بجەنگە))..

* * *

ئیمانی (عیمرانی کوڕی حوصەین) مەزنترین سەرکەوتنی بەدەستهێنا، کاتێك کە نەخۆشیەکی سەختی تووش بوو سی ساڵ پێوەی تلاوە، نە لێی بێزار بوو، نە وتیشی ئۆف.

بەڵکو بەردەوام بوو لەسەر پەرستشەکانی بەپێوەو، بەدانیشتن و، راکشانەوە..

هەرکاتێك دۆست و برایانی بهاتنایە سەردانی نەخۆشیەکەیان لا ئاسان بکردایە و دڵنەواییان بکردایە، بەدەمیانەوە پێدەکەنی و، دەیوت:

((خۆشەویست ترین شت لای من، خۆشەویست ترین شتی لای خوایە))..!!

راسپاردەیشی بۆ خاووخێزان و برایانی لەسەرەمەرگدا ئەوەبوو:

((هەر کە لە ناشتنم گەڕانەوە، حەیوان سەربڕن و ببیەخشنەوە))..

* * *

بەڵێ.. با سەرببڕن و.. ببەخشنەوە.. چونکە مردنی بڕواداری وەك عیمرانی کوڕی حوصەین، مردن نیە.. بەڵکو زەماوەندێکی مەزن و بەرزە، کە تێیدا گیانی بە ڕازیبوویی بەرەو بەهەشتێك بەرز دەکرێتەوە کە پانتاییەکەی هێندەی ئاسمانەکان و زەوی دەبێت و بۆ تەقواداران ئامادەکراوە..

٥٢

# سەلەمەی کوڕی ئەکوەع

## پاڵەوانی پیادەکان

(ئیاس)ی کوڕی ویستی کە تێکڕای چاکەکانی باوکی لە دەستەواژەیەکدا کۆبکاتەوە.

هەر بۆیە وتی:

((باوکم هەرگیز درۆی نەکردووە))..!!

بۆ مرۆڤ هێندە بەسە کە ئەم چاکەیە بەدەست بهێنێت، تا جێگەی بڵندی خۆی لە نێو پیاوچاکان و چاکەکاراندا بگرێت.

بەڕاستیش (سەلەمەی کوڕی ئەکوەع) شایستەی بوو و، بەدەستی هێنا.

(سەلەمە) لە تیرهاوێژە باشەکانی عەرەب بوو و، لە ئازایەتی و بەخشندەیی و چاکەمەندیشدا لە کەسایەتیە دیارەکان بوو.

ئەو کاتەیشی خۆی دایە دەستی ئیسلام، بەڕاستی و ڕوونی موسڵمان بوو و، ئیسلام لەسەر شێوازە مەزنەکەی ڕاضاویدا.

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع لە بەشداریوانی بەیعەی ریضوان بوو.

* * *

کاتێك کە پێغەمبەر و هاوەڵانی لەساڵی شەشی کۆچیدا بە مەبەستی سەردانی ماڵی خودا(کەعبە) کەوتنە ڕێ و، قورەیشیەکان بەرەو ڕوویان بوونەوە.

پێغەمبەر، (عوسمانی کوڕی عەففان)ی نارد بۆ لایان تا هەواڵیان بداتێ کە پێغەمبەر بۆ سەردان هاتووە، نەك جەنگ..

لە چاوەڕوانی گەڕانەوەی (عوسمان)دا، ئەوە بڵاوبوویەوە کە گوایە قورەیشیەکان کوشتویانە، پێغەمبەریشﷺ لە سێبەری دارێکدا دانیشت و پەیمانی لە هاوەڵانی یەك بە یەك وەرگرت لەسەر مردن.

(سەلەمە) دەڵێت:

((لەژێر درەختەکەدا پەیمانم لەسەر مردن دا بە پێغەمبەری خواﷺ، پاشان چووم، کاتێ قەرەباڵغی خەڵکەکە سووك بوو، فەرمووی: ئەی سەلەمە، چیتە بۆ پەیمان نادەیت، وتم: پێشتر پەیمانم دا ئەی پێغەمبەری خوا.. فەرمووی: هەروەها ئێستاش.. منیش پەیمانم پێدایەوە)).

بە چاکترین شێوەش ئەمەکدار بوو بەرامبەر پەیمانەکەی.

بگرە بەر لەوەیش پەیمان بدات ئەمەکدار بوو بەرامبەری، لەوساتەوەی کە شاهیدی دا (أن لا اله الا الله، وأن محمداً رسول الله)..

دەڵێت:

((لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەشداری حەوت جەنگم کردووە، لەگەڵ (زەیدی کوڕی هاریسە)شدا بەشداری نۆ جەنگم کردووە)).

* * *

سەلەمە لە لێزانترینی ئەو جەنگاوەرە پیادانە بوو کە تیر و ڕمیان دەهاویشت.

شێوازی شەڕکردنیشی هاوشێوەی هەندێ لە شەڕی پارتیزانییە گەورەکان دەکرد کە ئەمڕۆ پەیڕەو دەکرێت.. بەجۆرێ هەر کە دوژمن شاڵاوی بهێنایەتە سەر، لەسەر نوکی پێ دەگەڕایەوە دواوە، هەرکە دوژمن پشتی هەڵبکردبایە یان بوەستایە بۆ حەوانەوە، بێسڵکردن هێرشی دەبردنە سەر..!

بەم شێوازە توانی کە بە تەنها ئەو هێزە ڕاوبنێت کە هێرشی هێنابووە دەوروبەری مەدینە بە سەرۆکایەتی (عویەینەی کوڕی حیصنی فراری) لەو جەنگەی کە بە جەنگی (ذي قرد) ناسرابوو..

ئەوەبوو بەتەنها کەوتە شوێنیان و، بەردەوام لەدژیان دەجەنگا و ئەملاو ئەولای پێ دەکردن و، دووری دەخستنەوە لە شاری مەدینە تا پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هێزێکی تری هاوەڵاندا پێی گەیشت..

لەم ڕۆژەدا پێغەمبەر بە هاوەڵانی فەرموو:

((چاکترین پیاوتان-ئەوانەی بەپێ دەڕۆن- (سەلەمەی کوڕی ئەکوەع)ە))!!

* * *

سەلەمە تەنها لەکاتی تیاچوونی (عامری کوڕی ئەکوەع)ی برای لەشەڕی خەیبەردا خەمبار و نارەحەت بوو..

لەکاتێکدا عامر لە پێشەوەی سوپای موسڵمانەکان ئەم شیعرەی بەدەنگی بەرز دەوتەوە:

| | |
|---|---|
| اللهم لولا أنت ما أهتدينا | ولا تصدقنا، ولا صلينا |
| فانـزلن ســكينة علينـا | وثبت الأقدام إ لاقينـا |

لەو جەنگەدا عامر بە شمشێر کەوتبوە لێدانی بێباوەڕێك، تا شیرەکەی لەدەستی وەرگەڕا و دای بەنێوچاوانی خۆیدا و بووە هۆی کوشتنی و.. هەندێ لە موسڵمانەکان وتیان:

((بەستەزمانە عامر.. لە شەهیدیش بێبەش بوو)).

هەر لەو ساتەدا-بەس- سەلەمە زۆر پەشۆکا، کاتێ ئەویش وەك ئەو خەڵکەی دیکە وای گومان برد کە براکەی بەهەڵە خۆی کوشتووە، لە پاداشتی جیهادکردن و، پلەی شەهیدی بێبەش بووە.

بەڵام پێغەمبەرى دڵسۆز، زۆر زوو شتەکانى هێنایەوە جێى گونجاوى خۆى، کاتێ کە سەلەمە چوویە خزمەتى و لێى پرسى:

– ئەرێ ڕاستە، ئەى پێغەمبەرى خوا، کە عامر کردەوەکانى پوچەڵ بۆتەوە..؟

پێغەمبەرﷺ پێى فەرموو:

((ئەو بەموجاهیدى کوژرا و

دوو پاداشتى بۆ هەیە و..

ئەو ئێستا لە ڕوبارەکانى بەهەشتدا

مەلە دەکات))..!!

سەلەمە سەرەڕاى ئەو بەخشندەییە زۆرەى کە هەیبوو زیاتر دەیبەخشى گەر لە پێناوى خوادا داواى لێ بکرایە..

هەربۆیە گەر مرۆڤێك لەبەر خوا داواى ژیانى لێ بکردایە بێ دوودڵى دەیبەخشى.

خەڵکیش بەڕاستى ئاشناى ئەو خەسڵەتەى بووبوون، گەر یەکێکیان بیویستایە شتێکى لێ وەربگرێت، پێى دەوت: لەڕێى خوا پێم بدە.. ئەویش دەیوت:

((هەرکەس لەڕێێ خوادا نەبەخشێت.. دەبێ لەپێناوى چیدا بیبەخشێت))..؟؟

* * *

ئەو ڕۆژەیش عوسمان کوژرا، ئەم موجاهیدە بوێرە تێگەیشت کە دەروازەکانى ئاشووب بەڕووى موسڵماناندا والا بووە..

پێى نەدەکرا لەکاتێکدا کە تەمەنى لە شەڕکردن لەنێو هاوەڵانیدا بەسەربردووە بیگۆڕێت بۆ شەڕکردن لەدژى هاوەڵانى..!

بەڵێ.. ئەو پیاوەى کە پێغەمبەر دەستخۆشى لێهاتووییەکەى کرد لە شەڕکردن دژ بە بێباوەڕەکان ئەو مافەى نیە کە بەو لێهاتووییەى لەدژى براوادارێك بجەنگێت، یان برایەکى موسڵمانى بکوژێت..

ئەوەبوو دواتر، شتومەکەکانى هەڵگرت و شارى مەدینەى بەرەو (ڕەبەزە) بەجێهێشت، هەمان شوێنى کە (ئەبوزەر) پێشتر هەڵیبژارد و کۆچى کرد بۆى و تێیدا مرد.

سەلەمەش پاشماوەى ژیانى لە (ڕەبەزە) بەسەر برد، هەتا ساڵى حەفتاو چوارى کۆچى، ڕۆژێکیان پەرۆشى بینینى شارى مەدینە بوو، هەر بۆیە بەسەردان گەڕایەوە بۆى و.. ڕۆژى یەکەم و، دووەمى تێدا بەسەر برد..

لە ڕۆژى سێیەمدا مرد.

بەمجۆرە گڵکۆ ئازیزە چاکەکەى بانگى کرد تا لە سایەى باڵەکانیدا خۆى بگرێت و لەگەڵ ئەو هاوەڵە پیرۆزانە و، شەهیدانى چاکەکاردا پەناى بدات کە پێشتر پەناى دابوون.

## ٥٣

# عبداللەی کوڕی زوبەیر

## چ پیاوێک .. چ شەهیدێک ؟!

کۆرپەلەیەکی پیرۆز بوو لە سکی دایکیدا، لەکاتێکدا بیابانی بڵێسەداری مەککەی بەرەو مەدینە دەبڕی لەسەر ڕێی هیجرەتی مەزن.

بەمجۆرە قەدەر وابوو کە عبدالله ی کوڕی زوبەیر لەگەڵ موهاجیراندا کۆچ بکات بەر لەوەی کە بێتە دونیا و، ڕەحمی بۆ لەت نەکرابوو..!!

هەر کە ئەسمای دایکی-خوای لێ ڕازیبێت- گەیشتە (قەبا)ی دەوروبەری مەدینە، ژان گرتی و کۆرپەلە موهاجیرەکەش لە هەمان کاتدا کە موهاجیرانی هاوەڵانی پێغەمبەری دادەبەزین ئەویش دابەزی..!!

جا یەکەمین لەدایکبووی هیجرەت هەڵگیرا و برایە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ لەماڵەکەی لەشاری مەدینە و ئەویش ماچی کرد و دەنکێ خورمای خستە دەمی خۆی جووی و لە دەمی وەردا، بەمجۆرە یەکەمین شت کە چووە نێو هەناوی عبدالله ی کوڕی زوبەیر لیکی دەمی پێغەمبەری ئازیز بوو.

موسڵمانانیش لەشاری مەدینە کۆبوونەوەو، ساواکەیان لە لانکەکەیدا هەڵگرت و، پاشان بەدەم (لا اله الا الله) و (الله اكبر)ەوە بەتێکڕای شەقامەکانی مەدینەیاندا گێڕا.

ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە جولەکەکان ئەو کاتەی پێغەمبەر و هاوەڵانی هاتنە مەدینە دەمکوت کران و ڕق و کینیان بڵێسەی دا، دەستیان دایە جەنگی دەروونی بەرامبەر موسڵمانەکان و، ئەو پڕوپاگەندەیان بڵاوکردەوە کە کاهینەکانیان جادوویان لە موسڵمانەکان کردووەو نەزۆکیان کردوون و، هەرگیز شاری مەدینە لەدایکبوونی نوێیان بەخۆوە نابینێت.

ئەو کاتەیشی عبدالله ی کوڕی زوبەیر لەجیهانی پەنهانەوە هاتە نێویان، بەڵگەنامەیەك بوو قەدەر بوختانەکەی جولەکەکانی مەدینەی پێ مۆرکرد و فێڵ و تەڵەکە و هەڵبەستراوەکانیانی پوچەڵ کردەوە..!!

عبدالله لە سەردەمی پێغەمبەری خواداﷺ نەگەیشتە ئاستی پیاوان لە تەمەندا، بەڵام لەو سەردەمە و، لە خودی پێغەمبەری خوا بەهۆی ئەو پەیوەندیە بەتینەی کە هەیبوو لەگەڵیدا، هەموو کەرەستە خاوەکانی پیاوەتی و بنەماکانی ژیانی وەرگرت کە دواتر دەیبینین دونیا پڕ دەکات و دەبێتە جێی قسەکردنی خەڵکی..

جا ئەم منداڵە بە خێرایی گەشەی کرد و، لە زیندەگی و، زیرەکی و خۆڕاگریدا بێ وێنەبوو..

گەیــشتە تەمـــەنی لاوی و، گەنجێتیەکەیــشی بێگـــەردی و، پــاکی و، خواپەرســتی و، پاڵەوانێتیەك بوو لە سەرووی خەیاڵەوە.

ڕۆژگار و قەدەرەکانی لەگەڵیدا گوزەشت و، ژیانی وەك خۆی مایەوەو نەگۆڕا و، ویستەکانی ملیان پێکەچ نەکرد..

بەڵکو ئەو پیاوێك بوو ڕێگای خۆی دەناسی و، بە جەسوریەکی گەورەو، بڕوایەکی بەتین و سەرسوڕهێنەرەوە بڕی..

* * *

لە ڕزگارکردنی ئەفریقیا و ئەندەلوس و قوستەنتینیە-کەهێشتا تەمەنی بیست و حەوتساڵی تێنەپەڕاندبوو- پاڵەوانێك بوو لە پاڵەوانانی رزگارکردنە نەمرەکان.

بەتایبەتیش لە جەنگی ئەفریقیادا موسڵمانەکان بە سوپایەکی بیست هەزار سەربازیەوە بەرامبەر سوپایەك وەستان کە ژمارەی جەنگاوەرانی سەد و بیست هەزار کەس بوو..

جەنگ بەرپا بوو، مەترسیەکی مەزن باڵی بەسەر موسڵمانەکاندا کێشا..

جا عبداللە ی کوڕی زوبەیر تەماشایەکی هێزی دوژمنی کرد و چاوگەی هێز و توانایانی دەرك پێکرد، ئەو چاوگەیەش تەنها پادشای (بەریەر) و سەرکردەی سوپاکە بوو، بەجۆرێك هاواری لە سەربازەکانی دەکرد و هانی دەدان کە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بەرەو مردن پاڵی پێوەدەنان..

عبداللە تێگەیشت کە ئەم جەنگە خوێناویە تەنها بە کوشتنی ئەو سەرکردەیە یەکلا دەبێتەوە، بەڵام چۆن پێی بگات، لەکاتێکدا سوپایەکی بێشوماری لەپێشەوەیە و، کە وەك گەردەلول دەجەنگێت..؟؟

بەڵێ بەجەرگی عبداللە ی کوڕی زوبەیر و گیان لەسەردەستیەکەی هەرگیز جێگەی پرسیار نەبوو..!!

ئالێرەدا هەندێ لە براکانی بانگ کرد و، پێی وتن:

((لەپشتەوەم پارێزگاریم بکەن و، لەگەڵمدا هێرش ببەن.))...

ئەمجا ریزە چڕەکەیانی وەك تیر خێراگرانە بەرەو لای سەرکردەکەیان بڕی، هەتا پێی گەیشت و بە یەك لێدان لەناوی برد، پاشان بەو جەنگاوەرانەوە کە لەگەڵیدابوون ڕووی کردە ئەو سەربازانەی کە دەورەی پادشا و سەرکردەکەیانیان دابوو دەستیان کرد بە لەناوبردنیان و... پاشان هاواریان کرد: اللە اکبر..

موسڵمانەکان بینیان ئاڵاکەیان لەوێدا بەرز دەبێتەوە کە سەرکردەی (بەریەر) تێدا وەستابوو فەرمانەکانی دەردەکرد و سەربازەکانی هەڵدەنا.. تێگەیشتن کە ئەمە سەرکەوتنە و،

وەك تاکە کەسێك خۆیان توندوتۆڵ کرد و، هەموو شتێك لە بەرژەوەندی موسڵمانەکان کۆتایی پێ هات..

(عبداللهی کوڕی ئەبی سەرح)ی سەرکردەی سوپای موسڵمانەکانیش بەو ڕۆڵە گەورەیەی ئیبن زوبەیری زانی، دەستخۆشانە و دیاریشی بۆی ئەوەبوو کە خۆی مژدەی ئەو سەرکەوتنە بباتەوە بۆ شاری مەدینە و، عوسمانی کوڕی عەففانی خەلیفەی موسڵمانان.

* * *

سەرەرای پاڵەوانێتی لە جەنگدا و، باڵادەستی و بەتوانایی تێیدا کەچی لەبەردەم پاڵەوانێتی لە پەرستشدا خۆی دەشاردەوە..

ئەوەی دەکرێت ببێتە هۆی گەشانەوە و، لاربوونەوەی دەستەکان زیاد لە هۆیەکە و، بەشوێنی هەمیشەیی و بڵندی لەنێوی خواپەرستە دونیانەویستەکاندا سەرسامیمان دەکات.

نە ڕەچەڵەك و، نە لاوێتی و، نە شوێن و بڵندی و، نە سامان و، هێزی.. هیچ یەك لەوانە هەموو، نەیتوانی عبدالله ی کوڕی زوبەیر دابڕێت لەوەی کە ئەو خواپەرستە بێت کە بەڕۆژدا بەڕۆژووە و، شەو هەڵدەستێت بۆ شەونوێژ و، بەشێوەیەی سەرسوڕهێنەر ملکەچی خوا بێت..

(عومەری کوڕی عبدالعزیز) ڕۆژێکیان بە (ئیبن ئەبی مولەیکە)ی وت: دەربارەی عبداللهی کوڕی زوبەیر بۆمان بدوێ.. ئەویش وتی:

{سوێند بەخوا، هیچ کەسم نەدیوە وەك ئەو کە لەنێوان دوو لادا ڕۆشتبێت.. کە دەچوویە ناو نوێژەوە، لە هەموو شتێك دەردەچوو بۆی..

کە دەچوویشە ڕکوع یان کڕنووشەوە، چۆلەکە لەسەر پشت و شانی رادەوەستان، بەهۆی درێژخایاندنی ڕکوع و کڕنوشەکەیەوە بە دیوار، یاخود کاڵایەکی هەڵواسراویان دەزانی..

جارێکیان لەکاتی نوێژدا بەردێکی ئاگرینی مەنجەنیق بەنێوان سنگ و ڕیشیدا تێپەڕی، سوێند بەخوا نە هەستی پێکرد، نە وروژا پێی، نە بەهۆیەوە لە خوێندنەوەکەی دابڕا، نە پەلەی کرد لە ڕکوعەکەیدا}..!!

ئەو هەواڵە ڕاست و دروستانەی کە مێژوو لەبارەی پەرستشی عبدالله ی کوڕی زوبەیرەوە دەیگێڕێتەوە لە ئەفسانە دەچێت..

چونکە ئەو لە ڕۆژووگرتن و، نوێژکردن و، حەجکردن و، هیمەت بەرزی و، بەڕێزیەکەیدا.. لە شەو بەئاگای-بەدرێژایی تەمەنی- ملکەچ و خواپەرستیدا..

لە تینویەتی نیوەڕوانی گەرمدا-بەدرێژایی تەمەنی- ڕۆژووگر و تێکۆشانیدا.. لە ئیمانی پتەویدا بەخوا و، لەترسی هەمیشەییدا لێی..

لە هەموو ئەوانەدا تاکە چنراوی دەستی خۆی بوو..!!

لە بارەیەوە پرسیار کرا لە (ئیبن عەباس)-سەرەڕای ئەو جیاڕاییەی کە لەنێوانیاندا هەبوو-، لە وەڵامدا وتی:

((قورئانی دەخوێند و، شوێنکەوتەی سوننەتی پێغەمبەر بوو.. ملکەچ بوو بۆ خوا و.. لە گەرمای نیوەڕواندا لەترسی خوا بەڕۆژوو بوو.. کوڕی حەواری پێغەمبەری خوا بوو..

ئەسمای دایکیشی کچی ئەبوبەکری صدیق بوو.. (عائیشە)ی پوریشی خێزانی پێغەمبەری خوا بوو.. کەس ناتوانێت مافەکانی فەرامۆش کات مەگەر کەسێك کە خوای گەورە نابینای کردبێت))..!!

* * *

ئەو لە بەهێزی ئاکار و دامەزراوی خووڕەوشتەکانیدا، وەك چیاکان دامەزراو بوو.. ڕوون و.. ڕێزدار و.. بەهێز بوو.. هەردەم ئامادەی ئەوەبوو ژیانی بکاتە قوربانی قسە لەڕوویییەکەی و، دامەزراوی ڕێبازەکەی..

لەکاتی ململانێ و شەڕەکانیدا لەگەڵ ئەمەویەکاندا، (حوصەین کوڕی نەمیر)ی سەرکردەی ئەو سوپایەی (یەزید) ناردبووی بۆ خامۆشکردنی شۆڕشی (ئیبن زوبەیر) هات بۆ لای..

بەهۆی گەیشتنی هەواڵی مردنی (یەزید)ەوە بۆ مەککە هاتە سەردانی و..

پێشنیاری ئەوەی خستە بەردەمی کە لەگەڵیدا بچێت بۆ شام و، حوصەین باڵادەستی مەزنی خۆی بخاتە گەڕ بۆ وەرگرتنی بەیعەت بۆ عبداللەی کوڕی زوبەیر..

عبداللەش ئەو دەرفەتە زێڕینەی ڕەتکردەوە، چونکە بڕوای وابوو کە پێویستە تۆڵەی ئەو هەموو تاوانە دڕندانانەی لێ بکرێتەوە کە جەنگاوەرانی لەکاتی دەست بەسەراگرتنی شاری مەدینەی پێغەمبەری خواداﷺ لەپێناوی چاوچنۆکی ئەمەویەکاندا ئەنجامیان دا..

لەوانەیە جیاڕابین لەگەڵ عبدالله دا لەم هەڵوێستەیدا و، خوازیاری ئەوەین کە ئاشتی و لێبوردەیی هەڵبژاردایە و، بەدەم ئەو دەرفەتە نایابەوە بڕۆیشتایە کە حوصەینی سەرکردەی سوپای (یەزید) خستیە بەردەستی..

بەڵام وەستانی مەردانەی-ع مەردییەك- لەسەر بۆچوون و بیروباوەڕی.. دوورکەوتنەوە لە فریودان و درۆ، کارێکە جێگای سەرسوڕمان و ڕێزە..

ئەوکاتەیشی حەجاج بە سوپاکەیەوە هێرشی هێنایە سەری و، ئابڵۆقەی ترسناکی خستە سەر خۆی و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، ژمارەیەکی زۆری (ئەحباش)ی لەگەڵدابوو، کە لێزانترین ڕم هاوێژ و جەنگاوەر بوون.

گوێی لێیان بوو بەشێوەیەکی ناڕەوا و بێویژدانانە دەربارەی خەلیفەی کۆچکردوو-عوسمانτ- دەدوێن، ئەمیش بەمجۆرە توڕەبوو لێیان و پێی وتن:

((سوێند بەخوا، پێم خۆش نیە پشت بە کەسانێك ببەستم بەرامبەر دوژمنەکەم کە رقی لە عوسمان بێت))..!!

پاشان لەو تەنگانەیەی کە ئەو تێیدابوو، وەکو نفرێبوویەك چەند پێویستی بە دەربازکەرێکە، ئەو پێویستی بە کۆمەك هەبوو، تا لەو کاتەدا لە خۆی دوور خستنەوە..!!

قسە لەڕویی ئەو لەگەڵ خۆیدا و، ڕاستگۆیی لەگەڵ بیروباوەڕ و ڕێبیرەکانیدا، وایان لێکردبوو گوێ نەدات بە لەدەستدانی دووسەد ڕم هاوێژی لێهاتوو، کە ئاینەکەیان جێگای متمانە و دڵنیایی ئەو نەبێت، لەکاتێکدا کە لە جەنگێکی چارەنوسسازی لەناویەردایە و، زۆر پێدەچوو کە مانەوەی ئەو ڕم هاوێژە لێهاتوانە لەگەڵیدا ڕەوتی شەڕەکەی بگۆڕیایە..!!

* * *

خۆڕاگریشی لە بەرەوڕوو بوونەوەی موعاویە و یەزیدی کوڕیدا بەڕاستی پاڵەوانێتیەکی بێوێنە بوو...

ئەو وایدەبینی کە یەزیدی کوڕی موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان دوایەمین پیاوە کە دەست بدات بۆ خەلیفەی موسڵمانان.. گەر هەر دەستیش بدات و.. ئەم بۆچوونەیشی ڕاست و دروست بوو، چونکە یەزید لە هەموو شتێکدا خراپ بوو.. تەنها چاکەیەکی نەبوو تا تکا بۆ ئەو تاوان و گوناهانەی بکات کە مێژوو تۆماری کردووە بۆمان.

جا ئیدی چۆن عبداللە ی کوڕی زوبەیر پەیمانی بداتێ..؟؟

وشەی ڕەتکردنەوەیشی بەرز و بەمێژانە بە موعاویە گوت لەکاتێکدا کە زیندوو بوو.. ئەوەتانێ ئێستاش بە یەزیدیشی دەڵێت پاش ئەوەی بووە خەلیفە و، نێردراوی ناردە لای عبداللە و بەڵێنی چارەنوسێکی خراپی پێدا..

ئا لێرەدا عبداللەی کوڕی زوبەیر وتی:

((هەرگیز پەیمان نادەم بە سەرخۆش))..

پاشان ئەو سرودەی وت:

وَلا أَلِــــينُ لِغَـــيرِ الحَـــقِّ أَسْــــأَلُهُ
حَتـــى يَلِـــينَ لِيـــضرسِ الماضِـــغِ الحَجَــرُ

* * *

بەردەوام عبداللە ی کوڕی زوبەیر هەر بە ئەمیری باوەڕداران مایەوەو، مەککەی پیرۆزی کربووە پایتەختی خەلافەتی و، دەستەڵاتی بەسەر حیجاز و یەمەن و بەصرە و کوفە و

خوراسان و شامدا هەبوو جگە لە دیمەشق.. پاش ئەوەی تێکڕای خەڵکی ئەو ناوچانە پەیمانیان پێی دا..

بەڵام ئەمەویەکان ناسرەون و، داناسوکنێن و، چەند شەڕێکی یەك لەدوای یەکی دەکەنە سەر و، لە زۆریاندا سەرشۆڕی و تێکشکان بەشیان بوو.

هەتا سەردەمی (عبدالملیك ی کوڕی مەروان) هات و بۆ هێرش کردنە سەر عبداللّٰهش لە شاری مەککە ئادەمیزادێکی هەڵبژاردبوو کە دڵڕەقترین کەس بوو لە تاوانکاری و توندوتیژیدا..

ئەویش (حەجاجی سەقەفی)یە، کە پێشەوای دادگەر (عومەری کوڕی عبدالعزیز) لەبارەیەوە دەڵێت:

((گەر هەر نەتەوەیەك بە هەڵەکانیانەوە بێت و، ئێمەش تەنها بە (حەجاج)ەوە بێین، ئەوا لە هەموویان زیاتر دەبێت))..!!!

* * *

حەجاج بە سەرکردایەتی لەشکرە بەکرێگیراوەکەیەوە بۆ داگیرکردنی شاری مەککەی پایتەختی عبداللە ی کوڕی زوبەیر کەوتە ڕێ و، نزیکەی شەش مانگ ئابلۆقەی خستە سەر شارەکە و خەڵکەکەی و ڕێگەی نەدا ئاو و خۆراك بروات بۆیان، تا ناچاریان بکات عبداللە بەجێبهێڵن و بەتەنها بمێنێتەوە، بەبێ سوپا و یارمەتیدەر..

لەژێر چەپۆکی ئەو برسێتیە لەناوبەرەدا زۆرکەس خۆیان دا بەدەستەوەو، عبداللە ش خۆی بە تەنها بینیەوە.. یا لەوەدا بوو تەنیا بمێنێتەوە، سەرەڕای مانەوەی دەرفەتی دەربازکردنی خۆی و ژیانی، بەڵام ئەو بڕیاریدا تا کۆتایی بەرپرسیارێتیەکەی هەڵبگرێت و، بە ئازایەتیەکی بێوێنەوە لە دژی سوپای حەجاج دەجەنگا، لەکاتێکدا کە ئەوکاتە تەمەنی حەفتا ساڵ بوو..!!

ناکرێت وێنەیەکی تەواوی ئەو هەڵوێستە بەرزەمان بۆ دەرکەوێت تا گوێ بۆ ئەو وتوێژە ڕانەدێرین کە لەنێوان عبداللە و دایکی مەزنی پایەبڵندی (ئەسمای کچی ئەبوبەکر)دا ڕوویدا لە دواساتەکانی ژیانیدا.

دایکی چوویە سەردانی و، ڕەوشتی تەواوی هەڵوێستەکەی و، ئەو ئایندەیەی کە بەڕوونی دیارە و چاوەڕوانیەتی بۆ خستە ڕوو..

(ئەسما) پێی وت:

((کوڕی ئازیزم! خۆت چاکتر ئاگاداری خۆتی، گەر دەزانیت کە تۆ لەسەر حەقیت و، بانگەشە بۆ حەق دەکەیت، ئەوا ئارام بگرە لەسەری هەتا لەپێناویدا دەمریت و، ملی خۆت مەخەرە بەردەستی هەرزەکارانی بەنی ئومەییە..

خۆ گەر دەشزانیت کە مەبەستت دونیا بووە، ئەوا خراپترین کەس تۆیت و، خۆت و ئەوانەی لە پێناوتدا کوژراون تووشی ناڕەحەتی کردووە)).

عبداللە وتی:

((سوێند بەخوا دایەگیان، دونیام نەویستووە و پەنام بۆ نەبردووە.

هەرگیزیش نە لە فەرمانی خوادا سەرپێچیم کردووە، نە ستەم و، دەستدرێژیم کردوە))..

ئەسمای دایکیشی پێی وت:

((لەخوای گەورە داواکارم لە دڵدانەوەی لەدەستدانی تۆم چاك بێت، گەر پێش من گەڕایتەوە بۆ لای خوا، یان من پێش تۆ کەوتم.

خوایا بەزەییت بێتەوە پێیدا لەبەر درێژایی هەستانی شەوانەی و، تینویەتی گەرمای نیوەڕۆی و، چاکبوونی بۆ باوکی و من..

خودایا من تەسلیمی ئەمری تۆی دەکەم و، ڕازیم بەوەی کە فەرمانت لەسەریەتی و، پاداشتی ئارامگرە شوکرانەبژێرەکان ببەخشە بە عبداللە ی کوڕی زوبەیر))..!

ئەمجا دەست لە ملانێی و سڵاوی ماڵئاواییان لەیەکدی کرد.

پاش سەعاتێ کەوتە نێو شەڕێکی تاڵی نابەرانبەرەوە، تێیدا شەهیدی مەزن لێدانی مردنی بەرکەوت و، لەکاتێکدا کە حەجاج هێندەی هەموو ئەو ڕق و سەرزەنشتەی لەسەر زەویدا هەیە پەستی دایگرت، سووربو لەسەر ئەوەی کە جەستەی سارد و سڕی هەڵبواسێت، بۆ دامرکاندنەوەی کینەی پیسی ناخی..!!

* * *

دایکی کە لەوکاتەدا تەمەنی نەوەد و حەوت ساڵ بو، هەستا تا کوڕە لەخاچدراوەکەی ببینێت، وەك کێوێکی بڵندی بێلەرزین بەرانبەری ڕاوەستا و.. حەجاج بە سەرشۆڕی و سەرکزیەوە لێی نزیك بوویەوە، وتی:

– دایکە! عبدالملیك کوڕی مەروان ڕایسپاردم چاك بم بەرانبەرت، هیچ پێویستیەکت هەیە..؟

ئەویش هاواری کرد بەسەریدا و وتی:

((من دایکی تۆ نیم..

بەڵکو دایکی ئەو هەڵواسراوەم بەسەر ئەو بەرزاییەوە..

هیچ پێویستیەکیشم پێتان نیە..

بەڵام بەسەرهاتێکت بۆ دەگێڕمەوە کە لە پێغەمبەری خوداﷺ بیستووە، فەرمووی:

((لە سەقیفدا درۆزن و دڕندەیەك دەردەکەوێت))..

درۆزنەکەمان ئەوا بینی و، دڕندەکەش، جگە لەتۆ وا نازنم کەسێکی دیکە بێت))..!!

ئەمجا عبدالله ی کوڕی عومەر نزیك بوویەوە لێی تا سەرەخۆشی لێ بکات و، داوای لێ کرد ئارام بگرێت، لە وەڵامیدا وتی:

((لەبەرچی ئارام نەگرم، لەکاتێکدا کە سەری یەحیای کوڕی زەکەریا بەدیاری برا بۆ داوێن پیسێك لە داوێنپیسەکانی ئیسرائیل))..!!

ئێی لە مەزنی تۆ.. ئەی کچی صدیق..!!

جا لەوێدا هیچ وشەیەك لەو وشانە جوانترە بوترێن بەوانەی کە سەرزی عبداللەی کوڕی زوبەیریان لە جەستە کردەوە بەرلەوەی کە هەڵیبواسن..؟؟

بەڵێ.. گەر سەری (ئیبن زوبەیر) کرابێتە دیاری بۆ حەجاج و عبدالملیك، ئەوا سەری پێغەمبەرێکی بەڕێزی وەك یەحیاU پێشتر کرایە دیاری بۆ (سالومی).. داوێنپیسی خراپی بەنی ئیسرائیل..!!

بە یەکچواندنەکەی چەند جوانە و، وشەکانی چەند ڕاستە..

* * *

پاشان، ئایا دەکرا عبدالله ی کوڕی زوبەیر بەبێ ئەو ئاستە دوورەی سەرکەوتن و، پاڵەوانێتی و، چاکسازی کە ژیانی بگوزەراندایە، لەکاتێکدا کە بەشیری دایکێکی لەو جۆرە گۆش کرابێت..؟؟

سڵاو لە عبدالله و..

سڵاو لە ئەسما.

سڵاو لە هەردوو شەهیدی هەمیشە زیندوویان بێت..

لەگەڵ چاکەکارانی تەقوادار سڵاویان لێ بێت.

٥٤

# عبداللەی کوڕی عەبباس

# زانای ئەم ئوممەتە

ئیبن عەباسیش لە عبداللە ی کوڕی زوبەیر دەچێت لەوەدا کە گەنج بوو گەیشت بە پێغەمبەر و لەگەڵیدا ژیا و، کاتێ پێغەمبەر وەفاتی کرد هێشتا ئیبن عەباس نەگەیشتبووە تەمەنی پێگەیشتن.

بەڵام ئەویش هەر لە تەمەنی منداڵیەوە هەموو سیفەتەکانی مەردی و، بنەماکانی ژیانی لە پێغەمبەری خواوەﷺ وەرگرت، شوێن پێی هەڵدەگرت کە پێشی دەخست و پاکژی دەکردەوە و دانایی پوختی فێردەکرد.

بەهۆی بەهێزی ئیمانی و، بەهێزی ئاکار و، زانینی زۆریەوە، ئیبن عەباس جێگایەکی بڵندی گرتبوو لەنێو پیاوانی دەوری پێغەمبەردا.

* * *

ئەو کوڕی عەباسی کوڕی عەبدولموتەڵیبی کوڕی هاشمی مامی پێغەمبەری خوایەﷺ.

نازناوەکەیشی (الحِبر) زانا.. زانای ئەم ئوممەتە، بەهۆی عاقڵمەندی و، دڵزیرەکی و، فراوانی زانست و زانیاریەوە، بەدەست هێنابوو.

ئیبن عەباس لە سەرەکانی رۆژانیدا ئاشنای رێبازی چۆنیەتی ژیانی بوو، زیاتریش لە بارەیەوە بەئاگا بوو، کە بینی پێغەمبەرﷺ لەخۆی نزیک کردەوە کاتێك کە منداڵ بوو، دەستی خستە سەرشانی و، پێی فەرموو:

((خودایا شارەزای بکە لە ئاین و فێری لێکدانەوە(تأویل)ی بکە)).

پاشان بۆنە و دەرفەتی دیکەی بەدوادا هات پێغەمبەر هەمان نزا بۆ عبداللەی کوڕی عەباسی ئامۆزای دووبارە بکاتەوە.. لەو ساتەوە، ئیبن عەباس تێگەیشت کە ئەو بۆ زانست و، زانیاری دروستکراوە.

ئامادەباشی عەقڵیشی لەم رێگایەدا زیاتر بەرەو پێشەوەی دەبرد.

سەرەڕای ئەوەی کە تەمەنی سیازدەساڵی تێنەپەڕاندبوو ئەوکاتەی پێغەمبەری خواﷺ وەفاتی کرد، ئەوا ئەو یەك رۆژی منداڵێتیە تێگەیشتووەکەی بەفیڕۆ نەدەدا، دەچوویە کۆڕ و دانیشتنەکانیەوە هەرچی بفەرموایە پێغەمبەر ئەم لەبەری دەکرد..

پاش گەڕانەوەی پێغەمبەریش بۆ لای پەروەردگاری باڵادەست، ئیبن عەباس سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ئەوەی لەدەستی چووە لە پێغەمبەرەوە گوێی لێ بێت و فێری ببێت لە هاوەڵە پێشینەکانی پێغەمبەری خواوە فێری ببێت..

ئا لێرەدا، هەمیشە خۆی کردبووە نیشانەی پرسیار.. هەرکە بیبیستایە کە فلانەکەس دانابیەك دەزانێت، یان فەرموودەیەکی لەبەرە، خێرا بەرەو لای دەڕۆیشت و لێوەی فێردەبوو.

عەقڵە ڕۆشن و کراوەکەیشی بەرەو پشکنینی هەموو ئەوەی گوێبیستی دەبوو ئاراستەی دەکرد.. ئەو تەنها بایەخی بە کۆکردنەوەی زانست نەدەدا و بەس، بەڵکو لەگەڵ کۆکردنەوە، پشکنین و وردبوونەوە لەسەرچاوەکەی مەبەست بوو.

لەبارەی خۆیشیەوە دەڵێت:

((من لەبارەی یەك کارەوە، پرسیارم لە سی هاوەڵی پێغەمبەری خواﷺ دەکرد)).

لەم ڕووەشەوە نمونەیەکی سووربوونی خۆیمان لە تێگەیشتنی حەقیقەت و زانست و زانساری دەداتێ و دەڵێ:

((کاتێ پێغەمبەری خواﷺ گیانی سپارد لە گەنجێکی ئەنصاریم پرسی: وەرە با بچین پرسیار لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا بکەین، ئەمڕۆ زۆرن..

وتی: چەند سەیری ئیبن عەباس!! وا دەزانیت کە ئەو خەڵکە لەکاتێکدا کە ئەو هەموو هاوەڵەی پێغەمبەری خوایان لەناودایە پێویستیان بە تۆ دەبێت..؟

جا ئەو وازی لەوە هێنا، منیش دەستم کرد بە پرسیار کردن لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا.. ئەگەر بمبینیایە کەسێك فەرموودەیەکی لایە، دەچوومە لای لەکاتێکدا ئەو لە نیوەڕۆخەودا بوو، منیش عاباکەم لەبەر دەرگاکەیدا دادەخست و پاڵم دەدایەوەو با تەپ وتۆزی دەدا بەڕوومدا، هەتا لە نیوەڕۆخەوەکەی هەڵدەستا و، دەهاتە دەرەوەو دەیبینیم و، جا دەیوت: ئەی ئامۆزای پێغەمبەری خوا! چی گەیاندوویتیە ئێرە..؟؟ بۆ وەڵامت نەنارد بۆم تا من بێم بۆ لات..؟؟ منیش دەموت: نەخێر، تۆ لەپێشتری من بێم بۆ لات، جا پرسیارم لەبارەی فەرموودەکەوە لێدەکرد و فێردەبووم لێی))..!!!

بەمجۆرە لاوە مەزنەکەمان دەیپرسی و، دەیپرسی.. پاشتر وەڵامەکەی لەگەڵ خۆیدا دەپشکنی و، بە عەقڵێکی بوێرەوە تاوتوێی دەکرد..

جا ئەو هەموو ڕۆژێ، زانست و زانیاری و داناییەکەی گەشەی دەکرد، [illegible] لاوێتیەکی زوودا دانایی پیر و لەسەرخۆییان و، ڕێکوپێکی ڕاوێژچونیانی، تێدا دەستەبەر [illegible] تەنانەت ئەمیری باوەڕداران (عومەر) سوور بوو لەسەر ئەوەی کە لە هەموو کاروبارێکی گەورەدا ڕاوێژی پێبکات و.. نازناوی (لاوی پیر)ی لێ نابوو..!!

ڕۆژێکیان لە ئیبن عەباس پرسیار کرا: چۆن ئەم زانستەت دەستکەوتووە..؟؟

لە وەڵامدا وتی:

((بە زمانێکی پرسیارکەر و..

دڵێکی هۆشمەند)).

جا بە زمانی پرسیارکەری هەمیشەیی و، بە عەقڵە هەردەم پشکنەرەکەی، پاشان بە خۆ بەکەم زانی و ئاکار شیرینیەکەی، ئیبن عەباس بوویە زانای ئەم ئوممەتە..

(سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص)یش بەم وشانە لەبارەیەوە دەدوێت:

((کەسم نەدیوە زیاتر لە ئیبن عەباس تێگەیشتنی ئامادەبێت و، عەقڵی گەورە بێت و، زاناتر و، لەسەرخۆتر بێت..

عومەرم بینی بۆ گرێ وتەگەرەکان بانگی دەکرد، لەکاتێکدا کە بەشداربوانی بەدر لە موهاجیرین و ئەنصار لە دەوری بوون، جا ئیبن عەباس قسەی دەکرد ، عومەریش لەقسەی دەرنەدەچوو.))...

عبیداللە ی کوڕی عوتبەش لەبارەیەوە دەڵێت:

((کەسم نەدیوە هێندەی ئیبن عەباس شارەزای فەرموودە پێشینەکانی پێغەمبەری خواﷺ بێت..

کەسیشم نەبینیوە لەو زاناتر بێت لە دادوەریی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان.

یا لە بۆچووندا لەو تێگەیشتووتر بێت..

یان لە شیعر و لە عەرەبیدا، یا لە ڕاڤەی قورئان و، حیساب و فەرزدا لەو زاناتر بێت..

هەر بۆیە ڕۆژێك دادەنیشت بۆ (فقە)ەکەی و، ڕۆژێك بۆ قورئان و.. ڕۆژێك بۆ غەزاکان و.. ڕۆژێك بۆ شیعر و.. ڕۆژێك بۆ ڕۆژانی عەرەب و دەنگوباسەکانیان..

هیچ زانایەکم نەدیوە لای دانیشتبێت دەنا کەوتۆتە ژێر کاریگەریی و ملکەچی بووە، یان پرسیارکەرێك لێی پرسی بێت زانست و زانیاری لێ دەست کەوتووە))..!!

* * *

موسڵمانێکی خەڵکی بەصرەش وەصفی دەکات، لەکاتێکدا کە ئیبن عەباس لە سەردەمی ئیمامی عەلی دا لەوێ والی بوو، دەڵێت:

((سێ شتی دەست پێوەگرتبوو، وازیشی لە سێ‌شت هێنابوو:

دڵی پیاوانی ڕادەکێشا کاتێك قسەی دەکرد..

بەجوانی گوێی ڕادەگرت گەر قسەی بۆ بکرایە..

ئاسانترینیانی هەڵدەبژارد گەر لەنێوان دواندا سەرپشك بکرایە..

وازیشی هێنابوو لە دەمە قاڵێ و..

هاوڕێیەتی پیاوخراپان و..

ئەو شتەی داوای لێبووردنی بۆ بکرێت))..!!

* * *

هەمەڕەنگی ڕۆشنبیریەکەی و، کشتگیری زانست و زانیاریەکەی سەرسوڕهێنەر بوو.. ئەو زانای، زیرەکی نۆرزان بوو لە هەموو زانستێکدا.. لە ڕاڤەی قورئان و لێکدانەوەیدا و.. لە فقە و لە مێژوو، لە زمانی عەرەب و داب و نەریتەکانیاندا و، پاشان ئەو جێ‌مەبەستی عەودالانی زانست و زانیاری بوو، خەڵکی دەستەدەستە لە وڵاتانی ئیسلامەوە دەهاتنە خزمەتی، تا گوێی لێ بگرن و لێوەی شارەزا ببن.

یەکێك لە هاوەڵان و هاوسەردەمەکانی لەبارەیەوە دەڵێت:

((ئیبن عەباسم لە کۆڕ و دانیشتنێکدا بینی، گەر هەموو قوڕەیش شانازی پێوە بکردایە، بەشی شانازی هەموویانی دەکرد..

بینیم خەڵکی لای دەرگاکەشەوە کۆبوویبوونەوە هەتا ڕێگەش نەمابوو، هیچ کەس نەیدەتوانی کە بێت و، بڕوات..

منیش چوومە لای و دەربارەی شوێنیان لای دەرگاکەوە هەواڵم پێدا، پێی وتم: ئاوی دەستنوێژم بۆ ئامادە کە، جا دەستوێژی گرت و دانیشت و، وتی: بڕۆ بۆ لایان، ئەوەی دەیەوێت لەبارەی قورئان لێکدانەوەیەوە پرسیار بکات بانگی بکە..

منیش چوومە دەرەوە مۆڵەتم دان، هاتنە ژوورەوە تا ماڵەکەیان پڕکرد، پرسیاریان لەبارەی هەر شتێکەوە دەکرد بەزیادەوە وەڵامی دەدانەوە..

پاشان وتی پێیان: براکانتان ماون.. ئەوانیش چوونە دەرەوە تا ڕێگەی بۆ ئەوانەی دیکە چۆڵ بکەن..

پاشان پێی وتم: بڕۆ دەرەوەو هەرکەس دەیەوێت لەبارەی حەڵاڵ و حەرام پرسیار بکات بابێتە ژوورێ..

منیش چوومە دەرێ و مۆڵەتم دان، هاتنە ژوورەوە تا ماڵەکەیان پڕکرد، پرسیاریان لەبارەی هەرشتێکەوە دەکرد بە زیادەوە وەڵامی دانەوە..

پاشان وتی: براکانتان ماون.. جا چوونە دەرێ..

دواتر پێی وتم: بڕۆ هەرکەس دەیەوێت لەبارەی فەرزەکانەوە پرسیار بکات ا بێتە ژوورێ..

منیش مۆڵەتم دان، هاتنە ژوورێ تا ماڵەکە پڕ بوو، لەبارەی هەر شتێکەوە پ یاریان کرد بە زیادەوە وەڵامی دانەوە.

پاشان پێێ وتم: بڕۆ هەرکەس دەیەوێت لەبارەی عەرەب و شیعرەوە پرسیار بکات با بێتە ژوورێ.

منیش مۆڵەتم دان و، هاتنە ژوورێ تا ماڵەکە پڕ بوو، جا لەبارەی هەرشتێکەوە پرسیاریان دەکرد بە زیادەوە وەڵامی دانەوە))..!!

ئیبن عەباس لەپاڵ ئەو بیرە بەهێزەیدا، بگرە بۆوێنەیەیدا، خاوەنی زیرەکیەکی نۆر و دووربین بوو، زرنگیەکەی لەڕادە بەدەر بوو.. بەڵگەشی وەك تیشکی خۆر درەوشاوە و، ڕوون

و، گەشاوە بوو.. لە گفتوگۆ و بیروبۆچوونیشدا، لێ نەدەگەڕا بەرانبەرەکەی تەنها بە قەناعەت هێنان بە بۆچونەکەی تێر بکات و بەس، بەڵکو دڵشادیشی بکات بەهۆی جوانی بیروبۆچوون و لێزانیی گفتوگۆکەیەوە..

لەپاڵ زۆری زانستەکەی و، بەهێزی بەڵگەکانیدا، گفتوگۆ و وتوێژەکانی وەك جەنگی زیرەکێتی نەدەهاتە پێش چاو، تێیدا بەهۆی زانستەکەیەوە بەرز بێتەوەو، پاشان بەسەرکەوتنی بەسەر بەرانبەرەکەیدا.. بەڵکو وەك ڕێگایەکی بەهێزی بەدیکردنی ڕاستی و زانینی دەهاتە پێش چاوی.

چەندەهاجار خەواریجەکان سەرسام بوون بەهۆی تێڕوانینە توندە دادگەرەکانیەوە.

ئیمامی عەلیؓ ڕۆژێکیان ناردی بۆلای کۆمەڵێکی زۆریان و، گفتوگۆیەکی جوان لەنێوانیاندا بەرپابوو بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر قسەی کرد و بەڵگەی بۆ هێنانەوە.

لەو گفتوگۆ درێژە تەنها ئەم بڕگەیە دەهێنینەوە..

ئیبن عەباس پرسیاری لێ کردن:

((ئێوە تۆڵەی چی لە عەلی دەکەنەوە..؟؟))

وتیان:

((تۆڵەی سێ شت:

یەکەمیان: ئەو حوکمی پیاوانی بەکارهێناوە لە ئاینی خوادا، لەکاتێکدا کە خوا فەرمویەتی ﴿إن الحكم الاّ لله: فەرمان هەر فەرمانی خوایە﴾.

دووەمیش: ئەو شەڕی کرد، پاشان لەو کەسانەی کە شەڕی لەگەڵدا کردن کەنیزەك و دەستکەوتی وەرنەگرت، جا گەر ئەوانە کافر بووبن، ئەوا ماڵ و سامانیان حەڵاڵ بووە بۆی و، گەر بڕواداریش بووبن، ئەوا خوێنیان حەرام بووە بۆی..!!

سێیەمیش: لەکاتی دادوەریکردندا ڕازی بوو بەوەی کە سیفەتی (ئەمیری باوەڕداران) لەخۆی دابماڵێ، لەسەر قسەی دوژمنەکانی، جا گەر ئەمیری باوەڕداران نەبێت، ئەوا ئەمیری بێباوەڕانە..))

ئیبن عەباسیش دەستی دایە پوچەڵکردنەوەی ئارەزووەکانیان و، وتی:

((ئەو قسەیەتان، ئەو حوکمی پیاوانی بەکارهێناوە لە ئاینی خوادا، چی تێدایە..؟ خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَقْتُلُوا الصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ وَمَنْ قَتَلَهُ مِنكُمْ مُتَعَمِّدًا فَجَزَاءٌ مِثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ النَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِ ذَوَا عَدْلٍ مِنكُمْ: ئەی گەلی بڕواداران! هەتا ئێوە لە ئیحرامدان، نابێ هیچ نێچیرێ بکوژن، کێ لە ئێوە بە ئانقەست لە ئیحرامدا نێچیرێ بکوژێ، لەسەریەتی ئاژەڵێکی هاوتای ئەو نێچیرە بکاتە قوربانی، ئەم هاوتاییەش دوو کەسی دادوەری خۆتان بڕیاری لەسەر دەدەن.﴾المائده/٩٥.

جا توخوا تێم بگەیەنن: دادوەریکردنی پیاوان لە پاراستنی خوێنی موسڵمانان لەپێشتر و ڕەواترە، یان داوەریکردنیان لە کەرویشکێکدا کە نرخەکەی چارەکە درهەمێکە..؟؟!!))

سەرکردەکانیان لەبەر بەرکەوتنی ئەم بۆچوونە گاڵتەئامێزە یەکلاکەرەوەیدا دەستیان بەیەکدا دەهات و.. زانای ئوممەتیش درێژەی بەقسەکانی دا:

((ئەو قسەیەشتان، ئەو جەنگا و کەنیزەك و دەستکەوتی نەبرد، ئایا ئێوە دەتانەوێ کە عائیشەی خێزانی پێغەمبەر و دایکی بڕواداران بە کەنیزەك ببات و، شت ومەکەکانی وەك دەسکەوت هەڵگرێت..؟؟))

ئا لێرەدا ڕوخساریان لەشەرماندا زەرد داگەڕا و، بەدەستیان ڕووی خۆیان دەشاردەوە..

جا ئیبن عەباس چووە سەر سێیەمیان:

((ئەو قسەیەشتان، ئەو ڕازی بووە سیفەتی ئەمیری باوەڕداران لەخۆی داماڵێت، هەتا داوەریەکە دەکرێت، جا گوێبگرن پێغەمبەری خواﷺ لەڕۆژی حودەیبیەدا چی کرد، ویستی ئەو نامەیە بنوسێت کە لەنێوان ئەو و قورەیشدا دادەنرێت، بە نوسیارەکەی فەرموو: بنووسە: ئەمە ئەوەیە کە محمدی پێغەمبەری خوا-.. نێرراوەکەی قورەیش وتی: سوێند بەخوا گەر بمانزانیایە تۆ پێغەمبەری خوایت ڕێگریمان لەکەعبە لێ نەدەکردیت و شەڕمان لەگەڵ نەدەکردیت.. بنووسە: ئەمە ئەوەیە کە محمدی کوڕی عبدالله لەسەری پێکهات.. جا پێغەمبەری خوا فەرمووی پێیان: سوێند بەخوا من پێغەمبەری خوام، با ئێوە بە درۆیشم تێبگەن.. پاشان فەرمووی بەنوسیاری نامەکە: ئەوەی دەیانەوێت بینووسە: بنووسە: ئەمەبوو محمدی کوڕی عبدالله لەسەری پێکهات..))!

جا وتوێژ لەنێوان ئیبن عەباس و خەواریجەکاندا لەسەر ئەو شێوازە سەرسوڕهێنەرە بەهێزە بەردەوام بوو.

هێشتا گفتوگۆکە تەواو نەبووبوو بیست هەزاریان بیروبۆچونیان گۆڕا و، وازیان هێنا لە دژایەتیکردنی ئیمامی عەلی..!!

* * *

ئیبن عەباس تەنها خاوەنی ئەم گەنجینەی زانست و زانیاریە نەبوو بەس، بەڵکو لەپاڵیدا خاوەنی گەنجینەیەکی گەورەتر بوو، لە خوڕەوشتی زانین و ئاکاری زانایان.. لە بەخشندەیی و داستگیریدا پێشەوا و دیاربوو..

بەماڵی خۆی دەیبەخشیە خەڵکی.. بەهەمان شێوەی کە زانستی خۆی پێدەدان..!!

هاوسەردەمەکانی لەبارەیەوە دەڵێن:

((هیچ ماڵێکمان نەبینیوە کە خواردن و، خواردنەوەو، میوە و، زانستی لەماڵی ئیبن عەباس زیاتر بوبێت..))!!

ئەو دڵپاك و، دەروون بێخەوش بوو، رق و كینەی بەرامبەر هیچ كەس هەڵنەدەگرت، ئەو ئارەزووەیشی كە لێی تێر نەدەبوو، بەئاوات خواستنی چاكەبوو بۆ هەموو ئەو خەڵكەی دەیناسی و ئەوانەیشی نەیدەناسین..

لەبارەی خۆیەوە دەڵێت:

((كاتێك دەچمە سەر ئایەتێك لە ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز، حەزدەكەم كە هەموو خەڵكی ئەوەی من لەبارەیەوە دەیزانم بیانزانیایە..

كاتێكیش دەبیستم فەرمانڕەوایەك لە فەرمانڕەواكانی موسڵمانان دادگەرەو، یەكسانی دەچەسپێنێت، دڵخۆش دەبم پێی و، بۆی دەپاڕێمەوەو.. هیچ ئیش و كاریكیشم پێی نیە..!!

كاتێك گوێم لێ دەبێت زەویەكی موسڵمانان بارانی زۆری لێ دەبارێت، شادومان دەبم پێی، لەكاتێكدا كە هیچم نیە لەو زەویە بلەوەڕێت..!!))

* * *

ئەو خواپەرستێكی ملكەچی تەوبەكارە.. بەشەو هەڵدەستێت بۆ شەونوێژ و، بە ڕۆژیشدا بەڕۆژوو دەبێت و، ڕێچكەی فرمێسكی چاوەكانی لەسەر ڕومەتی لاناچێت.. لەكاتی نوێژكردن و، قورئان خوێندندا زۆر دەگریا..

گەر لەكاتی قورئان خوێندنیدا بگەیشتایەتە سەر هەندێك لە ئایەتەكانی سەركۆنە و ترساندن و، باسكردنی مردن و، زیندوویوونەوە، هەنیسك و دەنگی گریانی بەرز دەبوویەوە.

* * *

ئەو لەپاڵ ئەمەدا ئازا و، دەست پاك و، بۆچوون دروست بوو.. لە جیاڕایی نێوان ئیمامی عەلی و موعاویەشدا، بیروبۆچوونی وای هەیە كە درێژەپێدانی زیرەكی و، لێزانی فراوانی دەردەخات.

لەكاتێكدا كە ئەو ئاشتی بەسەر شەڕدا هەڵدەبژارد و، نەرم و نیانی بەسەر توندوتیژیدا و.. تێگەیشتن بەسەر ڕاپێچكردندا..

كاتێكیش حوسەین هات بە خەیاڵیدا كە بەرەو عێراق بچێت بۆ شەڕكردن بەرامبەر (زیاد) و (یەزید)، ئیبن عەباس خۆی پێداهەڵواسی و زۆر هەوڵیدا كە ڕێی لێ بگرێت.. دواتریش هەواڵی شەهیدبوونی پێگەیشت، غەم و پەژارە دایگرت و، لە ماڵی خۆی دەرنەچوو..

لەكاتی دروستبوونی هەر جیاڕاییەكیشدا لەنێوان موسڵمانێك و موسڵمانێكی دیكەدا ئیبن عەباس ئاڵای ئاشتی و، تێگەیشتن و، نەرم و نیانی بەدەستەوەبوو..

ڕاستە ئەو لەگەڵ ئیمامی عەلی دا دژ بە موعاویە شەڕی کرد، بەڵام ئەوەی بۆیە کرد چونکە شەڕەکە لەسەرەتاوە خۆی لە وەڵامدانەوەیەکی پێویستدا دەنواند دژ بە بزاڤێکی لێکبوونەوەی ترسناک، کە هەڕەشەی لە یەکێتی ئاین و یەکڕیزی موسڵمانان دەکرد..

* * *

ئیبن عەباس ژیانی دەگوزەراند و دونیای خۆی پڕکرد لە زانین و دانایی و، بۆن و بەرامە و تەقواکەی لەنێوان خەڵکیدا بڵاو دەکردەوە..

لە تەمەنی حەفتا و یەك ساڵیدا بۆ دیداری پەروەردگاری مەزنی بانگکرا..

شاری (طائیف) دیمەنێکی قەرەباڵغی بەخۆوە دی کە بەشداری بەڕێکردنی بڕوادارێکیان دەکرد بەرەو بەهەشت..

لەکاتێکدا کە جەستەی جێگەی ئارامی خۆی لە گڵکۆکەیدا گرت ، بەهەشتەکانی باڵا بە دەنگدانەوەی بەڵێنی ڕاستی خوا دەهەژا:

﴿يَاأَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ
ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً
فَادْخُلِي فِي عِبَادِي
وَادْخُلِي جَنَّتِي﴾

الفجر:٢٧-٢٨-٢٩-٣٠.

# ٥٥

## عەببادی کوڕی بیشر

## ڕوناکی خودای لەگەڵدایە!

کاتێك موصعەبی کوڕی عومەیری نوێنەری پێغەمبەری خواﷺ گەیشتە شاری مەدینە، تا ئەو ئەنصاریانەی پەیمانیان لەسەر ئیسلام دابوو بە پێغەمبەری خوا فێربکات و، نوێژیان پێبکات، (عەبادی کوڕی بیشر)τ یەکێك بوو لەو چاکەکارانەی پەروەردگار دڵی بەڕووی چاکەدا والاکرد، چوویە کۆڕ و دانیشتنی موصعەب و گوێی لێ ڕاگرت و پاشان دەستی ڕاستی هێنا و پەیمانی موسڵمان بوونی دا، ئیدی لەو ساتەوە جێگای خۆی لەنێو ئەو ئەنصاریانەدا گرت کە خوای گەورە لێیان ڕازی بوو و لێی ڕازی بوون..

کە پێغەمبەریش کۆچی کرد بۆ مدینە، پاش ئەوەی کە بڕوادارانی مەککە بەر لەخۆی ناردبوو، ئەو جەنگانە دەستی پێکرد کە تێیدا هێزی چاکە و ڕۆشنایی بەرەو ڕووی بەرەی تاریکی و خراپە بوویەوە.

لە هەموو ئەو جەنگانەدا، عەبادی کوڕی بیشر لەڕیزی پێشەوەدا بەجەرگانە و لێبڕاوانە لەپێناوی خوادا دەجەنگا بەجۆرێ کە مایەی سەرسام بوونی عەقڵەکان بوو.

* * *

پێدەچێت ئەم ڕوداوەی کە ئێستا دەیگێڕینەوە گۆشەیەك لە پاڵەوانێتی ئەم بڕوادارە مەزنەمان بۆ بخاتە ڕوو..

پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا و موسڵمانەکان لە جەنگی (ذات الرقاع) بوونەوە، لایاندایە جێگایەك تا شەو تێیدا بمێننەوە و، پێغەمبەر هەندێك لە هاوەڵانی دیاریکرد کە بەسەرە پاسەوانێتی بکەن، لەوانە (عەممارى کوڕی یاسر) و (عەبادی کوڕی بیشر) سەرەیان پێکەوە بوو.

(عەباد) بینی (عەممار)ی هاوڕێی ماندووە، هەربۆیە داوای لێکرد کە سەرەتای شەو بخەوێت و ئەم لە جێیدا ئێشك بگرێت، هەتا هاوڕێکەی ماوەیەك دەحەوێتەوەو دەتوانێت پاش هەستانی درێژە بە ئێشکگرتنەکەی بدات..

عەباد سەیری کرد دەوروبەری هێمنە و، ئیدی بۆ کاتەکانی بە نوێژکردن پڕ نەکات و، پاداشتی ئەوەشی لەگەڵ پاداشتی ئێشکگرتنەکەدا دەست بکەوێت..؟!

هەستایەوە دەستی کرد بە نوێژکردن..

لەکاتێکدا کە بەپێوەبوو نوێژی دەکرد و لەدوای سورەتی فاتیحە سورەتێکی قورئانی دەخوێند، تیرێك بەردەستی کەوت و، دەریهێنا و بەردەوام بوو لەسەر نوێژەکەی..! جا تیری دووەمی تێگرت..

پاشان هێرش هێنەرەکەی نێو تاریکی شەو سێیەمین تیری بۆ هاویشت، ئەمیش دەریهێنا و خوێندنەوەکەی تەواو کرد..

دواتر چوویە ڕکوع و، کڕنووشی برد.. ماندوێەتی و ئازار هێزی لێ بڕیبوو، جا لە کاتێکدا کە لە کڕنووشدا بوو دەستی ڕاستی درێژکرد بۆ هاوەڵەکەی کە لە تەنیشتیەوە خەوتبوو، ڕایوەشاند تا بێداربوویەوە..

پاشان لە کڕنووشەکەی بەرزبوویەوەو تەحیاتی خوێند و نوێژەکەی تەواوکرد.

عەممماریش بە وشە لەرزۆکە ماندوەکانی بەئاگاهاتەوە کە پێی دەوت:

{هەستە بۆ ئێشك گرتن لەجێی من، چونکە بریندار بووم}.

(عەمار) ڕاپەڕی هەراو ڕلوکردنێکی دروستکرد کە بوویە مایەی ترساندنی هێرشبەران و، ئەوەبوو هەڵهاتن، پاشان ئاوڕی دایەوە لە عەباد و پێی وت:

{سبحان الله..

بۆ لەگەڵ یەکەم تیردا کە لێتدرا بەئاگات نەمێنامەوە}..؟؟

عەبادیش وەڵامی دایەوە:

{لەنوێژەکەمدا هەندێ ئایەتی قورئانی پیرۆزم دەخوێند کە دەرونیان پڕ لە خۆشی و جەزم کردبوو، جا حەزم نەکرد کە بیبڕم..

سوێند بەخوا گەر لەبەر ئەوە نەبوایە کەلێنێکم لەدەست دەچوو کە پێغەمبەری خوا فەرمانی پارێزگاریکردنی پێکردبووم، ئەوا مردنم هەڵدەبژارد بەسەر بڕینی ئەو ئایەتانەدا کە دەمخوێندەوە}..!!

* * *

عەباد لە پشتیوانیکردن و خۆشەویستی خوا و، پێغەمبەر و، ئاینەکەیدا زۆر توند بوو..

هەر ئەو خۆشەویستی و پشتیوانیکردنەش هەموو ژیان و هەستی داپۆشیبوو..

لەو ساتەوەش کە گوێی لە پێغەمبەری خواﷺ بوو ڕووی کردبووە ئەنصارەکان-کە ئەو یەکێکیان بوو- و پێی فەرموون:

{ئەی کۆمەڵی ئەنصار..

ئێوە پیادەن و، خەڵکی سوارە

با لەلای ئێوەوە کەسم بۆ نەیەت}.

دەڵێت: لەو ساتەوەی عەبادە گوێبیستی ئەو وشانەی پێغەمبەر و، مامۆستا و، ڕێنوێنیکارەکەی بۆ لای خوا بوو، بەگیان و ماڵ و ژیانی لەپێناوی خوا و پێغەمبەرەکەیدا تێدەکۆشی..

لەشوێنی قوربانیدان و مردندا، هەمیشە یەکەمین کەس بوو..

لەجێگای دەستکەوت و وەرگرتندا، هاوەڵانی ماندوو و ناڕەحەت دەبوون تا دەیاندۆزیەوە..!!

ئەو هەردەم:

خواپەرست بوو– لە پەرستشەکەیدا ڕۆدەچوو..

پاڵەوان بوو– لە پاڵەوانێتشدا ڕۆدەچوو..

بەخشندە بوو– لە بەخشندەیەتیدا ڕۆدەچوو..

بڕوادارێکی بەهێز بوو، هەموو ژیانی لەپێناوی ئیماندا بەخت کردبوو..!!

لەنێو هاوەڵانی پێغەمبەردا هەمووی ئەم خەسڵەتانەی زانرابوو..

عائیشەی دایکی بڕواداران–خوای لێ ڕازی بێت– دەڵێت:

((سێ کەسی ئەنصاری هەیە کەس لە چاکەمەندیدا پێیان نەگەیشتووە:

سەعدی کوڕی مەعاذ و

ئوسەیدی کوڕی حوضەیر و

عەبادەی کوڕی بیشر))...

* * *

موسڵمانە پێشینەکان عەبادەیان وا ناسیبوو کە ڕووناکی خوای لەگەڵدایە.. چونکە بەرچاوڕوونییە پرشنگدارەکەی بەبێ گەڕان بەرەو لای چاکە و دڵنیایی دەبرد..

بەڵکو بڕوای هاوەڵەکانی سەبارەت بەو ڕووناکیەی گەیشتبووە ئاستێك کە وێنەی هەست و ماددەیان بەسەردا دەدا، یەکدەنگ بوون لەسەر ئەوەی کە عەبادە گەر لە تاریکیدا بڕوات پرشنگ و ڕۆشنایی لێ هەڵدەقوڵێت و، ڕێگاکەی بۆ ڕۆشن دەکات..

* * *

لە جەنگی هەڵگەڕاوەکانیشدا، پاش وەفاتی پێغەمبەری خواﷺ عەباد بەشێوەیەکی ئازایانەی کەم وێنە بەرپرسیارێتی سەرشانی لە ئەستۆ گرت..

لەشەڕی یەمامەشدا کە موسڵمانەکان بەرەو ڕووی سوپایەکی ئەوپەڕی توندوتیژ و لێزان بوویەوە بە سەرکردایەتی موسەیلەمەی درۆزن، عەباد هەستی بەو مەترسیە کرد کە هەڕەشە لە ئیسلام دەکات..

قوربانیدانی و، گوڕج و گوڵیەکەی بەپێی ئەو ئەرکەی کە ئیمانەکەی پێی دەسپارد بەرز دەبوویەوە بۆ ئاستی زیاتر هەستکردن بەو مەترسیە، بەڕادەیەك و بەجۆرێك خۆبەختکارێکی لێ دروست دەکرد کە سووربێت لەسەر مردن و شەهیدبوون..

* * *

ڕۆژێك بەر لەڕودانی جەنگی یەمامە، خەونێکی بینی کە هێندەی نەبرد وەك ڕۆژی روونال ڕاڤەکرا، لەسەر خاکی ئەو شەڕە گەورە و خوێناویەی کە موسڵمانەکان کردیان..

دەبا لێگەڕێین هاوەڵێکی پایەداری کە ئەبوسەعیدی خودرییەτ ئەو خەونەمان بۆ بگێڕێتەوە کە عەباد دیویەتی لەگەڵ ڕاڤەکەیدا بۆی، پاشان هەڵوێستی سەرسوڕهێنەری لەو جەنگەدا کە بە شەهیدبوونی کۆتایی هات.

ئەبوسەعید دەڵێت:

((... عەباد پێی وتم: ئەی ئەبوسەعید! ئەمشەو لەخەومدا بینیم، دەتوت ئاسمان کراوەتەوە بۆم، پاشان بەسەرمدا داخرا.. من تەنها وای دەبینم کە بە پشتیوانی خوا شەهیدی بێت..!!

منیش پێم وت: سوێند بەخوا خەونێکی باشت بینیوە..

لەڕۆژی یەمامەشدا سەرنجم دەدا، هاواری لە ئەنصاریەکان دەکرد:

کیفکی شمشێرەکانتان بشکێنن و، لەنێوخەڵکیدا خۆتان دیارخەن..

جا چوارسەد پیاو کە هەموویان ئەنصاری بوون بەرەو لای ڕۆیشتن، هەتا هێرشیان بردە سەر دەروازەی باخچەکە و، بەتوندترین شێوە جەنگان.

جا عەبادی کوڕی بیشر τ شەهید بوو..

لێدانی زۆرم لەسەر ڕوخساری بەدی کرد و، بەتەنها بەهۆی نیشانەیەکی جەستەیەوە ناسیمەوە))..!!

* * *

لەکاتێکدا بینی کە جەنگە خوێناویەکە لەسەرەتاوە لە بەرژەوەندی دوژمنان بوو، پەیامی پێغەمبەری خوای بۆ ئەنصاریەکانی هۆزەکەی هاتەوە یاد:

{ئێوە پیادەن..

با لەلای ئێوەوە کەسم بۆ نەیەت}..

دەنگەکەی جوانی و ویژدانی پڕکردبوو..

وەك ئەوەی کە پێغەمبەرﷺ ئێستا وەستابێت و ئەو وتانەی بڵێتەوە..

عەباد هەستی کرد کە هەموو بەرپرسیارێتی جەنگەکە تەنها دەکەوێتە ئەستۆی ئەنصاریەکان، یان بەر لە خەڵکی دیکە لە ئەستۆی ئەواندایە..

لێرەدا چوویە سەر گردێك و هاواری کرد:

{دەی خەڵکی ئەنصار..

کیفکی شمشێرەکانتان بشکێنن و،

لەنێو خەڵکیدا با دیار بن}..

کاتێك چوارسەد پیاویان بەدەمیەوە هاتن، لەنێویاندا ئەو و ئەبودوجانە و بەرائی کوڕی مالیك سەرکردایەتیان کردن بەرەو باخچەکە کە سوپای موسەیلەمە خۆیان تێدا پەنادابوو.. جا جەنگاوەرە پاڵەوانەکە بەجۆرێکی شیاوی پیاوانەو، باوەڕدارانە و، ئەنصاریانە جەنگا..

* * *

لەو ڕۆژە بەرزەدا عەباد شەهید بوو..

بەڕاستیش خەونەکەی کە دوێنی لە خەونیدا بینیبووی هاتە دی..

ئەی ئەو نەبوو بینی ئاسمان بۆی کرایەوە، هەتا لەو کەلێنە کراوەیەوە چوویە ژوورەوەو، ئاسمان چوویەوە شوێنی خۆی و پێچایەوەو، دایخست؟؟

هەرخۆیشی وای لێکدایەوە کە گیانی لەو جەنگە چاوەڕوانکراوەدا بەرەو لای پەروەردگاری دروستکاری بەرزدەبێتەوە..؟

* * *

بەڕاستی خەونەکەی و لێکدانەوەکەیشی بۆی ڕاست دەرچوو..

دەرگاکانی ئاسمان بە شادیەوە کرانەوە تا پێشوازی لە گیانی عەبادی کوڕی بیشر بکەن..

ئەو پیاوەی کە ڕووناکی خودای لەگەڵ بوو..!!

## ٥٦

# سوهەیلی کوڕی عەمر

## لەئازادکراوانەوە بەرەو شەهیدبوان

کاتێك لە جەنگی بەدردا بەدیلی کەوتە دەستی موسڵمانەکان، عومەری کوڕی خطاب لە پێغەمبەری خوا ﷺ نزیك بوویەوەو ، وتی:

((ئەی پێغەمبەری خوا.. لێم گەڕێ ئەو ددانانەی پێشەوەی سوهەیلی کوڕی عامر دەربێنم، هەتا جارێکی دیکە ڕانەوەستێت لەدژت وتار بدات.))...

پێغەمبەری مەزنیش وەڵامی دایەوە:

((نەخێر ئەی عومەر..

هیچ کەس ناشێوێنم، خوا بەسەرمدا دێنێتەوە، با پێغەمبەریش بم))..!!

پاشان عومەری لەخۆی نزیك کردەوەو، پێی فەرموو:

((ئەی عومەر..

بەڵکو سوهەیل هەڵوێستێك بنوێنێت کە دڵخۆشت بکات))..!!

* * *

ڕۆژان تێپەڕی..

پێشبینیەکەی پێغەمبەر ڕاست دەرچوو..

مەزنترین وتاربێژی قورەیش کە سوهەیلی کوڕی عەمر بوو گۆڕا بۆ وتاربێژێکی لێهاتوو لە وتاربێژانی ئیسلام..

ئەو هاوەڵپەرستە داخ لە دڵە گۆڕا بۆ.. بڕوادارێکی تەوبەکار، کە لە ترسی خوا فرمێسك لە چاوانی نەدەبڕا..!!

یەکێك لە پیاوماقوڵە گەورەکانی قورەیش و سەرکردەکانی سوپایان، گۆڕا بۆ جەنگاوەرێکی خۆڕاگر لەپێناوی خوادا.. جەنگاوەرێك پەیمانی بەخۆی دابوو کە بەردەوام لە ئامادەباشی و جیهادکردندا بێت تا مردن لەو بارەدا پێی دەگات، بەو ئومێدەی خوای گەورە لە تاوانەکانی پێشتری ببورێت..!!

دەبێ ئەو هاوەڵپەرستە سەرسەختە و، ئەو بڕوادارە لەخوا ترسە شەهیدە کێ بێت..؟؟

* * *

ئەو پیاوە سوهەیلی کوڕی عەمرە..

یەکێك لە پیاوماقوڵانی بەناوبانگی قورەیش و، دەستەڵاتدارە زرنگ و خاوەن ڕاوبۆچوونەکانیان.. هەر ئەویش بوو کە لەلایەن قورەیشەوە نێردرایە لای پێغەمبەر تا ڕازی بکات بەوەی کە نەیەتە شاری مەکە لە ساڵی حودەیبیەدا..

ئەوەبوو لە کۆتایی ساڵی شەشەمی کۆچیدا پێغەمبەری خودا و هاوەڵانی لەشاری مەدینەوە بەرەو مەککە کەوتنە ڕێ بە مەبەستی سەردانی ماڵی خوا و، بەجێهێنانی عەمرە-شەڕیان نەدەویست- ئامادە نەبوون بۆ شەڕکردن..

قوڕەیشیەکانیش بە هاتنیانی زانی بەرەو مەککە و، چوویە دەرەوە تا ڕێگایان لێ بگرێت و، بەربەستیان بکات لە هاتن..

هەڵوێستەکە تەنگ و چەڵەمەی تێکەوت و، دەروونەکان تێکچوون..

پێغەمبەر بە هاوەڵانی فەرموو:

((لێم مەگرن گەر قوڕەیشیەکان ئەمڕۆ داوای ڕێگاچارەیەکم لێ بکەن کە تێیدا سیلەی ڕەحم بەجێ بهێنم، ئەوا پێیان دەدەم.))..

قوڕەیشیەکان دەستیان کرد بە ناردنی نوێنەر و نێردراوەکانیان بۆ لای پێغەمبەرﷺ، هەموویانی ئاگادارکرد کە بۆ شەڕ نەهاتووە، بەڵکو بۆ سەردانی ماڵی خوا هاتووە و بەرێزیەکانی مەزن ڕادەگرێت..

هەر کە نوێنەرێك دەگەڕایەوە، قوڕەیشیەکان دوای ئەو نێردراوێکی لێهاتوو بەهێزتر و زیاتر قسەزانیان دەنارد، هەتا عروەی کوڕی مەسعودی سەقەفی یان هەڵبژارد، کە لە لێهاتووترین و لێزانترین کەسیان بوو.. وایان گومان برد قوڕەیشیەکان کە عروە دەتوانێت بڕوا بە پێغەمبەر بکات کە بگەڕێتەوە..

بەڵام زۆر زوو گەڕایەوە بۆ لایان و پێی وتن:

((ئەی کۆمەڵی قوڕەیش..

من چوومە لای کیسرا و، قەیسەر لە موڵکی خۆیدا و، نەجاشی لە موڵکی خۆیدا، بەڵام سوێند بەخوا هیچ پاشایەکم نەدیوە هەرگیز هۆزەکەی وا بە مەزنی بزانن، وەك ئەوەی هاوەڵانی موحەممەد، موحەممەد بە مەزن دەزانن..!!

لە دەوروبەری کەسانێکم بەدی کرد کە هەرگیز بۆ خراپە خۆیان نادەن بەدەستەوە..

ئێوەش لە بۆچوونی خۆتان وردببنەوە))..!!

ئەوکاتە قوڕەیشیەکان تێگەیشتن کە هەوڵەکانیان بێئاکامە، بۆیە بریار[illegible]ا کە پەنا ببەنە بەر دانوستان و پێکهاتن و.. بۆ ئەم کارە گرنگەش لێهاتووترین پیاوما[illegible]ی خۆیان هەڵبژارد... کە سوهەیلی کوڕی عەمر بوو..

* * *

موسڵمانەکان هەر کە سوهەیلیان بینی بەرەو لایان دێت ناسیانەوە، تێگەیشتن کە قوڕەیشیەکان ڕێگای لێکگەیشتن و پێکهاتنیان گرتۆتە بەر، مادام سوهەیلیان لەکۆتاییدا ناردووە..

سوهەیل لە خزمەت پێغەمبەردا دانیشت و، گفتوگۆیەکی درێژ لە نێوانیاندا ئەنجام درا و بە پێکهاتن کۆتایی هات..

سوهەیل هەوڵی دا کە زۆر شت بۆ قورەیشیەکان بەدەست بهێنێت و.. لەمەشدا لێبوردەیی بڵند و چاکی پێغەمبەر لە دانوستان و رێککەوتندا یارمەتیدەری بوو..

ڕۆژگار یەك بەدوای یەکدا گوزەشتن، هەتا ساڵی هەشتەمی کۆچی هات و.. پێغەمبەری خوا و موسڵمانەکان بۆ ڕزگارکردنی مەککە کەوتنە ڕێ پاش ئەوەی قورەیشیەکان پەیمان و بەڵێنەکەی خۆیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا شکاند.

ئەمجا کۆچبەران گەڕانەوە بۆ ئەو نیشتمانەی خۆیان کە دوێنێ بە زۆرەملێ وەدەر نرابوون لێی.. گەڕانەوەو، ئەو ئەنصاریانەشیان لەگەڵدا بوو کە لە شارەکەی خۆیان داڵدەیان دان و ڕێزی زۆریان لێ نان..

تێکڕای ئیسلام گەڕایەوە و، ئاڵای سەرکەوتووەکانی لە ئاسماندا دەشەکایەوە..

شاری مەککەش هەموو دەروازەکانی والا بوو..

هاوەڵپەرستەکانیش حەپەسابوون..

دەبێ ئەمڕۆ ئاکامیان چی بێت، لەکاتێکدا کە پێشتر ئەوان دەسەڵاتی خۆیان لە کوشتن و، وستاندن و، ئەشکەنجەدان و، برسێتی کردنیدا بەکارهێنابوو..؟!

پێغەمبەری بەسۆز لێ نەگەڕا لەژێر چەپۆکی ئەو هەست بە سەرشۆڕیە لەناویەرەدا زۆر بمێننەوە. ئەوەبوو بە لێبوردەیی و نەرم و نیانیەوە پێشوازی لێکردن و، لەکاتێکدا زێیەکانی دەنگی بەسۆزی سۆز و بەزەیی لێ دەباری، پێی فەرموون:

((ئەی قورەیشیەکان..

گومان دەبەن چیتان بەرانبەر ئەنجام بدەم))..؟؟

ئا لێرەدا ڕکابەری دوێنێی ئیسلام، سوهەیلی کوڕی عەمر هاتە پێشەوە و، وەڵامی دایەوە:

((گومانی چاکەت پێدەبەین، برایەکی بەڕێز و، کوڕی برایەکی بەڕێز)).

زەردەخەنەیەکی پرشنگدار لەسەر لێوەکانی خۆشەویستی خوا درەوشایەوەو، پێی فەرموون:

((بڕۆن.. ئێوە ئازادن))..!!

ئەو وشانەی پێغەمبەری سەرکەوتوو هیچ مرۆڤێکی هەست زیندووی نەهێشت وەك خۆی و گۆڕینی بۆ گوێڕایەڵی و شەرمەزاری، بەڵکو پەشیمانی..

لەهەمان کاتدا ئەم هەڵوێستە پڕ لە چاکە و مەزنیە، هەموو هەستی سوهەیلی کوڕی عەمری هێنایە جۆش و موسڵمان بوونی خۆی و بڕوای تەواوی بە پەروەردگاری جیهانیان ڕاگەیاند.

موسڵمان بوونی لەو ساتەدا موسڵمان بوونی پیاوێکی تێکشکاوی خۆ بەدەست دەری ڕوداوەکانەوە نەبوو..

بەڵکو-هەروەکو ئایندەی دەریدەخات دواتر- موسڵمان بوونی پیاوێك بوو کە مەزنی موحەمەد و مەزنی ئەو ئاینەی کە موحەمەد بەپێی ڕێنما و بنەماکانی هەڵس و کەوت دەکات سەرسام و شادمانی کرد و، بەخۆشەویستیەکی زۆرەوە ئالاو بەیداخەکەی هەڵدەگرێت..!!

* * *

ئەو کەسانەی لە ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککەدا موسڵمان بوون ناوی ئازادکراوان(طلقاء)یان لێ نرا.. واتە ئەوانەی کە لێبوردەیی پێغەمبەر لە هاوەڵپەرستیەوە گواستنیەوە بۆ لای ئیسلام، کاتێ پێی فەرموون:

((بڕۆن، ئێوە ئازادن)).

بەڵام یەکێك لەو ئازادکراوانەی بەهۆی دڵسۆزی بەتینیەوە ئەو هێڵەی بەزاند و، بەرەو ئاسۆی دوری قوربانیدان و پەرستش و پاکبوونەوە بەرز بوویەوەو، خستیە ڕیزی پێشەوە لەنێو هاوەڵە پایەبەرزەکانی پێغەمبەری خوادا، سوهەیلی کوڕی عەمر بوو..

* * *

ئیسلام سەرلەنوێ دایڕشتەوە.

هەموو بەهرەکانی پێشتری ڕێکخستنەوەو، زیادی کرد و، پاشان هەموویانی خستە خزمەتی حەق و، چاکە و، باوەڕ..

لەکاتی مردنیدا بەم وشانە لەبارەیەوە دواون و، وتویانە:

((لێبوردن، بەخشندەیی..

زۆر نوێژکردن و، ڕۆژوو، خێرکردن و، خوێندنەوەی قورئان و، گریان لەترسی خوا))..!!

هەر ئەوەش بوو مەزنێتی سوهەیل..

هەرچەندە لە ڕۆژی رزگارکردنی مەککەدا موسڵمان بووبوو، نەك پێشتر، دەبینین زۆر ڕاستگۆیە لە موسڵمان بوون و دڵنیابوونیدا ، بەڕادەیەك کە بەسەر هەموو دەروونی خۆیدا زاڵ دەبێت و، دەگۆڕێت بۆ خواپەرستێکی، دونیا نەویست و، گیان بەختکارێکی تێکۆشەر لەپێناوی خودا و ئیسلامدا.

کاتێك پێغەمبەریش بۆ لای پەروەردگاری باڵادەست گەڕایەوە، هەر کە ئەو هەواڵە گەیشتە مەککە، لەکاتێکدا کە ئەو ساتە سوهەیل لەوێ دادەنیشت، موسڵمانەکانی ئەوێش وەك موسڵمانانی مەدینە ماتەمینی و حەپەسان دایگرتبوون.

خۆ گەر حەپەسانی مەدینە، کە ئەبوبەکر τ ئەو ساتە بەو وشە یەکلاکەرەوەکانی ڕەواندیەوە:

((هەرکەسێك موحەمەدی دەپەرست، ئەوا موحەمەد وەفاتی کرد..

هەرکەسیش خوای دەپەرست، ئەوا خوای گەورە زیندووە و نامرێ))..

سەرمان سوڕدەمێنێت کاتێك دەبینین سوهەیلؓ هەمان هەڵوێستی شاری مەدینەی ئەبوبەکری لەشاری مەککە هەبوو.

هەموو مسوڵمانەکانی کۆکردەوەو، بە وشە پاراوەکانی سەرسامی کردن و، هەواڵی پێدان کە موحەمەد بەڕاستی پێغەمبەری خوا بوو.. ئەمرد هەتا سپاردە و ئەرکی سەرشانی بەجێهێنا و، پەیامەکەی گەیاند، ئەرکی سەرشانی بڕوادارانیش دوای خۆی ئەوەیە کە ڕێبازەکەی ئەو بگرنە بەر..!!

سوهەیل بەم هەڵوێستەی و، بەو وشە تەواو و، بڕوا بەتینەی، ئەو ئاژاوەیەی لادا کە لەوەدابوو بە گەیشتنی هەواڵی وەفاتی پێغەمبەر ئیمان لە دڵی هەندێ کەسی مەککە هەڵبکەنێت..!!

لەو ڕۆژەدا زیاد لەکات و ساتی دیکە پێشبینیەکەی پێغەمبەری خواﷺ درەوشایەوە" ئەوەئەبوو کاتێ کە عومەر مۆڵەتی لێ خواست ڕێگەی بدات ددانەکانی پێشەوەی سوهەیل دەربهێنێت لەکاتێکدا کە لە شەڕی بەدردا دیل کرابوو، بە عومەری فەرموو:

((لێی گەڕێ، لەوانەیە ڕۆژێك دڵخۆشت بکات))..؟!

جا ئا لەو ڕۆژەدا و.. کاتێك هەڵوێستی سوهەیل لە شاری مەککە وتارە سەرسامکارەکەی کە ئیمانی لە دڵدا دەچەسپاند گەیشتە موسڵمانەکان لە مەدینە، عومەری کوڕی خطاب پێشبینیەکەی پێغەمبەری هاتەوە یاد.. زۆر پێکەنی، چونکە ئەو ڕۆژە هات کە ئیسلام سودمەند بێت لە ددانەکانی پێشەوەی سوهەیل کە عومەر دەیویست هەڵیبکێشێت و دەری بهێنێت..!!

* * *

ئەوکاتەی سوهەیل لەڕۆژی ڕزگارکردنی مەککەدا موسڵمان بوو..

پاش ئەوەی چێژی ئیمانی چەشت، بەڵێنێکی دابوو بەخۆی، کە لەو وشانەدا کورتی کردبووەوە:

((سوێند بەخوا! هەر هەڵوێستێکم کە لەگەڵ هاوەڵپەرستاندا نواندبێتم، لەگەڵ موسڵمانەکانیشدا هەڵوێستی وەك ئەوە دەنوێنم و لێی ناگەڕێم.. هەر بەخششێکیش کە لەگەڵ هاوەڵپەرستاندا بەخشیبێتم، هەر دەبێت لەگەڵ موسڵمانەکانیشدا ئەوە ببەخشم.. بەڵکو کارەکانم یەك بسڕنەوە.)).

جا لەگەڵ بێباوەڕاندا زۆر لە بەرانبەر بتەکانیاندا وەستابوو..

دەبا ئێستاش زۆر و زۆر لەگەڵ باوەڕداراندا لەبەردەم خوای تاك و تەنهادا بوەستێت.

بەم شێوەیەوە دەستی دایە نوێژکردن.. نوێژی دەکرد..

ڕۆژووی دەگرت و.. پاشان بەڕۆژوو دەبوو..

هەر پەرستشێك مایەی بەرزرکردنەوەی گیان و، نزیکبوونەوەی بوایە لە پەروەردگاری بالادەستی لێی نەدەگەڕا و بەشێکی زۆری لێ دەبرد..

دوێنێشی لەگەڵ بێباوەڕەکاندا هەروا بوو لە شوێنی دژایەتیکردن و شەڕکردن بەرانبەر ئیسلام.. دەبا ئێستاش وەك جەنگاوەرێکی ئازا، شوێنی خۆی لەنێو سوپای ئیسلامدا بگرێت و، لەگەڵ کەتیبەکانی حەقدا ئاگری فارسەکان خامۆش بکات کە لەبری خوا دەیپەرستن و، سەرئەنجامی ئەو گەلانەی پێ دەسوتێنن کە بەسەریاندا زاڵن و، هەروەها با لەگەڵ کەتیبەکانی حەقدا تاریکی و ستەمکاری ڕۆمەکان ڕابماڵێت و.. پەیامی یەکخوناسی و تەقوا لە هەموو جێگایەك بلاو بکاتەوە..

بەم شێوەیە لەگەڵ سوپای موسڵمانەکاندا بەرەو شام کەوتە ڕێ، تا بەشداری جەنگەکانیان بکات.

لە ڕۆژی یەرموکدا کە موسڵمانەکان شەڕێکیان ئەنجام دا کە لەوپەڕی توندوتیژی و ترسناکی و مەترسیدا بوو.

سوهەیلی کوڕی عەمر وەخت بوو لە خۆشیاندا باڵ بگرێت، لەکاتێدا کە ئەو دەرفەتە چەورەی دەست کەوت تا لەم ڕۆژە نارەحەتەدا ئەوەی لە توانایدایە ئەنجامی بدات و هەنگاو و هەڵەکانی سەردەمی نەفامی و بێباوەڕی خۆی پێ بسڕێتەوە..

* * *

مەککەی نیشتمانی بەجۆرێ خۆش دەویست خۆی لەبیر بردبووەوە..

لەگەڵ ئەوەشدا، لەپاش سەرکەوتنی موسڵمانەکان لە شام نەگەڕایەوە بۆی و، وتی:

((گوێم لە پێغەمبەری خوا بووﷺ دەیفەرموو: مانەوەی هەرکەسێکتان یەك سەعات لە پێناوی خوادا، چاکترە بۆی لە کاروکردەوەی هەموو تەمەنی..

منیش هەتا مردن لە ئامادەباشیدام لەپێناوی خوادا و، ناگەڕێمەوە بۆ مەککە))..!!

* * *

سوهەیل ئەمەکدار بوو بەرامبەر پەیمانەکەی و..

پاشماوەی ژیانی لە ئامادەباشیدا بەسەر برد، هەتا وادەی کۆچکردنی هات و، گیانی بەخێرایی بەرەو لای سۆز و ڕەزامەندی خوای گەورە لە شەقەی باڵیدا.

٥٧

ئەبو موسای ئەشعەری

دڵسۆزیی .. ئیدی چی دەبێت بابێت

کاتێك ئەمیری باوەڕداران (عومەری کوڕی خطاب) ناردی بۆ (بەصرە)، تا ببێتە ئەمیر و والی لەوێ، خەڵکەکەی کۆکردنەوە و وتارێکی بۆ دان و پێی ڕاگەیاندن:

((ئەمیری بڕواداران (عومەر) ناردوومی بۆ لای ئێوە، تا پەڕاوی پەروەردگار و، ڕێ وشوێنی پێغەمبەرتان فێر بکەم و، ڕێگاتان بۆ پاك بکەمەوە)..!!

خەڵکەکە بە تەواوی سەرسام و حەپەسان، چونکە تێدەگەن کە ڕۆشنبیرکردنی خەڵکی و تێگەیاندنیان لە ئاینەکەیان چۆن ئەرکێکە لە ئەرکەکانی سەر شانی فەرمانڕەوا و ئەمیر، بەڵام پاککردنەوەی ڕێگاکان لە ئەرکەکانی سەرشانی بێت، ئەمە شتێکی نوێ بوو لایان، بگرە سەیر و سەرسوڕهێنەریش بوو..

جا دەبێ ئەو والییە کێ بێت کە حەسەنؒ لەبارەیەوە وتویەتی:

(هیچ سوارێك نەهاتۆتە بەسرە لەو چاکتر بێت بۆ خەڵکەکەی)..؟؟

* * *

ئەو پیاوە (عبداللهی کوڕی قیس)ی ناسراو بە (ئەبوموسای ئەشعەری)یە..

هەر کە هەواڵی دەرکەوتنی پێغەمبەرێکی بیست لە شاری مەککە کە بانگەشە بۆ یەکخواناسی دەکات، بەرچاوڕوونانە بانگی خەڵکی دەکات بۆ لای خوا و، فەرمان بە خوڕەوشتی جوان دەکات، دەست بەجێ (یەمەن)ی وڵات و نیشتمانی بەجێهێشت و بەرەو ئەوێ کەوتە ڕێ..

لە (مەککە)ش، لەخزمەتی پێغەمبەری خواداﷺ دانیشت و ڕێنموونی و دڵنیایی لەوەرگرت..

ئەمجا بە پەیامی خوداوە گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی، پاشان گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەرﷺ پاش لێبوونەوەی لە رزگارکردنی (خەیبەر).

گەڕانەوەی لەگەڵ هاتنەوەی (جەعفەری کوڕی ئەبوتالب)د-ا یەکی گرتەوە کە لە حەبەشەوە لەگەڵ هاوەڵانی حەبەشەیدا گەڕابوونەوە و، پێغەمبەر بەشی هەموویانی دانا..

ئەمجارەیان (ئەبوموسا) بەتەنها نەهاتەوە، بەڵکو پەنجا و چەند پیاوێکی خەڵکی (یەمەن)ی لەگەڵدا بوو کە ئاشنای ئیسلامی کردبوون، لەگەڵ دوو برای خۆیدا کە ناویان (ئەبوروهم) و، (ئەبوبوردە) بوو..

جا پێغەمبەر ئەو شاندەی ناونا.. بەڵکو هەموو هۆزەکەیانی ناونا (ئەشعەریەکان).. پێغەمبەر بە دڵنەرمترین کەس ناوی بردن.

زۆرجاریش وەك نمونەی بەرز بۆ هاوەڵانی باسی دەكرد و، لەبارەیانەوە دەیفەرموو:

((ئەشعەرییەكان ئەگەر پیاوێكیان لەشەڕدا لێبكوژرێت، یان خۆراكیان لا كەم بێتەوە، هەموو ئەوەی كە لە دەستیاندایە لە كاڵایەكدا كۆیدەكەنەوە و، پاشان بە یەكسانی دابەشیان دەكرد.. جا ئەوان لە من و.. منیش لەوانم)).. ! !

* * *

لەو ڕۆژەوە ئەبوموسا جێگای هەمیشەیی بڵندی خۆی لەنێو موسڵمانان و بڕواداراندا گرت، ئەو موسڵمانانەی كە دانرا بۆیان هاوەڵ و قوتابی پێغەمبەری خواﷺ بن و، هەڵگری پەیامی ئیسلام بن بۆ دونیا لە تێكڕای سەردەم و ڕۆژگارەكانیدا..

* * *

ئەبوموسا ئاوێتەیەكی سەیری ئاكارە مەزنەكان بوو..

ئەو جەنگاوەرێكی چاونەترس و، تێكۆشەرێكی خۆڕاگر بوو، ئەگەر ناچار بكرایە بۆ شەڕكردن..

لەهەمان كاتدا كەسێكی بێزیان و، چاك و، ڕووخۆش بوو، تا ئەوپەڕی چاكەمەندی و، ڕووخۆشی.. ! !

شارەزا و، دانا و ژیر و، زیرەك بوو، دەیزانی چۆن بیروبۆچوونی ئاراستەی كاروبارە داخراوەكان بكات و، لە فتواندان و قازیەتیشدا دەدرەوشایەوە، هەتا لەبارەیەوە وتراوە:

((دادوەر و قازیەكانی ئەم ئوممەتە چوار كەسن:

عومەر و، عەلی و، ئەبوموسا و، زەیدی كوڕی سابیت)).. ! !

پاشان ئەو لەگەڵ ئەمەشدا، خاوەنی فیترەتێكی بێخەوش بوو، هەركەس ناوی خوای بهێنایە بۆ فێڵ لێكردنی، هەڵدەخەڵەتا بۆی.. ! !

پشتیوانی و خۆشەویستییەكی مەزنی بەرانبەر بەرپرسیارێتی سەرشانی هەبوو..

زۆر متمانەیشی بە خەڵكی هەبوو..

گەر بمانەوێت لە واقیعی ژیانی دروشمێك هەڵبژێرین، ئەوا ئەم دەستەواژەیە دەبوو:

(دڵسۆزی.. ئیدی چی دەبێت با ببێت)...

لەكاتی جیهادكردندا، ئەبوموسای ئەشعەری بە ئازایەتیەكی بەرزەوە بەرپرسیارێتی سەرشانی دەگرتە ئەستۆ، هەر ئەوەش بوو وایكردبوو پێغەمبەری خواﷺ لەبارەیەوە بفەرموێت:

(ئەبوموسا گەورەی سوارچاكانە).. ! !

خۆیشی وێنەیەكی ژیانی خۆیمان وەك جەنگاوەرێك بۆ باس دەكات و، دەڵێت:

(لەخزمەت پێغەمبەری خوادا بۆ جەنگێک کەوتینە ڕێ، قاچمان تێیدا ئاوسا و، هەردوو قاچی منیش ئاوسا و، نینۆکەکانم هەڵوەرین، هەتا بە پەڕۆی شڕ قاچمان پێچایەوە)..!!

باشێتی و دەروون سافیەکەی وایان لێ نەکردبوو دوژمن بتوانێت لە جەنگدا فریوی بدات..

هەر بۆیە لە پێگەی ئاوەهادا کاروبارەکانی بەڕوونیەکی تەواوەوە بەدی دەکرد و بە عەزمێکی دڵنیاشەوە یەکلای دەکردەوە..

ئەوەبوو ئەوکاتەی موسڵمانەکان وڵاتی فارسیان ڕزگار دەکرد، ڕوویدا کە ئەبوموسای ئەشعەری بە سوپاکەیەوە دای بەسەر ئەسبەهاندا کە لەگەڵی پێکهاتبوون سەرانە بدەن و ئەویش لەگەڵیان پێکهاتبوو..

بەڵام ئەوان ڕاستگۆ نەبوون لەو پێکهاتنەیاندا.. بەڵکو ویستیان دەرفەتی خۆئامادەکردن بسازێنن بۆ لێدانێکی چاوەڕوان نەکراو..

بەڵام زرنگی ئەبوموسا کە لەکاتی پێویستیدا ون نابێت، بۆنی ئەو کارەی کرد کە ئەوان سەرقاڵی بوون.. کاتێ ویستیان لێیان بدەن، سەرکردە بێئاگا نەبوو، ئا لێرەدا لەگەڵیان جەنگا و نەگەیشتە نیوەڕۆ سەرکەوتنێکی بێوێنەی بەسەریاندا بەدەست هێنا..!!

* * *

لەو جەنگانەشدا کە موسڵمانەکان لەدژی ئیمپراتۆیەتی فارس ئەنجامیان دا، تاقیکردنەوەی مەزن و جیهادی بەڕێزی ئەبوموسای ئەشعەری بوو آ بەتایبەت لە شەڕی (توستەر)دا، کاتێك هورمزان بە سوپاکەیەوە کشایەوە بۆی، تێیدا خۆی قایم کرد و سوپایەکی بەشوماری تێدا کۆکردەوە، ئەبوموسا پاڵەوانی ئەو جەنگە بوو..

ئەمیری بڕواداران (عومەر) لەو ڕۆژەدا ژمارەیەکی زۆر لە موسڵمانانی بۆ کۆمەکی نارد، لە سەرووی هەموویانەوە (عەمماری کوڕی یاسر) و (بەرائی کوڕی مالك) و (ئەنەسی کوڕی مالیك) و ( مەجزەئەتی بکری) و (سەلەمەی کوڕی ڕەجاو)..

جا هەردوو سوپا بەیەك گەیشتن..

سوپای موسڵمانان بە سەرکردایەتی ئەبوموسا و.. سوپای فارسەکانیش بە سەرۆکایەتی هورمزان لە جەنگێکدا کە لە توندوتیژترین شەڕ بوو لە گەرمی و بەهێزیدا..

فارسەکان کشانەوە بۆ ناو شاری (توستەر)ی شورەدار.

موسڵمانەکانیش ڕۆژانێکی زۆر ئابڵۆقەیان دان، هەتا ئەبوموسا عەقڵ و تەڵەکەی خۆی خستە گەڕ..

جا هات و دووسەد سوارچاکی لەگەڵ بەکرێگیراوێکی فارسدا نارد و، ئەبوموسا هەڵیخەڵەتاندن تا فێڵیان لێ بکات هەتا دەروازەی شارەکە دەکاتەوە، لەبەردەم ئەو دەستە پێشڕەوەی کە بۆ ئەم کارە هەڵبژێردرابوون..

هەر کە دەروازەکە والآ بوو، سەربازانی پێشڕەو دايان بەسەر قەلآدا هەتا ئەبوموسا بە سوپاکەيەوە تێکی شکاندن..

جا لە چەند سەعاتێکدا توانی دەست بگرێت بەسەر پێگەيەکی مەترسيداردا و، سەرکردەی فارسەکان خۆی دا بەدەستەوە و، ئەبوموساش ناردی بۆ شاری مەدينە تا ئەميری باوەڕداران لەبارەيانەوە بڕيار بدات..

* * *

سەرەڕای ئەوەش ئەم جەنگاوەرە زۆر بەهێزە، گوڕەپانی شەڕی چۆڵ نەدەکرد هەتا دەگۆڕا بۆ تەوبەکارێکی چاوبەفرمێسکی بێگەردی وەك چۆلەکە..!

بە دەنگێك قورئانی دەخوێند هەرکەس گوێی لێبوايە لەناخەوە دەهەژا.. هەتا پێغەمبەر لەبارەيەوە فەرمويەتی:

((ئەبوموسا لەرينەوەيەکی دەنگی لە لەرينەوەکانی دەنگ خۆشی ئالی داودی پێدراوە))..!

عومەريش‌ τ هەرکە چاوی پێی بکەوتايە، بانگی دەکرد تا قورئانی پيرۆزی بۆ بخوێنێت، پێی دەوت:

((پەرۆشی لای پەروەردگارمان بکە ئەی ئەبوموسا))..

هەروەها بەس لە دژی سوپای بێباوەڕان بەشداری جەنگی دەکرد، ئەو سوپايانەی کە لەدژی ئاين دەجەنگان و مەبەستيان بوو ڕۆشنايی خوا خامۆش بکەن..

ئەو کاتەيشی شەڕ لەنێوان موسڵمانانندا ببوايە، هەڵدەهات لێی و هيچ ڕۆڵێکی نەبوو تێيدا.

لە ململانێی نێوان ئيمامی عەلی و موعاويەشدا ئەو هەڵوێستە ڕوون و ديار بوو، لەو شەڕەشدا کە لەنێوان موسڵمانانندا لەو کاتەدا بەرپابوو.

لەوانەيە ئەم خاڵەی باسەکەمان بمانگەيەنێتە بەناوبانگترين هەڵوێستی ژيانی، کە ئەويش هەڵوێستيەتی لە دادوەرێکردنی نێوان ئيمامی عەلی و موعاويەدا.

ئەو هەڵوێستەی کە زۆرجار بە نيشانە و شايەتی لەسەر زيادەڕەوی ئەبوموسا لەچاکەدا دەهێنرێتەوە بەجۆرێك کە هەڵخەڵەتاندن ئاسان بێت.

لەکاتێکدا کە ئەم هەڵوێستەی وەك دەبينين، سەرەڕای ئەوەی کە لەوانەيە پەلە و هەڵەی تێدابێت، بەڵکو مەزنی ئەم هاوەڵە پايەبەرزە دەردەخات، مەزنی دەروون و، مەزنی بڕوای بە حەق و، بە خەڵکی..

بيروبۆچوونی ئەبوموسا لەکاری دادوەرێکردنەکەدا خۆی لەوەدا دەبينێتەوە کە موسڵمانانی بينی يەکديان دەکوشت، هەر دەستەيەك دەمارگيری بۆ پێشەوا و فەرمانڕەواکەی تێدايە.. هەروەها بينی هەڵوێستی نێوان شەڕکاران لە پەرەسەندن و کاتی پاکتاوکردنيدا گەياندۆتە ئەو ئاستەی کە داهاتووی هەموو ئوممەتی ئيسلام لە لێواری تياچووندا بێت..

دەڵێین: بیروبۆچوونی ئەو لە کاتێکدا کە بارودۆخ لە خراپیدا گەیشتبووە ئەو ئاستە، لە گۆڕینی هەموو بارودۆخەکە و سەرلەنوێ دەست پێکردنەوەدا خۆی دەبینیەوە.

ئەو شەڕە نێوخۆییە کە ئەو ڕۆژگارە بەرپا بوو، لەنێوان دوو دەستەی موسڵماناندا بوو کە ململانێیان بوو لەسەر کەسی فەرمانڕەوا، دەبا ئیمامی عەلی بەشێوەیەکی کاتی دەستی لە خەلیفایەتی هەڵگرێت و، معاویەش دەست بەرداری بێت، بەو مەرجەی هەموو کاروبارەکە سەرلەنوێ بگەڕێنرێتەوە بۆ موسڵمانەکان تاوەکو بە ڕێگەی ڕاوێژ ئەو خەلیفەیەی دەیانەوێت هەڵبژێرن..

ئەبوموسا بەم شێوەیە لەبارەی ڕەوشەکەوە گفتوگۆی کرد و، چارەسەریشی بۆی بەو جۆرە بوو.

ڕاستە کە ئیمامی عەلی پەیمانێکی ڕاست و دروستی خەلیفایەتی پێدرابوو.

ڕاستە کە هەموو هەڵگەڕانەوەیەکی ناڕەوا نابێت کە دەرفەتی پێبدرێت حەقێکی ڕەوا بخات.

بەڵام کاروبارەکانی ململانێی نێوان ئیمامی عەلی و موعاویە و، نێوان خەڵکی عێراق و خەڵکی شام-بەبۆچوونی ئەبوموسا- گەیشتبووە ئەو ئاستەی کە جۆرێکی نوێ لە بیرکردنەوە و چارەسازی بسەپێنێت.. چونکە سەرپێچیکردنی موعاویە، تەنها سەرپێچیکردن نەبوو بەس.. هەڵگەڕانەوەی خەڵکی شامیش تەنها هەڵگەڕانەوە نەبوو.. جیاڕاییەکەش هەموو تەنها جیاوازی بۆچوون یان هەڵبژاردن نەبوو..

بەڵکو هەموو ئەوانە گۆڕابوو بۆ شەڕێکی نێوخۆی خوێناوی کە تێیدا هەزارەها کەس لە هەردوولا کوژرا و.. هەتا ئێستاش هەڕەشەی خراپترین ئاکام بۆ سەر ئیسلام و موسڵمانان دەکات.

جا لابردنی هۆکانی ململانێ و شەڕ و، وەلانانی لایەنەکانی، بۆ نمونە لە بیروبۆچوونی ئەبوموسادا خاڵی سەرەتای ڕێگای دەربازبوون بوو..

بیروبۆچوونی ئیمامی عەلیش لە کاتێکدا کە بەکاری دادوەری کردنەکە ڕازی بوو ئەوەبوو کە عبداللە ی کوڕی عەباس یان هەر هاوەڵێکی دیکە نوێنەری لای ئەم بێت، بەڵام دەستەیەکی گەورە لە خاوەن هێزەکانی کۆمەڵ و سوپاکەی ئەبوموسای ئەشعەرییان سەپاند بەسەریدا.

بیانووشیان لە دیاریکردنی ئەبوموسادا ئەوەبوو کە ئەو هیچ کاتێ بەشداری نەکردبوو لە ململانێی نێوان ئیمامی عەلی و موعاویە لەو ساتەوەی دەستی پێکرد بوو بەڵکو لەهەردوو لا دوورکەوتەوە پاش ئەوە بێئومێد بوو لەسەر لێکگەیشتن و پێکهاتن و دەست لەشەڕ هەڵگرتنیان. جا بەم هۆیەوە ڕەواترین کەسە بۆ دادوەری..

نە لە ئاینی ئەبوموسا و، نە لە دڵسۆزی و ڕاستگۆییەکەیدا شتێ نەبوو ئیمام بخاتە دوودڵیەوە.. بەڵام ئەو لە مەبەستی لایەنی بەرانبەر تێگەیشتبوو، دەیزانی چەندە پشتیان بە

فێڵ و تەڵەکە دەبەستن، ئەبوموساش سەرەڕای تێگەیشتن و شارەزایی ڕقی لە هەڵخەڵەتاندن و فێڵ بوو، پێشی خۆش بوو ڕاستگۆیانە هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکیدا بکات، نەك بە زیرەکیەکەی، لێرەوە ئیمامی عەلی مەترسی ئەوەی هەبوو کە لایەنی بەرانبەر فریوی بدەن و داوەریکردنەکە بگوڕێت بۆ ئەملا و ئەولا پێکردن و، بەوەش کارەکە خراپتر بێت..

* * *

دادوەریکردنی لەنێوان هەردوو کۆمەڵدا دەستی پێکرد..

ئەبوموسای ئەشعەری نوێنەری بەرەی ئیمامی عەلی بوو.

عەمری کوڕی عاصیش نوێنەری لایەنی موعاویە بوو.

لەڕاستیشدا عـەمر پـشتی بـە زیرەکـی زۆر و فـرت و فێڵـی فراوانـی خـۆی بەسـتبوو بـۆ بەدەستهێنانی کارەکە بۆ موعاویە.

دانیشتنی نێوان هەردووکیان بە پێشنیارێکی ئەبوموسا دەستی پێکرد، کە ئەوەبوو کە هەردوو داوەر پێك بێن لەسەر پاڵاوتنی عبداللەی کوڕی عومەر، بگرە هەر داشی بنێن بە خەلیفەی موسڵمانان، ئەمەش بەهۆی ئەو یەکدەنگیە جوانەی هەبوو لەسەر خۆشەویستی و ڕێز و پایەداری.

عـەمری کـوڕی عـاص لـەم ڕووەوە دەرفـەتێکی باشـی لـە ئەبوموساوە دەست کـەوت و قۆستیەوە..

کرۆکـی پێـشنیارەکەی ئەبوموسـا ئـەوەبوو کـە پەیوەنـدی نیـە بـەو لایەنـەی کـە ئـەم نوێنەریەتی کە لایەنی ئیمامی عەلی بوو.

بەو واتایەش کە ئەو ئامادەیە خەلیفایەتی بداتە کەسانێکی دیکـە لـە هـاوەڵانی پێغەمبـەر، بەڵگەی ئەمەش پێشنیارکردنی عبداللە ی کوڕی عومەرە.

بەمجۆرە عەمر بەهۆی لێزانیە زۆرەکەیەوە کـەلێنێکی فراوانـی دەستکەوت بـۆ بـەدیهێنانی مەبەستەکەی و، ئەوەبوو معاویەی پێشنیارکرد.. پاشان عبداللە ی کوڕی عەمری پێشنیار کرد کە کوڕی خۆی بوو، خاوەنی جێگایەکی مەزن بوو لەنێوان هاوەڵانی پێغەمبەرداﷺ.

بەرانبەر لێزانی عەمر زیرەکیەکـەی ئەبوموسـا وەلانـەنابوو، ئـەوەبوو هـەر کـە بینـی عـەمر بنـەمای پـاڵاوتنی کردۆتـە چوارچـێوەی قـسەکردن و داوەری هـەتا جڵـەوی بـەرەو لایـەکی سـەلامەت ببـات، ڕوبـەڕووی عـەمر بوویـەوە بـەوەی کـە هەڵبـژاردنی خەلیفـە مـافی هـەموو موسڵمانانە، خوای گەورەش کاروباری نێوانیانی لەسەر ڕاوێژکردن داناوە، بۆیـە پێویـستە کـە تەنها بۆ ئەوان هەموویان مافی دیاریکردن واز لێ بهێنرێت..

دواتریش دەبینین کە چۆن عەمر ئەو بنەمایە بەرزەی لە بەرژەوەندی موعاویە قۆستەوە..

بەڵام بەر لەوە با گوێ بۆ دەقی ئەو وتووێژە مێژووییە ڕادێرین کە لەنێوان ئەبوموسا و عەمری کوڕی عاصدا لە سەرەتای دانیشتنەکەیاندا ئەنجام درا، لە کتێبی (الأخبار الطوال)ی (ئەبی حەنیفەی دەینەوەری) دەیگوێزینەوە:

ئەبوموسا: ئەی عەمر.. هیچت پێیە مایەی ڕێکبوونی ئوممەت و ڕەزامەندی خوای گەورەی تێدابێت..؟

عەمر: ئەوە چییە..؟

ئەبوموسا: عبدالله ی کوڕی عومەر دابنێین، چونکە ئەو دەستی لە هیچ شتێکی ئەم شەڕە وەرنەداوە.

عەمر: ئەی بۆ موعاویە ناڵێیت..؟

ئەبوموسا: موعاویە گونجاو نیە بۆ ئەمە و شایستە نیە.

عەمر: ئایا نازانیت کە عوسمان بە ستەملێکراوی کوژرا..؟

ئەبوموسا: بەڵێ.. دەزانم..

عەمر: دەسا موعاویە میراتگری خوێنی عوسمانە و، لە بنەماڵەی قورەیشیە وەك دەزانیت. خۆ گەر خەڵکی وتیان بۆچی درا بە کەسێك کە پێشینەی نیە؟ ئەوا لەمەدا بیانوت دەبێ، دەڵێیت: بینیم میراتبەری عوسمانە و، خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿وَمَنْ قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَانًا: هەرکەسێکی بە ناهەق بکوژرێت، دەسەڵاتمان داوەتە دەست خوێنگرەکەی.﴾الاسراو/٣٣. سەرەڕای ئەوەش برای (ئوم حەبیبە)ی خێزانی پێغەمبەرەﷺ و، یەکێکە لە هاوەڵانی.

ئەبوموسا: ترسی خوات هەبێت ئەی عەمر..

ئەوەی باست کرد لەبارەی ڕێز و پایەی موعایە و، خۆ گەر خەلافەت بەهۆی پلە و ڕێزەوە وەربگیرایە ئەوا (ئەبرەهەی کوڕی صەباح) ڕەواترین کەس بوو پێی، چونکە لە نەوەی پادشا یەك لەدوای یەکەکانی یەمەن بوو کە دەستەڵاتیان بەسەر ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەویدا هەبوو. پاشان موعاویە چ ڕێزێکی هەیە لەبەرانبەر عەلی کوڕی ابوطالب..؟؟

ئەوەش کە دەڵێیت: موعاویە میراتگری عوسمانە، ئەوا عەمری کوڕی عوسمان لەپێشترە بۆی..

بەڵام گەر گوێڕایەڵم بیت ڕێوشوێنی عومەری کوڕی خطاب و یادی ئەو زیندوو دەکەینەوە بەوەی کە عبدالله ی دانای کوڕیمان دابنایە..

عەمر: ئەی چی ڕێگرتە بەرانبەر عبدالله ی کوڕم لەگەڵ ئەو هەموو باشێتی و گونجاوی و زووکۆچکردن و هاوەڵێتیەی..؟

ئەبوموسا: کوڕەکەت پیاوی ڕاستیە، بەڵام تۆ لەو شەڕانەت وەرداوە، هەستە با بیدەینە دەست باشی کوڕی باش.. عبدالله ی کوڕی عومەر.

عەمر: ئەی ئەبوموسا، تەنها پیاوێك شایستەی ئەم کارەیە کە دوو کەڵبەی هەبێت بە یەکێکیان بخوات و، بەوی دیکەشیان نان بدات..

ئەبوموسا: تیاچوون بۆتۆ عەمر.. موسڵمانان کاروباری خۆیان پاش شمشێر نانە سەرملی یەکتر و، بەڕم لێکدان، داوەتە دەست ئێمە، دەبا نەیانگێڕینەوە بۆ ناو ئاشوب.

عەمر: ئەی چی بەچاك دەزانیت تۆ..؟

ئەبوموسا: وای دەبینم کە هەردووکیان –عەلی و موعاویە– لابدەین و پاشتر بیکەین بەڕاوێژ لەنێوان موسڵماناندا، تا کێیان خۆشویست هەڵیبژێرن..

عەمر: بەم بۆچوونەت ڕازیم و چاکی دەروونی تێدایە..

ئەم وتوێژە شێوەی ئەو وێنەیە دەگۆڕێت کە لەسەری ڕاهاتووین ئەبوموسای ئەشعەری تێدا بەدی بکەین، هەرکاتێ باسی ڕووداوی دادوەری کردنمان کرد.

ئەبوموسا زۆر دوور بوو لە بێئاگایی..

بگرە لەم وتوێژەیدا زیرەکی ئەو زیاد لە زیرەکی عەمری کوڕی عاصی ناسراو بە زیرەکی و لێزانی لەکاردا بوو..

ئەوەبوو کاتێك عەمر ویستی ئەبوموسا بە خەلیفایەتی موعاویە ڕازی بێت بەو بیانوەی کە بە ڕەچەڵەك قورەیشیە و، میراتبەری خوێنی عوسمان، وەڵامی ئەبوموسا یەکلاکەرەوەو درەوشاوە بوو وەك تیژی شمشێر..!

– گەر خەلافەت بەهۆی بە پلە و ڕێز بێت ئەوا (ئەبرەهەی کوڕی صەباح) لە موعاویە لەپێشترە.

– خۆ گەر بە میراتبەری خوێنی عوسمان و بەرگریکردن لە مافییشی بێت، ئەوا کوڕەکەی عوسمانτ لە موعاویە لەپێشترە بۆ وەرگرتنی.

* * *

لەپاش ئەم وتوێژە ڕەوشی داوەریکردن کەوتە سەر ڕێڕەوێك کە بە بەرپرسیارێتیەکەی تەنها لەسەر شانی (عەمری کوڕی عاص)ە و بەس..

ئەبوموسا ئەرکی سەرشاتی بەجێگەیاند و کارەکەی گەڕاندەوە بۆ دەستی خەڵکی تا قسەی خۆیان بکەن و خەلیفەی خۆیان هەڵبژێرن..

عەمریش ڕەزامەندی لەسەر دەربڕی و پابەند بوو بەو بۆچوونەوە..

نەدەهات بە خەیاڵی ئەبوموسادا کە عەمر لەو هەڵوێستەدا کە هەڕەشەیە بۆ سەر ئیسلام و موسڵمانان بە خراپترین کارەسات، پەنا دەباتە بەر فرت و فێڵ، بڕوا و متمانەی هەرچەند بێت بە موعاویە..

لەم ڕووەوە ئیبن عەباس ئەبوموسای ئاگادارکردەوە لە فرت و فێڵی عەمر کاتێ کە گەڕایەوە و هەواڵی پێکهاتنەکەی پێدان، ئەوەبوو پێی وت:

((سوێند بەخوا دەترسم عەمر فریوی دابێت، خۆ گەر لەسەر هەر شتێك پێکهاتوون ئەوا پێشی بخە با ئەو پێشتر قسە بکات، پاشان تۆ لەدوای ئەو قسە بکە)).. !

بەڵام ئەبوموسا هەڵوێستەکەی بەرز و پایەدارتر لەوە دەهاتە پێش چاوی کە عەمر فرت و فێڵی تێدابکات.. پاشان هیچ گومان و دوودڵییەکی نەبوو لە پابەندبوونی عەمر بەوەی کە لەسەری پێکهاتوون.

بۆ ڕۆژی دوایی کۆبوونەوە.. ئەبوموسا نوێنەرایەتی بەرەی ئیمامی عەلی دەکرد و عەمری کوڕی عاصیش نوێنەری بەرەی موعاویە بوو..

ئەبوموسا، عەمری بانگ کرد تا قسە بکات.. بەڵام عەمر ڕازی نەبوو، وتی:

((هەرگیز پێشی تۆ ناکەوم لەکاتێکدا کە لەمن باشتری و.. پێشتر کۆچت کردووەو.. لەمن بەتەمەنتری)).. !

ئەمجا ئەبوموسا هاتە پێشەوەو ڕووکردە ئەو خەڵکە زۆرەی هەردوو لا کە کۆبووبوونەوەو.. وتی:

((ئەی خەڵکینە.. ئێمە ڕاماین لەوەی کە خوای گەورە خۆشەویستی ئەم ئوممەتەی پێ دەگێڕێتەوەو کاروباری دەسازێنێت، هیچ شتێکمان بەدی نەکرد باشتر بێت لە لادانی ئەم دووپیاوە–عەلی و موعاویە– و بیکەینە ڕاوێژ تا خەڵکی کێ بە شیاو دەزانن بۆ خۆیان هەڵبژێرن.. ئەوا من عەلی و موعاویەم لادا.. دە ئێوەش سەرنج لە کاروبارتان بدەن و کێتان خۆش دەوێت دایبنێن))..

ئەمجا ڕۆڵی عەمری کوڕی عاص هات، تا لادانی موعاویە ڕابگەیەنێت، هەروەك چۆن ئەبوموسا ئیمامی عەلی لادا.. بە مەبەستی بەجێهێنانی ئەو پێکهاتنە مۆرکراوەی دوێنێ.

عەمر چوویە سەر دوانگە و وتی:

((ئەی خەڵکینە.. ئەبوموسا ئەوەی گوێبیستی بوون وتی و، هاوەڵەکەی لەسەرکار خست..

ئەوا منیش هاوەڵەکەی ئەوم لەکارخست وەك ئەو لەسەر کاری لادا و، لەجێگەیدا هاوەڵەکەم موعاویەم دانا، چونکە ئەو وەلی ئەمیری باوەڕداران عوسمانە و داواکاری خوێنەکەیەتی و ڕەواترین کەسە بۆ جێگاکەی..))!

ئەبوموسا بەرگەی ئەو ڕووداوە لەناکاوەی نەگرت و، چەند وشەیەکی توڕەو توندی بە عەمر وت و..

سەرلەنوێ گەڕایەوە بۆ گۆشەگیرییەکەی و، هەنگاوەکانی بەرەو مەککە گرتە بەر و.. لە پەنای ماڵێ خوادا، پاشماوەی ژیان و تەمەنی بەسەر ببات..

* * *

ئەبوموسا جێگای متمانە و خۆشەویستی پێغەمبەر و، جێگای متمانە و خۆشەویستی خەلیفەکانی راشیدین و هاوەڵان بوو.. لەکاتی ژیانیدا پێغەمبەرﷺ لەگەڵ (مەعاذی کوڕی جەبەل)دا کردنیە والی یەمەن..

پاش وەفاتی پێغەمبەریش گەڕایەوە بۆ مەدینە تا بەرپرسیارێتیەکانی لەو تێکۆشانە گەورەیەدا بگرێتە ئەستۆ کە سوپای موسڵمانان لەدژی فارس و ڕۆم ئەنجامی دەدا..

لە سەردەمی عومەریشدا ئەمیری باوەڕداران کردبوویە والی شاری بەصرە.. عوسمانی کوڕی عەففانیش کردی بە والی کوفە..

* * *

بەڕاستیش لە پێڕی قورئان بوو، بە لەبەرکردن و، تێگەیشتن و، کارپێکردن..

لە وتە پرشنگدارەکانیشی دەربارەی قورئان:

((شوێنی قورئان بکەون..

چاوتان لەوە نەبێت کە قورئان شوێنتان بکەوێت))..!

هەروەها لە پێڕی پەرستشکارانی بەردەوام بوو..

لە ڕۆژە گەرمەکاندا کە وەخت بوو تینی گەرماکە هەناسەی دەبڕی، ئەبوموسات بەدی دەکرد بە پەرۆشەوە پێی دەگەیشت تا بەڕۆژوو بێت تێیدا و، دەیوت:

((بەڵکو گەرمای نیوەڕۆ ببێتە ئاودێرمان لە ڕۆژی قیامەتدا))..

* * *

لەڕۆژێکی شێداردا ئاکامی هات..

درەوشانەوەیەك ڕوخساری داپۆشی وەك کەسێ کە داوای بەزەیی خوا و پاداشتی چاکەی لێ بکات..

ئەو وشانەیش کە هەمیشە و بەدرێژایی ژیانی باوەڕدارانەی دەیوتەوە، ئێستا زمانی لە کاتێکدا کە لە چرکەساتەکانی ماڵئاواییدایە دەیڵێتەوە..

ئەوەیش ئەوەبوو:

((اللهم أنت السلام..

ومنك السلام))..

لەخاکی (دەوس) لەنێو خانەوادەیەکی بەڕێزدا گەورەبوو..

خاوەنی بەهرەی شیعر بووە و، لەنێو هۆزەکاندا دەنگ و باس و ناوبانگی بڵاوبووبووەوە.. لە وەرزەکانی (عوکاظ)دا، کاتێ شاعیرانی عەرەب لە هەموو لایەکەوە دەهاتن و، خەڵکی کۆدەبوونەوەو قەرەباڵغ دەبوو، خۆیان بە شاعیرانەکانیانەوە هەڵدەنا، (طوفەیل) جێگای پێشەوەی بۆ خۆی دەستەبەر دەکرد..

زۆرجاریش جگە لە وەرزی (عوکاظ) دەهاتە شاری مەککە..

جارێکیان لەکاتی سەردانی مەککەیدا بوو، پێغەمبەری خواﷺ بانگەوازی خۆی ئاشکرا کردبوو.. قورەیشیەکان مەترسی ئەوەیان هەبوو کە (طوفەیل) پێی بگات و موسڵمان ببێت، پاشان بەهرەی شاعیری خۆی بخاتە خزمەتی ئیسلام، ئەو کاتە دەبێتە بەڵای ناگەهان بەسەر قورەیش و بتەکانیانەوە..

لەبەر ئەوە دەوریان دا و.. هەموو پێداویستیەکی ڕابواردن و شادی و خۆشگوزەرانیان بۆ میواندارێتی ئامادەکرد، پاشان دەستیان دایە بەئاگامێنانەوە لە دیداری پێغەمبەری خواﷺ و، پێیان دەوت:

((قسەی ئەو وەك جادووە، کوڕ و باوك و، پیاو و براکەی و، پیاو و ژن لە یەکدی جودا دەکاتەوە، ئێمەش مەترسی تۆ و هۆزەکەتمان لێنیشتووە، بۆیە لەگەڵی مەدوێ و گوێی لێ ڕامەگرە))..!!

دەبا گوێ لە (طوفەیل) خۆی ڕاگرین تا پاشماوەی باسەکەمان بۆ تەواو بکات، دەڵێت:

((سوێند بەخوا هێندەیان لەگەڵ وتم، هەتا وام لێهات سووربیم لەسەر ئەوەی کە نە گوێی لێبگرم و نە بە دیداری بگەم..

کاتێکیش چووم بۆ کەعبە لۆکەم دەخستە گوێم، هەتا گوێم لەهیچ قسەیەکی نەبێت، گەر قسەی کرد..

لەوێ بینیم بەپێوە وەستابوو لە کەعبە نوێژی دەکرد، منیش لە نزیکیەوە ڕاوەستام، ویستی خوا وابوو کە هەر دەبێت هەندێك لەوەی دەیخوێنێتەوە گوێبیستی بم، بەڕاستی قسەی زۆر جوانم گوێ لێبوو..

جا بە خۆمم وت: ڕۆڵەی داکم مرێ.. سوێند بەخوا من پیاوێکی هۆشمەندی شاعیرم، چاك و خراپم پەنهان نیە، ئیدی چی ڕێگری ئەوەم لێدەکات کە گوێبیستی قسەکانی ئەو پیاوە بیم، خۆ گەر ئەوەی هێناویەتی چاك بوو ئەوا ڕازی دەبم پێی و، گەر خراپیش بوو وازی لێدێنم..

مامەوە هەتا بەرەو ماڵەوەی گەڕایەوە، منیش شوێنی کەوتم تا چوویە ژوورەوە، بە شوێنیدا چوومە ژوورێ و پێم وت: ئەی موحەممەد، هۆزەکەت ئەوە و ئەوەیان لەبارەی تۆوە بۆ باسکردووم.

جا سوێند بەخوا ئەوەندەیان لەم کارەی تۆ ترساندم هەتا گوێیەکانم بە لۆکە ئاخنی تا گوێبیستی قسەکانت نەبم..

بەڵام ویستی خوا وابوو گوێم لێبێت و، قسەی چاکم بیست، دەسا ئەوەی هێناوتە بۆم باس بکە..

ئەمجا پێغەمبەر لەبارەی ئیسلامەوە بۆم دوا و، هەندێ لە قورئانی بۆم خوێندەوە..

سوێند بەخوا، هەرگیز قسەی لەوە باشتر و، کاری لەوە دادگەرانەترم نەبیستووە.. ئەوەبوو موسڵمان بووم و، شایەتی حەقم هێنا و، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، من کەسێکم هۆزەکەم گوێم لێ ڕادەگرن، ئەوا بۆ لایان دەگەڕێمەوە و، بەرەو ئیسلام بانگیان دەکەم، لەخوا بپاڕێرەوە کە بەڵگە و نیشانەیەك بکاتە پشتیوانم لە بانگکردنیاندا، پێغەمبەریﷺ فەرمووی: خوایە بەڵگە و نیشانەیەکی پێ بدە))..

* * *

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ستایشی ئەوانەی کردووە کە ﴿الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ: ئەوانەی گوێبیستی قسە دەبن و شوێنکەوتەی چاکترین و جوانترین قسە دەبن﴾ الزمر/١٨.

ئەوەتا ئێستا ئێمە بە یەکێك لەوانە دەگەین..

کە بەڕاستی نمونەیەکی ڕاستە لە نمونەکانی فیترەتی چاك و پێگەیشتوو..

هەرکە گوێبیستی هەندێك لە ئایەتەکانی چاکە و خێر بوو کە خوای گەورە بۆ سەر دڵی پێغەمبەرەکەی دابەزاندبوو، هەتا هەموو گوێ و، دڵی بکاتەوە، دەستی ڕاستی هێنا و پەیمانی دا..

هەر ئەوە نا و بەس.. بەڵکو دەست بەجێ بەرپرسیارێتی بانگکردنی خزم و هۆزەکەی بەرەو لای ئەم ئاینە ڕێنمونی کارە و، بۆ لای ئەم ڕێگا ڕاست و دروستە گرتە ئەستۆ..

لەپێناوی ئەمەشدا، دەیبینین هەر کە دەگاتەوە شوێن و ماڵێ خۆی لە خاکی (دەوس) بەو بیروباوەڕ و سووربوونەی کە لە دڵنیایەتی ڕووبەڕووی باوکی دەبێتەوە، بەرەو لای ئیسلام بانگی دەکات پاش ئەوەی کە لەبارەی ئەو پێغەمبەرەوە بۆی دوا کە بانگەوازی خەڵکی دەکات بەرەو لای خوا.. باسی مەزنێتی و.. پاکی و ئەمانەتپارێزی و.. دڵسۆزی و لێبڕانی بۆ خودای پەروەردگاری جیهانیان بۆ کرد..

دەست بەجێ باوکیشی موسڵمان بوو..

پاشان ڕۆشت بۆ لای دایکی و، ئەویش موسڵمان بوو..

دوای ئەوەی دڵنیابوو لەوەی کە ئیسلام ماڵەکەی تەنیوە، گواستیەوە بۆ لای هۆزەکەی و، هەموو خەڵکی (دەوس) و.. ئەوانیش جگە لە (ئەبوهورەیرە)ڕ کەسی دیکەیان لێ موسڵمان نەبوو..

ئەمجا دەستیان دایە سوکایەتی پێکردنی و لێی دووردەکەوتنەوە، هەتا ئارامی نەما لەگەڵیاندا..

سواری وڵاخەکەی بوو و، بە بیاباندا کەوتە ڕێ و بەرەو لای پێغەمبەری خواﷺ گەڕایەوە و سکاڵای خۆی بردە خزمەتی و، هەوڵی بەدەستهێنانی شارەزایی زیاتری دەدا.

کاتێ گەیشتە شاری مەککە، خێرا بەوپەڕی جۆش و خرۆشەوە بەرەو لای پێغەمبەر ڕۆیشت.

بە پێغەمبەری وت:

((ئەی پێغەمبەری خوا.. زینا و، سوو، بەسەر خەڵکی (دەوس)دا زاڵبوون، لەخوای گەورە بپاڕێرەوە کە (دەوس) لەناو ببات.))..!!

شتێکی سەیر و چاوەڕواننەکراو بوو و مایەی سەرسامبوونی بوو کاتێ بینی پێغەمبەر هەردوو دەستی بۆ ئاسمان بەرزکردەوەو، فەرمووی:

((خوایە هیدایەتی (دەوس) بدە و، بە موسڵمان بووی بیانهێنە))..!!

پاشان ئاوڕی لە (طوفەیل) دایەوە و.. پێی فەرموو:

((بگەڕێوە بۆ لای هۆزەکەت و بانگیان بکە و، نەرم و نیان بە لەگەڵیان)).

ئەم دیمەنە دەروونی (طوفەیل)ی پڕ لەخۆشی کرد و، گیانی پڕ کرد لە سەلامەتی و، بە باشترین شێوە سوپاسگوزاری خوای گەورەی کرد کە ئەم پێغەمبەرە مرۆڤە بەسۆزەی کردۆتە مامۆستا و فێرکاری و، ئیسلامیشی کردۆتە ئاین و پەناگەی.

ئەمجا هەستایەوەو بەرەو لای خاك و هۆزەکەی گەڕایەوە..

ئا لێرەوە بەنەرم و نیانی دەستی دایە بانگەشەکردنی خەڵکی بۆ لای ئیسلام، بەو شێوەیەی کە پێغەمبەرﷺ ڕایسپارد..

لەمیانەی ئەو ماوەیەی کە لەنێو هۆزەکەیدا بەسەری برد، پێغەمبەری خوا کۆچیکرد بۆ شاری مەدینە و جەنگی بەدر و، ئوحود و، خەندەق ڕوویدا.

لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا لە خەیبەر بوو پاش ئەوەی کە خوای گەورە ڕزگارکردنی بەخشیە موسڵمانەکان، کاروانێکی گەورە هات کە هەشتا خانەوادەی (دەوس)ی تێدابوو کە بەدەم وتنەوەی (لا اله الا الله محمد رسول الله) و (الله اکبر)ەوە بەرەو خزمەتی پێغەمبەر دەهاتن..

ئەمجا لەبەردەمیدا دانیشتن و یەك لەدوای یەك پەیمانیان دا..

کاتێك لە دیمەنە جەنجاڵەکەیان و، پەیماندانە پیرۆزەکەیان بوونەوە، (طوفەیلی کوڕی عەمر) بە تەنها دانیشت و یادەوەریەکانی بەسەرکردەوەو لە هەنگاوەکانی لەم ڕێگایەدا ڕادەما..!!

ئەو ڕۆژەی هاتەوە یاد کە هاتە خزمەت پێغەمبەر و داوای لێکرد کە دەستی بەرزبکاتەوە بۆ ئاسمان بپاڕێتەوە لەخوا و بڵێت: ((خوایە (دەوس) لەناو ببە)).. بەڵام ئەو بەجۆرێکی دیکە پاڕایەوە کە مایەی سەرسام بوونی بوو ئەو کاتە..

ئەویش بریتی بوو لە:

((خوایە هیدایەتی دەوس بدە و، بە موسڵمان بویی بیانهێنە))!!

خوای گەورەش هیدایەتی دەوسی دا و..

بە موسڵمان بووی هێنانی..

ئا ئەوەتان.. هەشتا ماڵ و، خانەوادەن کە زۆرینەی خزم و کەسەکانی پێکدەهێنن، لە ریزە بێگەردەکانی شوێن پێغەمبەری دەستپاکیدا جێگای خۆیان دەگرن.

* * *

(طوفەیل) لەگەڵ کۆمەڵی بڕواداراندا لەسەر کارەکەی بەردەوام بوو..

لە ڕۆژی رزگارکردنی مەککەشدا، ئەو لەگەڵ دەهەزار موسڵماندا دەچوویە ناوی کە سۆز و بەزەییان بە لوتبەرزی و خۆهەڵکێشان بەسەر نەدەبرد، بەڵکو بە ملکەچی و ڕێزەوە ناوچەوانیان دانواندبوو و، سوپاسگوزاری ئەو خوایە بوو کە رزگارکردنێکی نزیك و، سەرکەوتنێکی ڕوونی پێبەخشین..

(طوفەیل) پێغەمبەری خوای بینی بتەکانی مەککەی تێکدەشکاند و، بەدەستی خۆی لەو پیسیە پاکی دەکردەوە کە لە مێژە تێیدایە..

(طوفەیلی دەوسی) دەست بەجێ بتێکی (عەمری کوڕی حومەمە)ی هاتەوە یاد.. کە زۆرجار ئەو (عەمر)ە لەگەڵ خۆیدا دەیبرد بۆ لای، کاتێ کە بە میوانی دەچوویە ماڵی و، لەبەردەمیدا ملی کەچ دەکرد و، لێی دەپاڕایەوە..!!

ئا ئێستا دەرفەتە، تا (طوفەیل) خەوش و پیسی ئەو رۆژگارە لەخۆی ڕامالێت..

لێرەدا لە پێغەمبەری خواﷺ نزیك بوویەوە تا مۆڵەتی لێ بخوازێت بڕوات بتەکەی (عەمری کوڕی حومەمە) کە بە (ذا الكفين) ناودەبرا بشکێنێت، پێغەمبەریش ڕێی پێدا..

(طوفەیل)یش ڕۆیشت و ئاگری تێبەردا.. هەرکە ئاگرەکە خامۆش بوایە زیاتر ئاگری تێبەردەدا و، دەیوت:

یا ذا الكفين، لستُ، من عُبّادكا ... ميلادنا أقدم من ميلادكا!!

إني حشوت النار في فؤادكا

* * *

بەم شێوەیە لەگەڵ پێغەمبەردا ژیا، لەدوایەوە نوێژی دەکرد و فێر دەبوو لێی و، لەگەڵیدا بەشداری جەنگی دەکرد.

پاش وەفاتی پێغەمبەر و گەڕانەوەی بۆ لای پەروەردگاری باڵادەست، (طوفەیل) سەرنجی دا کە بەرپرسیارێتی سەرشانی وەك موسڵمانێك بە وەفاتکردنی پێغەمبەرﷺ کۆتایی نەهاتووە، بەڵکو لەوەدایە دەست پێبکات..

بەم جۆرە هەر کە جەنگی هەڵگەڕاوەکان دەستی پێکرد (طوفەیل) دەست و قاچی لێ هەڵماڵی و، تا بەسۆزێکی پەرۆشدارانەی شەهیدبوونەوە بچێتە نێو سەختی و ناڕەحەتیەکانیەوە..

بەشداری یەك لەدوای یەکی شەڕی هەڵگەڕاوەکان بوو..

لە ڕووداوی یەمامەشدا لەگەڵ موسڵمانەکاندا چوویە دەرەوەو عەمری کوڕی لەگەڵ خۆیدا برد.. لەگەڵ دەست پێکردنی جەنگەکەدا دەستی کرد بە ڕاسپاردنی کوڕەکەی کە وەك کەسێکی شەهادەت خواز و مەرگ ویست لەدژی سوپای موسەیلەمەی درۆزن بجەنگێت..

هەواڵی ئەوەشی پێدا کە ئەو-واتە (طوفەیل)- وا هەست دەکات کە لەم جەنگەدا دەمرێت..

بەم شێوەیە شمشێرەکەی گرتە دەست و بە لێزانێکی بەرزەوە جەنگا..

ئەو بە شمشێرەکەی بەرگری لە ژیانی نەدەکرد.

بەڵکو بە ژیانی شمشێرەکەی دەپاراست.

هەتا کاتێ ئەو مرد و جەستەی بەلادا هات، شمشێرەکەی بەساغی دەمێنێتەوە تا دەستێکی دیکە کە خاوەنەکەی ماوە پێی بجەنگێت..!!

لەو جەنگەشدا (طوفەیلی دەوسی) τ شەهید بوو..

جەستەی کەوتە بەر لێدانی ڕم لەکاتێکدا دەیڕوانیە کوڕەکەی کە لەنێو قەرەباڵغیەکەدا نەیدەبینی..!!

سەرنجی دەدا وەك ئەوەی هانی بدات تا شوێنی بکەوێت و پێی بگات..

بەڕاستیش پێی گەیشت.. بەڵام پاش ماوەیەك..

ئەوەبوو لە جەنگی یەرموکدا لەشام عەمری کوڕی طوفەیلی موجاهید بەشداری کرد و.. تێیدا ئاواتی شەهیدبوونی هاتەدی..

لەکاتێکیشدا گیانی دەدا، دەستی ڕاستی درێژکرد و ناو لەپی کردەوە، وەك ئەوەی تەوقە لەگەڵ یەکێکدا بکات.. بەڵام کێ دەزانێ..؟؟

لەوانەیە لەوساتەدا تەوقەی لەگەڵ گیانی باوکیدا کردبێت..!!

سێ کەس هەبوو لە قورەیش، پێغەمبەرى خوایانﷺ بەتوندى ڕوویەڕووبوونەوەى بانگەوازەکەى و ئەشکەنجەدانى هاوەڵانى ماندوو کردبوو..

پێغەمبەریش دوعاى لێدەکردن و، لە پەروەردگارى بەسۆز دەپاڕایەوە کە سزاى خۆى دابارێنێت بەسەریاندا..

لەکاتێکدا کە هەر دەپاڕایەوەو، تکاى دەکرد، ئەم ئایەتانەى قورئانى پیرۆزى بۆ سەر دڵى دابەزین..

﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ: خودا ئەوان ببورێ یان سزایان بدا لەبەر ئەوەى ستەمکارن، تۆ هیچ کارت بەسەر کارى ئەواندا نیە.﴾آل عمران/١٢٨

پێغەمبەر وا لە ئایەتەکە تێگەیشت کە فەرمانى پێدەکات واز بهێنێت لە دوعاکردن لێیان و، وازیان لێبهێنێت بۆ خوداى بێهاوتا..

ئیدى یا ئەوەتا لەسەر ستەمى خۆیان بەردەوام دەبن و، سزا و ئەشکەنجەى خوا دەیانگرێتەوە..

یاخود لێیان دەبورێت و، پاشگەز دەبنەوەو، سۆز و بەزەیى خوایان پێدەگات..

(عەمرى کوڕى عاص) یەکێك بوو لەو سێ کەسە..

خواى گەورە ڕێگاى تەوبەکردن و، بەزەیى بۆ هەڵبژاردن و، هیدایەتى دان بۆ لاى ئیسلام..

جا عەمر گۆڕا بۆ موسڵمانێکى تێکۆشەر و.. سەرکردەیەك لە سەرکردە نەبەردەکانى ئیسلام..

سەرەڕاى هەندێ هەڵوێستى عەمر کە ناتوانین بڕوا بە جۆرى تێڕوانینەکانى بهێنین تێیدا، بەڵام ڕۆڵى وەك هاوەڵێکى پایەبەرز کە هەوڵى داوەو خزمەتى پێشکەش کردووەو، سودى گەیاندووەو تێکۆشاوە، هەردەم دڵ و چاومان لەسەر کۆششەکانى دەبێت..

جا لێرەدا بە تایبەت لە میصر، بەردەوام ئەوانەى کە ئیسلام وەك ئایینێکى بەهادارى بەرز سەیر دەکەن و، نێردراوەکەیشى بەزەییەکە کراوەتە دیارى و، بەخششێکە پێشخراوە و، پێغەمبەرێکى ڕاستگۆى مەزن دێتە پێش چاویان، کە بەرچاوڕوونانە بانگەشەى خەڵکى بۆ لاى خوا دەکرد و، تێگەیشتن و تەقواى زۆرى بە ژیان بەخشى..

بەردەوام ئەوانەى هەڵگرى ئەو بڕوایەن خۆشەویستى و پشتیوانى لەمێژینەى ئەو پیاوەن کە قەدەر کردیە هۆکارێك-بەڵام چ هۆکارێ- بۆ بەخشینى ئیسلام بە میصر و، بەخشینى میصر بە ئیسلام، باشترین دیارى و چاکترین بەخشەر.

کە ئەویش عەمرى کوڕى عاص بووآ.

* * *

مێژوونووسان وا ڕاهاتوون کە عەمر بە (فەتحکاری میصر) ناوزەد بکەن..

لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە وای دەبینین کە دەرچوون و زیادەڕەوی تێدابێت و، پێدەچێت کە ڕەواترین ناو بۆ عەمر ئەوەیە کە بە (ڕزگارکەری میصر) ناوی ببەین.

چونکە ئیسلام فەتحی وڵاتەکانی نەدەکرد بەو تێگەیشتنە هاوچەرخەی کە چەمکی فەتح هەیەتی، بەڵکو خەڵکیان لەژێر چنگی ئەو دوو ئیمبراتۆرە دەرباز دەکرد کە بە خراپترین شێوە ئازار و ئەشکەنجەیان دەدان، کە ئەوانیش ئیمبراتۆریەتی فارس و.. ئیمبراتۆریەتی ڕۆم بوو..

میصریش بە تایبەت، ئەو ڕۆژەی پێشەنگانی ئیسلام پێی گەیشتن لە ژێر چنگی ڕۆمەکاندا بوو، گەلەکەیشی بێچاچان لە ڕووبەڕووبوونەوەدا بوون..

هەر بۆیە کاتێك هاواری کەتیبەی باوەڕدارانیان لە دەورووبەری وڵاتەکە بیست:

((الله اکبر.. الله اکبر))..

هەموویان بە قەرەباڵغیەکی زۆرەوە بەرەو ئاسۆ هاتوەکە ڕۆیشتن و ئاوێتەی بوون، دەربازبوونی خۆیان لەدەست قەیسەر و ڕۆمەکان تێیدا بەدی دەکرد..

کەوابوو عەمری کوڕی عاص و سەربازەکانی فەتحی میصریان نەکردووە، بەڵکو ڕێگایان لەبەردەم میصردا واڵاکرد تا چارەنووسی خۆی بەهەق بگەیەنێت و.. پەیوەستی بکات بە دادگەری و قەدەرەکانیەوە.. خۆی و حەقیەتی بوونی لەبەر ڕۆشنایی پەیامی خوادا و بە بنەماکانی ئیسلام بدۆزێتەوە..

عەمرt سوور بوو لەسەر ئەوەی کە خەڵکی میصر و قیبتیەکانی لەشەڕ دووربخاتەوە، تاوەکو شەڕ و کوشتار تەنها لەنێوان ئەو و سەربازە ڕۆمەکاندا بێت کە وڵاتیان داگیرکردووەو ڕزق و ڕۆزی خەڵکەکەی دەدزن..

لەپێناوی ئەوەشدا دەبینین قسە بۆ سەرکردەی مەسیحیەکانی ئەو کاتە و گەورە ئەسقەفەکانیان دەکات و، دەڵێت:

...خوای گەورە موحەممەدی بە حەق ناردووەو فەرمانی پێکردووە..

پێغەمبەریشﷺ پەیامەکەی گەیاند و، پاش ئەوەی لەسەر ڕۆشنایی–واتە لەسەر ڕێگەی ڕاست و دروست– داینانین، بەجێی هێشتین..

لەوەشی کە ئەو فەرمانی پێکردوین بەڵگەدانە بە خەڵك.. ئێمە بانگەشەتان دەکەین بۆ لای ئیسلام..

هەرکەس بە دەممانەوە بێت، ئەوە لە ئێمەیە و، ئەوەی بۆ ئێمە بێت بۆ ئەویشە و، ئەوەیشی لەسەر ئێمە پێویست بێت لەسەر ئەویشە..

ئەو کەسەیشی وەڵاممان نەداتەوە و نەیەت بەدەم ئیسلامەوە، سەرانەی لەسەر دادەنێین– واتە باج– و بارێزگاری و بەرگری لێکردنی بۆ دابین دەکەین..

هەروەها پێغەمبەرەکەمان هەواڵی پێداوین کە میسر بە رووماندا دەکرێتەوە، ڕایسپاردووین کە لەگەڵ خەڵکەکەیدا چاك بین و، فەرموویەتی: لەپاش من میسر بەڕوتاندا والآ دەبێت، جا ئێوە بۆ قیبتیەکانی باش بن، چونکە (زمە) و خزمایەتیان[1] لەسەرمان هەیە)..
گەر بە دەممانەوە بێن بۆ ئەوەی کە بانگتان دەکەین بۆی، ئەوا پاراستنتان لە ئەستۆماندا دەبێت تا ئەوپەڕی پەیمان)).
جا عەمر لە قسەکانی بویەوە، هەندێك لە ئەسقەف و ڕاهیبەکان هاواریان کرد و وتیان:
( ئەو خزمایەتیەی کە پێغەمبەرەکەتان ڕایسپاردوون پێی، خزمایەتیەکی دوورەو تەنها پێغەمبەران بەجێی دەهێنن)..!!
ئەمەش دەستپێکی باشی لێکگەیشتن و ویستراوی نێوان عەمر و قیبتیەکانی میسر بوو.. هەرچەندە سەرکردەکانی ڕۆم هەوڵی هەڵوەشاندنەوەیان دا..

* * *

عەمری کوڕی عاص لەو کەسانە نەبوو کە زۆر زوو موسڵمان بوون، ماوەیەکی کەم بەر لە فەتحی مەککە لەگەڵ خالیدی کوڕی وەلیددا موسڵمان بوو..
سەیر لەوەدایە کە موسڵمان بوونی لەسەر دەستی نەجاشی لە حەبەشە دەستی پێکرد، لەوکاتە نەجاشی، عەمری دەناسی و ڕێزی لێدەنا بەهۆی زۆر سەردانکردنی حەبەشە و ئەو دیاریە بەنرخانەی دەیبرد بۆ نەجاشی، لە دوا سەردانیدا بۆ ئەو وڵاتە باسی ئەو پێغەمبەرە هاتە ناو کە بانگەشە بۆ یەکخواناسی و ئاکار جوانی دەکات لە نێو دورگەی عەرەبدا.
سەرۆکی حەبەشە لە عەمری پرسی: چۆن بڕوات نەهێناوە پێی و شوێنی بکەویت، لەکاتێکدا کە ئەو بەڕاستی نێردراوی خوایە..؟؟
جا عەمر لە نەجاشی پرسی:
((ئینجا بەڕاستی وایە؟؟))
نەجاشی وەڵامی دایەوە:
((بەڵێ.. دەسا ئەی عەمر گوێڕایەڵم بە و شوێنی بکەوە، چونکە سوێند بەخوا ئەو لەسەر حەقە و، بەسەر ئەوانەدا زاڵ دەبێت کە سەرپێچی دەکەن))..؟!
دەست بەجێ عەمر ڕێگای دەریای گرتە بەر، گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەیەو، ڕوویکردە شاری مەدینە تاوەکو موسڵمان ببێت و بڕوا بەخودای پەروەردگاری جیهانیان بهێنێت.

---

١ فەرموودەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە قیبتیەکانی ئەوکاتەی میسر بە پلەی خاڵوانی ئیسماعیل(u) بوون، چونکە هاجەرەخاتوونی دایکی ئیسماعیل قیبتی میسر بووەو، ئیبراهیم(u) کاتێك هاتە میسر و پێشکەشی کرا، خواستی و ئیسماعیلی لێ بوو.

لەڕێگەی چونیدا بۆ شاری مەدینە گەیشت بە خالیدی کوڕی وەلید کە لە مەککەوە هاتبوو، -ئەویش بە هەمان شێوە- بەرەو لای پێغەمبەر دەڕۆیشت تا پەیمانی موسڵمان بوونی پێبدات..

هەرکە پێغەمبەر بەدی کردن دێن ڕوخساری گەشایەوەو بە هاوەڵەکانی فەرموو:

((بەڕاستی مەککە ڕۆڵە و جەرگی خۆی تێگرتن))..

جا خالید هاتە پێشەوەو پەیمانی دا..

پاشان (عەمر) هاتەپێشەوە و، وتی:

(ئەی پێغەمبەری خوا..

من پەیمانت پێدەدەم لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە لە گوناهەکانی پێشووم ببورێت)..

پێغەمبەریشﷺ وەڵامی دایەوە، فەرمووی:

((ئەی عەمر..

پەیمان بدە، چونکە ئیسلام هەموو شتێکی بەر لەخۆی دەسڕێتەوە))..

جا عەمر پەیمانی دا و لێزانی و ئازایەتیەکەی خستە خزمەت ئاینی نوێ.

ئەوکاتەیشی پێغەمبەر بۆ لای پەروەردگاری باڵادەست گەڕایەوە، عەمر والی پێغەمبەر بوو لە عومان..

لە سەردەمی جێنشینی عومەریشدا لە جەنگەکانی شامدا بەچاکی تاقیکرایەوە، پاشان بەڕزگارکردنی میصر لە فەرمانڕەوایی ڕۆمەکان.

* * *

بریا عەمری کوڕی عاص جڵەوی حەزلێکردنی فەرمانڕەوایی لە دەروونی خۆیدا بگرتایە.. ئەوا بەسەر هەندێك لە هەڵوێستەکاندا زاڵ دەبوو کە ئەو خۆشەویستیە تێوەی گلاند..

بەڵام خۆشویستنی فەرمانڕەوایەتی لای عەمر تا ڕادەیەك ڕاستەوخۆ گوزارشتی لە سروشتی بەجۆشی پڕ بەهرەی دەکرد.. بگرە شێوەی دەرەکی و، چۆنیەتی ڕۆیشتن و، قسەکردنیشی، وایان نیشان دەدا کە بۆ فەرمانڕەوایەتی دروستکراوە..!! تەنانەت دەگێڕنەوە کە ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی خطاب ڕۆژێکیان چاوی پێی کەوت بەرەو ڕووی دەهات، زەردەخەنە گرتی بەشێوەی ڕۆیشتنەکەی و، وتی:

((بۆ ئەبوعبداللە نەهاتووە بەسەر زەوییدا هەنگاو بنێت و ئەمیر نەبێت))..!

لەڕاستیدا ئەبوعبداللە ئەم حەقەی لەدەست خۆی نەدا..

تەنانەت کاتێك ڕووداوە مەترسیدارەکان بەسەر موسڵماناندا دەهات.. عەمر وەك ئەمیر مامەڵەی لەگەڵ ڕووداوەکاندا دەکرد.. ئەمیرێکی زیرەك و، لێزان و، بەتوانا، بەجۆرێك کە وای لێکرد متمانەی بەخۆی بێت و شانازی بکات بە باڵادەستیەکەیەوە..!!

بەلام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هێندە دەستپاکی تێدابوو کە عومەری کوڕی خطاب بیکاتە والی سەر فەلەستین و ئوردن، دواتریش تا کۆتایی ژیانی ئەمیری باوەڕداران عومەر والی میصر بوو، لەکاتێکدا کە عومەر لە هەڵبژاردنی والیەکانیدا زۆر توندوتیژ بوو..

تەنانەت کاتێك کە ئەمیری باوەڕداران عومەر بیستی کە خۆشگوزەرانی عەمر ئەو ئاستەی تێپەڕاندووە کە ئەمیری باوەڕداران لە والیەکانی داوای دەکرد کە لێی تێپەڕ نەکەن، تا هەمیشە لە ئاستێکدا بن، یان بەلایەنی کەمەوە نزیك بن لە ئاستی گشتی خەڵکی..

دەڵێین: تەنانەت کاتێك خەلیفە بەزۆر خۆشگوزەرانی عەمری زانی لایەنەدا، بەڵکو موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی نارد بۆ لای و فەرمانی پێکرد کەهەموو سامان و شت و مەکەکانی عەمر بکاتە دوو بەشەوە و نیوەی بۆ بهێڵێتەوە و نیوەکەی دیکەشی لەگەڵ خۆی هەڵبگرێت و بیهێنێتەوە بۆ (بەیتولمال) لە مەدینە.

خۆ گەر ئەمیری بڕواداران ئاگاداری ئەوە بوایە کە خۆشەویستی فەرمانڕەوایەتی وای لێ دەکات کە کەمتەرخەمی بکات لە بەرپرسیارێتیەکانیدا، ئەوا ویژدانی پێکەیشتووی ڕێگەی پێنەدەدا کە بۆ چرکەساتێ بە والیەتی بمێنێتەوە.

* * *

عەمرا زۆر زیرەك و، خاوەن زرنگی و بۆچوونێکی قووڵ بوو..

هەتا ئەمیری بڕواداران عومەر  هەرکاتێك مرۆڤێکی بێفرت و فێڵی بەدی بکردایە، بە سەرسوڕمانەوە دەیدا لەشانی و دەیوت:

((سبحان الله..!!

دروستکاری ئەم و، دروستکاری عەمری کوڕی عاص یەك خوایە))!!

هەروەها تا ئەوپەڕی بەجەرگ و گیان لەسەردەست بوو..

لەزۆر جێگاشدا لێزانی و بەجەرگیەکەی ئاوێتەی یەکدی دەکرد، وا گومان دەبرا کە بترسێ یان تۆقیبێ.. بەلام ئەوە فراوانی فرت و فێڵی بوو، کە عەمر زۆر چاك دەیزانی لە تەنگانەی سەختدا خۆی پێ دەرباز بکات..!!

ئەمیری بڕواداران عومەر ئاشنای ئەو بەهرانەی بوو و ڕێزی خۆی لێ دەنا.

لەپێناوی ئەمەشدا بەر لە ڕۆیشتنی بۆ میصر کاتێ ناردی بۆ شام، بە ئەمیری بڕواداران وترا: سوپای ڕۆمەکان لە شام (أرطبونا) واتە ئەمیر و سەرکردەیەکی ئازای لێزان سەرکردایەتیان دەکات..

وەلامی عومەریش ئەوەبوو:

(( (أرطبون)ی عەرەبمان گرتۆتە (أرطبون)ی ڕۆم، دەبا سەیر بکەین بزانین کاروبارەکان سەریان لەکوێوە دەردەچێت))..!!

جا ئەوەبوو زاڵبوونێکی گەورەی (أرگبون)ی عەرەب و،عەمری کوڕی عاصی لێزانی مەترسیداریان بەسەر (أرگبون)ی ڕۆمدا لێکەوتەوە کە سوپاکەی بۆ شکست بەجێهێشت و بەرەو میصر هەڵهات.. کە عەمر پاش ماوەیەکی کەم دەیگاتێ.. تا بەیداخی ئیسلام لەسەر بەرزاییەکانی بەرزیکاتەوە..

* * *

ئەو هەڵوێستانە زۆرن کە تێیاندا زیرەکی و لێزانی عەمر درەوشاوەتەوە.

گەرچی ئەو هەڵوێستەی بەرانبەر ئەبوموسای ئەشعەری لە بەسەرهاتی دادوەری کردندا نواندی ئەو ساتەی کە هەردووکیان پێکهاتبوون لەسەر ئەوەی کە ئیمامی عەلی و موعاویە لابدەن، تا کار و فەرمانی ڕاوێژ بگەڕێتەوە بۆ موسڵمانان، ئەوەبوو ئەبوموسا پێکهاتنەکەی بەجێهێنا.. بەڵام عەمر جێبەجێی نەکرد.

خۆ گەر بمانەوێت نموونەیەکی لێزانی و، زرنگیەکەی بەدی بکەین، ئەوا هەڵوێستی بەرانبەر سەرکردەی (قەڵای بابلیۆن) لەکاتی شەڕکردنیدا بەرانبەر ڕۆمەکان لە میصر- لەگێڕانەوەیەکی دیکەی مێژوویدا- ئەو ڕوداوەی کە لێی دەدوێین لە یەرموك بەرانبەر (أرگبون)ی ڕۆم ڕوویداوە.

ئەوەبوو (أرطبون)ی سەرکردە بانگی کرد تا لەگەڵی بدوێت، پێشتر فەرمانی بە هەندێك لە پیاوەکانی کردبوو کە پاش دەرچوونی لە قەڵا بەردێك بەسەریدا بەربدەنەوە، هەموو شتێك ئامادەکرابو تاوەکو کوشتنی عەمر کارێکی مسۆگەر بێت.

عەمریش چوو بۆ لای سەرکردەکەیان، هیچ شتێکی مایەی ترساندنی نەبوو، دیدارەکەیان کۆتایی هات.

لەکاتێکدا کە بەرەو دەرەوەی قەڵاکە هەنگاوی دەنا، هەستی بە جوڵانەوەیەکی گوماناوی سەربازەکانی سەر قەڵاکە کرد، جوڵانێك کە هەستی زۆر ئاگادار بوونی تێدابوو.

دەست بەجێ بەشێوەیەکی لێهاتوانە هەڵس وکەوتی کرد.

گەڕایەوە بۆ لای سەرکردەی قەڵاکە چەند هەنگاوێکی دڵنیای هێمن و لەسەرخۆی نا بە هەستێکی پڕ متمانەوە، وەك ئەوەی هەرگیز هیچ شتێك نەیترساندبێت، هیچ گومانێکی نەبردبێت!!

چوویە ژوورەوە بۆ لای سەرکردەکەیان و پێی وت:

-شتێکم هات بە خەیاڵدا ویستم ئاگادارت بکەم لێی.. لەو جێگایەی کە یاوەرانی لێیە کۆمەڵێك لە هاوەڵانی زوو موسڵمان بوی پێغەمبەرم لەگەڵدایە، کە ئەمیری باوەڕداران هیچ فەرمانێك بەبێ ڕاوێژپێکردنی ئەوان دەرناکات و، هیچ سوپایەك لە سوپاکانی ئیسلام ڕەوانە ناکات تا ئەوان لە پێشەوەی سەرباز و جەنگاوەرەکانی دانەنێت، منیش وام بە چاك زانی کە

بیانهێنم بۆ لات، هەتا گوێبیستی ئەوە بن کە من گوێم لێی بوو و، ئەوانیش وەک من کارەکەیان لا ڕوون بێت..

سەرکردەی ڕۆمەکانیش وا تێگەیشت کە عەمر بە سادەیی خۆی هەڵی تەمەنی داوەتە دەستی..!!

کەوابوو با ڕازی بێت بە بۆچوونەکەی، هەتا کە گەڕایەوەو ئەو ژمارە سەرکردەی موسڵمانەکان و چاکترینی پیاوان و سەرکردەکانیان لەگەڵدا بوو، هەموویان لەناوبەرێت، لەبری ئەوەی کە تەنها عەمر بکوژێت..

جا بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو فەرمانی دا بە هەڵوەشاندنەوەی ئەو نەخشەیەی کە ئامادەکرابوو بۆ لەناوبردنی عەمر..

ئەوەبوو بەچاکی بەڕێی کرد و، بە گەرمی تەوقەی لەگەڵدا کرد..

جا لێزانی عەرەب لەکاتی بەجێهێشتنی قەڵاکەدا پێکەنی..!!

بۆ بەیانی عەمر بە سەرکردایەتی سوپاکەی گەڕایەوە بۆ قەڵاکە و، بە سەر پشتی ئەسپەکەیەوە بوو، کە بەشێوەیەکی گاڵتەئامێز دەیحیلاند.

بەڵێ.. ئەویش بە هەمان شێوە زۆری لەبارەی لێزانی خاوەنەکەیەوە ئاشنابوو..!!

لەساڵی چل و سێی کۆچیدا، عەمری کوڕی عاص لە میصر کۆچی دوایی کرد، لەکاتێکدا کە والی بوو لەوێ..

لە دوا چرکەساتەکانی ماڵئاواییدا ژیانی خۆی دەهاتەوە پێش چاو، وتی:

((.. لە سەرەتای کارمەوە بێبڕوا بووم و.. توندوتیژترین کەس بوم بەرامبەر پێغەمبەری خوا، جا گەر ئەو کاتە بمردمایە ئاگر مسۆگەر بوو بۆم..

پاشان پەیمانم دا بە پێغەمبەری خوا، لەنێو خەڵکیدا کەسم هێندەی ئەو خۆش نەدەویست و، ڕێزدارترین کەس بوو لەپێش چاوم.. خۆ گەر پرسیارم لێبکردایە کە بەپێی توانام لەبارەیەوە بڵێم نەمدەتوانی، چونکە لە توانامدا نەبوو کە چاوم پڕ لە ڕێزی ئەو بکەم..

خۆ گەر ئەو کاتە بمردمایە ئەوا ئومێدەوار بووم کە لە پێڕی خەڵکی بەهەشت بم..

دوای ئەوە بە دەسەڵاتداریێتی و، بە شتانێك تاقیکرامەوە کە نازانم ئایا بۆ منە، یان لەسەرمە))...

* * *

پاشان بە ملکەچیەوە چاوەکانی بڕیە ئاسمان و، لە پەروەردگاری بە ڕەحم و بەزەیی بەرزی دەپاڕایەوە:

((خودایا بێ تاوان نیم تا داوای لێخۆش بوون بکەم، دەسەڵاتدار نیم تا سەربکەوم، گەر بەزەیی تۆم فریا نەکەوێت لە تیاچوان دەبم))!!

بەردەوام بوو لە پاڕانەوەکەی و، (لا اله الا الله)کانی هەتا گیانی بەرەو لای خوای گەورە بەرز بوویەوەو، کۆتا وشەیشی (لا اله الا الله) بوو..

* * *

جا لە ژێر خاکی میصردا، کە عەمر ڕێگای ئیسلامی پێناشنا کرد، جەستەی بەخاک سپێردرا..

لەسەر خاکە پتەوەکەیشی، هێشتا کۆڕ و کۆبوونەوەکەی کە تێیدا فێری دەکردن و، قازیەتی بۆ دەکردن و، فەرمانی دەردەکرد.. بەدرێژایی سەردەمەکان لەژێر سەربانی مزگەوتە دێرینەکەیدا (مزگەوتی عەمر) ماوەتەوە، کە یەکەمین مزگەوتی میصر بوو ناوی خوای تاک و تەنها تێدا بهێنرێت و، لەسەر هەموو لایەکان و لەسەر دوانگەکەی پەیامی خوای گەورە و، بنەماکانی ئیسلام ڕاگەیەنرا.

## ٦٠

# سالمی ئازادکراوی ئەبوحوذەیفە
# بەلگو باشترین هەلگری قورئان !

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی ڕاسپارد و، فەرمووی:
((قورئان لە چوارکەس وەربگرن"
عبدالله ی کوڕی موسعود و..
سالمی ڕزگارکراوی ئەبوحوذەیفە و..
ئوبەی کوڕی کەعب و..
موعاذی کوڕی جەبەل..))
پێشتر بە (ئیبن مەسعود) و (ئوبەی) و (موعاذ) گەیشتین..
جا دەبێ ئەو هاوەڵەی چوارەمیان کێبێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ کردبوویە بەڵگە و سەرچاوەی فێربوونی قورئان..؟؟
ئەو پیاوە سالمی ڕزگارکراوی ئەبو حوذەیفەیە..
پێشتر کۆیلەیەکی ژێردەستە بوو، ئیسلام پلەوپایەی بەرزکردەوە تا کردیە کوڕی یەکێك لە گەورەپیاوانی موسڵمانان کە بەر لە موسڵمان بوونی یەکێك بوو لە پیاوماقوڵانی قوڕەیش و، سەرۆکێك لە سەرۆکەکانیان..
کاتێکیش کە ئیسلام بە کوڕکردن (تبنی) هەڵوەشاندەوە، بوو بە برا و، هاوڕێ و، ڕزگارکراوی ئەوکەسەی کە پێشتر بوویبوویە کوڕی، کە ئەویش هاوەڵی پایەبەرز (ئەبوحوذەیفەی کوڕی عوتبە)یە..
بەهۆی فەزڵ و نیعمەتی خواوە لەسەر سالم، لەنێو موسڵماناندا گەیشتە جێگایەکی بڵند و بەرز، کە باشەی گیانی و خووڕەوشت و، تەقواکەی پێی گەیاندبوو..
ئەم هاوەڵە پایەبەرزەش بەم نازناوە ناسرا: (سالمی ئازادکراوی ئەبوحوذەیفە)..
ئەمەش لەبەر ئەوەی کۆیلە بوو و ئازاد کرا..
زۆر زوو بڕوای بە خودا و پێغەمبەرەکەی هێنا و..
جێگای خۆی لەنێو هاوەڵانی زوو موسڵمان بوودا گرت..
بە هەمان شێوە حوذەیفەی کوڕی عوتبەش، زۆر زوو بە پەلە بەرەو لای ئیسلام هات و دەستی لە عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی باوکی هەڵگرت، ڕق و کینەی و خەمەکانی بخواتەوە کە پڕ بە ژیانی بوو، بەهۆی موسڵمان بوونی کوڕەکەیەوە کە کەسێکی دیاری هۆزەکەی بوو و، باوکیشی بۆ سەرکردایەتی قوڕەیش کۆشی دەکرد..

* * *

ئەبوحوزەیفە لەپاش ئازادکردنی سالم بە کوڕی خۆی کرد و، ئیدی بە سالمی کوڕی حوزەیفە بانگ دەکرا.. جا هەردووکیان بە دڵنیایی و، ملکەچیەوە خواپەرستی خۆیان ئەنجام دەدا و، بە چاکترین شێوە لەسەر ئازار و ئەشکەنجەی قورەیشیەکان ئارامیان دەگرت..

ڕۆژێکیان کە ئەو ئایەتە دابەزی داب و نەریتی بەکوڕکردنی هەڵوەشاندەوە.. هەموو بەکوڕکراوەکان بوونەوە بە هەڵگری ناوی ڕاستەقینەی ئەو باوکەی کە لێی بووەو خستویەتیەوە..

بۆ نمونە (زەیدی کوڕی حاریسە) کە پێغەمبەر ﷺ کردبوویە کوڕی خۆی و، لەنێو موسڵمانەکاندا بە (زەیدی کوڕی موحەممەد) ناسرابوو، گەڕایەوە سەر ناوی (حاریسە)ی باوکی و بووەوە بە زەیدی کوڕی حاریسە، بەڵام سالم نەدەزانرا کە کێ باوکیەتی، بۆیە ئەبوحوزەیفە گرتیە ئەستۆی خۆی و، ئیدی بە سالمی ئازادکراوی ئەبوحوزەیفە بانگ دەکرا..

پێدەچێت کە ئەو کاتەی ئیسلام داب و نەریتی بەکوڕکردنی هەڵوەشاندەوە، ویستبێتی بە موسڵمانەکان ڕابگەیەنێت:

بەشوێن خزمایەتی و نزیکایەتی، یان پەیوەندییەکدا مەگەڕێن کە برایەتیتانی پێ بسەلمێنن لە ئیسلام گەورە و بەهێزتر.. لەو عەقیدەیەی کە دەتانکاتە برا..!!

موسڵمانە پێشینەکانیش بەچاکی لەمە گەیشتن..

هیچ شتێك نەبوو لەدوای خودا و پێغەمبەرەکەی، لەبرا بڕواداره موسڵمانەکانیان خۆشەویستتر بێت لایان..

ئەو دیمەنەشمان بەدی کرد کە ئەنصاریەکان چۆن پێشوازیان کرد لە برا کۆچبەرەکانیان و، سامان و، ماڵ و، هەموو ئەوەی کە هەیانبوو لەگەڵیاندا بەش کردن..!!

هەر ئەوەشە کە دەیبینین لەنێوان ئەبوحوزەیفەی خانەدانی قورەیش و، سالمدا کە کۆیلەیەکی ژێردەستە بوو و، باوکی خۆی نەدەناسی ڕوودەدات..

هەتا دواچرکەساتی ژیانیشیان زیاتر لە دوو برای دایك و باوکی بوون –هەتا لەکاتی مردنیشدا– پێکەوە مردن.. گیان لەگەڵ گیان و.. جەستەش بە تەنشتی جەستەوە..!!

ئەمەیە مەزنی نایابی ئیسلام..

بەڵکو ئەمە یەکێکە لەباشە و، مەزنیەکانی..!!

* * *

بەڕاستی سالم ئیمانێکی ڕاستگۆیانەی هێنابوو و..

پێ و شوێنی چاکەکارە موتەقیەکانی بەرەو لای خوای گەورە گرتبووە بەر..

هەر بۆیە ڕەچەڵەك و، جێگای لەنێو کۆمەڵگادا هیچ سەنگێکی نەبوو..

بەڵکو بەهۆی تەقوا و دڵسۆزییەوە بەرەو بەرزترین پلەی کۆمەڵگای نوێ بەرز بوویەوە کە ئیسلام هات لەسەر بنچینەیەکی نوێی دادگەری و مەزن دایمەزراند و رایدەپەراند.. بنچینەیەك کە پوختەکەی لەم ئایەتەدا هاتووە:

﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ: رێزدارترینتان لەلای خودا پارێزکارترینتانە.﴾الحجرات/١٣.

لە فەرموودەشدا هاتووە:

((هیچ عەرەبێك فەزڵی بەسەر ناعەرەبدا(بێگانەدا) نیە مەگەر بە تەقوا))..

((هیچ کوڕی سپییەك فەزڵی نیە بەسەر کوڕی ڕەشێکدا مەگەر بە تەقوا))..!!

* * *

جا لەم کۆمەڵگە نوێیە پێگەیشتووەدا، ئەبوحوذەیفە رێزێکی گەورەی بۆ خۆی بینیەوە بەوەی کە ئەو کەسە لەخۆ بگرێت تا دوێنێ کۆیلەی بووە..

بەڵکو رێزیشی بۆ خانەوادەکەی دۆزییەوە، بەوەی کە فاتیمەی کچی وەلیدی کوڕی عوتبەی برازای کردە هاوسەری سالم..!!

لەم کۆمەڵگە نوێ و پێگەیشتووەدا، کە چینی ستەمکاری ڕوخاند و، جیاکەرەوەی درۆینەی هەڵوەشاندەوە، سالم بەهۆی ڕاستگۆیی و ئیمان و، ئازار چەشتنەوە هەردەم لەڕیزی پێشەوەدا خۆی دەبینیەوە..!!

بەڵێ.. بەڕاستی پێشنوێژی کۆچبەران لە مەککەوە بۆ مەدینە بوو بە درێژایی ماوەی نوێژکردنیان لە مزگەوتی (قوباء)..!!

هەروەها بەڵگەیەکیش بوو لە پەڕاوی خوای گەورەدا، هەتا پێغەمبەر فەرمانی کرد بە موسڵمانەکان کە لێوەی فێر بن..!!

هێندەی چاکە و، تەقوا تێدابوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەیەوە پێی فەرموو:

((سوپاس بۆ خوا، کە لەنێو ئوممەتەکەمدا کەسی وەك تۆ هەیە))..!!

تەنانەت برا بڕوادارەکانیشی بە:

(سالم لە چاکەکارانە) ناویان دەبرد..!!، بێ گومان چیرۆکی موسڵمان بوونی (سالم) وەکو چیرۆکی بیلال و دەیان کۆیلە و هەزاری تر وایە ئەوانەی کە ئیسلام کۆتی کۆیلایەتی و بێ هێزی لەسەر لابردن و کردنیە پێشەواو و سەرکار و پێشەنگ لە کۆمەڵگای ڕێنوێنی و ڕاست و شارەزادا.

* * *

سالم چاکەکانی ئیسلامی پێکەیشتووی وەرگرتبوو..
چاکەکان تێیدا و لە دەوروبەریشی کۆبووبوویەوە.. ئیمانە قوڵە ڕاستگۆیەکەیشی بەجوانترین شێوە ڕێکی خستبووەوە..
لە دیارترین لایەنە باشەکانیشی، درکاندنی ئەوەی بە ڕەوانی دەزانی..
ئەو ئاشنای بێدەنگی نەبوو لە بەرانبەر وشەیەکدا کە وتنی بە ئەرکی سەرشانی خۆی بزانیایە..
ناپاکیشی لەژیان نەدەکرد بە بێدەنگ بون لە ئاست هەڵەیەک کە خۆشی بوێت..

* * *

پاش فەتح کردنی شاری مەککە لەلایەن موسڵمانانەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێك دەستەی نارد بۆ لای گوند و هۆزەکانی دەوروبەری مەککە و، هەواڵی پێدان کە پێغەمبەرﷺ وەك بانگخواز ناردوونی نەك جەنگاوەر..
خالیدی کوڕی وەلید سەردەستەی یەکێك لەو کۆمەڵانە بوو..
کاتێك خالید گەیشتە ئەو جێگایەی بۆی نێردرابوو، کارەکە وابوو پەنا بباتە بەر شمشێر و، خوێن بڕێژێت..
ئەم ڕووداوە کاتێك پێغەمبەر هەواڵەکەی پێ گەیشت ماوەیەکی زۆر داوای لێخۆشبوونی لە پەروەردگاری کرد و، دەیفەرموو:
((خودایا من بەریم لەو کارەی خالید ئەنجامی داوە))..!!
ئەو ڕووداوەش بوو کە ئەمیری باوەڕداران عومەر بۆی باس دەکرد و لەسەری حسێب دەکرد و دەیوت:
((شمشێرەکەی خالید پەلەکردنی تێدایە)).
سالمی ئازادکراوی ئەبوحوزەیفە لەگەڵ چەند هاوەڵێکی دیکەدا لەو دەستەیەی خالیددا بوون..
هەر کە سالم ئەو کارەی خالیدی بەدی کرد وتوێژێکی توند و گەرمی لەگەڵدا، جام دا و، دەستی کرد بە ژماردنی ئەو هەڵانەی ئەنجام درابوو..
خالیدی سەرکردە و، پاڵەوانی مەزنی سەردەمی نەفامی و ئیسلام، جارێ گوێی دەگرت و، جارێکیش بەرگری لەخۆی دەکرد و، بۆ جاری سێیەم توند دەبوو لە قسەکردنیدا، سالمیش لەسەر بۆچوونەکەی خۆی بوو و، بەبێ ترس و پێچ و پەنا ڕای دەگەیاند..
سالم لەو کاتەدا وەك خانەدانێك لە خانەدانەکانی مەککە نەیدەڕوانیە خالید.. لەکاتێکدا کە ئەو لە دوێنێیەکی نزیکدا کۆیلە بووە..
نەخێر.. چونکە ئیسلام وەك یەکی لێکردوون..!!

وەك سەرکردەیەکیش سەیری خالیدی نەدەکرد کە هەڵەکانی پیرۆز سەیر بکرێت.. بەڵکو وەك هاوبەشێك لە بەرپرسیارێتی و ئەرکدا..!!

هیچ مەبەست و ئارەزوویەکی نەبوو لەو بەرەوڕووبوونەوەی خالیددا، بەڵکو ئەوە ئامۆژگاری بوو کە ئیسلام مافەکەی پیرۆز ڕاگرتووە، چەندەها جار لە پێغەمبەرەوەﷺ گوێبیستی دەبوون دەیکردە کۆڵەکەی تێکڕای ئاین کاتێك دەیفەرموو:

((ئاین ئامۆژگارییە.. ئایین ئامۆژگارییە.. ئایین ئامۆژگارییە..))

* * *

پێغەمبەر ﷺ کاتێك هەواڵی کارەکەی خالیدی کوڕی وەلیدی پێگەیشت، پرسیاری کرد:

((هیچ کەس سەرزەنشتی کرد))..؟؟

چەند پرسیارێکی بەرز و، شەنگ و جوانە..؟؟!!

توڕەبوونەکەیشی هێور بووەوە ئەو ساتەی پێیان وت:

((بەڵێ.. سالم چووە لای و بەوە ڕازی نەبوو)).

سالم لەگەڵ پێغەمبەر و بڕواداراندا ژیا..

لەهیچ جەنگێك دوانەدەکەوت و، لە پەرستشدا کەمتەرخەمی نەدەنواند..

برایەتیەکەیشی لەگەڵ ئەبوحوزەیفەدا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەتین و پتەوتر دەبوو..

* * *

پێغەمبەری خوا گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری باڵادەست..

جێنشینایەتی ئەبوبەکرﷺ بەرەو ڕووی پیلانی هەڵگەڕاوەکان بوویەوە..

ڕۆژی یەمامە هات..

بەڕاستی جەنگێکی ترسناك بوو، کە ئیسلام بەو جۆرە تاقی نەکرابووەوە..

ئەوەبوو موسڵمانەکان بۆ شەڕکردن چوونە دەرەوە..

سالم و ئەبوحوزەیفەی برای ئایینیشی چوونە دەرەوە..

لە دەستپێکی جەنگەکەدا موسڵمانەکان توانای خۆڕاگرتنیان نەبوو لەبەردەم هێرشەکەدا و.. لەوێدا هەموو بڕوادارێك هەستی کرد کە شەڕەکە شەڕی ئەوە.. بەرپرسیارێتیەکە بەرپرسیارێتی سەر شانی ئەوە..

سەر لەنوێ خالیدی کوڕی وەلید کۆیکردنەوە..

بە لێزانیە سەرسوڕهێنەرەکەی سەرلەنوێ سوپاکەی ڕێکخستەوە..

سالم و ئەبوحوزەیفەش دەستیان کردە ملی یەکتر و بەڵێنی شەهیدبوونیان لەپێناوی ئەو ئاینە ڕەوایەدا دا بە یەك کە بەختەوەری دونیا و دواڕۆژی پێ بەخشین..

ئەمجا خۆیان هاویشتە شوێنێکی ترسناکەوە..!!

ئەبوحوذەیفە هاواری دەکرد..

((ئەی قورئان خوازان..

قورئان بە کردەوەکانتان برازێننەوە))..

شمشێرەکەیشی وەك گەردەلول بەریووبووە سوپای موسەیلەمەی درۆزن.

سالمیش هاواری دەکرد:

((گەر لەلای منەوە هێرش بکرێتە سەر موسڵمانەکان..

ئەوا خراپترین هەڵگری قورئان منم..))..!!

دوور لەتۆ ئەی سالم.. بەڵکو باشترین هەڵگری قورئان تۆ بوویت..!!

شمشێرەکەی لە گەردنی ئەو هەڵگەڕاوانەدا دەهات و دەچوو کە دەیانویست نەفامی قورەیش بگێڕنەوە، ڕۆشنایی ئیسلام خامۆش بکەن..

شمشێرێك لە شمشێری هەڵگەڕاوەکان دای لەدەستی ڕاستی و پەڕاندی.. لەکاتێکدا کە ئاڵای کۆچبەرانی پێهەڵگرتبوو پاش ئەوەی زەیدی کوڕی خطابی هەڵگری شەهید بوو..

کاتێك سەرنجی دا دەستی ڕاستی دەپەڕێت، بەدەستی چەپی ئاڵاکەی هەڵگرت و، بەردەوام بەرزتری دەکردەوەو بەدەنگی بەرزیش ئەم ئایەتە پیرۆزەی دەوتەوە:

﴿وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَاتَلَ مَعَهُ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُوا لِمَا أَصَابَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَمَا ضَعُفُوا وَمَا اسْتَكَانُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ﴾ال عمران/١٤٦.

ئای چەند مەزنە ئەو دروشمەی.. کە لە ڕۆژی مردنیدا کردیە دروشمی خۆی..!!

کۆمەڵێك لە هەڵگەڕاوەکان دەورەیان دا و سالمی پاڵەوان کەوت، بەڵام گیانی بەردەوام لە جەستە بێگەردەکەیدا دەهات و دەچوو، هەتا جەنگەکە بە کوژرانی موسەیلەمەی درۆزن و تێکشکانی سوپاکەی و سەرکەوتنی موسڵمانەکان کۆتایی پێهات..

ئەو کاتەیشی موسڵمانەکان بەنێو قوربانیان و شەهیدەکانیاندا دەگەڕان (سالم)یان بەدی کرد لەسەرەمەرگدا بوو..

لێی پرسین:

(ئەبوحوذەیفە) چی بەسەرهات..؟؟

وتیان: شەهید بوو..

وتی: لە پەنایەوەم ڕامکێشن..

وتیان: ئەوەتانێ لە پەناتەوەیە ئەی سالم.. لە هەمان جێگادا شەهید بووە..!!

*   *   *

دوايين بزە كەوتە سەر لێوانی و..

ئيدی قسەی نەكرد..!!

تێگەيشت كە ئەوەی ئەو و هاوەڵەكەی خوازياری بوون پێی گەيشتن..!!

پێكەوە موسڵمان بوون و..

پێكەوە ژيان و..

پێكەوەش شەهيدبوون..

ئای لە جوانی بەختەكان و، قەشەنگی قەدەرەكان..!!

ئەو بڕوادارە گەورەيە كە عومەری كوڕی خطاب τ لەكاتی سەرەمەرگی خۆيدا لەبارەيەوە وتی:

((ئەگەر سالم زيندووبوايە، ئەوا لەدوای خۆم دامدەنا))..!!

# دوا وتە

پاش ئەوەش..

ئائێستا کە ئێمە ماڵئاوایی لەو پێڕە پایەبڵندەی هاوەڵانی موحەممەدی پێغەمبەری خوا درودی خوا لەسەر بێت و ڕەزامەندیشی لەسەر هەموویان بێت..

وای دەبینین کە مافی خۆیمان دابێت بە باسەکەمان..؟

وای تێدەڕوانن کە سەرژمێری یەکەیەکەی ئەو پیاوە بە جەرگانەمان کردبێت..؟

نەخێر..

ڕێزی ئاشنابوونی دەستەیەکی پیرۆزی مەزنیانمان لە نزیکەوە پێبڕا و، چەند ساتێکی پرشنگدارمان لەگەڵدا بەسەر بردن، لەکاتێکدا کە دەرفەتی هاوەڵێتی هەموویانمان بۆ نەبوو..

ئەو شەست پیاوەی کە لەم پەرتوکەدا خرانە ڕوو، نوێنەرایەتی هەزارەها کەسانی زۆر و سەرفرازی ئەو برایانەیان دەکەن کە پێغەمبەریانﷺ بینی و، لەگەڵیدا ژیان و، بڕوایان پێ هێنا و، لەگەڵیدا تێکۆشان..

جا لە وێنەی ئەو شەست چاکەکارەدا، وێنەی تێکڕای هاوەڵان بەدی دەکەین..

ئیمان و، خۆڕاگری و، پاڵەوانێتی و، قوربانیدان و، خۆشەویستی و پشتیوانیکردنیان بەدی دەکەین..

ئەو هەوڵەیان کە دایان و..

ئەو سەرکەوتنەی کە بەدەستیان هێنا و..

ئەو ڕۆڵەی کە پێی هەستان بۆ ڕزگارکردنی هەموو مرۆڤایەتی لە بتپەرستی ویژدان و، لە دەستچوونی ئایندە دەبینین..!!

* * *

کەوابوو ئەو شەست پیاوە نمونەیەکی گەش و جوانن، پێشوازی لێدەکەین و بەرز و بەڕێز ڕایدەگرین و، تێیدا پاڵەوان و سەربازی مەزنترین قۆناغ لە قۆناغەکانی تێکۆشانی هەموو مرۆڤایەتی و، ئاینی بە شێوەیەکی بەرز تێدا بەدی دەکەین..

ئەو قۆناغەی کە تێیدا جیهانی کۆنی لەژێر پاچەکانی ئەو ڕاستیە نوێیەدا دادەڕوخێت کە هاتووە یەکخواناسی پەروەردگار و، یەکخواناسیی بەدیهێنەر ڕادەگەیەنێت..

هیچ بت و بتپەرستیەك نیە..
دەستەڵاتی فارس و قەیسەر نیە..
بەڵکو تەنها یەك خوای بێهاوەڵ هەیە..
هەموو مرۆڤەکانیش وەك ددانەکانی شانە یەکسانن..
نامانەوێت دووبارە ئەوەی پێشتر نووسیومە دەربارەی ئەو هۆکارانەی کە ئەم ئیمانە سەرسوڕهێنەرەیانی داڕشت کە دڵ و دەروونی ئەو پیاوانەی پڕ کرد بنووسمەوە.
چونکە لێرەدا و لە دەستپێکی ئەم پەرتووکەدا و، لەژێر ناونیشانی (ئەو ڕووناکییەی شوێنی کەوتن) بە پشتیوانی و بەخشینی خوای گەورە بۆم ڕەخسا کە کرۆکی ئەو فاکتەر و هۆکارانە دەربخەم.

* * *

بەڕاستی محمد بە ڕاستگۆیی و، دامەزراوی و، بێگەردی و، مەزنیەکەی، تەنها ئیمانێکی لەو شێوەیەی تێدا ڕەنگدانەوە.
ئیمانی پیاوێك کە بە چاکی ئاشنا بوون و.. بە تێکڕای تەواومەندی و بەزەیی و، هەموو مرۆڤێتی و خوداویستیەوە و.. بە گشت بەرزی خۆ بەکەم زانیەوە.. بە گشت جوانی و ساکارییەکەوە و.. بە تەواوی هێز و بەزەییەوە بینیبویان..
بینیان و.. بەچاکی پاڵنەر و، دامەزراوی بەرنامەکەیان بەدیکرد، هەربۆیە لەپاش بڕواهێنان پێی، گومان دەستەڵاتێکی نەما بەسەریانەوە.. بەڵکو ئەوان دەستبەرداری ئەو مافە ئاساییەی خۆیشیان بوون کە داوای موعجیزەیەکی لێبکەن کە لە پێش چاویاندا ڕاستی پێغەمبەرێتی و پەیامەکەی دەربخات..!!
هەموو نەتەوەکان داوای مەعجیزەیان لە پێغەمبەرەکەیان کردووە، تا بڕوای پێ بهێنن.. تەنها هاوەڵانی پێغەمبەر نەبێت.. تەنیا پیاوانی دەوری پێغەمبەر نەبێت.. هەرگیز نەیانوت پێی: موعجیزەیەکمان نیشان بدەن ڕاستگۆییمان نیشان بدات.. چونکە محمد بۆ خۆی موعجیزە بوو..!!
گەڕان لەدوای موعجیزەیەکی دیکە لە دەرەوەی خۆی و کەسێتی و بیروباوەڕەکانی، ساویلکەییەکە پیاوانێکی لەم شێوە عاقڵمەندانەی تووشی نابن، بە تایبەت پاش ئەوەی دڵیان پڕ هیدایەتی خوا بوو و، چاوەکانیان پڕ لە ڕۆشنایی پێغەمبەرەکەی بوو..!!

* * *

بەڕاستی ئیمانی ئەو دەستە موسڵمانە یەکەمینە هێندە متمانە دەبەخشێتە تێکڕای مرۆڤایەتی بە هەموو ئاین و، سەرجەم سەردەم و، ڕەگەزەکانی کە بەردەوام بێت لەسەر لاوێتی بەگوڕ و، عەزمی جەسووری.

ئەوان لە سەرەتا و کۆتایی کارەکەشدا، وەکو خەڵکی مرۆڤن.

لەنێو ڕەوشێکدا دەژیان، کە لە روکەشیدا وا دیار نەبوو کە بتوانێت وایان لێبکات توانای ئەنجامدانی ئەوەیان هەبێت کە دواتر کردیان.

هەروەها ئەوان وەك کۆمەڵگاش، هێشتا هەموو پێداویستیە گونجاوەکانی دروستکردنی کۆمەڵگایان بەدەست نەهێنابوو..

چونکە ئەوان هۆزی پەرتەوازە و.. بەگژیەکداچوو بوون.. کە تاکی توندوتیژی داخراو بەڕێوەی دەبرد..

وەکو هێزی سیاسی، بەر لە هاتنی ئیسلام شتێکی وا نەبو شیاوی باس بێت.

وەك هێزی ئابووری، لە هەموو کەس نەدارتر بوون.

وەك هێزی ژمارەش، ژمارەیان لە هەموو خەڵکی کەمتر بوو..

جا چی روویدا، وایکرد ئەو کۆمەڵە کەمە لە هەموو شتێکدا بوونە بنیاتنەری جیهانێکی نوێی جوانی گشتگیر..؟

ئایا بەهێزی چەك و زۆری سوپا بوو..؟؟

بەڕاستی ئەسکەندەر بەر لەوان و، جەنگیزخان دوای ئەوان زۆر لەوان زیاتر چەك و سوپایان هەبوو..

جا ئەمڕۆ کوا ئەسکەندەر و، کوا جەنگیزخان..؟!

چییان لەپاش خۆیان و، سوپا داگیرکەرەکانیان و، سەرکەوتنە سەرسوڕهێنەرەکانیان ماوەتەوە..؟!

لە هەموو ئەوانە چی ماوەتەوە لە ویژدانی ژیان و، ویژدانی مرۆڤدا..؟!

هیچ..

کەوابوو هێزی ماددی بە هەموو شێوەکانیەوە نەبووە هۆی ئەوەی هاوەڵانی پێغەمبەر بەو جۆرە بن کە بینیمان..

بەڵکو بەهۆی ئیمانەوە بوو، ئیمان بە حەق و، بە چاکە..

بەر لەوەش، ئیمان بە پەروەردگاری حەق و، چاکە..

ئەوەش ئەو وانە راستیەیە کە محمدی پێغەمبەری خوا ﷺ داویەتی و بەردەوام دەیدات بەگوێی هەموو مرۆڤایەتی و، ئەوانەی باوەڕیان هێنا لەگەڵیدا..

* * *

تاریکی دەگۆڕێت بۆ رۆشنایی..

ئاژاوە بۆ یاسا..

لاوازی بۆ بەهێزی..

ونبوون دەبێتە پارێزکار و..

سوکێتی دەبێتە مەزنی و..

نەفامی زانستی بە شوێندا دێت و..

نەبوون دەبێە زۆری..

جا کاتێ مرۆڤەکان ژینیان بۆ حەق و چاکە تەرخان دەکەن، هەموو دڕکەکانی سبەینێ دەبنە گوڵ.. ئەمەش ئەوەبوو کە پێغەمبەری خواﷺ و هاوەڵانی ئەنجامیان دا..

هەر ئەوەش بوو، بەر لەوان، تێکڕای نێردراوان و، یاوەرانی بڕواداریان فەراهەمیان هێنا..

ئەوەش، ئەو مانەیەیە کە لە دوای خۆیان بەجێیان هێشتووە..

* * *

لەبەر ئەوەی حەق و چاکە، هەردووکیان کاکڵەی ئەو رۆڵە بوون کە پێغەمبەر و هاوەڵانی پێی هەستان.. لەبەر ئەوەی ئیمانی راستگۆیانەی، بێگەرد و، ئازا رێڕەو و بەرنامەیان بوو.. لەبەر ئەوەی کە وابوون-بینیمان- محمد و هاوەڵانی باشترین میراتیان بۆ مرۆڤایەتی بەجێهێلا.

هەروەها بینیمان ویژدانی مرۆڤایەتیان پڕ دەکرد لە باشێتی و، رووناکی و، تێگەیشتن..

ئەمڕۆش، زۆربەی ئێستگەکانی دونیا ئایەتەکانی قورئانی مەزنیان لەخۆگرتووە کە پێشەوا و رووناکی بوو بۆ پێغەمبەرﷺ و هاوەڵانی، تا بە ئاشکرا و بێ پەردە رایبگەیەنن..

زۆربەی ئێستگەکانی دونیا، تەنانەت ئەو وڵاتانەیشی کە جگە لە ئاینی ئیسلام ئاینێکی دیکەیان هەیە..

هەتا ئەو وڵاتانەیشی کە بڕوایان بە ئایین نیە..

زۆربەیان، لەو ئێستگانەیاندا کە بە زمانی عەرەبیە، دەستپێکی بەرنامەکانیان بە ئایەتەکانی قورئانە..!!

لە هەموو بستێکی سەر زەوی و...

لەنێو گەلە موسڵمانەکان و..

گەلە مەسیحی و..

لەنێوان جولەکە و، هیندۆسی و، بوزی و..

لە سەرووی سەرسام بوونی ئەو دەوڵەتانەیشەوەیە کە بڕوایان بە ئایین نیە..

جا لەنێوان ئەوانە و، ئەوانەدا.. بڵندگۆ بەرزەکان بڵندتر دەبن تا لە سەریانەوە هەمان ئەو وشانە بەرز ببنەوە کە دەنگی بانگدەری پێغەمبەرﷺ بەر لە هەزار و چوارسەد و ئەوەندە ساڵ دای بە گوێی خەڵکیدا..

الله أكبر... الله اكبر

أشهد أن لا اله الا الله

أشهد أن محمداً رسول الله

حی علی الصلاه

حی علی الفلاح

لە تێکڕای جێگاکانی سەر زەوی، قورئانی ئەم ئاینە دەخوێندرێتەوە..

لەسەرجەم شوێنەکانی سەر زەوی، مزگەوتەکانی بەرز دەبنەوە.

لە هەموو پێگەکانی سەر زەوی، بنەماکانی بڵاودەکرێنەوە.

چ هێزێکە ئەم جاویدانیەی پێ بەخشیوە..؟؟!!

هەمان ئەو هێزەیە کە پێشتر بینیمان کە هێزێکی بێوێنە و بەرزی دەبەخشیە ئەم ئاینە و پیاوەکانی بۆ گۆڕینی دونیا و، ئەوەی تێیدایە لە خەڵك و، داب و نەریت و چارەنووسەکان..

کە ئەویش هێزی ئیمانە بە حەق و، بە چاکە..

بەر لەوەیش، ئیمان بە پەروەردگاری حەق و، چاکە و..

بە پێغەمبەر، بگرە بەو پێغەمبەرانەی کە ژیانی خۆیان لە پێناوی حەق و چاکەدا بەخشی..

ئەوانە هەموو شتێکیان بەخشی و، هیچیان وەرنەگرت..!!

*       *       *

لە کۆتاییدا وشەیەك ماوە بوترێت..

ئەویش پرسیارێکە کە بێگومان دێت بە خەیاڵدا، پاش ئەوەی کە ئەو دیمەنە پرشنگدارەمان خوێندەوە کە لە میانەیاندا ئەو شەست پیاوەی هاوەڵانی پێغەمبەری خوامان تێدا بەدی کرد..

پرسیارەکەش ئەوەیە:

ململانێی جیاڕایی چۆن توانی پەیوەندی بەتینی نێوان ئەو برا تێگەیشتوانە بشێوێنێ و.. چۆن چۆنی ئەو شەڕە نێو خۆییەی لەنێوان لایەنگرانی ئیمامی عەلی و، پشتیوانانی موعاویەدا بەرپا بوو، زاڵ بوو بەسەر برایەتی گەشیاندا، کە بینیمان لە خستنەڕووی هەندێك لە هەواڵەکانیدا، لە میانەی لاپەڕەکانی ئەم پەڕاوەدا..؟

وەڵامی ئەو پرسیارەش دەمانگەڕێنێتەوە بۆ لای چاکەی ئیمان لای ئەو هاوەڵانە، پاشان بۆ لای هۆکاری دیکەی مێژوویی..

بەڵێ.. ئیمانی دیار و، راستگۆیانە و، یەکلابووەوەیان، کردبوونیە رێبواری یەك ڕێ...

حەقیش لای ئەوان تەنها یەك شێوەی هەبوو، ئاشنای بوون و شوێنی دەکەوتن و، چەندەها شێوەی جۆراوجۆری نەبوو کە چاك هەڵبژێران بە ویستی خۆیان و بەپێی بەرژەوەندییەکانیان یەکێکیان بەچاك بزانن.

کاتێك پێغەمبەرﷺ لە نێویاندا دەژیا، ڕێنموونی کردنی خەڵکی بەرەو لای ئەو حەقەی کە خەڵکی جیاواز بوایە بە بیروڕایان لەبارەیەوە کارێکی ئاسان بوو. چونکە نیگا، یاخود پێغەمبەر، یان هەردووکیان پێکەوە هەموو کارێکی جێی گومانیان یەکلا دەکردەوە.

کاتێك پێغەمبەریش وەفاتی کرد، جیاواز نەبوون لەوەی کە خوای گەورە یەکلای کردبووەوە بۆیان، یان پێغەمبەرەکەی بۆی یەکلاکردبووەوە.

کاتێکیش عوسمانτ کوژرا، کوشتنەکەی ئاشووب و ئاژاوەی لەگەڵ خۆی هێنابوو کە هەموو وڵاتانی ئیسلامی لەو کاتەدا هەژاند و، لە ئاکامی ئەو ڕوداوە ترسناکە هەڵوێستێك هاتە پێش بواری جیاوازی بیروڕا و مەزندە فراوان بوو.

موسڵمانانیشی ناچار کرد کە هەموویان هەڵوێستی خۆیان دیاری بکەن و یەکێك لە لایەکانی هەڵوێستە زۆرەکانی هەڵبژێرن..

شێوازیشیان لە هەڵبژاردندا وەك شێوەی ئیمان هێنانیان.. ڕوون و یەکلاکەرەوە بوو، بەبێ دوودڵی و، دووپووویی..

جا ئەوانەی بڕوایان بەو تێڕوانینە هەبوو کە ئیمامی عەلی سەرکردایەتی دەکرد، لای ئەویان هەڵبژارد.. ئەوانەشیان بڕوایان بەو تێڕوانینە هەبوو کە موعاویە سەرکردایەتی دەکرد، لای ئەویان هەڵبژارد..

ئەوانەیشی هەردوو لایان بە هەڵە دەزانی، ڕێگەیەکی دیکەیان گرتبووە بەر کە خۆی لە ناچارکردنی هەردوو لای ناکۆکدا دەبینییەوە بۆ وازهێنان لە جیاوازی، کاتێك کارەکە لەدەست دەرچوو، بێلایەنیان هەڵبژارد و، لە کێشەکە دوورکەوتنەوە..

ئەمە، سەبارەت بەو هاوەڵانەی زوو موسڵمان بوون و هاوسەردەمی پێغەمبەر بوون و، لەگەڵیدا دژ بە هێزەکانی بێباوەڕی و تاریکی جەنگابوون.

بەڵام ئەو هاوەڵانە لە ڕۆژانی ململانێکەی نێوان ئیمامی عەلی و معاویەدا بە تەنها نوێنەرایەتی (چەقی هێز)یان لە دەوڵەتی ئیسلامدا نەدەکرد..

لەبەر ئەوەی ئەو ساتە دەوڵەت زۆر زۆر فراوان ببوو و، هێزی دیکە لەنێویدا سەری هەڵدابوو، کە بەشداری لە ڕووداوەکان و ئاراستەکردنیدا دەکرد. ئەو پیلانەشی کە ژیانی خەلیفە عوسمانی کردە مەبەست و، ئەو دام ودەزگایەی ئەنجامدانی گرتە ئەستۆ بەڵگەیە لەسەر ئەوە، کە لە دەرەوەی مەدینە هاتبوو، بگرە لە دەرەوەی هەموو نیوە دوورگەی عەرەب و.. لە وڵاتە ئیسلامیە زۆر دوورەکانەوە هاتبوو..

جا ئەو هێزە نوێیانە رۆڵێكی وایان هەبوو كە لە توانای هاوەڵە گەورەكاندا نەبوو رێگری لێبكەن.. رۆڵێكی مەترسیدار و كارا لە گۆڕانی ململانێی نێوان معاویە و ئیمامی عەلی بۆ شەڕ و كوشتار.

بگرە كە خەڵكی شامی لایەنگری معاویە و، خەڵكی عێراقی لایەنگری ئیمامی عەلی، لە پێشخستنی كۆتایی ململانێكەدا خاوەنی رۆڵی راستەقینەی ئەو شەڕە بوون..

تەنانەت لە شێكردنەوەی كۆتاییدا بۆی، لە نێوان دوو سەربازگەی ئیسلامیدا نەبوو، هێندەی ئەوەی كە لەنێوان دو سەربازگەی هەرێمیدا بوو.. خەڵكی شام لەلایەك و، خەڵكی عێراق لەلایەكی دیكەوە..!!

لێرەدا هێزی سێیەمیش هەیە كە ناتوانرێ چاوپۆشی لێ بكرێت.. ئەویش هێزێكی خراپەكارە و لەو ساتەوەی ئیسلام قامچی لەدەست سەندبووەوە و دەسەڵاتەكەی تەختی زەوی كردبوو خەو نەدەچووە چاوی.

ئەو هێزەش خۆی لە پاشماوەی فارس و رۆمەكاندا دەبینیەوە، كە بەردەوام فێڵ و تەڵەكەی بەرامبەر ئیسلام ئەنجام دەدا لەرێی سیخوڕە زۆرەكانیانەوە كە دزەیان كردبووە ناوی بەوەی وا خۆیان دەخستە روو كە باوەڕیان پێی هێناوە، ئەوانەیشی كە هەندێكیان توانیبویان ژاوەژاو و تێكدان بخەنە ریزی موسڵمانانەوە، بەجۆرێك كە هەردوو ئیمپراتۆریەتەكە لە ئاستیدا دەستەوستان بوون..؟!

ئەمە سەرنجدانێكی خێرابوو لە ئاست ئەو هەڵوێستە سەختەی كە لەو رۆژەدا بەسەر هاوەڵان و، هەموو ئیسلامدا هات.. پێویستە كە ئەو راستیەی دیكەش فەرامۆش نەكەین، كە هەردوو سەركردەی سەربازگە بەشەڕهاتووەكان ئەوەیان مەزەندە نەكردبوو كە كارەكە بگاتە ئەو ئاستە مەترسیدارە..

جا ئیمامی عەلی و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، شاڵاوبردنیان بۆ سەر شام تەنها وەك هێرشێكی ترسێنەر سەیر دەكرد، كە زۆر نەخایەنێت معاویە لەسەر هێزی دەستەڵاتی دەوڵەت پێكدێتەوە لەگەڵیان و، رێزی دەگرێت و گوێڕایەڵی دەبێت..

معاویە و ئەوانەیشی لەگەڵیدا بوون، لەو باوەڕەدا بوون كە ئیمامی عەلی دەستەڵاتیان دەپێچێتەوە و، ئامادەباشییان تاقی دەكاتەوە، گەر بینی هێز و تفاقیان بەو جۆرەیە كە هەیانە، ئەوا جگە لە شەڕ رێگایەكی دیكە دەگرێتە بەر بۆ نەهێشتنی جیاوازی.. بەڵام كارەكان زۆر دوورتر گەشەی كرد.

ئەو گەشەكردنە لەناكاو و دوورەش، پەردە لەسەر ئەو هێزە شاراوەیە هەڵدەماڵێت كە لە ناواخنی هەر سەربازگەیەكدا كاری دەكرد، بۆ گۆڕینی ململانێكە بۆ شەڕ و كوشتار..

* * *

ئێستاش بەم ڕووداوە کۆتایی بە قسەکانمان دەهێنین لەبارەی ئەو شەڕەوە.

زوبەیرﭬ لە ڕیزی سوپای معاویەدا دەجەنگا و.. لە کۆتایی شەڕەکەدا هەڵەیی بەشداریکردنی لەشەڕدا بۆ دەرکەوت و، کشایەوە لێی.

بەڵام یەکێك لە بەشەڕهاتووەکان شوێنی کەوت و، لەکاتێکدا بەپێوە نوێژی دەکرد، ڕمێکی کوژەری لێدا.

جا بکوژەکە شمشێرەکەی زوبەیری هەڵگرت و، بەخێرایی بەرەو لای ئیمامی عەلی گەڕایەوە، دەیویست مژدەی کوژرانی زوبەیری پێ بدات و ئەو شمشێرەی بخاتە بەردەم کە لەنێو سوپای معاویەدا دژ بە ئیمامی عەلی پێی دەجەنگا.

لە دەروازەی ئیمامی عەلیدا ڕاوەستا و، داوای مۆڵەتی چوونەژوورەوەی کرد.. ئیمامی عەلی بە ڕووداوەکەی زانی، هاواری لێکرد و فەرمانیدا کە ئەو بکوژە دەربکەن و فەرمووی:

((مژدەی چوونە نێو ئاگر بدە بە بکوژی کوڕی صەفیە)).

مەبەستیشی لە (کوڕی صەفیە) زوبەیر بوو.

جا فەرمانی کرد کە شمشێرەکەی زوبەیری لێ وەربگرن و بۆی بهێنن.. شمشێرەکەی زوبەیر بەرەو لای ئیمامی عەلی برا، ئەویش بەدەم گریانەوە دەستی کرد بە ماچ کردنی و، وتی:

(ئەمە شمشێرێکە، سوێند بەخوا، خاوەنەکەی چەندەها جار ناڕەحەتی لە پێغەمبەری خوا دوورخستۆتەوە پێی ..)!

* * *

ئەمە دیمەنێکی مەزنە و سەبوورییەکی زۆر دەدات بە سەر ناڕەحەتیەکانی ئەو جیاوازیە ناخۆشە و، زۆر تێگەیشتن و چاك مەزەندەکردنیش بە ئێمە دەبەخشێت..

* * *

ئائێستاش ئەوا ئێمە ماڵئاوایی لەو پیاوانە دەکەین کە کاتێکی پڕ لە خۆشی و شادی لەسەر لاپەڕەکانی ئەم پەڕاوە لەگەڵیاندا بەسەرمان برد و.. کڕنۆشی سوپاسگوزاری بۆ خوای گەورە دەبەین لەسەر بەخششەکانی و.. داواکاری بەخشش و بەزەیی و، لەشساغیی زیاترین لێی..

بە ملکەچی و ڕێزیشەوە، بە مامۆستای مەزن و، دوایین پێغەمبەرانی خوا دەڵێین:

–السلام علیك أیها النبی ورحمه الله وبرکاته.

–خوا بە چاکترین شێوە پاداشتت بداتەوە لەسەر ئەوەی بەخشیت و، ڕێنموێنیت کرد.

بەجۆش و خرۆشێکی زۆریشەوە، بە هاوەڵە بەڕێزەکانی دەڵێین:

ئەی چاکەکاران، ماڵئاوا.. !

بەڵام... کەی ئاوابوون،، هەتا پێیان بگوترێت ماڵ ئاوا..؟؟

دەبا سڵاومان ئەمە بێت: سڵاو..
سڵاوێك، لە دەستپێكدا بە ملكەچیەوە وتمان..
لە كۆتاییشدا هەر بە ملكەچی دەیڵێین..

## سەرچاوە مێژووییەکان

١- الإصابة، في تمييز الصحابة ابن حجر العسقلاني.
٢- الإستيعاب، في أسماء الأصحاب ابن عبدالبر.
٣- أسد الغابة، في معرفة الصحابة ٣ابن الأثير.
٤- السيرة النبوية ابن هشام.
٥- الطبقات الكبرى ابن سعد.
٦- البداية والنهاية ابن كثير.
٧- حلية الأولياء أبو نعيم الأصبهاني.

## ناومرۆك